کە گوفتاری ئەویان ئاراستە کراوە و لێی تێ دەگەن، ئەوا بێ هیچ گومانێك قورئانی پیرۆز لە پێشەکیدا و پاش ئەو سەرجەمی کتێبە پیرۆزەکانی تر گوفتاری ئەون.

* * *

یان ئایا دەگونجێ کردگاری دانا کە هەموو جۆر و پایەکانی ئەم گەردوونە مەزنەی بۆ زیندەوەران ملکەچ و گوێڕایەڵ کردووە بە ڕادەیەك کردوویەتی بە نیشتەجێ و پیشانگا و میوانخانەیەکی ئەوان و، هەردەم جۆرەکانی زیندەوەران کە لە هەزاران تێپەڕ دەبن زیاد دەکات و تەنانەت هەموو گەڵایەکی درەختی چنار و نەبقی وەك سەربازگەیەك لێ کردووە بۆ جۆرە مێروویەك لەوانەی کە بە هەوادا دەفڕن و زیکری خوا دەکەن و ئەو گەڵایانەی بە وێنەی ڕەحمی دایك کردووە بە لانك و ڕەحمی گەشەکردن و گەنجینەی ڕۆزی و ئازووقەکانیان.. کردگاری دانا ئەم گەردوونە بەم جۆرە ملکەچ و گوێڕایەڵ دەکات تاکو لەم ڕێیەوە خۆی بە خاوەن هەستان بناسێنێت و خۆشەویستی بکات لایان و، وا لە بەدیهاتووانیش بکات کە سەنا و سوپاس و ستایشی بکەن و، ئنجا ڕەزامەندی و خۆشحاڵی لە زیندەوەراندا دروست کردووە بەرامبەر هەموو جۆرێکی چاکەکارییەکانی و، ڕەزامەندی و منەتباریی ئەوانی کردووە بە تەوەرەیەکی گرنگی پەروەردگارێتییەکەی.. ئایا دەگونجێ ئەم کردگارە دانایە ئاسمانە ڕازاوەکان و ئەستێرە درەخشانە پەرش و بڵاوەکان بێ خاوەن گیان و بێ سەرنشین و خاڵی و بەتاڵ و بێ کەڵك و سوود، واتە بێ مەلائیکەت و ڕۆحانییات واز لێ بهێنێت و دەستیان لێ هەڵبگرێت؟ نەخێر بە ژمارەی مەلائیکەت و ڕۆحانییات نەخێر.

یان ئایا دەگونجێت کردگاری دانا و کارساز کە بە قەڵەمی قەدەری خۆی موقەددەراتی ژیانی بچووکترین ڕووەك و درەخت بە کەماڵی ڕێکوپێکی لە ناوك و بەرەکەیدا دەنووسێت و، پێشەکی و ئەنجامەکانی بەهاری مەزن بە وێنەی نووسینی یەك دانە درەخت و بە کەماڵی جیاوازی و ڕێکوپێکی دەنووسێت و تەنانەت بایەخ بەو شتانەش دەدات کە مایەی بایەخ پێدان نین.. ئایا دەگونجێ ئەم کردگارە شکۆمەندەی کە ئەمانە دەکات، کردارە یەکجار گرنگەکانی ئەم مرۆڤە نەنووسێت و وەستان و جموجوولەکانی تۆمار نەکات و نەیانخاتە ناو بازنەی قەدەری خۆی و بایەخ بەم مرۆڤە نەدات لە کاتێکدا کە کردوویەتی بە: ئەنجامی گەردوون و جێنشینی ڕووی زەوی و

بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیکاری گشت جۆرەکانی بەدیهاتووانی؟ نەخێر بە ئەندازەی ژمارەی ئەو کردەوانەی مرۆڤ کە کێشانە دەکرێن، نەخێر.

**پوختەی قسە:**

هەموو گەردوون بەگشت حەقیقەتەکانیەوە هاوار دەکات و دەڵێت:

آمنتُ بالله وملائكته وكتبه ورسله وبالقدر خيره وشره من الله تعالى، والبعث بعد الموت حق. أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أن محمداً رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وإخوانه وسلّم. آمين.

## موناجاتێکی تەوحیدی و پێشەکییەکەی

... بە بۆنەی دوویات بوونەوەی ناوی "سراج النور" لەم پەیامەدا، والە کۆتاییەکەیدا موناجاتەکەی ئیمامی عەلی - رضِيَ اللهُ عنه وكرَّمَ وجْهَه - بە دوو پلە فراوان دەکەین و زمانمان لە پێناوی زمانی بەرز و بڵندی ئەودا دەخەینە قسە و ئەم موناجاتەی خوارەوە پێشکەش بە دیوانی خواوەندی تاك و تەنیا - جلّ وعلا - دەکەین:

## موناجاتێك

اللّهم إنه ليسَ في السّموات دوراتٌ ونجومٌ ومُحرِّكاتٌ سيّاراتٌ، ولا في الجوّ سحاباتٌ وبروقٌ مسبِّحاتٌ ورَعداتٌ، ولا في الأرض غَمَراتٌ وحيواناتٌ وعجائبُ مصنوعات، ولا في البحارِ قَطَراتٌ وسَمَكاتٌ وعجائبُ مخلوقات، ولا في الجبالِ حجَراتٌ ونباتاتٌ ومدخرات معدنيات، ولا في الأشجار ورقاتٌ وزهرات مزيناتٌ وثمراتٌ، ولا في الأجسام حَركاتٌ وآلاتٌ ومنظّماتُ جهازات، ولا في القلوبِ خَطراتٌ وإلهاماتٌ ومنوّراتُ اعتقادات.. إلاّ وهي كلُّها على وجوب وجودكَ شاهداتٌ وعلى وَحدانيتك دالاّتٌ وفي مُلككَ مُسخراتٌ. فبالقدرة التي سخّرتَ بها الأرضين والسموات سخّرْ لي نفسي وسخّر مَطلوبي وسخّر لرسائل النور ولخدمة القرآن والإيمان قُلوبَ عبادكَ وقلوبَ المخلوقاتِ الرّوحانيات من العُلويات والسُفليات، يا سميعُ يا قريبُ يا مجيبَ الدعوات..

والحمد لله ربّ العالمين.

**﴿سُبْحانكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما علّمْتَنا إنّكَ أنتَ العليم الحكيم﴾.**

# تیشکی سێهەم

## پێشەکی

ئەم هەشتەم بەڵگە ئیمانیی‌یە هەروەك بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ شایەتی لەسەر "پێویستیی بوون" و "یەکتایی" خوای گەورە دەدات، بە هەمان جۆر شایەتی لەسەر "گشتگیریی پەروەردگاریتی"یەکەی و "مەزنیی توانست"ەکەشی دەدات.. هەروەك "هەمەلایەنگیریی فەرمانڕەوایەتی و دانست"ی خواوەند و "گشتگیریی زانست"ەکەی بۆ هەموو بەشێکی گەردوون دەچەسپێنێت، بە هەمان جۆر دەشبێت بە بەڵگە لەسەر "فراوانیی میهرەبانی"یەکەی.

بە کورتی: هەریەك لە "پێشەکی"یەکانی ئەم هەشتەم بەڵگە ئیمانیی‌یە هەشت "ئەنجام"ی هەیە و، لە هەموو یەکێك لەو هەشت پێشەکی‌یانەشدا هەر هەشت ئەنجامەکان - بە بەڵگەکانیانەوە - دەچەسپێنێت. لەبەر ئەوە، ئەم هەشتەم بەڵگە ئیمانیی‌یە گەلێ تایبەتکاریی بەرز و بڵندی بەدەست هێناوە.

(ئەم پەیامی "موناجات"ە بە شێوازێکی پوختی دەراسا و بێ گومانیی‌یەکی لەعادەتبەدەر و خاوێنی و دڵنیایی: (پێویستیی بوون و.. تاکی و.. تەنیایی و.. شکۆمەندیی پەروەردگاری و.. مەزنیی توانست و.. فراوانیی میهرەبانی و.. عموومییەتی فەرمانڕەوایی و.. هەمەلایەنگیریی زانست و.. گشتگیریی دانستی خواوەند) و بناغە ئیمانیی‌یەکانی تری هاوچەشنیان دەچەسپێنێت. هەروەك ئاماژەیەکی گەلێ بەهێزیش بۆ "حەشر" دەکات، بە تایبەت لە کۆتایی‌یەکەیدا).

**سەعیدی نوورسی**

پەیامی
# موناجات

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ الَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي البَحْرِ بِما يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللهُ مِنْ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيا بِهِ الأَرضَ بَعْدَ مَوتِهَا وَبَثَّ فيْها مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّياحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّماءِ وَالأَرضِ لآياتٍ لِقَوْمٍ يَعْقلونَ﴾ (البقرة: ١٦٤).

**ئەم پەیامی موناجاتە، کە تیشکی سێهەمە، جۆرە تەفسیرێکی ئایەتە پیرۆزەکەی سەرەوەیە.**

ئەی خواوەند و پەروەردگارم!

من بەهۆی بەسیرەتی ئیمان و، نووری قورئان و وانە و دەرسەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و، بەو شتانەش کە ناوی "الحکیم" پێش‌چاویان دەخات، دەبینم کە:

هەرچی خولانەوە و بزووتنێك لەناو ئاسمانەکاندا هەیە.. هەر هەموویان، لە ڕێی ڕێکوپێکی‌یە ناوازەکەیانەوە، بەڵگە و ئاماژەی "بوون"ی تۆن..

هەرچی تەن و قەبارەی ئاسمانیش هەن.. هەر هەموویان، لە ڕێی بێدەنگی و کشوماتی‌یان لە دەمی ئەنجامدانی کارەکانیاندا و، بە مانەوەشیان بێ ئەوەی هیچ کۆڵەکە و ستوونێك ڕاگیریان بکات.. شایەتی لەسەر "پەروەردگاری"ت دەدەن و ئاماژە بۆ "یەکتایی"ی تۆ دەکەن..

هەرچی ئەستێرەش هەن، لە ڕێی بەدیهاتنە هاوسەنگ و ‌بارودۆخە ڕێکوپێك و زەردەخەنە نوورانی‌یەکانیان و بەوەش کە لە سەرجەمی ئەستێرەکانی تر دەچن، شایەتی لەسەر گەورەیی خوایەتیت دەدەن و ئاماژە بۆ "تەنیایی" تۆ دەکەن..

ههموو یهکێك له ههساره گهڕۆکهکانیش، له ڕێی: بزووتنی پڕ له دانست و، گوێڕایهڵیی ملکهچ بوون و، کارمهندییه ڕێکوپێك و پاشکۆ گرنگهکانیهوه، شایهتی لهسهر "پێویستیی بوون"ی تۆ دهدات و ئاماژه بۆ "دهستهڵاتداریی خوایهتی"یهکهت دهکات.

بهڵێ، ههروهك یهك به یهکی ئاسمانهکان به سهرجهم دانیشتووانیانهوه ئهم شایهتییه دهدهن، ههر ههمووشیان پێکهوه و به چهشنێکی بهڵگهنهویست شایهتییهکی ڕوون و ئاشکرا لهسهر "پێویستیی بوون"ی تۆ دهدهن، ئهی بهدیهێنهری ئاسمانهکان و زهوی! ههروهها شایهتییهکی ڕاست و بههێز لهسهر "تاك و تهنیایی"ت دهدهن ئهی ئهو کهسهی که گهردیلهکان و پێکهاتووه ڕێکهکانیان بهڕێوه دهبهیت و کاریان دهسازێنیت! ئهی ئهو خواوهندهی که ههر تۆ ههساره گهڕۆکهکان و پاشکۆ ڕێکوپێکهکانیان دهخهیته گهڕ و ملکهچ و گوێڕایهڵی خۆتیان دهکهیت! بهڵێ، ههر ههموویان شایهتییهکی ئاشکرا و بههێزی ئهوتۆ دهدهن که چهندین بهڵگهی نوورانی و بێ گومانی به ئهندازهی ئهستێرهکانی ڕووی ئاسمان پشتی دهگرن.

جا ئهم ئاسمانه ساف و جوان و خاوێنانه، به ئاشکرا دهبن به بهڵگه لهسهر: پهروهردگاریتی و فراوانیی "توانست"ه داهێنهرهکهت.. ههروهك ئاماژهیهکی بههێزیش دهکهن بۆ فراوانیی "فهرمانڕهوایهتی"یهکهت که ههموو ئاسمانه بهرینهکانی گرتووهتهوه و، "میهرهبانی"یه فراوانهکهشت که ههموو زیندهوهرێکی له باوهش گرتووه.. ههروهها شایهتییهکی بێ گومان دهدهن لهسهر ئهوهی که "دانست"ی تۆ ههموو کارێك دهگرێتهوه و "زانست"هکهشت دهورواندهوری ههموو شتێکی داوه و، ههر ئهم توانست و زانسته ههمهلایهنگرهن که ههموو کاروبارێکی گشت بهدیهاتووهکانی ئاسمان و سهرجهم تهن و قهبارهکانیان لهناو دهستی خۆیاندا ڕێکدهخهن، ئهوانهی که تابلێی مهزن و گهورهن و لهوپهڕی خێراییدان و شێوه و بارودۆخی سوپایهکی ڕێکخراو و فیستیڤاڵێکی بهسام و شکۆی به کارهبا و گڵۆپ نهخشاویان لهخۆ گرتووه..

ئهم شایهتی و بهڵگانه، هێنده ڕوون و ئاشکران که دهڵێی ئهستێرهکان "وشهی بهرجهسته و نوورانی"ن بۆ بهڵگه و شایهتیدانی ئاسمانهکان!

ئنجا ئهو ئهستێرانهش که لهناو دهریا و بۆشایی ئاسمان مهله و هاتوچۆ دهکهن، بارودۆخێکی ئهوتۆیان لهخۆ گرتووه که له هی سهربازه گوێڕایهڵهکانی سوپا و

کەشتی‌یە ڕێکوپێکەکان و فڕۆکە دەراسا و چرا و گڵۆپە سەرسووڕهێنەکان دەچێت، بەم بارودۆخەشیان بریسکەی دەستەڵاتداریی خوایەتی‌یەکەت دەردەخەن. هەروەك هاوڕێی خۆرەکەی خۆمانن کە ئەویش ئەستێرەیەکە لەناو ئەو سوپایەدا و دەروانێتە دوارۆژ و، هەرگیز بێ ئیش و کار نی‌یە، بە بەڵگەی کارمەندی‌یەکانی لە هەسارەکانی تر و زەویی خۆشماندا، تەنانەت لەوانەیە ئەو ئەستێرانە چەند خۆرێك بن بۆ چەندین جیهانی باقی و هەمیشەیی.

ئەی "واجب الوجود"! ئەی تاك و تەنیا!

ئەم ئەستێرە دەراسا و خۆرە زەبەلاح و مانگە سەرسووڕهێنەرانەی کە لەناو ئاسمانەکانی تۆدان، هەر هەموویان بە: فەرمان و هێز و توانست و ویست و کارسازیی تۆ گوێڕایەڵ کراون و ڕێك خراون و کار و ئەرکیان لە ئەستۆ نراوە.. کەواتە سەرجەمی ئەو تەن و قەبارە بەرزانەی ئاسمان: تەسبیحات و تەکبیر پێشکەش بەو بەدیهێنەرە تەنیایە دەکەن کە بەدیی‌هێناون و دەیانخاتەگەڕ و بەڕێوەیان دەبات و، هەر هەموویان بە زمانی حاڵ دەڵێن: "سبحان الله.. ألله أكبر". وا منیش لەگەڵ هەموو تەسبیحاتێکی ئەواندا و بە ئەندازەی ژمارەی ئەو تەسبیحاتانەیان، تەسبیح و تەقدیست پێشکەش دەکەم.

* * *

یا من اختفی بشدة الظهور! یا من احتجب بعظمة الکبریاء!

ئەی بەتوانای شکۆمەند و خاوەن توانستی ڕەها!

من بەهۆی وانە و دەرسی قورئان و فێرکاری‌یەکانی پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ تێ‌گەیشتم لەوەی کە:

هەروەك ئاسمانەکان و ئەستێرەکان شایەتی لەسەر "بوون" و "تاکی"ی تۆ دەدەن.. بە هەمان جۆر بۆشایی و بەرزایی ئاسمانیش، لە ڕێی: هەور و، بروسکە و، هەورەگرمە و، با و، بارانەکانیانەوە، هەموو شایەتی لەسەر "بوون" و "تاکی"ت دەدەن.

بەڵێ، هەر تەنها بە میهرەبانی و توانستی تۆیە کە هەوری بێ هەست و گیان بارانی مایەی ژیان بە هانای زیندەوەرانی پەککەوتە و بێچارەوە دەنێرێت و، هەرگیزاو هەرگیز "ڕێکەوت"ی کتوکوێر دەستی لەم کارەدا نی‌یە.

"بروسکه و چەخماخە"ش کە خۆی لە خۆیدا وزەیەکی مەزنی کارەبایە، بە ڕووناکی و درەخشانییەکەی خۆی شەوق و گەرموگوڕی دەکات بە بەر گرۆی مرۆڤدا تاکو کەڵك لە سوودە نوورانییەکانی ببینن.. هەروەك بە جوانترین شێوەش توانستی کارامەی تۆ لەناو بۆشایی ئاسماندا بە ڕووناکی پێشچاو دەخات.

"هەورە گرمە"ی مژدەبەخشی بارانیش کە بە تەسبیحاتی خۆی بۆشایی فراوانی ئاسمان دەخاتە گۆ و هەموو لایەکی ئاسمان دەلەرێنێتەوە، ئەویش تەسبیح و تەقدیست پێشکەش دەکات و، بە زمانی گوفتار شایەتی لەسەر پەروەردگارێتیی تۆ دەدات.

"با"یش کە لە چەندین کارمەندی و ئەرکی جۆراو جۆردا گوێڕایەڵ کراوە و خراوەتەکار، وەك: هەڵگرتنی زۆربەی ڕزق و ڕۆزییە پێویستەکانی ژیانی زیندەوەران و ئاسانترینیان لە بەکارهێنان و سوود لێ وەرگرتندا و، بەخشینی هەناسە و حەوانەوە بە دەروونەکان و، گەلێ کارمەندی و ئەرکی تر.. ئەم "با"یەی کە ئەمانە هەندێکن لە ئەرکەکانی سەرشانی، ئاماژە بۆ کارامەیی توانستی تۆ دەکات.. ئنجا لەو ڕێگایەشەوە کە هەمیشە و لەبەر دانستێك و، بە وێنەی تابلۆی کوژانەوە و تێدا نووسین، ئاڵوگۆڕ لە بەرزایی و بۆشایی ئاسمان دەکات و ئەو مەبەستەی بیەوێ بیگەیەنێت تیایدا دەینووسێت و پاشان دوای ئەوەی مەبەستەکەی ڕاگەیاند، دەیکوژێنێتەوە.. بەم کارەشی شایەتی لەسەر: "بوون"ی تۆ دەدات.

ئەو "میهرەبانی"یەش(باران) کە بە سۆز و بەزەیی خۆت لە هەورەکانەوە دۆشراوە و بۆ زیندەوەران ڕەوانە کراوە، بە وشەی: دڵۆپە سازگار و نیان و هاوسەنگ و ڕێکوپێکەکانی خۆی، شایەتی لەسەر فراوانیی سۆز و "میهرەبانی"ی تۆ دەدات.

یا متصرف یا فعّال! یا فیّاض یا متعال!

هەروەك بە جیاجیا و یەك بە یەك: (هەورە بروسکە و، با و، باران و، هەورە گرمە) شایەتییان لەسەر "پێویستیی بوون"ی تۆ دا.. هەر هەموشیان پێکەوە ئاماژەیەکی یەکجار بەهێز بۆ "تاکی"ی تۆ دەکەن. ئەمەش لە ڕێی: یەکگرتن و بەیەکەوە هاتن و تێهەڵکێش بوون و پشتگیرییانەوە بۆ یەکتری، هەرچەندەش جۆرەکانیان لە یەکترەوە دوورە و ماهییەتیشیان لە یەکتر جیایە!

جا هەروەك ئەو توخمانەی بەرزایی ئاسمان بە پڕبوون و خاڵیبوونەوەی چەند جارەیان – تەنانەت لە تەنها یەك ڕۆژدا – بۆشایی فراوانی ئاسمانیان کردووە بە کۆگا و

مەحشەری شتانی سەرسووڕهێن و، لەم ڕێیەوە شایەتی لەسەر "شکۆمەندیی پەروەردگاریتی"یەکەت دەدەن.. بە هەمان جۆر شایەتیش دەدەن لەسەر "مەزنیی توانست"ە دەست بەکارەکەت و هەمەلایەنگریی ئەو توانستەت بۆ هەموو شتێك کە توانستێکی وەهایە بەرزایی فراوانی ئاسمان بە وێنەی تابلۆی نووسین دەنووسێت و ئاڵوگۆڕ لەو نووسینەدا دەکات و، هەورەکان دەگووشێت تاکو بە ئاوێکی سازگار باخچەی زەویەیان پێ ئاودێری بکات.. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو توخمانە دەشبن بە بەڵگە لەسەر: فراوانیی ڕەهای "میهرەبانی" و "فەرمانڕەوایی"یەکەت و ئامادەبوون و توانا و دەستەڵاتیان لە هەموو شتێکدا و خستنەگەڕ و خولانەوەی سەرانسەری گۆی زەوی و گشت بەدیهاتووان لە ژێر پەردەی بۆشایی ئاسماندا.

ئەو "هەوا"یەش کە بەناو ئەم بۆشاییەدا بڵاو بووەتەوە، بە هەمان جۆر و بە چەشنێکی دانایانە لە چەندین ئەرکدا بەکار دەهێنرێت و.. "هەور" و "باران"ەکانیش بە جۆرێکی زانایانە لە چەندەها سوودی زۆر و زەبەندەدا دەخرێنەکار، بە چەشنێك کە ئەگەر زانستێکی هەمە لایەنگر و دانستێکی گشتگیری هەموو شتێك لە گۆڕێدا نەبوایە، هەرگیز ئەو بەکارهێنانە دانایانە و خستنەکارە زانایانە نەدەگونجا ڕوو بدات!

یا فعّال لما یرید!

دەرخستن و پیشاندانی نموونەی حەشر و قیامەت کە هەموو کاتێك بە کارایی خۆت لە بەرزایی و بۆشایی ئاسماندا پێش‌چاوی دەخەیت و، لە ماوەی یەك سەعاتدا هاوین بە زستان و، زستان بە هاوین دەگۆڕیت و لە غەیبەوە جیهانێك دەهێنیت و جیهانێکی تریشی بە دوادا ڕەوانە دەکەیت و، شتانی تری هاوچەشنی ئەمانە ئەنجام دەدەیت کە کاروباری توانستی دیار و بەرچاوی تۆن، هەموو ئەمانە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە: ئەو "توانست"ەی تۆ دنیا دەگۆڕێت بە ئاخیرەت و چەندین کاروباری هەمیشەیی لە دوارۆژدا پێش‌چاو دەخات.

ئەی خاوەن توانای شکۆمەند!

"با" و "هەوا" و "هەور" و "بروسکە" و "هەورە گرمە" و "باران"ی ناو بۆشایی و بەرزایی ئاسمان.. هەر هەموویان، ملکەچ و کارمەندن لە موڵکی تۆدا و، بە فەرمان و هێز و توانای تۆ کارەکانی ئەستۆیان ڕادەپەڕێنن.. کەواتە بەدیهاتووانی ناو ئەم

بۆشایی‌یە، هەرچەندەش ماهییەتیان لە یەكتر دوور و جیایە. كەچی هەر هەموویان تەسبیحات و ستایشی فەرمانڕەواكەیان دەكەن كە بۆ چەندەها فەرمانی كتوپڕی و لەوپەڕی خێرایی و چەندین فەرماندەری بە پەلە و خێرادا ملكەچی كردوون.

* * *

ئەی بەدیهێنەری شكۆمەندی ئاسمانەكان و زەوی!

وا من ئیمانم هێنا و بەهۆی فێركاری‌یەكانی قورئانە حەكیمەكەت و دەرس و ڕێنمایی‌یەكانی پێغەمبەرە خۆشەویستەكەتەوە ﷺ تێ گەیشتم كە:

هەروەك ئاسمانەكان بە ئەستێرەكانیەوە و، حەوا و بۆشایی لای سەرەوەشمان بە شتانی ناویەوە، شایەتی لەسەر "پێویستیی بوون" و "یەكتایی" تۆ دەدەن.. بە هەمان جۆر گۆی "زەوی"یش بە هەموو بەدیهاتووانی ناوی و بارودۆخەكانیەوە و بە ژمارەی بەدیهاتووەكانی: ئاماژە دەكات و شایەتی دەدات لەسەر: "بوون" و "یەكتایی" تۆ.

بەڵێ، هەر ئاڵوگۆڕێكی هەمەكی یان هەندەكی لە "زەوی"دا ڕوو بدات، وەك: بەرگ و پۆشاك گۆڕینی ساڵانەی درەخت و زیندەوەرانی ناوی، هەریەكەیان، بە ڕێكوپێكیی خۆی: ئاماژە بۆ "بوون" و "تاكی"ی تۆ دەكات.

هەرچی زیندەوەریش هەیە، بەو ڕۆزی‌یەی خۆی – كە بە میهرەبانی و سۆزەوە بۆی دەهێنرێت – و لە ڕێی كۆئەندامە پێویستەكانی ژیانی – كە تیایدا دانراون – و هەریەكەشیان بەپێی لاوازی و ئیحتیاجی خۆی، شایەتی لەسەر "بوون" و "تاكی"ی تۆ دەدەن.

هەرچی ڕووەك و زیندەوەریش هەن، كە هەموو بەهارێك لە بەرچاوی خۆماندا بەدی دەهێنرێن، لە ڕێی سنعەتی سەرسووڕهێن و ئارایشتی ناسك و نیان و جیاوازیی تەواوەتی و ڕێكوپێكی و هاوسەنگیی خۆیەوە، تۆ بە خاوەن هەستان دەناسێنێت.. چونكە بەدیهێنانی موعجیزاتی توانستی تۆ كە ڕووی زەوی‌یان پڕ كردووە و ناوی "ڕووەك" و "ئاژەڵ"یان لێ نراوە، لە: هێلكە و گەرا و دڵۆپە ئاوەكان و ناوك و ناوكۆكەكان، بە چەشنێكی كاملی ڕێكوپێك و ڕازاوە و جیاكراوە لە یەكتر بە چەندین نیشانەی جوداكەرەوە، هەرچەند ماددەكانیشیان یەكە و دەستنیشان كراوە و لە یەك دەچن.. شایەتیدانی ئەم كارە لەسەر: "بوون" و "تاكی" و "دانست" و "توانست"ی

ڕەهای بەدیهێنەرە داناکەیان، گەلێ درەخشان و بەهێزترە لە شایەتیدانی "ڕووناکی" لەسەر "خۆر"!

هەروەها هەرچی توخمی وەك "ئاو" و "هەوا" و "ڕووناکی" و "ئاگر" و "گڵ" هەن، لەو ڕووەوە کە هەرچەند خۆشیان بێ هەست و نەستن، کەچی کارمەندیی کامڵ و تەواوەتی ئەنجام دەدەن و، گەلێ داهات و بەروبوومی جۆراوجۆر بەوپەڕی ڕێکوپێکی لە گەنجینەی غەیبەوە دەهێنن، هەرچەندەش بۆ خۆیان توخمێکی سادە و ساکارن و سنووری یەکتر دەشکێنن و ڕێکوپێکییان تێدا نییە و لە هەموو شوێنێکدا پەرش و بڵاون.. جا ئەم توخمانە لەم ڕێیەوە شایەتی لەسەر "بوون" و "تاکی"ی تۆ دەدەن.

ئەی بەدیهێنەری بە توانا! ئەی فەتتاحی زانا! ئەی بەدیهێنەری کارا!

ئەی خواوەندی تاك و تەنیا و حەننان و مەننان و بەخشەر و ڕۆزیدەر!

هەروەك گۆی زەوی، بە سەرجەمی دانیشتووانی، شایەتی دەدات لەسەر ئەوەی کە بەدیهێنەرەکەی "واجب الوجود"ە.. بە هەمان جۆر ئەم گۆی زەوییە بەو تەمغە و مۆرەش کە بەسەر ڕوخساری خۆیەوە دیارە و بەو تەمغە و مۆرانەش کە بەسەر ڕووی دانیشتووانیەوەن و، لە ڕووی: یەکێتی و یەکگرتن و تێهەڵکێشبوون و هاوکاریی نێوانیان و یەکبوونی ناوەکانی پەروەردگارێتی و ئەو کارانەش کە ڕوویان لە سەرجەمی ئەو ناوانەیە.. بە هەموو ئەمانە، چەندەها شایەتیی بەڵگەنەویستی بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەران لەسەر: "تاك" و "تەنیایی" تۆ دەدەن.

ئنجا هەروەك "زەوی" بەم بارودۆخەی کە وەك سەربازگە و پیشانگا و مەیدانی مەشق وایە و، بەوەش کە تۆ چەندین کەرەسە و کۆئەندامی ڕێکوپێك و جیا جیا و جۆراوجۆرت بە چوارسەد هەزار نەتەوەی جیاجیای ڕووەك و ئاژەڵەکانی ناو زەوی بەخشیوە، شایەتی لەسەر: "مەزنی و شکۆمەندیی پەروەردگارییەکەت دەدات.. بە هەمان جۆر، ڕۆزییە جۆراوجۆرەکانی زیندەوەرە لەسنووربەدەرەکانیش کە لە گڵێکی وشکی سادەوە پەیدا دەبن و بەوپەڕی بەخشندەیی و میهرەبانی و لەکاتی خۆیاندا بۆ یەك بە یەکی زیندەوەران ڕەوانە دەکرێن و، ملکەچی و گوێڕایەڵیی تەواوەتیی ئەو تاك تاك و دانە دانە لەسنووربەدەرانە بۆ فەرمانەکانی پەروەردگار.. هەموو ئەمانە، "شمووڵی میهرەبانی"ی تۆ بۆ هەموو شتێك و "هەمەلایەنگریی فەرمانڕەوایەتی"یەکەشت سەبارەت بە هەموو شتێك، دەردەخەن..

هەروەها بەڕێوەبردنی کاروانەکانی ئەو بەدیهاتووانەی ناو زەوی کە هەمیشە دووچاری ئاڵوگۆڕ دەبن، پاشان بە دوای یەکدا هێنانیان لە ڕێی مردن و ژیانەوە.. هەروەها بەڕێوەبردن و کارسازیی کاروباری زیندەوەران و ڕووەکەکان کە ئەگەر لە ڕێی "زانست"ێکی پەیوەندیدارەوە نەبێت بە هەموو شتێك و بەهۆی "دانست"ێکی بێ کۆتاییەوە نەبێت کە لە هەموو شتێکدا فەرمانی خۆی ڕایی بکات، هەرگیز ناکرێت ئەنجام بدرێت.. ئەم کارە، بەڵگەیە لەسەر "گشتگیریی زانست و دانست"ی تۆ..

هەروەها ئەم گرنگییە مەزن و، بەخششە بێ سنوور و، درەوشانەوە پەروەردگارییە ڕەها و، گوفتارە سوبحانییە نەبڕاوە و، چاکەکارییە خواییە بێ کۆتاییانەی تایبەت کراون بەم مرۆڤەی کە جڵەوی هەڵسوکەوت تێدا کردنی بوونەوەرانی ناو زەویی لەدەستدایە و، لە ماوەیەکی کەمی ژیاندا گەلێ ئەرکی بێسنووری لە ئەستۆ نراوە و چەندین توانا و لێهاتن و کۆئەندامی مەعنەویی ئەوتۆشی پێ دراوە کە بۆ ژیانێکی درێژ و کاتێکی بێسنوور ئامادەی بکەن.. بێ گومان هەموو ئەوانەی کە بەم مرۆڤە دراوە، تەنها بۆ ئەم قوتابخانەیەی دنیا و سەربازگەی زەوی و پیشانگا کاتییەکەی ئەم جیهانە نییە و بەم تەمەنە کورت و تەماوی و پڕ لە خەم و پەژارەیەوە بەند نییە و بەم ژیانە لێڵ و جیهانە فانییە پڕ لە بەڵا و گیروگرفتە زۆرانەوە نەبەستراوە.. بەڵکو هەموو ئەوانە - بە بێ گومانی - ئاماژە بۆ تەمەنێکی تری هەمیشەیی و بەختەوەرییەکی باقیی هەتاهەتایی و چەندەها بەخشش و چاکەکاریی قیامەتییانەی جیهانی مانەوە دەکەن، تەنانەت شایەتیشی لەسەر دەدەن.

دەسا ئەی بەدیهێنەری هەموو شتێك!

هەرچی بەدیهاتووی ناو زەوی هەن، هەر هەموویان لەناو موڵکی تۆ و زەویی تۆدا و، بە هێز و توانا و ویست و زانست و دانستی تۆ، بە ملکەچی و گوێڕایەڵییەوە، بەڕێوە دەبرێن و دەخرێنە کار!

ئەو "پەروەردگارێتی"یەی کە کارایییەکەی بە ڕووی زەوییەوە دەبینرێت، "گشتگیری" و "هەمەلایەنگری"ی پێوە دیارە، چونکە بەڕێوەبردن و کارسازی و پەروەردەکاریی ئەو پەروەردگارێتییە بە هەستیارییەکی ئەوتۆیە کە لەوپەڕی کەماڵدایە و، ئەو کاربەڕێ کردنانەش کە بە پەرش و بڵاوی لە هەموو جێیەکدا دەست بەکارە، لە چوارچێوەی یەکێتی و بەیەکەوە بوون و لەیەکچوونێکی وەهادایە کە

دەزانرێت ئەم کارە: پەروەردگاریێتی و هەڵسوکەوتێکی هەمەکیی ئەوتۆبە هەرگیز لەتکردن هەڵناگرێت و، لە حوکمی هەمەکی‌یەکی وەهایشدایە کە هەرگیز نەگونجێ دابەش بکرێت.

بەم جۆرە، گۆی زەوی بە خۆی و سەرجەمی دانیشتووانیەوە و بە چەندەها زمانی پاراوی بێ‌سنووری ڕوون و ئاشکراتر لە زمانی گوفتار، تەسبیح و تەقدیسی بەدیهێنەری خۆی دەکات و سوپاسی ڕۆزیدەرە شکۆمەند و مەزنەکەی دەردەبڕێت و، بە چەندین زمانی حاڵیش کە بە ژمارەی نیعمەتە لە ژمارەنەهاتووەکانی دەبن، ستایشی ڕۆزیدەرەکەی ڕادەگەیەنێت.

سبحانك يا من اختفى بشدة الظهور! سبحانك يا من احتجب بعظمة الكبرياء!

لەگەڵ هەموو تەقدیس و تەسبیحێکی زەویدا کە پاکی و خاوێنیی تۆ لە ناتەواوی و دەستەوسانی و هاوبەش دەردەبڕێت، منیش تەقدیس و تەسبیحت پێشکەش دەکەم و.. هاودەم لەگەڵ هەموو حەمد و سەنایەکی زەویدا، حەمد و سەنای خۆمت ئاراستە دەکەم.

* * *

ئەی پەروەردگاری دەریا و وشکایی‌یەکان!

من بەهۆی وانە و دەرسەکانی قورئانی پیرۆز و لە ڕێی فێرکاری‌یەکانی پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ، فێربووم کە:

هەروەك ئاسمانەکان و بۆشایی(فضاء) و گۆی زەوی، شایەتی لەسەر "یەکتایی" و "بوون"ی تۆ دەدەن.. بە هەمان جۆر دەریا و جۆگە و ڕووبار و کانیاوەکانیش شایەتی‌یەکی ئەوتۆ لەسەر "پێویستیی بوون" و "یەکتایی"ت دەدەن کە لە پلەی بەداهەت و بەڵگەنەویستیدایە.

بەڵێ، هەرچی شت هەیە، تەنانەت هەموو دڵۆپە ئاوێکی دەریاکانی ئەم دنیایەمان کە سەرچاوەی شتانی سەرسووڕهێنن و وەك مەنجەڵی هەڵم وان، بە "بوون"ی خۆیان و لە ڕێی: ڕێکوپێکی و سوود و بەرژەوەندی و بارودۆخەکانیانەوە، بەدیهێنەری خۆیان بە خاوەن هەستان دەناسێنن.

هەموو یەکێکیش لەو بەدیهاتووە نامۆیانەی کە ڕزق و ڕۆزیی تەواوەتیی خۆیان لە گڵ و ئاوێکی سادە و ساکارەوە بۆ ڕەوانە دەکرێت و.. هەموو گیانلەبەرێکیش لەو

زینـدەوەرە دەریاییانـەی كـە لەوپـەڕی بەدیـهاتنی كـامڵ و ڕێكوپێكیـدان، بـە تایبـەت "ماسی"یەكان كە هەریەكەیان یەك ملیۆن گەرا دادەنێت و دەریاكانی پێ دەڕازێنێتـەوە.. هەموو یەكێك لەمانە، ئاماژە بۆ بەدیهێنەری خۆی دەكات. هەروەك لە ڕێی بەدیـهاتنی و، ئەركـەكانی سەرشـانی و، بـەڕێوەبردنی و، ژیـاندنی و، سـازاندنی كاروبارەكـانی و، پەروەردەكردنیشیەوە شایەتی لەسەر "ڕۆزیدەر"ەكەی دەدات..

هـەروەها هـەموو یـەكێك لەگەوهـەرە بەنرخـەكانی نـاو دەریـا و مرواریـیـە ڕازاوە گرانبەهاكانی، كە دارای گەلـێ تایبەتكاریی گرنگن، لە ڕێی بەدیهاتنی جـوان و سـەرنج بزوێنیـەوە و بـەو تایبەتكارییـە سوودبەخشـەی كـە تیایدایـە، تـۆ دەناسێت و بـە غـەیری خۆیشی دەتناسێنێت.

بەڵێ، هەروەك یەك بە یەك و دانە دانەی ئەو گەوهەرانـە ئـەم شـایەتییانە دەدەن.. هـەر هەموو شـیان پێكـەوە و بـە هـەمان جـۆر لـە ڕێـی: یەككـەوتنی نێوانیـان و، ئاوێتـە و تێهەڵكێشبوونیان لەگەڵ یەكتریدا و، یەكبوونی تەمغە و مۆری بەدیـهێنان بەسـەر هـەموو یەكێكیانەوە و، ئەوپەڕی ئاسانی لە بەدیهێنانیاندا و، لە ڕێی زۆری و زەبەندەیی شیانەوە، شایەتی لەسەر "یەكتایی" تۆ دەدەن.

پاشـان هەڵواسـینی زەریاكـانی دەورانـدەوری زەوی هـاودەم لەگـەڵ وشـكاییە فراوانەكەی، بە ئاسماندا و مەلەكردنی بە دەوری خۆردا، بـێ ئـەوەی ئاوەكانیـان بـەم لا و ئەو لادا بڕژێـن و پەرتـەوازە بـبن، یـان لـە شـوێنی خۆیـاندا بـترازێن و وشـكاییەكان داپۆشن.. هەروەها بەدیهێنانی زیندەوەرە ڕێكوپێك و جۆراوجۆرەكان و گەوهەرەكانی ناوی لـە ئـاوێكی سادە و لێكـی ئاسایی.. هـەروەها بـەڕێوەبردنی هەمـەكی و تـەواوەتیی ڕۆزی و سـەرجەم كاروبارەكـانی تـری ئـەو بەدیهاتووانـە و سـازاندنی كاروباریـان و خاوێنكردنەوەی پێویستی ڕووی ئەو دەریایانە لە تەرمە لەژمارەنەهاتووەكان.. هەموو ئەم كارانە و بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەرەكانی ناو دەریا، شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی كە تۆ هەیت و "واجب الوجود"یت.

ئنجا هـەروەك دەریاكـان بەڵگەیـەكی ئاشـكران لەسـەر: شـكۆمەندیی دەسـتەڵاتی پەروەردگاریتییەكەت و مەزنیی توانستە هەمەلایەنگرەكەت.. بە هەمان جـۆر دەشـبن بـە بەڵگە لەسەر "فراوانیی ڕەهای میهرەبانی و فەرمانڕەوایی" تۆ كە بەسـەر هـەموو شتێكدا

زاڵن و بە هانای هەموو شتێکەوە دەڕۆن، هەر لە ئەستێرە گەورە و ڕێکوپێکەکانی ناو بەرزایی ئاسمانەکانەوە تا دەگاتە ماسی‌یە بچووکەکانی ناو قووڵایی دەریاکان، کە بەوپەڕی ڕێکی ژیانیان بەڕێوە دەبرێت.. هەروەها بە ڕێکوپێکی و سوود و بەرژەوەندیی خۆیان و لە ڕێی ئەو دانستەی کە تیایاندایە و ئەو تەرازوو و کێش و هاوسەنگی‌یەش پێیانەوە دیارە، ئاماژە بۆ "زانست"ی تۆ دەکەن کە دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە و بۆ "دانست"ەکەشت کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە.

هەروەها بەدیهێنانی ئەم چەشنە گۆم و حەوزانەی "میهرەبانی" بۆ ئەم مرۆڤە میوانەی ناو میوانخانەی دنیا و ملکەچ کردنیشیان بۆ کەشتی و بەرژەوەندی‌یەکانی مرۆڤ، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە: ئەو کەسەی بەم سەخاوەتە مەزنەی دیاری و بەخششی دەریاکان، تەنها بۆ ماوەی یەك شەو ڕێزی ئاوای لە میوانەکانی نابێت، لەو خانەی حەوانەوەیەدا کە لەسەر ڕێی گەشت و سەفەریاندا بۆی بنیات‌ناون.. دەبێ لە بارەگای دەستەڵاتداریی هەمیشەیی خۆیدا هێندە دەریای فراوان و هەمیشەیی بۆ ئامادە کردبن کە ئەم دەریا بینراوەی ئێرە لەچاویاندا تەنها بە چەند نموونەیەکی بچووك و فانی دابنرێت.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە ئەم شێوە دەراسا و بارودۆخە سەرسوورهێنەرەی دەریاکان بە چواردەوری زەویدا و، بەڕێوەبردن و پەروەردە کردنی یەکجار ڕێکوپێکی بەدیهاتووانی ناوی، بە ئاشکرا ئەوە دەردەخات کە هەر هەموویان لەناو موڵکی تۆدا ملکەچ کراون و، تەنها بە: فەرمان و هێز و توانست و بەڕێوەبردن و کارسازیی تۆ کار دەکەن و بەڕێوە دەچن. کەواتە هەموویان بە زمانی حاڵ تەقدیسی تۆ دەکەن و دەڵێن: "ألله أكبر"!

* * *

ئەی ئەو کەسەی کە چیاکانی کردووە بە مێخ و گەنجینەی کەشتیی گۆی زەوی!
ئەی خاوەن توانای شکۆمەند!

من لە ڕێی فێرکاریی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و بەهۆی وانە و دەرسەکانی قورئانە حەکیمەکەتەوە، تێگەیشتم لەوەی کە:

هەروەك "دەریاكان" لە ڕێی شتانی نامۆ و سەرسووڕهێنەریانەوە تۆ دەناسن و بە غەیری خۆشیان دەتناسێنن.. بە هەمان جۆر "چیاكان"یش لە ڕێی: خزمەتگوزاری و حیكمەتە زۆرەكانیانەوە دەتناسن و بە غەیری خۆشیانت دەناسێنن. ئەوەتا "چیاكان" دەبن بەهۆی نەجوولان و نەڕووخانی زەوی بە كاریگەریی بوومەلەرزەكان و.. گۆی زەوی لە هەڵچوون و ئاڵوگۆڕەكانی ناوەوەی هێور دەكەنەوە و لە تۆفان و لافاوی دەریاكانیش دەیپارێزن و.. "هەوا" لە گازە زیانبەخشەكان پاڵفتە دەكەن و.. چاودێری و پارێزگاری و پاشەكەوت كردنی "ئاوەكان" دەخەنە ئەستۆیانەوە و.. بە وێنەی عەمبار كانزا سوودبەخش و پێویستەكانی زیندەوەرانیش لە خۆیاندا هەڵدەگرن..

بەڵێ، هەموو جۆرە بەردێكی چیاكان و، هەموو بەشێكی ئەو ماددانەش كە مایەی شیفا و چارەسەریی نەخۆشی و دەردە جۆراوجۆرەكانن و، گشت ڕەگەزێكی كانزا جیاجیاكان كە زیندەوەران، بە تایبەت مرۆڤ، پێویستیان پێیانە و، هەموو جۆرێكی ئەو ڕووەكانەش كە بە گوڵ و بەروبوومەكانیان چیا و دەشتاییەكانیان ڕازاندووەتەوە.. هەر هەموویان، بە ئاشكرا و بەڵگەنەویستی شایەتی لەسەر: "پێویستیی بوون"ی بەدیهێنەرێك دەدەن كە خاوەنی توانست و دانست و میهرەبانی و بەخشندەیی‌یەكی نەبڕاوە بێت، ئەمەش لە ڕێی ئەو دانست و ڕێكوپێكی و جوانیی بەدیهاتن و سوود و بەرژەوەندی‌یانەی كە تیایاندایە و هەرگیز ناكرێت بە هی "ڕێكەوت" دابنرێن و، بە جیاوازیی زۆر و زەبەندەی تام و چێژەكانیان، بە تایبەت لە مادده كانزاییەكانی وەك: خوێ و لیمۆندۆزی و سەلفات و زاخدا، كە بە ڕواڵەت لە یەك دەچن و، لە ڕووەكەكانیشدا كە جۆرەكانیان تابڵێی زۆر و جیاجیایە و گوڵ و بەروبوومەكانیشیان جۆراوجۆرە، هەرچەندەش هەموویان لە گڵێكی سادە و ساكارەوە بەدیهێنراون. ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە هەر هەموویان بەو: یەك بەرێوەبردن و، یەك كارسازی و، یەك شوێنی گەشەكردن و، یەك خانەولانە و، یەك بەدیهاتن و، بەو یەكسانی‌یەی كە لە ڕێكوپێكیی هەموویاندا هەیە، هاودەم لەگەڵ ئەو هەرزانی و ئاسانی و زۆری و خێرایی‌یەش كە لە بەدیهێنانیاندایە.. شایەتی لەسەر: "تاك و تەنیایی" بەدیهێنەریان دەدەن.

هەروەها بەدیهێنانی هەموو جۆرێكی بەدیهاتووانی ناوەوە و سەر ڕووی زەوی، كە لە هەموو لایەكی زەویدا پەرش و بڵاون، لە یەك كاتدا و بە یەك شێوە و بەوپەڕی كەماڵ و

خێرایی و بێ هیچ هەڵە و تێکەڵبوونێك و بێ ئەوەش هیچ کارێك ڕێی کارێکی تری لێ بگرێت، هەرچەندەش لەگەڵ جۆرەکانی تردا چوون بەناو یەکتریدا و تێکەڵی یەکتر بوون.. ئەم کارە، بەڵگەیە لەسەر: سام و شکۆی پەروەردگارێتی‌یەکەت و مەزنیی توانستەکەت کە هیچ شتێکی بەلاوە قورس و گران نی‌یە.

هەروەها پڕکردنی ڕووی دەرەوەی چیاکان بە درەخت و ڕووەك و دیوی ناوەوەشیان بە کانزا ڕێکوپێکەکان و، ملکەچ کردنی هەمووشیان بۆ بەدەمەوەچوونی پێداویستی‌یەکانی سەرجەمی زیندەوەران، بە چەشنێك کە چارەسەر کردن و شیفای نەخۆشی‌یە جۆراوجۆرەکانیان و، تەنانەت هێنانەدیی خواستی تام و چێژە جیاجیاکانیشیان دەستەبەر دەکات و، حەز و ئارەزووە لەیەك نەچووەکانیشیانی پێ تێر و دڵنیا دەبێت.. ئەم کارە، بەڵگەیە لەسەر: فراوانیی ڕەها و نەبڕاوەی میهرەبانی و فەرمانڕەوایەتی‌یەکەت.

هەروەها ئامادەکردنی شتانی پەنهان و تێکەڵ و پێکەڵ لە تاریکستانی چینەکانی گڵدا، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و زانایی و بینایی و بێ سەر لێ شێوان و لە کاتی پێویستدا و بەپێی پێویست.. بەڵگەیە لەسەر: گشتگیریی زانستەکەت کە پەیوەندیی بە هەموو شتێکەوە هەیە و، هی زانستەکەشت کە هەموو شتێك دەگرێتەوە و ڕێکی دەخات.

هەروەها ئامادەکردنی دەرمانەکان و پاشەکەوت کردنی ماددە کانزایی‌یەکان، بە ئاشکرا ئاماژە دەکات و بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر: جوانیی کارسازی‌یەکانی پەروەردگارێتی‌یە میهرەبان و بەخشندەکەت و، لەسەر: نەرم و نیانیی چاودێری‌یە پاشەکەوت کراوەکەت.

هەروەها بەکارهێنانی چیا بەرزەکان لە شێوەی چەند گەنجینەیەکی ڕێکوپێك و پێویستدا بۆ ژیانی ئەو میوانانەی دێنە ناو میوانخانەی زەوی و، بۆ دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی ئایندەیان.. بەڵگەیە و ئاماژە دەکات، تەنانەت شایەتیش دەدات لەسەر ئەوەی کە: بەدیهێنەرێك ئەم کەرەمە فراوانەی هەبێت و، پەروەردگارێکی بەخشندە و دانا و میهرەبان و بەتوانای ئەوتۆ کە ئەم گەنجینانە بەم جۆرە پاشەکەوت بکات، دەبێ لە جیهانێکی تری هەتاهەتاییدا چەندین گەنجینەی نەبڕاوەی نیعمەتە هەمیشەیی‌یەکانی خۆی

بۆ ئەو میوانە خۆشەویستانەی خۆی ئامادە کردبێت و، ئەو گەنجینانەش هەمان ئەرکیان لە ئەستۆدا بێت کە "چیاکان" لێرەدا لە ئەستۆیان گرتووە.

دەسا ئەی خواوەندی بەتوانا بەسەر هەموو شتێکدا!

چیاکان و سەرجەمی بەدیهاتووانی ناویان بە "هێز و توانست و زانست و دانست"ی تۆ و لە "مولك"ی تۆدا ملکەچ و پاشەکەوت کراون و، تەسبیح و تەقدیسی ئەو بەدیهێنەرەیان دەکەن کە لەسەر ئەم شێوەیە گوێڕایەڵی کردوون و خستوونیەتە کار.

* * *

ئەی بەدیهێنەری بەخشندە و پەروەردگاری میهرەبان!

من لە ڕێی فێرکاریی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و بەهۆی وانە و دەرسەکانی قورئانی حەکیمەوە، تێگەیشتم لەوەی کە:

هەروەك ئاسمان و، بۆشاییەکەی و، زەوی و، دەریا و، چیاکان، بە خۆیان و بەدیهاتووانی ناویانەوە، دەتناسن و بە غەیری خۆیانت دەناسێنن.. بە هەمان جۆر و تا پلەی بەداهەت و بەڵگەنەویستی، درەخت و ڕووەکەکانی زەویش لە ڕێی گەڵا و گوڵ و بەروبوومەکانیانەوە دەتناسن و تۆ بە غەیری خۆیان دەناسێنن. چونکە هەموو گەڵایەکی ئەو درەخت و ڕووەکانەی کە بە جەزبە و شەوقی زیکری تۆ دەلەرێنەوە و.. یەك بە یەکی ئەو گوڵانەش کە بە جوانی و ئارایشتی خۆیان وەسفی ناوەکانی بەدیهێنەرەکەیان دەکەن و.. هەموو بەرێکی درەختەکانیش کە بەهۆی دەرکەوتنی میهرەبانیی خواوەندەوە تیایاندا، خەندەی ناسك و نیانیان لەسەر لێوە..

هەموو ئەمانە، بە: ڕێسای ناوازەی بەدیهاتنیان و، تەرازووکاریی ناو ڕێساکەیان و، ئارایشت و جوانیی ناو ئەو تەرازووە و، نەخشونیگاری ئەو ئارایشت و جوانییە و، بۆن و بەرامەی خۆش و جۆراوجۆری ئاوێتەی ئەو نەخشونیگارانە و، بەو تام و چێژە جیاجیایانەش کە لە بۆن و بەرامەی بەروبوومەکاندان، شایەتییەکی ئەوتۆ دەدەن کە لە پلەی بەداهەت و بەڵگەنەویستیدایە و هەرگیز ناکرێت بدرێتە پاڵ "ڕێکەوت"، لەسەر: "پێویستیی بوون"ی بەدیهێنەرێکی ئەوتۆ کە بەخشندەیی و میهرەبانییەکەی کۆتایی نەبێت.

جا هەروەك یەك بە یەكی درەخت و ڕووەكەكان بەم جۆرە شایەتی دەدەن، هەر هەمووشیان پێکەوە و بە چەشنێکی بەدیهی شایەتی لەسەر: "پێویستیی بوون" و "تاك و تەنیایی" ئەو بەدیهێنەرە دەدەن، ئەمەش بەوەی كە هەموویان لەسەر ڕووی زەویدا هەر یەك شت و یەك چەشنە ڕووەك و درەختن و، وەكو یەك وان و، پێکەوە پەیدا دەبن و، تەمغە و مۆری بەدیهێنانی هەموویان لە یەك دەچێت و، لە كارسازی و بەڕێوەبردنیاندا پەیوەندییان بە یەكەوە هەیە و، لە نێوان خۆیشیاندا وەكو یەك وان لە كارەكانی: بەدیهێنان و، تیادەركەوتنی ناوە پەروەردگارییەكان و، بەڕێوەبردنی دانە دانە و تاكە لە ژمارەبەدەرەكانی سەد هەزار جۆری ڕووەكدا بە چەشنێکی ڕاستەوخۆ و بێ هەڵە و سەر لێ شێوان، هەرچەندەش تێکەڵ و پێکەڵی یەكترین.

پاشان هەروەك هەموو ئەوانە شایەتی لەسەر "پێویستیی بوون" و "تاكی"ی تۆ دەدەن. بە هەمان جۆر: ژیاندن و بەڕێوەبردنی تاكە لە ژمارەبەدەرەكانی سوپای زۆر و زەبەندەی زیندەوەرانیش كە لە چوارسەد هەزار نەتەوەی ڕووی زەوی پێکهاتوون، بە سەدان هەزار جۆری ژیاندن و بەڕێوەبردن، بەوپەڕی ڕێکی و بێ هیچ هەڵە و تێکەڵی و لێ ئاڵۆزبوونێك.. ئەم كارە، بەڵگەیە لەسەر:

شكۆمەندیی پەروەردگارێتییەكەت و، سام و هەیبەتیشی لە "تەنیایی"یەكەتدا و، لەسەر مەزنیی توانستەكەشت كە پەیوەندیی بە هەموو شتێکەوە هەیە و بە ئەندازەی ئاسانیی بەدیهێنانی تاقە گوڵێك وەرزی بەهار بەدی دەهێنێت و. هەروەك دەشبێت بە بەڵگە لەسەر: فراوانیی میهرەبانییە ڕەهاكەت كە جۆرە جیاجیا و بێ سنوورەكانی خواردەمەنییە جۆراوجۆرەكان بۆ زیندەوەرە لە ژمارە نەهاتووەكان و بۆ مرۆڤیش، لە هەموو جێیەكی ئەم زەوییە گەورە و زەبەلاحەدا، ئامادە دەكات.

ئنجا بەڕێوەچوونی ئەو كاروبار و، نیعمەتبەخشین و، بەڕێوەبردن و، ژیاندن و، كاربەڕێ كردنە بێ سنوورانە، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و.. ملكەچبوونی هەموو شتێك تەنانەت گەردیلەكانیش بۆ ئەو فەرمان و كاربەڕێ كردنانە.. بەڵگەی گومان بڕن لەسەر: فراوانیی ڕەهای فەرمانڕەوایەتییەكەت.

ئنجا کـاری یـهك بـه یـهکی: گـهڵا و گـوڵ و بـهر و قـهد و پـهل و لقـی ئـهو درهخـت و ڕووهکانه، که به زانایی و بینایی و بهپێی خواستی دانست و سـوود و بهرژهوهندییـهکان ئهنجامیان دهدهن، به پهنجه له ژمـاره نـههاتووهکانیان ئاماژه دهکـهن و بهڵگهیـهکی ڕوونـن لهسهر ئهوهی که: "زانستی تۆ دهوراندهوری ههموو شتێکی داوه و، "دانست"هکهشت هـهموو شـتێکی گرتووهتـهوه. هـهروهك هـهموویان بـه زمانـه بێسـنوور و لـه ژمـاره بهدهرهکانیان سوپاس و ستایشی جوانیی سنعهتی تـۆ دهکـهن کـه لهوپـهڕی کهمالدایـه و، هی کهمالی نیعمهتهکهشت که لهوپهڕی جوانیدایه.

هـهروهها ئـهم نیعمـهت و چاکـهکاری و بهخشـشه بـهنرخ و زۆر و زهبهندانـه و، ئـهم مهسرهف و ڕێزلێنانه لهڕادهبهدهرانهی که لهم خانه کـاتی و میوانخانه فانییـهی دنیـا و لـه کـاتێکی کـهم و تهمـهنێکی کورتـدا لهسـهر دهسـتی درهخـت و ڕووهکهکانـهوه پێمـان دهگهن، ئاماژه بۆ ئهوه دهکهن که ئهو میهرهبانه بهخشنده و خاوهن توانستهی ئـهم هـهموو سۆز و میهرهبانییهی بۆ میوانهکانی ئێرهی نوانـدووه، دهبێ لـه جیـهانێکی ههمیشـهیی و وڵاتێکی ههتاهـهتاییدا گهلـێ درهختی بـهردار و ڕووهکـی گوڵـداری ههمیشـهیی ـ کـه شـایانی بهههشتی ههتاهـهتایی بـن ـ بـۆ ئـهو بهندانـهی خـۆی ئامـاده کردبێـت کـه بـۆ ههتاهـهتایی لـهوێدا دهیانهێڵێتـهوه، تـاکو ئـهنجامی مهسـرهف و نیعمهتـهکانی، کـه بـۆ خۆشهویست کردن و ناساندنی خۆی لای بهندهکانی سهرفی کردبـوون، بـه پێچهوانهوه ههڵنهگهڕێتهوه.

واته بۆ ئهوهی بوونهوهران نهڵێن: (خواوهند تامی نیعمهتـهکانی پـێ چهشـتین، کـهچی پێش ئهوهی نۆشیان بکهین لهناوی بردین)!

ههروهها بۆ ئهوهی ڕێگا لهوه بگرێت که سام و ههیبـهتی خوایهتییهکـهی بشـکێت و ئینکـاریی فراوانیـی میهرهبانییهکـهی بکرێـت و، بـۆ ئـهوهش کـه نـههێڵێت سـهرجهم خۆشهویسته موشتاقهکانی مهحرووم بن و ببن به دوژمنی..

بـهڵێ، هـهموو ئهمانـهی لـه گهنجینـهکانی میـهرهبانیی ههتاهـهتایی و بهههشـته ههمیشهییهکانیدا بۆ بهندهکانی ئاماده کردووه. خـۆ هـهرچی نیعمـهت و بهخششـی ئـهم خانهیهی دنیا ههن، ههر هموویان تهنها نموونهیهکن خراونهته پێشچاوی ئامادهبووان!

ئنجا هەروەك سەرجەمی درەخت و ڕووەکەکان، بە وشەی گەڵا و گوڵ و بەروبوومەکانیان، تەقدیست ڕادەگەیەنن، بە تایبەت: بەدیهێنانی ناوازەی بەروبوومەکان و کاکڵە و ناوکە جۆراوجۆرەکانیان و، سنعەتە سەرسووڕهێن و تۆوە دەراساکانیان و، دانانی ئەو سینی‌یە خواردەمەنی‌یانە لەسەر دەستی درەخت و ڕووەکەکان و ناردنیان بەم شێوەیە بۆ زیندەوەرە میوانەکانی خۆی، کە هەموو ئەمانەش کارێك دەکەن تەسبیحاتی زمانی حاڵی یەك بە یەکی ڕووەك و درەختەکان هێندە ئاشکرا بێت کە بگاتە پلەی تەسبیحاتی زمانی گوفتار.

دەسا ئەی پەروەردگارم! هەموو ئەمانەی باس کران، لە موڵکی تۆدا و بە "هێز و توانست و بەڕێوەبردن و چاکەکاری و میهرەبانی و دانست"ی تۆ ملکەچ و گوێڕایەڵی هەر فەرمانێکن کە لە تۆوە دەربچێت.

فیا من اختفى بشدة الظهور!

ويا من احتجب بعظمة الكبرياء!

يا صانع يا حكيم!

يا خالق يا رحيم!

من، بە زمانی هەموو ڕووەك و درەخت و گەڵا و گوڵ و بەروبوومێك و بە ئەندازەی ژمارەی هەموویان، حەمد و سەنا و ستایشت پێشکەش دەکەم و، لە هەموو ناتەواوی و بێ‌دەستەڵاتی و هاوبەشێك تەقدیست دەکەم.

* * *

ئەی بەدیهێنەری بەتوانا!

ئەی کارسازی دانا!

ئەی پەروەردگاری میهرەبان!

من لە ڕێی فێرکاریی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و وانە و دەرسەکانی قورئانی حەکیمەوە، تێ گەیشتم و ئیمانم هێنا کە:

هەروەك ڕووەك و درەختەکان تۆ دەناسن و وانەی سیفاتە قودسی و ناوە جوانەکانیشت دەڵێنەوە، هیچ دانە گیانلەبەرێکیش نی‌یە چ لە مرۆڤ و چ لە

زیندەوەراندا کە شایەتی لەسەر "پێویستیی بوون"ی تۆ و هاتنەدیی سیفەتەکانت نەدەن. ئەوەتا هەر هەموویان بە ئەندامە کارگوزارە دەرەکی و ناوەکی‌یەکانی جەستەیان کە بە وێنەی کاتژمێری ورد و رێك بەرەو کارکردن دراونەتەبەر و، لە رێی ئامێر و هەست و نەستەکانیشیانەوە کە بە رێسایەکی لەوپەڕی وردی و تەرازوویەکی یەکجار هەستیار و چەندەها سوود و بەرژەوەندیی گرنگ لە تەن و لەشی ئەواندا دانراون و، بەو کۆئەندامانەی جەستەشیان کە لەوپەڕی وردەکاریدا بەدی هێنراون و تایبشلێی بە دانایی و هاوسەنگی لەواندا جێگیر کراون.. ئەم شایەتی‌یە دەدەن..

چونکە هەرگیز ناگونجێ ئەم سنعەتە وردەی کە بە بینایی ئەنجام دراوە و، ئەم دانستە نەرم و نیانەی کە جێ دەستی هەست و شعوورە و ئەم هاوسەنگی‌یە تەواوەش کە بە تەگبیر و کارسازی ڕەچاو کراوە، "هێز"ی کتوکوێر، یان "سروشت"ی کەڕولاڵ، یاخود "ڕێکەوت"ی هەڕەمەکی و چەواشە خۆیانی تێدا هەڵبقورتێنن و هیچ کام لەم دیاردانە کار و جێ‌دەستی ئەوان بن!

خۆ "پێکهاتنیشیان لە خۆڕا" و بێ هیچ هۆکارێك، سەد و یەك مەحاڵی تێدایە، چونکە ئەو کاتە دەبێ هەموو یەکێك لە گەردیلەکانیان گشت ئەو شتانە ببینێت و سەرجەمی ئەو کارانەش ئەنجام بدات کە تایبەتن بە پێکهێنانی جەستەی خۆیەوە تەنانەت ئەو شتانەش کە لە دنیادا پەیوەندیی پێیانەوە هەیە. بەم پێیە یەك بە یەکی ئەو گەردیلانە – پەنا بە خوا – بە وێنەی خوای گەورە خاوەنی زانست و توانستێکی هەمەلایەنگیر بێت تاکو بتوانرێت بەدیهێنانی "جەستە" بدرێتە پاڵ گەردیلەکانی و بوترێ: خۆی لە خۆیەوە پێکهاتووە!!

هەروەها هەرچی "چۆنێتیی گشتی"ی زیندەوەران هەن، وەك: یەکبوونی کارسازی و بەڕێوەبردن و جۆر و ڕەگەز و مۆری سروشت، کە بە ئاشکرا دەبینرێت و هەر هەمان مۆرە بەسەر گوێ و چاو و دەم و ڕووی هەموویانەوە و.. یەکبوونی تەمغەی دانست بە سەروسیمای یەك بە یەکی دانە دانەکانی هەموو جۆرەکانەوە و، پێکەوە بەدیهێنان و ژیاندنی هەموویان سەرباری تێکەڵبوونیان لەگەڵ یەکتردا.. هەموو یەکێك لەم چۆنێتی‌یانەی زیندەوەران، بەو درەوشانەوانەی ناوە جوانەکانی خواوەند کە ڕوویان لە

گەردوونە و لە هەموو دانەیەکی جۆرەکانیاندا هەیە، شایەتێکی گومانبڕ لەسەر "تاکی"ی تۆ دەدات و، ئاماژەش بۆ ئەو "تەنیایی"یە دەکات کە لە "تاکی"ی تۆدایە.

هەروەها وەك ملکەچ کردنی سەدان هەزار جۆری زیندەوەرانی ڕووی زەوی لەگەڵ مرۆڤدا و پڕچەك کردن و مەشق دادان و گوێڕایەڵ کردنیان بە وێنەی سوپای ڕێکخراوی ڕێکوپێك و جێبەجێبوونی فەرمانە پەروەردگاریەکان لەواندا بەوپەڕی کاملی و تەواوی، دەبێت بە بەڵگە لەسەر: پلەی شکۆمەندیی ئەو پەروەردگاریتی‌یەت.. بە هەمان جۆر: نرخ و بەهای گرانی ئەو بەدیهاتووانە، هەرچەندەش زۆر و زەبەندەن و.. بەدیهێنانیان بەوپەڕی خێرایی، هەرچەندەش لەوپەڕی ڕێکوپێکیدان و.. دروست کردنیان بەوپەڕی ئاسانی، هەرچەندەش لەوپەڕی وردەکاریدان، بەڵگەیەکی گومانبڕن لەسەر "مەزنیی توانست"ەکەت..

هەروەها گەیاندنی ڕۆزی بۆ ئەو بەدیهاتووانەی کە لەم سەر و ئەو سەری خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باکوور و باشووردا بڵاوبوونەتەوە، هەر لە بچووکترین میکرۆبەوە تا دەگاتە گەورەترین گیانلەبەر و، لە بچووکترین مێرووەوە تا مەزنترین باڵندە.. بەڵگەیە لەسەر فراوانیی میهرەبانی‌یەڕەهاکەت..

هەروەها کە هەموو بەهارێك ڕووی زەوی دەبێت بە سەربازگەیەکی نوێ بۆ بەدیهاتووانی ناوی لە بریی وەرزی پایز کە ئەرکی سەرشانی خۆی کۆتایی پێ هێنا و.. لێبڕانی هەریەکە لەو بەدیهاتووانەش بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی لە ئەستۆیدایە بە وێنەی سەربازی گوێڕایەڵ.. ئەم کارە، بەڵگەیەکی گومان بڕە لەسەر فراوانیی فەرمانڕەوایەتی‌یەکەت..

هەروەها هەروەك هەموو زیندەوەرێك بە ئەندازەی ژمارەی گیانلەبەران و زیندەوەران و لەو ڕووەوە کە وەك نوسخەیەکی بچووککراوەی گەردوون بەدیهێنراوە و، زانستێکی لەوپەڕی قووڵی و دانستێکی لەوپەڕی وردەکاریی تێدا ڕەچاو کراوە، بێ ئەوەی بەشە تێکەڵ و پێکەڵەکانی ئاوێتەی یەکتر ببن، یاخود لە وێنەکێشانی شێوە و ڕوخسارە جیاجیاکانی سەرجەمی زیندەوەراندا سەرسامی دروست ببێت، یان هیچ هەڵە و ناتەواوی و سەهوویەك بێتە کایەوە.. هەروەك هەموو زیندەوەرێك

بەم کارانە ئاماژە بۆ هەمەلایەنیی زانستەکەت و گشتگیریی دانستەکەت بۆ هەموو شتێك دەکەن.. بە هەمان جۆر، بەدیهێنانی یەك بە یەکیشیان بەوپەڕی وردەکاری و جوانیی ئەوتۆ کە خۆی لە خۆیدا موعجیزەیەکی سنعەت و کارێکی ناوازەی حیکمەتە، ئاماژە بۆ ئەوپەڕی کەمالی جوانیی سنعەتی پەروەردگاریی تۆ دەکات کە سنعەتێکە خۆت خۆشت دەوێت و حەزیش دەکەیت پێشچاویان بخەیت.

هەروەها پەروەردەکردنی تەواو نەرمونیانی یەك بە یەکیان، بە تایبەت وردیلە و بچووکەکانیان و، جێبەجێ کردن و هێنانەدیی سەرجەم خواست و ئارەزووەکانیان.. چەندەها ئاماژەی بێ سنوور بۆ جوانیی ڕەنگینی تۆ دەکات.

* * *

ئەی بەخشندەی میهرەبان!

ئەی ئەمینی خاوەن بەڵێنی ڕاست!

ئەی خاوەنی ڕۆژی جەزا!

من بەهۆی فێرکاریی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەت ﷺ و لە ڕێی ڕێنمایی قورئانە حەکیمەکەتەوە تێگەیشتم لەوەی کە:

مادەم "ژیان" مەزنترین ئەنجامی هەڵێنجراوی گەردوونە و، "گیان"یش پوختەی هەڵبژاردەی ناو ژیانە و، "خاوەن هەستان"یش ئاکامی پوختی سەرجەم بەشەکانی گیانلەبەرانن و، "مرۆڤ"یش جامیعترینی خاوەن هەستانە و..

ئنجا سەرجەمی بوونەوەران لە پێناوی "ژیان"دا خراونەتەکار و ملکەچ کراون و، "خاوەن ژیان"ەکانیش بۆ گیانلەبەرەکان ڕام و گوێڕایەڵ کراون و لەبەر ئەوان بۆ ئەم دنیایە نێرراون و، "گیانداران"یش هەمیشە گوێڕایەڵ و یاریدەدەری مرۆڤن و، "گرۆی مرۆڤ"یش بە سروشتی خۆیان و بە بێگەردی بەدیهێنەری خۆیان خۆشدەوێت و بەدیهێنەرەکەشیان ئەوانی خۆشدەوێت و لە ڕێی هەموو هۆکارێکەوە خۆی لای ئەوان خۆشەویست دەکات و.. ئامادەیی و لێهاتن و کۆئەندامە مەعنەوییەکانی ئەم مرۆڤەش ڕوویان لە جیهانێکی تری نەبڕاوە و ژیانێکی دیکەی هەمیشەیییە و.. دڵ و هەست و شعووریشی داخواز و تاسەمەندی مانەوەن و.. زمانەکەشی بە چەندەها نزا و لالانەوەی بێ سنوور داوا و تکای مانەوە لە بەدیهێنەرەکەی دەکات...

ئەوا هەرگیز ناگونجێ گرۆی مرۆڤ لە دوای "مردن" زیندوو نەکرێنەوە و لەم ڕێیەوە تووڕەیی و ڕق و قین لە دڵی ئەو خۆشەویستانەدا بهەژێنرێت و دوژمنایەتی‌یەکی هەمیشەیی‌یان لەگەڵدا بکرێت! لە کاتێکدا کە ئەوان هەر لە بناغەدا بۆ مەبەستی خۆشویستنێکی هەمیشەیی بەدیهێنراون و، لەبەر حیکمەتێك ڕەوانەی ئەم دنیایە کراون تاکو ژیانێکی پڕ لە بەختەوەری لە جیهانێکی تری هەمیشەییدا بەدەست بهێنن.

پاشان ئەو ناوە جوانانەی خوای گەورەش کە لە مرۆڤدا دەردەکەون، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە: ئەم مرۆڤەی لەم ژیانە کورت و فانی‌یەی دنیادا ئاوا بوو‌بێت بە ئاوێنەی تیادرەوشانەوەی ئەو ناوانە، دەبێ لە جیهانی نەبڕاوەی ئەو دنیادا بەهرەمەندی گەلێ تیادرەوشانەوەی هەمیشەیی ئەو ناوانە بێت. بەڵێ، هاوڕێی ڕاستی شتی "هەمیشەیی" دەبێ ئەویش "هەمیشەیی" بێت و، ئاوێنەی خاوەن هەست و نەستی "باقی"ش داخوازی ئەوەیە کە ئەویش "باقی" بێت!

خۆ هەروەك لە ڕیوایەتە صەحیحەکانەوە دەردەکەوێت:

ڕۆحی زیندەوەران بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە و، ڕۆحی چەند دانەیەکی تایبەتیشیان هاودەم لەگەڵ جەستەکانیاندا دەڕۆن بۆ جیهانی هەمیشەیی، وەك: مێروولە و پەپووی حەزرەتی سولەیمان و.. حوشترەکەی حەزرەتی صالح و.. سەگی "أصحاب الکهف"[1] و، هەریەك لە جۆرەکانیشیان لە تەنێکدا بەرجەستە دەبێت تاکو هەندێ جار بەکار بهێنرێت..

جا هەروەك لەو ڕیوایەتانەوە ئەمە دەردەکەوێت، "حیکمەت" و "حەقیقەت" و "میهرەبانی" و "پەروەردگاریتی"ی خواوەندیش بە هەمان جۆر داخوازی ئەمەن.

ئەی قەییومی بەتوانا!

هەرچی زیندەوەر و گیانلەبەر و خاوەن هەست و شعوور هەن، لەناو موڵکی تۆدا چەندین کار و ئەرکی سروشتی‌یان لە ئەستۆ نراوە و، بۆ فەرمانەکانی

---

(١) روي انه يدخل الجنة مع المؤمنين على ما قال مقاتل: عشرة من الحيوانات تدخل الجنة ناقة صالح وعجل ابراهيم وكبش اسماعيل وبقرة موسى وحوت يونس وحمار عزير ونملة سليمان وهدهد بلقيس وكلب اصحاب الكهف وناقة محمد ﷺ فكلهم يصيرون على صورة كبش ويدخلون الجنة (ذكره فى مشكاة الانوار). بڕوانە: تفسير روح البيان ٥/٢٢٦ للبروسوي و تفسير القرطبى ١/٣٧٢. (وەرگێڕ)

پەروەردگاریتی‌یەکەت و، تەنها بە: هێز و توانست و ویست و کارسازی و میهرەبانی و دانستی تۆ ملکەچ و گوێڕایەڵ کراون.

هەندێکیشیان لە لایەن میهرەبانیی تۆوە بۆ مرۆڤ زەلیل و ملکەچ کراون. ئەمەش نەك لەبەر هێز و زاڵبوونی مرۆڤ، بەڵکو لەبەر لاوازی و دەوستەوسانیی ناو سروشتی!

کەواتە هەرچی زیندەوەر هەیە، بە زمانی حاڵ و گوفتار، پەرستشی خۆی دەردەبڕێت و، لە هەموو شیرك و ناتەواوی‌یەك تەقدیسی خوای گەورە دەكات و، شوکرانە و سوپاسی نیعمەت و بەخششەکانی ڕادەگەیەنێت.

سبحانك يا من اختفى بشدة الظهور!

سبحانك يا من احتجب بعظمة الكبرياء!

وا من لەگەڵ تەسبیحاتی سەرجەم گیانلەبەراندا، تەسبیح و تەقدیست دەکەم و، بە دەنگی بەرز دەڵێم:

"سبحانك! يا من جعل من الماء كل شيء حي"!

* * *

ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان!

ئەی خوای پێشینان و دواینان!

ئەی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان!

من بەهۆی فێرکاریی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و لە ڕێی وانە و دەرسەکانی قورئانی حەکیمەوە، تێ‌گەیشتم و ئیمانم هێنا بەوەی کە:

هەروەك ئاسمان و، بۆشایی‌یەکەی و، زەوی و، وشکایی و، دەریا و، درەخت و، ڕووەك و، زیندەوەر، لە ڕێی دانە و بەش و گەردیلەکانیانەوە تۆ دەناسن و، ئاماژەت بۆ دەکەن و، دەبن بە بەڵگە و شایەت لەسەر "بوون" و "یەکتایی" تۆ.. بە هەمان جۆر پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - و ئەولیا و ئەصفیاکانیش، کە پوختەی ڕەگەز و جۆری مرۆڤن، کە ئەوانیش پوختەی گیاندارانن و، ئەوانیش پوختەی گەردوونن، شایەتی دەدەن و هەواڵی: "پێویستیی بوون" و "تاکی"ی و "تەنیایی" تۆ ڕادەگەیەنن. ئەم هەواڵەشیان هێندە قایم و گومان‌نەهێڵ و ڕەگداکوتاوە کە لە هێزی سەدان ئیجماع و

تەواتوردایە و، پاڵی بە بینین و کەشف و هەڵێنجانی دڵ و ژیریی ئەوانەوە بەستووە و، بە موعجیزات و کەرامات و بەڵگە دڵنیایی بەخشەکانیان دەیچەسپێنن..

بەڵێ، هەر ختوورەیەکی نادیار و پەنهان بە دڵدا بێت و ئاماژە بۆ ئەو زاتەی پشت پەردەی غەیب بکات کە ئەو ختوورەیەی بەو دڵەدا هێناوە و.. هەر ئیلهامێکی ڕاست کە بە ناو دڵدا بێت و ئەو زاتە ئیلهامدەرەی ناو دڵ بە پێویست دابنێت و.. هەر عەقیدەیەکی دڵنیاییبەخش و یەقینیی ئەوتۆ کە بە "حق الیقین" سیفاتی قودسی و ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەربخات و.. دڵی نوورانیی هەرچی ئەنبیا و ئەولیا هەیە کە بە "عین الیقین" نوورەکانی خواوەندی "واجب الوجود" دەبینێت و.. عەقڵ و ژیریی هەرچی صیددیق و ئەصفیا هەیە کە بە "علم الیقین" تەصدیقی نیشانەکانی "پێویستیی بوون"ی بەدیهێنەری هەموو شتێك دەکات و بەڵگەکانی "یەکتایی"شی دەچەسپێنێت..

هەر هەموویان، بەڵگەن و.. ئاماژە پێشچاو دەخەن و.. شایەتی دەدەن لەسەر: "پێویستیی بوون" و "سیفاتی موقەددەس" و "تاکی" و "تەنیایی" و "ناوە جوانەکان"ی تۆ!

هەرچی موعجیزەی ئاشکرا و تەسدیقکراوی هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە سەردار و پوختەی سەرجەمی پێغەمبەران و پیاوچاکان و ئەصفیا و صیددیقانە.. هەروەها هەموو یەکێك لەو حەقیقەتە بەرزانەی کە دەریدەخەن ئەو پێغەمبەرە ﷺ لەسەر حەقە.. هەروەها یەك بە یەکی ئایەتە بێگومانەکانی "یەکتایی" و سەرجەمی مەسەلە قودسی و ئیمانییەکانی ئەو قورئانە ئیعجازبەخشەی کە پوختەی سەرجەمی کتێبە حەق و موقەددەسەکانە.. هەر هەموویان، بەڵگەن و.. ئاماژە پێشچاو دەخەن و، شایەتی لەسەر "پێویستیی بوون" و "سیفاتی موقەددەس" و "تاکی" و "تەنیایی" و "ناوە جوانەکان" و "سیفەتە مەزنەکان"ت دەدەن.

ئنجا هەروەك ئەو هەواڵدەرە ڕاستگۆیانەی کە ژمارەیان سەدان هەزار کەس دەبێت و پشت بە موعجیزات و کەرامات و بەڵگەکانیان دەبەستن، شایەتی لەسەر "بوون" و "یەکتایی" تۆ دەدەن.. هەر هەموو شیان – بە ئیجماع و یەکدەنگی – مەودای گەورەیی شکۆمەندیی ئەو پەروەردگارێتییەی تۆ دەچەسپێنن و ڕایدەگەیەنن کە لە هەموو شتێکدا دەست بەکارە، هەر لە بەڕێوەبردنی کاروبارە هەمەکییەکانی عەرشی مەزنەوە کە دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە، تا دەگاتە گوێ لێ بوون و بەڕێوەبردنی پەنهانترین

خەیاڵ و ختووره و نهێنی و ئاوات و نزا و خواستێکی جوزئیی دڵی مرۆڤ.. هەروەها هەموو ئەوانە ڕادەی گەورەیی ئەو توانستەی تۆ ڕادەگەیەنن کە هەر لە پێش‌چاوی خۆماندا و بە تەنها یەك جار چەندین شتی جیا جیا و بێ سنوور بەدی دەهێنێت و گەورەترین شت بە ئەندازەی ئاسانیی دروستکردنی بچووکترین مێروو دروست دەکات، بێ ئەوەی هیچ کام لەم کارانە ڕێی ئەنجامدانی کارێکی تری لێ بگرێت!

پاشان هەروەك هەموو ئەوانە هەواڵی فراوانیی میهرەبانی‌یە ڕەهاکەت ڕادەگەیەنن و، بە موعجیزات و کەرامات و بەڵگەکانیان دەیچەسپێنن کە: میهرەبانی‌یەکی ئەوتۆیە سەرجەمی گەردوونی خستووەتە حوکمی کۆشکێکی مەزن بۆ گیانلەبەران بە تایبەتی بۆ مرۆڤ و، بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ گرۆی جیننی و ئادەمیزاد ئامادە کردووە و، تەنانەت بچووکترین زیندەوەریش لە یاد ناکات و، بۆ دڵنیاکردن و دڵڕاگرتنی دەستەوسانترین "دڵ" تێدەکۆشێت..

هەروەها لە بارەی فراوانیی ئەو "فەرمانڕەوایەتی‌یە ڕەها"یەتەوە دەدوێن کە سەرجەمی جۆرەکانی بەدیهاتووانی - هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە هەسارەکان - ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خۆی کردووە..

جا هەروەك هەموو ئەوانە ئەم هەواڵانە ڕادەگەیەنن و دەیانچەسپێنن، بە هەمان جۆر و بە ئیجماع و یەکدەنگی، ئاماژەش دەکەن و دەبن بە بەڵگە و شایەت لەسەر: هەمەلایەنگریی "زانست"ەکەت کە دەورواندەوری هەموو شتێکی داوە و گەردوونی وەك کتێبێکی گەورەی ئەوتۆ لێ کردووە کە هێندەی ژمارەی بەشەکانی، نامیلکەی لەخۆ گرتبێت و، سەرجەم ڕووداوەکانی ناو بوونەوەرانی لەسەر "ئیمامی موبین" و "کیتابی موبین" تۆمار کردووە کە دوو تۆماری "لەوحی مەحفووظ"ن و، گشت پێرست و بەرنامەیەکی درەختەکانی لە تۆوەکاندا جێ کردووەتەوە و، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و بە بێ هیچ هەڵەیەك مێژووی ژیانی خاوەن هەستانی لەناو هێزی پارێزەری ناو کەللەسەری ئەواندا داناوە..

هەروەها بە هەمان جۆر، شایەتی لەسەر گشتگیریی "دانست"ە موقەددەسەکەت دەدەن کە بە چەشنێکە چەندین دانایی زۆر و زەبەندەی لە هەموو شتێکدا ڕەچاو

كردووە، تەنانەت بە ئەندازەی بەروبوومەكانی درەخت ئەنجامی بە حیمكەت نەخشاوی بە هەموو درەختێك بەخشیوە و، هێندەش بەرژەوەندیی لە زیندەوەراندا ڕەچاو كردووە هێندەی ژمارەی ئەندامەكانی، تەنانەت بە ئەندازەی ژمارەی بەش و خانەكانی دەبێت، تەنانەت جگە لەو كارمەندییە زۆرانەی كە خستوونیەتە ئەستۆی زمانی مرۆڤەوە، بە ئەندازەی تام و چێژی خواردەمەنییەكانیش تەرازووی چێژەری وردی لەو زمانەدا داناوە!

هەروەها هەموویان شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی كە درەوشانەوەی ناوە جوان و شكۆمەندەكانی خوای گەورە، كە لەم دنیایەدا شوێنەواریان دیار و ئاشكرایە، لەودنیای هەمیشەیی و هەتاهەتاییدا بە جوانترین و درەخشانترین شێوە بەردەوام دەبێت.. لەسەر ئەوەش كە نیعمەتەكانت - كە لەم دنیا فانییەدا نموونەیمان بینی - لەودنیای خانەی بەختەوەریدا بەوپەڕی جوانی و درەخشانی بەردەوام دەبن و، لەگەڵ موشتاقان و تاسەمەندەكانی ئێرەیاندا، لە خانەی هەتاهەتایی ئەوێدا هاودەم و هەمیشەیی دەبن.

ئەوەتا لە پێشەكیی هەموو ئەوانەوە: پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ كە پاڵی بە سەدان موعجیزاتی ڕوونی خۆیەوە داوە و، قورئانی پیرۆزیش كە ئایەتە ڕاستەوخۆ و گومان نەهێڵەكانی پشتی دەگرن و، سەرجەمی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - كە خاوەنی گیانی ڕووناكن و، گشت ئەولیاكان كە جەمسەری دڵە ڕۆشناكانن و، هەموو ئەصفیا و صیددیقانیش كە خاوەنی ژیرییە ڕووناكەكانن.. هەر هەموویان، مژدەی بەختەوەریی هەمیشەیی بە گرۆی جیننی و ئادەمیزاد دەدەن و، هەڕەشە و مەترسیی ئاگری دۆزەخیش پێشچاوی گومڕایان دەخەن.

بەڵێ، هەموو ئەوانە باوەڕیان بەم هەواڵە هەیە و شایەتیی لەسەر دەدەن و، لەمەشدا پشت بەو بەڵێن و هەڕەشانە دەبەستن كە چەندین جار لە كتێب و صوحوفە ئاسمانییە خاوێنەكانتدا باست كردوون و، پاڵیان بە سیفات و كاروبارە قودسییەكانیشتەوە داوە، وەك: توانست و، میهرەبانی و، چاودێری و، دانست و، شكۆمەندی و، جوانی. هەروەك لەم هەواڵەیاندا پشتیان بە عیززەتی شكۆمەندی و دەستەڵاتی پەروەردگارێتیی تۆ بەستووە و، لە ڕێی كەشف و بینینی خۆیان و ئەو عەقیدە دامەزراوەشیانەوە كە لە پلەی "علم اليقين"دایە، ئەم مژدەیە ڕادەگەیەنن.

دەسا ئەی خواوەندی بەتوانای دانا!

ئەی بەخشندەی میهرەبان!

ئەی خاوەن بەڵێنی ڕاست!

ئەی قەهھاری شکۆمەند!

ئەی خاوەن عیززەت و مەزنی و گەورەیی!

تۆ زۆر خاوێن و پاك و پیرۆزیت و گەلێ لەوە بەرزتریت کە ئەم ژمارە زۆرەی دۆستە ڕاستگۆکانت و گشت بەڵێنە زۆر و زەبەندەکانت و سەرجەم سیفەتە مەزن و کاروبارە خاوێن و پیرۆزەکانی خۆت بە درۆ بخەیتەوە و، پەردە بەسەر خواستی دەستەڵاتداریی پەروەردگاریتییەکەتدا بگێڕێت و، دوعا و نزا بێسنوورەکانی بەندە باش و وەرگیراوەکانی خۆت گیرا نەکەیت کە خۆشت دەوێن و، ئەوانیش لە ڕێی ئیمان و تەسدیق و گوێڕایەڵییەوە خۆیان لە لا خۆشەویست کردوویت..

تۆ ئەی پەروەردگارم! خاوێن و پیرۆزیت و بە جۆرێکی ڕەها بەرزیت لەوەی کە کافر و گومڕایان لە ئینکاری کردنی حەشردا تەسدیق بکەیت، لە کاتێکدا کە ئەوان دەستدرێژی بۆ سەر مەزنیی تۆ دەکەن و، بەهۆی کافری و سەرپێچی و بەدرۆخستنەوەی تۆوە لە بەڵێنەکەتدا سنووری عیززەتی شکۆمەندی و مەزنیی سام و شکۆی خوایەتی و میهرەبانیی پەروەردگاریتییەکەت دەشکێنن.

من تەقدیسی بێسنوور و نەبڕاوەی "دادگەری" و "جوانی" و "میهرەبانی"یەکەت لەم ستەم و ناشیرینییە نەبڕاوەیە ڕادەگەیەنم و، بە ئەندازەی گەردیلەکانی وجوودم ئەم ئایەتە دەخوێنمەوە کە دەفەرموێ:

﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّاً كَبِيراً﴾ (الإسراء:٤٣).

تەنانەت پێغەمبەرە ڕاستگۆکانت - دروودیان لەسەر بێت - کە بانگەوازکاری ڕاستەقینەی پەروەردگاریتییەکەتن، بە "حق اليقين" و "عين اليقين" و "علم اليقين" گەنجینەکانی بەخشش و میهرەبانییەکانت لە دوارۆژی هەمیشەییدا و.. دەرکەوتنی تەواوەتی و دەراسای درەوشانەوەی ناوە جوانەکانت لە خانەی بەختەوەریدا، دەبینن و ئاماژەی بۆ دەکەن و بە مژدەش بە ئێمەی ڕادەگەیەنن، هەروەك بەندە ئیماندارەکانیشت

ڕێنمایی دەکەن بۆ ئەوەی کە مەزنترین تیشکی ناوی جوانی "الحق" - کە سەرچاوە و خۆر و پارێزەری هەموو حەقیقەتەکانە - بریتی‌یە لە "حەقیقەتی حەشر"ی مەزن!

ئەی پەروەردگاری پێغەمبەران و صیددیقان!

هەموو ئەوانە پێکەوە لە موڵکی تۆدا و بە فەرمان و توانست و ویست و کارسازی و زانست و دانستی تۆ خراونەتەکار و ئەرکیان پێ سپێرراوە.. ئەوانیش بە تەقدیس و تەسبیح و تەکبیر و تەحمید و تەهلیل گۆی زەوی‌یان لە حوکمی گەورەترین شوێنی زیکر و یادی تۆدا خستووەتە پێش‌چاو، هەروەك گەردوونیشیان خستووەتە حوکمی گەورەترین مزگەوتەوە بۆ پەرستنی تۆ.

ئەی پەروەردگاری خۆم و ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی!

ئەی بەدیهێنەری خۆم و بەدیهێنەری هەموو شتێك!

تـــو حـــەققی "توانســـت" و "ویســـت" و "دانســـت" و "فەرمانڕەوایـــەتی" و "میهرەبانی"یەکەت کە بەهۆیانەوە گشت ئاسمانەکانت بە ئەستێرەکانیانەوە و، گۆی زەویشت بە سەرجەم شتانی ناویەوە و، هەموو بوونەوەرانیشت بە گشت چۆنێتی و جۆرەکانیانەوە، ملکەچ و گوێڕایەڵ کردووە:

نەفسی خۆمم بۆ ملکەچ و دەستەمۆ بکە..

خواست و داواکاری‌یەکەمم بۆ ڕام و گوێڕایەڵ بکە..

دڵی خەڵکی بۆ "پەیامەکانی نوور" ملکەچ بکە، تاکو خزمەتی "ئیمان" و "قورئان" بکەن..

"ئیمانی کامڵ" و "عاقیبەت خێری" بە خۆم و براکانم ببەخشە..

ئنجا هەروەك:

"دەریا"ت بۆ مووسا، دروودی لەسەر بێت و..

"ئاگر"ت بۆ ئیبراهیم، دروودی لەسەر بێت و..

"چیا" و "ئاسن"ت بۆ داوود، دروودی لەسەر بێت و..

"ئینس" و "جیننی"ت بۆ سولەیمان، دروودی لەسەر بێت و..

خۆر و مانگت بۆ حەزرەتی محەممەد ﷺ..

**❑ مەسەلەی چواردەهەم:**

هاتووە کە: "جوولەکە" هێزی گەورەی دەجاڵ دەبن و، بە ویست و گوێڕایەڵیی خۆیان شوێنی دەکەون[١].

دەتوانین - واللە أعلم - بڵێین:

بەشێکی تەئویلی ئەم ڕیوایەتە لە ڕووسیادا هاتە دی. چونکە ئەو جوولەکانەی کە گەلێ ستەمیان لەسەر دەستی حکومەتەکاندا چەشتبوو، لە پێناوی تۆڵەسەندنەوە لەو گەل و دەوڵەتانە، بە زۆری لە ئەڵمانیادا کۆبوونەوە و، "تروتسکی"ی جوولەکەش دەستێکی باڵای لە دامەزراندنی "ڕێکخراوی شیوعییەت"دا هەبوو بە ڕادەیەك کە گەیاندیانە سەرکردایەتیی گشتی و ئنجا لە پاش "لینین"یش - کە هەر خۆیان پێیان گەیاندبوو - خستیانە سەرۆکایەتیی حکومەتی ڕووسیا و، بە جۆرێکی سامناك ڕووسیایان وێران کرد و داهاتی هەزار ساڵەیان بەبا دا[٢]!

هەروەها "جوولەکە" بەم کارەیان دەریانخست کە ئەوان یەکێکن لە ڕێکخراوەکان و جێبەجێکەرانی کارەکانی دەجاڵی گەورە.

هەروەك ئەوان بوون کە قەوارەی حکوومەتەکانی تریان خستە لەرزە و گەلێ گیروگرفت و شڵەژاویان تێدا نایەوە.

---

(١) عن أنس بن مالك رضي الله عنه، أن النبي ﷺ قال: "يتبع الدجال من يهود أصبهان سبعون ألفاً عليهم الطيالسة". رواه مسلم ٢٩٤٤ (وفي بعض النسخ أصفهان بالفاء وكلاهما صواب). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە هێناویەتی)

(٢) (ليون تروتسكی): ناوی ڕاستەقینەی: (ليف داڤيدۆڤيچ برۆنشتاين)ە. لە ١٨٩٧/١٠/٧زدا لە بنەماڵەیەکی جووتیاری جوولەکە لە ئۆکرانیا لە دایك بووە. لە مارکسییە دێرینەکانی ڕووسیایە و بەشداریی چەندین کۆنگرە و ڕێکخستنی لەو ڕووەوە کردووە و چەندین جاریش دووچاری گرتن و نەفی و دوورخستنەوە بووە. ساڵی ١٩٠٢ز بە دەم بانگهێشتی لینینەوە ڕۆشت بۆ لەندەن. ساڵی ١٩١٧زیش ڕۆشتە ناو حیزبی بەلشەفیکەوە و لە گەڵ لینیندا پێکەوە ناودەبران. ڕێکخەر و سەرکردەی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ی ڕووسیایە. لە پێشدا وەزیری دەرەوە و دوایی وەزیری جەنگ بووە. لەو ماوەیەدا "سوپای سوور"ی دامەزراندووە و سەرکردەی بووە، هەروەك ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی ناوەندیی حیزبیش بووە. ساڵی ١٩٢٣ز سەرکردەیی یەکەم بزووتنەوەی دژایەتیی ستالینی لە ئەستۆ گرت و، ساڵی ١٩٢٧ لە حیزب دەرکرا. دوای کوشتنی کوڕە گەورەکەی و کەسانێکی تر لە شوێنکەوتووانی لە دەرەوەی وڵات لە لایەن ڕێکخراوی پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەتەوە، خۆیشی ڕۆژی ١٩٤٠/٨/٢٠ لە مەکسیك کوژرا. (وەرگێڕ)

**☐ مەسەلەی پازدەهەم:**

ئەو ڕووداوانەی "یەئجووج و مەئجووج" کە قورئانی پیرۆز بە پوختی لێیان دەدوێت، فەرموودەی پیرۆز هەندێ بە درێژی باسیان دەکات. بەڵام ئەم درێژەپێدانانە وەك پوختەکەی قورئانی پیرۆز لە جۆری "موحکەم" نین، بەڵکو لەوانەیە بە "موتەشابیهات" دابنرێن کە تا ڕادەیەك پێویستیان بە "تەئویل" تەنانەت بە "تەعبیر"یش هەیە. چونکە ئیجتیهادی ڕاوییەکانیان تێکەڵ بووە..

جا تەئویلێکی ئەمە – ولا یعلم الغیب الا الله – بریتییە لەوەی کە:

ئەو فەرموودانە کینایە و ئاماژەن بۆ ئەوەی کە: هۆزەکانی "مانجۆر و مەغۆل" – ئەوانەی کە قورئانی پیرۆز بە زمانی ئاسمانیی خۆی ناوی "یەئجووج و مەئجووج"ی لێ ناون – لە سەردەم و ڕۆژگارەکانی داهاتوودا سەرانسەری جیهان کاول دەکەن، وەك چەندین جار لەگەڵ چەند هۆزێکی چین و دەوروبەریدا هێرشیان بۆ سەر ئاسیا و ئەورووپا برد و کاولیان کردن و شێرزییان تێدا نایەوە. تەنانەت تیرۆریست و تۆقێنەرە بەناوبانگەکانی ڕێکخراوە شیوعییەکانی ئێستا لەوانن.

بەڵێ، بیری "سۆسیالیست" لە شۆڕشی فەرەنساوە سەری هەڵدا و، بە بانگەشەکردنی بۆ ئازادی و سەربەستی گەشەی کرد و پەرەی سەند. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بیری سۆسیالیستە بانگەشە بۆ ڕووخاندنی بەشێك لە موقەددەسات دەکات، ئەوا لەم دواییەدا گۆڕرا بە بەلشەفییەت. ئنجا بەلشەفییەتیش بە مەبەستی ڕووخاندنی گەلێ موقەددەسات و ڕەوشتی جوانی مرۆڤایەتی، تۆوی گەندەڵی و خراپکاریی بڵاو کردەوە. بێ گومان ئەو تۆوانەش گوژاڵکی ئەو ئاژاوە و تیرۆرانە بەرهەم دەهێنن کە نە سنووری هیچ شتێك دەزانن و نە هیچ نرخێکیشی بۆ دادەنێن. چونکە ئەگەر میهرەبانی و سۆز و ڕێز و بەزەیی لە دڵی مرۆڤ دامالرێن، ئەوا ژیری و زیرەکی بەسەر جڵەوی مرۆڤدا زاڵ دەبن و خەڵکی وەك ئاژەڵی دڕندە و سەگی هار لێ دەکەن بە چەشنێ کە ئیتر هیچ زالبوونێکی توندوتیژی سیاسی چاریان ناکات و دادیان نادات.

بەپیتترین لەوەڕگای بیری ئاژاوەچێتی و تیرۆریستان ئەو شوێنانەیە کە پڕن لە ستەم لێکراوان و ئەو هۆز و تیرانەشە کە دوورن لە شارستانێتی و حکومەت و دەوڵەت و،

لەسەر تالآن و برۆ ڕاهاتوون. ئەم هەلومەرجانەش بە تەواوەتی لە هۆز و تیرەكانی "مانجۆر و مەغۆل" و بەشێكی تیرەكانی "قەرغیز"دا دێنەدی، كە هەر ئەوانیش بوون بەهۆی بنیاتنانی "بەربەستی چین" كە چل ڕۆژە ڕێ درێژە و بە یەكێك لە حەوت شتە سەرسووڕهێنەكانی دنیا دادەنرێت.

بەم جۆرە، پێغەمبەری نازدار ﷺ كە پوختەی قورئانی پیرۆز لێكدەداتەوە، هەواڵێكی ئیعجازبەخش و واقیعیی لە بارەوە ڕاگەیاندن.

**❐ مەسەلەی شازدەهەم:**

لە باسی كوشتنی دەجاڵدا لە لایەن حەزرەتی عیساوە - دروودی لەسەر بێت - ڕیوایەتەكان ئەوە دەردەخەن كە "دەجاڵ" جەستەیەكی یەكجار گەورە و بەرزی نائاسایی پێوەیە و تەنانەت لە منارەش بەرزترە و، جەستەی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - لەچاو ئەودا گەلێ بچووكە[1]!

دەبێ یەكێك لە ڕووەكانی تەئویلی ئەمە - ولا یعلم الغیب الا الله - بەم جۆرە بێت:

ئەم واتایە كینایە و ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ئەو كەسانەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - بە نووری ئیمان دەناسن و شوێنی دەكەون - كە كۆمەڵی ڕۆحانییە موجاهیدەكانن - لەچاو سوپای زانستی و ماددی (واتە ڕۆشنبیری و سەربازی)ی دەجاڵدا، گەلێ ژمارەیان كەمە.

**❐ مەسەلەی حەڤدەهەم:**

هاتووە كە: هەموو دنیا هەواڵی سەرهەڵدانی دەجاڵ لە هەمان ڕۆژی پەیدابوونیدا دەبیستێت و، چل ڕۆژ گەشت بە زەویدا دەكات و، گوێدرێژێك(مەركەبێكی نائاسایی)شی هەیە.

---

(١) ورد في كتاب: الإشاعة لأشراط الساعة ص١٨٨ عن أمير المؤمنين علي رضي الله عنه: أن طول الدجال أربعون ذراعاً بالذراع الأول، تحته حمار أقمر - أي شديد البياض - طول كل أذن من أذنيه ثلاثون ذراعاً، ما بين حافر حماره إلى الحافر الآخر، مسيرة يوم وليلة، تطوى له الأرض منهلاً منهلاً، يتناول السحاب بيمينه، ويسبق الشمس إلى مغيبها، يخوض البحر إلى كعبه.." اهـ الحديث بطوله. وانظر النهاية او الملاحم ٢/٨٠، ٨٢ كنز العمال ١٤/٣٣٠، مختصر تذكرة القرطبي ١٤٤، ١٤٨. جمع الجوامع ١٠٦٦٢ الدر المنثور ٥/٣٥٥ فيض القدير رقم ٤٢٤٩ مجمع الزوائد ٨/٣٤٤ الحاوي للفتاوى ٢/٥٨٨. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەكەوە هێناویەتی).

ئه‌م ڕیوایه‌تانه، به مه‌رجی صه‌حیح‌بوونیان، چه‌ند ته‌ئویلێکیان هه‌یه که - والله أعلم - بریتین له‌مانه‌ی خواره‌وه:

ئه‌م ڕیوایه‌تانه به هه‌واڵێکی ئیعجازبه‌خش ڕایده‌گه‌یه‌نن که له کاتی سه‌رهه‌ڵدانی ده‌جالدا هۆکاره‌کانی "گواستنه‌وه" و "هه‌واڵدان" به ڕاده‌یه‌ك پێش ده‌که‌ون که هه‌ر ڕووداوێك له هه‌مان ڕۆژی ڕوودانیدا له سه‌رتاسه‌ری جیهاندا ده‌بیسترێت و بڵاو ده‌بێته‌وه و، ده‌جالیش به ڕادیۆ هاوار ده‌کات و خۆرهه‌ڵات و خۆرئاوا گوێیان لێ ده‌بێت و ئه‌م ڕووداوه‌ش له ڕۆژنامه‌کانیدا بڵاو ده‌بێته‌وه و ده‌خوێنرێته‌وه.. هه‌روه‌ها مرۆڤ ده‌توانێت له ماوه‌ی چل ڕۆژدا گه‌شتی هه‌موو جیهان بکات و هه‌ر حه‌وت کیشوه‌ر و حه‌فتا حکوومه‌ته‌کانی دنیا ببینێت.

جا ئه‌م ڕیوایه‌تانه هه‌واڵێکی ئیعجازبه‌خش له باره‌ی: ته‌لگراف و ته‌له‌فۆن و ڕادیۆ و فڕۆکه‌وه، به "ده" سه‌ده پێش په‌یدابوونیان، ڕاده‌گه‌یه‌نن.

پاشان "ده‌جاڵ" له جیهاندا به‌و جۆره به‌رگوێ ناکه‌وێت که "ده‌جاڵ" بێت، به‌ڵکو به سیفه‌تی پادشا و کاربه‌ده‌ستێکی دیکتاتۆری ڕه‌ها ناوی ده‌ڕوات و.. گه‌شته‌که‌شی به‌ناو زه‌ویدا بۆ داگیرکردنی هه‌موو شوێنه‌کانی زه‌وی نی‌یه، به‌ڵکو بۆ گومڕاکردن و بێدارکردنه‌وه‌ی فیتنه و سه‌ر لێ شێواندنی خه‌ڵکی‌یه.. مه‌رکه‌ب و گوێدرێژه‌که‌شی یان شه‌مه‌نده‌فه‌ره، که سه‌رێکی و یه‌کێك له گوێکانی سه‌رچاوه‌ی ئاگرێکی وه‌ك هی دۆزه‌خه و، گوێکه‌ی تریشی شوێنێکی پڕ فه‌رش و ڕازاوه‌ی وه‌ك به‌هه‌شتێکی درۆینه‌یه و، دوژمنانی ڕه‌وانه‌ی سه‌ره ئاگرینه‌که‌ی ده‌کات و دۆستانیشی له سه‌ره‌که‌ی تردا داده‌نێت که بۆ میوانداری ئاماده کراوه. یان ئه‌و گوێدرێژ و مه‌رکه‌به‌ی ئه‌و ئۆتۆمبیلێکی سه‌یر و سه‌رسووڕهێنه‌ره. یان فڕۆکه‌یه. یان.. (ده‌بێ بێ‌ده‌نگ بم).

❐ **مه‌سه‌له‌ی هه‌ژده‌هه‌م:**

هاتووه که: ئه‌گه‌ر نه‌ته‌وه‌که‌م له‌سه‌ر "ئیستیقامه‌ت"بمێننه‌وه ئه‌وا ڕۆژێکی هه‌یه. واته موڵك و حوكمداریی نه‌ته‌وه‌كه‌م هه‌زار ساڵی ته‌واو به‌رده‌وام و فه‌رمانڕه‌وا ده‌بێت(١)، به

(١) وفي سنن أبي داود ١٢٣/٤ (٤٣٥٠) عن سعد بن ابي وقاص رضي الله عنه أن النبيﷺ قال: إني لأرجو أن لا تعجز أمتي عند ربها أن يؤخرهم نصف يوم، قيل لسعد: وكم نصف ذلك اليوم قال: خمسمائة سنة. وانظر إلى النهاية أو الملاحم لابن كثير ١٣/١ واليواقيت والجواهر للشعراني ٤٢/٢، ١٢٧. (وه‌رگێڕ - له چاپه عه‌ره‌بی‌یه‌که‌وه هێناویه‌تی).

بەڵگەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ (السجدة:٥). بەڵام گەر لەسەر ڕێی ئیستیقامەت لا بدات ئەوا نیو ڕۆژی هەیە، واتە نزیکەی پێنج‌سەد ساڵ پارێزگاریی دەسەڵات و فەرمانڕەواییی‌یەکەی خۆی پێ دەکرێت.

ئەم ڕیوایەتە - واللّٰه أعلم - هەواڵدان نی‌یە لە بەرپابوونی "قیامەت"، بەڵکو ڕیوایەتێکە لە بارەی ماوەی سەربەرزیی ئیسلام و دەستەڵاتی خەلافەتەوە، کە هەر لە ڕاستی و واقیعیشدا وەك موعجیزەیەکی غەیبی هاتەدی. چونکە دەوڵەتی عەبباسی نزیکەی پێنج سەد ساڵ تا ئەو کاتەی کە کاربەدەستە سیاسی‌یەکان وازیان لە ڕێی ئیستیقامەت هێنا، ژیا و بەردەوام بوو. بەڵام نەتەوەی ئیسلام بە هەموویانەوە پارێزگاریی ئەو ئیستیقامەتەیان کرد، بۆیە خەلافەتی عوسمانی هات بە هانایانەوە و ئەو دەستەڵاتەی تا نزیکەی هەزار و سێ‌سەد ساڵ بەردەوام کرد. پاشان کاتێ کە سیاسەتمەدارە عوسمانی‌یەکان توانای پارێزگاری کردنی ئیستیقامەتیان نەما، ئەوا ئەوانیش پێنج‌سەد ساڵ بە خەلافەت ژیان. جا "مردنی خەلافەتی عوسمانی" تەسدیقی هەواڵە ئیعجازبەخشەکەی ئەم فەرموودە پیرۆزەی کرد.

لەبەر ئەوەی کە لە چەند پەیامێکی تردا لە بارەی ئەم فەرموودە پیرۆزەوە دواوین، ئەوا لێرەدا بە کورتی باسمان کرد و بە کەمی لێی دواین.

**❑ مەسەلەی نۆزدەهەم:**

چەند هەواڵێکی جیاجیا و جۆراوجۆر لە بارەی "حەزرەتی مەهدی"یەوە[1] هەیە کە لە ئالی بەیتە و پەیدابوونیشی یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت. تەنانەت بەشێك لە زانایان و ئەهلی ویلایەت پێیان وایە کە مەهدی پێشتر هاتووە و کاتی بەسەرچووە.

تەئویلێکی ئەم ڕیوایەتە جیاجیا و جۆراوجۆرانە - واللّٰه أعلم بالصواب - ئەمەی خوارەوەیە:

(١) وأحاديث المهدي عند الترمذي، وأبي داود، وابن ماجه، والحاكم، والطبراني، وأبي يعلى الموصلي، وأسندوها إلى جماعة من الصحابة.. قال الشوكاني في التوضيح: والأحاديث الواردة في المهدي التي أمكن الوقوف عليها منها خمسون حديثاً فيها الصحيح والحسن والضعيف المنجبر، وهي متواترة بلا شك ولا شبهة، بل يصدق وصف التواتر على ما هو دونها على جميع الإصطلاحات المحررة في الأصول، وأما الآثار عن الصحابة المصرحة بالمهدي فهي كثيرة أيضاً لها حكم الرفع، إذ لا مجال للاجتهاد في مثل ذلك. إهـ (الأذاعة لمحمد صديق حسن خان ١١٣ - ١١٤). (وەرگێر - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

حەزرەتی مەهدیی گەورە گەلێ کارمەندی و ئەرکی زۆر و جۆراوجۆری هەیە. جا هەروەك لە چەندین بازنە و جیهانی زۆری وەك: جیهانی سیاسەت و جیهانی ئایین و جیهانی دەسەڵات و جیهانی جیهاددا گەلێ ئیشوکار رایی دەکات، بە هەمان جۆر خەڵکانی هەموو چەرخ و سەردەمێکیش لەو کاتانەدا کە نائومێدی باڵ دەکێشێت بە سەریاندا، پێویستیان بە کەسێکی وەك حەزرەتی مەهدیيە، تاکو پشتیان بگرێت و وەرەیان بەرز بکاتەوە، یان پێویستیان بە چاوەڕوان کردنی هاتن و پەیدابوونیەتی تاکو لەو کاتەدا پشتیان بگرێت و فریایان بکەوێت. بۆیە لە هەموو چەرخ و سەردەمێکدا و بە میهرەبانیی خوای گەورە کەسێکی وەك مەهدی پەیدا بووە کە پارێزگاریی شەریعەتەکەی باپیری بەرێزی خۆی کردووە و سوننەتە خاوێنەکەی ئەوی زیندوو کردووەتەوە. بۆ نموونە: مەهدیی عەبباسی لە جیهانی سیاسەت و دەوڵەتدا سەری هەڵداوە و، شێخی گەیلانی"[1] و "شاهی نەقشبەند"[2] و هەر چوار قوتبەکان و دوازدە

---

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ساڵی (٤٧٠)ی کۆچی هاتووەتە دنیاوە و لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە. بۆ خوێندن ڕۆیشتووە بۆ بەغدا و سەرجەمی زانستە ئیسلامییەکانی ئەو ڕۆژگارەی لای زانایانی پایەبەرزی بەغدا، خوێندووە. یەکێکە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئایینی ئیسلام و، چەندەها کەس لە گاور و جولەکەکان لە خزمەتیدا موسڵمان بوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان کردووە و دەستبەرداری کردەوە خراپەکان بوون. چەند کتێبێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە وەك (الغنية) و (فتوح الغيب) و (الفتح الرباني). لە ساڵی (٥٦١ك)دا کۆچی دوایی کردووە و لە قوتابخانەکەی خۆی لە بەغدا نێژراوە. بۆ مەبەستی ناسینی پایەبەرزیی ئەم مەردە مەزنە و ئاشنا بوون بە ڕۆڵی کاریگەری لە مێژووی ئیسلامدا، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو فەسڵانە دەکەین کە مامۆستای مێژوونووسی هاوچەرخ (أبو الحسن الندوي) - خوا لێی خۆش بێت - لە بەرگی یەکەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)دا تۆماری کردوون. هەروەها کتێبی: (هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس) نووسراوی: (د. ماجد عرسان الكيلاني) بە تایبەت (الفصل الحادي عشر: مدارس الإصلاح والتجديد، المدرسة القادرية). (وەرگێڕ)

(٢) شاهی نەقشبەند ناوی (محەممەدی کوڕی محەممەد)ە و ناسراوە بە (خواجە محەممەد بەهائەددین) و دامەزرێنەری (تەریقەتی نەقشبەندی)یە. لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ٧١٧ك لە گوندی (قەصری عاریفان)ی نزیکی (بوخارا) کە پێشی دەوترێت: (قەصری هیندوان) لە دایك بووە و لە (سەمەرقەند) خوێندوویەتی و چەندین شوێنی تر گەڕاوە و بەهرەمەندی دەرس و پەروەردەی گەلێ زانا و پیاوباشی سەردەمی خۆی بووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بوخارا و لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ژنی هێناوە. دوو جاریش حەجی کردووە و تا کۆتایی ژیانی لە بوخارادا ماوەتەوە و، هەر لەوێش (تەریقەتی نەقشبەندی)ی دامەزراندووە. لە بەرواری (شەوی دووشەممە ٣/ڕەبیعی یەکەم/٧٩١ك) و لە سەرەتای تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گوندەکەی خۆی (قەصری عاریفان) بە خاك سپێرراوە. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، وەك: (رسالة الواردات)، (الأوراد البهائية)، (حياتنامه)، (دليل العاشقين). (وەرگێڕ)

ئیمامەکان و کەسایەتی‌یە بەرزەکانی هاوچەشنیان، لە جیهانی ئایین و ئیماندا پەیدا بوون و بەشێك لە کار و ئەرکەکانی "مەهدی"یان جێ‌بەجێ کردووە..

جا لەبەر هاتن و پەیدابوونی ئەو کەسایەتی‌یانە و ئەنجامدانی هەندێك لە کارەکانی مەهدی - کە ڕوویان لە زیندوو کردنەوەی سوننەت و شەریعەتی پێغەمبەرە ﷺ - لە لایەن ئەوانەوە و، لەبەر ئەوەی کە هەر ئەوانیش مایەی ڕوانین و ئاوڕلێدانەوەی پێغەمبەر ﷺ بوون، ئەوا ڕیوایەتەکانی سەبارەت بە حەزرەتی "مەهدی" ئیختیلاف و جیاوازی‌یان تێدایە و، ئەم ئیختیلافەش وای لە هەندێ کەسی ئەهلی حەقیقەت کردووە کە بڵێن: "مەهدی" لە ڕابوردوودا هاتووە و کاتی بەسەر چووە.

بە هەرحاڵ، پەیامەکانی نوور ئەم مەسەلە و بابەتەیان ڕوون کردووەتەوە و، خوێنەریان بۆ لا ڕەوانە دەکەین. بەڵام لێرەدا هێندە دەڵێین کە:

لە سەرانسەری هەموو دنیادا هیچ دەستە و کۆمەڵێکی بەڕێز و شەرەفمەند نی‌یە کە بگاتە ئاستی پلە و شەرەفی ئالی بەیت و، هیچ تیرە و هۆزێکی یەکگرتوویش نی‌یە کە بگاتە ڕادەی یەکگرتنی ئالی بەیت و، هیچ کۆمەڵ و دەستەیەکی نوورانیش نی‌یە کە لە دەستە و کۆمەڵی ئالی بەیت نوورانی و ڕووناکتر بێت.

بەڵێ، ئەو ئالی بەیتەی کە بە ڕۆحی حەقیقەتی قورئان و لەو سەرچاوەیەوە گۆش کراون و، بە نووری ئیمان و شەرەفی ئیسلام ڕووناك بوونەتەوە و، بە پلەکانی کەماڵاتدا سەرکەوتوون و، سەدان پاڵەوانی بەرزی بێ‌وێنەیان تێدا هەڵکەوتووە و، هەزاران پێشەوا و سەرکردەی مەعنەوی‌یان بۆ پێشەوایەتیی ئەم نەتەوەیە پێشکەش کردووە.. بێ هیچ گومانێك ئەم ئالی بەیتە، بە زیندوو کردنەوە و ڕاگەیاندن و جێ‌بەجێ کردنی شەریعەتی محەممەدی و حەقیقەتی قورئانی و سوننەتی ئەحمەدی، دادگەریی تەواوەتیی پێشەوا هەرە گەورە و مەهدی‌یە هەرە مەزنەکەیان بۆ سەرجەمی دنیا، دەردەخەن.

ئەم کارەش بەلای ژیری‌یەوە تابڵێی پەسەندە، جگە لەوەش کە لەوپەڕی پێویستیدایە. تەنانەت یەکێکە لە خواستی دەستوورەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی گرۆی مرۆڤ.

❏ **مەسەلەی بیستەم:**

هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە و، سەرهەڵدانی "دابة الأرض".

سەبارەت بە هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، ئەوا نیشانەیەکی بەدیهی و بەڵگەنەویستی بەرپابوونی قیامەتە و، لەبەر ئەم بەدیهی‌بوونەشی واتاکەی گەلێ ڕوونە و پێویستی بە تەفسیر و تەئویل نی‌یە. چونکە ڕووداوێکی ئاسمانی‌یە و بە هۆیەوە دەرگای تەوبە دادەخرێت کە کارێکە پەیوەندیی بە ئیختیاری ژیری‌یەوە هەیە. بەڵام شتێك هەیە، کە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

هۆکاری ڕواڵەتیی ئەو خۆرهەڵهاتنە پێچەوانەیە – والله أعلم – ئەمەی خوارەوەیە:

قورئانی پیرۆز – کە وەك ژیریی گۆی زەوی وایە – کاتێ کە لەم سەر زەوی‌یە هەڵدەگیرێت، زەوی عەقڵ و ژیریی لەدەست دەدات و بە فەرمانی خوای گەورە بەر هەسارەیەکی گەڕۆکی تر دەکەوێت و لە جووڵانەوەکەیدا پاشە و پاش دەگەڕێتە دواوە و، بە ویستی خوای گەورە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا – لە بریی لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات – دەخولێتەوە و، ئەو کاتەش خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

بەڵێ، کاتێك کە هێزی کێشی قورئانی پیرۆز بچڕا، کە دەستاوێزی مەحکەمی خواوەندە و زەوی بە خۆرەوە و فەرش بە عەرشەوە دەبەستێت، ئەوا ئەو کاتە جڵەوی گۆی زەوییش دەبچڕێت و بە چەشنێکی هەڕەمەکی و سەرلێ‌شێواوانە دەخولێتەوە و بەهۆی هەڵگەڕانەوەی و بچڕانی شیرازەی جموجووڵەکەی، "خۆر" لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

جگە لەمە، فەرموودەکە تەئویلێکی تریشی هەیە، کە بریتی‌یە لەوەی:

بە فەرمانی تەقدیرکراوی خوای گەورە، قیامەت لە ئەنجامی بەریەك‌کەوتنی زەوی و هەسارە گەڕۆکەکانەوە بەرپا دەبێت.

سەبارەت بە "دابـــة الأرض"یشەوە، ئەوا لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیەکی یەکجار پوختی بۆ کراوە و، گوفتارێکی یەکجار کورتیش بە زمانی حاڵی ئەو باس کراوە.

بەڵام ئێستا – بە وێنەی مەسەلەکانی تر – قەناعەتی تەواوەتی و زانیاری‌یەکی دوور و درێژ و بێ گومانم لە بارەیەوە نی‌یە. لەگەڵ ئەوەشدا – ولا يعلم الغيـــب الا الله – دەتوانم بڵێم:

هەروەك خوای گەورە ئافاتی ئەسپێ و کوللەی بەسەر قەومی فیرعەوندا و، باڵندەی "ئەبابیل"یشی بەسەر سوپاکەی ئەبرەهەدا زاڵ کرد کە هاتبوون کەعبەی پیرۆز

بروو خێنن، بە هەمان جۆر ئەو کەسانەش کە بە ویست و ملکەچی و زانین و ئاگاداریی خۆیان شوێن فیتنەی سوفیانی و دەجالەکان دەکەون و، لە سەرپێچی و فەساد و ستەم و لە ڕێترازاندا ڕۆ دەچن و، بە هاندەری ئەو تیرۆر و ئاژاوەیەی کە یەئجووج و مەئجووج بڵاوی دەکەنەوە، بۆ ناو کوفر و ئیلحاد و ناشکوری و وەحشی گەری و غەدرکاری بەردەبنەوە، ئەوانە لەبەر حیکمەتێکی پەروەردگار و بۆ هێنانەوەبەری ژیری‌یان، لە زەوی‌یەوە زیندەوەرێکیان بۆ دێتە دەرەوە کە زاڵ دەکرێت بەسەریاندا و بە تەواوەتی تەفرو توونایان دەکات.

ئەو "دابة"یە – واللّٰه أعلم – "جۆر"(نوع)ە، نەك تاك(فرد). چونکە گەر یەك تاك و یەك دانە زیندەوەری یەکجار گەورە بێت، ئەوا ناگاتە هەموو کەسێك لە هەموو شوێنێکدا. کەواتە جۆر و تیرەیەکی ترسناکی زیندەوەرانە و، لەوانەیە وەك ئەو مۆرانەیە وابێت کە تەختەدار دەقرتێنێت و دەیخوات، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿إلاّ دابَّـةَ الأرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ﴾ (السبأ:١٤). جا ئەم زیندەوەرەش بە وێنەی ئەو مۆرانەی تەختەیە ئێسکی مرۆڤ دەقرتێنێت و لە ناوەوە کلۆری دەکات و لە هەموو بەشەکانی جەستەی مرۆڤدا، هەر لە دانەکانیەوە تا دەگاتە نینۆکەکانی جێی خۆی دەکاتەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەو "دابة"یە لە بارەی "ئیمان"ەوە دەخاتە گوفتار و، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەش کە ئیمانداران بەهۆی بەرەکەتی ئیمانەکەیان و دوورەپەرێزی‌یان لە هەرزەیی و هەڵەخەرجی و ئیسراف و بەدڕەوشتی، ڕزگاریان دەبێت لێی.

﴿رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إنْ نَسِيْنَا أَوْ أَخطَأْنَا﴾.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

* * *

## (پاشماوەی بیست مەسەلەکەی پێشوو لە سێ مەسەلەی بچووکدا)

### ❑ مەسەلەی یەکەم:

لە ڕیوایەتەکاندا ناوی "مەسیح" لە حەزرەتی عیسا - درוودی لەسەر بێت - نراوە، کەچی هەمان ناو لە هەردوو دەجاڵەکەش نراوە! وەك لەو ئیستیعازەیەدا بەرچاو دەکەوێت کە تیایدا وتراوە: "من فتنة المسيح الدجال". جا ئایا حیکمەت و تەئویلی ئەم ناوە چییە[1]؟

**وەڵام:**

حیکمەتی ئەوە - والله أعلم - بریتییە لەمەی خوارەوە:

حەزرەتی عیسا - درוודی لەسەر بێت - بە فەرمانی خوای گەورە هەندێ لەو ئەرکە قورسانەی لەسەر خەڵکی لابرد کە لە شەریعەتی حەزرەتی مووسادا - درוודی لەسەر بێت - هەبوو. هەروەك هەندێ شتی وەك "خەمر"ی حەڵاڵ کرد لەوانەی کە دەروونەکان حەزیان لێ دەکرد. جا "دەجالی گەورە"ش بەهۆی هاندان و دەمڕاستیی شەیتانەوە، هەمان شت دەکات و، بەشێك لە ئەحکامەکانی شەریعەتی حەزرەتی عیسا - درוודی لەسەر بێت - لادەبات و ئەو پەیوەندییانەش لێك دەترازێنێت کە ژیانی کۆمەڵایەتی نەصرانییەکانی پێ بەڕێوەدەچێت. بەم کارەش ڕێگا و بارودۆخ بۆ نانەوەی ئاژاوە و تۆقاندن و هاتنی یەئجووج و مەئجووج خۆش دەکات.

"سوفیانی"ش، کە دەجالی موسڵمانانە بە پیلانی دەروونی بەدخواز و یارمەتیی شەیتان، هەوڵ دەدات کە بەشێك لە ئەحکامە نەمر و هەمیشەییەکانی شەریعەتی محەممەدی - علی صاحبها أفضل الصلاة والسلام - هەڵبگرێت و، لەم ڕێیەوە پەیوەندییە ماددی و مەعنەوییەکانی گرژی مرۆڤ لێکدەترازێنێت و پەتی دەروونە سەرسامە دەمارگیرەکان دەبچڕێنێت، تاکو بەرەڵا و سەرگەردان ببن. لە ئەنجامی

---

(١) (حافظ ابن حجر)ی عەسقەلانی لە "فەتح"دا ١٣/ ٩٤ دەفەرموێت: مامۆستاکەمان کە "مەجدەددینی شیرازی"ی خاوەنی قامووسە، دەگێڕێتەوە کە پەنجا هۆکاری لەمەڕ ناونانی "دەجال"ی بەم ناوە لەلا کۆبووەتەوە. (وەرگێڕ)

ئەمەشەوە پەیوەندی‌یە نوورانی‌یەکانی چەشنی "ڕێز" و "خۆشەویستی" کە خەڵکانی ناو کۆمەڵگای مرۆڤ پێکەوە گرێ دەدەن، یەك لە دوای یەك هەڵدەوەشێنەوە و، بە زۆرە ملێ خەڵکی ناچاری ئازادی و سەربەستی‌یەك دەکات کە لە ڕاستی و ناوەڕۆکدا ئیستبداد و دیکتاتۆری‌یەتە، تاکو دەروونە سەرگەردان و لە ڕێ ترازاوەکان، لەناو چلکاوی هەوا و ئارەزووەکان و ڕەوشت پیسیدا، جەنگ و ململانێ بکەن. بەمەش ڕێگا لە بەردەم تۆقاندنێکی چەپەڵ و ئاژاوەیەکی ترسناکی ئەوتۆدا دەکاتەوە کە لەو کاتەدا مەگەر بە ئیستبدادێکی لەوپەڕی توندوتیژیدا، دەنا بە هیچ شتێك ئەو خەڵکانە ملکەچ نەکرێن.

**❐ مەسەلەی دووهەم:**

ڕیوایەتەکان چەند کارێکی دەراسای هەردوو دەجالەکە و توانای زۆر و زەبەندەیان و سام و شکۆ و گەورەیی لەڕادەبەدەریان باس دەکەن، بە ڕادەیەك کە هەندێ خەڵکی بەدبەخت شتێك لە "خوایەتی" دەدەنە پاڵ ئەو دەجالانە! بەڵێ، ڕیوایەتەکان بەم جۆرە باسیان کردوون. ئایا هۆکاری ئەمە چی‌یە؟

وەڵامەکەی – والعلم عند الله – بەم جۆرەیە:

گەورەیی و دەراسایی کار و ئاڵوگۆڕەکانیان هی ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کارانە خەڵکی بەرەو کاولکاری و هەوای دەروون دەدەنە بەر، هەر لەبەر ئەوەیە کە دەتوانن بەوپەڕی ئاسانی چەند کارێکی لەڕادەبەدەر ئەنجام بدەن، چونکە – وەك زانیمان – ئەو کارانە هەموویان لە جۆری "تێکدان" و "کاولکاری"ن. تەنانەت ئەوەش کە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە: "یوم کسنة" ئەوە دەگەیەنێت کە: ئەو کارانەی دەجالەکان بە ماوەی ساڵێك ئەنجامیان دەدەن، بە ماوەی سێ‌سەد ساڵ ئەنجام نادرێت.

چوار هۆکار و ڕوو بۆ دەرکەوتنی توانا لەڕادەبەدەرەکەیان هەیە:

*یەکەمیان:*

بە ناحەقی و درۆ و لە ڕێی ئیستدراجەوە هەموو ئەو کردەوە چاك و پێشکەوتنانە دەدەنە پاڵ خۆیان کە بە هێزی سوپای ئازا و نەتەوەی چالاکەوە بەدەست هێنراون و، هەر ئەمەشە کە دەبێت بەهۆی ئەوەی وا بزانرێت "کەس"ی ئەوان هێندەی هەزار کەس

بەتوانا بن. کەچی قاعیدە و دەستوور و حەقیقەت داخوازی ئەوەن کە هەر چاکە و شەرەفمەندی و دەستکەوت و کردەوەیەکی ئیجابی کە داهاتی "کۆمەڵ" بێت بەسەر یەك بە یەکی کەسانی ئەو کۆمەڵەدا دابەش بکرێن و بە هی ئەوان دابنرێن، بەڵام کردەوەی خراپ و سەلبی و تێکدان و زیانەکان بخرێتە ئەستۆی قسوور و خراپیی کاری بەڕێوەبردنی سەرۆکی ئەو کۆمەڵەوە.

بۆ نموونە:

ئەگەر تیپێکی سوپا هێرش بەرنە سەر قەڵایەك و بیگرن، ئەوا شەرەفی سەرکەوتن و ئەو دەستکەوتانەش کە لەم سەرکەوتنەدا بەدەستی دەهێنن هی هێزی چەکی ئەوانە، بەڵام گەر زیان و کاری سەلبی لەم هێرش و هەڵمەتەدا ڕووبدات ئەوا لە ئەستۆی فەرماندەکەیاندایە.

جا بە پێچەوانەی ئەم دەستووورە بنەڕەتییەی کە لەسەر بناغەی حەق و حەقیقەت دامەزراوە، ئەو سەرکردە ترسناکانە لە ڕێی ئیستدراج و فێڵ و تەڵەکەوە، خۆشەویستی خەڵکانی بێئاگا بۆ خۆیان بەدەست دەهێنن، لە کاتێکدا کە شایانی ئەوەن کە ڕق و قینی هەموو خەڵکیان ئاراستە بکرێت. ئەمەش بەوەی کە هەموو چاکەکاری و پێشکەوتن و کارێکی ئیجابی دەدەنە پاڵ خۆیان و خراپە و هەڵە و کارە سەلبییەکان دەخەنە ئەستۆی نەتەوە هەژار و کڵۆڵەکەیانەوە.

*هۆکار و ڕووی دووهەم:*

هەردوو دەجاڵەکە بە دیکتاتۆرییەتێکی ڕەها و تۆقاندنێکی سەخت و ستەمێکی چەپەڵ و توند و تیژییەکی لەڕادەبەدەر، حوکم و فەرمانی خۆیان ڕایی دەکەن. بۆیە وا دەردەکەوێت کە خاوەنی توانایەکی مەزن بن.

بەڵێ، ئیستیبدادەکەیان گەلێ سەیرە! بە ڕادەیەك کە لە ژێر پەردەی "یاسا"دا خۆیان لە ویژدان و، موقەددەسات و، تەنانەت جۆری بەرگ و پۆشاکی هەموو کەسێکدا هەڵدەقورتێنن!

پێم وایە موسڵمانان و تورکەکانی چەرخی دوایی کە بانگەشەیان بۆ "ئازادی" دەکرد، بە هەستی پێش وەخت بەم ئیستیبدادەیان زانیبوو، بۆیە تیریان ئاراستە کرد و هێرشیان کردە سەر. بەڵام بە تەواوەتی خەڵەتابوون و نیشانەکەیان نەپێکا. چونکە هێرشیان بۆ سەر شوێنی شەڕ و بەرەی پێکدادان نەکرد!

ستەم و توند و تیژییەکەشیان هێندە چەپەڵ و ناڕەوایە کە بە تاوانی "یەك" دانە کەس "سەد" گوند دەڕووخێنن و کەسانی بێتاوان سزا دەدەن و لە شوێنی خۆیان ڕاپاندەگوێزن و زەلیل و ڕسوایان دەکەن.

*هۆکار و ڕووی سێهەم:*

هەردوو دەجاڵەکە هاوکاریی ڕێکخراوە پەنهانەکانی "جولەکە" بەدەست دەهێنن، لەوانەی کە ڕق و قینێکی یەکجار زۆریان لە ئیسلام و نەصرانییەکانە. هەروەها پشتگیریی ڕێکخراوێکی ترسناکی تر کە لە ژێر پەردەی ئازادیی ئافرەتاندا کار دەکات بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن. تەنانەت دەجاڵی موسڵمانان دەتوانێت لیژنە و کۆمیتەکانی ماسۆنییەکان بخەڵەتێنێت و خۆشەویستی و پشتگیرییان بۆ خۆی بەدەست بهێنێت.. لەبەر ئەمەیە کە وا دەزانرێت توانایەکی لەڕادەبەدەر و گەورەیان بێت.

لە پەیبردن و وردەکاریی هەندێ ئەولیای پیاوچاکەوە دەردەکەوێت کە ئەو دەجاڵە سوفیانییەی سەرۆکایەتیی دەوڵەتی ئیسلام دەگرێتە دەست، سەرۆك وەزیرانێك بۆ حکوومەتەکەی پەیدا دەکات کە لەوپەڕی توانا و کارامەیی و زیرەکیدا بێت و لە هەمان کاتیشدا حەز لە خۆدەرخستن نەکات و بایەخ بە ناوبانگ دەرکردن نەدات.. هەروەها سەرکردەیەکی گشتی بۆ سوپا دەدۆزێتەوە کە لەوپەڕی ئازایەتی و بەتوانایی و توندوتۆڵی و چالاکیی بەردەوامدا بێت و، لە هەمان کاتیشدا هیچ بایەخێك بە ناوبانگ نەدات. ئیتر "دەجاڵی سوفیانی" ئەم دوانە بۆ ئامانجە کەسییەکانی خۆی ژێربار و ملکەچ دەکات و، دوورەپەرێزییان لە ڕیا و خۆدەرخستن دەقۆزێتەوە و هەموو ئەو کارە گەورە و مەزنانە دەداتە پاڵ خۆی کە ئەم دوانە بە زیرەکی و لێهاتنی خۆیان ئەنجامیان دەدەن..

ئیتر بەم هۆکارە، هەموو ئەو نوێکاری و ئاڵوگۆڕ و پێشکەوتنەی کە دەوڵەت و سوپا مەزنەکەی بە هاندەری پێویستی و لە ئەنجامی جەنگی جیهانییەوە بەدەستیان هێناون، هەموویان دەداتە پاڵ خۆی و، ئنجا کەسانی مەدح و سەناخوان دەخاتە ناو خەڵکییەوە تاکو لە نێوان خەڵکیدا پروپاگەندەی ئەوەی بۆ بڵاوبکەنەوە کە گوایا هێزێکی سەیری دەراسا و توانایەکی لەڕادەبەدەر لە کەسی ئەودا هەیە!

*هۆکار و ڕووی چوارەم:*

دەجالی گـەورە چەند هەستیارێکی هەیە کە بە وێنەی "خەواندنی موگناتیسی" و "کارکردنە سەر گیانەکان" دارای کاریگەری و گوێڕایەڵ کردنن.. دەجالی موسڵمانانیش هێزێکی موگناتیسیی ڕامهێنان و مل پێ کەچکردن لە چاوێکیدا هەیە. بە ڕادەیەك لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە: "إنه أعـور" و بەمەش سەرنجی خەڵکیی بۆ لای چاوی ئەو ڕاکێشاوە. جا ئەم فەرموودەیە ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی کە دەجالی گەورە چاوێکی کوێرە و دەجالەکەی تریش چاوێکی سڕراوەتەوە. واتە سەبارەت بە چاوەکەی تری وەکو کوێر وایە. هەروەها هاتووە کە: هەردوو کیان کافری موتڵەقن و تەنها یەك چاویان هەیە کە ژیانی دنیای پێ دەبینن. بەڵام ئەو چاوەیان کە دەتوانێت دواڕۆژ و ئاخیرەت ببینێت کوێرە و سڕراوەتەوە.

لە جیهانێکی مەعنەویدا دەجالی موسڵمانانم دی و بە چاوی خۆم ئەو هێزە ڕامکەرە موگناتیسییەم لە یەکێك لە چاوەکانیدا بینی و، زانیم کە بە تەواوەتی "ئینکاریی خوا" دەکات. هەر ئەم ئینکارییەشە کە هانی دەدات بە پرکێشی و جورئەتەوە هێرش بکاتە سەر موقەددەسات. بەڵام خەڵکی ئەم ڕاستییە نازانن و، پێیان وایە کە بە جورئەتێکی لەڕادەبەدەر و توانستێکی گەورە کارەکانی ڕادەپەڕێنێت!

ئەو نەتەوە سەربەرزەی کە ئێستا دووچاری شکست بووە، چەندە بە هەڵەدا چووە و دووچاری زیان بووە کە بە هاندەری ڕێزنانی لە قارەمانێتی، دەچێ بە شان و باڵی پاڵەوانێتی ئەم سەرکردە فێڵبازە لە خشتەبەرەدا دەخوێنێت کە بەخت و ناوبانگ و چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێناوە و، چاو لە ماهییەتە ڕاستەقینەکەی دەنووقێنێت و هەوڵی شاردنەوەی خراپکارییەکانی دەدات.. بەڵام - وەك لە ڕیوایەتەکانەوە هەست پێدەکرێت - نووری "ئیمان" و ڕووناکی "قورئان" لەناو گیانی سوپای پاڵەوانی موجاهید و نەتەوەی ئاییندارردا حەقیقەتی حاڵ پێشچاوی ئەو سوپایە دەخەن و ئیتر ئەوانیش هەوڵی چاکسازی و ئاوەدانکردنەوەی تێکدان و کاولکارییە ترسناکەکانی ئەو سەرکردەیە دەدەن.

❑ **سێهەم مەسەلەی بچووك:**

بریتییە لە سێ ڕووداوی پڕ لە پەند و عیبرەت:

◆ **ڕووداوی یەكەم:**

ڕۆژێكیان ئیمامی عومەری كوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێت - لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بە ڕێدا دەڕۆشت. پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ منداڵێكی نێوان منداڵە جوولەكەكان كرد و فەرمووی: "ئەمە شێوە و وێنەكەیەتی". حەزرەتی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - وتی: لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با لە گەردنی بدەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "گەر ئەوە خۆی بێت - واتە سوفیانی بێت - تۆی بەسەردا زاڵ ناكرێیت، گەر خۆیشی نەبێت ئەوا هیچ خێرێكت لە كوشتنیدا دەست ناكەوێت"[(١)].

ئەم ڕیوایەتە ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە شێوە و وێنەكەی لە سەردەمی حوكمڕانی‌یەكەیدا لە زۆر شتدا دەردەكەوێت، هەروەها ئاماژەیە بۆ ئەوەش كە لەناو جوولەكەدا لەدایك دەبێت.

گەلێ كارێكی نامۆ و جێی سەرنجە كە ئەو حەزرەتی عومەرەی - خوای لێ ڕازی بێت - ڕق و دوژمنایەتی‌یەكی زۆری لە شێوەكەی ئەو دەجالە سوفیانی‌یە هەڵسا كە لە ڕوخساری منداڵێكدا بەرچاوی كەوت و تەنانەت ویستیشی بیكوژێت، ئەو سوفیانی‌یە گەلێ سەنا و ستایشی ئەوی دەكرد و بە ڕێزەوە ناوی دەهێنا!

◆ **ڕووداوی دووهەم:**

زۆر كەس دەگێڕنەوە كە: دەجاڵی موسڵمانان زۆر پەرۆش بووە بۆ واتای سوورەتی: ﴿**والتين والزيتون**﴾ و پرسیاری لە بارەوە كردووە.

سەیر لەوەدایە كە سوورەتی: ﴿**إقرأ باسـم ربـك**﴾ ڕاستەوخۆ لە دوای سوورەتی ناوبراو دێت و، ئەم ئایەتە پیرۆزەی تێدایە: ﴿**إِنَّ الإِنْسانَ لَيَطْغَى**﴾ كە بە واتاكەی و بە حسابی زانستی جەفر ئاماژە بۆ پلەوپایە و خودی كەسی ئەو دەكات. جگە لەوەش كە بەڵگەیە بۆ دەستدرێژی كردنی لەسەر نوێژكەران و مزگەوتەكان.

---

(١) عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال: إن عمر بن الخطاب انطلق مع رسول الله ﷺ في رهط من أصحابه قبل ابن صياد، حتى وجده يلعب مع الصبيان عند أطم بني مغاله... فقال عمر بن الخطاب ذرني يا رسول الله أضرب عنقه، فقال له رسول الله ﷺ: "أن يكنه، فلن تُسلَّطَ عليه وإن لم يكنه فلا خيرَ لك في قتله". رواه البخاري ومسلم ٢٩٢٤، ٢٩٣٠، وأبو داود ٤٣٢٩ وغيرهم بألفاظ متقاربة. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەكەوە هێناویەتی).

واتە ئەو کەسە ئیستیدراج کراوە هەست دەکات کە سوورەتێکی کورتی قورئان پەیوەندی‌یەکی بەمەوە هەیە، بەڵام بە هەڵەدا دەچێت و لە دەرگای دراوسێکەی دەدات!

◆ **ڕووداوی سێهەم:**

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە: دەجالی موسڵمانان لە خۆراسانەوە سەرهەڵدەدات[(١)].

تەئویلێکی ئەمە – ولا یعلم الغیب الا الله – بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

گەلی "تورك" کە ئازاترین و بەهێزترین نەتەوەکانی خۆرهەڵاتن و لەناو سوپای ئیسلامیشدا لە هەموویان زۆرتر و ئازاتر و بە جەرگترن، لە کاتی ئەو ڕیوایەتەدا لە دەوراندەوری خۆراساندا نیشتەجێ بووبوون و هێشتا نەهاتبوونە ناو ئەنادۆڵەوە. جا ئەم ڕیوایەتە بە ناوهێنانی نیشتەجێی ئەو کاتەیان ئاماژە بۆ سەرهەڵدانی "دەجالی سوفیانی" لەناو ئەواندا دەکات.

گەلێ سەیر و نامۆیە کە ئەو گەلی تورکەی هێمای عیززەت و شەرەفی ئیسلام بووە و ماوەی حەوت سەد ساڵ شمشێرێکی ئەڵماسی نایاب بووە بەدەست ئیسلام و قورئانەوە، کەچی دەجالی سوفیانی هەوڵ دەدات کە – بە جۆرێکی کاتی – ئەو گەل و نەتەوەی تورکە لە دژی هەندێك لە شەعائیرەکانی ئیسلام بەکاربهێنێت.. بەڵام خەیاڵی خاوە و لە هیچ کارێکیدا سەرناکەوێت و، بەرەودوا دەڕواتەوە، وەك مرۆڤ لە ڕیوایەتەکانەوە تێدەگات کە: "سوپای پاڵەوان جلەوی خۆیانی لەدەست دەرباز دەکەن".

والله أعلم بالصواب.

ولا يعلم الغيب إلا الله.

---

(١) عن أبي بكر الصديق رضي الله عنه قال: حدثنا رسول الله ﷺ: (إن الدجال يخرج من أرض بالمشرق يقال لها، خراسان، يتبعه أقوام كأن وجوههم المجان المطرقة). حديث صحيح. رجاله ثقات. أخرجه أحمد برقم ١٢، ٣٣، والترمذي رقم ٢٢٣٨ في الفتن باب ما جاء من أين يخرج الدجال. وابن ماجة (٤٠٧٢) في الفتنة باب فتنة الدجال كذا في مسند أبي بكر الصديق تحقيق شعيب الأرناووط رقم الحديث ٥٧ ص١١٨ – ١١٩. (وەرگێر – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی).

# تیشکی شەشەم

## بریتی‌یە لە تەنها دوو سەرنج

بسم الله الرحمن الرحیم

**لەم تیشکی شەشەمەدا بە پوختی تەنها دوو سەرنج باس دەکرێت لە نێوان ئەو سەدان سەرنجانەی کە تەحیاتی نوێژ (التحیات، المبارکات، الصلوات، الطیبات) لەخۆی گرتوون. ئەم دوو سەرنجە – لە ڕاستیدا – دوو پوختە وەڵامن بۆ دوو پرسیار کە پەیوەندی‌یان بە دوو خاڵی ناو تەحیاتەوە هەیە. بەڵام ڕاستی‌یەکانی تری تەحیات – پشت بە خوا – بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین.**

**❐ پرسیاری یەکەم:**

حیکمەتی خوێندنی وشە پیرۆزەکانی "تەحیات" چی‌یە لە نوێژدا، لە کاتێکدا کە ئەو وشانە هی گفتوگۆیەك بوون شەوی میعراج لە نێوان پەروەردگاری شکۆمەند و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیدا ﷺ ڕووی داوە؟

**وەڵام:**

"نوێژ"ی هەموو ئیماندارێك بریتی‌یە لە "میعراج"ی ئەو ئیماندارە. خۆ ئاشکرایە کە وشە و گوفتاری شایستەی ئەو ئامادە بوونەی ئیماندار لە بەردەم خوای گەورەدا، تەنها هەر ئەو وشانەیە کە لە میعراجی پێغەمبەری سەروەرماندا ﷺ بەکارهێنراون!

مرۆڤ به وتنی ئـه‌م وشـانه لـه نوێژه‌که‌یدا ئه‌و گفتوگۆ به‌رز و هاوده‌می‌یه پیرۆزه‌ی میعراجی بیر ده‌كه‌وێته‌وه. به‌م یادكردنه‌وه‌یه‌ش واتای ئه‌و وشه جوان و خاوێنانه‌ی كه لـه زاری ده‌رده‌چن بۆ ئاسته هه‌مه‌كی‌یه بڵنده‌كان بـه‌رز ده‌بنـه‌وه و لـه ئاسته هه‌نده‌كی‌یه‌كان ڕزگاریان ده‌بێت و، واتا كوللی و گشتگیر(محیـــط) و به‌رزه‌كانیان ته‌سه‌وور ده‌كرێن، یاخود ده‌گونجـێ ته‌سـه‌وور بكرێن. خۆ هـه‌ر بـه‌م ته‌سه‌ووركردنه‌شه به‌های به‌رزی ئه‌و وشانه ده‌رده‌كه‌وێت و ڕووناكی‌یه‌كانیشیان بڵاو ده‌بنه‌وه.

بۆ نموونـه: پێغه‌مبـه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ لـه‌و شـه‌وه پیرۆزه و لـه حـوزووری خـوای گه‌وره‌دا، له بریی " سه‌لام" فه‌رمووی: "التحيات لله"..

واتـه هـه‌رچی ته‌ســبیحاتی لـه‌مـه‌ڕ "ژیـان" هه‌یـه و زینــده‌وه‌ران بـه ژیانه‌كـه‌یان ده‌ریانده‌خـه‌ن.. هـه‌روه‌ها سـه‌رجه‌می دیاری‌یـه سروشتی‌یه‌كانیشـیان كـه پێشكه‌شـی به‌دیهێنه‌ری مه‌زنی خۆیانی ده‌كه‌ن.. هه‌رهه‌موویان، تایبه‌تن به ته‌نیا تۆ ئه‌ی په‌روه‌ردگارم! وا منیش لـه لایـه‌نی خۆمـه‌وه و بـه ته‌سـه‌ووركردنم بۆ هـه‌موو ئه‌مانـه و بـاوه‌ڕبوونم پێیـان، سه‌رجه‌می ئه‌و ته‌سبیحات و دیاری‌یانه‌ت پێشكه‌ش ده‌كه‌م.

به‌ڵێ، هه‌روه‌ك پێغه‌مبه‌ری مه‌زن ﷺ به وشه‌ی "التحيات" نییه‌تی لـه هـه‌موو په‌رستشـه سروشتی‌یه‌كانی سه‌رجه‌می زینده‌وه‌ران هێنا و پێشكه‌شی باره‌گای په‌روه‌ردگاری مه‌زنی كردن، هه‌ر ئه‌و پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته ﷺ به فه‌رمایشتی "المباركات"یـش - كـه پوختـه‌ی "التحيـات"ه - هـه‌مان شـت ده‌فـه‌رموێت و ده‌ری ده‌بڕێـت، بـه‌ڵام بـه واتایـه‌كی هێنـده فراوانتر كه په‌رستشی سروشتی و خێروبێر و پیت و به‌ره‌كه‌تی (سـه‌رجه‌می به‌دیـهاتووان) له ئامێز ده‌گرێت، ئه‌و به‌دیهاتووانه‌ی كه مایه‌ی پیت و به‌ره‌كه‌تن و شایانی پیرۆزبایی لـێ كردنـن لـه لایـه‌ن بینه‌رانیانـه‌وه و، بریتـین لــه پوختــه‌ی (ژیــان و زینــده‌وه‌ران)، بــه تایبه‌ت"تۆو"و "ناوك"و"ده‌نكه دانه‌وێڵه"و"هێلكه"و "گه‌را"كان.

هـه‌ر ئـه‌و پێغه‌مبـه‌ره سـه‌روه‌رهﷺ بـه وشـه‌ی "الصلـوات"یـش - كـه پوختـه‌ی "المباركات"ه - ته‌سه‌ووری په‌رستشه تایبه‌تی‌یه‌كانی "گیـانداران" ده‌كات كه پوخته‌ی زینده‌وه‌رانن و، به واتـا فـراوان و هه‌مـه لایه‌نگره‌كه‌یـه‌وه لـه حـوزووری خـوای گـه‌وره‌دا پێشكه‌شی ده‌كات.

ئنجــا نیازی پێغەمبەر ﷺ لە وشــەی "الطیبات"یش - كــە پوختــەی "الصلـوات"ە - پەرستشە بڵند و نوورانی‌یەكانی "مەلائیكەت"ە لەخوا نزیكەكان و "مرۆڤە كامڵەكان"ە، كە پوختەی گیـاندارانن. بۆیە بە تایبەتی هەموو ئەو پەرستشـانەی ئەوان پێشكەشـی خواوەندی پەرستراوی خۆی دەكات.

پاشان فەرمایشتەكەی پەروەردگاری مەزنیش كە لەو شەوەدا بە پێغەمبـەری فـەرموو: (السلام علیك أیها النبي) وا دەباتە هەستی مرۆڤەوە كە فەرمانێك بێت بۆ هەموو كەسێك لەو سەدان ملیۆن مرۆڤانەی لە ئایندەدا دێن، تاكو هەموو یەكێكیان لـە هەموو ڕۆژێكـدا بەلای كەمەوە (دە)جار بڵێن: (السلام علیك أیها النبي)! ئیتر ئەم سڵاوەی خوای گەورە، نوورێكی گشتگیر و واتایەكی بەرز و بڵند بەو وشەیە دەبەخشێت.

هـەروەك وەڵامدانەوەكەی پێغەمبـەری مـەزنیش ﷺ بـۆ سـڵاوەكەی خـوای گــەورە: (السـلام علینـا وعلـى عبـاد الله الصـالحین) ئـەوە یـادی مـرۆڤ دەخاتـەوە كـە پێغەمبـەری خۆشـەویســت ﷺ بـە تكـا و لالانـەوە داوای لــە خــوای گــەورە كـردووە كــە نــەتەوە مەزنەكەی و پیاوچاكـانی ئوممەتەكـەی لـە داهـاتوودا ئـایینی ئیسـلامیان تێدا بەرجەسـتە ببێـت، كـە ئایینێكـە ئاشتی و سـڵاوی خـوای گــەورە دەنوێنێــت، هــەروەها ســەرجەمی نەتەوەی ئیسلامیش ئەو دروشمە ئیسلامی‌یە گشتی‌یە لە نێوان خۆیاندا بڵێنەوە كـە بریتی‌یـە لە (الســلام علیك) و (علیك السـلام)! خـۆ فـەرمـایشــتەكـەی حـەزرەتی جیـبریلیش - دروودی لەسەر بێت - كە بەشێكی لەو هاودەمی‌یە بـەرز و بڵنـدەی شـەوی میعراجدا هەیە و، بە فەرمانی خواوەند فەرموویەتی: (أشهدُ أن لا إله إلاّ الله وأشـــهدُ أنَّ محمـــداً رسولُ الله) ئـەو فەرمایشتە، مژدەیەك بـووە بۆ ئـەوەی كـە: سـەرجەمی نەتـەوەی ئیسـلام هەمان شایەتی دەدەن و تا ڕۆژی قیامەت ئەم شایەتمانەیان لەسەر زارە و دەیڵێنەوە!

بەم جۆرە و بە یادكردنەوەی ئەم گفتوگۆ خاوێن و بەرزەی شەوی میعراج، واتای ئەو وشانە درەخشان و فراوان دەبن.

حاڵەتێكی ڕۆحیی نامۆ یارمەتیی دام كە ئەم ڕاستی‌یەم لـێ دەربكـەوێت، ئـەویش بـەم جۆرەی خوارەوە بوو:

لــە ماوەیــەكی پێــش ئێســتا و لــە نــاوەندی غەریبی‌یــەكی تــاریك و نووتــەك و شەوەزەنگێكی بێ تروسكایی و بێ‌ئاگایی‌یەكی چڕو پڕدا: كاتی (ئێستا)ی ئەم گەردوونە

لە شێوەی تەرمێکی ترسناکی بێ گیان و ژیان و چۆڵدا لـە ئەندێشـەم دەرکـەوت.. کـاتی بەسەرچووی (ڕابوردوو)ش بە هەمان جۆر سامناك و بێ گیان و بێژیان و خالی و چـۆڵ هاتە بەرچاوی ئەندێشەم. ئیتر لەو ڕوانگەیەوە ئەو "شوێن"ە بێسنوور و "کات"ە بەرین و بێ لێوارانە شێوەیەکی چۆڵ و پڕ لە ترس و بیمیان لەخۆ گرت. منیـش لـە ترسـاندا هانـام بردە بەر "نوێژ" تاکو لەو بارە ترسناك و پەرێشانە ڕزگارم ببێت..

هەر کـە لـە نوێژەکەمدا وتم: "التحيـات" یەکسـەر هەسـتم کـرد کـە سەرانسـەری گـەردوون گیـانی بە بـەردا کـرا و هـەموو گۆشەیەکیشـی ڕوونـاك بـووەوە و شـێوەی ئاوێنەیـەکی لـەخۆ گـرت بـۆ تیادەرکـەوتنی درەوشـانەوەکانی خواوەنـدی "حـەیی و قەییووم".

ئیـتر ئـەو کاتـە بـە "علـم اليقـين" بـەڵکو بـە "حـق اليقـين" زانیـم کـە: سەرتاسـەری گـەردوون، بــە هــەموو بەشــە حەیەویەکانیــەوە، هەمیشــە و بــەردەوام دیاریــەکانی "ژیان"یان و سڵاوەکانیان پێشکەشی خواوەندی "حەیی و قەییووم" دەکەن.

ئنجا کە وتیشـم: (السلامُ عليكَ أيّها النبيّ)! یەکسەر ئەوکاتـە چـۆڵ و سـامناك و بێ لێوار و سنوورەم لـە بەرچـاودا گـۆڕا و بوو بە باخچەیەکی پڕ لە گیـاندارانی ناسـك و نیـان و هـاوڕاز کـە بـە سـەرکردایەتی پێغەمبـەری خۆشەویسـت ﷺ ئـەو باخچـە و گوڵزارەیان ئاوەدان کردبووەوە.

❑ **پرسیاری دووهەم:**

ئەو تەشبیهەی کە لە کۆتایی تەحیاتدایە و بریتییە لە: "اللهم صلِّ على محمّدٍ و علـى آلِ محمّدٍ كما صَلّيتَ على إبراهيمَ و على آلِ إبراهيمَ" لەگـەڵ قـاعیدە و دەستوورەکانی تەشبیهدا یەك ناگرێتەوە، چونکە حەزرەتی محەممەد ﷺ لـە حـەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - گەورەترە و لەویش زیـاتر بەهرەمـەندی میـهرەبانیی خـوای گـەورە بـووە.. کەواتە:

چ نهێنییەك لەم تەشبیهەدا هەیە و؟

حیکمەتی تایبەتکردنی ئەم جۆرە سڵاواتە لە تەحیاتدا چییە و؟

چ نهێنییەك لەوەدا هەیە کە هەر لە دێر زەمانەوە تا ئێستا و لە لایەن ملیۆنـەها کەسـی دوعا گیراوە، هەمان نزا و پاڕانەوە دووپات دەبێتەوە و جـەخت لەسـەر ئـەم داواکارییـە

دەكرێت، لەكاتێكدا كە گیرابوونی تەنها یەك دوعا بۆ تەنیا یەك جار سەروزیادی هاتنەدیی مەبەستەكەیە، بە تایبەت كە بەڵێنێكی خوای گەورەشی لەگەڵدایە؛ ئەوەتا خواوەند بەڵێنی داوە و فەرموویەتی: ﴿عسى أَنْ يبعثَكَ رَبُّكُ مقاماً محموداً﴾ (الإسراء:٧٩). هەروەك لە بانگ و قامەتیشدا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەت كراوە: "وابعَثْه مقاماً محموداً الذي وَعَدْتَه"[١] خۆ ئەوەتا سەرجەمی نەتەوەی ئیسلام بۆ هاتنەدیی ئەم بەڵێنە لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە. ئایا چ نهێنییەك لەمەدا هەیە؟

**وەڵامی** ئەم پرسیارە، سێ پرسیار و سێ ڕووی لەخۆ گرتووە:

❍ **ڕووی یەكەم:**

هەرچەند حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - ناگاتە حەزرەتی محەممەدی سەروەرمان ﷺ بەڵام ئالی بەیتی ئیبراهیم هەموویان پێغەمبەر بوون، كەچی ئالی بەیتی محەممەد ﷺ هیچیان پێغەمبەر نین، بەڵكو ئەولیان. خۆ دیارە كە هەرگیز پلەی ئەولیا ناگاتە پلەی ئەنبیا (واتە پێغەمبەران، درووديان لەسەر بێت).

بەڵگەش لەسەر قبووڵ بوونی ڕوون و ئاشكرای ئەم دوعایەی كە تایبەتە بە ئالی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە كە:

زۆربەی ڕەهای ئەو پیاوچاك و ئەولیایانەی لە وەچەی دوو كەسی ئالی محەممەدن ﷺ (كە حەزرەتی حەسەن و حەزرەتی حسەینن، خوایان لێ ڕازی بێت) لە ناوەندی سێسەد و پەنجا ملیۆن موسڵماندا، ڕابەر و پێشەوای ڕێبازەكانی حەقیقەت و تەریقەت بوون و، پلەیەكیان بەدەست هێناوە كە وەك پلەی پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل وابێت، وەك وتراوە: "عُلَماءُ أمَّتي كأنبياءِ بني إسرائيل"[٢]. ئەوەبوو هەریەك لەوانە زۆرینەی نەتەوەی ئیسلامیان بەرەو ڕێی حەقیقەت و ڕاستییەكانی ئیسلام ڕێنمایی كرد. جا ئەو ڕابەرانە بەروبوومی گیرابوونی ئەو دوعا و نزایەن كە تایبەتە بە ئالی پێغەمبەرەوە ﷺ لە

---

(١) عن جابر مرفوعاً: من قال حين يسمع النداء: "اللهم ربّ هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته" حلت له شفاعتي يوم القيامة. رواه أحمد والبخاري والاربعة عن جابر مرفوعاً. (وەرگێر ـ لە چاپە عەرەبییەكەوە)

(٢) قال السخاوي في المقاصد: قال شيخنا يعني ابن حجر: لا أصل له. قال: وقال النجم: وممن نقله جازماً بأنه حديث مرفوع الفخر الرازي و موفق الدين بن قدامة وأشار الى الأخذ بمعناه التفتازاني والسيوطي في الخصائص. (باختصار عن كشف الخفاء ٢/٦٤) (وانظر تذكرة الموضوعات ص ٢٠). (وەرگێر ـ لە چاپە عەرەبییەكەوە هێناویەتی).

پێشەکیی ئەوانیشەوە: ئیمام جەعفەری صادق[1] و شێخی گەیلانی و شاهی نەقشبەندن، خوایان لێ ڕازی بێت.

❍ **ڕووی دووهەم:**

حیکمەتی تایبەتکردنی ئەم جۆرە سڵاواتانەش بە نوێژەوە، بریتی‌یە لەوەی کە:

ئەم سڵاواتە، شوێنکەوتن و هاوڕێیەتیی ئەو کاروانە مەزن و پیرۆزەی "پێغەمبەران" و "ئەولیاکان" دەخاتەوە یادی مرۆڤ، کە ڕووناکترین و کامڵترینی مەردە مەزن و بەڕێزەکانی گرۆی ئادەمیزادن و لە هەمووشیان زیاتر لەسەر ڕێی ڕاست بەردەوام بوون و لێی نەترازاون..

هەروەها ئەم سڵاواتە یادی دەخاتەوە کە ئەو ڕێگایەی گرتوویەتیە بەر، ڕاستە شەقامێکە پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - و ئەولیاکان ڕچەکەیان شکاندووە و پیایدا ڕۆیشتوون.. هەروەك ئەوەشی بیر دەکەوێتەوە کە: هێزی سەدان ئیجماع و تەواتور پشتی ئەو کۆمەڵە پیرۆزەیان گرتووە کە هەرگیز لە ڕێ ناترازێن.

جا بە یادکردنەوەی هەموو ئەمانەی کە باس کران، مرۆڤ لە شوبهە و گومانەکانی شەیتان و وەهمە بێ کەڵك و سوودەکان ڕزگاری دەبێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەولیاکانی پەروەردگار و ئەوانەی کە خواوەند لێیان ڕازی‌یە تەنها هەر بەشدارانی ئەم کاروانە پیرۆزەن و، نەیارەکانی ئەوانیش دوژمنان و ڕق لێبووانی خواوەندن لەناو بەدیهاتووەکانیدا، ئەوەیە کە: هەمیشە و هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - درووودی لەسەر بێت - ئەو کاروانە پیرۆز و بەڕێزە لە غەیبەوە پشتگیری کراون و، موسیبەت و گیروگرفتە ئاسمانی‌یەکانیش بەسەر نەیارەکانیاندا داباریوە.

بەڵێ، هەموو نەیارەکانی وەك: قەومی نووح و، سەموود و، عاد و، فیرعەون و، نەمروود. هەر هەموویان، بە چەشنێك کە مرۆڤ هەست بە تووڕەیی و سزای خواوەند

---

(١) ئیمام جەعفەری صادق (٨٠-١٤٨ك/٦٩٩-٧٦٥ز) کوڕی ئیمام محەممەد باقری کوڕی ئیمام عەلی زەینولعابیدینی کوڕی حەزرەتی حسەینە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. یەکێکە لە گەورە مەردانی تابیعین و پلەیەکی بلندی لە زانستدا بووە و چەند کەسێکی پایە بەرزی وەك ئیمامی ئەبوو حەنیفە و ئیمامی مالیك دەرسیان لە لا خوێندووە. لە دایك بوون و کۆچی دواییشی لە شاری مەدینەدا بووە. (وەرگێر)

بکات، زللەی غەیبیی‌یان تێ سرەوێنراوە.. کەچی کەسانی ناو کاروانە پیرۆز و مەزنەکە وەك: حەزرەتی نووح و ئیبراهیم و مووسا - درووديان لەسەر بێت - و حەزرەتی محەممەد ﷺ و سەرجەم پێغەمبەرە مەزن و بەرێزەکانی تری هاوچەشنیان و، گشت پێشەوا بەرز و بڵندەکان، موعجیزاتی گەورە و نیعمەت و بەخششی پەروەردگاريان، بە شێوەیەکی نائاسایی، خەڵات کراوە..

جا لە کاتێکدا کە تەنها یەك "زللە" دەبێت بە بەڵگە لەسەر رِق و، یەك "رِێزلێنان"یش دەبێت بە بەڵگەی خۆشویستن و پشتگیری.. دەبینین نەك تەنها یەك دانە بەڵکو هەزاران زللە ئاراستەی نەیارەکان کراوە و هەزاران رِێزلێنان و پشتگیریی مەعنەویش پێشکەشی مەردە پیرۆز و بەرزەکان کراوە. کە ئەمەش بە چەشنێکی بەڵگەنەویست و بە وێنەی رووناکیی رۆژگار دەبێت بە شایەت لەسەر رِاستی و حەقبوونی ئەو کاروانە بەرێزە و، بە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەوان لەسەر رێی رِاست بوون.

ئەوەش کە لە کۆتایی سوورەتی "فاتیحە"دا هاتووە و دەفەرموێت: ﴿**صراطَ الذين أنعمتَ عليهم**﴾ رووی لەو مەردە پیرۆزانەیە کە خواوەند نیعمەتی خۆی بەسەردا پەخشاندوون، کەچی: ﴿**المغضوب عليهم**﴾ و ﴿**الضالين**﴾ی کۆتایی ئەم سوورەتە، نەیارەکانی ئەوان دەگرێتەوە.

ئەم سەرنجەی کە لێرەدا خستمانە پێش‌چاو، لە کۆتایی سوورەتی فاتیحەدا زۆر بە جوانی روون کراوەتەوە.

❍ **رووی سێهەم:**

نهێنیی حیکمەتیش لە دووپات کردنەوە و جەخت کردنی نەتەوەی ئیسلام لەسەر ئەو داواکاری‌یەی کە بە دڵنیایی دەزانرێت خواوەند دەیبەخشێت، لەوەدایە کە ئەو شتە داوا کراوە - بە وێنەی مەقامی مەحمود - لە رِاستیدا چمك و لقی حەقیقەتێکی یەکجار مەزنە کە هەزاران حەقیقەتی گەورەی وەك مەقامی مەحموودی لەخۆ گرتووە و بەروبوومێکە بۆ مەزنترین ئەنجامی بەدیهێنانی گەردوون. خۆ داواکردنی ئەو بەروبووم و لق و چمکەش - لە رِاستیدا - بریتی‌یە لە:

داوای هێنانه‌دیی ئه‌و حه‌قیقه‌ته گشتی و مه‌زن و هه‌مه‌لایه‌نه‌یه و، هاتنه‌دیی ئـه‌و جیهانـه باقی‌یه‌ی که مه‌زنترین لقی دره‌ختی به‌دیهاتووانـه و، خواستی هاتنـه‌دیی حه‌شر و قیامه‌تـه که گه‌وره‌ترین ئه‌نجامی به‌دیهێنانی گه‌ردوونه و، داخوازی‌یه‌که بۆ کردنه‌وه‌ی ده‌رگـای خانـه‌ی به‌ختـه‌وه‌ری. جـا مـرۆڤ بـه‌م داواکـاری و پاڕانـه‌وه و خواسـته‌ی، ئـه‌وه‌ی ده‌که‌وێته‌وه یاد که خۆیشـی لـه‌و په‌رستش و پاڕانه‌وه‌یـه‌ی گـرۆی مرۆڤـدا به‌شـداره، کـه گرنگترین هۆی بوونی خانه‌ی به‌خته‌وه‌ری و به‌هه‌شتی هه‌میشه‌یی‌یه!

له‌م گۆشه‌ی ڕوانینه‌وه تێده‌گه‌ین که: ئه‌م دوعا و نزا بێ سنوورانه، هێشتا هه‌ر به کـه‌م داده‌نرێت سه‌باره‌ت به‌م ئامانجه مه‌زنه بێ سنووره.

هـه‌روه‌ها به‌خشینی (مـه‌قامی محمـود) بـه پێغه‌مبـه‌ری سـه‌ردارمان ﷺ ئاماژه‌یـه بـۆ شه‌فاعه‌ته مه‌زنه‌که‌ی که ده‌یکات بۆ سه‌رجه‌می نه‌ته‌وه‌کـه‌ی خـۆی. که‌واتـه پێغه‌مبـه‌ر ﷺ په‌یوه‌ندیی به به‌خته‌وه‌ریی سه‌رانسه‌ری نه‌ته‌وه‌که‌یه‌وه هه‌یه.

له‌به‌ر ئه‌مه‌یه که داواکردنی دوعای سڵاوات و میهره‌بانیی بێ سنوور له نه‌ته‌وه‌کـه‌ی، کارێکه عه‌ینی دانایی و حیکمه‌ته.

﴿سبحانك لاعلمَ لنا إلاّ ماعلَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ العليمُ الحكيمُ﴾.

# تیشکی حەوتەم

پەیامی (الآیة الکبری)

## ڕوونکردنەوە و بێداری‌یەکی گرنگ

سەرەڕای مەزنی و گرنگیی ئەم پەیامە، هەموو کەسێك لە هەموو بابەتەکانی بە تەواوی تێ‌ناگات، بەڵام لێیشی بێ‌بەهرە نابێت. چونکە ئەگەر یەکێك بڕواتە ناو باخێکی گەورە و دەستیشی بە هەموو میوە و بەرەکانی نەگات، ئەو ئەندازەیەی سەروزیادە کە دەستی پێیان دەگات، چونکە باخەکە تەنها بۆ ئەو دانەنراوە، بەڵکو کەسانی باڵابەرزیش کە دەستیان بەو پەلە بەرزانە دەگات بەشیان لە بەروبوومی ئەو باخەدا هەیە.

پێنج هۆکار هەن کە ڕێ لە تێگەیشتنی ئەم پەیامە دەگرن:

*یەکەمیان*: لەم گەشتەمدا، بەپێی تێگەیشتنی خۆم شتانم چۆن دیوە هەروەهایش نووسیومن. چونکە لە پێشدا بۆ خۆمم نووسیون. کەواتە وەك ئەو پەیامانەی تر نی‌یە تا بە گوێرەی ئاستی تێگەیشتنی کەسانی تر و مەودای وەرگرتنیان نووسرابێت.

*دووهەمیان*: تەوحیدی ڕاستەقینە لە شێوە مەزنەکەیدا و، لەبەر تیشکی ڕێژنەی درەوشانەوەی "ناوی هەرە مەزن"ی خوای گەورەدا نووسرا. بەم جۆرە، بابەتەکانی گەلێ زۆر و یەکجار فراوان و درێژ دەرچوون. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەموو کەسێك ناتوانێت بۆ یەکەم جار پەی بە هەموو بابەتەکانی ببات.

*سێ‌هەمیان*: هەریەك لە بابەتەکانیشی لە خۆیدا ڕاستی‌یەکی مەزن و دوور و درێژە. جا لەبەر پاراستنی یەکپارچەیی ڕاستی‌یەکە و لەت نەکردنی، هەندێ جار لاپەڕەیەکی تەواو دەبێت بە یەك ڕستەی دوور و درێژ، چونکە چەندین پێشەکیی زۆر دەهێنرێن و بە یەك بەڵگە دادەنرێن.

*چوارەمیان:* زۆربەی ئەو بابەتانەی کە لەم پەیامەدا باس کراون، هەریەکەیان چەندین بەڵگەی زۆری هەیە. جا هەرکات (دە) یان (بیست) بەڵگە لەو بەڵگە زۆرانە بە یەکەوە دەهێنرێن و دەکرێن بە بەڵگەیەکی مەزن، ئەوا بابەتەکە گەلێ فراوان و دوور و درێژ دەردەچێت و لە زەینە کورت و تەسکەکاندا جێی نابێتەوە.

*پێنجەمیان:* بە بۆنەی رێژنە و سروەی بەرەکەتی رەمەزانی پیرۆزەوە کەوتمە بەر تیشکی رووناکی‌یەکانی ئەم پەیامە. بەڵام بە پەلە نووسرا و، بە یەکەم رەشنووسیشی قایل بووم و دەستکاریم نەکرد، لەبەر ئەو نەخۆشی و گیروگرفت وتەنگ پێ‌هەڵچنینە زۆرانەی کە لایەنە جۆراو جۆرەکان دەیانهێنایە رێم. ئنجا لە کاتی نووسینیشیدا هەستم دەکرد کە بە بێ ویستی خۆم باسەکانی ئەم پەیامە بۆ دڵم دێن. ئیتر بە کارێکی رەوا و شیاوم نەزانی کە بەپێی "بیر"ی خۆم دەستکاری و پوختەی بکەم.. لەبەر ئەم هۆیە، پەیامەکە شێوەیەکی ئەوتۆی لێ نیشت کە بە ئاسانی تێگەیشتنی بەدەستەوە نادات. ئنجا سەرباری ئەو هۆکارانە، برگەکانی مەقامی دووهەمیشی تێکەڵ بوون، کە بە زمانی عەرەبی نووسراون.

بەڵام ئەم پەیامە، سەرەرای ئەم پێنج هۆکارانەی کە مایەی ناتەواوی و گیروگرفتی تێگەیشتنن، پەیامێکی گەلێ گرنگە.

..........................................................................................

ئەم پەیامە کە یەکێکە لە راستی‌یەکانی "ئایەتی هەرە مەزن" و تەفسیرێکی ئەو ئایەتەیە، تیشکی حەوتەمی کتێبی (تیشکەکان)ە و، لە هەمان کاتیشدا یەکەم بەڵگەی ئیمانیی کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا"یە.

ئەم تیشکە لە دوو مەقام(پلە) و پێشەکی‌یەك پێکهاتووە. پێشەکی‌یەکە چوار مەسەلەی گرنگ روون دەکاتەوە و، مەقامی یەکەم (بە زمانی عەرەبی) تەفسیری ئایەتی هەرەمەزن دەکات و، مەقامی دووهەمیش بەڵگەکانی مەقامی یەکەم روون دەکاتەوە و دەیانچەسپێنێت.

ئەم پێشەکی‌یەی کە دێت، لەچاو خۆیدا دوور و درێژ دیارە و، گەلێ درێژەی بە روونکردنەوەکانی داوە، ئەمەش لە دەستی خۆمدا نەبوو، کەواتە پێویست بووە وا بێت، بۆیە بەو جۆرە پێم نووسرا. لەوانەشە درێژی‌یەکەی بە لای هەندێکەوە هێشتا کەم و کورت بێت.

**سەعیدی نوورسی**

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿وَمَا خَلَقْتُ الجِنَّ والإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُون﴾ (الذاريات:٥٦)

لە نهێنی‌یەکانی ئەم ئایەتە مەزنەوە تێدەگەین کە دانست و ئامانجی هاتنی ئادەمیزاد بۆ ئەم دنیایە: ناسینی بەدیهێنەری گەردوونە و، باوەڕبوونە پێی و، پەرستنیەتی.. هەروەها کارمەندیی سروشتیی مرۆڤ: خواپەرستی‌یە و، ئیمانبوونە بەو خوایە و، سەلماندنی تەواوەتی و پڕ لە دڵنیایی "بوون" و "یەکتایی" ئەوە.

بەڵێ، ئەو مرۆڤە بێچارە و هەژارەی کە بە سروشت داخوازی ژیانی بەردەوامی خۆش و هەمیشەیی‌یە و، خاوەنی چەندین ئاوات و ئازاری بێ‌کۆتایی و بێ‌سنوورە، دەبێت هەرچی شت هەیە و هەرچی کەمالات هەن، سەبارەت بەو مرۆڤەوە، نزم و بێ نرخ بن، بەڵکو زۆربەیان - سەبارەت بەو - هیچ بایەخێکی ئەوتۆیان نەبێت کە شایانی باس بێت، جگە لە: "ناسینی خوا" و "ئیمان هێنان پێی" و جگە لەو هۆکارانەش کە دەستی دەگرن و دەیگەیەنن بەو ئیمانەی کە بناغە و کلیلی ئەو ژیانە هەمیشەیی‌یەیە.

لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور" ئەم ڕاستی‌یەیان زۆر بە ڕوونی و بەڵگەی یەکجار بێ‌گومان چەسپاندووە، ئەوا خوێنەری بەڕێزیان بۆ لا ڕەوانە دەکەین و لێرەدا تەنها دوو "گرفت" باس دەکەین کە لەم چەرخەدا ئەو دڵنیایی‌یەی لەمەڕ ئیمان دەلەقێنن و مرۆڤ دەخەنە دوودڵی و سەرگەردانی‌یەوە. ئەمەش لە چوار مەسەلەدا ڕوون دەکەینەوە:

***گرفتی یەکەم:***

مرۆڤ بەهۆی دوو مەسەلەوە ڕزگاری دەبێت لێی:

◆ **مەسەلەی یەکەم:**

هەروەك لە "بریسکەی سیازدەهەمی مەکتووبی سی و یەکەم"دا بە درێژی چەسپێنرا: (لە مەسەلە گشتی‌یەکاندا "نەفی‌کردن" هیچ نرخێکی نی‌یە لە بەرامبەر "چەسپاندن"ەوە، چونکە ئەو نەفی‌کردنە بڕیارێکی لاوازە).

نموونەی ئەمە، وەك ئەوەی کە ئەگەر دوو کەس لەو خەڵکە هەڵبهاتنی مانگ بچەسپێنن و شایەتی بدەن کە مانگی یەك شەوەی ڕەمەزانیان دیوە.. لە هەمان کاتیشدا هەزاران مرۆڤی زانا و پیاوماقووڵ نەفیی بکەن و بڵێن: "ئێمە نەمان دیوە" ئەوا نەفی کردنەکەی ئەمان هیچ گرنگی و بایەخێکی بۆ دانانرێت. چونکە هەریەك لە چەسپێنەران بە "چەسپاندن"ەکەی پشتی ئەوی تر دەگرێت و بە هێزی دەکات، کەواتە "چەسپاندن" پشتگیری و کۆبوونەوەی تێدایە، بەڵام نەفی کردن وانییە؛ چ لە یەك کەسەوە بێت و چ لە هەزار کەسەوە وەکو یەك وایە، چونکە ئەو کەسەی نەفیی شتێك دەکات تەنها لەو ڕووەوە دەیکات کە هەر خۆی نەیدیوە. بە پێچەوانەی چەسپێنەرەوە، چونکە ئەو بۆ خودی شتەکە دەڕوانێت ئنجا بڕیارەکەی دەردەکات، وەك ئەم نموونەیەی کە هێنامانەوە؛ ئەگەر یەکێك لە دوو شایەتەکە بڵێت: (ئەوەتا ئەوە مانگی یەك شەوەیە بە ئاسمانەوە) ئەوی تر تەسدیقی دەکات و قسەی هاوەڵەکەی دەسەلمێنێت و پەنجە بۆ هەمان شوێن ڕادەکێشێت و، بەم چەشنە هەردووکیان لە سەیرکردنی هەمان شوێندا بەشدارن، ئیتر بەم پێیە یەکدەگرن. ئەو بڕیارەش کە دەری دەکەن هێز بەدەست دەهێنێت و پتر جێگیر دەبێت و دەچەسپێت.

هەرچی ئەو کەسەشە کە نەفی دەکات، سەیری خودی شتە نەفیکراوەکە ناکات و تەنانەت هەر تواناشی نییە سەیری بکات! لەبەر ئەوەیە کە ئەم دەستوورەی خوارەوە ناوبانگی دەرکردووە، کە دەڵێت:

(نەفییەك تایبەتی نەبێت و شوێنەکەشی دەستنیشان نەکرابێت، هەرگیز لە توانادا نییە بچەسپێت)!

نموونەی ئەمە، وەك ئەوەی کە ئەگەر من شتێکی دیاریکراوم لەم دنیایەدا بۆ چەسپاندی و، تۆیش ئینکاریت کرد، ئەوا دەبێت هەموو شوێن و قوژبنێکی ئەم دنیایە بگەڕێیت و بیانپشکنیت، تاکو بیچەسپێنیت ئەو شتە نییە کە من دەتوانم بەوپەڕی ئاسانی و بە ئاماژەیەکی ئاسایی بیچەسپێنم بۆت. بەڵکو تۆ دەبێت لە قووڵایی کاتەکانی ڕابوردووشدا ڕۆبچیت و یەك بە یەکیان بپشکنیت، تاکو بتوانیت بڵێیت: (شتی وا لە ڕاستیدا نییە و.. ڕووداوی وا ڕووی نەداوە)!

جا لەبەر ئەوەی نەفیکەران ناڕوانە خودی شتە نەفیکراوەکە، بەڵکو ئەو بڕیارانەی دەری دەکەن بەپێی ژیری و تێڕوانین و ئارەزووی خۆیانە، ئەوا هەرگیز ناگونجێ

پشتگیر و بەهێزکەری یەکتری بن، چونکە پەردە و هۆکارەکانی "نەبینین" یەك نین و هی هەریەکیان لەوانی تر جیاوازە. ئەوەتا هەریەکەیان دەتوانێت بڵێت: "من ئەو شتە نابینم".. "پێم وایە نی‌یە".. "لەو باوەڕەدام شتی وا نابێت".. بەڵام هەرگیز ناتوانێت بڵێت: "لە ڕاستیدا نی‌یە"! خۆ ئەگەر ئەم چەشنە نەفی‌یە بکات – بە تایبەت لە بابەتەکانی ئیماندا کە تێکڕای گەردوون دەگرنەوە – ئەوا درۆیەکی هێندە گەورەی کردووە کە بە ئەندازەی دنیا دەبێت و، وتەیەکە بە هیچ جۆرێك دارای ڕاستی نی‌یە و، هەرگیز ناکرێت بە کارێکی ڕاست و ڕەوا دابنرێت!

**لەمەی پێشەوە دەگەینە ئەوەی کە:**

ئەنجامی "چەسپاندن" یەکێکە و پشتگیریی یەکتریی تێدایە. بەڵام ئەنجامەکانی "نەفی کردن" یەك نین؛ بەڵکو زۆرن، چونکە: "لام وایە" و.. "لە بەرچاوی مندا" و.. "لەو باوەڕەدام" و هاوچەشنی ئەم وتانە، کە پەردەن لە بەردەم بینینی "ڕاستی"دا، یەك نین. بەڵکو بەپێی نەفی کەران زۆر و جیاجیان. لەبەر ئەوەیە کە هەمیشە ئەنجامەکانی (نەفی کردن) زۆر و جیاواز دەردەچن و بە هیچ جۆرێك پشتگیریی یەکتری‌یان تێدا نایەتەدی.

کەواتە، لە ڕوانگەی ئەم ڕاستی‌یەوە:

(زۆریی ڕواڵەتیی کافران و کەسانی سەرسەخت، کە ڕێ لە ئیمان دەگرن، هیچ نرخ و بایەخێکی نی‌یە).

بەڵام لە کاتێکدا کە دەبوو دڵنیایی مرۆڤی ئیماندار هیچ شتێك کاری تێ نەکردایە و هیچ چەشنە دوودڵی‌یەك ئاوێتەی ئیمانەکەی نەبوایە، کەچی دەبینین ئەو چەشنە گومان و ئینکاری‌یانەی کە فەیلەسووفەکانی ئەورووپا لەم سەردەمەدا بڵاوی دەکەنەوە، هەندێ کەسیان دووچاری سەرگەردانی و گومان کردووە، لەوانەی کە بە چاوی سەرسووڕمان و ڕێزەوە بۆ ئەو فەیلەسووفانە دەڕوانن. ئیتر بەم پێیە سەریان لێ شێواوە و، گومانەکانی ئەوان دڵنیایی‌یەکەی ئەمانی نەهێشتووە و بەختەوەریی هەمیشەیی لەکیس داون و گرفتاری بەدبەختی و چارەڕەشیی کردوون. چونکە ئینکاری کردنەکەی ئەوان وای لە ناوەرۆکی "مردن" کردووە – کە هەرچی ڕۆژە سی هەزار کەس بەسەر دەکات[1] – لە واتا ڕاستەقینەکەی، کە کۆتایی‌هێنانە بە فەرمانبەریی مرۆڤ

---

(١) ئەو ژمارانەی کە دانەر نووسیونی وەك خۆیان هێشتمانەوە و دەستکاریمان نەکردن. (وەرگێڕ)

لە زەویدا، دوور بخرێتەوە و، واتایەکی تری پێچەوانەی بدرێتێ و، لە شێوەی: لەناودانی هەمیشەیی و تیاچوونی تەواوەتی و کۆتاییەکی سامناکدا پیشان بدرێت.. هەروەها گۆڕ – کە هەرگیز دەرگاکەی داناخرێت – بەم ڕوانگە و بۆچوونە، تام و چێژەکانی ئەو مرۆڤە ئینکار و سەرسەختە لێڵ و ژەهراوی دەکات و، چەندین ئازاری بەسۆی دەرخوارد دەدات و، هەردەم بە: لەناودانی هەمیشەیی (إعدام أبدي) هەڕەشەی "نەبوون"ی پڕ لە سامناکیی لێ دەکات.

کەواتە لەمەوە تێبگە کە:

"ئیمان" چەندە گەورەیە و چ نیعمەتێکی مەزنە و، بزانە کە چۆن دەبێت بە "ژیان"ی ژیان!

◆ **مەسەلەی دووهەم:**

ئەگەر لەبارەی بابەتێکی هەر زانستێك یان هەر پیشەیەك گفتوگۆ و وتووێژ بکرێت، گوێ بۆ قسەی ئەوانە ڕاناگیرێت کە لە دەرەوەی بازنەی ئەو پیشەیە یان ئەو زانستەدان، با لە مەیدانی پسپۆڕیی خۆیشیاندا زانا و کەسانی مەزن و پیشەسازی کارامە بن. هەروەها بڕیاری ئەوان لەم چەشنە مەسەلانەدا وەرناگیرێت و ناچێتە ڕیزی "یەکدەنگی"ی زانایانی ئەو بابەتەوە.

بۆ نموونە: بڕیاری ئەندازیارێکی مەزن لە دەستنیشان کردن و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکدا وەکو بڕیاری پزیشکێك دانانرێت و بە هەمان چاو تەماشا ناکرێت. کەواتە ئەو وتانەی ئینکاری کردنیان تێدایە و گەورەترین فەیلەسووفی "ماددی" بیانکات سەبارەت بە بابەتە "مەعنەوی"یەکانەوە هیچ بەها و بایەخێکیان بۆ دانانرێت. بە تایبەت هی ئەوانەی کە بە تەواوی لە "مادییات"دا ڕۆچوون و پەردە بەسەر بینایی دەروونیاندا دادراوەتەوە و بە یەکجاری کول و کاس بووە و، ژیرییان دابەزیوەتە چاویان و، وایان لێ هاتووە کە جگە لە "مادده" عەقڵیان بە هیچ شتێك ناشکێت و هیچی تر نابینێت.

ئایا وتەی ئەو فەیلەسووفانە چ نرخێکی هەیە کە لە بەردەم لێ لێبوونەوەی بچووکترین بەشەکانی بووەنەوەردا سەریان سووڕماوە و، لەناو ئەو جۆرە شتانەدا ون و نوقم بوون کە لەت لەت و بەش بەشن؟.. قسەی ئەوانە چ نرخێکی هەیە لە مەسەلە بەرزەکانی "تەوحید" و "ئیمان" و "مەعنەوییات"دا کە سەدان هەزار کەسی زانا و حەقڕەو تیایاندا یەکیان گرتووە، وەکو شێخی گەیلانی – قُدِّسَ سِرُّهُ – کە خاوەنی

زیرەکی‌یەکی قودسی و دارای بینایی‌یەکی دەروونیی بێ‌وێنەی وەها بووە کە هێشتا لە سەرزەویدا ژیاوە بۆ عەرشی مەزنی ڕوانیوە و، نزیکەی نەوەد ساڵ تێ‌کۆشاوە و لێ بڕاوە و بە پلەکانی "مەعنەوییات"دا سەرکەوتووە تاکو پەردەی لە ڕووی ڕاستی‌یەکانی ئیماندا بە (علم الیقین) و (عین الیقین)، تەنانەت بە (حق الیقین)یش، هەڵماڵیوە و ئاشکرای کردوون؟

ئایا ئینکاری‌کردنی ئەوان (بەرامبەر بە چەسپاندنی پیاوی ئاوا) کارێکی چەشنی ویزەی مێشوولە نی‌یە لە بەردەم نەعرەتەی هەورە بروسکەی ئاسماندا؟

"کوفر" کە دوژمنایەتی بەرامبەر ڕاستی‌یەکانی "ئیسلام" دەنوێنێت و ململانێی لەگەڵدا دەکات، لە "ڕاستی" و "ماهییەتی"دا بریتی‌یە لە: ئینکاری کردن و، نەزانی و، نەفی کردن، هەرچەند لە ڕواڵەتیشدا بە: چەسپاندن و، بوون، دەربکەوێت. چونکە ناوەڕۆکەکەی: "نەفی" و "نەبوون"ە!

بەڵام ئیمان: زانین و، بوون و، چەسپاندن و، بڕیارە. تەنانەت مەسەلە سەلبی‌یەکانیشی پەردە و ناونیشانن بۆ ڕاستی‌یەکی ئیجابی.

جا ئەگەر هەموو ئەو کافرانەی کە ڕێ لە ئیمان دەگرن تێکڕا لێ بڕێن و تێبکۆشن بۆ ئەوەی بیروباوەڕە سەلبی و بێ کەڵکەکانیان بچەسپێنن - کە ئەمەش کارێکی دژواری سەرتاپا گیروگرفتە - و بیانەوێت ئەو بیر و باوەڕەیان لە شێوەی "قبوولکردنی نەبوون" و "تەسدیق کردنی نەبوون"دا پیشان بدەن، ئەوا ئەو جۆرە کوفرە دەکرێت - لە ڕوویەکەوە - بە: زانینێکی هەڵە و بڕیارێکی ناڕەوا دابنرێت، دەنا "نەویستن" و "ئینکاری" و "تەسدیق نەکردن" کە تابلێیت کارێکی ئاسانە، بریتی‌یە لە نەزانی‌یەکی ئاشکرا و نەبوونی بڕیار!

**بە پوختی:**

باوەڕبوون بە کوفر دوو بەشە:

یەکەمیان ئەوەیە کە: پەیوەندیی بە ڕاستی‌یەکانی ئیمانەوە نی‌یە. ئەم بەشەیان تەسدیق کردنی شتێکی هەڵەیە و باوەڕکردنە بە شتێکی ناڕەوا و بڕیارێکی ستەمکارانەیە، تایبەتە بە خۆیەوە. ئەم بەشەی کوفر لە بازنەی ئەم باسەی ئێمەدا نی‌یە و، نە کارمان بەسەریەوە هەیە و، نە ئەویش پەیوەندی‌یەکی بەم باسەمانەوە هەیە..

دووهەمیان ئەوەیە کە: نەیاری ڕاستی‌یەکانی ئیمانە و ململانێی لەگەڵ دەکات. ئەمەش دوو بەشە:

یەکەم: بریتی‌یە لە "وەرنەگرتن" و "پشتگوێ خستن". ئەمەش - لە ڕاستیدا - "نەسەلماندنی چەسپاندنە". ئەم چەشنە کوفرە جگە لە "نەزانی" و "بێ بڕیاری" هیچی تر نی‌یە و، کارێکە بە ئاسانی دەکرێت. ئەمیش لە چوارچێوەی ئەم باسەدا نی‌یە.

دووهەم: بریتی‌یە لە "وەرگرتنی نەبوون" و پڕ بەدڵ سەلماندنی "نەبوون". ئەم بەشەی کوفر "بڕیار" و "باوەڕ"ە و، وا لە خاوەنەکەی دەکات کە دەستی پێوە بگرێت و ناچارە ئەم نەفی و ئینکاری کردنەی بچەسپێنێت.

نەفی کردنیش دوو جۆرە:

یەکەمیان: ئەوەیە کەسی نەفی کەر بڵێت: (فلان شت لە فیسار شوێنی دیاری کراودا نی‌یە). ئەم بەشەی نەفی کردن دەکرێ بچەسپێنرێت. ئەمیش لە دەرەوەی بازنەی ئەم باسەی ئێمەدایە.

بەشی دووهەم: نەفی و ئینکاری کردنی مەسەلە خاوێن و گشتی و گشتگیرەکانی "ئیمان"ە کە ڕوویان لە هەموو دنیا و تێکڕای گەردوونە و، ڕووەو دوارۆژ دەڕوانن و، هەموو چەرخ و سەردەمەکان دەگرنەخۆ. ئەم چەشنە نەفی کردنە - وەك لە مەسەلەی یەکەمدا چەسپاندمان - هەرگیزاو هەرگیز ناکرێت بچەسپێت، چونکە بۆ چەسپاندنی ئەم جۆرە نەفی کردنە، دەبێت ڕوانینێك هەبێت گشت گەردوون بگرێتەوە و، دوارۆژ ببینێت و، هەموو لاکانی کاتی بێ سنوور ببڕێ و چاوی لێیان بێت!

***گرفتی دووهەم:***

ئەمیش بە هەمان جۆر، بەهۆی دوو مەسەلەوە مرۆڤ ڕزگاری دەبێت لێی:

یەکەم: ئەو ژیری‌یانەی کە لە بەرامبەر "مەزنی" و "گەورەیی" و "ڕەهای بێ کۆتایی"دا مەودای تێگەیشتنیان تەسکە و، لە ئەنجامی بێ ئاگایی و تاوان و ڕۆچوونیان لە "مادییات" و هەڵپەکردنیان بە دوایدا، توانای پەی بردنیان بەوانە نەماوە.. بەهۆی لەخۆبایی بوونی زانستی‌یەوە، پێیان بەرەو نەفی و ئینکاری کردنی ئەو مەسەلە مەزن و بەرزانە هەڵخلیسکاوە. چونکە بەرامبەر بە پەی بردنێکی گشتگیر(محیط) بەو مەسەلانە تابلێیت کۆڵەوار و دەستەوسانن.

بەڵێ، ئەو کەسانەی کە نەیانتوانی مەسەلە گشتگیر و هەرە قووڵ و فراوانەکانی "ئیمان" لە ژیری‌یەکانیاندا - کە لە ناوەڕۆکدا ڕەق و تەسکن - جێ بکەنەوە و، لە دڵەکانیاندا - کە بەرامبەر بە "مەعنەوییات" مردوون و لەکارکەوتوون - جێگیریان

بکەن، ئەو کەسانە، خۆیان دەهاونە باوەشی کوفر و گومڕایی‌یەوە و، لە ئەنجامدا دەخنکێن. بەڵام ئەوان ئەگەر بتوانن بە وردی سەرنج لە ڕاستی و ناوەرۆکی کوفرەکەیان بدەن و بیر لە ماهییەتی گومڕایی‌یەکەیان بکەنەوە، ئەوا بۆیان دەردەکەوێت و دەبینن کە ئەو شتەی لە "ئیمان"دا سەبارەت بە "مەزنی" بە کارێکی ژیرانە و شیاو و پێویستی ئەو "مەزنی"یە دەردەکەوێت، کوفرەکەی ئەوان، بەرامبەر بەمە، گەلێ مەحاڵ و نەگونجاو و نەشیاوی یەك لە دوای یەکی لە دووتوێدایە.

"پەیامەکانی نوور" بە سەدان پێوەر و بەراوردکاری و تەرازوو، هەروەها بە چەشنێکی بێ گومان – وەك گومان نەبوون لە ئەنجامی: دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار – ئەم ڕاستی‌یەیان چەسپاندووە.

بۆ نموونە: ئەو کەسەی کە بە بۆنەی "مەزنی"ی خواوەند و "سیفەتە مەزنە گشتی‌یەکان"یەوە نەتوانێت باوەڕ بە: "پێویستیی بوون" و "ئەزەلییەت" و "سیفەتە گشتگیرەکان"ی خوای گەورە بهێنێت، ئەوا "پێویستیی بوون" و "ئەزەلییەت" و "سیفەتە مەزنەکانی خوای گەورە" بە هەموو بوونەوەرە بێ سنوورەکان، تەنانەت گەردیلە لەژمارەبەدەرەکانیش، دەبەخشێت، تاکو بتوانێت باوەڕ بە کوفرەکەی بهێنێت! یان دەبێت ئینکاریی بوونی خودی گەردوون بکات و بە چەشنی "سۆفستائی‌یە نەفامەکان"[(١)] دەست لە ژیریی خۆی دابشوات.

بەم جۆرە، هەموو ڕاستی‌یەکانی ئیمان و ئیسلام بەهۆی پاڵدانیان بە "مەزنی"یەوە – کە ئەو ڕاستی‌یانە داخوازی دەبن – لە دڵ و دەروونە خاوێن و ژیری‌یە تەواوە بێ عەیبەکاندا، بەوپەڕی دڵنیایی و ملکەچی‌یەوە، جێگیر دەبن و دەچەسپێن و

(١) سۆفستائی‌یەکان: دەستەیەك بوون لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، کە دوای قوتابخانەی "فیساگۆرس" و لە ئەنجامی ئاڵۆزیی باری ڕامیاری و قەیرانی ئابووری پەیدا بوون. ئەم دەستەیە ئینکاریی حەقیقەتی شتانیان کردووە و لایان وا بووە کە هیچ شتێك دارای حەقیقەت نی‌یە. "گۆرگیاس" و "بڕۆتاگۆراس" بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائی‌یەکانن. ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێکن. کاتی خۆی "سوقرات" زۆر بە توندی بەرپەرچی داونەتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە کەس و بیر و ڕایانە لە هەموو سەردەمێکدا بە کاڵای نوێ و ناوی جۆراوجۆرەوە پەیدا دەبنەوە. بۆ زیادە شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: "شرح العقائد النسفية" لسعدالدين التفتازاني ص ٢٣-٢٥ طبعة تركيا سنة ١٣٢٦ هـ، "كشاف إصطلاحات الفنون" للتهانوي ج١/ص٦٦٥ طبعة كلكته في الهند عام ١٨٦٢م، "الموسوعة الفلسفية الميسرة" ج١/ص١٠٣٤ طبعة دار نهضة لبنان – بيروت سنة ١٩٦٥م. هەروەها پێشەکیی (مهدی توحیدی پور) بۆ (نفحات الأنس)ی مەولانای جامی ص ٦٩-٧٠ ناشر: کتابفروشی سعدی. (وەرگێڕ)

دادەمەزرێن. ئیتر خاوەنی ئەو جۆرە دڵ و دەروون و ژیری‌یانە لە: کوفر و مەحاڵە سەرسووڕهێنەر و خورافەتە سامناك و نەفامی‌یە تاریکەکانی ڕزگار دەکات.

بەڵێ، شتێکی ڕوونە کە "مەزنی" و "گەورەیی" (العظمة والکبریاء) دوو پەردەن پێویستە ببن. ئەمەش لە ئاشکراکردنی ئەو مەزنی و گەورەیی‌یەدا دەردەکەوێت کە لە هەموو کاتێکدا، بە تایبەت لە بانگ و نوێژ و زۆربەی دروشمەکانی ئیسلامدا بە دووپات کردنەوەی: "ألله أکبر.. ألله أکبر.. ألله أکبر.. ألله أکبر" ڕادەگەیەنرێت.. هەروەها لەو فەرموودە قودسی‌یەشدا ڕوون دەبێتەوە کە دەفەرموێ:

"العظمة إزاري والکبریاء ردائي"[(١)].

هەروەها لە گرێی هەشتا و شەشەمی نزا و لاڵانەوە ڕەوانە ئەحمەدی‌یەکەی "الجوشن الکبیر"دا دەردەکەوێت، کە دەفەرموێ:

یا من لا مـلكَ إلاّ مـلكَـه * یا من لا یحصي العبادُ ثنـاءه

یا من لا تصف الخلائق جلاله * یا من لا تنال الأوهام کنهـه

یا من لا یدرك الأبصار کماله * یا من لا یبلغ الأفهام صفـاته

یا من لا ینال الأفکار کبریاءه * یامن لا یُحسن الإنسان نعوته

یا من لا یرد العبـاد قضـاءه * یامن ظهر في کل شيء آیاته

سبحانك لا إله إلاّ أنت الأمان الأمان نجنا من النار.

* * *

(١) "الکبریاء ردائي والعظمة إزاري، فمن نازعني واحداً منهما قذفته في النار". رواه أحمد وأبو داود وابن ماجه، عن أبي هریرة رضي الله عنه.

# پەیامی (الآية الكبرى)

بینینەکانی گەشتیارێکە بەناو گەردووندا دەگەڕێت و سۆراخی بەدیهێنەری دەکات

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ

﴿تُسَبِّحُ له السَّمواتُ السَّبْعُ والأَرْضُ وَمَنْ فيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لا تَفْقَهونَ تَسْبيحَهُمْ إِنَّهُ كانَ حَليماً غَفوراً﴾ (الإسراء:٤٤)

**(ئەم مەقامی دووهەمە، لە کاتێکدا کە تەفسیری ئەم ئایەتە هەرە مەزنە دەکات، لە هەمان کاتدا بەڵگەکانی مەقامی یەکەمیش ڕوون دەکاتەوە، کە ئەویش هەر لە ناوەندی ئەم مەقامەدایە و بە زمانی عەرەبی‌یە).**

## بەشی یەکەم

## بەڵگەکانی بوون

**١**

چەندین ئایەتی زۆری قورئانی پیرۆز - وەك ئەم ئایەتە هەرە مەزنە - لە پێشەکیی پێناساندنی بەدیهێنەری گەردووندا "ئاسمانەکان" باس دەکەن، کە ڕوونترین لاپەڕەی "یەکتاناسی"ن و، هەر سەرنجدەرێك سەرنجیان لێ بدات نوقمی سەرسامی و سەرسووڕمان دەبێت و، بەوپەڕی تام و لەزەت و حەپەسانەوە چێژ لە موتاڵاکردنیان دەبات. کەواتە باشتر وایە لە "ئاسمانەکان"ەوە دەست بە گەشتەکە بکرێت.

بەڵێ، هەر کەسێك بە میوانی دێتە ناو ئەم دنیایە، هەردەمێك چاو بکاتەوە و بڕوانێت:
"میوانخانەیەك"ی لەوپەڕی سەخاوەتمەندی و..
"پیشانگایەك"ی لەوپەڕی جوانی و..
"سەربازگەیەکی مەشق کردن"ی بەسام و شکۆی لەوپەڕی ناوازەیی و..
"باخچەیەك"ی لەوپەڕی دڵڕفێنی و قەشەنگی و..
"شوێنێك بۆ ناوبانگ دەرکردن" لەوپەڕی تاسە و شەوق بزواندن و..
"پەراوێکی کراوەی پڕ واتا"ی لەوپەڕی ڕەوانیدا..
دەبینێت!

جا لەو کاتەدا کە ئەم میوانە گەشتیارە خولیای ناسینی خاوەنی ئەم میوانداری‌یە سەخاوەتمەندە و، دانەری ئەم پەڕاوە مەزنە و، پادشای ئەم وڵاتە بەسام و شکۆیەی کەوتە سەر، کتوپڕ ڕووی "**ئاسمان**"ە جوان و گەش و بە ئەستێرە درەخشانەکانی لێ دەرکەوت، کە بۆ ئەمی دەڕوانی و پێی دەوت:

(بۆم بڕوانە، من بەو کەسەت ئاشنا دەکەم کە بە دوایدا عەودالیت).

گەشتیارەکەش چاو دەگێڕێت، دەبینێت:

"پەروەردگاری‌یەکی" ئاشکرا دەردەکەوێت لە:

بەرزکردنەوەی سەدان هەزار قەبارەی ناو ئاسماندا، بە بێ هیچ کۆڵەکە و ستوون و پشتگیرێك، لە لایەن ئەو پەروەردگاریتی‌یەوە.. ئەو قەبارانەی کە هی وایان تێدایە هەزار جار لە زەویی خۆمان گەورەترە و، هی وەهاشیان هەیە حەفتا جار لە خێرایی گوللە تۆپ تیژڕەوترە..

جووڵاندن و بەڕێ کردنی ئەو قەبارە و تەنە ئاسمانی‌یانە، هەموویان پێکەوە، لە لایەن ئەو پەروەردگاریتی‌یەوە، بێ ئەوەی بەر یەك بکەون و جێ بە یەکتری لێژ بکەن..

داگیرساندنی ئەو چرا هەڵواسراوانە، بێ هیچ سووتەمەنی و کوژانەوەیەك..

بەڕێوەبردنی ئەو تەنە زەبەلاح و لەسنووربەدەرانە، بێ هیچ غەلبە و دەنگ و کەموکووڕی‌یەك.

هەروەها ئەم گەشتیارە کە چاو دەگێڕێت، درەوشانەوەی ئەو پەروەردگاریتی‌یە دەبینێت:

لەوەدا کـە: ئـەو بەدیـهێنراوە مەزنانـە لـە چـەندین کـار و ئـەرکی دیـاری کراودا دەخاتەکار، وەکو ملکەچ بوون و گوێڕایەڵیی مانگ و خۆر بۆ ئـەنجامدانی ئـەرکی سەرشانیان بێ هیچ دواکەوتن و سستی‌یەك.

هەروەها لە: بەڕێخستن و بەڕێوەبردنی ئەم ژمارە گەورەیەی (ئەستێرەکان) کە هێندە زۆرن لە سنووری ڕەنووس دەرچوون، لە نێوان ئـەو دووری‌یـە یـەکجار فراوانـەی نێـوان بازنەی هەردوو جەمسەرەکان.. "بەڕێخستن" و "بەڕێوەبردن"ی هەموو ئەمانـە لـە هـەمان کاتدا و، بە هەمان هێز و، بە هەمان جۆر و، بە هەمان مـۆری سروشـت و، لەسـەر هـەمان شێوە. هەموو ئەمانەش بە یەکەوە بێ هیچ کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەك..

ئـەم گەشتیارە سـەری لـە درەوشانەوەی "پەروەردگارێتی" سـووڕما بـوو، چونکـە دەیبینی:

ئەو ئەستێرە و هەسارە گەڕۆکە مەزنانەی کە خاوەنی هێزێکی مەزنی یـەکجار زۆری لە توانای خۆیان بەدەرن، ئەو پەروەردگارێتی‌یـە هـەموو ئەمانـە گەردن کـەچ و گوێڕایـەڵ دەکات بۆ یاساکانی خۆی، بێ ئەوەی هیچ کامیان لە نەخشەی خۆی لابـدات و سنوور بشکێنێت.

هەروەها دەیبینی ئەو "پەروەردگارێتی"یە ڕووی ئاسمانی ساف و خاوێن ڕاگرتووە و، لە پاشماوەی داروپەردووی ئەو قەبارە چڕ و زۆر و زەبەندانەی ناو بۆشایی ئاسمـان پـاکی کردووەتەوە، بێ ئەوەی هیچ چەشنە چڵك و چەپەڵی‌یەکی پێوە دیار بێت.

هەروەها بە چەشـنی نمایشـێکی سـەربازیی ڕێکوپێـك ئـەو قەبارانـە دەداتەبـەر و، وەك دیمەنەکانی فلیمی سینەما دەیانخاتە پێش‌چاوی بوونـەوەرە بینـەرەکان. ئەمـەش لـەوەدا کـە زەوی بە: "شەو" و "ڕۆژ" دەسووڕێنێتەوە و، هەردەم ئـەو دیمەنـە ڕاستەقینە جۆراوجـۆر و دڵڕفێنانە نوێ دەکاتەوە کە لە ناوەندی ئەو نمایشە ڕەنگین و جوانەدا سـەرنجی ئەندێشـەی مرۆڤ دەبزوێنن.. دەرخستن و پیشاندانی هەموو ئەمانەش لە هەموو "شـەوێك" و هـەموو "ساڵێك"دا.

جا ئەم "پەروەردگارێتی"یە مەزن و ئاشکرایە و.. ئەو ڕاستی‌یە گرنگەش کە لـە نێـوان کارایی(فعّاليـة)ی ئـەودا دەردەکـەوێت، کـە ڕاستی‌یەکە لـە: "ڕامکـردن(التسـخير) و، کارئـەنجامدان و، بـەڕێوەبردن و، ڕێکخسـتن و، پـاکژکردن و، کـار پـێ سـپاردن"

پێکهاتووە. ئەم پەروەردگاریتیەیە، بەم "مەزنی"یە شکۆدارەی خۆی و بەم "گشتگیری"یـە هەمەکی‌یەی، شایەتی دەدات لەسەر: "پێویستیی بوون" و "تاك وتەنیایی" بەدیهێنەری ئـەم ئاسمانانە و، هەروەك لە بەرچاودایە شایەتە لەسـەر ئەوەی کـە: "بـوون"ی خـوای گـەورە گەلـێ لە بوونی ئەو ئاسمانانە ڕوون و ئاشکراترە!

ئەم واتایە لە پلەی یەکەمی مەقامی یەکەمدا بەم جۆرەی خوارەوە باس کراوە:

(لا إله إلاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ على وجـــوب وجوده في وحدته: الســـمواتُ بجميع ما فيـــها، بشـــهادة عظمة إحاطة حقيقة: التسخير والتدبير والتدوير والتنظيـــم والتنظيف والتوظيف الواسعة المكملة بالمشاهدة).

* * *

## ٢

پاشان "بۆشایی ئاسمان" کە کۆگای چەندین شتی سەیر و پیشانگای چـەندەها کـاری دەراسایە و پێی دەوترێ (حەوا)، بە دەنگێکی دلێرانە و زولاڵ بانگی لەم گەشتیارە کـرد کە بە میوانی بۆ دنیا هاتووە؛ پێی وت:

(سـەیرم کـە! تـاکو بۆلای ئـەو کەسـەت ڕێنمـایی بکـەم کە بـە تاسـەوە بـە شـوێنیدا عەودالێت و، بەو کەسەت ئاشنا بکەم کە بۆ ئێرەی ناردوویت)!

ئەمیش سەیری ڕووی گرژی ئاسمان دەکات کە میهرەبانیی لـێ دەتکێـت و گـوێ لـە نەعرەتـەی سـامناکی ڕادەگرێـت کـە مژدەی خۆشـیی لەگـەڵ خـۆدا هـەڵگرتووە.. کـە سەیری دەکات و بۆی دەڕوانێت، دەبینێت:

ئەو **"هەور"**ەی لە نێوان ئاسمان و زەویدا هەڵواسراوە، بە چەشنێ ئـاودێریی باخچـەی زەوی دەکات کە سەرتاپا دانایی و میهرەبانیی بەخوڕ لـێ دەچۆڕێـت و، بـە ئـاوی مایـەی ژیان بە فریا و هانای دانیشتووانی ڕووی زەوییەوە دەچێت و گەرمیی بـەتین و سـەختیی گوزەرانی پێ فێنك دەکاتەوە و، دەزانێـت چ شوێنێك پێویستیی بە ئـاوە؛ یەکسـەر فریـای دەکەوێت!

هەرچەند ئەو هەورە قورس و سەنگینە چەندەها کار و فرمانی هاوچەشنی ئەمانە ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا و دوای ئەوەی کە ڕووی ئاسمانی داپۆشیبوو، کتوپڕ لە بەرچاودا ون دەبێت و، هەموو یەکێك لە پەلەکانی بەرەو حەوانەوە دەڕۆن و دەکشێنەوە و، بەپێی چەند فەرمانێك کە بۆی دەردەکرێن لەبەرچاودا نامێنێت، بێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکی ئەو سوپا مەزنە لە ڕووی ئاسماندا بەجێ بهێڵێت.

بەڵام هەر ئەوەندەی فەرمانی: "ڕاپەڕە باران بارێنە"ی بەدەست دەگاتەوە، ئەوا لە ماوەی سەعاتێك بەڵکو چەند خولەکێکدا کۆ دەبێتەوە و ڕووی ئاسمانی پێ دادەپۆشێت و، وەکو سەربازی چاوەڕێی فەرمان، لەسەرپێ و چاوەڕوانی فەرمانی سەرکردەکەی دەبێت!

ئنجا ئەو گەشتیارە سەیری **"با"** دەکات کە بە حەواوە لە هاتن و چووندایە، دەبینێت:

"هەوا" لە چەندین کار و فرمانی زۆردا، بەوپەڕی دانایی و سەخاوەتمەندی، دەخرێتەکار، بە چەشنێکی ئەوتۆ دەڵێی هەموو یەکێك لە گەردیلە بێ گیان و دوور لە هەست و نەستەکانی ئەو هەوایە سەرجەم ئەو فەرمانانە دەبیستێت و تێدەگات کە لە لایەن پادشای ئەم گەردوونەوە بۆی دەردەکرێن!

ئەوەتا بەهۆی توانا و هێز و دەسەڵاتداریی ئەو پادشا فەرماندەرەوە، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و وردی و بە بێ سستی، کارەکانی ڕادەپەڕێنێت، وەك:

هەوا هەڵمژینی هەموو زیندەوەرانی ڕووی زەوی..

یان گەیاندن و گواستنەوەی "دەنگ" یاخود ماددە پێویستەکانی زیندەوەران چەشنی گەرمی و ڕووناکی و کارەبا..

یان بوون بەهۆی پیتاندنی ڕووەکەکان..

یاخود چەندین کاروباری تری زۆر و هاوچەشنی ئەمانە.

کەواتە "با" لە لایەن دەستێکی نادیاری غەیبییەوە بەوپەڕی هەست و زانین و زیندەیی لەم هەموو کارگوزارییانەدا دەخرێتەکار.

پاشان سەیری **"باران"** دەکات، دەبینێت:

ئەو دڵۆپە ناسك و بریقەدارە زوڵاڵانەی کە لە گەنجینەی نادیاری میهرەبانییەوە نێرراون و بەخشراون، پڕن لە چەندین دیاریی خواوەندی میهرەبان و چەندەها

کاروباری زۆریان پێ سپێرراوە. تەنانەت دەڵێی میهرەبانیی بەخشراوی خواوەندن لە شێوەی ئەو دڵۆپە بارانە بەخوڕانەدا بەرجەستە بوون و لە گەنجینەی پەروەردگارییەوە هەڵڕژاون. هەر لەبەر ئەوەش بووە کە ناوی: "الغیث" و "الرحمة" لە باران نراوە[1].

پاشان سەیری **"هەورە بروسکە"** دەکات و گوێ بۆ **"هەورە گرمە"** ڕادەگرێت، دەبینێت:

ئەم دوانە لە چەندەها کاروباری یەکجار سەیر و سەرسووڕهێنەردا دەخرێنە کار.

ئنجا ئەم مرۆڤە گەشتیارە کە ئەمانەی بینی، چاوی گێڕایەوە بۆ لای ژیریی خۆی و بە ئەسپایی بە خۆی وت:

بێ گومان ئەم "هەور"ە بێ گیان و بێ هەست و فشەڵە خوری ئاسایە، ئێمە ناناسێت و هەرگیز ناکرێت میهرەبانیی بۆمان بجووڵێت و لە خۆیەوە بەزەیی پێماندا بێتەوە و بەم بۆنەیەوە بەهانامانەوە بێت!

هەروەها ناشگونجێ بێ ئەوەی فەرمانی پێ درابێت لە خۆیەوە ڕووی ئاسمان دابگرێت و پاشان بڕوات و بەجێی بهێڵێت.

بەڵکو دەبێت بەپێی فەرمانی فەرماندەرێکی خاوەن توانستی ڕەها و میهرەبانیی ڕەها ئەو ئەرکەی سەرشانی ڕاپەڕێنێت، چونکە بێ ئەوەی پاشەوپاش بگەڕێتەوە ون دەبێت، پاشان کتوپڕ دەردەکەوێتەوە و سەرلەنوێ ئەرکی سەرشانی دەگرێتەوە ئەستۆی و، بۆ ئەنجامدانی فەرمانی دەستەڵاتدارێکی مەزن و شکۆمەند دەم بە دەم ئەو جیهانەی وا بە حەواوە پڕ دەکات و خاڵیشی دەکاتەوە و، هەمیشە بە ڕێسایەکی دانایانە، بەو هەورە، لەسەر تەختی ئاسمان دەنووسێت و پاشان بەوەی کە لەسەر کار لای دەبات ئەو نووسینە دەکوژێنێتەوە. بەم کارەش ڕووی ئاسمان دەکات بە تابلۆیەکی کوژانەوە و تیانووسین و وێنەیەکی بچووکی حەشر و قیامەت. چونکە "هەور" بە فەرمانی فەرمانڕەوایەکی کارسازی خاوەن چاکە و چاودێری و بەخشندەیی، سواری پشتی "با" دەبێت و چەندین گەنجینەی مەزن و فراوانی "باران" بە ئەندازەی چیاکان هەڵدەگرێت و فریاگوزاریی ئەو شوێنانەی سەر ڕووی زەویی پێ دەکات کە پێویستیان بەو بارانەیە. وەك بڵێیت:

---

(١) الغیث: فریاگوزار. الرحمة: سۆز و میهرەبانی. (وەرگێڕ)

بەزەیی بەو شوێنەدا دێتەوە و بۆی دەگری و فرمێسکی بۆ هەڵدەڕێژێت و، پاشان بە گوڵ و ڕێحانە دەیخاتە پێکەنین و..

لە توند و تیژیی گڕەی خۆر دادەگرێت و..

باخچە و مێرگوزارەکانی زەوی دەدێرێت و..

پێست و ڕووی زەوی لە چڵك و چەپەڵی پاك دەکاتەوە، تاکو بە دیمەنی بریسکاوەی قەشەنگ و نایاب بیخەملێنێت!

پاشان ئەو ڕێبوارە تاسەمەندە، بە ژیریی خۆی وت:

ئەم "هەوا" بێ گیانەی کە دارای هیچ ژیان و هەستێك نییە و، هەمیشە شپرز و پەشێوە و پڕ لە زریان و گێژەلووکەیە و نازانێت ئارامی چییە.. بەبۆنە و بەهۆی ڕواڵەتی ئەم هەوایە، سەدان هەزار کار و فرمان و نیعمەتی ئەوتۆ دێنە جیهانی "بوون" کە پڕن لە دانایی و میهرەبانی و وردەکاری. ئەمەش بە ئاشکرا ئەوە دەچەسپێنێت کە:

ئەم "با" بەردەوام خزمەتگوزار و هاتوچۆکەرە، خاوەنی بزووتنی خۆیی و سەربەخۆ نییە، بەڵکو فەرمانی فەرماندەرێکی دانا و زانا و بەتوانا و خاوەنی سەخاوەتمەندیی ڕەها دەیخاتە کار و جموجووڵ. وەك بڵێیت هەریەك لە گەردیلەکانی "با" لە هەموو ئەو کارانە تێدەگات کە ئەنجامیان دەدات و، بە چەشنی سەربازی گوێڕایەڵ هەموو ئەو فەرمانانە دەبیستێت کە لەو فەرماندەرەوە دەردەچن و، گوێڕایەڵییان دەکات و، بەم پێیە:

ئەرکی هەوا هەڵمژینی زیندەوەران دەگرێتە ئەستۆ و..

بەشداریی بەردەوامکردنی ژیانی ئەو زیندەوەرانە و، پیتاندن و گەشەکردنی ڕووەکەکان دەکات و..

لە گەیاندنی ماددە پێویستەکانی ژیانیاندا و، بەڕێوەبردن و هاتوچۆ پێ کردنی هەورەکاندا و، لێخوڕینی ئەو کەشتییانەی کە سووتەمەنییان نییە، هاوکاری دەنوێنێت و..

بە تایبەتی دەبێت بەهۆی گەیاندنی: دەنگ و گفتوگۆکان و ئەو پەیوەندیکردنانەی کە لە ڕێی شەپۆلە بێتەل و بروسکە و ڕادیۆییەکانەوە ئەنجام دەدرێن.

"هەوا" ئەم خزمەتگوزارییە گشتییانە و هاوچەشنیان جێبەجێ دەکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا "گەردیلەکان"ی ئەم هەوایە لە چەند ماددەیەکی لەیەکچووی ساکاری

وەك: ئازۆت و ئۆکسجین پێکهاتوون. لەبەر ئەوە، من وای دەبینم کە لە لایەن دەستێکی داناوە و بەوپەڕی ڕێکوپێکـی و لـە نێـوان سـەدان هـەزار جۆری دروستکراوانی خـوای گەورەدا ئەم "هەوا"یە بەکاردەهێنرێت.

لەبەر ئەوە، ئەم گەشتیارە بڕیاری دا و وتی:

بەڵێ ڕاستە، وەك ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿**وتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ والسَّحابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّماءِ والأَرْضِ**﴾ (البقرة:١٦٤) ئـەو کـەسـەی فـەرمان بـۆ "هـەوا" دەردەکـات و لـە چەندین کار و خزمەتگوزاریی پەروەردگاریيانەی بێ سنووردا لە ڕێـی ئـاڵوگۆڕ کردنی "با" و.. لە چەندین کاروباری میهرەبانانـەی لەژمارەبەدەر لـە ڕێی ڕامکردنی هـەورەوە بۆی، دەیخاتەکار..

ئەو کەسـەی کـە "هـەوا"ی بـەم شێوەیە بـەدی هێنـاوە، جگـە لــە پـەروەردگارێکی: "واجب الوجود" و بەتوانا بەسەر هەموو شـتێکدا و ئاگـاداری هـەموو شـتێك و خـاوەنی بەخشندەیی و شکۆمەندی، کەسی تر نی‌یە.

پاشان ئاوڕ لە **"باران"** دەداتەوە، دەبینێت: بە ئەندازەی ژمارەی دەنکەکانی، سوودی لەگەڵ خـۆدا هـەڵگرتووە و.. هێنـدەی ژمـارەی دڵۆپـەکانی، درەوشـانەوەی میـهرەبانیی تێدایە و.. بە ئەندازەی هەموو نمێك لە نمەکانیشی، دانایی دەردەخات.

بینیی: ئەم دڵۆپە ناسك و زوڵاڵ و پیرۆزانە، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و لەوپەڕی جوانیـدا بەدی دەهێنرێن، بە تایبەت **"تەرزە"** کە تەنانەت بە هاوینیشـدا بـە وردەکـاری و ڕێکـی بـۆ ڕووی زەوی ڕەوانە دەکرێت، بە ڕادەیەك کە ئەو تۆف و ڕەشـەبا سـەختانەی بارستایی‌یە چـڕ و زەبەلاحـەکان دەئـاڵۆزێنن، هیـچ کـارێکی سـەلبی ناکەنـە سـەر ڕێکوپێکــی و هاوسەنگیی ئەو تەرزانە و پارسـەنگیان ناکـەن و دەنکەکانی ئـەم تەرزانـە یـەك ناخـەن و نایانکەن بە پارچە بارستایی‌یەکی زیانبەخش!

جا ئەم ئاوەی کە بێ گیانێکی سادەیە و هیچ هەستێکی تێدا نی‌یە، لەم چەشنە کارە پـڕ لە دانایی‌یانەدا بەکاردەهێنرێت، بە تایبەت لـە کاری زیندەوەرسازی و ئاودێریدا و، تەنـها لـە دوو مـاددەی سـادەی بێ گیـان و هەستیش پێکـهاتووە کـە بریتـین لــە هـایدرۆجین و ئۆکسجین. لەگەڵ ئەوەشدا، لە سەدان هەزار خزمەت و سنعەت و کاروباری جیاجیای پڕ لە دانایی و هەست و نەستدا بەکار دەهێنرێت!

کەواتە ئەم بارانە – لە ڕاستیدا – میهرەبانی‌یەکی بەرجەستەیە و، تەنـها لـە گەنجینـەی غەیبیی میهرەبانیی خواوەندی "بەخشندەی میهرەبان"ەوە دروست دەکرێـت. کـاتێکیش کە بە ڕووی زەویـدا دەڕژێـت و دەبارێت، بـە ڕوونـی و بـە کـردار، تەفسـیری ئـەم ئایەتـە پیرۆزە دەخاتە پێش‌چاو کە دەفەرموێ:

﴿وهو الّذي يُنَزِّلُ الغَيْثَ مِنْ بعدِ ما قَنَطُوا ويَنْشُرُ رَحْمَتَهُ﴾ (الشورى: ٢٨).

پاشان ئەم گەشتیارە – بە سەرسووڕمانەوە – گوێ بۆ **"هەورە گرمـە"** ڕادەگرێـت و، بە سەرسامیشەوە بۆ **"هەورە بروسکە"** دەڕوانێت.. دەبینێت:

ئەم دوو دیاردە سەیرانەی ئاسمان هەروەك بە تـەواوی تەفسـیری ئـەم دوو ئایەتـە پیرۆزە دەکەن:

﴿وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ﴾ (الرعد:١٣).

﴿يَكادُ سنا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالأَبْصارِ﴾ (النور:٤٣)..

لە هەمان کاتیشدا مزگێنیی هاتنی باران بە موحتاج و تاسەمەندانی باران دەدەن.

بەڵێ، دەمکردنەوەی ئەو **"حەوا"** تاریکە، کە بە نەعرەتەیەکی مەزن پەردەی بێ‌دەنگی لادەبات.. هـەروەهـا پڕبوونی ئەو تاریکی‌یە لـە ڕووناکی‌یـەك کـە وەختـە بینـایی چـاوان ببات و بـە ئـاگرێك کـە سـام دەهاوێتـە دڵـی هـەموو بوونەوەرێکـەوە.. داگیرسـاندنی ئـەو هـەورە مـەزنانەی کە بــە ئـەندازەی چیاکـان دەبـن و چـەشـنی خوریـی شـی‌کراوەوان و تەرزە و بەفر و بارانیان لە کۆڵ نراوە..

هەموو ئەم کار و فرمان و بارودۆخە ناوازە و پڕ لە دانایی‌یانە و هاوچەشنیان، مرۆڤـی "بێ ئاگا" بێدار دەکەنــەوە و بـە "قـامچی" ئامـاژە بـۆ تەوقـە ســەری شــۆڕکراوەی ئـەو دەکەن و پێی دەڵێن:

– سەرت هەڵبڕە و بۆ ناوازەیی سنعەت و وردەکاریی بەدیهێنان بڕوانـە کـە لـە لایـەن خواوەندی کارای بەتواناوە ئەنجام دراون و کە دەیەوێت لەم ڕێیەوە خۆی بە بەندەکانی بناسێنێت.

جا هەروەك تۆ لەم بوونەوەرەدا بەرت بۆ بەرەڵا نەکراوە و دەستت لـێ هەڵنـەگیراوە، ئـەم بوونەوەرانـەش بـە هـەمان جـۆرن و هـەرگیز هەڕەمـەکی و بێ مەبەسـت نـین، بـەڵکو

هەریەکەیان بەوپەڕی ملکەچی و گوێڕایەڵی‌یەوە بەرەو چەندین کاروباری پڕ لە دانست دەبرێن و، لە لایەن پەروەردگارێکی کارساز و داناوە دەخرێنەکار.

* * *

بەم چەشنە، ئەم گەشتیارە ئارەزوومەندە، شایەتی‌یەکی بەرز و مەزنی ڕاستی‌یەکی ئەوتۆی بیست کە لە:

ڕامکردنی "هەور" و.. بەڕێ‌کردنی "با" و.. سازاندنی کاروبارەکانی "حەوا"، پێکهاتبوو..

کە ئەمەی بیست، یەکسەر وتی: "آمنتُ بالله".

پلەی دووهەمی مەقامی یەکەم، بەم جۆرەی خوارەوە بینینەکانی ئەم گەشتیارەی ڕاگەیاندووە[1]:

(لا إله الاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ على وجوب وجوده: الجوُّ بجميع ما فيه. بشهادة عظمة إحاطة حقيقة: التسخير والتصريف والتنزيل و التدبير الواسعة المكملة بالمشاهدة).

* * *

## ٣

پاشان "گۆی زەوی" بە زمانی حاڵ بانگی لەم گەشتیارە کرد کە لەسەر گەشتی "فیکری" ڕاهاتووە، پێی وت:

(بۆچی بەناو هەوا و بۆشایی ئاسماندا دەگەڕێیت؟ وەرە بۆلای من تا ئەو کەسەت پێ بناسێنم کە تۆ بە دوایدا عەودالێیت.. بیر لەو کار و فرمانانە بکەرەوە کە من ئەنجامیان دەدەم و، ئەو شتانە بخوێنەرەوە کە لەسەر لاپەڕەکانمدا نووسراون)!

---

(١) بێداری‌یەك: دەمویست هەر سی و سێ پلەکانی تەوحید کە لە مەقامی یەکەمدا باس کراون، ڕوون بکەمەوە. بەڵام باری ئێستام بواری ئەوەی نەدام و ناچاری کردم تەنها بەڵگە زۆر کورتەکانیان بهێنم و تەنها واتاکانیان وەربگێڕم. جا لەبەر ئەوەی سی پەیام، بەڵکو سەد پەیامیش لە پەیامەکانی نوور هەریەکەیان بەشێکیان لەو سی و سێ پلەیە و بەڵگەکانیان بە چەندین شێوازی جیا جیا ڕوون کردووەتەوە، ئەوا سەبارەت بە درێژەپێدانی ئەو باس و بەڵگانە خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو پەیامانە دەکەین. (دانەر)

کە گەشتیارەکە سەیری کرد، بینیی:

"زەوی" وەك "مەولەویی عاشق" وایە[١]، بەو دوو جۆرە بزووتنەی خۆی کە لە لێواری مەیدانی حەشری مەزندا ئەنجامیان دەدات، هێڵی بازنەیەك دەکێشێت کە ڕۆژ و ساڵ و وەرزەکانی پێ دروست دەبێت و، وەك کەشتییەکی پەروەردگارییانەی مەزن وایە کە سەد هەزار جۆر زیندەوەران و ڕۆزی و داخوازییەکانی گوزەرانی هەموویانی هەڵگرتووە و، بەناو شەپۆلەکانی بۆشاییدا دەکەوێتە ڕێ و، بەوپەڕی هاوسەنگی و ڕێکوپێکی گەشتوگوزاری خۆی بە دەوری "خۆر"دا ئەنجام دەدات.

پاشان ئەم گەشتیارە بۆ لاپەڕەکانی پەڕاوی "زەوی" دەڕوانێت.. دەبینێت:

هەریەك لەو لاپەڕانە، بە هەزاران ئایەت و نیشانە، پەروەردگاری خۆی دەناسێنێت.

بەڵام لەبەر ئەوەی هێندە کاتی بەدەستەوە نەبوو کە هەموو لاپەڕەکان بخوێنێتەوە، ناچار تەنها سەیری یەکێکیانی کرد، کە لاپەڕەی: "بەرجەستەبوونی بەدیهێنانی زیندەوەران و بەڕێوەبردنیانە لە وەرزی بەهاردا".. بینیی:

چەندین "تاك" و "دانە"ی لەژمارەبەدەری سەد هەزار "جۆر"ی ئەو زیندەوەرانە بەوپەڕی ڕێکی و لە ماددەیەکی ساکار، وێنە و شێوەیان بەدی دەهێنرێت و دەکرێنەوە و دەخرێنە ڕوو، ئنجا بەوپەڕی میهرەبانی پەروەردە دەکرێن و بەوپەڕی خێراییش لە هەموو شوێنێکدا بڵاو دەبنەوە، دەبینیت تۆوی هەندێکیان وردیلە باڵی ناسکۆڵەیان دەدرێتێ بۆ ئەوەی پێیان بفڕن! هەروەها بەوپەڕی کارسازی بەڕێوە دەبرێن و، بەوپەڕی شەفەقەت و میهرەبانی گوزەران و خۆراکیان پێ دەدرێت و، بەوپەڕی بەزەیی پێدا هاتن و ڕۆزی پێ بەخشینەوە ڕۆزییە زۆر و جۆراوجۆر و خۆش و بەتامەکانیان بۆ دابین دەکرێت و، لە هیچەوە و لە خۆراکێکی وشك و برنگ و چەند ڕەگێکی ڕەقوتەقی چەشنی ئێسك و، چەند دڵۆپە ئاوێکی وەك یەك و، چەند تۆوێکی لەیەکچوو، ئەو ڕۆزییەیان بۆ دەنێررێت و، لە هەموو بەهارێکدا، بە چەشنی باری شەمەندەفەرێکی پڕ، سەدویەك هەزار جۆری خۆراك و پێداویستی بەوپەڕی ڕێکوپێکی لە گەنجینەی غەیبەوە بۆ زیندەوەران ڕەوانە دەکرێت. بە تایبەت شیری بەلەزەتی پوخت و خاوێن کە لە مەمکی دایکانی

---

(١) مەبەست بە "مەولەوی" لێرەدا: ڕێڕەوانی تەریقەتەکەی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمییە. چونکە موریدی ئەم تەریقەتە کە حاڵ و جەزبەی لێ دێت، بە دەوری کۆڕی زیکرەکەدا دەسووڕێتەوە و لە هەمان کاتدا بە دەوری خۆیشیدا دەخولێتەوە. (وەرگێڕ)

میهرەبانەوە هەڵدەقوڵێن و، ئاوێتەی شەفەقەت و بەزەیی و داناییین و، بۆ منـاڵان بـە دیـاری پێشکەش کراون!

بە ڕوونی و ئاشکرایی شتێکی دیار و چەسپاوە کە: هەموو ئەمانـە دروشـانەوەیەکن - لەوپەڕی پەروەردەکاری و میهرەبانیدا - لە دروشـانەوەکانی میهرەبانیی خـواوەنـدی بەبەزەیی و میهرەبان و، یەکێکن لە چاکەکارییە زۆر و زەبەندە و گشتییەکانی.

**بە پوختی:**

ئەم گەشتیارە، بە بینینی ئەم لاپەڕە "ژیانی"یەی بەهاری ڕەنگین، تێ گەیشت کە:

ئەم لاپەڕەیە یەکێکە لەو وێنانەی کە سەدان هەزار نموونەی حەشر و نەشـریان تێدایـە، کەواتە ئەم لاپەڕەیە بە کردار تەفسیرێکی بەرجەستە و هەست پێکراوی ئـەم ئایەتـە پیرۆزە دەخاتە ڕوو کە دەفەرموێ:

**﴿فَانظُرْ إِلى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذلِكَ لَمُحْيِ الْمَوتـــى وَ هُوَ عَلى كُلِ شَيْءٍ قَديرٌ﴾** (الروم: ٥٠).

ئایەتەکە خۆیشی، بە چەشنێکی ئیعجازبـەخش، هـەموو ئـەو واتایانـە دەگەیـەنێت کـە لەو لاپەڕەیەدا جەم بوون.

هەروەها ئەم گەشتیارە لەو "لا إله الاّ هو"ەش تێگەیشت کە گـۆی زەوی، بـە هـەموو لاپەڕەکانی و بە ڕێژەی مەزنی و هێزی خۆی، هەمیشە دەیلێتەوە و دووپاتی دەکاتەوە!

هەر بەم چەشنە و، لەبەر ڕوونکردنەوەی پوختەی شایەتیدانی تەنها یەك ڕوو لـە بیست ڕووی لاپـەڕە فراوانـەکانی گـۆی زەوی، کـە بیسـت لاپـەڕە زیـاترن و، لەبـەر ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەی کە ئەم گەشتیارە لە لاپەڕە و ڕووەکانی تردا بینیونی، ئەمـەی خوارەوە لە پلەی سێ‌هەمی مەقامی یەکەمدا، باس کراوە:

(لا إله الاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ علي وجـــوب وجوده في وحدته: الأرضُ بجميع ما فيها وما عليها، بشهادة عظمة إحاطة حقيقة: التسخير والتدبير والتربية والفتاحيـــة وتوزيع البذور والمحافظة والإدارة والإعاشـــة لجميـــع ذوي الحياة، والرحمانية والرحيميـــة العامـــة الشـــاملة المكملـــة بالمشاهدة).

## ٤

پاشان ئەو گەشتیارە هەتا لاپەڕەیەکی زیاتری بخوێندایەتەوە، ئیمانەکەی - کە کلیلی بەختەوەرییە - پتر بەهێز و دامەزراو دەبوو، ڕادەی خواناسیشی - کە کلیلی پلیکانە مەعنەوییەکانە - زیاتر پەرەی دەسەند و، پلەیەکی تری ڕاستیی "ئیمان بە خوا" - کە بناغەی بەنرخ و سەرچاوەی بەخوڕ و سازگاری هەموو کەماڵاتێکە - بۆ بینایی دەروونی دەردەکەوت..

هەرچەندە ئەم گەشتیارە گەلێ وانەی بەپیت و گرنگی لە "ئاسمان" و "حەوا" و "زەوی" وەرگرتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، هەتا خوێندنەوە و سەرنج لێدانی ئەو لاپەڕانە چێژی ناسك و مەعنەوی و لەزەتی ڕۆحیی زۆرتریان پێ بەخشیبایە و حەزی ئەویان بیزواندایە و تاسە و ئارەزوومەندییان بجووڵاندایە، ئەو پتر بە دوای دەرسی زیاتردا دەگەڕا و، دەیوت:

- ئایا هی تر ماوە؟

کتوپڕ زایەڵەی زیکری **"دەریا"** و **"ڕووبار"**ە مەزنەکانی بیست، کە بە ئەسپایی و شەوق و نەوازشەوە هەڵدەقوڵان. ئەمیش گوێی بۆ چپەی دەنگە خەمناکە لەزەت بەخشەکانی ئەوان ڕاگرت، کە بە زمانی حاڵ و گوفتار دەیانوت:

- (بۆچی بۆمان ناڕوانیت.. ئایا سەیرمان ناکەیت)؟

ئەمیش بە تاسەمەندییەکی ئاوێتەی سەرسامییەوە تەماشای کردن، بینیی:

**"دەریاکان"** کە بە توندی و چوست و چالاکی و بەردەوامی شەپۆل دەدەن و، پرژان و ڕژان و ڕۆچوونیان لە سروشتدایە.. دەورەی سەرانسەری زەوییان داوە و، هاودەم لەگەڵ وشکایی گۆی زەویدا بە خێراییەکی لەڕادەبەدەر لە ماوەی یەك ساڵدا بازنەیەکی بیست و پێنج هەزار ساڵی دەبڕن، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا بەم لا و ئەو لای خۆیاندا ناپرژێن و زاڵ نابن!

کەواتە ئەم دەریایانە بە فەرمانی کەسێك بەڕێ دەخرێن و دەوەستێنرێن کە خاوەنی مەزنی و دارای توانستی ڕەهایە.

پاشان ئەم گەشتیارە سەیری: **"ناوەوەی دەریا"** دەکات، دەبینێت:

جگە لە مرواری‌یە درەوشاوە تیشك بەخشەکانی، کە لەوپەڕی جوانی و ئارایشت و ڕێکوپێکیدان.. ڕۆزیدان و ژیاندنی هەزاران زیندەوەری جۆراوجۆری ناویشی.. هەروەها بەڕێوەبردنیان و دەستنیشان کردنی لەدایك بووان و کۆچ کردووانیان، بەوپەڕی ڕێکی و وردەکاری.. هەروەها پەیدابوون و گەشەکردنی خۆراك و ڕۆزی‌یەکانیان لە لمێکی ئاسایی و ئاوێکی سوێر.. هەموو ئەمانە، بەوپەڕی ئاسانی و تەواوی ئەنجام دەدرێن، بە چەشنێ کە بە ئاشکرا دەیچەسپێنێت:

ئەم کارانە تەنها بە ویستی خاوەن توانایەکی شکۆمەند و، ڕۆزیدان و ژیانبەخشینی خوایەکی خاوەن جوانی نەبێت، هەرگیز بەڕێوە نابرێن.

پاشان ئەو ڕێبوارە سەیری **"ڕووبارەکان"** دەکات، دەبینێت:

سوود و بەرژەوەندی‌یەکانی ناویان و، خزمەتگوزاریی فەرمانبەری‌یەکانی ئەستۆیان و، ئەو "خەرجی"یانەی بەرهەمیان دێنن و، ئەو "دەرامەتانە"ش دێنە دەستیان.. هەموو ئەمانە، بە دانایی‌یەکی فراوان و، میهرەبانی‌یەکی مەزن ڕوو دەدەن. بە ڕادەیەك کە بە ئاشکرا دەیچەسپێنن: هەرچی جۆگە و کارێز و کانی و لافاو و ڕووبارە مەزنەکان هەن، هەموویان لە گەنجینەی خواوەندی میهرەبانی شکۆمەند و بەخشندەوە هەڵدەقوڵێن، بەڵکو بە چەشنێکی دەراسا هەڵدەگیرێن و پاشەکەوت دەکرێن و، ئنجا بە جۆرێکی نائاسایی و لە عادەت‌بەدەریش بەکاردەهێنرێن و دەخرێنە سەر ڕەوتی ڕەوان و بەخوڕی خۆیان. تەنانەت فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بەم واتایە هەیە کە دەفەرموێ: چوار ڕووبار هەن لە بەهەشتەوە دێن[1]. بەو واتایەی کە ڕەوتی بەخوڕی ئەم ڕووبارانە گەلێ لە سەرووی ژمێرکاری و لێکدانەوەی هۆکارە ماددی‌یەکانەوەن، کەواتە تەنها لە گەنجینەی بەهەشتێکی مەعنەوی‌یەوە دێن کە وشك ناکات و، لە ڕێژنەی کانیی غەیبیی وەهاوە هەڵدەقوڵێن کە تەواو بوون و برانەوەی بۆ نی‌یە.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه، قال: قال رسول الله ﷺ "سَيْحان وجَيحان والفرات والنيل كلٌّ من أنهار الجنة". رواه مسلم: كتاب الجنة:٢٦، وفي الخطيب البغدادي "ليس من الجنة في الارض شئ إلاّ ثلاثة اشياء: غرس العجوة والحجر وأواقٍ تنزل في الفرات كلَّ يوم بركة من الجنة". هەروەها بڕوانە: فيض القدير ٣٨١/٥. (وەرگێڕ)

بۆ نموونە: ئەوەتا ڕووباری بەپیتی "نیل" کە دەشتایی وشك و برنگی میسری کردووە بە بەهەشتی ڕووی دنیا، بە چەشنی دەریایەکی بێبرانەوە، هەمیشە ئاوی لەبەر دەڕوات و، لە بنی چیایەکی باشوورەوە کە ناوی "جبل القمر"ە هەڵدەقوڵێت. خۆ ئەو ئاوەی کە لە ماوەی شەش مانگدا لەبەری دەڕوات گەر کۆبکرێتەوە و بمەیەنرێت و بکرێت بە "سەهۆڵ" ئەوا گەلێ لەو چیایە مەزنتر دەردەچێت! لە کاتێکدا کە ئەو جێیەی لەو چیایەدا بۆ پاشەکەوت کردنی ئاو تەرخان کراوە هێشتا شەشیەکی خودی چیاکە نابێت! ئنجا دەرامەت و دەستکەوتەکانیشی تابلێیت کەمن، چونکە کەمیی باران و گەرمیی یەکجار زۆری ناوچەکە و تینوێتی زەویی ئەوێ، هەموویان پێکەوە - مەگەر زۆر بە کەمی - دەنا دەرفەت بە پاشەکەوت کردنی ئەو ئاوە و بواری پارێزگاری کردن و ڕاگرتنی هاوسەنگیی خەرجی و دەرامەتەکانی نادەن. لەبەر ئەوەیە کە ڕیوایەت کراوە: ڕووباری "نیل" لە بەهەشتێکی غەیبییەوە هەڵدەقوڵێت. بەم چەشنە، ئەو ڕیوایەتە، ڕاستییەکی ورد و پڕ لە واتای گەلێ قووڵی ڕاگەیاند.

ئەم گەشتیارە - بەم جۆرە - لە نێوان هەزاران شایەتی و ڕاستیی ئەوتۆدا، کە بە وێنەی دەریاکان فراوانن، تەنها یەك ڕاستی و یەك شایەتیی بینیی و، ئنجا تێگەیشت کە هەموو دەریاکان پێکەوە و بە گشتی و یەکدەنگی و بە ئەندازەی هێزی هەموویان: "لا إلـــه إلاّ هو" دووپات دەکەنەوە و، لەمەوە بە ئەندازەی بەدیهێنراوانی ناو دەریاکان شایەتیی لەسەر ڕاستیی ئەم شایەتیدانە لە بەرچاودا ڕاست بووەوە.

پلەی چوارەمی مەقامی یەکەم، بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو شایەتییەکانی دەریا و ڕووبارەکان، ئەمەی خوارەوەی ڕاگەیاندووە:

(لا إله إلاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ على وجـــوب وجوده في وحدته: جميع البحار والأنـــهار بجميع مافيـــها، بشهادة عظمة إحاطة حقيقة: التسخير والمحافظة والإدخـــار والإدارة الواسعة المنتَظَمَة بالمشاهدة).

* * *

٥

پاشان **"چیا"** و **"بیابانەکان"** بانگیان لەو ڕێبوارە کرد کە نوقمی "گەشتی فیکری" بووە؛ پێیان وت:

(ئەی لاپەڕەکانی ئێمەش ناخوێنیتەوە)؟

ئەویش کە چاوی پێدا گێڕان، بینیی:

فەرمانبەرییە هەمەکی و سوودە گشتییەکانی **"چیاکان"** هێندە مەزن و پڕ لە دانستن کە سەری ژیرییەکانی تێدا سووڕماوە. بۆ نموونە:

قنج بوونەوەی چیاکان، بە فەرمانی خوای گەورە، بووە بەهۆی ئارامگرتن و هێدیکردنەوەی هەڵچوونی زەوی و، هێمن بوونەوەی ئەو تووڕەیی و توند و تیژییانەی کە لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕەکانی ناویەوە پەیدا بوون.. ئنجا فوارە و کەلێن و کەلەبەرەکانی ناو چیاکان بواری هەناسەدانی ناوەوەی زەوی دەدەن و دەیحەوێننەوە. بەمەش ڕووی زەوی لە: بوومەلەرزە کاولکار و شەق بوونە ڕوخێنەرەکان ڕزگاری دەبێت و پارێزگاریی ئاسایش و هێمنیی دانیشتووانی دەکرێت.

ئنجا هەروەك ستوون و مێخ لەسەر کەشتییەکان دادەکوترێن تاکو هاوسەنگییان ڕاگیر بکرێت و لە نوقم بوون و لەق بوون و تەکانداں بپارێزرێن.. چیاکانیش بە هەمان جۆرن؛ مێخی پڕ لە گەنجینەی کەشتیی گۆی زەوین: لە بوومەلەرزە دەیپارێزن و، پتر سەقامگیری دەکەن و هاوسەنگیشی ڕادەگرن. قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتی پیرۆزیدا ئەم واتایەی ڕوون کردووەتەوە، کە ئەمانە هەندێکیانن:

﴿والجبالَ أوتاداً﴾ (النبأ:٧).

﴿وأَلْقَيْنَا فيها رَوَاسِيَ﴾ (الحجر:١٩).

﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾ (النازعات:٣٢).

نموونەیەکی تر:

ئەو چەندەها جۆرە کانی و ئاو و کانزا و مادده سەرەکییانەی کە زیندەوەران پێویستیان بە هەموویان دەبێت، بەوپەڕی دانایی و سەخاوەتمەندی و کارسازی، لە ناوەندی ئەم چیایانەدا ئامادە و پاشەکەوت کراون، بە چەشنێ کە دەیچەسپێنێت:

ئەم چیایانە چەند گەنجینەیەکی فەرمانبەردار و خزمەتگوزاری یەکێکی بەتوانا و داناى ئەوتۆن کە هەرگیز توانایی و دانایی ئەو لەبن نایەن.

ئەم گەشتیارە بە تەواوی لەمە تێ گەیشت و، ئنجا فەرمانبەری و کارە پڕ لە دانایی‌یەکانی تری چیا و بیابانەکانی - کە بە ئەندازەی مەزنیی چیاکان و فراوانیی بیابانەکانن - بەم دوو گەوهەرەی باس کران، قیاس کرد و، دەبینی کە:

**"چیا"** و **"بیابانەکان"** بە زمانی هەموو دانایی و فەرمانبەری‌یەکانیان کە ئەنجامیان دەدەن، بە تایبەت پاشەکەوت کردنی مادده ئیحتیاتەکان، تێکڕا شایەتی دەدەن و بە وتنی: "لا إله الاّ هو" یەکتایی خوای گەورە ڕادەگەیەنن. ئەم شایەتیدان و یەکتاناسینەشیان بە ئەندازەی چیا سەخت و بلندەکان: بە هێز و ڕەگداکوتاوە و، بە قەدەر هەمەلایەنگری و فراوانیی دەشت و دەر و بیابانەکانیش: گشتی و بەرین و فراوانن.

ئیتر ئەم گەشتیارە کە ئەمەی بینیی ، بەوپەڕی خشووعەوە وتی: "آمنتُ بالله".

بەم جۆرە، لە پلەی پێنجەمی مەقامی یەکەمدا، ئەمەی خوارەوە بۆ خستنەڕووی ئەم ناوەرۆکە، باس کراوە:

(لا إله الاّ الله الواجب الوجود الذي دل على وجوب وجوده: جميع الجبال والصحاري بجميع مافيها وعليها، بشهادة عظمة إحاطة حقيقة: الإدخار والإدارة ونشر البذور والمحافظة والتدبير الإحتياطية الربانية الواسعة العامة المنظمة المكملة بالمشاهدة).

* * *

### ٦

لەو کاتەدا کە ئەم ڕێبوارە بە بیر و ئەندێشەی خۆی بەناو "چیا" و "بیابانەکان"دا دەگەڕا، دەرگای **"جیهانی درەخت و ڕووەکەکان"** لە بەردەم بیری ئەودا کرانەوە و، بانگیان لێ کرد و، پێیان وت:

(وەرە بۆ لای ئێمەش و بەناو باخچەکانماندا بگەڕێ و، دێرەکانمان بخوێنەرەوە)!

ئەويش رۆشتە ناويانەوە، بينيى:

**"درەخت و ڕووەكـەكان"** كۆڕێكى مەزن و قەشـەنگيان بۆ تەهـليل و تـەوحيد سـاز داوە و، بازنەيەكى بەسام و شكۆدارييان بۆ زيكر و شوكرانەبژێرى پێكهێناوە.

ئەم گەشتيارە لـە زمـانى حـاڵى ئەوانەوە تێ گەيشـت كـە درەخـت و ڕووەكـەكان لـە دۆخێكى ئەوتۆدان وەك بڵێيت هەموويان پێكەوە و بە يەك دەنگ "لا إله إلاّ هو" دووپات بكەنەوە. چونكە سێ "ڕاستى"ى هەمەكى و مەزنى ئەوتۆى تيايـاندا بينـى كـە بەڵگەن لەسەر ئەوەى: هەرچى درەختى بەردار و ڕووەكى گوڵدار هەن بـە تەسـبيحات كردنـەوە شـايەتى لەسـەر خـواى خۆيـان دەدەن و، هـەموويان پێكـەوە بـە زمـانى پـاراوى: گـەڵا هاوسەنگەكانيان و، بە گوفتـارى شـيرينى: گوڵـە جوانـەكانيان و، بـە وتـەى ڕەوانـى: بەروبوومە ڕێكەكانيان، تێكڕا "لا إله إلاّ هو" دەڵێن و شايەتيى لەسەر دەدەن.

❑ **يەكەميان:**

ڕاستيى (نيعمەتبەخشين و، ڕێزلێنـانى مەبەسـتدار و، چاكـەكارى و منـەت لێنـانێك كە ويستيان تێدايە).

ئەمەش ڕاستىيەكە لە هەموو ڕووەك و درەختێكـدا بـە ڕوونـى هەسـت بـە نـاوەرۆك و واتاكەى دەكرێت.

واتە: هەرچى ڕووەك و درەخت هەن، هەموويان، چاودێريى: "نيعمـەت پێبەخشـين" بەسـەرى كـردوون و، ويسـتى: "ڕێزلێنـان"يـش گرتوونيەتـەوە.. كەواتـە لـەم ويسـتنەدا چاكەكارى مەبەستە و، منەتباركردنيش يەكێكە لە ئامانجـە بـە لێزمـە و خوڕەمـەكانى ئـەو ويستە. ئەمەش ڕاستىيەكە، بە چەشنى دەركەوتنى ڕوونـاكيى خـۆر، لـە هـەموو شـتێكدا درەخشـان و نمايانـە. چونكـە هـەموو يـەكێك لـە ڕووەك و درەختـەكان لـە نـاوەندى: (نيعمەت پێبەخشـين و، سـەخاوەتمەندى و، ڕێزلێنـان و، منـەت و، چاكـەكارى)دا نوقـم بوون.

❑ **دووهەميان:**

ڕاستيى: (لـە يـەك جياكردنـەوەى هـەموويان بـە چەشـنێكى دانايانـە و مەبەسـتدار و، ئارايشتدان و نەخشاندنيان بە جۆرێك كە "ويست"يان تێدا ديارە و، بە ميـهرەبانى ئەنجام دەدرێت).

ئەم ڕاستىيەش – لە حەقيقـەت و نـاوەرۆكدا – بـە چەشـنى ڕوونـاكيى ڕۆژ، ڕوون و ئاشكرايە. چونكـە لـە يـەك جياكردنـەوەى ئـەو "جۆر" و "تـاك تـاك"ە لەژمارەبەدەرانـەى

ڕووەك و درەختەكان كارێكی مەبەستە و، جیاوازیی نێوانیشیان حیكمەتێكە دەبێ ببێت و، جێ دەستەكانی "ئارایشتدان" و "جوانی"ش میهرەبانی‌یەكی پێویست و ئاماجدارە.

ئەم ڕاستی‌یە هێندە ڕوونە كە بوار بەوە نادات بدرێتە پاڵ "ڕێكەوت". ئەمەش دەری دەخات كە ئەمانەی لەم ڕاستی‌یەدا باس كران، جێكار و ئاسەوار و نەخشی ڕەنگین و بێ هاوتای بەدیهێنەری دانان.

❒ **سێ‌هەمیان:**

ڕاستیی: (نەخشاندنی وێنەی بەدیهێنراوە لە ژمارەبەدەرەكان) كە ئەم بەدیهێنراوانە بە سەدان هەزار جۆر و شێوەی جیاجیا لە چەندین دەنكە دانەوێڵەی كەمی لەیەكچوو و، لە چەند تۆوێكی دیاری كراوی وەك یەك دەم دەكەنەوە و، بەوپەڕی ڕێكی و وردی و ئارایشت و جوانی سەوز دەكرێن، هەرچەندەش هەموو ئەوانە تابلێیت سادە و وشك و تێكەڵی یەكترین.

جا نەخشاندن و پشكووتنی وێنە و شێوەی یەك بە یەكی ئەو جۆرە جیاجیانەی كە لە دووسەد هەزار جۆر تێپەڕ دەكەن، هەریەكەیان بە جیا و، بە ڕێكوپێكی و هاوسەنگیی تەواوەتی و، بە حەیەوییەت و دانایی و، بێ هیچ هەڵەیەك.. ڕاستی‌یەكی گەلێ لە "خۆر" ڕووناكترە.

لەمەوە ئەم گەشتیارە تێ گەیشت كە:

بە ژمارەی گوڵ و، بەروبووم و، گەڵا و، بوونەوەرانی بەهار، شایەت و بەڵگەی چەسپێنەر لەسەر ئەم ڕاستی‌یە هەن. ئنجا بە وتنی: "الحمد لله على نعمة الإيمان" هەموو ئەو واتایانەی دەربڕی كە لە ئەنجامی پەی بردنی بەم ڕاستی‌یە لە دڵیدا جۆشیان خواردبوو.

پلەی شەشەمی مەقامی یەكەم، بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم ڕاستی و شایەتی‌یانە، ئەمەی خوارەوەی باس كردووە:

(لا إله الاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ على وجوب
وجوده في وحدته: إجماع جميع أنواع الأشجار والنباتات
المسبحات الناطقات بكلمات أوراقها الموزونات
الفصيحات، وأزهارها المزينات الجزيلات وأثمارها

المنتظمات البليغات بشهادة عظمة إحاطة حقيقة: الإنعـــام والإكرام والإحسان بقصدٍ ورحمةٍ، وحقيقة التمييز والتزيين والتصوير بإرادة وحكمةٍ، مع قطعية دلالة حقيقة فتح جميع صورها الموزونات المزيَّنات المتباينة المتنوعة الغير المحـــدودة من نواتاتٍ وحبّاتٍ متماثلة متشابـــهة محصورة معدودة).

* * *

## ٧

ئەم گەشتیارە شەیدایەی کە بەم بەرزبوونەوانەی پتر چێژ و تاسەمەندییەکانی زیادیان کردبوو، کاتێ لەو گەشتە بیرەکییەی گەڕایەوە و بە چێژی دۆزینەوەی "ڕاستی" و "بەهەشتەکانی ئیمان" خۆشحاڵ و بەهرەمەند بوو، هەروەها لە باخی خەملاوی بەهار چەپکێکی مەزنی بە ئەندازەی فراوانیی بەهاری لە گولزاری زانین و ئیمان لەگەڵ خۆیدا هێنا..

لەم گەڕانەوەیەیدا، دەرگای **"جیهانی باڵندە و زیندەوەران"** ڕووبەڕووی "ژیریی ئارەزوومەندی دۆزینەوەی ڕاستی" و "بیری تامەزرۆی زانین"ی ئەودا کرایەوە..

ئەو باڵندە و زیندەوەرانە بە سەدان هەزار دەنگ و جریوە و زمانی جیاجیا خولکی ئەم گەشتیارە تاسەمەندەیان بۆ بەسەرکردنی جیهانە فراوانەکەیان کرد و تێکڕا هاتبوونە پێشوازی و بەخێرهاتنی ئەو.

ئەمیش کە ڕۆشتە ناو جیهانەکەیان، بینیی:

هەموو جۆرە جیاجیا و چەشن و نەتەوە جیاوازەکانی باڵندە و زیندەوەران، پێکەوە و بە زمانی حاڵ و گوفتار "لا إله الاّ هو" دەڵێنەوە، بە ڕادەیەك کە دەڵێیت ڕووی زەوی کۆڕێکی بەسام و شکۆی زیکر و کۆگایەکی مەزنی تەهلیلەیە؛ بە چاوی خۆی بینی هەموو یەکێك لەوانە وەکو قەسیدەیەك وایە بە باڵای نیعمەت و بەخششەکانی پەروەردگاردا دەخوێنێت و، چەشنی وشەیەکی ئەوتۆیە کە زاری بە تەسبیحات و پاك ڕاگرتنی بەدیهێنەری لە کاردایە و، پیتێکی بەسۆز و میهرەبانی پڕ واتای وەهایشە کە میهرەبانیی خواوەند ڕادەگەیەنێت.

چونكە هـەر هـەموویان سـەنای بەدیهێنـەریان پێشـكەش دەكـەن و، بـە سـوپاس و ستایشـەوە وەسفەكانی دەنوێنن؛ دەڵێی هـەرچی هەسـت و نەسـت و ئـەندام و ئـامێر و كۆئەندام و هێزی ئەو باڵندە و زیندەوەرانە هەن، هەر هەموویان، وشەی هۆنراوی رێك و گوفتاری پوخت و رەوانن.

ئەم گەشتیارە، سێ راستیی مەزنی لەمەدا بینی كە بە روونی و راسـتی شـایەتن لەسـەر ئەوەی: بـاڵندە و زینـدەوەران "شـوكرانە بژێـری" بەرامبـەر بەدیهێنـەر و رۆزیدەریـان پێشـكەش دەكـەن و، بـەو وشـە و گوفتارانـەیان شـایەتی لەسـەر یـەكتایی خـوای گـەورە دەدەن..

❖ **یەكەمیان**: (راستیی: بەدیهێنان و دروستكردن و داهێنان).

واتە: "راستیی بەزیندووكردن و پێبەخشینی گیان" كە هـەرگیز نـاكرێت و ناگونجێ بدرێتە پاڵ رێكەوت و هێزی كتوكوێر و سروشتی كەرولاڵ، چونكە ئـەم گیـان بەخشـینە راستییەكی وەهایـە كـە بـە "دانـایی" لـە نەبوونـەوە دێتـە "بـوون" و.. داهێنانێكـە لەگـەڵ "رێكـی" و "وردەكـاری"دا هاودەمــە و.. بەدیهێنانێكــە "ویســـت"ی لەگەڵدایــە و.. دروستكردنێكە لەسەر بناغەی "زانست" ئەنجام دراوە..

ئەم راستییە، بە روونی و لـە بیسـت رووەوە، درەوشـانەوەی (زانسـت و، دانسـت و، ویسـت) دەردەخـات. لـە هــەمان كاتیشـدا بەڵگەیـەكی ئاشـكرایە لەسـەر "پێویسـتیی بوون"ی خواوەندی زیندووی راگیركەری گەردوون(الحي القيوم) و، شایەتێكی رەوایە لەسەر حەوت سیفەتە مەزنەكانی و، نیشانەیەكی راستە بۆ "یەكتایی" خوای گەورە.

واتـە: راسـتیی "بـەزیندووكردن و پێبەخشـینی گیـان" بـە ئـەندازەی ژمـارەی هـەموو گیانداران، شایەتی چەسپێنەر دەخاتە روو!

❖ **دووهەمیان**: (راستیی: لە یەك جیاكردنەوە و ئارایشتدان و وێنەكێشانیان). ئەمەش راستییەكە لـەو بەدیـهێنراوە زۆر و لەژمارەبەدەرانەوە دەردەكـەوێت كـە بـە چـەندین نیشانەی جیاكەرەوە لە روخسارياندا و، بە چەندەها شێوەی جیاجیای جوان و ئارایشتی رەنگین و، بە چەند ئەندازەیەكی رێكی لەیەك نەچووی ورد و، گەلـێ وێنـە و نەخشـی رێكوپێك و قەشەنگ، لە یەكتر جیا كراونەتەوە.

ئـەم راستییە هێنـدە مـەزن و بـەهێزە كـە دەری دەخـات جگـە لـە خـوای گـەورەی "بـەتوانا" بەسـەر هـەموو شتێكدا و "زانـا" بـە هـەموو شتێك، نـاكرێت و ناگونجێ هیـچ

کەسێکی تر خاوەنی ئەم کارە گشتگیر(محیط)ە بێت کە هەزار دانایی و کاری دەراسا دەخاتە پێش چاو.

بەڵێ، جگە لەمە هیچ گریمانێکی تر لە ئارادا نییە.

❖ **سێهەمیان:** (ڕاستیی نەخشاندن و خستنە ڕووی وێنە و شێوە لەژمارەبەدەرەکانی ئەو زیندەوەرانەیە) کە لە چەندین هێلکە و گەرای کەمی وەك یەك و، چەند دڵۆپە ئاوێکی کەمی لەیەکچوو یان لەگەڵ کەمێك جیاوازیدا، بە سەدان هەزار شێوە و ڕوخساری جیاجیا دەنەخشێنرێن.

پشکووتن و نەخشاندنی ئەم هەموو وێنە و شێوانەی کە هەر تەنها بۆ خۆیان موعجیزەیەکی سەربەخۆی توانستی خوای گەورەن، بە ڕێکی و هاوسەنگی و وردەکاریی تەواوی بێ هیچ هەڵە و کەم و زیادێك، ڕاستییەکی یەکجار ڕوون و درەخشانە و، ئەم ڕوونییەشی لە چەندین بەڵگە و پاڵپشتی زۆر و زەبەندەی بە ئەندازەی ژمارەی هەموو زیندەوەرانەوە دەست کەوتووە.

ئەم گەشتیارە، بەم چەشنە "جیهانی باڵندە و زیندەوەران"ی بینی و، دەرسێکی تەواوی لە بەڵگەی یەکگرتووی ئەم سێ ڕاستییە وەرگرت، چونکە هەرسێکیان پێکەوە دەبن بە بەڵگەیەکی گەلێ ڕوون و یەکجار مەزن لەسەر ئەوەی کە هەرچی جۆرەکانی سەرجەمی زیندەوەران هەن، بە ڕێژە و گوێرەی مەزنی و گەورەییان، شایەتی لەسەر "بوون" و "یەکتایی" بەدیهێنەر دەدەن و دەڵێن: "لا إله إلاّ هـو". ئەوەندەش بە توندی و هێزەوە ئەم شایەتییە دووپات دەکەنەوە و دەیڵێنەوە کە تەنانەت گومەزی ئاسمانیش بەو دەنگە مەزنە دەزرنگێننەوە و بە گوێی ئاسمان نشینانیدا دەدەن!

لە پلەی حەوتەمی مەقامی یەکەمدا، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییانە، ئەمەی خوارەوە باس کراوە:

> (لا إله إلاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ على وجـوب وجوده في وحدته: إتفاق جميع الحيوانات والطيور الحامدات الشاهدات بكلمات حواسها وقواها وحسيّاتها ولطائفها الموزونات المنتظمات الفصيحات، وبكلمات جهازاتها وجوارحها وأعضائها وآلاتها المكملة البليغات، بشهادة

عظمة إحاطة حقيقة: الإيجاد والصنع والإبـــداع بـــالإرادة، وحقيقة: التمييز والتزيين بالقصد، وحقيقة: التقدير والتصوير بالحكمة، مع قطعية دلالة حقيقة: فتح جميع صورها المنتظمـة المتخالفة المتنوعة الغير المحصورة من بيضات وقطرات متماثلـة متشابـــهة محصورة محدودة).

* * *

## ۸

پاشان ئەم گەشتیارەی کە سەرنجدان و تێرامانی کـردووە بـە خولیـای خۆی، ویستی **"جیهانی مرۆڤ"** بەسەر بکات، بە نیازی ئەوەی کە بە پلە بێسنوورەکانی ناسینی خـوادا پتر سـەر بکـەوێت و، هـەنگاوێکی زیـاتر لـە چەشتنی نوورەکـانی ئـەو ناسینەدا بنێـت و، پلەیەکی بەرزتری ڕووناکیی‌یە لەبن نەهاتووەکانی بەدەست بهێنێت.

لـەم کاتـەدا و لـە پێش هـەموو کەسێکەوە، هـەڵبژاردەکانی گـرۆی ئـادەمیزاد (کـە **پێغەمبـەرانن** – دروودیـان لـەسـەر بێـت) خولێکیـان کـرد و، ئـەمیش ڕۆشتە نـاو جیـهانی مرۆڤەوە.

پێش هەموو شـتێك دەستی دایـە هەڵدانـەوەی لاپـەڕەکانی مێـژووی مـرۆڤ و کەوتـە پشکنین و سەرنجدانی کاتەکانی پێشین.. بینیی:

پێغەمبەران – دروودیان لـەسەر بێـت – کە باشترین و کامڵترینی کەسانی ناو ڕەگەز و گرۆی ئادەمیزادن، هەر هەموویان بە یەکدەنگی و یەك زمان "لا إله إلاّ هـو" دەڵێنـەوە و، بـە هـێزی: موعجـیزە لـە سـنوور بەدەرەکانیشـیان – کـە مـۆری تەسـدیقی ئــەمان و بانگەوازەکەیانە – خـەڵکی بـۆ لای یـەکتایی(التوحیـد) بـانگ دەکـەن.. هـەروەها بینیـی بانگەوازی سەرجەمی ئەو پێغەمبەرانـە، لـە بنـەڕەتدا، بـۆ ئیمـان هێنـانی گـرۆی مرۆڤـە بـە خوای گەورە، تاکو – بەم ئیمانە – گرۆی مـرۆڤ لـە پلـەی ئاژەڵی‌یـەوە بـەرەو پلەیـەکی بالآی مەلائیکەت ئاسا، ببەن و بەرزی بکەنەوە.

بۆیە ئەم گەشتیارە بە ئەدەبێکی شیاوی بەرز و بلنـد و ڕێزێکی شایستەی مەزنـەوە لـە هەیوانی ئەو قوتابخانە نوورانی‌یەدا بـەچۆکدا هـات و، بینیی کە هەریەکە لـەو پێشـەوا و

رابەر و ڕێنماکارانەی مرۆڤایەتی چەندەها موعجیزە و کاری دەراسایان لە بەردەستدایە کە نیشانەی ئەوەن لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە تەسدیق کراون و پشتیان گیراوە.. هەروەها بینیی کە بەهۆی ڕاگەیاندن و ڕێنمایی هەموو یەکێك لەوان کۆمەڵێکی گەلێ زۆر و نەتەوەیەکی یەکجار زەبەندەی گرۆی ئادەمیزاد بەختەوەریی ئیمانیان بەدەست هێناوە.

ئەم گەشتیارە، لە ڕووناکیی ئەمەدا، توانیی مەودای هێز و پتەوی و دامەزراویی "تەوحید"ی بۆ دەربکەوێت، کە ڕاستی‌یەکی ئەوتۆیە هەموو ئەو مرۆڤە ڕاستگۆیانەی کە لە سەد هەزار کەس تێپەڕ دەبن، لەسەری یەکیان گرتووە. هەروەها لە ڕادەی ئەو هەڵە مەزن و تاوانە گەورەیەش تێ گەیشت کە گومڕایان و ئینکاری‌کەرانی ئەو ڕاستی‌یە ڕەگداکوتاوە تێی کەوتوون، کە ڕاستی‌یەکە دارای هێزێکی ئاوایە و تا ئەم ئەندازە و ژمارەیەش هەواڵدەرانی ڕاستگۆ پشتیان گرتووە و بە موعجیزە لەژمارەبەدەرەکانیشیان چەسپاندوویانە.

ئنجا بۆی دەرکەوت کە ئەو گومڕا و سەرسەختانە شایانی چ سزایەکی سەخت و هەمیشەیین و.. ئەوەشی زانی کە ئەو کەسانەی باوەڕیان بەو پێغەمبەرانە هێناوە و ڕۆشتوونەتە ناو بازنەی ئیمانەوە، چەندە لەسەر حەق و ڕاستەشەقامی حەقیقەتن.

بەم چەپکە زانیاری‌یە، پلەیەکی گەورەی خاوێنیی ئیمان و، پایەبەرزیی "تەوحید" لەم گەشتیارە دەرکەوت.

بەڵێ، بەدەر لە موعجیزە لەژمارە بەدەرەکانی **پێغەمبەران** – دروودیان لەسەر بێت – کە پشت ڕاستکردنەوەی بەرجەستەن لە لایەن خواوەندی حەقەوە بۆیان.. هەروەها جگە لەو زللە ئاسمانی‌یانەش کە لە نەیارانیان دران و حەق بوونی پێغەمبەران و پشتگیریی خوای بۆ دەرخستن.. هەروەها جگە لە کەمالاتی کەسیی خۆیان و ڕێنمایی‌یە ڕاست و ڕوونەکانیان، کە بەڵگەی ئەوەن پێغەمبەران – دروودیان لەسەر بێت – لەسەر حەقێکی ڕوون و ئاشکران.. جگە لە هێزی ئیمانیان و دەربڕینی ئەوپەڕی گەرموگوڕی و لێبڕان بۆ کارەکەیان، کە هەموو ئەمانەش شایەتن لەسەر ڕاستگۆیی‌یان و ڕاستیی بانگەوازەکەیان.. جگە لەو کتێب و نووسراوە خاوێن و پیرۆزانەی بەردەستیان.. تەنانەت جگە لە قوتابی‌یە لەژمارەبەدەرەکانیشیان، کە بەهۆی

شوێنکەوتنی پێغەمبەرانەوە گەیشتنە ناوجەرگەی حەقیقەت و بەرەو کەماڵ بەرز بوونەوە و ڕێی ڕووناکی‌یان دۆزی‌یەوە، کە ئەمەش بۆ خۆی شایەتە لەسەر ئەوەی کە: ڕێی ئەو پێغەمبەرانە - درووديان لەسەر بێت - لە هەموو ڕێیەك ڕاست و حەقترە..

جگە لە هەموو ئەمانە..

هەر تەنها یەکگرتنی ئەو ڕاگەیەنەرە ڕاستگۆیانە لە مەسەلە ئیجابی و چەسپاوەکاندا، بەڵگەیەکی بێ گومان و سەروزیادە لەسەر ڕاستیی "ئیمان" و، هێزێکی تری مەزنی ئەوتۆیە کە پشتی ڕاستیی ئیمان دەگرێت و بە ڕادەیەك هێز و پێزی پێ دەبەخشێت کە هیچ توانا و هێزێك لە جیهاندا ناتوانێت هاوشانی بێت. کەواتە ڕاستی‌یەکی ڕەگداکوتاوی چەسپاوی وەهایە پەردە لە ڕووی تەمومژی هەموو دوودڵی و گومانێك هەڵدەماڵێت و دەیاندات بە بادا.

لێرەدا ئەم گەشتیارە پەیی بەو دانستە پەنهانە برد کە باوەڕهێنانی مرۆڤی بە "سەرجەمی پێغەمبەران" بە یەکێك لە پایەکانی ئیمان داناوە! ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە ئیمان هێنان بەو پێغەمبەرانە چۆن دەبێت بە کانیاوێکی سازگاری بەخوڕ و سەرچاوەی هێزێکی بەپیتی مەزن بۆ ئیمانەکەی. هەر کە هەستیشی بەمە کرد و لێی تێ گەیشت، دەستی دایە هەڵگۆزین و لێنۆشینی ئەم کانیاوە بەخوڕ و سازگارە.

لە پلەی هەشتەمی مەقامی یەکەمدا، بۆ دەربڕینی ئەم دەرسەی پێشووی گەشتیارەکە، ئەمەی خوارەوە باس کراوە:

(لا إله إلاّ الله الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدتـه:
إجماعُ جميع الأنبياء بقوة معجزاتـــهم الباهرة المصدقة).

* * *

**٩**

ئەم گەشتیارە زانستخوازەی کە تامی چەندین چێژی بەرز و بڵندی هێزی "ئیمان"ی چەشت و، سروەی فێنك و بێ گەردی "ژیان" بەسەریدا هەڵی کرد.. کاتێ لە کۆڕ و ئەنجومەنی پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - گەڕایەوە، ئەو مرۆڤانە بانگیان کرد کە دەعوای پێغەمبەرانیان بە "علم اليقين" چەسپاندووە و بەڵگەی گومانبڕی بەهێزیان

له‌سه‌ر ڕاستیی بانگه‌وازه‌که‌ی ئه‌وان هێناوه‌ته‌وه، له‌و زانا لێکۆڵه‌ر و موجته‌هیدانه‌ی که پێیان ده‌وترێت: **"الأصفياء والصديقون"** و هه‌ریه‌که‌یان ده‌ریایه‌کی زانست بوون.. ئه‌و زانایانه، خوڵکی ئه‌م گه‌شتیاره‌یان بۆ قوتابخانه‌کانی خۆیان کرد..

ئه‌ویش ڕۆشت و، له‌وێ ئه‌نجومه‌نێکی دی که پڕ بوو له:

سه‌دان هه‌زار زانای ورده‌کار و هه‌زاران بلیمه‌تی هه‌ڵکه‌وتوو، که هه‌ر هه‌موویان به توێژینه‌وه و لێکۆڵینه‌وه قووڵه‌کانیان – که بواری بێبایه‌خترین گومانیش ناهێڵنه‌وه – به‌ڵگه‌یان له‌سه‌ر "بابه‌ته چه‌سپاوه‌کانی ئیمان" ده‌هێنایه‌وه، که له پێشه‌کیی ئه‌و بابه‌تانه‌وه: "بوون" و "یه‌کتایی" خوای گه‌وره بوو.

به‌ڵێ، یه‌کگرتنی ئه‌و که‌ڵه زانا مه‌زنانه‌ی که هه‌رچه‌نده‌ش توانا و لێهاتن و به‌هره‌ی سروشتی و، ته‌نانه‌ت ڕێبازه‌کانیشیان له یه‌کتر جیاوازه، له‌سه‌ر بناغه و بنچینه‌کانی ئیمان.. که هه‌موو یه‌کێك له‌وان پشتی به: هێز و توانا و دڵنیایی به‌ڵگه مه‌حکه‌م و به‌هێزه‌کانی ده‌به‌ستێت..

یه‌کگرتنی ئه‌وانه له‌و بابه‌تانه‌دا، به‌ڵگه‌یه‌کی هێنده به‌هێزه که له توانای که‌سدا نی‌یه به‌ره‌نگاریی بکات، یان پووچه‌ڵی بکاته‌وه، یاخود بتوانێت ده‌مقاڵیی تێدا به‌کار بهێنێت. مه‌گه‌ر یه‌کێك که به ته‌نها خۆی زه‌ینی له هی ئه‌و زانایانه تیژتر بێت و له هه‌موویان زیره‌کتر بێت و به‌ڵگه‌کانیشی له هی سه‌رجه‌م ئه‌و زانا لێکۆڵه‌ر و وردکارانه ڕوونتر و به‌هێزتر بێت!! ئه‌مه‌ش گریمانێکی مه‌حاڵه.

له‌به‌ر ئه‌وه، هه‌رگیز له توانای که‌سدا نی‌یه به‌ره‌نگاری ئه‌و به‌ڵگه‌یه ببێته‌وه، مه‌گه‌ر به: نه‌زانی و، خۆگێل‌کردن و، ئینکاری و، نه‌فی‌کردنێك که ناکرێت بچه‌سپێت. یاخود به: سه‌رپێچی و چاونووقاندن له ئاستی ئه‌و ڕووناکی‌یه‌دا. خۆ دیاره ئه‌و که‌سه‌ی که چاوی ده‌نووقێنێت، ته‌نها ڕۆژگاری ڕووناکی خۆی ده‌کات به شه‌و!

ئه‌م گه‌شتیاره، تێگه‌یشت له‌وه‌ی که: مامۆستایانی ئه‌م قوتابخانه فراوانه، ئه‌وانه‌ی له زانستدا چه‌شنی ده‌ریان، ڕووناکی‌یه‌کیان په‌خش کردووه که بۆ ماوه‌ی هه‌زار ساڵ نیوه‌ی گۆی زه‌ویی ڕووناك کردووه‌ته‌وه.

ئه‌م تێگه‌یشتنه، هێزێکی مه‌عنه‌وی و وزه‌یه‌کی گه‌رموگوڕ و وره‌یه‌کی مه‌زنی به‌م گه‌شتیاره به‌خشی و، هه‌موو گۆشه‌یه‌کی دڵ و ده‌روونی ئه‌وی گرته‌وه، ته‌نانه‌ت گه‌ر

هەموو کەسانی سەرسەخت و ملنەدەر پێکەوە کۆبنەوە و ڕووبەڕووی ڕابووەستن، هێشتا ناتوانن بە ئەندازەی تاڵە موویەکیش لەرزە بەو دڵنیاییەی بخەن و لە جێی ڕەگداکوتاوی خۆیدا بیبزوێنن.

بەم جۆرەی خوارەوەش لە پلەی نۆهەمی مەقامی یەکەمدا، ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو وانە و پەندانە کراوە کە ئەم گەشتیارە لەو قوتابخانەیەدا خوێندوونی و دەستی خستوون:

(لا إله الاّ الله الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته:

اتفاق جميع الأصفياء بقوة براهينم الزاهرة المحققة المتفقة).

* * *

## ١٠

کاتێ ئەم گەشتیارە سەرنجدەرە لە قوتابخانەی زانایان دەگەڕایەوە، تاسەیەکی یەکجار بەتین بوو بە خولیای تاکو ئیمانەکەی پتر زیاد و گەشاوە بکات و ڕوونتر لە بەرچاویدا ئاشکرا ببێت.

بۆ هاتنەدیی ئەم ئامانجە، ئارەزوویەکی بەتین هانی دا کە بڕوات بەو چێژ و ڕووناکییانەش بەهرەمەند ببێت کە لە ڕێی بەرزبوونەوەی ئیمانداران لە پلەی "علم اليقين"ەوە بۆ پلەی "عين اليقين".

ئا لەم کاتەدا، هەزاران و ملیۆنان **"ئەولیای پیاوچاك و ڕابەری مەزن"** لەوانەی کە لە پێناوی گەیشتندا بە "حەقیقەت" تێکۆشاون و لە ئەنجامدا پێی گەیشتوون و، بە بۆنەی شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرەوە ﷺ و لە سایەی میعراجەکەی ئەودا و لە ڕێی گرتنەبەری ڕاستەشەقامەکەی ئەو، بە پلەی: "عين اليقين" شاد و بەهرەمەند بوون.. ئەوانە، خوڵکی ئەم گەشتیارەیان بۆ کۆڕێکی مەزن و ڕەنگینی زیکر و مەقامێکی بەڕێزی ڕابەرایەتی کرد، کۆڕ و مەقامێکی ئەوتۆ کە تەنها ئەو نوورەی لێی دەدرەوشایەوە هەموو گۆشە و لایەکی ڕووناك کردبووەوە و، لە سەرچاوەی پشتگیری و یەکدەنگیی هەموو تەکیە و خانەقاکانیان هەڵقوڵابوو..

ئەم گەشتیارە ڕۆشتە ناو کۆڕەکەی ئەوان و، بینیی کە:

ئەو هەموو ئەهلی کەشف و کەرامەتانە، پێکەوە بە یەك دەنگ "لا إلــه إلاّ هــو" دەڵێنەوە و بەمەش "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی پەروەردگار ڕادەگەیەنن و، لەمەشدا پشت بە کەشف و کەرامەتەکانیان و ئەو شتانە دەبەستن کە بە نووری ئیمان دەیانبینن.

بەڵێ، هەروەك حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆر دەبن بە بەڵگە لەسەر بوونی خۆر، بە هەمان جۆر ڕاستیی "تەوحید"یش، هەموو ئەو مرۆڤە بەرز و خواناس و هەڵکەوتووە دەروون پاکانە پێکەوە و بە یەکدەنگی تەسدیقی دەکەن.

ئەوان لەمەدا تەنها نوێنەری خۆیان نین، بەڵکو نوێنەری هەموو شوێنکەوتووانی تەریقەتە ڕاستە جۆراوجۆرەکان و ڕێڕەوانی ڕێبازە دروست و خاوەن مەشرەبە حەق و ڕەوا و لە یەکتر جیاوازەکانن، کە حەفتا ڕەنگیان لێ نیشتووە، تەنانەت بە ژمارەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە جۆراوجۆرن و، بە ئەندازەی ئەو نوورە ڕەنگاوڕەنگ و جیاوازانەن کە لە نووری ڕووناکیی خۆری ئەزەلەوە بەسەر "دڵ" و "ئاسۆکان"دا درەوشاونەتەوە.

جا کە ئەم گەشتیارەش وەك ئەوان درەوشانەوەی ئەو ڕاستییە ڕووناکەی بە "عین الیقین" بینی، بۆی دەرکەوت کە:

ڕاستییەك هەموو پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - تیایدا یەکدەنگ بن و.. گشت زانا و دەروون خاوێنان لەسەری یەکیان گرتبێت و.. سەرجەمی ئەولیا و پیاوچاکانیش تیایدا هاودەنگ بن، ڕاستییەکی گەلێ ڕوونترە لە چاو ڕووناکیی ڕۆژ کە بەڵگەی بوونی خۆرە!

هەر بەم چەشنە، لە پلەی دەهەمی مەقامی یەکەمدا، ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو ڕووناکییە بەرێزنەیە کراوە کە ئەم ڕێبوارە لەو تەکیە و خانەقایانە بەدەستی هێنا:

(لا إله إلاّ الله الذي دلّ على وجوب وجوده في
وحدته: إجماع الأولياء بكشفياتهم وكراماتهم
الظاهرة المحققة المصدقة).

* * *

## ١١

پاشـان ئـەم گەشـتیارە، بـە هـەموو توانایـەکی خـۆی و گشـت هەسـتە نیـان و ناسکەکانیەوە، ویستی لـە هێز و پێزی ئیمانەکەیدا پتر سـەربکەوێت و ناسینی خـوای گەورەشی زیاتر بۆ ڕوون ببێتەوە، چونکە دەیزانی کە خۆشویستنی خوای گەورە گەر لـە ناسینی و باوەڕبوونەوە پێی سـەری هـەڵدابێت، ئـەوا مـەزنترین و گرنگـترین و فراوانـترین کەماڵە بۆ مرۆڤ، تەنانەت سـەرچاوە و بناغـەی هـەموو کەماڵێکـە. لەبـەر ئـەوە، سـەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و، لەگەڵ "ژیری"ی خۆیدا دوا و، وتی:

مادەم "ژیان" بەنرخترین شتی ناو گەردوونە و، هەموو بوونـەوەرانی تریش بۆ "ژیـان" ڕام و گوێڕایـەڵ کـراون و، بـەنرخترینی ئەوانـەش کـە دارای ژیـانن: گیانلەبـەرانن و، بڵندترینی ئەوانیش: خاوەن هەستانن..

مادەم لەبەر ئەم پلە بەرزی‌یەی "ژیان" هەموو سـەردەمێك، بـەڵکو گشـت ساڵێك بـە بەردەوامی و بۆ مەبەستی زۆرکردنی زیندەوەران، گۆی زەوی‌یان لـێ پڕ دەکرێت..

کـەواتـە بێ هیچ گـومانێك، دەبێـت ئـەم ئاسـمانە بـەرز و ڕازاوانـەش دانیشـتووانی زینـدوو و خـاوەن هەسـت و شـعوور و ژیـانی وایـان هـەبێت کـە لەگـەڵ بـارودۆخی ئـەو شوێنانەدا تەبا و گونجاو بن، خۆ ئـەوەتا چـەندین "ڕیوایـەتی موتـەواتیر" هـەن دەیچەسپێنن کە هەر لە کۆنـەوە **"مەلائیکـەت"** بینـراون و قسـەیان لەگـەڵدا کـراوە، وەك دەرکـەوتنی حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسـەر بێت - لە شێوەی مرۆڤدا و لە بەرچاوی هاوەڵان و لە کۆڕی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ.

لەبەر ئەوە، گەشتیارەکە وتی:

خۆزگا بە بینینی **"سەرنشینانی ئاسمـان"**یش شـەرەفمەند دەبووم و، دەمزانـی لـەبارەی "ڕاستیی ئیمان و یەکتایی خوای گەورە"وە، چی‌یان لە لایـە. چونکـە گرنگـترین شـایەتی لەبارەی بەدیهێنەری گەردوونەوە شایەتیی ئەوانە..

ئەم هێشتا لـەم قسـانەی نەبووبووەوە، گوێـی لـێ بـوو دەنگێـك، وەكبڵێیـت ئاسمـانی بێت، دەیوت:

(مـادەم دەتـەوێت پێمـان بگـەیت و گـوێ لـە وانـەکانمان ڕابگریـت، ئـەوا بزانـە: سەرجەمی ئەو بابەتە ئیمانی‌یانەی کە لە ڕێی ئێمـەوە بۆ گشـت پێغەمبـەران نێرراون، لـە

پێشەکیی هەموویانەوە ئەو قورئانەی کە بۆ حەزرەتی محەممەد ﷺ رەوانە کراوە، لە پێش هەموو کەسێکدا ئێمە باوەڕمان پێیان هێناوە و ملکەچیان بووین. ئەوەش بزانە کە: هەموو خاوەن گیانە خاوێنەکانی ئێمە، لەوانەی کە لە بەرچاوی مرۆڤدا دەرکەوتوون، شایەتی‌یان لەسەر "پێویستیی بوون" و "یەکتایی" خوای گەورە و "سیفەتە خاوێنەکانی" داوە. ئنجا ئەو هەواڵە زۆرانەش کە ئەوان ڕایانگەیاندوون، هەموویان یەکاویەك دەرچوون. جا یەکگرتنی سەرانسەریی ئەو هەواڵە زەبەندە و لەژمارەبەدەرانە - خۆی لە خۆیدا - بەڵگەیەکی وەك خۆر ڕوون و ئاشکرایە).

کاتێ ئەم گەشتیارە ئەمەی لێ بیستن، لە مەبەستەکەیان گەیشت و نووری ئیمانەکەی پتر ورشەی دایەوە و ڕووناك بووەوە، تا بەرەو ئاسمانەکان سەرکەوت و پلەیەکی بالاتری بەدەست هێنا.

هەر بەم چەشنە، لە پلەی یازدەهەمی مەقامی یەکەمدا، ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو وانەیە کراوە کە ئەم گەشتیارە لای مەلائیکەت خوێندی:

(لا إله إلاّ الله الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته: إتفاق الملائكة، المتمثلين لأنظار الناس والمتكلمين مع خواص البشر، بإخباراتهم المتطابقة المتوافقة).

* * *

## ١٢ - ١٣

پاش ئەو دەرسەی کە ئەم ڕێبوارە لە زمانی حاڵ و گوفتاری چەندین دەستە و تاقمی دیاری کراوی لایەنە ماددی‌یەکەی "جیهانی بینراو" وەری گرت، تاسە و ئارەزوومەندی‌یەکانی زیاتر بزوان بۆ لێکۆڵینەوە و، کەوتە خولیای گەشتوگوزار و پشکنینی پتر لە بارەی "حەقیقەت"ەوە.

لەبەر ئەوە، بە نیازی موتالاکردنی لاپەڕەکانی "جیهانی پەنهان" و "جیهانی بەرزەخ"یش ڕۆشتە پێشەوە.

لەم کاتەدا، دەرگای **"ژیری‌یە ڕاست و ڕووناکەکان"** و **"دڵە ساغە نوورانی‌یەکان"** کە هیچ چین و دەستە و بەرەیەکی مرۆڤ لێیان بێ‌بەش نابێت، لە ڕووی ئەمدا کرانەوە.

"ژیری" و "دڵ" لە ڕاستیدا وەك "تۆو" و "کاکڵە"ی مرۆڤ وان. تەنها بەهۆی ئەوانەوە مرۆڤ بۆی ڕەخسا کە ببێت بە بەری درەختی گەردوون. چونکە هەرچەند ئەم دوانە بە ڕواڵەت بچووکن، بەڵام لە ڕاستیدا دەتوانن پەل بۆ هەموو لایەك بهاوێژن و دارای فراوانی‌یەکی هێندە بەرین و بەربڵاون کە دەتوانن جێی سەرانسەری جیهان لە خۆیاندا بکەنەوە.

کە لەم دەرگایەوە ئەم گەشتیارە ڕوانیی، بینیی کە:

"ژیری" و "دڵان" ناوەندێکن لە مرۆڤدا لە نێوان هەردوو جیهانی "ئاشکرا" و "پەنهان"دا. چونکە پەیوەندی و مامەڵەکانی نێوان ئەم دوو جیهانە – سەبارەت بە مرۆڤەوە – لەو سنوورانەدا ڕوودەدەن.

لەبەر ئەوە، ئەم گەشتیارە، ڕووی لە "ژیری" و "دڵ"ی خۆی کرد و، پێی وتن:

(نزیکترین ڕێی گەیشتن بە "حەقیقەت" لە دەرگای هاوچەشنی ئێوەوەیە. کەواتە وەرن با پێکەوە سوود لە خوێندنەوەی لاپەڕەکانی ئەو دڵ و ژیری‌یانە وەربگرین کە خاوەنی ئیمانن. با لە بارەی چۆنێتی و جۆرەکانیانەوە بکۆڵینەوە، چونکە ئەم وانەیە چەشنی وانە و ڕێگاکانی تر نی‌یە و دەماودەم وەرناگیرێت).

پاش ئەمە، یەك بە یەکی لاپەڕەکانی "ژیری" و "دڵان"ی هەڵگێڕایەوە و، بە وردی سەرنجی دان و بە درێژی و خەستوخۆڵی بیری خۆی ئاراستە کردن، تا لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت:

هەموو "ژیری‌یە ڕاست و ڕووناکەکان" هەرچەندەش توانا و لێهاتنیان لە یەکتر جیاوازە و ڕێبازەکانیشیان جیاجیا و لە یەکتر دوورە، کەچی هەر هەموویان لە باوەڕی ڕوون و چەسپاوی ڕەگداکوتاوی "ئیمان و تەوحید"دا و، لە یەقین و قەناعەتی بێ گومان و دڵنیایی‌بەخشدا، یەکیان گرتووە. واتە هەموویان پاڵیان بە باوەڕێکەوە داوە و پەیوەستەی ئیمانێکن کە گۆڕانی بۆ نی‌یە و، ڕۆشتوونەتە ناوجەرگەی "ڕاستی"یەکی چەسپاوی ئەوتۆیشەوە کە دووچاری پچڕان و لێکترازان نابێت.

لەبەر ئەوە، یەکدەنگی و یەکگرتنی ئەم هەموو ژیری‌یانە لە بابەتەکانی: "ئیمان" و ، "پێویستیی بوون" و، "یەکتایی" خوای گەورەدا، زنجیرەیەکی هێندە نوورانی‌یە کە

هەرگیز ناپچڕێت و، پەنجەرەیەکی فراوان و ڕووناکیبەخشی وەهایشە کە بەسەر "حەقیقەت"دا دەڕوانێت.

هەروەها بینیی کە:

سەرجەمی "دڵە ساغ و نوورانیی‌یەکان" هەرچەندەش مەشرەبەکانیان جیاوازن و ڕێبازەکانیشیان لە یەکترەوە دوورن. کەچی لە نێوان خۆیاندا و لە کەشف و بینینەکانیاندا - کە دارای یەکگرتن و دڵنیایی و سەرنج ڕاکێشانن - لە بابەتەکانی "ئیمان" و "تەوحید"دا هەموو یەکیان گرتووە. واتە: هەریەك لەم دڵە ڕووناکانە عەرشێکی یەکجار بچووکە؛ ناسینی خوای پەروەردگاریان لەسەر جێگیر بووە و، ئاوێنەیەکن نووره ڕووناکی بەخشەکانی خواوەندی "صەمەد"یان تێدا دەردەکەوێت و دەدرەوشێتەوە. چونکە ئەو دڵانە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی "حەقیقەت" ڕاوەستاون و "ڕاستی"یان تێدا دەردەکەوێت و، لەم ڕێیەوە دەستی مرۆڤ دەگرن و دەیگەیەنن بە "ڕاستی" و، شاد و بەهرەمەندی حەقیقەتی دەکەن.

کەواتە ئەم دڵانە چەند پەنجەرەیەکن ڕووبەڕووی "خۆری حەقیقەت" کراونەتەوە. واتە کۆی هەموو ئەم دڵانە پێکەوە ئاوێنەیەکی مەزنی چەشنی دەریا پێکدەهێنن لە بەرامبەر ئەو خۆرە درەخشانەوە.

ئنجا یەکگرتن و یەکدەنگیی سەرجەمی ئەم "ژیری" و "دڵان"ە لەسەر: "پێویستیی بوون" و "یەکتایی خوای گەورە" بەڵگەیەکی تابڵێیت تەواو و ڕابەرێکی یەکجار مەزنی وەهایە کە نە سەری لێ دەشێوێت و نە کەسیش گرفتاری سەرسامی و سەر لێ‌شێوان دەکات، چونکە هەرگیز لە هیچ لایەکەوە ئەو گریمانە نایەتە کایەوە کە: وەهمێکی دوور لە ڕاستی و، بیرێکی دابڕاو لە حەقیقەت و، سیفەتێکی بێ‌بناغە، کارێك بکات چاوی بینەر و تیژی ئەم هەموو خاوەن دڵە خاوێن و ژیری‌یە بە ویقارانە، هەر لە مێژەوە، بە تەواوی بخەڵەتێنێت و تا ئێستاش هەر لە خەڵەتاندنیاندا بەردەوام بێت!! یان تێکڕا هەموو ئەوانە بخاتە ناو داوی گێلی و گێژاوی سەر لێ تێکدانەوە!!

ئایا جگە لە کەسێ کە عەقڵێکی گەنیوی بێ کەڵکی لە کەللەدا بێت، کەسی تر هەیە گریمانی وا شك ببات؟ خۆ سۆفستائی‌یە نەفامەکانیش - کە ئینکاریی بوونی گەردوون دەکەن - دەست بە ڕووی گریمانی وەهاوە دەنێن و قایل بوون پێی بە مایەی شەرمەزاری دەزانن!

ئەم گەشتیارە، بەم شێوەیە، لەم ڕاستی‌یە گەیشت و، ئەویش هاودەم لەگەڵ "ژیری" و "دڵ"ی خۆیدا وتی: "لا إله إلاّ هو"!

لە پلەی سیازدەهەمی مەقامی یەکەمدا، بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژە بۆ ئەو زانیاری‌یە ئیمانی‌یە کراوە کە ئەم گەشتیارە لە: "ژیری‌یە ڕاست" و "دڵە ڕووناکەکان"ەوە بەدەستی هێنا:

(لا إله الاّ الله الواجب الوجود الذي دلّ على وجـوب وجوده في وحدته: إجماع العقـول المستقيمة المنـورة باعتقاداتـها المتوافقة وبقناعاتـها ويقينياتـها المتطابقـة، مع تخالف الاستعدادات والمذاهـب.. وكـذا دلّ علـى وجوب وجوده في وحدته: إتفاق القلوب السليمة النورانية بكشفياتـها المتطابقة وبمشاهداتـها المتوافقة، مع تبـاين المسالك والمشارب).

* * *

## ١٤-١٥

پاشان ئەم گەشتیارە کە لە نزیکەوە بۆ **"جیهانی پەنهان"**ی ڕوانی و گەشت و گەڕانی بەناو هەردوو جیهانی "ژیری" و "دڵ"دا کرد، بەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە دەرگای ئەو جیهانەی دا کە:

"ئاخۆ جیهانی پەنهان(عالم الغیب) چی بڵێت"؟

چونکە:

مادەم ئێمە لەم جیهانە بینراوە ماددی‌یەدا دەبینین کە ئەو کەسەی لە پشت پەردەی غەیبەوە، بەم ئەندازە مەزن و زۆرەی بەدیهێنراوە ڕێك و ڕازاوەکانی، خۆیمان پێ دەناسێنێت و.. بەو هەموو نیعمەتە بەتام و لەزەت و خۆشە لەژمارەبەدەرانەشی بەرەو خۆشویستنی خۆی هانمان دەدات و.. بەم ڕادە زۆر و زەبەندەیەی ئاسەوار و نیشانە دەراسا(خارق) و ناوازانەی خۆیشی، هەوالی کەماڵاتی پەنهانی خۆیمان دەداتێ..

بەڵێ، ئەو کەسەی کە ئاوا بە کـردەوە و زمـانی حـاڵ - کـە گەلـێ ڕوون و ڕەوانترە لـەچاو زمـانی گوفتـار - خـۆی بـە بەدیـهێنراوانی دەناسـێنێت و خـۆی لای ئـەوان خۆشەویست دەکات.. دەبێت هەروەك بە کردار و زمانی حاڵ دەدوێـت، بـە گوفتـاریش بدوێت و زاتی خۆی بە بەدیهێنراوانی بناسێنێت و لە لایان خۆشەویستی بکات.

بۆیە ئەم گەشتیارە لەبەر خۆیەوە بە خۆی وت:

(دەبێت لە ڕێی دیـاردە و ڕواڵەتەکانی "خوایـەتی و پـەروەردگاریتی خـواوەنـدەوە لـە جیهانی پەنهاندا" خوای گەورە بناسین).

ئەمەی وت و، ئنجا بە "دڵ" لەو جیهانەدا ڕۆچوو و بە "ژیری"یش بینیی کە:

**ڕاستیی سرووشی خوایی**(حقيقة الوحي الإلهـــي) لـە هـەموو کـاتێکدا و بـە چـەندین ڕواڵـەتی لەوپـەڕی هێز و ڕوونیـدا بەسـەر هـەموو جیـهانی پەنـهاندا زاڵـە و، لـە لایـەن خواوەنـدی زانـای پەنهانەکانەوە شـایەتی لەسـەر "بـوون" و "یـەکتایی" خـوای گـەورە دەدرێت، کە ئەمەش بریتیـیە لە شایەتیدانی "وەحی" و "ئیلـهام"، کـە گەلـێ لـە شـایەتیی بوونەوەران بـەهێز و توندوتۆڵـترە، چونکـە خـوای گـەورە پێناسینی خۆی و بەڵگەکانی "بوون" و "یەکتایی" خۆی تەنها لە بازنەی بوونەوەراندا ناهێڵێتەوە، بەڵکو خۆیشـی - بـە فەرمایشت و گوفتاری ئەزەلیی شـیاوی زاتـی خۆیشی - دەدوێـت و خـۆی دەناسێنێت. چونکـە گوفتـاری ئـەو خـواوەنـدەی کـە هەمیشـە ئامادەیـە و بـە زانسـت و توانـای خـۆی چاوی لە هەموو جێیەکە، سنوور و کۆتایی بۆ نییە. جا هەروەك "واتای گوفتارەکـەی" ئەو خوایەمان پێ دەناسێنێت، بـە هـەمان جـۆر وتـن و گوفتارەکەشی، لـە ڕێـی ناسـاندنی سیفەتەکانیەوە، ئەومان پێ دەناسێنێت.

بەڵێ، تـەواتور و یـەکدەنگیی سـەد هـەزار پێغەمبـەر - دروودیـان لەسـەر بێـت - لـەو هـەواڵەیاندا کـە لـە سـەرچاوەی "وەحی"ی خواییـیەوە پێیـان گەیشـتووە.. هـەروەها بەڵگـە و موعجیزەکـانی کتێبـە خـاوێن و پیرۆز و صوحوفـە ئاسمانییـەکان، کـە وەحیـی بەرجەستە و بینراون و بەرهەمی "وەحی"ی خواوەندن و زۆربەی هـەرە زۆری مرۆڤایـەتی تەسدیقیان کردوون و شوێنیان کەوتوون و لەبەر تیشکی ئەو ڕووناکییەدا ڕێی ڕاسـتیان دۆزیوەتەوە..

ئەمانـە، وایـان لـەم گەشتیارە کـرد کـە بـە ڕوونـی تێبگـات: "وەحـی" ڕاسـتییەکی چەسپاوی ڕەگداکوتاوی ئەوتۆیـە جێـی دەمقـاڵێی تێـدا نییـە. هـەروەها تێ گەیشـت کـە

ڕاستیی "وەحی" پێنج ڕاستیی خاوێن دەبەخشێت و جەختیان لەسەر دەكات و ڕوونیان دەكاتەوە:

○ **یەكەمیان:** بریتی‌یە لە ئاخاوتنی خوای گەورە بە گوێرەی تێگەیشتنی ئادەمیزاد و لە ئاستی ژیریی ئەواندا، كە پێی دەوترێت: "التنـــزلات الإلهية إلى عقول البشر".

بەڵێ، پەروەردگاریێتیی ئەو كەسەی كە هەموو گیانلەبەرانی ناو بەدیهێنراوانی خۆی خستووەتە قسە و لە گوفتار و ئاخاوتنیان تێدەگات، داخوازی ئەوەیە كە واتای ئاخاوتنە ئەزەلی‌یەكەی خۆیشی لە چەند و شەیەكدا دابڕێژێت، تاكو بۆ ئادەمیزاد بڕەخسێت ئەو گوفتارە ئەزەلی‌یانە لە نێوان قسە و گوفتارەكانی خۆیاندا بخوێننەوە.

○ **دووهەمیان:** ئەو كەسەی بوونەوەری وەك موعجیزەیەك بەدی‌هێناوە و، هەر ئەم بوونەوەرەشی لە چەندەها موعجیزەی ڕوون و ئاشكرای تر پڕ كردووە، تاكو بەم موعجیزانە "بەدیهێنەر" بە خاوەن هەستان بناسێنێت.. ئەو كەسەی بوونەوەرانی بە چەند زمانێكی گۆیای ئەوتۆ خستووەتە گوفتار كە لە باسی كەماڵاتی بدوێن، دەبێت هەر ئەو كەسە خۆیشی، بە "گوفتارەكانی"، خۆی بەوان بناسێنێت.

○ **سێ‌هەمیان:** ئەو كەسەی بەدەم لاڵانەوە و سكاڵا و پاڕانەوە و شوكرانەبژێریی مرۆڤە ڕاستەقینەكانەوە دەڕوات، ئەو مرۆڤانەی كە پوختە و كاكڵەی بوونەوەرانن و، لە هەموو بوونەوەرانیش پتر دەستكورت و زیاتر ئارەزوومەند و گەلێ هەست ناسكترن.. سیفەتی "بەدیهێنەرێتی"ی ئەو خواوەندەی كە ئاوا - بە كردار - بە هانای پاڕانەوە و شوكرانەبژێریی ئەو مرۆڤانەوە دەڕوات، داخوازی ئەوەیە كە: بە گوفتاری پەروەردگاری‌یانەی خودی خۆیشی، بەرامبەر بەو شوكرانە و لاڵانەوە و سكاڵایەی ئەوان، بدوێت.

○ **چوارەمیان:** سیفەتی "ئاخاوتن" كە لازم و پێویست و دیاردەی ڕووناكی‌بەخشی هەردوو سیفەتی: "زانین" و "ژیان"ە، دەبێت بە شێوەیەكی گشتگیر و هەمیشەیی و هەتاهەتایی لەو كەسەدا ببێت كە خاوەنی "زانست"ی گشتگیر و "ژیان"ی هەمیشەیی‌یە.

○ **پێنجەمیان:** ئەو كەسەی كە: (كۆڵەواری و، تاسەمەندی و، هەژاری و، موحتاجی و، مەترسیی دواڕۆژ)ی لە سروشتی بەدیهێنراوانیدا داناوە و، (خۆشەویستی و بەندایەتی)ی پێ بەخشیون، بە ڕادەیەك كە هەست بە خۆشەویستی‌یەكی یەكجار توند و تاسەمەندی‌یەكی تابلێیت زۆر دەكەن بۆ ناسینی خاوەنی ڕاستەقینەی

خۆیان و، پەی بە پێویستیی لەرادەبەدەریان دەبەن بۆ هێزێك پاڵی پێوە بدەن و، کاتێ لە نێوان هەژاری و کۆڵەواری و ترسی دوارۆژدا دەتلێنەوە هانای بۆ لا ببەن و لە سایەیدا بحەوێنەوە..

بەڵێ، ئەو کەسەی بەدیهێنراوانی خۆی لەسەر ئەم سروشتە بەدیهێناوە، خوایەتی‌یەکەی ئەو داخوازی ئەوەیە کە: بە گوفتار و فەرمایشتی خۆیشی "بوون"ی خۆی بەوان ڕابگەیەنێت.

* * *

بەم چەشنە، گەشتیارەکە لەوە گەیشت کە هەموو بەڵگەکانی: سرووشی ئاسمانیی گشتی (الوحي السماوي العام) کە ئەم ڕاستی‌یانەی خوارەوەی تێدایە:

"ئاخاوتنی خواوەند لە ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤ"دا و.. "خۆپێناساندنی پەروەردگاری" و.. "ڕووبەڕوو بوونەوە و بەدەمەوە چوونی خواوەندی میهرەبان بە هانای بوونەوەرانی" و.. "گوفتاری خواوەند" و.. "ڕاگەیاندنی خواوەندی تاك و بێ وێنە"..

بەڵگەکانی ئەم سرووشەی کە ئەم ڕاستی‌یانەی تێدایە، بە یەکدەنگی بەڵگەیەکی یەکگرتووی یەکجار مەزنە لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی "واجب الوجود" و، لەم ڕووەوە شایەتی‌یەکی گەلێ بەهێزترە لەچاو شایەتیدانی "خۆر" لەسەر خۆی لە ڕۆژی ڕووناکدا!

* * *

پاشان ئەم گەشتیارە بۆ **"ئیلهامەکان"**ی ڕوانی، بینیی: ئیلهامە ڕاستەکان، هەرچەند لەو ڕووەوە کە گوفتاری خواوەندن لە "وەحی" دەچن، کەچی دوو جیاوازی‌یان لە نێواندا هەیە:

❑ **جیاوازیی یەکەم:**

زۆربەی "وەحی" - کە لە چاو ئیلهام گەلێ بەرزتر و پایەدارترە - بەهۆی مەلائیکەتەوە ڕادەگەیەنرێن، بەڵام زۆربەی ئیلهامەکان بە بێ بوونی "هۆکار" ئەنجام دەدرێن.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم جیاوازی‌یە، ئەم نموونەیەی خوارەوە دەهێنینەوە:

ئاشکرایە کە پادشا بە دوو جۆر دەدوێت و فەرمانەکانی دەردەکات:

یەکەم: بە ناوی دەوڵەت و مەزنی و فەرمانڕەوایی و دەستەڵاتداریی دەوڵەت بەسەر هەموانەوە. بۆ ئەم جۆرەیان، پادشا یەکێك دەنێرێت بۆ لای کەسێك لە کارمەندەکانی خۆی و، هەندێ جاریش لەگەڵیدا کۆدەبێتەوە و، ئنجا فەرمانەکانی خۆی پێ ڕادەگەیەنێت. بۆیە ئەم فەرمانەشی بەم جۆرە دەردەکات و ئەم گوفتارەشی لەسەر ئەم تەرز و شێوەیە دەردەخات، تاکو مەزنی و گرنگیی فەرمانڕەوایەتی‌یەکەی لەو فەرمانانەدا دەربکەوێت.

دووهەم: گوفتارێکە بە ناوی "کەسێتی"ی خۆیەوە، نەك بە ناوی پادشایەتی‌یەکەی و لەو ڕووەوە کە پادشا بێت. لەم جۆرەدا بە گوفتارێکی تایبەتی و، بەهۆی تەلەفۆنی تایبەتی و، لە کارێکی تایبەتیدا و بە مامەڵەیەکی تایبەتی، لەگەڵ خزمەتگوزارە تایبەتی‌یەکەی یان یەکێك لە تێکڕای میللەتەکەیدا دەدوێت .

گوفتاری پادشای ئەزەلیش بە هەمان شێوەیە؛ چونکە دوو جۆر گوفتاری هەیە: بە "وەحی" و بە "ئیلهامی گشتی". کە ئەم ئیلهامە کارەکانی "وەحی" دەخاتە ئەستۆی خۆی. خواوەند لەم جۆرە گوفتارەدا بە ناوی: "پەروەردگاری هەموو جیهانەکان" و، بە ناونیشانی: "بەدیهێنەری گەردوون"ەوە، دەدوێت.

هەروەها جۆرە گوفتارێکی تریشی هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی و، لە پشتی چەندین پەردەوە، لەگەڵ هەموو تاك و گشت یەکێکی زیندەوەراندا، هەر یەکەیان بە گوێرەی توانا و لێهاتنی خۆیان، چونکە خواوەند پەروەردگار و بەدیهێنەری یەك بە یەکیانە.

### ❑ جیاوازیی دووهەم:

"وەحی" ساف و بێ گەرد و بێ سێبەرە و، تایبەتە بە کەسانی تایبەتمەندەوە. بەڵام "ئیلهام" سێبەردارە و، تێکەڵ و ڕەنگاوڕەنگە و، گشتی‌یە و، چەندین شێوەی جۆراوجۆری لەیەك نەچووی هەیە، چەشنی ئیلهامی مەلائیکەت و ئیلهامی مرۆڤ و ئیلهامی زیندەوەرانی تر. ئنجا بەو هەموو جۆر و شێوە جیاواز و جۆراوجۆرانەی خۆی، مەودای فراوانی و زۆریی وتە پەروەردگاری‌یەکان دەردەخات، کە ژمارەیان گەلێ لە ژمارەی دڵۆپی دەریاکان زیاترە. لەمەوە گەشتیارەکە لە ڕوویەکی تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە گەیشت کە دەفەرموێ:

﴿قُلْ لَوْ كانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِكَلِماتِ رَبِّــي لَنَفِــدَ الْبَحْــرُ قَبْــلَ أَنْ تَنْفَــدَ كَلِمــاتُ رَبِّي﴾(الكهف:١٠٩).

پاشان سەیری چی‌یەتی(ماهیـة)ی ئیلـهامی کـرد، تـاکو لـە نهێنی‌یەکەی تێ‌بگـات و، شارەزای دانایی و شایەتیدانی ئەویش ببێت، بینیی: چییەتی و، دانایی و، ئەنجامی ئیلهام، لە چوار ڕووناکی پێکهاتووە:

**ڕووناکیی یەکەم:**

هەروەك خواوەند لە ڕێی کردارەکانیەوە کە پێیان دەوترێـت: "التـودد الإلهـی" خـۆی لـە لای بەدیـهێنراوانی خۆشەویسـت دەکـات، هـەروەها یـەکێك لــە داخوازی‌یـەکانی: "خۆشەویستی و میهرەبانی" ئەوەیە کە: بە گوفتار و، ئامادەبوون و، هـاودەمیی خۆیشـی، خۆی لە لای ئەو بەدیهێنراوانەی خۆشەویست بکات.

**ڕووناکیی دووهەم:**

هـەروەك خواوەنـد بـە کـردار دوعـای بـەندەکانی گـیرا دەکـات، ئـەوا گـیراکردنی دوعاکانی ئەوان بە فەرمایشتەکانیشی – لە پشتی چـەندین پـەردەوە – یەکێکـە لـە کـار و داخوازەکانی میهرەبانی و بەخشندەیی ئەو.

**ڕووناکیی سێهەم:**

هەروەك خواوەند بـە کـردار دەڕوات بـە هانـای ئـەو بەدیهێنراوانەیـەوە کـە گرفتـاری بـەڵای سـەخت و دووچـاری گـیرو گرفتی دژوار بـوون و، یارمـەتی‌یان دەدات و فریـای لاڵانەوە و پەناهێنانیان دەکەوێت. هەر بە هـەمان جۆریـش یـەکێك لـە پێداویستی‌یەکانی "پـەروەردگاریتی" ئـەوەیـە کـە هـاوڕاز و هـاودەمـی ئـەو بەندانـەی بێـت و، بێزاری‌یـان نـەهێڵێت و، بـە فەرمایشـتە ئیلهامی‌یـەکانی خـۆی – کـە جۆرێکـن لـە گوفتارەکـانی – پشتیان بگرێت و یارمەتی‌یان بدات.

**ڕووناکیی چوارەم:**

هەروەك خواوەند بە کردارەکانی وامان لـێ دەکات کە هەست بکـەین بـە "بـوون" و ئامادەیی خۆی و، پارێزگاریی بۆ خاوەن هەست و نەسـتانی نـاو بەدیـهێنراوانی، ئەوانـەی کە لە کۆڵەواری و لاوازی‌یەکی سەخت و هەژاری و ناچاری‌یەکی مەزندان و ئەوپەڕی موحتاج و تاسەمەندی ناسینی خاوەن و پارێزگار و کارسازی خۆیانن..

بە هەمان جۆر، میهرەبانیی خوایەتی و بەزەیی پەروەردگاری‌یانەی ئەو، داخوازی ئەوەن و بە پێویستیشی دادەنێن کە: "خوای گەورە" ئامادەیی و.. لەگەڵدابوون و.. "وجود"ی خۆی، لە ڕوویەکی تایبەتی‌یەوە، بۆ بەدیهێنراوێکی دیاری کراوی خۆی، بەپێی لێهاتنی ئەو بەدیهێنراوە و لە ڕێی بەشێك لە ئیلهامە ڕاستەکانەوە، بە قسەکردن لەگەڵ تەلەفۆنی دڵی ئەودا، بەو بەندەیەی خۆی ڕابگەیەنێت، بە چەشنێ کە ئەو بەندەیەی هەستی پێ بکات. ئەمەش وەك جۆرێك وایە لە فەرمایشت و گوفتارەکانی خوای گەورە.

ئنجا ئەم گەشتیارە سەیری شایەتیدانی "ئیلهام"ی کرد، بینیی کە ئەگەر وا دابنێین "خۆر" خاوەنی هەست و ژیان بێت و، گریمان حەوت ڕەنگەکانی ڕووناکیی خۆیشی بریتی بن لە حەوت دانە سیفەتی ئەو خۆرە، ئەوا "خۆر" بە تیشکەکانی و ئەو درەوشانەوانەی لە ڕووناکی‌یەکەیدان، خاوەنی جۆرە قسە و گوفتارێکی تایبەتی دەبێت. چونکە بوون و ڕەنگدانەوەی وێنەکەی لە هەموو شتێکی ڕوون و بریقەداردا، واتە: قسەکردنی خۆر لەگەڵ هەموو ئاوێنەیەکی وێنەدەرەوە و شتانی بریسکەدار و گشت شووشە و بلق و دڵۆپێکی دەریاکاندا، تەنانەت لەگەڵ گەردیلە بریسکەدارەکانیشدا – هەریەکەیان بەپێی توانا و لێهاتنی خۆیان – هەموو ئەمانە، شایەتێکی ڕاستن لەسەر بوونی "خۆر" و لەسەر ئەوەش کە هیچ کارێك لەو کارانەی ڕایاندەپەڕێنێت ڕێ لە کارێکی تر ناگرێت و هیچ گوفتارێکی ڕێ بە گوفتارێکی ئەو لێژ ناکات.

هەروەك ئەمە بە ڕوونی لە "خۆر"دا دەبینرێت، گوفتاری پادشای ئەزەل و ئەبەدیش وایە؛ کە خاوەنی شکۆمەندی و جوانی‌یە و، بەدیهێنەری سەرجەمی بوونەوەرانە و، نووری ئەزەلی و خۆری هەمیشەیی‌یە.. گوفتاری ئەو وەکو "زانست" و "توانست"ەکەی وایە؛ گشتی و گشتگیرە.

کەواتە مرۆڤ بە ڕوونی لەوە دەگات کە درەوشانەوەی گوفتاری ئەم خواوەندە گەلێ فراوانە و هەموو شتێك بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی گوفتاری ئەوی تێدا دەردەکەوێت، بێ ئەوەی هیچ پرسیارێك جێ بە پرسیارێکی تر لێژ بکات و، هیچ کارێك ڕێ لە کارێکی تر بگرێت و، قسەیەك لە گوفتارەکانی تێکەڵی یەکێکی تری ببێت.

ئەم گەشتیارە بە زانینێکی دڵنیایی‌بەخشی گەلێ نزیك لە "عین الیقین"ەوە، زانیی کە:

هەموو ئەو درەوشانەوەو.. گوفتار و.. ئیلهامانە – چ یەك بە یەك و چ هەموویان پێکەوە – بەڵگەن و بە یەکدەنگی شایەتی دەدەن لەسەر: "پێویستیی بوون" و "تاکی" و "تەنیایی" و "ئامادەبوون"ی ئەو ڕووناکی بەخشە ئەزەلی‌یە.

هەر بەم جۆرەش لە پلەی چواردەهەم و پازدەهەمی مەقامی یەکەمدا، ئاماژەیەکی کورت باس کراوە لە بارەی ئەو وانە و دەرسانەی کە ئەم گەشتیارە تاسەمەندە لە جیهانی پەنهانی "غەیب"ەوە وەری گرت:

(لا إله إلاّ الله الواجب الوجود الواحد الأحد الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته: إجماع جميع الوحيات الحقة المتضمنة: للتنزلات الإلهية، وللمكالمات السبحانية، وللتعرفات الربانية، وللمقابلات الرحمانية عند مناجاة عباده، وللإشعارات الصمدانية لوجوده لمخلوقاته.. وكذا دلّ على وجوب وجوده في وحدته: إتفاق الإلهامات الصادقة المتضمنة: للتوددات الإلهية، وللإجابات الرحمانية لدعوات مخلوقاته، وللإمدادات الربانية لإستغاثات عباده، وللإحسانات السبحانية لوجوده لمصنوعاته).

* * *

## ١٦

پاشان ئەو گەشتیارەی کە لە دنیادا خەریکی گەشتوگوزار بوو، بە "عەقڵ"ی خۆی وت:

مادەم من بە دوای بەدیهێنەر و خاوەنی خۆمدا دەگەڕێم و لەم پێناوەدا پرسیار لە بەدیهێنراوانی ناو گەردوون دەکەم، ئەوا باشتر وایە سەر لەو کەسە بدەم کە کامڵترین مرۆڤی ناو بوونەوەرە و مەزنترین کەسێکە بە شایەتیی دوژمنانیشی – چ جای دۆستانی – خەڵکی بەرەو چاکە دەبات و، بەناوبانگترین و ڕاستگۆترین و پلە بەرزترین و خاوەنی

رووناکـترین ژیری‌یە کە بریتی‌یـە لـەو محەممـەدە ئەمینـەی ﷺ کـە بـەهۆی ڕەوشـتە بەرزەکانی و قورئانەکەیەوە چوارده سەدەی ڕەبەقی ڕووناك کردەوە.. جـا لەبـەر ئـەوەی بە سەرلێدانی شاد بیم و لە بارەی ئەو شتانەی بە دوایاندا عـەودالم پرسیاری لـێ بکـەم، ئەوا دەبێ بە یەکەوە (واتە خۆی و عەقڵی) بڕۆین بۆ باشترین سەردەم و سەدە و کات، کە چەرخی بەختەوەری‌یە، چەرخی پێغەمبەرێتیی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ.

بەم جۆرە ئەو مرۆڤە گەشتیارە، بە "عەقڵ" ڕۆشتە ناو چـەرخی بەختەوەری‌یـەوە. کـە ڕۆشت، بینیی:

ئـەم چەرخـە بـەهۆی پێغەمبـەرەوە ﷺ بـە ڕاسـتی بـووە بـە چـەرخی بەختـەوەریی مرۆڤایەتی. چونکە بە بۆنەی ئەو نوورەی کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ هێنـابووی، لـە ماوەیـەکی کورتـدا نەتەوەیـەکی نوقـم بـووی نـاو نـەخوێندەواری و ڕەگداکوتـاوی نـاو ژیـانی "دەشتەکێتی"ی گۆڕی و، کردنی بە مامۆستا و سەرکردەی جیهان!

هەروەها ئەم گەشتیارە بە عەقڵی خۆی وت:

دەبێ پێش هەموو شتێك، سـەبارەت بـە مـەزنیی ئـەم زاتـە خـاوەن ئیعجـاز و پیرۆزەوە شتێك بزانین، ئەمەش لە ڕێی ڕاستگۆیی و حەق بوونی گوفتار و هەواڵدانەکانیەوە. ئنجا لە بارەی بەدیهێنەرمانەوە پرسیاری لـێ بکەین.

پاش ئەمە، ئەو گەشـتیارە دەسـتی بـە لێکۆڵینـەوە کـرد. لـە ئـەنجامدا ئـەوەندە بەڵگـەی سەبارەت بە ڕاستیی پێغەمبەرێتیی ئەو دەست کەوت کە لە ژمارە نەدەهاتن، بەڵام توانیـی (نۆ) دانەیان دەستنیشان بکات:

**یەکەم:**

ئەوەیە کە: هەرچی سیفەت و ڕەوشـتی بـەرز و جوانـە لـەم پێغەمبـەرەدا ﷺ هەیـە، بـە ڕادەیـەك کـە دوژمنانیشـی شـایەتی لەسـەر ئەمـە دەدەن. هـەروەها دەرکـەوتنی هـەزاران موعجیزە لەم پێغەمبەرەوە ﷺ وەك: لەت بوونی مانگ کە بە پەنجە بۆ ڕاکێشانی پێغەمبەر ﷺ بوو بە دوو کەرتەوە و لە دەقی قورئاندا بە: ﴿وانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ (القمر:١) بـاس کـراوە.. هەروەها وەك ئەوەی کە سوپایەکی تەواوی دوژمنانی، تەنها بەوەی کە مشتێك خاکی بە سـەر و چـاودا وەشـاندن، هـەموو یـەکێکی ئـەو دوژمنانـە لـەو گڵ و خاکـە ڕۆشـتە نـاو چاویانەوە، هـەروەك دەقی ئایەتی: ﴿وما رَمَيْتَ إِذْ رميتَ وَلَكِنَّ اللهَ رَمَـى﴾ (الأنفال:١٧)

باسی دەکات.. هەروەها وەك تیْراوبوونی هاوەڵەکانی لەو کانیاوەی کە وەك کەوسەر لە کاتی تینوێتیی سەختدا لە نیْوان هەر پێنج پەنجە پیرۆزەکانیەوە هەڵدەقوڵا و.. جگە لەمانەش سەدان موعجیزەی تر کە لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەدا ﷺ روویان داوە و، بە نەقلی صەحیح و بێ گومان، یان بە تەواتور پێمان گەیشتوون.

ئیتر ئەم گەشتیارە داوای لە "عەقڵ"ی خۆی کرد کە: بڕوات مەکتووبی نۆزدەهەم(موعجیزاتی ئەحمەدی) بخوێنێتەوە، کە پەیامێکی وەهایە خۆی لە خۆیدا کارێکی لەعادەت بەدەر و خاوەنی کەرامەتە و، زیاتر لە سێ سەد موعجیزەی لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بەڵگە بێ گومان و سەنەدە باوەڕ پێ کراوەکانیاندا لەخۆ گرتووە.

پاشان ئەم گەشتیارە لەبەر خۆیەوە بە خۆی وت:

کەسێك بەم ئەندازەیە ڕەوشتی جوان و بەم زۆرییەش موعجیزەی بیێت، بێ هیچ گومانێك ئەو کەسە خاوەنی ڕاسترین گوفتارە و، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ ئەو مرۆڤە لەو پلەیەی خۆی دابەزێت و، وەك خراپکاران دەست بە ساختە و درۆ و دەلەسە بکات.

**دووهەم:**

ئەوەیە کە: ئەو قورئانەی بە دەستیەوەیەتی، لە حەوت ڕووەوە خاوەنی ئیعجازە.. ئەو قورئانەی کە فەرمانێکە لە لایەن خاوەنی گەردوونەوە دەرچووە و، لە هەموو چەرخێکدا سێ سەد ملیۆن کەس باوەڕیان پێیەتی.

جا لەبەر ئەوەی وتەی بیست و پێنجەم، واتە: پەیامی (موعجیزاتی قورئانی) کە خۆری پەیامەکانی نوورە، بە چەندین بەڵگەی بەهێزی دامەزراو چەسپاندوویەتی کە بە چل ڕوو قورئانی پیرۆز خاوەنی ئیعجازە و فەرموودەی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.. لەبەر ئەوە، گەشتیارەکە ئەم کارەی بەو پەیامە ناوبراوە سپارد، چونکە ئەو پەیامە بە درێژی ئەو ئیعجازەی ڕوون کردووەتەوە.

پاشان وتی: ئەو کەسەی کە خواوەند بیکات بە ئەمیندار لەسەر وتەکانی خۆی و، ئەویش ئەم وتانەی خوای گەورە لە خۆیدا جێبەجێ بکات و بەم کارەش واتاکانی ڕوون بکاتەوە.. ئەو کەسەی کە خوای گەورە ئەرکی ڕاگەیاندنی ئەم قورئانە مەزنەی بە

هەموو خەڵکی پێ سپاردبێت، کە ئەمەش کارێکی تەواو حەق و ڕەوایە، هەرگیز مومکین نییە مرۆڤێکی وا درۆی لێ ببینرێت یان جێی گومان بێت.

**سێهەم:**

ئەوەیە کە: ئەم پێغەمبەرە ﷺ بە شەریعەتێکی پاك و ئایینێکی سروشتی و بەندایەتییەکی خاوێن و نزا و لاڵانەوەیەکی بەکوڵ و بانگەوازێکی گشتی و باوەڕێکی دامەزراوەوە ڕەوانە کراوە، کە هیچ شتێك نییە هاوچەشنی ئەوانە بێت کە ئەم هێناونی و، هەرگیز لەوانە باشتر نەبووە و نابێت..

چونکە ئەو شەریعەتەی کە ئەو نەخوێندەوارە ﷺ هێنای و پێنج یەکی مرۆڤایەتیی بە درێژایی چواردە سەدەی ڕەبەق لەسەر بناغەی حەق و دادگەری و بە یاسا پڕ لە وردەکاری و زۆرەکانی بەڕێوە برد، هەرگیز هاوتای نییە و ناشی بێت.

هەروەها ئەو "ئیسلام"ەی کە لە کردار و گوفتار و هەڵسوکەوتی ئەو کەسە نەخوێندەوارەوە دەرچووە، پێشەوا و جێی پرس و ڕای سێ سەد ملیۆن مرۆڤە لە هەموو چەرخێکدا و، مامۆستا و ڕابەری عەقڵ و، ڕووناککەرەوەی دڵ و، پەروەردەکار و پاکژکەرەوەی دەروون و، هۆی بەرزبوونەوەی ڕۆحیانە.. ئەم ئیسلامە، نە هاووێنەی بووە، نە هەرگیز دەیشی بێت.

هەروەها پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی بەسەر هەموو کەسێکدا لەو پەرستنانەی کە لە ئایینەکەیدا هەن و، تەقوا مەزنەکەی کە لە هەموو کەسێك زیاترە و، ترسانە زۆرەکەی لە خواوەند و، موجاهەدە بەردەوامەکەی و، چاودێرییە لەڕادەبەدەرەکەی بۆ وردترین نهێنییەکانی بەندایەتی، تەنانەت لە ناخۆشترین بارودۆخیشدا و، بەندایەتی کردنە بێ گەردەکەی هەر لە سەرەتاوە بە جوانترین شێوە، بێ ئەوەی لاسایی کەس بکاتەوە و، لە سەرەتا و کۆتاییدا هەر یەکتاپەرست بێت، بێ گومان هاوچەشنی بەندایەتیی وا نە تا ئێستا بینراوە و نە لەمەولاش دەبینرێت.

هەروەها بە دوعا و لاڵانەوەی "الجوشن الكبير" کە یەکێکە لەو هەزاران نزا و پاڕانەوانەی ئەو، وەسفی پەروەردگاری خۆی لە پلەیەکی عارفانەی وەهادا دەکات کە هیچ کام لە عارفان و ئەولیاکان لە خواناسیدا نەگەیشتوونەتە ئەو پلەیە و، هەر لە کۆنەوە تا ئێستا وەسفی کەسیان نەگەیشتووەتە ڕادە و پایەی ئەو وەسفەی کە ئەو هی خواوەندی دەکات. هەرچەندەش ئەوان دەیانتوانی یەك لە دوای یەك سوود لە بیری یەکتر و

پێشینانیان وەربگرن. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هیچ کەسێك نی‌یە لـە پاڕانـەوەدا وەکو ئـەو وابێـت. هەرکـەس سـەیری ئـەو ڕوونکردنـەوە کورتـەی بڕگەیـەکی نـەوەدونۆ بڕگەکەی موناجاتی "الجوشن الکبیر" بکات لە سەرەتای پـەیامی "موناجـات"دا، هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی کە بڵێت: هیچ نزا و پاڕانەوەیەك هاوچەشنی ئـەم دوعـا بـەرز و جوانە نی‌یە کە لە چڵەپۆپەی خواناسیدایە.

هەروەها لە گەیاندنی پێغەمبەرێتی‌یەکەی و ڕاگەیاندنی بانگەوازەکـەیدا بـە خـەڵکی، دامەزراوی و ئازایەتی‌یـەکی ئەوتۆی پیشانداوە کە هیـچ کەسێك - بـا بـە ئـەندازەی گەردیلەیـەکیش بووبێـت - لەمـەدا نزیکی نابێتـەوە و پێی‌ناگاتـەوە و لـەگـەڵیدا بـەراورد ناکرێت. هیچ جۆرە دوودڵی و دڵەتەپێ‌یەکیشی تووش نەبووە و هەرگیز تـرس نـەیتوانیوە زەفەری پێ ببات، خـۆ هـەرچـەندە دەوڵەتە گەورە و ئایینە مەزنەکانی ئەو دەمە و تەنانەت هۆز و مام و خزمانیشی ئەوپەڕی دوژمنایەتی‌یان لەگەڵدا دەکرد، کەچی ئەم هەر بە تەنها خۆی تەحەددای گشت دنیـای دەکـرد و، خـواوەندیـش پشـتی گـرت و سـەری خسـت و سەربەرزی کرد و، ئەویش سەری گێتیی بە تاجی ئیسلام ڕازانـدەوە.. کەواتـە کـێ هەیـە لە گەیاندنی ئەو ڕاسپاردانەی خوای گەورەدا وەك محەممەد ﷺ وا بێت؟!

هەروەها ئەم پێغەمبەرە ﷺ ئیمانێکی توندوتۆڵی مەحکەم و، یەقینێکی دامەزراوی لـە عادەت‌بـەدەر و، دەرخسـتنی حەقیقـەتی سروشـتی مرۆڤـی بـــە جۆرێکـــی دەراســـا و، بیروباوەڕی بەرزی ئەوتۆی لەگەڵ خۆیدا هێناوە کـە نـە بیروبـاوەڕ و نـە دانـایی دانایـان و سەرگەورە ڕۆحی‌یەکانی ئەو سەردەمە، نـەیانتوانی هیـچ گومـانێك یـان دوودڵی‌یـەك یـان لاوازی‌یەك یان تەنانەت وەسوەسەیەکیش لە دڵی ئەودا دروست بکەن!

بەڵێ، هەموو ئەوانە نەیانتوانی هیچ کارێك بکەنە سەر هیچ شتێکی ئەو، چ یەقینی، چ بیروباوەڕی، چ پشت بەخوا بەستنی، چ ئـەو دڵنیایی‌یـەی کـە بـە خـوای گـەورە هـەیبوو، هەرچەندەش گشت ئەو بیروباوەڕ و دانایی‌یانەی باس کران، هـەموویان دژ و پێچەوانـەی ئەو بوون و دوژمنایەتی‌یان لەگەڵدا دەکردا!

جگە لەمەش، سـەرجەمی ئـەولیا و پیاوچـاکان کـە لـە پلـە و پایـە مەعنەوی‌یـەکاندا بەرزبوونەتەوە، لە پێشـەکیی هەموویانەوە: هاوەڵـە بـەڕێزەکانی پێغەمبـەر ﷺ هـەموویان بـەهۆی ئیلـهام و دەرس وەرگرتـن لـە پێغەمبـەر ﷺ و سـوود وەرگرتنیـان لـە پلـــەی

ئیمانەکەی و بەوەی کە پێغەمبەریان ﷺ لە بەرزترین پلەدا دیوە، بەرز بوونەوە و گەیشتن بەو پلە بڵندانە..

هەموو ئەمانە، بە جۆرێکی ئاشکرای بەڵگەنەویست، دەری دەخەن کە ئیمانی ئەم پێغەمبەرە ﷺ ئیمانێکە هەرگیز هاوتا و هاووێنەی نی‌یە.

ئیتر گەشتیارەکە تێگەیشت و تەسدیقی عەقڵی خۆی کرد، کە: کەسێك خاوەنی شەریعەتێکی ئاوا بێ وێنە و، ئیسلامێکی پاکی بێ هاوتا و، بەندایەتی‌یەکی خاوێنی بێ گەرد و، پاڕانەوەیەکی جوانی ناوازە و، دەعوایەکی گشتیی گەردوونی و، ئیمانێکی دەراسای بەم چەشنە بێت، هەرگیزاو هەرگیز جێی درۆی لانابێتەوە و خەڵکیش ناخەڵەتێنێت.

**بەڵگەی چوارەم:**

یەکدەنگیی هەموو پێغەمبەران، درووودیان لەسەر بێت و، یەکگرتنیان لەسەر ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ هێناونی، بەڵگەیەکی بێ گومانە لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی گەورە، هەروەها شایەتی‌یەکی ڕاستیشە لەسەر ڕاستی و پێغەمبەرێتیی ئەم پێغەمبەرە ﷺ. چونکە هەر شتێك ببێت بە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرانی تر و لە خولگەی پێغەمبەرێتیی ئەواندا بخولێتەوە، وەك سیفاتی بەرز و پیرۆز و موعجیزاتیان و ئەو کارانەی ئەنجامیان داون، کتومت وەك ئەوانە و لەوانەش تەواوتر لەم پێغەمبەرەدا ﷺ هەیە، هەروەك مێژوو تەسدیقی ئەمە دەکات..

چونکە ئەو پێغەمبەرانە - درووودیان لەسەر بێت - بە زمانی تەورات و ئینجیل و زەبوور و ئەو "صوحوفانەی" لە بەردەستیاندا بوون، هەواڵ و مزگێنیی هاتنی ئەم زاتە پیرۆزەیان بە خەڵکی داوە (تەنانەت بیست ئاماژەی ڕوون و ئاشکرا زیاترمان ڕوون کردووەتەوە کە لەو کتێبە پیرۆزانەدا هەن و، لە پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی"دا تۆمارمان کردوون). جا هەروەك ئەوان مزگێنیی هاتنی ئەمیان بە خەڵکی داوە، بە زمانی حاڵیشیان - واتە زمانی پێغەمبەرێتی و موعجیزاتیان - تێکڕا تەسدیقی دەکەن و مۆری پشتگیری لەسەر ڕاستیی بانگەوازەکەی دەدەن. چونکە هەر ئەو پێغەمبەرەیە کە لە بانگەوازەکەیدا بۆ لای خواوەند، پێش هەموو پێغەمبەرانی تر کەوتووەتەوە.

لەمەوە گەشتیارەکە تێ گەیشت کە ئەو پێغەمبەرانە - درووودیان لەسەر بێت - هەروەك بە زمانی گوفتار و یەکدەنگی‌یان دەبن بە بەڵگە لەسەر "یەکتایی" خواوەند، بە

هەمان جۆر، بە زمانی حاڵیشیان و یەکگرتنیان شایەتی لەسەر ڕاستی و ڕاستگۆیی ئەم پێغەمبەرە ﷺ دەدەن.

**بەڵگەی پێنجەم:**

گەیشتنی هەزاران ئەولیا بە "حەق" و سەرچاوەی "حەقیقەت".. هەروەها ئەو کەمالات و کەرامەت و کەشف و موشاهەدانەش پێیان بەهرەمەند بوون، تەنها بەهۆی شوێنکەوتنی دەستوورەکان و، پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ و، شوێن پێ هەڵگرتنیەوە هەموو ئەمانەیان دەست کەوتووە..

جا هەروەك هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر "یەکتایی" خواوەند، بە یەکدەنگی و یەکگرتنیشیان شایەتن لەسەر ڕاستیی مامۆستا و پێشەواکەیان، کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەیە ﷺ و، لەسەر ئەوەش کە پێغەمبەرێتی‌یەکەی لەوپەڕی حەق و ڕاستیدایە.

جا گەشتیارەکە لەمەوە تێگەیشت کە ئەم پیاوچاکانە بە "نووری ویلایەت" هەندێکیان لەو شتە غەیبی‌یانە دیوە کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیانەوە دواوە و هەواڵیانی ڕاگەیاندووە، بە نووری ئیمانیش هەموو هەواڵدانەکانی ئەویان دیوە و باوەڕیان پێ هێناوە و، چ بە "علم الیقین" و چ "عین الیقین" و چ "حق الیقین" تەسدیقیان کردووە. ئەمەش وەك خۆری ڕووناك دەری دەخات کە: تا چەندە ئەم پێشەوا و ڕابەرە گەورە و مەزنەیان ڕاستگۆیە و، تا چەندەش لەسەر حەقە.

**بەڵگەی شەشەم:**

ملیۆنان زانای هەڵبژاردەی وردەکار و صیددیقانی لێکۆڵەر و دانایانی بلیمەتی ئیماندار، لەوانەی کە بە بەرزترین پلە گەیشتوون، تەنها بەهۆی ئەوەی کە قوتابێتیی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەیان ﷺ کردووە و وانەی حەقیقەتە بەرز و پیرۆزەکانیان لە لا خوێندووە و، لەمەشەوە چەندین زانستی بەرزیان بەدەست هێناوە و، چەندین پلەیان لە خواناسیدا بۆ دەرکەوتووە..

گشت ئەو مرۆڤانە، هەروەك هەموویان بناغەی بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ (کە یەکتاپەرستیی خواوەندە) دەچەسپێنن و بە بەڵگە بێ گومانەکانیشیان و بە یەکدەنگی تەسدیقی دەکەن.. هەر بەو جۆرەش هەموویان یەك دەگرن و، لەسەر ڕاستی و ڕاستگۆیی ئەم مامۆستا مەزنە و لەسەر ئەوەی کە سەرجەم فەرموودەکانی حەق و ڕاستن، شایەتی دەدەن.

جا ئەم شایەتیدانەی ئەوان، وەك ڕۆژی ڕووناك، بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر ڕاستگۆیی ئەم زاتە و ڕاستیی پەیامەكەی. بۆ نموونە: "پەیامەكانی نوور" بە هەموو بەشەكانیەوە كە لە سەد تێدەپەڕن، تەنها یەك بەڵگەن لەسەر ڕاستی و دروستیی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ!

**بەڵگەی حەوتەم:**

ئەو كۆمەڵە مەزنەی كە پێیان دەوترێت: "ئال و ئەسحاب" و، سەبارەت بە فیراسەت و زانست و كەمالاتەوە لە دوای پێغەمبەران – دروودیان لەسەر بێت – بەناوبانگترین مرۆڤن و لە هەموو كەسێك وریاترن و لە پلە و پایە و كەمالاتیشدا پلەیان بەرزترە و، بەناوبانگتر و وردبینترن و لە هەموو كەسێكیش زیاتر دەستیان بە ئایینەوە گرتووە..

جا كە ئەم كۆمەڵە مەزنە بەوپەڕی تاسە و شەوق و لێبڕان و وردەكاری‌یەوە بە شوێن هەموو حاڵەت و بیر و هەڵسوكەوتێكی ئاشكرا و پەنهانی پێغەمبەردا ﷺ بە وردی گەڕاون و، ئنجا بە یەكدەنگی و یەكگرتن تەسدیقی ئەوەیان كردووە كە پێغەمبەر ﷺ لە قسە و گوفتارەكانیدا لە گشت كەسێكی ئەم دنیایە ڕاستگۆترە و، لە هەموویان پلەی بەرزترە و، لە هەموو شیان زیاتر و توندتر دەستی بە حەق و حەقیقەتەوە گرتووە.. جا ئەم تەسدیقەی ئەوان كە هێندە دامەزراوە هەرگیز لە جێگای خۆیدا نابزوێت، لەگەڵ ئەو ئیمانە قووڵەش كە هەیانە، بەڵگەیەكی گەلێ ڕوونە و وەك ئەوە وایە كە ڕۆژی ڕووناك دەبێت بە بەڵگە لەسەر ڕووناكیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان.

**بەڵگەی هەشتەم:**

هەروەك ئەم گەردوونە بەڵگەیە لەسەر ئەو بەدیهێنەر و نووسەر و وێنەكێشەی كە دروستی كردووە و بەڕێوەی دەبات و كاری دەسازێنێت و، بە وێنەكێشان و ئەندازەدانان و ڕێكخستن دەستكاریی دەكات، وەك بڵێی گەردوون كۆشكێكی ڕەنگین، یان پەڕاوێكی گەورە، یان پیشانگایەكی جوانی ناوازە، یان جێگای دەرخستن و ناوبانگ پێ دەركردن بێت بۆ ئەو شتانەی كە تیایدایە..

هەروەك ئەم گەردوونەی كە بەم جۆرەیە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری خۆی.. بە هەمان جۆر و بە چەشنێكی بێ گومان، داخوازی ئەوەش دەبێت كە یەكێك بێت ئەو واتایانە دەرببڕێت كە لەم كتێبە گەورەیەی گەردووندان و، ئامانجەكانی خواوەندیش لە

بەدیهێنانی گەردووندا بزانێت و بەخەڵکیشیان بڵێت و، ئەو دانستە پەروەردگاری‌یانەش کە لە ئاڵوگۆڕی گەردووندان و ئەنجامی فەرمانبەری و هەڵسوکەوتەکانی گەردوونن، بە دەرس بیانڵێتەوە و، نرخ و بایەخ و کەماڵاتی ئەو شتانەش لە گەردووندا ئاشکرا بکات. واتە داخوازی ئەوە دەبێت کە بانگەوازکارێکی مەزن و ڕاستگۆ و مامۆستایەکی لێکۆڵەر و کارامە، بۆ ئەم کارانە ببێت.

گەشتیارەکە لەم وانەیەوە تێگەیشت لەوەی کە گەردوون بەڵگە و شایەتە لەسەر ڕاستی و دروستیی ئەم پێغەمبەرە ئەمینەی کە بەڕێزترین و بەرزترین کەسە ئەم فەرمانبەری و ئەرکانەی بە تەواوی ئەنجام دابێت و، بەڵگەیە لەسەر ئەوەش کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەڕێزترین و ڕاستگۆترین نێرراوی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

**بەڵگەی نۆهەم:**

مادەم لە پشت پەردەوە یەکێك هەیە کەماڵی بێ وێنە و وردەکاریی سنعەتی خۆی لە ڕێی ئەم بەدیهێنراوە پڕ لە وردەکاری و دانایی‌یانەوە ئاشکرا دەکات و..

بەو بەدیهێنراوە لەژمارەبەدەر و ڕازاوە و ناسکۆڵە و جوانانەش، خۆی بە غەیری خۆی دەناسێنێت و خۆشەویستی دەکات لە لایان..

بەو نیعمەتە بەنرخ و خۆش و لە ژمارەبەدەرانەش کە بەخشیونی، سوپاس و شوکرانە لەسەر ئەو بەدیهێنراوانەی خۆی پێویست دەکات و..

بەدیهێنراوانی دەخاتە تاسە و شەوقەوە و هانیان دەدات کە لە بەرامبەر پەروەردگارێتیی ئەودا پەرستشێکی ئەوتۆ ئەنجام بدەن کە پڕ بێت لە خۆشەویستی و سوپاس و شوکرانەبژێری بۆ ئەم پەروەردگاری و ژیاندنە گشتی‌یەی خواوەند کە بەدیهێنراوانی خۆی پێ پەروەردە دەکات و، بە جۆرێکی پڕ لە شەفەقەت و چاودێری دەیانژیێنێت (بە ڕادەیەك کە خۆراك و میوانداریی پەروەردگاری‌یانەی وا ئامادە و ساز دەکات کە پێویستی‌یەکانی وردترین هەستی چەشتنی ناودەمەکان و هەموو جۆرە ئیشتیهاکان دابین دەکات) و..

داوا لە بەدیهێنراوانیشی دەکات کە باوەڕ و تەسلیم بوون و ملکەچی و گوێ ڕایەڵی‌یان لە بەرامبەر ئەو خوایەتی‌یەی خواوەندەوە ببێت کە بە گۆڕینی وەرزەکان و، شەو بە دوای ڕۆژدا هێنان و، جیاوازی‌یان و، هاوچەشنی ئەم کاروبارە مەزن و هەڵسوکەوتە گەورە و کردارە پەروەردگاری‌یە سەرسووڕهێنەر و پڕ لە دانایی‌یانەوە، ئەو

خوایەتی‌یەی خۆی پیشـانی ئـەوان دەدات و، دادگـەری و حـەقڕەویی خۆیشـی بـەوە دەردەخـات کە هەمیشـە پـەنای چـاکە خـوازان دەدات و، خـراپە و خراپـکاران لـەناو دەبات و، بە بەڵا و گیرو گرفتە ئاسمانی‌یەکانیش ستەمکاران و ئەوانەی پێغەمبەران بـە درۆ دەخەنەوە، لەناو دەبات.

کەواتە بێ هیچ گومـانێك، خۆشەویستترین بەدیهێنراو و ڕاستگۆترین بەندە لـە لای ئەو خواوەندەی کە پەردەی غەیبی بەسەر خۆیدا داداوەتەوە، ئەو کەسەیە کە بە جۆرێکی پاك و بێ گەرد و خاوێن بۆ ئەو ئامانج و مەبەستە باسکراوانەی خواوەنـد کـار بکـات و، نهێنیی هەرە گـەورەی بەدیهێنان لـە گـەردووندا بدۆزێتـەوە و ئـەو مەتەڵـە حـەل بکـات و گرێ کوێرەکـەی بکاتـەوە و دەری بخـات و، هەمیشـە بـە نـاوی بەدیهێنەرەکەیـەوە تێ‌بکۆشـێت و، لـە هەمـوو شـتێکدا داوای هـێز ویارمـەتی لـەو بکـات و، بـەم جـۆرە یـارمـەتی و سەرکەوتنی لەوەوە دەست کەوتبێت..

جا دەبێ ئەو کەسە کێ بێت جگە لە حەزرەتی محەممەد ﷺ؟

پاشان ئەم گەشتیارە بە "عەقڵ"ی خۆی وت:

مادەم ئەم (نۆ) حەقیقەتە شایەتی ئیسپاتن لەسەر ڕاستیی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ، ئـەوا هیچ گومانێك لەوەدا نی‌یە کە پێغەمبەر ﷺ تەوەرەی ڕێزی مرۆڤایەتی و، مایەی شانازیی جیهانە و، ئەوپـەڕی شایانی ئەوەیـە کـە نـاوی: "مایـەی شـەرەفی ئـادەمیزاد" و نازنـاوی: "جێی شانازیی هەموو جیهان"ی لـێ بنرێت. ئەو فەرمانەی خواوەندی میهرەبانیش کە لە دەستیدایە، بریتی‌یە لـەو قورئانـە پیرۆزەی کـە بـاڵی شـکۆمەندی و دەسـتەڵاتی مەعنەویی خۆی بەسەر نیوەی گۆی زەویدا ڕاکێشاوە. ئنجا کەماڵاتی کەسی و ڕەوشتە بەرزەکانی خۆیشـی، لەگـەڵ ئـەو قورئانـەدا، دەری دەخـەن کـە مـەزنترین مـرۆڤ لـــە جیـهاندا ئـــەم پێغەمبـــەرە مەزنەیـــە ﷺ. کەواتـــە وتـــە و گوفتـــاری حـــەقی بـــاوەڕ پـــێ کراو لـــە بـــارەی بەدیهێنەرمانەوە، تەنها وتە و گوفتاری ئەوە!

دەسا ئـەی عەقڵەکـەم! وەرە سـەرنج بـدە لـەوەی کـە بناغـەی هـەموو دەعواکـانی ئـەم پێغەمبـەرە مەزنـە ﷺ و ئامـانجی سـەرەکیی هـەموو ژیـانی بریتی‌یە لـە: شـایەتیدان لەسـەر "بـوون" و "یـەکتایی" خـواوەنـد و، ڕوونکردنـەوە و دەرخسـتنی "سـیفەتە مـەزن" و "نـاوە جوانـەکان"ی بەدیهێنـەرمان. ئـەوەتا هـــەموو ئەمانـەی چەســـپاندووە و ئاشـــکرای کـــردوون و، لەمەشدا پشتی بەو هـەزاران ڕاستی‌یە ڕەگداکوتـاوە دامەزراوانە بەستووە

کە لە ئایینەکەیدان و، هێزی ئەو سەدان موعجیزە ڕوون و ئاشکرایانەش کە خواوەند لەسەر دەستی ئەو دەری خستوون.

واتە: ئەو خۆرە مەعنەوی‌یەی کە ئەم گەردوونـەی ڕوونـاك کردووەتەوە و، بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی بەدیهێنەرمانە، تەنها ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەیە ﷺ کە نازناوی: "خۆشەویستی خوا"ی خەڵات کراوە. چونکە سێ جۆر یەکدەنگیی گەورەی ئەوتۆ هەن کە هەرگیز پشتگوێ ناخرێن و خۆیشیان شت پشتگوێ ناخەن، پشتی ئەم شایەتیدانە دەگرن و تەسدیقی دەکەن:

***یەکدەنگیی یەکەم:***

یەکدەنگیی ئەوانەیە کە لە جیهاندا بە ناوی "ئالـی بـەیتی محەممەد ﷺ" ناسراون و ناوبانگیان دەرکردووە. ئەو کۆمەڵە نوورانی‌یەی کە پێشەواکەیان ئەو ئیمامی عەلی‌یە بەڕێزەیە کە دەفەرموێ: "ئەگەر پەردە لە ڕووی پەنهاندا هەڵبدرێتەوە، یەقینم هەروەك خۆی دەمێنێتەوە" و.. لە دوای خۆیشـی هەزاران ئەولیای گەورەی خاوەن بەسـیرەتی تیژ و پەنهان بینیان تێدا هەڵکەوتووە، لە پیاوانی وەك شێخی گەیلانی (قُدِّسَ سِـرُّهُ) کە هێشتا لەسەر زەوی و لە ژیاندا بووە بە چاوی تیژی بەسیرەتی خۆی سەیری عەرشی مەزن و حەزرەتی ئیسرافیلی، بەو گەورەیی‌یە، کردووە!

***یەکدەنگیی دووهەم:***

بریتی‌یە لە یەکدەنگیی ئەو کۆمەڵەی کە بە "هاوەڵـە بـەڕێزەکانی پێغەمبـەر ﷺ" بەناوبانگ و ناسراون، کـە بـە یـەکگرتنیان و ئیمانـە دامەزراوەکـەیان تەسـدیقی ئـەم پێغەمبەرە مەزنـە ﷺ دەکەن. ئەم تەسـدیقەشیان لـە ڕادەیەکی وادا بـوو کە گەیاندنیە ئەوەی گیان و سامان و باوك و تیرە و هۆزیان لە پێناوی ئەودا بەخت بکەن. ئەوانەی کـە پێش پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێکی دەشتەکیی ناو جێگایەکی دوور لە خوێندەواری و بێ بەش لە هەموو ڕواڵەتێکی ژیانی کۆمەڵایەتی و بیری سیاسـی بوون و، خاوەنی هیـچ پەڕاو و ڕێبـازێکی ڕوون نـەبوون و، لـە تاریکستانی چەرخی "فـەترەت"دا ون بووبـوون و هـەر ناویـان نـەدەهێنرا، کـەچی لـە پاش موسڵمان بوونیـان و لـە ماوەیـەکی کـەمدا بـوون بـە مامۆسـتا و ڕابـەر و سیاسـی و کاربەدەسـتی دادوەری ئـەو نەتەوانـەی کـە لـە بـاری شارستانێتی و بـواری زانسـتی و ژیـانی کۆمەڵایـەتی و ڕامیاری‌یـەوە پێشـکەوتووترین

نەتەوەی ئەو کاتەی سەرزەوی بوون. بەم جۆرە فەرمانڕەوایی خۆرهەڵات و خۆرئاوایـان گرتە دەست و، ئاڵای دادگەری‌یان لە دەریا و وشکایی جیهاندا دەشەکایەوە.

***یەکدەنگیی سێ‌هەم:***

بریتی‌یە لە تەسدیقی ئەو کۆمەڵە مەزنەی کە لە زانایانی بەڕێز و لەژمارەبەدەری ئـەوتۆ پێکهاتوون کە لە زانستەکانیاندا وەك دەریا وان و تـابلێی لێکۆڵـەر و وردەکـار بـوون و، لـەناو نەتـەوەی ئـەم پێغەمبـەرەدا ﷺ هەڵکـەوتوون و گەشـەیان کـردووە و، لـە هـەموو چەرخێکدا هێندە مرۆڤی کامڵ و کارامە و لێهاتوویان هەیە کە لە گشـت زانیاری‌یـەکدا پێش هەموو کەسێك کەوتوونەتەوە.

جا تەسدیقی هەموو ئەو زانایانـە، پێکـەوە و بـە پلـەی "علـم الیقـین" - لـە ڕاستیدا - یەکدەنگی‌یەکە لە وێنەی نی‌یە.

لەمانـەوە گەشتیارەکە بڕیـاری دا کـە: شـایەتیدانی ئـەم پێغەمبـەرە نـەخوێندەوارە ﷺ لەسـەر "یـەکتایی خـواوەنـد" شـایەتیدانێکی جوزئـی و تاکـە کەسـی نی‌یـە، بـەڵکو شایەتیدانێکی هەمـەکی و گشـتیی ئەوتۆیـە کـە هێنـدە مەحکـەم و دامـەزراوە هـەرگیز لـە جێی خۆی نەبزوێت و، گەر سەرجەم شەیتانەکانیش لـە هـەموو لایەکـەوە لێـی کۆببنـەوە ناتوانن خۆیان لە بەرامبەریەوە ڕابگرن.

هـەر بـەم جـۆرەش لـە پلـەی شـازدەهەمی مـەقامی یەکـەمدا، ئاماژەیـەکی کـورت بـۆ ئـەم ڕاستی‌یە کراوە کە ئەو گەشتیارە لە گەشتە عەقلی‌یەکـەیدا بـە نـاو لایەنـەکانی ژیـان لـەو قوتابخانە نوورانی‌یەی چەرخی بەختەوەریدا دەستی کەوت. ئەو ئاماژەیەش بەم جۆرەیە:

(لا إله إلاّ الله الواجبُ الوجودُ الواحدُ الأحدُ الـــذي دلَّ على وجوبِ وجودِه في وحدتِه: فخرُ عالمٍ، وشرفُ نوعِ بني آدمَ، بعظمةِ سلطنةِ قرآنِه، وحشمةِ وسعةِ دينـــــهِ، وكـــثرةِ كمالاتِه، وعلويّةِ أخلاقِه، حتى بتصديقِ أعدائِه، وكذا شَـــهِدَ وبَرْهَنَ بقوةِ مئآتِ المعجزاتِ الظاهراتِ الباهراتِ الْمُصَدَّقَـــةِ وبقوةِ آلافِ حقائقِ دينِهِ الساطعةِ القاطعةِ، بإجماعِ آلِـهِ ذوي الأنوارِ، وباتفاقِ أصحابِهِ ذوي الأبصارِ. وبتوافُقِ محققي أُمَّتِـهِ ذوي البراهينِ والبصائرِ النّوارة).

## ١٧

ئەم گەشتیارەی کە تێر نابێت و ماندووبوون کاری تێناکـات، زانیـی: ئامانجی ژیـانی ئەم دنیایە و ژیانی "ژیان" تەنها لە ئیماندایە، بۆیە لەگەڵ "دڵ"ی خۆیدا دوا و، وتی:

گوفتاری ئەو کەسەی کە لێی دەگەڕێین، بەناوبانگترین و ڕاست و داناترین گوفتاری ناو ئەم "بوون"ەیە و، لە هەموو چەرخ و سەردەمێکدا تەحەددای گشت ئەوانەی کردووە کە ملی بۆ کەچ ناکەن. کەواتە با لـە پێشـدا سـەر لـەو قورئانە پیرۆزە خـاوەن ڕەوانی‌یـە ئیعجازبەخشـە بدەیـن و بزانیـن چـی دەڵێـت ؟ بـەڵام پێـش ئـەوەی بچینـە نـاو ئـەم جیهانـە جوانەوە، با هەندێك بووەستین و ئەوەندە لەم کتێبە بکۆڵینەوە کە دڵنیامان بکات لـەوەی کتێبی بەدیهێنەری ئێمەیە.

بەم جۆرە، دەستی کرد بە وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە.

جـا لەبـەر ئـەوەی ئـەم گەشـتیارە لـە هاوچەرخەکانمانـە، ئـەوا لـە پێشـدا سـەیری "پەیامەکانی نـوور"ی کـرد، کـە چـەند بریسـکانەوەیەکی ئیعجـازی مەعنـەویی قورئـانی پیرۆزن.. بینیی:

ئەم پەیامانەی کە دەگەنە سەد و سی دانـە، بۆخۆیـان تەفسـیرێکی بـەنرخی ئایەتـەکانی قورئـانن، چونکـە پـەردە لـە ڕووی سـەرنجە وردەکـان و ڕووناکی‌یـە ڕەنگینـەکانی ئـەو ئایەتانەی قورئان لادەدەن و ئاشکرایان دەکەن.

خۆ هەرچەندەش "پەیامەکانی نوور" لەم سەردەمە موڵحیدە سەرسەختەدا، بە جیـهاد و تێکۆشانێکی بەردەوام، ڕاستی‌یەکانی قورئانیـان بـە هـەموو لایـەکدا بـڵاو کردووەتـەوە، کەچی هیچ کەسێك نەیتوانیوە ڕەخنەیان لێ بگرێت یـان ڕووبـەڕوویان ببێتـەوە، ئەمـەش ئەوە دەچەسپێنێت کە قورئانی پیرۆز - کە پێشەوا و ڕابەر و سەرچاوە و خۆری ڕووناکی بەخشـی ئـەو پەیامانەیـە - ئاسمانی‌یـە و، گوفتـاری خواوەنـدی پـەروەردگاری هـەموو جیهـانەکانە و، هەرگیز گـوفتـاری ئادەمیزاد نی‌یە، بە ڕادەیـەك کـە "وتـەی بیسـت و پێنجەم" و کۆتـایی "مـەکتووبی نۆزدەهـەم" کـە هـەردووکیان تەنـها یـەك بەڵگـەی نێـوان سـەدان بەڵگـەن لەوانـەی کـە پەیامەکانی نـوور بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئیعجـازی قورئـان هێنـاونی، بـە چـل شـێوە و ڕووی جۆراوجـۆر ئیعجـازی قورئانیـان چەسـپاندووە، بـە چەشنێك هەموو ئەو کەسانەیان خستووەتە سەرسووڕمانەوە کە خوێندوویانەتەوە و لێیان کۆڵیونەتەوە، پاشان ڕێز و سەرسووڕمانی خۆیان بەرامبەر بەو پەیامانە دەربڕیوە، چ جای ئەوەی کە ڕەخنەیان ئاراستە بکەن یان بەرەنگاریان ببنـەوە، بـەڵکو هـەموویان - تێکـڕا - ستایشیان کردوون.

جا چەسپاندنی ڕووی ئیعجازی قورئان و، خستنەڕووی ئەو لایەنەی کە دەری دەخات قورئان فەرمایشت و گوفتاری خواوەندە، گەشتیارەکە ئەمەی بە پەیامەکانی نووری سپارد، بەڵام بە وردی سەرنجی لە چەند خاڵێك دا کە بە ئاماژەیەکی کورت مەزنی **قورئانی پیرۆز** دەردەخەن:

**● خاڵی یەکەم:**

هەروەك قورئانی پیرۆز، بە هەموو موعجیزات و ڕاستی‌یەکانی خۆی، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی لە هەموو شتێکی تر حەقترن، موعجیزەی حەزرەتی محەممەدە ﷺ، بە هەمان جۆر حەزرەتی محەممەدیش ﷺ بە هەموو موعجیزەکانی و بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی و کەماڵاتی زانیاریی خۆی، موعجیزەی قورئانی پیرۆزە و، بەڵگەیەکی گومان بڕە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز گوفتاری خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

**● خاڵی دووەم:**

قورئانی پیرۆز گۆڕانکاری‌یەکی گەلێ مەزنی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هێنایە گۆڕێ و، ڕووناکیی بە هەموو ئاسۆکانی گەردووندا پەخشاند و پڕی کردن لە بەختەوەری و ڕاستی‌یە مەزنەکانی لەسەر نەخشاندن و، ئاڵوگۆڕێکی یەکجار گەورەی ئەنجام دا چ لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا چ لە گیان و ژیری‌یاندا چ لە ژیانی: کەسی و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری‌یاندا. ئنجا ئەم گۆڕان و ئاڵوگۆڕەشی بە بەردەوامی هێشتەوە و بەڕێوەی برد، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ئایەتەکانی ئەم قورئانە (کە دەگەنە شەش هەزار و شەش سەد و شەست و شەش ئایەت) وا چواردە سەدەی ڕەبەقە لە هەموو چرکەیەکدا بە لای کەمەوە لەسەر زاری زیاتر لە سەد ملیۆن کەس، بەوپەڕی ڕێز و شکۆداری‌یەوە دەخوێندرێنەوە و، لەو کاتەشەوە ئەم قورئانە خەڵکان پەروەردە و "دەروونەکان"یشیان پاکژ دەکات و، "دڵانیان" دەپاڵێوێت و، ڕوونی و پلەبەرزی بە "گیانیان" و، ڕاستەشەقام و ڕووناکیش بە "ژیری‌یان" و ژین و بەختەوەریش بە "ژیانیان" دەبەخشێت.. بێ هیچ گومانێك، ئەم کتێبە هیچ هاووێنە و هاوتا و هاوشانێکی نی‌یە. کەواتە موعجیزە و دەراسایە.

**● خاڵی سێ‌هەم:**

قورئانی پیرۆز هەر لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا ڕەوانبێژی‌یەکی وای پیشان داوە کە لە وێنەی نی‌یە. بە ڕادەیەك کە نرخی "موعەللەقاتی سەبعە"ی بەناوبانگی ئەوانی داگرتە خوار کە چەند پارچە شیعرێکی کەلە شاعیرە هەرە ڕەوانگۆکانیان بوون و بە زێڕ

نوسرابوون و به دیواری که‌عبه‌دا هه‌ڵواسرابوون، به ئه‌ندازه‌یه‌کی ئه‌وتۆ له شان و شکۆ و نرخ و به‌های داشکاندن که دوای هاتنی قورئان، کچه‌که‌ی "له‌بید" پارچه شیعره‌که‌ی باوکی له ڕووی دیواری که‌عبه داگرت و، وتی:

(مادەم ئەم ئایەتانە هاتن ، ئیتر جێی تۆ لێرەدا نەماوە)!

هه‌روه‌ها کاتێك ئه‌دیبێکی ده‌شته‌کی ئه‌م ئایه‌ته‌ی بیست که ده‌فه‌رموێ:

﴿فاصْدَعْ بما تُؤْمَر﴾ (الحجر:٩٤) خۆی پێ ڕانه‌گیرا و یه‌کسه‌ر سه‌ری سوژده‌ی نایه زه‌وی!

پێیان وت:

ئایا موسڵمان بوویت؟

وتی:

نه‌خێر.. به‌ڵام سوژده‌م بۆ ڕه‌وانبێژیی ئه‌م ئایه‌ته برد!

هه‌روه‌ها هه‌زاران که‌س له پێشه‌وایانی ڕه‌وانبێژی و که‌ڵه ئه‌دیبانی چه‌شنی: عه‌بدولقاهیری جورجانی و، سه‌ککاکی و، زومه‌خشه‌ری، به یه‌ك ده‌م و یه‌ك ده‌نگ دان به‌وه‌دا ده‌نێن که:

(ڕه‌وانبێژیی قورئان له سه‌رووی وزه‌ی مرۆڤه‌وه‌یه و، له توانای هیچ که‌سێکدا نی‌یه پێی بگات).

هه‌روه‌ها قورئانی پیرۆز، هه‌ر له کاتی نازڵ بوونیه‌وه تاکو ئێستاش، ته‌حه‌ددای هه‌موو ڕه‌وانبێژ و ئه‌دیبه له‌خۆباییی و سه‌رسه‌خته‌کان ده‌کات و، له که‌ش و فش و خۆبه‌گه‌وره گرتن و سه‌رسه‌ختی‌یان داده‌گرێت و لووت‌به‌رزی‌یان ده‌هێنێته خوار و، له‌و ته‌حه‌ددایانه‌شدا داوای هێنانی سووره‌تێکی وه‌ك سووره‌ته‌کانی قورئانیان لێ ده‌کات، یان ده‌بێت به تیاچوون و ڕسوایی دنیا و قیامه‌ت ڕازی بن..

ئا له‌م کاته‌دا که قورئان ئه‌م ته‌حه‌ددایه‌ی ڕاده‌گه‌یه‌نێت، ده‌بینیت سه‌رجه‌م ڕه‌وانبێژه سه‌رسه‌خته‌کانی ئه‌و سه‌رده‌مه وازیان له ڕێگا کورته‌که هێنا، که لاسایی کردنه‌وه‌ی قورئانه و هێنانی سووره‌تێکی وه‌ك ئه‌وه و، له بریی ئه‌مه ڕێیه‌کی درێژیان گرته‌به‌ر، که ڕێی جه‌نگ و ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی چه‌ک‌دارانه‌یه و، ڕێیه‌که که کاولکاریی له دووتوێدایه و زیان به گیان و سامانیان ده‌گه‌یه‌نێت.. ئه‌وان به هه‌ڵبژاردنی ئه‌م ڕێگایه، ئه‌وه‌مان بۆ ده‌چه‌سپێنن که هه‌رگیز گرتنه‌به‌ری ڕێگا کورته‌که له تواناندا نی‌یه و بۆ هیچ که‌سێك مه‌یسه‌ر نابێت!

هەروەها ملیۆنەها كتێبی عەرەبیمان لە بەردەستدان، كە یان دۆست و پشتگرانی قورئان بە نیازی چاوكردن لە شێوازەكەی و شوێن پێ هەڵگرتنی.. یان دوژمنانی بۆ مەبەستی بەرەنگاری كردن و ڕەخنە لێ گرتنی، نووسیویانن..

خۆ هەموو ئەو كتێبانەی كە نووسراون و دەشنووسرێن، سەرباری بەرەوپێش چوونی شێوازیان، كە ئەویش ئەنجامی لە دوای یەكتر هاتنی بیرەكانیان و سوودوەرگرتنی دواینەكانیانە لە پێشینانیان، كەچی لەو كاتەوە تا ئێستا، هیچ كام لەو نووسراوانە نە لە شێوازی قورئان دەچێت نە نزیكیشی دەبێتەوە! تەنانەت ئەگەر پیاوێكی عەوامیش گوێی لە خوێندنی قورئان بێت، هەست بەو ڕاستییە دەكات و ناچار دەڵێت : (ئەم قورئانە لە هیچ كامێكی ئەو كتێبانە ناچێت). جا یان ئەوەیە ڕەوانبێژییەكەی ئەم لە خوار هی ئەو كتێبانەوەیە، یان لە سەرووی هەموویانەوەیە. خۆ هیچ مرۆڤێك - هەر كەسێك بێت - تەنانەت كافر و مرۆڤی نەفامیش ناتوانێت بڵێت: ڕەوانبێژییەكەی لە خوار ئەوانەوەیە.

جارێكیان یەكێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لله ما في السموات والأرض﴾ (الحدید:١) پاشان وتی:

- من هیچ ڕوویەكی ئیعجاز لە ڕەوانبێژیی ئەم ئایەتەدا نابینم كە ئێوە دەیبینن.

پێیان وت:

- (تۆیش وەك ئەم گەشتیارە بە ئەندێشەت بۆ ئەو سەردەمە بگەڕێرەوە كە ئەم ئایەتەی تێدا هاتووە، لەوێ گوێی لێ ڕابگرە)!

ئەویش كە بە ئەندێشە گەڕایەوە بۆ ئەوێ و سەیری كاتی پێش نازڵ بوونی قورئانی كرد، بینیی:

بوونەوەرانی جیهان، لە بۆشاییەكی چۆڵ و فراوانی بێ سنوور و جیهانێكی تیاچووی فانیدا فڕێ دراون و، لە بارێكی نائومێد و شڵەژاودان و، لەناو تاریكییەكی ڕەش و چڕدا دەگەوزێن و، بێ گیان و ژیان و هەست و نەست و كار و ئەرك و فرمانن.. ئا لەم كاتەدا، گوێی بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاگرت و لێی ورد بووەوە.. بینیی:

ئەم ئایەتە پەردەیەكی دادراوەی لەسەر ڕووی گەردوون و سەرانسەری جیهان هەڵدایەوە و، بە درەوشاوەیی و ڕوونی ڕووی گەردوون و جیهان دەركەوت و، ئەم گوفتارە ئەزەلی و فەرمانە هەتاهەتاییە دەرسێكی بە خاوەن هەستانی ڕیز بەستووی چەرخە یەك لە دوای یەكەكان ڕاگەیاند و بۆی ڕوون كردنەوە كە:

ئەم گەردوونە وەك مزگەوتێکی مەزن وایە و، بوونەوەرانی ناویشی - بە تایبەت ئاسمانەکان و زەوی - سەرگەرمی زیکر و تەهلیل و تەسبیحاتی گەرموگوڕی تایبەتیی خۆیانن و، هەریەکەیان بەوپەڕی شادمانی و ئاسەمەندیيەوە کار و ئەرکی خۆیان خستووەتە ئەستۆ و، بەوپەڕی بەختەوەری و سوپاسگوزاری و پێزانینیشەوە ئەنجامیان دەدەن و ڕایاندەپەڕێنن.

ئەم گەشتیارە، بەم جۆرە کاریگەریی ئەم ئایەتە پیرۆزەی لە گەردووندا بینی و، ئنجا مەودای بەرزی و ڕەوانبێژیيەکەی چەشت و، گشت ئایەتەکانی تریشی بەم چاوە بینی و بەم پێوەرە هەڵی سەنگاندن. پاشان لە نهێنیی ئەوەش گەیشت کە ڕەوانبێژیی بێ وێنەی قورئانی پیرۆز بەسەر نیوەی گۆی زەوی و پێنج یەکی گرۆی مرۆڤدا زاڵ و شکۆدارە و، دوای ئەوەش پەیی بە حیکمەتێك برد لە نێوان ئەو هەزاران حیکمەتانەی کە وان لە بەردەوام بوون و نەبڕانەوەی شکۆمەندیی دەستەڵاتی قورئانی پیرۆزدا، بۆ ماوەی چواردە سەدەی ڕەبەق بەوپەڕی ڕێزەوە.

● **خاڵی چوارەم:**

قورئانی پیرۆز دارای سازگاری و شیرینیيەکی ڕەسەن و ڕاستەقینەی ئەوتۆیە کە بە دووپات کردنەوەی زۆر و بەردەوامیشی نابێزرێت و، خوێندنەوەی زۆری هەرگیز نابێتە مایەی بێزاری، لە کاتێکدا کە دووپات بوونەوە لە شتی تردا، با زۆر خۆش و شیرین و بەتامیش بێت، هۆی بێزاربوون و لەبەرچاوکەوتنە. بەڵکو قورئانی پیرۆز، بە دووپات کردنەوەی خوێندنەوەی، پتر شیرینی و سازگارییەکەی زیاد دەبێت و دەردەکەوێت. ئەمەش ڕاستیيەکە هەر لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا لای هەموو کەسێك سەلماوە و، بە نموونە دەهێنرێتەوە.

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز هێندە تەڕی و پاراوی و لاوی و تازەیی دەرخستووە کە تا ئێستاش هەموو ئەمانەی پێوە دیارە و، هەرچەندەش وا چواردە سەدەیە نازڵ بووە و هەموو کەسێك بە ئاسانی دەستی دەکەوێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، دەڵێی ئا ئێستا بە تازەیی نازڵ بووە. هەموو سەردەمێکیش قورئانیان هەر ئاوا بە لاوی و پاراوی و تازەیی وەرگرتووە و، وەك تەنها بە تایبەتی لەگەڵ ئەواندا بدوێت ئاوا لە بەرچاویاندا دەرکەوتووە. گشت دەستە و کۆمەڵێکی زانست مەشرەبی هەموو کاتێکیش دەبینن قورئان پارێزگاریی لاوی و تازەیی شێوازەکانی دەکات و پاراویی شێوەی

ڕوونکردنەوەکانی ڕادەگرێت، هەرچەندەش قورئانیان لە بەردەستدایە و هەردەم لێی هەڵدەگۆزن و شوێن پێی هەنگاوی شێوازی ئەو هەڵدەگرن.

● **خاڵی پێنجەم:**

قورئانی پیرۆز یەکێك لە باڵەکانی ڕووەو "ڕابوردوو" و، ئەوی تریشی بەرەو "داهاتوو" بڵاو کردووەتەوە، چونکە بناغە و بنچینەی قورئان و یەکێك لە دوو باڵەکانی ئەو ڕاستییەیە کە هەموو "پێغەمبەرانی پێشین" لە سەری یەکیان گرتووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز تەسدیقیان دەکات و پشتیان دەگرێت و، ئەوانیش پشتی ئەم دەگرن و بە زمانی حاڵی یەك گرتنیان لەگەڵ قورئاندا، تەسدیقی دەکەن.. هەروەها "ئەولیا و پیاوچاکان و دەروون خاوێنەکان"یش "بەر"ێکن ژیانیان لە "درەختی قورئان"ی پیرۆزەوە دەست کەوتووە.

جا پێگەیشتن و زیندوویی ئەم بەرە پێگەیشتووانە بەڵگەی ئەوەیە کە درەختە پیرۆزەکەیان بەخشندە و خاوەنی ژیان و، دارای ڕیژنەی بەردەوام و ڕاستی و ڕەسەنایەتی‌یە. چونکە هەموو ئەو کەسانەی کە ڕۆشتوونەتە ژێر چاودێری و پاریزگاریی باڵی دووهەمی قورئان و لە سایەیدا ژیاون، لە شوێنکەوتووانی تەریقەتە ڕاستەقینەکانی ئیسلام، هەر هەموویان شایەتی دەدەن کە قورئانی پیرۆز عەینی حەق و کۆگای ڕاستی‌یەکانە و، لە "گشتی‌بوون" و "هەمەلایەنگیری"دا هەرگیز هاوتا و وێنەی نی‌یە. کەواتە موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکرایە.

● **خاڵی شەشەم:**

هەر شەش لاکانی قورئان ڕوون و ڕووناکی‌بەخشن. ئەمەش ڕاستی و دادگەریی قورئان دەردەخات..

بەڵێ، "لای خوارەوەی" قورئان و ژێرەوەی: ستوونی بەڵگەکانە و لەسەریان ڕاوەستاوە.. لە "لای سەروویشیەوە": مۆری ئیعجازی لەسەر نەخشاوە.. "بەردەم و ئامانجیشی": دیاری‌یەکانی بەختەوەریی هەردوو دنیان.. لە "پشتیشیەوە" واتە خاڵی پشت پێ‌بەستنی: ڕاستی‌یەکانی سرووشی ئاسمانی ڕیزیان بەستووە.. لە "لای ڕاستیشیەوە": تەسدیق کردنی چەندین بەڵگەی بێ‌سنوور و لەژمارەبەدەری ژیری‌یە ڕاستەکانە.. "لای چەپیشی": دڵنیایی و کێش‌بوون و تەسلیم و ملکەچیی تەواوەتیی دڵە ساغ و دەروون و هەناوە خاوێنەکانە.

جا هەروەك ئەم شەش لایانە دەیچەسپێنن قورئانی پیرۆز قەڵایەکی ئاسمانیی وەهایە لەسەر زەویدا کە هیچ شتێك ناتوانێت بیبڕێت و کەلێن لە دیوارەکەیدا دروست

بکات.. هەروەها شەش مەقامیش هەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەن و دەیچەسپێنن کە: قورئان خۆی لە خۆیدا ڕاست و ڕەوایە و، هەرگیز گوفتاری مرۆڤ نی‌یە و، لە هیچ لایەکیەوە ناڕەوایی توخنی ناکەوێت.

مەقامی یەکەمیان بریتی‌یە لە پشتگیری کردنی ئەم قورئانە پیرۆزە لە لایەن کارساز و بەڕێوەبەری ئەم گەردوونەوە، کە خوایەکە دەرخستنی جوانی و، پارێزگاری کردنی چاکە و ڕاستی و، نەهێشتن و لابردنی فێڵباز و درۆزنانی کردووە بە یاسایەکی کارگوزاری کارای خۆی..

ئەم خواوەندە مەقامێکی ڕێزلێنانی وەها و پلەوپایەیەکی ئەوتۆی لە هەموو جیهاندا بەم قورئانە بەخشیوە کە لە هەموو پلە و پایە و مەقامێك بەرز و پایەدار و زاڵترە و، بەمەش تەسدیق و پشتگیریی خۆی بۆ قورئان دەربڕیوە.

پاشان ئەو ڕێزە شایان و باوەڕە بەتین و ڕەگداکوتاوەی کە زاتی مەزنی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر قورئانی پیرۆز دەری‌بڕیوە، لە سەرووی هەموو ڕێزێکەوەیە. ئەم پێغەمبەرەی ﷺ کە سەرچاوەی ئیسلام و ڕوونکەرەوەی قورئانە و، بێ هیچ ویستێکی خۆی لە نێوان بێداری و نوستندا "وەحی"ی بۆ نازڵ دەبوو، ئەم پێغەمبەرەی کە فەرموودەکانی تری هەرگیز ناگەنە ئاستی قورئان، تەنانەت هەر لەویش ناچن، هەرچەندە ڕەوانگۆترین کەسیشە.. هەروەها ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەم قورئانە: ڕووداوە غەیبی‌یە گەردوونی‌یەکانی پێشین و داهاتووشی بەوپەڕی دڵنیایی و باوەڕبەخۆبوون و بێ هیچ دوودڵی‌یەك ڕوون کردووەتەوە، هەرچەندەش نەخوێندەوار بووە. ئنجا لەمەشدا هیچ فێڵ و هەڵە و شتێکی وەك ئەمانەی - با بچووکیش بوو بێت - لێ نەبینراوە، هەرچەندەش لە نێوان کەسانێکدا ژیاوە کە تابڵێی سەرنجی هەڵسوکەوتەکانی ئەویان داوە..

جا باوەڕهێنانی ئەم ڕوونکەرەوە و ڕاگەیەنەرە مەزنەی قورئان کە پێغەمبەرە ﷺ و، دڵنیایی و نەلەرزینی لە هیچ شتێکدا - با زۆر گەورەش بوو بێت - پشتی ئەوە دەگرێت و دەیچەسپێنێت کە: قورئانی پیرۆز ئاسمانی‌یە و، ڕاست و ڕەوا و داد و گوفتاری پیرۆزی پەروەردگاری میهرەبانە.

هەروەها پەیوەست بوونی پێنج یەکی گرۆی مرۆڤ، بەڵکو نیوەی هەرە مەزنیان، بەم قورئانە پیرۆزەی کە لە بەردەمیاندایە و بە چاو دەیبینن، بە پەیوەندی‌یەکی گەرموگوڕی ئاینداری و گوێڕاگرتنی پڕ لە شەوق و تاسە و ئارەزوومەندی و، هاتنی پۆل پۆلی جینی و مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یەکان بۆ لای و کۆبوونەوەیان لە دەوری لە کاتی

خوێندنەوەیدا بە چەشنی پەپوولەی شەیدای ڕووناکی، بە شایەتیی چەندەها ڕووداوی زۆر و نیشانەی زەبەندە و "کەشف"ی ڕاستی گەلێ کەس لە پیاوچاکان..

هەموو ئەمانە، تەسدیقی ئەوە دەکەن کە ئەم قورئانە جێی ڕەزامەندی و مایەی سەرسووڕمانی گشت بوونەوەرانە و، لەم گەردوونەدا مەزنترین پلەوپایەی پێ دراوە.

هەروەها هەموو چینێك لە چینەکانی مرۆڤ، هەر لە عەوامەکان و تەمبەڵترین کەسەوە تا دەگاتە کەسانی یەکجار زیرەك و زانا، بەشی خۆیان بە تەواوی لەو دەرسانە وەردەگرن کە قورئانی پیرۆز دەیانڵێتەوە و قووڵترین ڕاستییەکانی تێدەگەن و لێی وەردەگرن.. هەروەها سەرجەمی زانایانی سەدان زانست و هونەری ئیسلامی، بە تایبەت موجتەهیدانی شەریعەتی خاوێن و، لێکۆڵەرانی ئوسوولی دین و بلیمەتانی زانستی کەلام و هاوچەشنیان، وەڵامی شیفابەخشی پێداویستییەکانی تایبەت بە زانیارییەکانیانەوە لە قورئانی پیرۆز دەرهێناوە و هەڵگۆزیوە..

هەموو ئەمانە، تەسدیقی ئەوە دەکەن کە قورئانی پیرۆز سەرچاوەی حەق و کانگای ڕاستییە.

هەروەها بەرپەرچ نەدانەوەی قورئان لە لایەن ئەو ئەدیبە عەرەبانەی کە لە پێشەنگی کاروانی ئەدەبییەوەن، بە تایبەت ئەوانەیان کە موسڵمان نەبوون، هەرچەندەش حەزیان لە بەرەنگاریی قورئان کردووە. هەروەها دەستەوسانی و کۆڵەواریی تەواویان بەرامبەر تەنها یەك ڕووی حەوت ڕووە مەزنەکانی ئیعجازی قورئان (کە ڕووی ڕەوانبێژییەتی) و کۆڵەوارییان لە هێنانی شتێکی وەك تەنها یەك سوورەتی قورئان و، خۆدزینەوەیان لەم تەحەددا و داوایەی قورئان.. هەروەها بەرەنگار نەبوونەوەی ڕەوانبێژە بەناوبانگ و زانا بلیمەتەکان - تاکو ئێستا - بەرامبەر بە هیچ کام لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان، هەرچەندەش حەزیان دەکرد بەم چەشنە بەرەنگارییە ناوبانگ دەربکەن و ناویان بڵاو ببێتەوە.. بەڵێ، بێدەنگییان لە ئاستی ئەمەدا، کۆڵەوارییان پیشان دەدات، ئەوەتا ئەوان لەم بوارەدا هیچ هەنگاوێکیان نەنا!

هەموو ئەمانە، بەڵگەیەکی گومانبڕن لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز خۆی بۆ خۆی موعجیزەیە و لە سەرووی توانا و وزەی مرۆڤەوەیە.

بەڵێ، بەها و بڵندی و ڕەوانگۆیی هەر گوفتارێك بەوە ڕوون دەبێتەوە کە بزانرێت: (کێ وتوویەتی؟ بە کێی وتووە؟ بۆچی وتوویەتی)؟!

جا لەسەر بناغەی ئەمە، تا ئێستا نە هاووێنەی قورئانی پیرۆز هاتووە و، نە دێت و، نە هەرگیز هیچ شتێك نزیکی دەبێتەوە. چونکە قورئانی پیرۆز فەرمایشتی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە و گوفتاری بەدیهێنەریانە و، قسەکردنێکە هەرگیز بە هیچ جۆرێ لاسایی ناکرێتەوە و، هیچ نیشانەیەکی ئەوتۆی پێوە نییە کە ئەوە بگەیەنێت خۆکردەیی(التصنع)ی تێدا بێت..

هەروەها ئەو کەسەی کە قورئان گوفتاری خۆی ئاراستە دەکات نوێنەری گرۆی مرۆڤ بەڵکو نوێنەری سەرجەمی بوونەوەرانە بە گشتی و، بەرێزترین قسەبۆکراو(مخاطب)ە و، ناویشی لە ناوی هەموان بەرز و پایەدارترە و، ئەم ئیسلامە مەزنە لە هێز و فراوانیی ئیمانەکەی ئەو کەسەوە سەرچاوەی گرتووە و، رێزیشی لە رادەیەکدایە کە بۆ "قاب قوسین" یان نزیکتریش سەرخراوە و بە گوفتار و لەگەڵ دوانی خواوەندی بێوێنە پایەدار کراوە و رێزی لێ نراوە.

پاشان قورئانی پیرۆز رێی بەختەوەریی هەردوو دنیا و ئامانجەکانی بەدیهێنانی گەردوون و مەبەستە پەروەردگارییەکانی لەمەڕ گەردوونی روون کردووەتەوە.. هەروەها ئیمانە بەرز و بڵند و فراوانەکەی ئەو قسەبۆکراوە بەرێزەشی خستووەتە روو، کە ئیمانێکە هەموو راستییەکانی ئیسلامی لە خۆدا جەم کردووە.. قورئانی پیرۆز هەموو لایەکی ئەم گەردوونە مەزنەی یەکالا کردووە و ئەم دیو و ئەو دیوی لاپەڕەکانی خستووەتە روو، وەکو کەسێك کە نەخشەیەك یان سەعاتێکی لە بەردەستدا بێت و ئاڵوگۆڕ و دەستکارییان بکات و هەڵیان بگێڕێتەوە. قورئان بەم کردارەی و لە نێوان ئاڵوگۆڕەکانی ئەم گەردوونەدا، بەدیهێنەری "مرۆڤ و گەردوون"ی بەم مرۆڤە ناساندووە.

کەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە: هەرگیزاو هەرگیز هێنان و پەیداکردنی هاووێنەی ئەم قورئانە لە توانای کەسدا نییە و، ناکرێت هیچ شتێك بگاتە پلەی ئیعجازی قورئان.

هەروەها هەزاران زانای هەڵکەوتوو، لەوانەی کە هەریەکەیان تەفسیرێکیان لە چەندین بەرگدا بۆ قورئانی پیرۆز نووسیوە، کە هی هەندێکیان گەیشتووەتە سی یان چل یان حەفتا بەرگ تەفسیر. هەموو ئەو زانایانە بە پاڵپشت و بەڵگەکانی خۆیان چەندین لایەنی لەژمارەبەدەری: تایبەتکاریی بەرز و سەرنجی رەوان و تایبەتمەندیی ورد و نهێنیی ناسك و واتای بڵند و هەواڵی غەیبیی زۆر و جۆراوجۆری قورئانی پیرۆزیان روون

کردووەتەوە. جا دەرخستن و چەسپاندنی ئەو هەموو تایبەتکارییانەی قورئان لە لایەن ئەو زانا تەفسیر نووسانەوە، بەلگەیەکی گومانبڕە لەسەر ئەوەی کە قورئان موعجیزەیەکی خوایییە و دەراسا و لەعادەت بەدەرە. بە تایبەت کە هەر یەکە لە کتێبەکانی "پەیامەکانی نوور" - کە دەگەنە سەد و سی کتێب - تایبەتکارییەکی قورئانی پیرۆز و سەرنجێکی بێوێنەی ئەویان بە چەشنێکی گومانبڕ و بە بەلگەی بەهێز چەسپاندووە. بە تایبەت پەیامی "موعجیزاتی قورئانی" و "مەقامی دووهەمی وتەی بیستەم" کە گەلێ شتی لە کارە دەراساکانی شارستانێتیی نوێی چەشنی: شەمەندەفەر و فڕۆکەی لە قورئانی پیرۆز دەرهێناوە. هەروەها تیشکی یەکەم کە ناوی "ئاماژەکانی قورئان"ە، ئەو ئامازانە دەردەخات کە لە قورئاندا هەن سەبارەت بە "پەیامەکانی نوور" و "کارەبا" و، ئەو هەشت پەیامە بچووکانەش کە ناویان "هەشت هێماکان"ە، مەودای ڕێسای وردی نێوان پیتەکانی قورئان باس دەکەن کە تابلێی دارای نهێنی و واتای زۆر و زەبەندەن. هەروەها ئەو پەیامە بچووکەش کە باسی ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی "الفتح" دەکات و لە ڕووی هەواڵدانی غەیبییەوە بە پێنج ڕوو ئیعجازی ئەم سوورەتە دەردەخات و، پەیامەکانی تریش کە وەك ئەمانە وان..

جا کە هەموو یەکێك لە بەشەکانی "پەیامەکانی نوور" ڕاستییەك لە ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز و نوورێك لە نوورەکانی ڕوون دەکەنەوە، تەسدیق و تەئکیدی ئەوە دەکەن کە قورئانی پیرۆز هاووێنەی نییە و دەراسا و موعجیزەیە و زمانی جیهانی "پەنهان"ە لەناو ئەم جیهانە "بینراو"ەدا و، گوفتاری خواوەندی زانای نهێنییەکانە.

* * *

بەم جۆرە و لەبەر ئەم تایبەتکارییانەی قورئانی پیرۆز کە لە: شەش خاڵ و، شەش لا و، شەش مەقامدا ئاماژەیان بۆ کرا، فەرمانڕەوایەتیی نوورانی و شکۆدار و دەستەلاتی خاوێن و پیرۆزی قورئان، بەوپەڕی ویقار و ڕێزەوە، بەردەوام بووە و، ڕووی هەموو سەردەمەکان و گۆی زەویشی، بە درێژایی هەزار و سێ سەد ساڵ، ڕووناك کردووەتەوە..

لەبەر هەموو ئەو تایبەتکارییانە، قورئانی پیرۆز چەندین پلەوپایە و دەستکەوتی قودسیی خەلات کراوە. چونکە بەلای کەمەوە خوێندنەوەی هەر پیتێکی قورئان پاداشتی (دە) خێر و (دە) دانە چاکە و (دە) بەروبوومی بەهەشتی هەیە. تەنانەت هەموو پیتێکی

هەندێ ئایەت و سوورەت (سەد) یان (هەزار) یان زیاتر لە بەروبوومەکانی دوارۆژ دەگرێت و، لە کاتە پیرۆزەکاندا پاداشت و بەهای هەر پیتێك لە (دە) دانەوە بۆ (سەدان) بەرز دەبێتەوە.

ئەم گەشتیارەی ناو جیهان، لە هەموو ئەمانە و چەندین تایبەتکاریی تری خاوێن و هاوچەشنی ئەمانە گەیشت و، بە "دڵ"ی خۆی وت:

(بەڵێ ڕاستە، ئەم قورئانە پیرۆزەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە خاوەنی ئیعجازە و، بە: یەکدەنگیی سوورەتەکانی و، یەکگرتنی ئایەتەکانی و، تەوافوقی نهێنی و نوورەکانی و، یەکاویەك بوونی بەروبووم و ئاسەوارەکانی.. شایەتی‌یەکی بە بەڵگە چەسپاو دەدات لەسەر: "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی "واجب الوجود" و، لەسەر سیفەتە شکۆدار و ناوە جوانەکانی، بە ڕادەیەك کە هەموو شایەتی‌یە لەژمارەبەدەر و بێ‌سنوورەکانی گشت ئیمانداران، تەنها چەند نمێکی ئەو شایەتیدانەی قورئانی پیرۆزن).

لە پلەی حەڤدەهەمی مەقامی یەکەمیشدا، بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو دەرسی تەوحید و ئیمانە کراوە کە ئەم گەشتیارە لە قورئانی پیرۆز وەری گرت:

(لا إله إلاّ الله الواجب الوجود الواحد الأحد الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته: القرآن المعجز البيان المقبول المرغوب لأجناس المَلَك والإنس والجانّ، المقروء كلّ آياته في كلّ دقيقة بكمال الإحترام بألسنة مئة مليون من نوع الإنسان، الدائم سلطنته القدسية على أقطار الأرض والأكوان وعلى وجوه الأعصار والأزمان، والجاري حاكميته المعنوية النورانية على نصف الأرض وخمس البشر في أربعة عشر عصراً بكمال الإحتشام. وكذا شهد وبرهن بإجماع سوره القدسية السماوية وباتفاق آياته النورانية الإلهية وبتوافق أسراره وأنواره وبتطابق حقائقه وثمراته وآثاره بالمشاهدة والعيان).

* * *

## ١٨

پاشـان ئـەم گەشـتیار و ڕێبـوارە نـاوبراوە، بـە دڵنیـایی زانیـی کـە: ئـەو ئیمانـەی پێی گەیشتووە، مەزنترین سەرمایەی مرۆڤە. چونکە ئیمـان تەنـها زەوی و زارێکـی فـانی و نشینگەیەکی کاتی بە مرۆڤی هەژار نابەخشێت، بەڵکو ئـەم گەردوونـە مەزنـە دەکـات بـە موڵکی مرۆڤ و شایستەیی ئەوەشی دەداتێ کە موڵکێکی هەمیشـەیی و لـە دنیـا فراوانتر بەدەست بهێنێت و، پێداویستیيەکانی ژیانێکی هەمیشـەیی بۆ ئەمی مرۆڤـی فـانی بـەدی دەهێنێت و، ئادەمیزادی هـەژاری چاوەڕوانی قەنارەی ئەجەل لـەو کۆتاییيـە سـامناك و ئیعدامە هەتاهەتاییيە ڕزگار دەکات و، دەرگای گەنجینەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ دەخاتە سەرپشت.

لەبەر ئەوە، ئەم گەشتیارە لەبەرخۆیەوە بە خۆی وت:

- (بڕۆ پێشکەوە! با پلەیەکی نوێی تـر لـە پلـە بێسنوورەکانی ئیمـان دەستی خۆمـان بخەین. با ئەم جارە سەیری: **"کۆی تێکڕای گـەردوون"** بکـەین و گوێـی لـێ ڕابگریـن و بزانین ئەویش چی دەڵێت؟ تاکو ڕووناکیيەکی تر ئاراستەی ئەو دەرسـانە بکـەین کـە لـە هەموو سووچ و گۆشە و بەش و لاکانی گەردوونەوە - یەك بە یەك - وەرمانگرتن).

ئنجا ئەم گەشتیارە چاویلکەیەکی فراوانی گشتگیری لـە قورئـانی پیرۆز خواسـت و، سەیری **"کۆی گەردوون"**ی - بە گشتی - پێ کرد..

بینیی: ئەم گەردوونە بە جۆر و تەرزێکی تابلێی بێ وێنـە ڕێکخـراوە. هێنـدەش واتـای زۆری تێدا جەم کراوە کە لە شێوەی:

کتێبێکـی بەرجەستەی خوایی.. یـان قورئـانێکی جیسـمانیی پـەروەردگاری.. یـان کۆشکێکی ڕازاوەی صەمـەدانی.. یـان شـارێکی ڕێکوپێکـی دروستکراوی خـواوەنـدی میهرەباندا.. دەردەکەوێت.

چونکە هەموو سـوورەت و ئایـەت و وشـە و تەنانـەت گشـت پیـت و بـاب و فەسڵ و لاپەڕە و دێڕەکانی ئەم کتێبە.. هەروەها ئەو "کوژانەوە و نووسین"ە پڕ واتا ناسکانەی کە بەسەر هـەموویاندا دێـن و ئـەو ئاڵوگۆڕانـەش کـە بـە دانـایی و داهێنانکـاری تیایـاندا ڕوو دەدات.. هەموو ئەمانە، بە یەکدەنگ:

ڕوونی و بەڵگەنەویستیی "بـوون"ی خوایەکی زانـا بـە هـەموو شـتێك و توانـا بەسـەر هەموو شتێکدا، ڕادەگەیەنن و، "بـوون"ی بەدیهێنـەری شـکۆمەند و شێوەکێشـی خـاوەن

کەماڵ دەردەبڕن، کە خوایەکی وایە هەموو شتێك لە هەموو شتێکدا دەبینێت و ئاگاداری پەیوەندیی هەموو شتێکە بە هەموو شتێکەوە و، چاودێری‌یان دەکات!

بەم جۆرە، هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە، بە هەموو گۆشە و، جۆر و، بەش و، لایەنە هەندەکی‌یەکانی و، دانیشتووانی و، ئەو شتانەی کە وان تیایدا و، دەرامەت و خەرجی‌یەکانی و، ئاڵوگۆڕە بەرژەوەندی بەخش و، نوێ بوونەوە پڕ لە دانایی‌یەکانی.. هەموو ئەمانە پێکەوە: "بوون" و "یەکتایی" بەدیهێنەرێکی پایەبەرز و داهێنەرێکی بێ وێنەی ئەوتۆ دەبەخشن کە بە توانستێکی بێ سنوور و دانایی‌یەکی بێ کۆتایی کارەکانی ڕادەپەڕێنێت.

لێرەدا دوو "ڕاستی"ی گەورە هەن کە بە ئەندازەی گەردوون مەزن وفراوانن و، شایەتیدانی گەردوونی مەزن لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورە دەچەسپێنن. ئەو دوو ڕاستی‌یانەش ئەمانەن:

● **ڕاستیی یەکەم:** ڕاستیی "حدووث و ئیمکان".

کە ڕاستی‌یەکە دانایانی ئیسلام و زانا بلیمەتەکانی ئوسوولی دین و "زانستی کەلام" بینیویانە و بە چەندین بەڵگەی گومانبڕی بەهێز و مەحکەم چەسپاندوویانە.

ئەم دانا و زانایانە، وتوویانە:

مادەم جیهان و هەموو شتێکی ناوی ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت، ئەوا دەردەکەوێت کە هەموویان دروستکراون و لە ئەنجامیشدا دەفەوتێن و نامێنن و، هیچ کامێکیشیان "ئەزەلی" نین. جا مادەم ئەم جیهانە شتێکی دروستبوو(حادث)ە، ئەوا دەبێ دروستکەرێکی بێت.. ئنجا مادەم هەر شتێك لە زاتی خۆیدا گەر بۆ "بوون" و "نەبوون"ی هۆکارێك نەبێت، بوون و نەبوونی یەکسان دەبێت، ئەوا ئەو شتە "واجب الوجود" و "ئەزەلی" نی‌یە.

هەروەها بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ ئەوەش چەسپاوە کە هەرگیز ناکرێت و ناگونجێ بە "دەور و تەسەلسول" کە دوو گریمانی بەتاڵ و مەحاڵن، شتان یەکتری دروست بکەن. کەواتە بوونی زاتێکی "واجب الوجود" کە مەحاڵە هاوتا و هاووێنەی بێت، پێویستە و، هەموو شتێکی تری غەیری ئەو لە جۆری "مومکینات"ن و گشتیان "بەدیهاتوو"ن.

بەڵێ، "ڕاستیی حدووث" بەسەر گەردووندا زاڵە، چونکە "چاو" بەشی زۆری دەبینێت و، "ژیری"ش پەی بە بەشەکەی تری دەبات. ئەوەتا ئێمە لە هەمووساڵێکدا و

لەگەڵ هاتنی وەرزی پایزدا بە چاوی خۆمان دەبینین کە: جیهانێکی مەزن دەمرێت و چەندەها تاك(فرد)ی لە ژمارە بەدەری سەد هەزار جۆر(نوع) ڕووەك و زیندەوەرە بچووکەکانیش - کە هەریەکەیان لە حوکمی گەردوونێکی زیندوودایە - لەگەڵیدا دەمرن. بەڵام ئەم مردنە بەوپەڕی ڕێکوپێکی ڕوودەدات! چونکە تاك تاکی ئەو جۆرانە، گشت تۆو و ناوك و گەراکانیان - کە مایە و خولگەی حەشر و زیندووکردنەوەیانن و هەر بۆ خۆیان موعجیزاتی میهرەبانی و دانایی و کارە دەراساکانی توانست و زانستی خوای گەورەن - بە ئەمانەت لە لای بەدیهێنەری "پارێزگار"ی شکۆمەند و لە ژێر چاودێری و پارێزگاریی ئەودا دادەنێن و، لاپەڕەی کردەوەکانیان و بەرنامەی ئەو کارانەی ئەنجامیان داون، بە دەستی دانای بەدیهێنەری دەسپێرن، ئنجا دەمرن!

پاشان لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا، هەر خودی ئەو درەخت و بنج و زیندەوەرە بچووکانە زیندوو دەکرێنەوە و.. هاوێنەی بەشێکی تریشیان هەر لە جێی خۆیاندا بەدی دەهێنرێن و ژیانیان پێ دەبەخشرێت. بەمەش سەد هەزار نموونە و بەڵگە لەسەر حەشری مەزن دەهێننەوە و لە بەرچاودا بەرجەستەی دەکەن.

جا کە بوونەوەرانی بەهاری پێشوو بەرنامە و لاپەڕەی کردەوەکانیان و ئەو ئەرکانەی ئەنجامیان داون، ئاوا دەردەخەن و لەم بەهارەدا بە ئاشکرا ڕایاندەگەیەنن، ئەوا بەم کارەیان نموونەیەکی ئاشکرا بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخەنە ڕوو کە دەفەرموێ:

﴿وإذا الصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾ (التکویر: ١٠).

جا هەروەك ئەم مردن و زیندووبوونەوەیە لە یەك بە یەکی ئەو دانە و تاکانەدا ڕووی دا، بە هەمان جۆر لە کۆی گەردوونیشدا ڕوو دەدات، چونکە لە هەموو پایزێکدا جیهانێك دەمرێت و، لە هەموو بەهارێکدا جیهانێکی تری نوێ دێتە "بوون" و لە دایك دەبێت! ئەم مردن و بەدیهاتنەش بە ڕێکوپێکییەکی تابڵێی ورد بەڕێ دەکرێن و، ئەو هەموو مردن و لەدایکبوونانەی گشت ئەو جۆرە لەژمارەبەدەرانەی زیندەوەرانیش - کە لەم دوو جیهانەدا ڕوو دەدەن - بەوپەڕی ڕێکی و هاوسەنگی و وردی ئەنجام دەدرێن، بە ڕادەیەك کە دەڵێی دنیا هەوارگە و مەنزڵێکە میوانداریی زیندەوەرانی تێدا ساز دەکرێت! ئەوەتا چەندین جیهانی گەشتیار و دنیای گەڕۆك دێنە ناوی و کار و ئەرکی سەرشانی خۆیانی تێدا جێبەجێ دەکەن، پاشان کۆچ دەکەن و بەجێی دەهێڵن.

بەم جۆرە دەرکەوت کە پەیداکردن و بەدیهێنانی چەندین جیهانی زیندوو، هەروەها دروستکردنی چەندەها بوونەوەری کارمەند لەم دنیایەدا، کە بەوپەڕی زانایی و دانایی و،

بـە ئـەندازە و وردی و هاوسـەنگی و، بـە ڕێکـی و ڕێسـا دروسـت دەکرێـن و بـەدی دەهێـنرێن.. هـەروەها بـە توانسـت دەخرێنـەکار و، بـە میـهرەبانیش لـە مەبەسـتە پەروەردگاری‌یـەکان و ئامانجـە خوایی‌یـەکان و، کارگوزاری‌یـە ڕەحمانی‌یـەکاندا بەکاردەهێنرێن.. هەموو ئەمانە، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی، بەڵگـەن لەسـەر: "پێویستیی بوون"ی زاتێکی خاوێنی شکۆمەند کە توانست و دانستی ئەو کۆتایی‌یان بۆ نی‌یە و، ئەم دەرەنجامە بە چەشنی ڕووناکیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان بۆ هـەموو "ژیـری"یـەك دەردەخەن.

لـێرەدا دەرگـای باسـەکانی "حـدووث" دادەخـەین و، بـە "پەیامـەکانی نـوور" و کتێبەکانی "زانستی کەلام"یان دەسپێرین.

لایەنی "ئیمکـان"یـش بـە هـەمان جـۆر، بەسـەر گـەردووندا زاڵـە و سەرانسـەری گەردوونی گرتووەتەوە و دەورەی داوە..

چونکـە ئێمـە بـە چاوی خۆمـان دەبینین کـە: هـەموو شتێك، چ هەمەکی بێـت و چ هەندەکی، بچووك بێت یان گەورە..

گشت بوونەوەرێك، هەر لە عەرشەوە تا زەوی و، هەر لـە گەردیلەکانـەوە تـا دەگاتـە هەسارە گەڕۆکەکان..

هـەر هـەموویان، کە دەنێررێنـە ئـەم دنیایـە بـە: زاتییـەتێکی تایبـەتی و، شـێوەیەکی دیـاریکراو و، کەسایەتی‌یەکی جیـاواز و، بـە چـەند سـیفەتێکی تایبـەت و، چـەندین چۆنێتیی دانایانە و، بە چەند کۆئەندامێکی پڕ لە بەهرە و سوودەوە، دەنێررێن.

جا بەخشینی ئەو "تایبەتکاری"یە بـەو زاتـە تایبەتـە و بـەو ماهییەتـە، لـە نێـوان چـەندین گریمانی بێ‌سنووردا..

هـەروەها دەستنیشـان کردنی ئـەو "شـێوە" دیـاریکراوە خـاوەن نـەخش و نیشـانە جوداکەرەوە گونجـاوە، لـە نێـوان چـەندین گریمـانی زۆری بـە ئـەندازەی ژمـارەی وێنـە و شێوەکان..

هەروەها تایبەتکردن و هەڵبژاردنی تایبەتیی ئەو "کەسێتی‌یە" شیاوە بۆ ئەو بوونـەوەرە، لە نێوان چەندین گریمانی بە ئەندازەی کەسانی هاوڕەگەزیدا..

هـەروەها جێگیرکردنی "چـەند سیفەتێکی" تایبـەتی و بـەرژەوەندیدار و گونجـاو لـەو بەدیهێنراوەدا کە خاوەنی شێوە نی‌یە و، سەرسام و حەپەساوی نێـوان چەندەها گریمـانی

زۆری بە ئەندازەی ژمارە و پلەی سیفەتەکانە..

هەروەها دەستنیشان کردنی ئەو "چۆنێتی‌یە"ی کە "دانست"ی تێدا ڕەچاوکراوە و، بەخشینی ئەو گشت کۆئەندامەی کە چاودێری‌یان پێوە دیارە و کە دەکرێت و دەگونجێ بە چەندین ڕێگا و تەرز و شێوەی لەسنوور بەدەردا دەربکەون.. بەخشینی هەموو ئەمانە بەو بەدیهێنراوەی کە بێ ئامانج و سەرسام و سەرگەردانە لە نێوان چەندەها گریمانی لە ژمارەبەدەردا..

ئەم هەموو ئاماژە و، بەڵگە و، شایەتی‌یانەی کە لە "ڕاستیی ئیمکان"ەوە دەرچوون، هەموویان یەکێك لە دوو باڵەکەی ئەم شایەتی‌یە مەزنەی گەردوون پێکدەهێنن، چونکە بە ژمارەی گشت بوونەوەرە هەمەکی و هەندەکی‌یەکان و، بە ئەندازەی ئەو گریمانانەی کە بۆ هەموو یەکێك لەو بوونەوەرانەی باس کران، چ لە چییەتی و چۆنێتی‌یاندا، چ لە شکڵ و شێوەیاندا، چ لەو سیفەت و بارەی تیایدان.. بە ژمارەی هەموو ئەوانە، ئاماژە و بەڵگە و شایەتی هەن لەسەر: "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود" کە خوایەکی وایە بۆ هەموو یەکێك لەو شتانەی باس کران گریمان دەستنیشان دەکات.. خوایەکە توانستی ئەو سنووری نی‌یە و دانستەکەشی بێ کۆتایی‌یە و، هیچ شتێك و هیچ کارێکیش لەو شاراوە نی‌یە و، هیچ شتێك پەکی ئەو ناخات و، هیچ شتێکیشی لێ ون نابێت و، بەدیهێنانی گەورەترین شتی - وەك بچووکترینیان - بەلاوە ئاسانە. چونکە هەر ئەوە کە دەتوانێت چەشنی ئاسانیی بەدیهێنانی "درەخت"ێك بەهارێك بەدی‌بهێنێت و، وەك ئاسانیی دروستکردنی "تۆو"ێکیش درەختێك دروست بکات!

جا لەبەر ئەوەی بەشەکانی پەیامەکانی نوور، بە تایبەت "وتەی بیست و دووهەم و، سی و دووهەم" و "مەکتووبی بیستەم و، سی و سێ‌هەم" بە تەواوی و ڕوونی ئەم شایەتیدانەی گەردوونیان - بە هەردوو باڵەکەی و هەردوو ڕاستی‌یەکانیەوە - چەسپاندووە و ڕوونیان کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا کۆتایی بەم مەسەلە یەکجار ورد و درێژە دەهێنین و، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو پەیامانە دەکەین.

باڵی دووهەمی شایەتی‌یە هەمەکی و مەزنەکەی "کۆی گەردوون" بریتی‌یە لە:

● **ڕاستیی دووهەم**: "ڕاستیی هاوکاری (التعاون)

ڕاستیی "هاوکاری" و یاریدەدانی یەکتر، بە ڕوونی لەو بەدیهێنراوانەدا دەردەکەوێت کە بۆ پاراستنی: بوون و کار و ژیانیشیان - گەر زیندوو بن - هەروەها بۆ بەجێهێنانی

ئەرکـەکانی سـەرشـانیان، لـە نێـوان ئـەم هـەموو ئاڵوگـۆڕە بـەردەوام و گـۆڕانکاری‌یە تێکەڵ و هەمیشەیی‌یەدا.. تێدەکۆشن. ئەو بەدیهێنراوانە بە ڕادەیەکی ئـەوتۆ ئـەم ڕاستی‌یە دەردەخەن کە لە دەرەوەی تواناى خۆیاندایە.

بۆ نموونە: هەوڵدانی تۆخمەکان بـۆ یارمـەتیدانی زینـدەوەران، بە تایبـەت یارمـەتیدانی "هـەور" بۆ ڕووەك و هـی ڕووەك بۆ گیانلەبەران و، هـی گیانلەبـەرانیش بـۆ مـرۆڤ.. هەروەها هەڵقوڵانی شیری خاوێنی کەوسەر ئاسا لە مەمکانەوە بـۆ تێر کردنی ساوایان.. هەروەها سپاردنی پێداویستی و ڕۆزی‌یە یـەکجار زۆرەکـانی زینـدەوەران بـە دەسـتی ئـەو هەموو زیندەوەرانەی کـە ئـەم کارەیـان هـەرگیز لـە وزە و توانـادا نی‌یـە و، بێ ئـەوەی بە خۆیـان بزانـن یـان حسـابیان بـۆ کردبێـت، ئـەو پێداویسـتی و ڕۆزی‌یانـەیان تەسـلیم دەکرێت.. هەروەها ڕۆشتنی گەردیلەکانی خۆراك بۆ بنیاتنانی خانەکانی لەش..

ئەمانە و کارەکانی تری هاوچەشنیان لـە نموونـە زۆرەکـانی ڕاسـتیی "هاوکـاری" کـە ڕاسـتی‌یەکە پـەروەردگار ڕام و گوێڕایـەڵی کـردووە و بـە میـهرەبانیی خۆیشـی خسـتوویەتیەکار.. بـەڵێ، هـەموو ئەمانـە – بـە ڕوونـی – پـەروەردگارێتیی گشـتی و هەمەلایـەنگیر و میـهرەبانیی فـراوان و گشـت لایەنـەی پـەروەردگاری جیـهانیان، دەردەخـەن! ئـەو پـەروەردگارەی کـە سەرانسـەری گـەردوون بـە وێنـەی ئاسـانیی بەڕێوەبردنی کۆشکێك بەڕێوە دەبات.

بەڵێ، ئەم شتە هاوکارانەی کە بێ گیان و هەست و سۆزن، بە ئاشکرا چـەندین بـاری ئەوتۆ دەردەخەن کە سۆز و هەست و شعووریان پێوە دیـارە! ئەمـەش بەڵگەیـەکی گەلـێ ڕوونـە لەسـەر ئـەوەی کـە: دەستێك پاڵیـان پێـوە دەنێـت و دەیانخاتـەکار بـۆ هاوکـاری و یارمەتیدان و فریاگوزاریی یەکتر. کەواتە هەموو ئەوانە بە: هێز و، فەرمان و، میـهرەبانیی پـەروەردگارێکی شـکۆمەند و، دانـایی کەسـێکی خـاوەن دانـایی و میـهرەبانیی ڕەهـا ڕادەپەڕن و ئەو کارانە ئەنجام دەدەن.

بـەم جـۆرە، ئـەو "هاوکـاری"یـە گشـتی‌یەی کـە لـە "گـەردوون"دایـە و.. ئـەو "هاوسەنگی"یە گشـت لایەنـەی کـە بـە ڕێکوپێکیـی تـەواو لـە گەردووندا کـاری خـۆی جێبەجێ دەکـات و.. ئـەو "پارێزگـاری"یـە هەمەلایـەنگرەی کـە هـەر لـە گەلەسـتێرە و گەڕۆکەکانەوە تـا دەگاتـە کۆئەندامـە وردەکـانی زینـدەوەر، تەنانـەت گەردیلـەکانی جەستەشی، دەگرێتـەوە.. هـەروەها ئـەو "ئارایشـتکاری"یـەی کـە قەڵـەمی ئارایشـتدانی بەسەر ڕووی ئاسمانـە درەخشـانەکان و ڕووی گەشی زەوی‌یـەوە، تەنانـەت ڕووی گوڵـە

جوان و ڕەنگینەکانیشیەوە، هەمیشە لە کاردایە.. ئەو "ڕێکخستن"ەی کە هەر لە "ڕێی کاکێشان"ەوە تا "کۆمەڵەی خۆر" و دەنکی گەنمە شامی و هەنار و هاوچەشنیان، فەرمانڕەوا و دەستەلاتدارە.. ئەو "خستنەکار"ەی کە هەر لە خۆر ومانگ و توخمەکان و هەورەوە تا دەگاتە مێروولە و هەنگ، دەگرێتەوە..

ئەمانە و هاوچەشنیان، لە ڕاستییە هەرە مەزنەکان، کە هەر یەکەیان شایەتییەکی گەورەی بە ئەندازەی خۆیان دەدەن، باڵی دووهەمی شایەتیی گەردوون پێکدەهێنن لەسەر: "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورە و ئەم بوون و یەکتاییەی خواوەند دەچەسپێنن.

جا مادەم پەیامەکانی نوور ئەم شایەتییە مەزنەیان چەسپاندووە و ڕوونیان کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا بەم ئاماژە یەکجار کورتە واز دەهێنین.

هەر بەم جۆرەش، لە پلەی هەژدەهەمی مەقامی یەکەمدا ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو وانە ئیمانییە کراوە کە ئەم گەشتیارە لە گەردوونەوە وەری گرت:

(لا إله إلاّ الله الواجبُ الوجودُ، الممتنعُ نظيره، الممكنُ كل ما سواه، الواحد الأحد الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته: هذه الكائنات الكتاب الكبير المجسّمُ والقرآنُ الجسمانيُّ المعظَّمُ والقصرُ المزيَّنُ المنظَّمُ والبلدُ المحتشَمُ المنتَظَمُ، بإجماع سُوَرِه وآياته وكلماته وحروفه وأبوابه وفصوله وصحفه وسطوره، واتفاق أركانه وأنواعه وأجزائه وجزئياته وسكنته ومشتملاته وارداته ومصارفه. بشهادة عظمة إحاطة حقيقة: "الحدوث والإمكان" بإجماع جميع علماء علم الكلام.. وبشهادة حقيقة: تبديل صورته ومشتملاته بالحكمة والإنتظام وتجديد حروفه وكلماته بالنظام والميزان.. وبشهادة عظمة إحاطة حقيقة: "التعاون والتجاوب والتساند والتداخل والموازنة والمحافظة" في موجوداته بالمشاهدة والعيان).

* * *

## ١٩

پاشـان ئـەم گەشـتیارەی کـە هاتـە دنیـا و بـە دوای بەدیهێنـەریدا گـەڕا و بـەهۆی میعراج(پلیکانە)یێکی ئیمانی‌یەوە بە هەژدە پلەدا سەرکەوت تا گەیشتە "عەرشی ڕاستی"، لە پلەی: "ناسینی غیابی و نادیار"ەوە بەرەو پلەی: **"ئامـــادەیی و گفتوگـۆی ڕووبـەڕوو"** بەرز بووەوە.

ئەم گەشتیارە شەیدا و تاسەمەندە، بە "گیان"ی خۆی وت:

– سوپاس و ستایشە غیابی‌یـەکانی سـەرەتای سـوورەتی "فاتیحـە" تـا دەگاتـە وشـەی: ﴿إِيَّاكَ﴾ دڵنیایی‌یەکی ئەوتۆ بە مرۆڤ دەبەخشێت کە بۆ پلەی گوفتاری ڕووبەڕووانەی: ﴿إِيَّاكَ﴾ بەرزی دەکاتەوە. دەبا ئێستا ئێمەش پرسیارەکەمان لە بارەی ئەو کەسەی کە لێی دەگەڕێین ڕاستەوخۆ ئاراستەی خۆی بکەین و واز لە پرسـیار و لێکۆڵینـەوە و لێگـەڕانی نادیـار بـهێنین. ئـەوەتا پرسـیار لـە بـارەی ئـەو خـۆرەی کـە هـەموو شـتێکی ڕوونـاك کردووەتەوە دەبێت لە خۆی بکرێت، چونکە بێ گومان ئـەو کەسـەی کە هـەموو شـتێك دەردەخات و ڕوونی دەکاتەوە، خۆی لە هەموو شتێك ڕوونـتر دەردەخـات و پـتر ڕوونـی دەکاتەوە.

خۆ هـەروەك دەتوانـین لـە ڕێـی تیشـك و ڕووناکی‌یەکـەی خـۆرەوە "خـۆر" بناسـین، دەشتوانین بەپێی توانا و لێهاتنمان لە ڕێی دەرکـەوتن و درەوشـانەوەی نـاوە جوانـەکان و ڕووناکیی سیفەتە مەزنەکانی بەدیهێنەرمانەوە هەوڵی ناسینی بدەین.

جا لەم پەیامەدا، لە نێوان ڕاستی‌یە زۆر و دوور و درێژەکـاندا، بـە کورتـی تەنـها دوو دانە پلەی بێ کۆتایی نێوان ڕێگا زۆرەکانی ئەم مەبەستەمان، باس دەکەین:

❑ **ڕاستیی یەکەم:** ڕاستیی "کارایی زاڵ و هەمەلایەنگر"

ئەو کارایی(فعاليـــة) و چالاکی‌یـەی کـە بەسـەر هـەموو گـەردووندا زاڵـە و بـە چـاو دەیبینین و، هەموو بوونەوەرە گشتگیر و هەمیشەیی و ڕێکوپێك و سـامناکەکانی زەوی و ئاسمانـەکان بـەڕێوە دەبـات و دەیـانگۆڕێت و نوێیـان دەکاتەوە.. ئـەو کارایی‌یـەی کـە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئـەوەی بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی هەست بـە "ڕاستیی خـۆ ئاشـکرا کردنی پەروەردگاری" بکات لە نێوان ڕاستیی ئەو کارایی و چالاکی‌یەی کە لـە هـەموو

لایەكەوە بە دانایی دەورە دراوە. ئەم هەست كردنەش بە ئاشكرا و بەداهەت مرۆڤ دەگەیەنێتە پەی بردن بە "ئاشكرا بوونی خوایەتیی خوای گەورە" لە نێوان ڕاستیی ئەو پەروەردگاریێتی‌یەی كە لە هەموو لایەكەوە تیشكی میهرەبانیی لێ دەدرەوشێتەوە.

واتە لە پشت پەردەی ئەم كارایی و چالاكی‌یە هەمەلایەنگر و دانا و هەمیشەیی‌یەوە، هەست بە "كارەكانی" بكەرێكی بەتوانا و زانا دەكرێت، بە چەشنێكی هێندە ڕوون كە دەڵێی بە چاو دەبینرێت و..

تا ڕادە و پلەی هەست پێ كردن و بەڵگەنەویستی و لە نێوان ئەم كارە پەروەردگاری‌یانەی كە دارای پەروەردە و كارسازین، "ناوە جوانەكانی خوای گەورە" دەزانرێن كە لە هەموو شتێكدا ڕەنگ دەدەنەوە..

هەروەها لە پشت پەردە و لە ڕێی ئەو ناوانەی كە بە شكۆمەندی و جوانی دەدرەوشێنەوە، بوون و هاتنەدیی هەر "حەوت سیفەتە" خاوێن و پیرۆزەكانی خوای گەورە بە "علم الیقین" بەڵكو بە "عین الیقین" تەنانەت بە "حق الیقین"یش دەزانرێن و دەناسرێن..

هەروەها بە زانینێكی بێ گومان و بەڵگەنەویست و ڕوون و، بەوپەڕی دڵنیایی و بە شایەتیی گشت بەدیهێنراوان، بوونی: سیفەتدارێكی "واجب الوجود" و ناودارێكی تاك و تەنیا لە تیشكدانەوە بێ كۆتایی‌یەكانی ئەو حەوت سیفەتانەوە دەزانرێت.

كەواتە "بوونی خوای گەورە" لە بەرچاوی بینایی دڵدا، گەلێ ڕوون و ئاشكراترە لەچاو ئاشكرایی خۆر لە بەردەم چاوی سەردا. ئیتر ئەم بینایی‌یەی دڵی مرۆڤ، وەك بە چاو ببینێت، ئاوا پەی بە "بوون"ی ئەو خواوەندە گەورەیە دەبات.

چونكە بێ گومان هەموو كتێبێكی قەشەنگی پڕ واتای نایاب و جوان و، گشت خانووبەرەیەكی ڕێكوپێك، داخوازی كاری: "نووسین" "بیناكردن"ن.. ئنجا كاری نووسینی جوان و بینای ڕێكوپێكیش - وەك ئاشكرایە - داخوازی دوو ناوی: "نووسەر" و "بەننا"ن.. ئەم دوو ناوەش - وەك بە ڕوونی دیارە - داخوازی "سنعەت و سیفەتی: نووسین و بیناكردن"ن.. ئەم دوو سنعەت و سیفەتەش - بە جۆرێكی بەڵگەنەویست - داخوازی بوونی "زات"ێكن كە دارای ئەو سیفەتانە بێت و سنعەتكاریان بێت و، خاوەنی ئەو ناوانە و بكەری ئەو كارانە بێت. چونكە هەروەك ناگونجێ كاری "بێ بكەر" و ناوی "بێ خاوەن ناو" هەبێت، بە هەمان جۆر نایشگونجێ سیفەتێكی بێ خاوەن سیفەت و سنعەتێكی بێ سنعەتكار ببێت!

بەم پێیە و لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی و دەستوورە، ئەو بڕیارە دەچەسپێت کە:

ئەم گەردوونە – بە هەموو بوونەوەرانی ناویەوە – تێکڕا بە قەڵەمی قەدەری خوای گەورە نووسراوە و، بە چەکوشی قودرەتی ئەویش بینا کراوە. ئەوەتا چەندەها شتانی بێ سنووری وای تێدا نووسراوە کە لە حوکمی کتێب و نامیلکەی پڕ واتای ناسك و جواندان.. هەروەها چەندین شتی لەژمارەبەدەری ئەوتۆشی تێدا بینا کراوە کە لە حوکمی کۆشك و تەلار و خانووبەرەدان. جا یەك بە یەکی ئەوانە بە هەزاران ڕوو، هەمووشیان پێکەوە بە چەندەها ڕووی بێ سنوور ئاماژەی لەژمارەبەدەر دەکەن بۆ: کارە پەروەردگاری و میهرەبانی‌یە نەبڕاوەکان و درەوشانەوە بێ سنوورەکانی سەد و یەك ناوی جوانی خوای گەورە، کە سەرچاوەی ئەو کارانەن. هەروەها بە درەوشانەوە بێ کۆتایی‌یەکانی هەر حەوت سیفەتە خوایی‌یەکان – کە سەرچاوەی ئەو ناوە جوانانەن – شایەتی دەدەن و ئاماژە دەکەن بۆ: پێویستیی "بوون" و "تەنیایی" زاتێکی مەزنی ئەزەلی و هەمیشەیی ئەوتۆ کە خاوەنی ئەو حەوت سیفەتە گشتگیرە خاوێن و پیرۆزانەیە و سەرچاوەیانە.

هەروەها هەرچی ڕووەکانی: "جوانی" و جۆرەکانی: "تەواوی" و "بەهاداری"ی ناو بوونەوەران هەن و، سەرجەم جوانی و کەماڵی قودسی و بێگەرد و شایانی ئەو کارە پەروەردگاری و ناوە خوایی و سیفەتە صەمەدانی و کاروبارە خوایی‌یانەن.. هەموویان، چ بە تەنها و چ بە کۆمەڵ، شایەتیی‌یەکی ڕوونی بەڵگەنەویست دەدەن لەسەر: "جوانیی خاوێن و کەماڵی بێ گەردی زاتی خوای گەورە".

هەروەها ڕاستیی: ئەو "پەروەردگاریتی‌یە ئاشکرابووە"ی کە لە نێوان ڕاستیی: "کارایی هەمەلایەنگر"دا دەردەکەوێت، هەردەم خۆی دەردەخات و هەمیشە خۆی دەناسێنێت لە ڕێی: کاروبار و هەڵسوکەوتەکانی لەو بەدیهێنان و دروستکردن و داهێنانەدا کە بە زانایی و دانایی ئەنجام دەدرێن و.. لەو ئەندازەکاری و شێوەکێشان و کارسازی و بەڕێوەبردنەی کە دارای ڕێسا و تەرازوون و.. لەو ئاڵوگۆڕ و دابەزاندن و تەواوکاری‌یانەدا کە بە ویست و مەبەست جێبەجێ دەکرێن و.. لەو خۆراك و نیعمەت و چاکەبەخشین و ڕێزگرتنانەشدا کە بە شەفەقەت و میهرەبانی دەدرێن و دەبەخشرێن.

هەروەها "ڕاستیی دەرکەوتنی خوایەتیی خوای گەورە" کە بە جۆرێکی ڕوونی بەڵگەنەویست لە نێوان ڕاستیی: "ئاشکرابوونی پەروەردگاریتی"دا هەیە و هەستی پێ دەکرێت، ئەم ڕاستیيەش بە هەمان جۆر، بە: درەوشانەوەی ناوە جوانە خاوەن سۆز و بەخشندەییەکان و، بە: درەوشانەوەکانی لەمەڕ جوانی و شکۆمەندیی هەر حەوت سیفەتە ثبوتییەکان، خۆی دەناسێنێت. ئەو حەوت سیفەتانەی کە بریتین لە: "ژیان" و "زانست" و "توانست" و "ویست" و "بیستن" و "بینین" و "ئاخاوتن".

بەڵێ، هەروەك سیفەتی: "ئاخاوتن" لە ڕێی سرووش و ئیلهامەکانەوە زاتی خاوێنی خوای گەورەمان پێ دەناسێنێت، سیفەتی "توانست"یش لە ڕێی دەرخستنی ئاسەوار و جێدەستە بێ وێنە و ناوازەکانی زاتی مەزنی پەروەردگارەوە خوای گەورەمان پێ دەناسێنێت. ئەو ئاسەوار و جێ دەست و جێکارانەی کە وەك وشەی بەرجەستەی ئەو توانستەن و وەسفی خاوەن توانایەکی شکۆمەند دەنوێنن..

جگە لەمە، سیفەتی "توانست" زاتی خوای گەورەمان بەوەش پێ دەناسێنێت کە ئەم پەڕ و ئەوپەڕی گەردوونمان وەك قورئانێکی بەرجەستە دەخاتە پێش چاو.

سیفەتی: "زانست"یش، بە هەمان جۆر، زاتی خوای تاك و تەنیای خاوەنی ئەو سیفەتەمان بە ئەندازەی هەموو دروستکراوە پڕ لە دانایی و ڕێکوپێك و وردەکان و.. بە ژمارەی گشت ئەو بوونەوەرانەی کە بە: "زانست" دەبرێن بەڕێوە و کاریان ساز دەکرێت و ئارایشت دەدرێن و لێك جیا دەکرێنەوە، پێ دەناسێنێت.

سەبارەت بە سیفەتی: "ژیان"یشەوە، ئەوا: هەرچی نیشانە هەن کە بەڵگەی "توانست"ن و.. گشت ئەو شێوە و بارودۆخانەی کە دارای ڕێکوپێکی و دانایی و تەرازوو و ئارایشتدان و، بوونی سیفەتی "زانست" ڕادەگەیەنن و، هەموو ئەو بەڵگانەش کە هەواڵی سیفەتە مەزنەکانی ترمان دەدەنێ.. لەگەڵ بەڵگەکانی سیفەتی "ژیان" خۆیشیدا، تێکڕا و سەرجەم سیفەتی "ژیان" دەچەسپێنن!

ئنجا خودی "ژیان" بە گشت ئەو بەڵگانەیەوە کە باس کران، سەرانسەری گەردوون و سەرجەم زیندەوەران - کە وەك ئاوێنەی ژیان وان - لە شێوەی ئاوێنەیەکی یەکجار مەزندا دەردەخات کە لە چەندەها ئاوێنەی لەژمارەبەدەر و بێ سنووری هەمیشە بگۆڕ و تازەوەبوو پێکهاتبێت، تاکو هەموو درەوشانەوە بێ وێنە و نەخشە ڕەنگینە جۆراوجۆرەکان - لە هەموو کاتێکدا - بە تازەیی و پاراوی پیشان بدات.

بە وێنەی ئەم سیفەتانەی باس کران، یەك بە یەکی سیفەتەکانی: "بینین" و "بیستن" و "ویست" و "ئاخاوتن"یش - بە هەمان جۆر - زاتی خاوێنی خوای گەورە، بە ئەندازەی فراوانیی گەردوون، دەناسێنن و تێمانی دەگەیەنن..

ئنجا هەروەك ئەو سیفەتانە بەڵگەن لەسەر بوونی زاتی مەزنی خوای گەورە، بە هەمان جۆر و بە ئاشکرایی بەڵگەشن لەسەر: بوون و هاتنەدیی سیفەتی "ژیان" و لەسەر ئەوەش کە ئەو خواوەندە: "زیندوو"ە و دارای "ژیان"ە. چونکە "زانین" نیشانەی ژیانە.. "بیستن" ئاماژەیە بۆ بوونی ژیان.. "بینین" تایبەتە بە زیندەوەرانەوە، کە خاوەنی ژیانن.. "ویست" لەگەڵ ژیاندا دەبێت.. "توانستی ئیختیاری"یش تەنها لە شتانی خاوەن ژیاندا هەیە.. "ئاخاوتن"یش تەنها هی زیندووە خاوەن هەستەکانە.

بەم جۆرە و لەم خاڵانەوە تێدەگەین کە: سیفەتی "ژیان" حەوت ئەوەندەی فراوانیی گەردوون بەڵگەی لەسەرە و، بوونی خۆی و وەسفدارە "زیندوو"ەکەی دەناسێنێت. بە رادەیەك کە "ژیان" بووە بە کان و بناغەی هەموو سیفەتەکان و، سەرچاوە و خولگەی "ناوی هەرە مەزن"ی خوای گەورە.

لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور" شتێکیان لەم ڕاستییە سەرەتایی و یەکەمە ڕوون کردووەتەوە و، بە چەندین بەڵگەی چەسپێنەری گومانبڕ چەسپاندوویانە، ئەوا ئێستا بەم دڵۆپە لەو دەریایە واز دەهێنین.

❑ **ڕاستیی دووهەم:** فەرمایشتی خوایی کە لە سیفەتی "ئاخاوتن"ەوە هاتووە.

قسەکردن و ئاخاوتنی خوای گەورە بێ کۆتاییە، بەپێی نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە:

**﴿قُل لَوْ كانَ الْبَحْرُ مِداداً لِكَلِماتِ رَبّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أنْ تَنْفَدَ كَلِماتُ رَبّي﴾**(الكهف:١٠٩).

ئاخاوتن(قسەکردن) ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر بوونی قسەکەر. واتە ئەم ڕاستییە (ڕاستیی گوفتار و فەرمایشتی خوایی) شایەتێکی بەردەوام و بێکۆتایی دەدات لەسەر "بوون" و "یەکتایی" قسەکەری ئەزەلی کە خوای گەورەیە.

لە پلەی چواردەهەم و پازدەهەمی ئەم پەیامەدا - لە ڕووی سرووش و ئیلهامەوە - دوو شایەتی بۆ ئەم ڕاستییە هێنراوە و ڕوون کراوەتەوە. لە پلەی دەهەمیشدا، کە ئاماژەی بۆ کتێبە پیرۆزە ئاسمانییەکان تێدا کراوە، شایەتییەکی فراوانی تر باس کراوە.

لە پلەی حەڤدەهەمیشدا – کە باسی قورئانی پیرۆزی ئیعجازبەخشە – شایەتی‌یەکی تری ڕوون و ئاشکرا هەیە لەسەر ئەم ڕاستی‌یە. لەبەر ئەوە، ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە و شایەتی‌یەکانی بەو پلە ناوبراوانە دەسپێرین.

بەم جۆرە، نوور و نهێنی‌یەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿**شَهِدَ اللهُ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وأُلوا الْعِلْمِ قائِماً بِالْقِسْطِ لا إِله إِلاّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ**﴾ (آل عمران:١٨) کە بە ڕاگەیاندنێکی ئیعجازبەخش ئەم ڕاستی‌یەی ڕاگەیاند و شایەتیی خۆی لەگەڵ شایەتی‌یەکانی تردا خستەڕوو، سەروزیادی هاوڕێ گەشتیارەکەمان بوو، بە ڕادەیەك کە نەیتوانی پشتگوێی بخات و سنووری بشکێنێت.

لە پلەی نۆزدەهەمی مەقامی یەکەمیشدا، ئاماژەیەك بۆ چەند واتایەکی کورت و پوختی ئەو دەرسانە کراوە کە ئەم ڕێبوارە لەو مەقامە خاوێنەدا دەستی کەوت و فێری بوو:

> (لا إله إلاّ الله الواجبُ الوجودُ الأحدُ الصمدُ له الأسماءُ الحُسنى وله الصفات العليا وله المثلُ الأعلى الذي دلّ على وجوب وجوده في وحدته: الذات الواجب الوجود باجماع جميع صفاته القدسية المحيطة، وجميع أسمائه الحسنى المتجلية باتفاق جميع شؤوناته وأفعاله المتصرفة. بشهادة عظمة حقيقة: تبارز الألوهية في تظاهر الربوبية في دوام الفعالية المستولية بفعل الإيجاد والخلق والصنع والإبداعِ بإرادة وقدرة، وبفعل التقدير والتصوير والتدبير والتدوير بإرادة وحكمة، وبفعل التصريف والتنظيم والمحافظة والإدارة والإعاشة بقصد ورحمة، وبكمال الإنتظام والموازنة وبشهادة عظمة حقيقة أسرار:
>
> ﴿**شَهِدَ اللهُ انَّهُ لا اله الاّ هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وأُلوا الْعِلْمِ قائِماً بِالْقِسْطِ لا اله الاّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ**﴾...).

* * *

# بێدار کردنەوەیەك

هەموو یەکێك لەو ڕاستی و شایەتی‌یانەی نۆزدە پلەکانی (بەشی یەکەم) کە تا ئێستا باس کران، بەڵگەن لەسەر "تاکی" و "تەنیایی" لەو ڕووەوە کە "تەنیایی" گشتگیر و دەورەدەرە بە هەموو شتێك. بەڵام لە پێشدا بەڵگەکانی پێویستیی "بوون"ی خوای گەورە لە (بەشی یەکەم)دا خرانە ڕوو، چونکە ئەو بەڵگانە ڕاستەوخۆ و بە ڕاشکاوی "بوون"ی خوای گەورە دەچەسپێنن.

بەڵام (بەشی دووهەم) لەبەر ئەوەی یەکەم جار و ڕاستەوخۆ "یەکتایی" ئنجا لە نێوان "یەکتایی"دا "بوون"یش دەچەسپێنێت، ئەوا ناونرا: "بەڵگەکانی یەکتایی". دەنا هەردوو بەشەکە - یەکەم و دووهەم - پێکەوە "بوون"و "یەکتایی" خوای گەورە دەچەسپێنن. بەڵام بۆ مەبەستی جیاکردنەوەیان لە یەکتر. لە بەشی یەکەمدا بڕگەی: "بشهادة عظمة إحاطـة حقيقـة..." و، لە دووهەمیشدا بڕگەی: "بمشهادة عظمة إحاطة حقيقة..." دووپات بوونەتەوە، کە ئەمەی دووهەمیان ئاماژەیەکی ئەوەندە ڕوون و ئاشکرای "یەکتایی" خوای گەورەیە دەڵێیت بە چاو دەبینرێت!

نیازم وابوو پلەکانی بەشی دووهەمیش - وەك هی یەکەم - ڕوون بکەمەوە. بەڵام لەبەر چەند بارودۆخ و ڕێگرێك ناچار بووم کورتیان بکەمەوە. لەبەر ئەوە و بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەم بەشە، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی پەیامەکانی نوور دەکەین.

* * *

# بەشی دووهەم

## بەڵگەکانی "یەکتایی"

(ئەو ڕێبوارەی کە لە پێناوی ئیماندا نێررایە دنیا و، گەشتێکی بیرەکیی بەناو جیهانی بوونەوەراندا سازدا، تاکو پرسیار لە هەموو شتێك بکات لە بارەی بەدیهێنەریانەوە و، لە گشت جێیەکدا بە پەروەردگاری خۆی شاد و ئاشنا ببێت. لە ئەنجامیشدا تا پلەی: "حق اليقين" باوەڕ و ئیمانی بە: "پێویستیی بوون"ی خوای خۆی دامەزرا، کە پێشتر لێی دەگەڕا..

ئەم گەشتیارە، ڕووی لە ژیریی خۆی کرد و پێی وت:

– وەرە با پێکەوە بۆ گەشتێکی نوێی تر بڕۆین و، لەم گەشتە نوێیەدا چەند بەڵگەیەك ببینین کە بە "یەکتایی" بەدیهێنەری شکۆمەندمان بگەیەنێت.

ئنجا خۆی و ژیریی پێکەوە و بەوپەڕی تامەزرۆیی و تاسەمەندی قۆڵیان بە قۆڵی یەکتردا کرد و کەوتنە گەڕان و لێکۆڵینەوە لە بارەی "بەڵگەکانی یەکتایی خوای گەورە".

هەر لە یەکەم مەنزڵی گەشتەکەیاندا چوار "ڕاستی"ی پیرۆز و خاوێنیان بینی کە گشت لایەکی گەردوونیان گرتووەتەوە و، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی داخوازی: "یەکتایی" خوای گەورەن).

## ٢٠

**ڕاستیی یەکەم: خوایەتیی ڕەها**

سەرقاڵ بوونی هەموو یەکێك لە دەستە و تاقمەکانی گرۆی مرۆڤ بە یەکێك لە جۆرەکانی پەرستش بە چەشنێکی ئەوتۆ کە دەڵێی پەرستشێکی سروشتیی خۆیانە.. هەروەها ئەنجامدانی خزمەت و فەرمانبەرییە سروشتییەکان – کە لە حوکمی جۆرێکی پەرستشدان – لە لایەن "زیندەوەران" تەنانەت "بێ گیانەکان"یشەوە.. هەروەها بوونی هەریەك لەو نیعمەت و بەخششە ماددی و مەعنەوییانەی کە سەرانسەری گەردوونیان گرتووەتەوە، بە: هۆیەکی "پەرستن" و "شوکرانەبژێری بەرامبەر "پەرستراوی"یەکی ئەوتۆ کە بۆ ڕێگاکانی پەرستن و سوپاسگوزاری ڕێنمایییان دەکات.. هەروەها ڕاگەیاندنی "پەرستراوی"ی خوای تاك و تەنیا لە لایەن "وەحی" و "ئیلهام"ەوە کە لە جیهانی پەنهانی غەیبەوە و بە چەشنێکی مەعنەوی ئەمەیان لێ درەوشاوەتەوە و بۆیان دەرکەوتووە و ئنجا ڕایانگەیاندووە..

هەموو ئەمانە، بێ هیچ گومانێك و بە تەرزێکی بەڵگەنەویست و دڵنیاییبەخش "خوایەتیی تەنیا و ڕەها" و "زاڵبوون و دەستەڵاتداریی ئەو خوایەتییە ڕەهایەمان بەسەر هەموو شتێکدا" بۆ دەچەسپێنن.

مادەم ڕاستییەکی وەك ئەم "خوایەتییە ڕەهایە" هەیە و دارای "بوون"ە، ئەوا هەرگیز بە بوونی "هاوبەش" ڕازی نابێت، چونکە، ئەوانەی کە لە بەرامبەر ئەو خوایەتییە (واتە: ئەو پەرستراوییە)وە شوکرانە و پەرستش دەنوێنن چەند بەرێکی خاوەن هەستی چڵەپۆپەی درەختی بوونەوەرانن. لەبەر ئەوە، گریمانی بوونی کەسانی تر کە سەرنجی ئەو خاوەن هەستانە بۆ لای خۆیان ڕابکێشن و سوپاسگوزار و منەتباریان بکەن بۆ خۆیان و بیانەوێت لەم ڕێیەوە پەرستراوی ڕاستەقینەیان لەبیربەرنەوە (کە دەگونجێ لە بیریان بچێت، چونکە لە بەرچاویاندا دەرناکەوێت) ئەم گریمانە، دژ و پێچەوانەی ڕاستی و ناوەڕۆکی ئەو خوایەتییە و ئامانجە قودسییەکانیەتی و هەرگیز پێی ڕازی نابێت.

ئا لێرەوەیە کە قورئانی پیرۆز زۆر بە توندوتیژی دەستی بە ڕووی "هاوبەش"ەوە ناوە و، هەڕەشەی سزای دۆزەخیشی ئاراستەی ئەوانە کردووە کە هاوبەش بۆ ئەو خوایەتییە ڕەهایە بڕیار دەدەن.

* * *

# ٢١

## ڕاستی دووهەم: پەروەردگاریتیی ڕەها

ئەو هەڵسوکەوت و دەستکاری و دەستتێوەردانە گشتی و سەرتاسەری‌یەی کە لە لایەن دەستێکی پەنهانەوە کاری خۆی لەناو هەموو بوونەوەراندا ئەنجام دەدات و جێ‌دەستی خۆی بە ڕوونی دەنەخشێنێت، بە تایبەت پەروەردەکردن و ژیاندنی دانایانە و میهرەبانانەی زیندەوەران لە هەموو جێ و لایەکدا بە هەمان ڕێ و شێواز و بە چەشنێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوودەدات، هەرچەندەش ئەو زیندەوەرانە لە نزیك و تەنیشتی یەکترەوەن.. ئەم هەڵسوکەوت و دەستکاری‌یە گشتی و هەمەلایەنگرە لە ڕاستیدا چەند "نم" و "ڕووناکی"یەکی ئەوتۆن کە بەڵگەن لەسەر: "پەروەردگاری تاك و تەنیا و ڕەها" تەنانەت بەڵگەیەکی گومانبڕی "بوونی ڕاستەقینەی" ئەو پەروەردگاریتی‌یە ڕەهایەن.

جا مادەم تەنها "یەك دانە پەروەردگاریتیی ڕەها" هەیە، ئەوا هەرگیز بە بەشداری و هاوبەشایەتی ڕازی نابێت. چونکە گرنگترین ئامانج و مەبەستەکانی ئەو پەروەردگاریتی‌یە بریتی‌یە لە: دەرخستنی جوانیی خۆی و ڕاگەیاندنی کەماڵی و.. خستنەڕووی سنعەتە نایابەکانی و.. پیشاندانی داهێنانە ناوازە و بەهادارەکانی. خۆ هەموو ئەم مەبەستانەش لە گشت گیانلەبەرێکدا، تەنانەت لە شتە هەندەکی‌یەکانیشدا، کۆبوونەتەوە. لەبەر ئەوە، هەرگیز ناگونجێ و ڕێی تێناچێت کە ئەو "پەروەردگاریتی‌یە ڕەها و تاك و تەنیایە" بە بەشدار و هاوبەش قایل ببێت. چونکە هەر دەستتێوەردانێکی کوێرانەی هاوبەشایەتی(الشِّرك) لە هەر بوارێکدا - با هەندەکی و ساکار و بچووکیش بێت - ئەو گشت ئامانج و مەبەستانە تێکدەدات و هەڵیاندەوەشێنێتەوە و، سەرنجی زەینەکان لەو "ئامانجانە" و لەو "کەسەش کە کردوونی بە ئامانج و مەبەستی خۆی" وەردەچەرخێنێت و، ڕوویان پێ دەکاتە هۆکارەکان. خۆ ئەمەش - وەك ئاشکرایە - پێچەوانە و دژی ڕاستیی "پەروەردگاریتیی ڕەها"یە!

کەواتە دەبێت ئەم پەروەردگاریتی‌یە ڕەها و تاك و تەنیایە بە هیچ شێوەیەك ڕێ بە هیچ جۆرێکی بەشداری و هاوبەشایەتی نەدات.

ڕێنمایی‌یە زۆر و زەبەندە و هەمیشە بەردەوامـەکانی ئایـەت و وشـە و تەنانـەت پیـت و شێوەکانی قورئانی پیرۆز بۆ "یەکتایی"و تەقدیس و خاوێن ڕاگرتنی خـوای گـەورە، تەنـها لەم نهێنی‌یە مەزنەوە هەڵقوڵاوە و سەری هەڵداوە.

* * *

## ٢٢

**ڕاستیی سێهەم: کەماڵات**

بەڵێ، هەرچی دانایی بەرز و، جوانیی دەراسا و، یاسای دادگەر و ئامـانج و مەبەسـتی پڕ لە دانستی ناو بوونەوەران هـەن.. هـەموویان - بـە ئاشـکرا - بەڵگـەن لەسـەر بوونـی: "ڕاستیی کەماڵات". لە هەمان کاتیشدا شایەتێکی ئاشـکران لەسـەر: کـەماڵ و تـەواویی ئەو بەدیهێنــەرەی کـە ئـەم بوونەوەرانـەی لـە نەبوونـەوە بەدی‌هێناوە و، لـە هـەموو جێ و شوێنێکیشدا بە چەشنێکی دەراسای سەرنج ڕاکێش و ڕەنگین کاروباریان دەسازێنێت و بەڕێوەیان دەبات. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەمانە بەڵگەن لەسەر "کەماڵی مرۆڤ"یش، ئەو مرۆڤەی کە ئاوێنەی هەستیاری تیشکدەرەوەی درەوشانەوەکانی بەدیهێنەری مەزنە.

جا مادەم "ڕاستیی کەماڵات" لە بوونەوەراندا هەیە..

مادەم کەماڵی ئەو بەدیهێنەرەش کە ئـەم بەدیهێنراوانـەی ئـاوا بـە تـەواوی و کەماڵـەوە خولقاندووە، بێ‌گومان و چەسپاوە..

مادەم کەماڵی مرۆڤیش ڕاستە و چەسپاوە، ئـەو مرۆڤـەی کـە باشـترین بـەری درەختـی بوونـەوەرە و جێنشینی خوایـە لـە زەویـدا و بـەڕێزترین و خۆشەویسـت‌ترین بەدیـهێنراوی بەدیهێنەرە..

مادەم وایە..

ئەوا "بەشداری و هابەشایەتی" کە ڕوخساری ئەم بوونەوەرە خاوەن کەماڵ و دانستە ئاشـکرایانە دەگـۆڕێت و دەیکـات بـە تۆپـی یـاریی دەسـتی "ڕێکـەوت" و گاڵتـەجاڕی "سروشـت" و کوشـتارخانەیەکی ترسـناکی تـاریك بـۆ خـاوەن هەسـتان (چونکـە لـە ڕوانگـەی هاوبـەش بوونـەوە هـەموو شتێکی نـاو بوونـەوەر بـە پەلـە و بـێ ئامـانج بـەرەو تیاچوون دەترازێن و ڕووەو نەمان تلێر دەبنەوە)..

ئـەو بەشـداری و هاوبەشـایەتی‌یەی کـە مـرۆڤ بـەرەو نزمـترین پلـــەکانی ئـاژەڵ دادەبەزێنێت و لە پلەوپایەی مرۆڤ دادەگرێت و دەیکات بە بەدبەخت‌ترین بەدیـهێنراوی ناو گەردوون، لە کاتێکدا کە ئەم مرۆڤە دارای هێندە تەواوەتی و کەماڵە کـە بـە ئاشکرا شوێنەوار و ئاسەوارەکانی دەردەکەوێت..

ئەو بەشـداری و هاوبەشایەتی‌یەی کە پـەردەی بەسـەر ئاوێنـەکانی درەوشـانەوەی کەماڵی بەدیهێنەردا داداوەتەوە کە بریتین لـە گشت ئەو بوونەوەرانـەی شایەتی لـەسەر کـەماڵی بێ‌گـەرد و ڕەهـای بەدیهێنـەری بەخشـندە دەدەن. کـە بـەم پـەردە دادانەوەیـەش ئەنجامی کار و چالاکی و بەدیهێنەرێتیی ئەو خوایە هەڵدەوەشێنێتەوە!!

"بەشداری و هاوبەشـایەتی"یـەك ئەمـە واتـا و نـاوەرۆك و ئەنجامەکـەی بێـت، هـەرگیز ناگونجێ خاوەنی هیچ بناغەیەکی "ڕاستی" بێت و ناکرێت لە گەردووندا جێی ببێتەوە!!

جگە لەمانـەی بـاس کـران، لـە "تیشـکی دووهـەم"یشـدا کە سـێ دانـە بـەروبوومی "تـەوحید" ڕوون دەکاتـەوە، بە تایبـەت بـە بەڵگـەی گومـانبڕ و بـەهێزەوە لـە مـەقامی یەکەمیدا، بە درێژی بـاس کـراوە و چەسپاوە کـە "بەشـداری و هاوبەشـایەتی" سـنگ لـە کەمالاتی: خوایی و، ئادەمی و، گەردوونی دەردەپەڕێنێت و بە گژیاندا دەچێت و تێکیان دەدات.. لەبەر ئەوە، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو تیشکە ناوبراوە دەکەین.

* * *

## ٢٣

**ڕاستیی چوارەم: فەرمانڕەوایی ڕەها.**

بەڵێ، ئەو کەسەی بە سەرنجی فراوان و وردبینی‌یەوە بڕوانێتە بوونەوەران، لە شـێوەی وڵاتێکـی یـەکجار بەسـام و شـکۆی لەوپـەڕی کـارایی و مـەزنیدا دەیبینێــت.. هـەروەها بە"چەشنی شارێکی مەزنی ئەوتۆ لە پێش‌چاویدا دەردەکەوێت کە بە دانایی‌یەکی خـاوەن دەستەڵات و فەرمەنڕەوایی‌یـەکی لەوپـەڕی هێز و سام و شـکۆدا بـەڕێوە دەبرێـت. ئنجـا دەبینێت هەموو شتێك و هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی ناوی بەو کارەوە سەرقاڵە کە پێی سپێرراوە. چونکە ئایەتی پیرۆزی: ﴿ولله جُنودُ السَّـــموات والأرض﴾ (الفتـح:٧) واتـای سەربازێتیی هەموو بوونەوەران دەگەیەنێت، کە هەر لە "سوپا"ی گەردیلەکان و "هێز"ی ڕووەکـەکان و "تیـپ"ی ئاژەڵەکانەوە، تـا دەگاتـە "لـەشکر"ی ئەستێرەکان، سـەربازی پەروەردگارێتیی خوای گەورەن.

ئێمە جێبەجێ بوونی فەرمانە تەکوینی‌یە هەمەلایەنگرەکان و ڕایی بوونی فەرمانە جێبەجێ بووەکان و یاساکانی پادشای بێ گەرد لە یەك بە یەکی فەرمانبەرە بچووك و سەربازە هەرە مەزنەکاندا دەبینین و هەستیان پێ دەکەین.

ئەمەش بە ڕوونی بەڵگەیەکی قووڵە لەسەر بوونی: "فەرمانڕەوایەکی تەنیای ڕەها" و "فەرماندەیەکی تەنیای هەمەکی".

جا مادەم "فەرمانڕەوایی ڕەها و تەنیا" ڕاستی‌یەکە لە واقیعدا هەیە، ئەوا "هاوبەشایەتی" دارای هیچ بناغە و ڕاستی‌یەك نی‌یە، چونکە ئەو ڕاستی‌یە ڕوون و گومانبڕەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنێت: ﴿**لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللهُ لَفَسَدَتَا**﴾ (الأنبياء:٢٢) ئەوە دەردەخات کە ئەگەر چەند دەستێکی جیا جیا خۆیان لە تەنیا یەك شتی دیاری کراودا هەڵبقورتێنن و دەستی تێ وەربدەن و کاریگەری‌یان تیایدا ببێت، ئەوا ئەو شتە بە تەواوی دەشێوێت وتێکچوون و شپرزەیی چارەنووسی دەبێت. بۆ نموونە: ئەگەر لە یەك وڵاتدا دوو فەرمانڕەوا، بەڵکو لە یەك ناوچەدا دوو کاربەدەست هەبن، ئەوا - وەك ئاشکرایە - سیستەم و ڕێسا لەو شوێنەدا بە تەواوی تێکدەچێت و لە بریی "بەڕێوەبردن" کاری هەڕەمەکی و هەرا و هوریا لەو ناوچەیەدا زاڵ و دەستەڵاتدار دەبێت.

کەچی ڕێسایەکی هێندە ڕێك و ورد و قەشەنگ و گشتگیر لەم گەردوون و بوونەوەرانەدا هەیە کە هەر لە باڵی مێشوولەوە تا ئەستێرەکانی ئاسمان و، لە خانەکانی جەستەوە تا دەگاتە بورجی هەسارە گەڕۆکەکان، ئەو ڕێسایەیان لەسەر نەخشاوە. کە ئەمەش بە هیچ کلۆجێ - با بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت - ڕێ بە دەست تێوەردانی هیچ هاوبەشێك نادات.

ئنجا خودی "فەرمانڕەوایەتی"ش پلەیەکی هێندە بەسام و عیززەت و شکۆیە کە هەرگیز بوار بۆ بوونی دژ و نەیار و ڕکەبەر ناهێڵێتەوە. چونکە ڕێ پێدانی دژ و نەیار دەستدرێژی‌یە بۆ سەر ئەو سام و شکۆیەی خۆی و، پلەو پایەی عیززەتەکەی پێ دەشکێت.

بەڵێ "مرۆڤ" کە لەبەر لاوازی و دەستەوسانی و کۆڵەواریی خۆی پێویستی بە یارمەتیدەر هەیە و هانا بۆ یاریدەدەر دەبات، کەچی - کاتی وا هەیە - لە پێناوی

پاراستنی فەرمانڕەوایەتی‌یە كاتی و ڕواڵەتی و هەندەكی‌یەكەی خۆیدا ناچار دەبێت بـرای یان كوڕی جگەرگۆشەی خـۆی دەكوژێـت و لـەناوی دەبات! ئەمـە بەڵگەیـەكی ڕوونـە لەسەر ئەوەی كە "فەرمانڕەوایەتی" خۆی لە خۆیدا بوار بە بوونی دژ و نەیار نادات.

جـا ئەگـەر مرۆڤـی كۆڵـەواری دەسـتكورتی موحتـاجی یارمـەتی، لــە پێنـاوی فەرمانڕەوایەتی‌یــەكی هــەندەكیدا، بــەم ئەندازەیــە پارێزگــاریی ســەربەخۆیی فەرمانڕەوایەتی‌یەكەی بكـات، ئـەوا بـە هیـچ جۆرێـك ناگونجێ ئەو خوایـەی كـە دارای توانستی ڕەهایە و خاوەنی هـەموو گەردوونـە، بـە دەسـت‌تێوەردان و هاوبەشـایەتیی هیـچ كەسێك ڕازی ببێت لە كاروباری فەرمانڕەوایەتی‌یە خۆیی(ذاتي)یە پیرۆز و خاوێنەكەیدا، كە تەوەرەی پەروەردگاری‌یە ڕەها و خوایەتی‌یە ڕاستەقینە و هەمەكی‌یەكەیەتی!

لەبـەر ئـەوەی لـە مـەقامی دووهـەمی "تیشـكی دووهـەم" و گەلـێ شـوێنی تـری "پەیامەكانی نوور"دا ئەم ڕاستی‌یە تیشك بەخشـە بـە چـەندەها بەڵگـەی بـەهێز چەسپاوە، ئەوا خوێنەری بەڕێزیان بۆ لا ڕەوانە دەكەین.

* * *

بـەم جـۆرە، دوای ئـەوەی هـاوڕێ گەشتیارەكەمان ئـەم چـوار ڕاسـتی‌یانەی دی، تـا ڕادەی "پلەی بینین"یەكتایی خـوای گەورەی لەلا چەسپا و لـە نـاخی دڵیـدا جێگیر بـوو. لەمەشەوە ئیمانەكەی پتر پەرەی سەند و، بە هەموو توانا و هێزێكی دەستی دایـە دووپـات كردنەوەی: "لا إلهَ إلاّ الله وحْدَهُ لا شريكَ له".

لە مەقامی یەكەمی بابی دووهەمیشدا، بۆ مەبەستی ئاماژە كـردن بـۆ ئـەو وانەیـەی كـە ئەم گەشتیارە لـەم مەنزڵەدا دەستی كەوت، ئەمەی خوارەوە باس كراوە:

(لا إله إلاّ الله الواحد الأحد الذي دلَّ علـــى وحدانيتـــه ووجوب وجوده: مشاهدة عظمة حقيقة تبـــارز الألوهيـــة المطلقة، وكذا مشاهدة عظمة إحاطة حقيقة تظاهر الربوبيـــة المطلقة المقتضية للوحدة، وكذا مشاهدة عظمة إحاطة حقيقة الكمالات الناشئة من الوحدة، وكذا مشاهدة عظمة إحاطـة حقيقة الحاكمية المطلقة المانعة والمنافية للشركة).

* * *

●●

پاشان ئەم ڕێبوارە نەسرەوتەیە، لەگەڵ "دڵ"ی خۆیدا دوا و وتی:

- کە ئیمانداران، بە تایبەت سۆفی‌یان، هەمیشە "لا إله الا هو" دوویـات دەکەنـەوە و "یـەکتایی خـوا" ڕادەگەیـەنن و یـادی خەڵکیشـی دەخەنـەوە، ئـەم کـارەی ئـەوان ئـەوە دەگەیـەنێت کـە "تـەوحید" دارای چـەندین پلـەی یـەکجار زۆرە و، "یەکتاپەرسـتی"ش گرنگـترین فەرمانبـەریی خـاوێن و، شـیرینترین فـەرزی سروشـتی و، بـەرزترین پەرسـتنی ئیمانی‌یە.

جا مادەم وایـە، ئەوا - ئەی دڵەکەم! - وەرە بـا دەرگـای مـەنزڵێکی نوێـی تـری ئـەم خانەی پەندوەرگرتن و تاقیکردنەوەیـە بکەینـەوە، تـاکو لـەم ڕێیـەوە بـە پلەیـەکی دی لـە پلەکانی "تەوحید" شاد و ئاشنا ببین، چونکە ئەو تەوحیدە ڕاستەقینەیەی تا ئێستا بەدوایدا عەودالین و بۆی دەگەڕێین و لێی دەکۆڵینەوە، تەنها بریتی نی‌یە لە ناسینێکی هـەڵقولاوی بۆچوون(تەسەوور)ی مرۆڤ. بەڵکو ئەو تـەوحیدەی مەبەستمانە ئەوەیـە کـە لـە زانسـتی "مەنتیق"دا بەرامبەر بە "تەسـەوور" دانـراوە و بریتی‌یـە لـەو "تەسـدیق"ەی کـە لـە ڕاسـتیدا "زانـین"ە و ئـەنجامێکی هـەڵقولاوی بەڵگەیـە و، گەلـێ بـەرز و بلندتـرە لـە ناسـینێکی "تەسەووری"ی ڕووت.

کەواتە ئەو تەوحیدە ڕاستەقینەیە بریتی‌یە لە: بڕیار و تەسدیق و ملکەچ بوون و قبووڵ کردن، بە چەشنێ کە مرۆڤ بە پایەیەکی ئەوتۆ شەرەفمەند دەکات کـە بتوانێـت لـە ڕێـی هەموو شتێکەوە پەروەردگاری خۆی بدۆزێتەوە و، لە گشت شتێکدا ڕێیەك ببینێت کـە بە بەدیهێنەری بەخشندەی خۆی بگەیەنێت. ئیتر - پاش ئەمە - هیچ شتێك ڕێـی دڵنیـایی و ئارامی و هەمیشـە ئاگـاداربوونی لـە: چـاودێریی پـەروەردگاری، لـێ نـەگرێت. گـەر وا نەبوایە مرۆڤ ناچار دەبوو هەموو جارێ پەردەی سەر ڕوخساری بوونەوەرانی بدڕیایە و کوناودەری بکردایە، تاکو پەروەردگاری خۆی بناسیایە!!

لەبەر ئەوە، ئەم ڕێبوارە وتی: با لـە دەرگـای "ڕاسـتیی مـەزنی و گـەورەیی"(العظمـــة والكبرياء) بدەین و، بڕۆینە ناو مەنزڵی: "ئاسەوار و کردارەکان" و جیهانی: "بەدیهێنان و داهێنان"ەوە..

هەر ئەوەندەی پێی نایە ناو ئەو مەنزڵەوە، یەکسەر "پێنج ڕاستیی گشتگیر"ی بینـی کـە هـەموو لایـەکی بوونـەوەرانیان گرتووەتـەوە و، بـە ڕوونـی "تـەوحید" دەچەسـپێنن و داخوازی دەبن.

## ٢٤

**ڕاستیی یەکەم: ڕاستیی مەزنی و گەورەیی**

لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستی‌یە لە مەقامی دووەمی "تیشکی دووەم" و چەند جێ‌یەکی تری "پەیامەکانی نوور"دا بە بەڵگەوە ڕوون کراوەتەوە، وا لێرەدا تەنها ئەم ئەندازەیەی خوارەوەی لێ دەدوێین:

ئەو کەسەی گشت ئەو ئەستێرانەی بەدی‌هێناوە کە هەزاران ساڵ لە یەکتری‌یەوە دوورن..

ئەو کەسەی لە یەك کاتدا و بە یەك جۆر و شێوە دەستکاریی هەموو یەکێك لەو ئەستێرانە دەکات..

ئەو کەسەی کە چەندین تاکی لەژمارەبەدەری تەنها یەك جۆرە گوڵ - چ لە خۆرهەڵات و چ لە خۆرئاوا، لە باکوور یان لە باشووری زەوی ڕوابێت - بەدی‌دەهێنێت و، لە یەك کاتدا وێنەی ڕوخساری هەموویان بە یەك شکڵ و شێوە دەکێشێت..

ئەو کەسەی کە بە فەرمایشتی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّموات والأَرضَ فِي سِتَّةِ أَيَّام﴾ (الحديد:٤) هەواڵی سەرسوڕهێنەرترین ڕووداوی پەنهان و ڕابوردوومان دەداتێ و، ئەو ڕووداوەشمان بە ڕادەیەك بۆ دەچەسپێنێت کە دەڵێی ئا ئێستا لە بەردەمماندا ڕوودەدات، ئەمەش لە ڕێی بەدیهێنانی هاووێنەی ئەو ڕووداوەوە لەسەر ڕووی زەویدا، بە تایبەت لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا (چەندە کارێکی ڕەنگین و جوانە کە لەم وەرزەدا بە چاوی خۆمان سەد هەزار نموونەی "حەشری مەزن" دەبینین، کە لە ماوەی تەنها چەند حەفتەیەکدا پتر لە دووسەد هەزار جۆری ڕووەك و تاقمی زیندەوەران دروست دەکرێن و بەدی دەهێنرێن)..

بێ گومان ئەو کەسەی کە بەڕێوەبردن و پەروەردەکردنی تێکڕای ئەم حەشاماتەی بەدەستە و، بەوپەڕی ڕێکی و وردەکاری و، بێ هیچ هەڵە و لێ تێکچوون و ناتەواوی و دواکەوتن و پشتگوێ خستنێك، دەیان ژێەنێت و، لێکیان جیا دەکاتەوە و دەیانڕازێنێتەوە..

ئەو کەسەی ئەمانە ئەنجام دەدات، هەر ئەویشە کە خولانەوەی زەوی و ڕوودانی ڕێك و قەشەنگی دیاردەی شەو و ڕۆژی بەدەستە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕاشکاوی ڕایدەگەیەنێت: ﴿یولِجُ اللّیلَ في النهارِ ویولِجُ النهارَ في اللّیلِ﴾ (لقمان:٢٩) بەم خولانەوەیەی زەوی، سەرجەمی گۆڕانکاری و ڕووداوە ڕۆژانەکان لەسەر لاپەڕەی شەو و ڕۆژدا دەنووسێت و دەیانکوژێنێتەوە..

هەر ئەو کەسە - لە هەمان کات و ساتدا - ئاگای لە نهێنی و پەنهانەکانی گشت دڵ و دەروونێکە و، بە ویستی خۆی ئەوانیش بەڕێوە دەبات.

جا لەبەر ئەوەی هەموو یەکێك لەو کارانەی باس کران، کارێکی سەربەخۆ و تەنیا و تایبەتی‌یە، ئەوا دەبێت بکەرەکانیشیان تاك و تەنیا و بەتوانا و شکۆمەند بێت و خاوەنی "مەزنی و گەورەیی"یەکی ئەوتۆش بێت کە هەموو ڕەگێکی "هاوبەشایەتی" لە هەر جۆرێك و لە هەر شت و لا و جێگایەکدا بێت، ڕیشەکەن بکات و شوێنەواری نەهێڵێت.

جا مادەم ئەم "مەزنی" و "توانستە گەورەیە" هەن..

مادەم ئەم سیفەتی مەزنی‌یەش لەوپەڕی تەواوی و گشتگیری و ڕاستیدایە..

ئەوا هەرگیز ناگونجێ، ئەم دوو سیفەتە، ڕێ بە هیچ جۆرێکی "هاوبەشایەتی" بدەن.

چونکە هاوبەشایەتی: "پێویستی و کۆڵەواری" دەداتە پاڵ ئەو توانستە ڕەهایە و، "ناتەواوی"ش دەخاتە ئەستۆی ئەو مەزنی و کەماڵەوە و، ئەو گشتگیری‌یەش دەبەستێتەوە و کارێك دەکات کە ئەو بێ کۆتایی‌یە ڕەهایە "کۆتایی"پێ بێت!

دیارە کەسێك کە خاوەنی ژیری و هەست و شعوور و سروشتێکی ساغ بێت، ئەمەی پێ قبووڵ و ڕەوا نی‌یە.

کەواتە "هاوبەشایەتی" لەو ڕوانگەیەوە کە: سنگ لەو "مەزنی"یە دەردەپەڕێنێت و، دەمدرێژی دەکاتە سەر "عیززەت"ی خواوەندی شکۆمەند و، خۆی بە هاوبەشی "گەورەیی" ئەو دەردەخات، ئەوا تاوانێکی مەزنی هێندە بێ وێنە دەکات کە بواری بۆ هیچ لێخۆشبوون و چاوپۆشی‌یەك نەهێشتووەتەوە. قورئانی پیرۆزی خاوەن "ئیعجازی بەیان"یش، بە هەڕەشەی ئاشکرای توندوتیژ و ترسێنەر، گەورەیی ئەم تاوانە دەردەبڕێت. ئەوەتا دەفەرموێ:

﴿إنَّ اللهَ لا یغفِرُ أنْ یُشْرَكَ بِهِ ویغْفِرُ ما دونَ ذلِكَ لِمَنْ یشاءُ﴾ (النساء:٤٨).

## ٢٥

**ڕاستیی دووهەم: دەرکەوتنی کارە پەروەردگارییەکان بە شێوەیەکی ڕەها و گشتگیر**

ئەو کارانەی کە بە جۆرێکی ڕەها و گشتگیر هەڵسوکەوتیان لە هەموو بوونەوەراندا دەردەکەوێت.

دەستنیشان کردنی ئەم کارە ڕەهایانە تەنها لە لایەن "دانست"ی پەروەردگاری و "ویست"ی خوایی و "توانا و لێهاتن"ی ئەو شتانەوەیە کە ئەو کارانەیان تێدا دەردەکەوێت. واتە نە "ڕێکەوت"ی چەواشە و نە "سروشت"ی کەڕوکاس و نە "هێز"ی کتوکوێر و نە "هۆکار"ە وشك و بێ گیانەکان و نە "توخم"ە پەرتەوازەکان، هیچیان ناتوانن دەست لەو کارانە وەربدەن و خۆیانی تێدا هەڵبقورتێنن کە لەوپەڕی وردی و دانایدان و بە: بینایی و، حەیەوییەت و، ڕێکی و، مەحکەمی، ئەنجام دەدرێن. هۆکارەکانیش جگە لە چەند "پەردەیەك" هیچی تر نین کە توانستی کارگێڕ و بکەری خاوەن عیززەت و شکۆمەند، بەپێی فەرمان و ویست و هێزی خۆی، دەیانخاتە کار و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداریان دەکات.

لە نێوان هەزاران نموونەی ئەو کارە پەروەردگارییانەدا، دەمانەوێت لێرەدا سێ نموونە بخەینە ڕوو، لەوانەی کە سێ ئایەتی تەنیشتی یەکتری سوورەتی "النحل" ئاماژەیان بۆ کردوون. جا هەرچەند هەموو یەکێك لەو کارانە چەندەها سەرنجی وردی لەژمارەبەدەریان تێدایە، بەڵام ئێمە تەنها سیانیان لێ باس دەکەین:

**❁ ئایەتی یەکەم:**

**﴿وأَوْحى ربُّكَ إلى النَّحْلِ أنِ اتَّخِذي مِنَ الجِبالِ بيوتاً﴾** (النحل:٦٨).

بەڵێ، هەنگ، چ بە سروشت و چ بە کارەکانی، موعجیزەی توانستی پەروەردگارە. موعجیزەیەکی هێندە مەزنە کە سوورەتێکی گەورەی قورئانی پیرۆزی پێ ناونراوە. چونکە:

تۆمارکردنی هەموو بەرنامەکانی ئەرکە گرنگەکەی سەرشانی لە "سەر"ێکی بچووکی مەکینەیەکی گچکەی بەرهەمهێنانی هەنگویندا.. پاشان دانان و کوڵاندنی

خۆشترین و بەتامترین خواردەمەنی لەناو گەدە بچووکەکەیدا.. ئنجا هەڵبژاردنی جێی لەبار و شیاو بۆ دانانی ژەهرێکی کوشندە و لەناوبەری ئەندامی "زیندوو" لە چزووەکەیدا، بێ ئەوەی هیچ کارێك بکاتە سەر ئەندامەکانی تری جەستەی ئەو هەنگە..

هەموو ئەمانە، گەر بەوپەڕی وردی و، زانایی و، دانایی و، ویست و، هاوسەنگی و، ڕێکوپێکی نەبێت، هەرگیز ناگونجێ ئەنجام بدرێن. لەبەر ئەوە، شتانی بێ هەست و بێ ڕێسا و دوور لە وردەکاری و تەرازووی وەك: "سروشت"ی کەڕوکاس و "ڕێکەوت"ی کتوکوێر، هەرگیزاو هەرگیز، ناتوانن خۆیان لەم چەشنە کارە ناوازانەدا هەڵبقورتێنن.

بەم جۆرە، لەم سنعەتە خواییەدا سێ موعجیزەمان بەرچاو دەکەوێت و، هەمان کاری "پەروەردگاری"ش لە گشت هەنگە لەژمارەبەدەرەکانی سەر ڕووی زەویدا بە چاوی خۆمان دەبینین.

جا دەرکەوتنی ئەم کارە پەروەردگارییەی گشت هەنگێکی سەر ڕووی زەوی، بە هەمان دانایی و وردی و تەرازووکاری و، لە هەمان کاتدا و، بە هەمان شێوە.. بەڵگەیەکی ڕوونە کە بە ئاشکرا "یەکتایی" خوای گەورە دەچەسپێنێت.

❁ **ئایەتی دووهەم:**

**﴿وإنَّ لكُمْ في الأنْعامِ لَعِبْرَةً نُسْقيكُمْ مِمّا في بطُونِه مِنْ بيْنِ فَرْثٍ ودمٍ لبَناً خالِصاً سائغاً للشّارِبين﴾** (النحل:٦٦).

ئەم فەرمانە خواییە، سەرتاپا، دەرس و پەندی لێ دەچۆڕێت!

بەڵێ، ئەو شیرە سپی و بێ گەرد و خاوێن و ساف و بژێو و بەلەزەتەی کە خوای گەورە دەرخواردی ئێمەی دەدات و، لە کارگەکانی شیرەوە(مەمکی دایکان) بە تایبەت مانگا و حوشتر و بزن و مەڕدا، بە سەخاوەتمەندی، لە ناوەندی "سیخوڕ" و "خوێن"دا و، بێ تێکەڵی و لێڵبوون، هەڵدەقوڵێت..

هەروەها ڕواندنی ئەو میهر و شەفەقەتەی کە لە شیر شیرینتر و بەتامتر و بەنرخترە، لە سنگی ئەو دایکانەدا، کە هەندێ جار دەیانگەیەنێتە ڕادەی خۆنەویستی و فیداکاری..

هەموو ئەمانە، بێ هیچ گومانێك، پێویستیان بە پلەیەکی ئەوتۆی میهرەبانی و، دانایی و، زانین و، توانست و، ئیختیار دەبێت کە هەرگیز بە "ڕێکەوت"ە هەڕەمەکی و "توخم"ە سەرگەردان و "هێز"ە کوێرەکان ناکرێت ئەنجام بدرێت!

لەبەر ئەوە، ئەم هەڵسوکەوتەی کە لەم سنعەتە پەروەردگاری‌یەدایە و، هەمەلایەنگریی ئەم کارە خوایی‌یە و، دەرکەوتنی بە هەمان دانایی و وردەکاری و ئیعجاز و، بە یەك شێوە و لە یەك کاتدا، لە "دڵ" و "مەمك"ی هەزاران جۆری دایکانی سەر ڕووی زەویدا.. بە ڕوونی "یەکبوون"ی خوای گەورە دەچەسپێنێت و بەڵگەیە لەسەر "یەکتایی" ئەو.

❁ ئایەتی سێ‌هەم:

﴿وَمِنْ ثَمَراتِ النَّخيلِ والأَعْنابِ تَتَّخِذونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً إنَّ في ذٰلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلونَ﴾ (النحل:٦٧).

ئەم ئایەتە پیرۆزە سەرنج و ڕوانینی مرۆڤ بۆ لای دارخورما و مێو ڕادەکێشێت و، بێداریان دەکاتەوە کە: (ئەم دوو بەرە نیشانەیەکی مەزنیان تێدایە بۆ خاوەن ژیری و دڵان و بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەر تەوحید).

بەڵێ، ئەم دوو بەرە هەروەك "خۆراك"ن، لە هەمان کاتیشدا "بەر" و "میوە" و سەرچاوەی گەلێ خواردەمەنیی بەتامولەزەتن، هەرچەندەش درەختی هەردووکیان لە گڵێکی بێ گیان و زەوی‌یەکی وشکدا گەشە دەکەن. کەواتە هەریەك لەم دوانە، موعجیزەیەکی توانستی خوایی و کارێکی دەراسای پەروەردگارین و، کارگەیەکی شەکر و شیرینی و، شەربەتی هەنگوین‌ئاسا و، چەند سنعەتێکن کە بە تەرازووی وردی سەرنەکەر و، ڕێکوپێکیی تەواوەتی و، کارامەیی دانایانە دروست کراون. بە ڕادەیەك کە هەرکەسێك خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك "ژیری" و "بینایی دەروون" بێت بە پێویستی دەزانێت کە بڵێت: (ئەو کەسەی ئەم شتانەی بەم شێوەیە دروست کردووە، هەر ئەویشە کە گشت بوونەوەرانی بەدیهێناوە)!

چونکە ئەوەتا – بۆ نموونە – بە چاوی خۆمان دەبینین نزیکەی بیست هێشووی ترێ لەو پەلە بچووکە لاوازەوە شۆڕبوونەتەوە.. هەریەك لەو هێشووانەش نزیکەی سەد دەنکە ترێی ناسکی شیرینی وەك هەنگوینیان گرتووە.. هەریەك لەو دەنکانەش بەرگێکی تەنك و ناسك و ڕەنگاوڕەنگ و جوانیان تێوە پێچراوە.. لە ناوەڕاستی هەریەکەشیاندا چەند تۆوێکی ڕەقوتەق هەن کە بەرنامە و مێژووی ژیانی ئەو درەختەیان تێدایە!

بەڵێ، بەدیهێنانی هەموو ئەمانە و غەیری ئەمانەش لەم ترێیە و هاووێنەی لەژمارەبەدەری لەسەر ڕووی تێکڕای زەویدا، بە هەمان وردی و دانایی و، دروستکردنی

ئەم سنعەتە موعجیزە و دەراسـایە بـەم ژمـارە یـەکجار زۆرە – لـە یـەك کـاتدا و بـە هـەمان شێوە – بە ڕوونی ئەوە دەچەسپێنێت کە:

(جگە لە بەدیهێنەری مەزنی بوونەوەران، کەسی تر ناتوانێت ئەم کارە ڕاپەڕێنێت کە داخوازی توانست و دانستێکی ڕەها و نەبڕاوەیە).

بەڵێ، نە "هێز"ە کوێرەکان و نە "سروشت"ی کـەڕولاڵ و نـە "هۆکـار"ە پەرتـەوازە و سـەرگـەردانەکان، هیچیان – هەرگیزاو هەرگیز – نـاتوانن دەسـت بـۆ ئـەم کـارە درێـژ بکەن و خۆیان لەو تەرازووە وردە سەرنەکەرەدا هەڵبقورتێنن کە بەوپـەڕی: کارامـەیی و ڕێکی و دانایی لەو سنعەتەدا خراوەتەکار. نەخێر، بەڵکو هەموو ئەم چەشنە هۆکارانـە بـە فـەرمانێکی "پـەروەردگاری" لـەو کـارە پەروەردگاریانـەدا ملکـەچ دەکرێـن و ژێربـار دەخرێن. کەواتە "هۆکارەکان" چـەند شتێکی کـارتێکراون و، تەنـها لـەم ڕووەوە بۆیـان دەڕوانرێـت و قبـوڵ دەکرێـن. دەنـا جگـە لـە چـەند "پـەردە"یـەکی کاربێ سـپێرراوی بەردەستی خوای گەورە هیچی تر نین.

* * *

جا هەروەك ئەم سێ ئایەتە ئاماژە بۆ سێ ڕاستی دەکەن و، هەریەکەیان سێ سـەرنجیان تێدایـە کـە بەڵگـەن لەسـەر "یـەکتایی" خـوای گـەورە.. چـەندەها کـاری تـری لـە سنووربەدەری پەروەردگاری و چـەندین درەوشـانەوەی لەژمارەبەدەریش هـەن کـە هـەر هەموویان پێکەوە بەڵگەن لەسەر خواوەنـدی "تـاك" و "تـەنیا" و، شایەتییەکی ڕاسـت و ڕوون لەسەر "زات"ی تاك و تەنیای بەخشندەی شکۆمەند دەدەن.

* * *

## ٢٦- ٢٧

**ڕاستیی سێهەم: ڕاستیی بەدیهێنان و داهێنان**

واتە دروستکردنی بوونەوەران – بە تایبەتی ڕووەك و زینـدەوەران – بـە: زۆرییـەکی ڕەها.. خێراییەکی ڕەها.. ڕێکوپێکیی ڕەها..

هەروەها بەدیهێنانی بوونەوەران بە: ئاسـانییەکی ڕەهـا.. بەوپـەڕی جوانـی.. لەگـەڵ کارامەییەکی ورد و.. ڕێکوپێکیی ڕەهادا..

هەروەها داهێنانی دروستكراوەكان بەوپەڕی ئاسانی و، لە یەك جیاكردنەوەیان، هەرچەندە زۆر و زەبەندە و، تابلێیت تێكەڵ و پێكەڵیشن..

بەڵێ، بەدیهێنانی شتان بەوپەڕی زۆری و خێرایی و، لەوپەڕی ئاسانی و، بەوپەڕی وردی و كارامەیی و رێكوپێكی و، لەوپەڕی چاكی و بەنرخیدا.. ئنجا لە یەك جیاكردنەوەیان هەرچەندەش لەوپەڕی زۆر و زەبەندەییدان. ئەمەش بێ هیچ هەڵە و لێ تێكچوونێك هەرچەندەش گەلێ جیاوازیی چڕ و پڕیان لە نێواندایە..

بەڵێ، ئەم كاری بەدیهێنانە، تەنها بە توانستی خاوەن توانایەكی "تاك" و "تەنیا" نەبێت بە كەسی تر ناكرێت، چونكە هەر ئەو توانستەیە كە هیچ شتێكی بەلاوە قورس نییە و، هەموو كارێكیشی پێ سووك و ئاسانە.

بەڵێ، بۆ ئەوەی لەم كاری بەدیهێنانە تێبگەین كە بە چاوی خۆمان دەیبینین، دەبێت لە بەردەم ئەو توانستەی بەدیهێنەردا:

ئەستێرەكان و گەردیلەكان یەكسان بن..

گەورەترین شت وەك بچووكترین و.. دانە و تاكە لەژمارەبەدەرەكانی هەر "جۆر"ێك بە وێنەی یەك جۆر وابن..

شتی گشتی و مەزنی هەمەلایەنگریش وەكو بەشێكی تایبەتی و بچووك وابێت..

زیندووكردنەوەی ئەم زەوییە زەبەلاحەش چەشنی زیندووكردنەوەی یەك دانە درەخت بێت..

دروستكردنی درەختێكی گەورەش بە وێنەی بەدیهێنانی تۆوێكی یەكجار ورد ئاسان بێت.

تەنها بەهۆی ئەم نهێنییەی كە لەم پلەیەی "تەوحید"دایە و، بەم ڕاستیی سێ‌هەمە و، بە وشەی تەوحید (واتە بەوەی كە لە بەردەم توانستی پەروەردگاردا گەورەترین "كُـلّ" وەك بچووكترین "جُزء" وایە[1]، بێ هیچ جیاوازییەك لە نێوان زۆر و كەمدا)..

تەنها بەمانە نهێنییە ورد و شاراوەكانی قورئانی پیرۆز دەردەكەون و، بە ڕوونكردنەوەی ئەم داناییە سەرسوورهێنەر و مەتەڵە مەزنەی كە لە دەرەوەی توانای ژیریدایە - هەرچەندەش گرنگترین بناغەی ئیسلامە و قووڵترین خولگەی ئیمان و خشتی گەورەی بینای تەوحیدە - پەی بە شاراوەترین نهێنییە نەزانراوەكانی ڕاستیی

---

(١) "كُلّ" واتە: ئەو شتەی كە لە چەند بەشێك پێكهاتووە (وەك جەستەی زیندەوەر)، بەڵام "جُـزء" واتە: ئەو بەشانەی كە "كُلّ"یان لێ پێكدێت (وەك ئەندامەكانی ئەو جەستەیە). (وەرگێڕ)

بەدیـهێنانی گـەردوون دەبرێـت. کـە ئەمـەش ڕاستی‌یەکە "فەلسـەفە" لـە پـەی پێ بردنیـدا کۆڵەوار و دەستەوسان ماوە.

کەواتە هەزار و یەك جـار، بـەڵکو بە ژمـارەی پیتـەکانی پەیامـەکانی نـوور، شـوکر و سەنا و ستایش بۆ بەدیهێنەری میهرەبانم لەسەر ئەوەی کە:

"پەیامەکانی نـوور" توانی‌یـان ئـەم نهێنی‌یـە سەرسووڕهێنە شی بکەنەوە و، پـەردە لـە ڕووی ئەم ڕاستی‌یەدا هەڵبماڵن کە مرۆڤی نەزان بە تەماوی و نامۆی دەزانی. تەنانـەت بـە چەندین بەڵگەی گومانبڕیش ئەم ڕاستی‌یەیان چەسپاند. بە تایبەت لە باسی "وهوَ علـــى كلِّ شيءٍ قدير"ی کۆتـایی مـەکتووبی بیستەم و باسی "ئـەو کەسـەی ئـەم کارانـە ئـەنجام دەدات خـاوەنی ئەوپـەڕی توانـا و دەسـتەڵاتە"ی وتـەی بیسـت و نۆهـەمدا.. هـــەموو پەیامەکانی نوور بـە بەڵگـەی گومـانبڕی تـا ڕادەی ڕوونیـی: "دوو کـەڕەت دوو دەکاتـە چوار" بە تایبەت لـە پلـەکانی "اللهُ أكبر"ی بریسـکەی بیسـت و نۆهـەمدا، کـە بـە زمـانی عەرەبی نووسراوە، فراوانی و ڕەهایی توانستی خوایان چەسپاندووە.

جـا هەرچەندە درێژەپێدانـی ئـەم ڕاستی‌یە بـەو شـوێنە ناوبراوانـەی پەیامـەکانی نـوور دەسپێرین کە ئاماژەمان بۆ کردن، بەڵام ویستم لێرەشدا بە کورتی و بە چەشنی پێرستێکی پوخت، ئەو بناغە و بەڵگانە ڕوون بکەمەوە کە لەم نهێنی‌یە دەدوێن، پاشان بە سیازدە پلـە ئاماژە بۆ سیازدە نهێنی بکەم. بەڵام بە داخـەوە تەنـها دوو نـهێنیم لـێ نووسـین و - تـا لـەم کاتەدا - دووو ڕێگری بـە هێزی مـاددی و مەعنـەوی ڕێـی نووسـینی نهێنی‌یـەکانی تریـان لـێ گرتم.

○ **نهێنیی یەکەم:**

هەر شتێك خۆیی(ذاتي) بێت، دژەکەی ئاوێتەی نابێت. چونکە ئەو کاتـە "دوو شتی" دژ بە یەك کۆ دەبنەوە. ئەمەش - وەك ئاشکرایە - کارێکی مەحاڵە.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە:

مادەم توانستی خوای گەورە خۆیی‌یە و بۆ زاتـی پیرۆز و خـاوێنی خـواوەنـد پێویستە، ئەوا هەرگیز ناگونجێ "کۆڵەواری" کـە دژی ئـەو توانستەیە، بێتـە ڕێـی ئـەو زاتـە خـاوەن توانستە خۆیی‌یە.

هەروەها مادەم "پلە پلە" بوونی هەر شتێك بەوە دەبێـت کـە دژەکـەی تێکـەڵی ببێـت، وەك ئەوەی کـە پلـەکانی بـەهێزی و لاوازیـی "ڕوونـاکی" بـە تێکـەڵبوونی "تـاریکی" و..

پلەکانی بەرزی و نزمیی "گەرمی" بە ئاوێتەبوونی "سەرما" پێکدێت و.. ئەندازەکانی توندی و لاوازیی "هێز"یش بە ئەندازەی بەرگری کردن لەو هێزە، دەستنیشان دەکرێت.. مادەم وایە، ئەوا ئەو توانستە خۆیی‌یە هەرگیز پلەپلە نی‌یە، بەڵکو توانستێکی ئەوتۆیە کە "هەموو شتێك" وەکو تەنها "یەك شت" دروست دەکات.

ئنجا مادەم ئەو توانستە خۆیی‌یە لە: پلەپلە بوون و، لاوازی و، ناتەواوی دوورە، ئەوا بێ گومان هیچ ڕێگرێك لە بەردەمیدا ناوەستێ و، بەدیهێنانی هیچ کارێکی بەلاوە گران نابێت.. پاشان مادەم هیچ شتێکی پێ قورس نی‌یە، ئەوا دەبێت بەدیهێنانی حەشری مەزنی بەلاوە وەك ئاسانیی بەدیهێنانی بەهار وابێت و، بەدیهێنانی بەهاریشی وەك هی یەك درەخت پێ ئاسان بێت و، بەدیهێنانی درەختێکیشی بەلاوە وەك ئاسانیی بەدیهێنانی یەك دانە گوڵ وابێت. لە ڕاستی و واقیعیشدا ئەم بەدیهێنانە ئاوا بە ئاسانی و بەوپەڕی وردەکاری ئەنجام دەدات. ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەبینین کە "گوڵ" بە ئەندازەی وردەکاریی سنعەت و بە قەدەر گرنگی و بەهای "درەخت" بەدی دەهێنرێت.. هەروەها درەختەکەش بە ئەندازەی سنعەتی "بەهار"ی مەزن دارای ئیعجازە.. بەهاریش بە چەشنی "حەشر" خاوەنی ئیعجاز و هەمەلایەنگری و گشتی‌بوونە. بەم جۆرە، هەموو ئەمانە بەدی دەهێنرێن و، بە چاوی خۆشمان بەدیهاتنیان دەبینین.

"پەیامەکانی نوور" بە چەندین بەڵگەی زۆری گومانبڕ و بەهێز، چەسپاندوویانە کە:

ئەگەر "بەدیهێنان" نەدرێتە پاڵ "تاکی" و "تەنیایی" ئەوا بەدیهێنانی تەنیا یەك دانە گوڵ بە ئەندازەی دروستکردنی درەختێك، تەنانەت لەویش قورستر دەبێت. بەدیهێنانی درەختیش لە هی بەهار ئاڵۆزتر دەردەچێت. سەرەڕای ئەمەش، هەر هەموویان لە ڕووی نرخ و بەها و وردەکاریی سنعەتەوە، لەو ئاستەی خۆیان دەکەونە خوار و بایەخیان نامێنێت، چونکە ئەو بوونەوەرەی کە زووتر بە ماوەی یەك خولەك بەدی دەهێنرا، ئەو کاتە لە ساڵێکدا دروست دەکرێت، تەنانەت هەر مەحاڵە بەدی بهێنرێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە:

هەرچی بەر و گوڵ و درەخت و زیندەوەری وردیش هەن کە پەیوەندی‌یان بەمانەوە هەیە، هەر هەموویان بەوپەڕی زۆری و لەگەڵ ئەوپەڕی چاکی و بەنرخیدا و تایبشلێی بە پەلە و ئاسانی دێنە بوون و دەردەکەون، هەرچەندەش ئەوپەڕی وردەکاریی سنعەتیان پێوە دیارە! کەواتە هەموویان بە ڕێکوپێکی دێنە بوون و فەرمانبەری و تەسبیحاتی خۆیان – لە

ماوەی بوونیـاندا - ئەنجام دەدەن و، پاشـان لـە بریـی خۆیـان کارەکانیـان بـە تۆوەکانیـان دەسپێرن و، ئنجا بە ڕێی خۆیاندا دەڕۆن.

○ **نهێنیی دووهەم:**

بەپێی نـهێنیی "ڕووناکی" و "ڕوونی" و "گوێڕایەڵی"، تـەنیا یـەك "خـۆر" بـە یـەك درەوشانەوەی توانستی زاتیی خۆی، تیشکی ڕووناکی بە تەنیا یەك ئاوێنە دەبەخشێت و، لە هەمان کاتدا و بـە فـەرمانی خـوای گـەورە و، بەهۆی چالاکیی فراوانی ئەو توانستە ڕەهایە، هەمان ڕووناکی و گەرمی بە چەندەها ئاوێنـەی سـاف و شـتی بریقـەدار و دڵۆپی بریسکاوەی بێ سنووریش دەبەخشێت و، "کـەم" و "زۆر" لـە بـەردەم ئـەو توانسـتەدا یەکسان دەبن.

گەر کەسێ یەك وشەی لە زار دەربچێت، ئـەوا هـەروەك بـە بۆنـەی فراوانیـی ڕەهـای بەدیهێنەرێتیی خوای گەورەوە، ئەم وشەیە - بەوپەڕی ئاسانی - دەچێتە گوێـی تـەنیا یـەك کەسەوە، بە هەمان جۆر و بە فـەرمانی خـوای گـەورە، هـەمان وشـە بـە سـووك و ئاسـانی دەچێتـە زەیـن و گوێـی ملیۆنـان کەسیشـەوە. کەواتـە توانستی خـوای گـەورە هــەزاران گوێبیست و یەك گوێبیستیان بەلاوە یەکسانە و جیاوازییان ناکات.

هەروەك "چاو" بەوپەڕی ئاسانی سەیری یەك جێ و هەزاران جێ دەکـات، بـە هـەمان جۆر "ڕووناکی" یان "نوورانییـەکی ڕۆحـانی"ی وەك حـەزرەتی جیـبریلیش - درووودی لەسەر بێـت - لەبـەر فراوانیـی ئـەو چالاکییـە پەروەردگارییـەی کـە لـە درەوشـانەوەی میهـرەبانیدا هــەیە، بەوپـەڕی ئاسـانی، لـە یـەك شـوێندا دەبیــنرێت و دەڕوات و ئامـادە دەبێت و، لە هـەمان کاتیشـدا - بـە توانستی خوایی و بـە هـەمان ئاسـانی - لـە هـەزاران شوێندا دەبینرێت و دەڕوات و ئامادە دەبێت. کەواتە لێرەدا جیاوازی لـە نێـوان کـەمی و زۆریدا نییە.

توانستی خۆیی و ئەزەلیی خواوەندیش - وللهِ المَثَلُ الأعلى - بە هەمان جۆرە، چونکە ئەو توانستە ناسکترین و تایبەتیترین نوورە، بگرە نووری هەموو نوورەکانە.

جا لەبەر ئەوەی چییەتی و، ڕاستی و، ڕووە مەلەکووتییەکانی هەموو شتێك چەشنی ئاوێنە ڕوون و بریقەدارن و.. لەبەر ئەوەش کە هـەموو شتێك هـەر لـە گەردیلەکانـەوە تـا ڕووەك و جۆرەکـانی گشـت زینـدەوەران، تەنانــەت تـا دەگاتــە ئەسـتێرە و خـۆر و

مانگەکانیش، هەر هەموویان بە تـەواوی شـوێنکەوتە و گوێڕایـەڵی فـەرمانی ئـەو توانستە خواییەن و، ژێربار و سەربازی تەواو ملکەچی فەرمانـەکانی ئـەو توانسـتە ئەزەلی‌یـەن.. ئەوا بێ هیچ گومانێك ئەو "توانسته" شتانی لەژمارەبەدەر بـە چەشـنی ئاسـانیی تەنـها یـەك شت بەدی دەهێنێت و.. لە هەموو شوێن و کاتێکدا لای هەموو شتێك ئامادەیە و.. هیـچ شتێك ڕێی شتێکی تری لـێ ناگـرێت و.. گەورە و بچووك، زۆر و کـەم و، "جُــزء" و "کُلّ"ی بەلاوە یەکسانە و.. بەرامبەر هیچ شتێك دەستەوسان نـابێت و.. هـەموو شـتێکی لە لا سووك و ئاسان دەبێت.

ئنجـا بەپێی نهێنیی: "ڕێکـوپێکی" و "هاوسـەنگی" و "گوێڕایەڵی"ی فەرمـانەکان – وەك لە وتـەی دەهـەم (پـەیامی حەشر) و وتـەی بیسـت و نۆهـەم (لـەبارەی مەلائیکـەت و ژیانی دوارۆژەوە)دا بـاس کـراوە – دەتوانرێـت کەشتی‌یەکی یـەکجار مەزن و زەبەلاح بەرێ بخرێت و کاری پێ بکرێـت، بـە وێنـەی ئەوەی کـە منـاڵێك کەشتی‌یە مناڵانەکـەی خۆی بە ئاسانی بەرێ دەخات!

هەرەوەها فەرماندەیەکی سوپا وەك دەتوانێت فەرمان بۆ یەك سەرباز دەربکات و پێـی بڵێـت: "هێرش بەرە" ئیـتر بـەم فەرمانـە بیجووڵێنێـت و بیداتەبـەر، هـەر ئـەم فەرماندەیـە بـە هەمان فەرمان سوپایەکی گوێڕایەڵ بەرەو جەنگ دەداتەبەر..

هەروەها گەر دوو چیا لە دۆخی هاوسەنگیدا بن و ئنجا لەناو دوو تای تەرازوویەکی سەرنەکەری تەواو گەورە و هەستیاردا دابنرێن، پاشـان تەرازوویـەکی هەسـتیاری تریـش بـهێنرێت و لـە هـەردوو تاکـەیدا بـە هاوسـەنگی و هاوکێشـی‌یەکی تـەواو دوو هێلکـە دابنرێن.. ئەوا هەروەك تەنها یـەك دانـە گوێـز دەتوانێـت یـەکێك لـەو دوو تایـە بـۆ سـەر و ئەوی تریشیان بو خوارەوە ببات، هەمان دانە گوێز دەشتوانێت – بەپێی یاسـای دانـایی – یەکێك لە دوو تای تەرازووە مەزنەکەش، کە چیایەکی تێدایە، بۆ سـەر لوتکـەی چیایـەك بەرز بکاتەوە و، تاکەی تریش بۆ قووڵایی شیوێك دابەزێنێت.

هەروەك ئەم نموونانە بەم جۆرەن، توانستی پەروەردگاریش لـەو ڕووەوە کـە: "ڕەهـا و بێ کۆتایی و نوورانی و خۆیـی و هەمیشـەیی"یـە و، پاشـان "دانستی ڕەهـا" و "دادگـەریی تـەواو"یشـی لەگەڵدایـە – کـە دوو سـەرچاوە و خولگـەن بـۆ هـەموو ڕێکـی و ڕێسـا و هاوسـەنگی‌یەك – ئنجـا هـەموو شـتێکی هەمـەکی و هـەندەکی و گـەورە و بچـووك، گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمان و دەست تێوەردانی ئەو توانستەن..

ئەوا ئەم توانستە، بە وێنەی ئاسانیی بزواندنی گەردیلەکان، ئەستێرە و هەسارەکانیش دەبزوێنێت..

هەروەك لە بەهاردا بەوپەڕی ئاسانی یەك دانە مێش زیندوو دەکاتەوە و بەرەو گۆڕەپانی بەهاری دەبات، هەر هەمان توانست گشت تاقم و جۆری مێرووەکان و سەرجەم ڕووەك و زیندەوەران بەرەو گۆڕەپانی ژیان دەداتەبەر و، بە هەمان ئاسانی و هەمان فەرمان و، بەو داناییەی تیایاندایە و بەپێی نهێنیی: "میزان" زیندوویان دەکاتەوە..

هەروەها وەك لە بەهاردا - بەوپەڕی خێرایی - درەختێك سەوز دەکات و ژیان بە ڕەگ و بنجەکانی دەبەخشێت کە وەك ئێسك وان، هەر ئەو خواوەندە بەدیهێنەرە بە هەمان توانستی ڕەهای دادگەر و بە هەمان فەرمان، ئەم زەوییە زەبەلاحەش کە دەڵێیت تەرمێکی مەزنە، زیندوو دەکاتەوە، کتومت وەك ئەوەی کە بە ئاسانی ئەو درەختەی بەهاری زیندووکردەوە. بەم کارەش سەد هەزار نموونە بەدی دەهێنێت کە بەڵگەی حەشر و نەشری ئەودنیان..

هەروەك خوای گەورە بە فەرمانێکی تەکوینی زەوی زیندوو دەکاتەوە، هەر ئەو خواوەندە بە هەمان جۆر و بە فەرمانی مەزنی:

﴿إِنْ كانَتْ إِلاّ صَيْحَةً واحِدَةً فَإِذا هُمْ جَمِيعٌ لَدَيْنا مُحْضَرون﴾ (يس:٥٣)..

﴿وَما أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاّ كَلَمْحِ البَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَب﴾ (النحل:٧٧)..

﴿ما خَلْقُكُمْ ولا بَعْثُكُمْ إِلاّ كَنَفْسٍ واحِدَة﴾ (لقمان:٢٨).

هەرچی مرۆڤ و جینںی و گیانلەبەر و ڕۆحانی و مەلائیکەت هەن، بە هەمان فەرمان و بە هەمان ئاسانی، دەیانهێنێت بۆ گۆڕەپانی حەشری مەزن و، لە بەردەم تەرازووی هەرە مەزندا ئامادەیان دەکات و، هیچ کارێك ڕێی کارێکی تری لێ ناگرێت.

بە بێ هیچ ویستێکی خۆم، ناچار بووم نووسینی پاشماوەی نهێنییەکانی تر - لە سێهەمەوە تا سیازدەهەم - دوابخەم و بۆ کاتێکی تریان هەڵبگرم.

* * *

## ٢٨

**ڕاستیی چوارەم: هەمەکێتیی بوونەوەران و سەرهەڵدانیان پێکەوە**

گشت بوونەوەران کە پێکەوە پەیدا دەبن و بوونیان پێ دەبەخشرێت، هەندێکیان لە هی تر دەچن و، هەندێکی تریان نموونەی بچووك یان گەورەی ئەوانی ترن و، بەشێکیان "کُلّ" و "کُلّي"ن و بەشەکانی تریش "جُـــزْء" و "جُزئـــي"[1]ی ئەوانن، هەرچەندەش هەموویان لە مۆری سروشت و پەیوەندیی مەحکەمی نەخشی سنعەت و وردەکاریدا لەیەك دەچن.. ئنجا یارمەتیدانی یەکتریی نێوانیان و، تەواوکردنی "ئەم" بۆ کاری "ئەو"ی تر..

ئەمانە و هاوچەشنەکانی تری ئەم خاڵە زۆرانەی "یەکبوون" لەناو بوونەوەراندا، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی "یەکتایی" ڕادەگەیەنن و، دەیشیچەسپێنن کە بەدیهێنەری هەموویان یەکێکی "تاك" و "تەنیا"یە.. لە ڕووی "پەروەردگاریتیی هەمەلایەنگر"یشەوە ئەوە دەردەخەن کە تێکڕای بوونەوەران لە حوکمی "کُـلّ" و "هەمەکی"دان و هەرگیز لەتکردن و دابەشبوون هەڵناگرن!

بۆ نموونە: بەدیهێنانی چەندین تاکی لەژمارەبەدەری چوارسەد هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەران لە بەهاردا و، بەڕێوەبردنی هەر هەموویان لە یەك کاتدا و بە یەك شێوە و، ژیاندنیان بە دانایی تەواوەتی و جوانکاریی سنعەت و وردەکاری، بێ هیچ هەڵە و ناتەواوییەك، هەرچەندەش هەموویان ئاوێتە و تێکەڵی یەکترین..

هەروەها بەدیهێنانی چەندەها دانەی بێ سنووری جۆرەکانی باڵندە، هەر لە مێرووەوە کە نموونەی بچووکیانە، تا دەگاتە هەڵۆ کە نموونەی هەرە مەزنیانە.. ئنجا یەك بە یەکی ئەوانە توانایەکیان پێ بەخشراوە کە بە هۆیەوە دەتوانن بەناو حەوادا گەشت و هاتوچۆ بکەن و، چەندین کۆئەندامی ئەوتۆشیان دراوەتێ کە بۆ گوزەران و گەشت و جموجووڵ و بڵاوکردنەوەی شادمانی بە ناو حەوادا، یارمەتییان دەدەن.. پاشان نەخشاندنی مۆری ئەو سنعەتە دەراسایە لە دەموچاویاندا و، پێکهێنانی شەقڵی "دانایی"

---

(١) لە لاپەڕە (٢٦٩)دا واتای "کُلّ" و "جُزء" ڕابورد. نموونەی "کُلّـــي"یش وەك ڕەگەزی ئادەمیزاد. بەڵام (جوزئی) دانە دانەیان (وەك ئازاد و شێرزاد و هتد...). (وەرگێڕ)

بەوپەڕی کارسازی لە جەستەیاندا و، دانانی نیشانەی "تـەنیایی"ش بەوپـەڕی پـەروەردە و بایەخ پێدانەوە لە ماهییەتی هەموویاندا..

هـەروەها فریـاگوزاری و یارمـەتیدانی خانـەکانی لـەش بـە گەردیلـەکانی خـۆراك و یاریدەی ڕووەك بۆ زیندەوەران و، هی زیندەوەرانیش بۆ مـرۆڤ و، یارمـەتیدانی بێچـووە بچووك و بێدەستەڵاتەکان بە میهر و سۆز و چاودێریی دایکان و.. ڕوودانـی ئـەم هـەموو تەقەلا و کۆشش و یارمەتیدانانەش لە چوارچێوەی دانست و میهرەبانی‌یەکی تەواودا..

پاشان هەڵسوکەوت کردن بە هەمان: "ڕێسـا و داهێنـان و کـار و دانـایی" بـۆ نموونـە: هـەر لـە گەلـەسـتێرەی ڕێـی کاکێشـانەوە - کـە یەکێکـە لـە فـەرمـانگە گەردوونی‌یـە مەزنەکان - تا دەگاتە: کۆمەڵەی خۆر.. توخمەکانی ناو زەوی.. گلێنەی چاو.. گـەڵای چرۆی گوڵ.. توێکڵی لاسـکی گەنمەشـامی.. تۆوی نـاو کاڵـەك.. گشـت ئەمانـەی کـە دەڵێـی چـەند بازنەیـەکی هاوچـەقی یـەك لـەناو یـەکن و لـە حوکمـی هـەندەکی و هەمەکیدان..

هەموو ئەمانە، بە ڕوونی و بەڵگەنەویسـتی دەیچەسپێنن کـە ئـەو کەسـەی ئـەم کارانـە ڕادەپەڕێنێت یەکێکی "تاك"ی "تەنیا"ی وایە کە مۆری خـۆی بەسـەر ڕوخسـاری هـەموو شتێکەوە نەخشاندووە. لە کاتێکدا کە "شوێن" ناتوانێت سنوور بـۆ ئـەو کەسـە دابنێـت، کەچی ئەو لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە، کەواتە هەرچی شت هەیە بە وێنەی دووریـی لـە خۆرەوە لەویشەوە دوورە، بەڵام ئەو - وەك خۆر - لە هەموو شـتێکەوە نزیکە! هـەروەك قورسـترین کـاری نـاو بازنـە مەزنـەکانی گـەردوون و کۆمەڵـەی خۆری بـەلاوە ئاسـانە، بچووکـترین کاروبـاری نـاو خڕۆکـەکانی خوێـن و ورد و نادیـارترینی ختـوورەکـانی نـاو دڵیشی لـێ ون نـابێت. هـەموو ئەمانـەش دەریدەخـەن کـە هیـچ شـتێك نی‌یـە لـە دەرەوەی بازنە و سنووری دەستەڵاتی ئەو بێت. هـەرچی شـت هەیـە - بـا گـەورە و زۆریـش بێـت - وەك بچووکـترین شـت بەلایـەوە ئاسانە.. مێرووویـەکی بچـووك بـە هـەمان وردەکـاری و ڕێسای هەڵۆیەکی مەزن و.. تاقە گوڵێك بە هەمان ماهییەت و ڕێکوپێکیی درەختێك و.. درەختیش لە شێوە و داهێنانی باخێکدا و.. باخێکیش بە ئـەندازەی جوانی و خـەمڵاویی بەهار و.. بـەهاریش هێنـدەی مـەزنی و سام و شـکۆی حەشـر، بـەدی دەهێنێـت. ئنجـا وردترین و ڕێکترین و بەنرخترین شتمان بە نرخێکی تابڵێیت هەرزان تەنانەت هەر تەنها بە

چاکە و بەخششی خۆی دەداتێ و، بەرامبەر بەمەش جگە لە "بسم الله" و "الحمد لله" هیچی تری لێمان ناوێت. واتە نرخ و بەهای دەستنیشانکراوی ئەو نیعمەتانە بریتی‌یە لەوەی کە لە سەرەتاوە بە: "بسم الله الرحمن الرحيم" ناوی خوای لێ بهێنرێت و، لە کۆتاییشدا "الحمد لله" ی لەسەر پێشکەش بکرێت.

لێرەدا بەم ئەندازەیە واز دەهێنین، چونکە "پەیامەکانی نوور" بە درێژی‌یەکی زیاتر ئەم ڕاستیی چوارەمەیان ڕوون کردووەتەوە و چەسپاندوویانە.

ئنجا هاوڕێ گەشتیارەکەمان، لە مەنزڵی دووهەمدا ڕاستیی پێنجەمی بینی:

## ٢٩

**ڕاستیی پێنجەم: ڕێکوپێکیی هەرە تەواوی تێکڕای گەردوون و یەکبوونی ماددەکانی**

واتە:

بوونی "ڕێکوپێکی"ی یەکجار کامڵ و تەواو لەناو تێکڕای گەردوون و گشت گۆشە و بەشەکانیدا، تەنانەت لە هەموو بوونەوەرێکی ناو گەردووندا..

هەروەها "یەکبوون"ی ئەو کەرەسە و ماددانەش کە تەوەرەی بەڕێوەبردن و ڕەوتی ژیانی ئەم وڵاتە فراوانەن و پەیوەندی‌یان بە شێوەی گشتی و فەرمانبەرانی ئەم وڵاتەوە هەیە..

هەروەها "گشتی‌بوون" و "هەمەلایەنگری"ی ئەو (کار) و (ناوانەی) کە لەو شارە مەزن و حەشرگا سەرسووڕهێنەدا کاری خۆیان دەکەن، چونکە هەمان "ناو".. هەمان "کار".. هەمان "ماهییەت"ن کە لە هەموو جێ‌یەکدا هەن، هەرچەندەش تێکەڵ و بەیەکدا ئاڵاون..

هەروەها ئەو (تۆخم) و (جۆر)انەی کە بناغەی بنیاتنان و ئارایشتدانی ئەو کۆشکە مەزنەن و، هەموو لایەکی سەر ڕووی زەوی‌یان گرتووەتەوە و لە گشت جێ‌یەکدا زۆر و بڵاون. هەر هەمان تۆخم و هەمان جۆر و هەمان ماهییەتن کە هەرچەندەش تێکەڵ و پێکەڵن کەچی هەروەك خۆیان ماونەتەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نەهاتووە..

هەموو ئەمانەی کە باس کران، بە چەشنێکی ڕوونی بەڵگەنەویست ڕێنما و داخواز و بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە:

بەدیهێنەر و کارسازی ئەم گەردوونە.. پادشا و پەروەردگاری ئەم وڵاتە.. خاوەن و بنیاتنەری ئەم کۆشکە، یەکێکی: تاکی، تەنیای، بێ وێنەی، بێ وەزیری، بێ یاریدەدەری، بێ هاوبەشی، بێ دژی، بێ کۆلەواری، دوور لە گشت ناتەواوی‌یەکە!

پاشان "ڕێکوپێکیی تەواو" - خۆی لە خۆیدا - بەڵگەی "یەکتایی"یە، چونکە داخوازی تەنها یەك ڕێکخەر دەبێت. کەواتە بواری "هاوبەشایەتی" نادات، کە تەوەرەی دەمقاڵیی نێوان هاوبەشەکانە.

جا مادەم لە هەموو شتێکی گەردووندا، چ هەمەکی بێت و چ هەندەکی.. هەر لە خولانەوەی ڕۆژانە و سووڕانەوەی ساڵانەی گۆی زەوی‌یەوە تا دەگاتە سەروسیمای مرۆڤ و ڕێکخستنی هەست و نەستەکانی و جموجووڵ و سووڕی خڕۆکە سوور و سپی‌یەکانی ناو خوێن.. مادەم لە هەموو ئەمانەدا ڕێکوپێکیی دانایانە و ورد هەیە، ئەوا ناگونجێ جگە لەو کەسەی کە خاوەنی توانست و دانستی ڕەهایە هیچ شتێکی تر بە ئەنقەست دەستی خۆهەڵقورتاندن و بەدیهێنان بۆ هیچ کام لەو شتانەی ناو گەردوون ڕابکێشێت، بەڵکو هەموو شتێکی غەیری ئەو کەسە بەتوانا و دانایە، تێکڕا وەرگر(متلقی) و کارتێکراو(منفعل)ن و، چەند ڕوویەکن "کارتێکراوی" بە هەموویانەوە دەردەکەوێت.

هەروەها مادەم ڕێکخستن و ڕێسابەخشین، بە تایبەت بوونی ئامانجی یەك لە دوای یەك لە هەموو شتێکدا و ڕێکخستنی ئەم ئامانجانەش لە ڕێی دەرخستنی بەرژەوەندیی شتانەوە.. مادەم ئەم کارانە بێ "زانایی" و "دانایی" و "ویستێکی بکەر" و "ئیختیار" ڕوو نادەن، ئەوا دەبێت ئەم ڕێکوپێکی‌یەی کە لەگەڵ داناییدا دەست لەملانن و، بە چەندەها جۆری لەژمارەبەدەر لە بەدیهێنراواندا دەردەکەون و، بە چاوی خۆمان دەیانبینین و، هەموویان لە دەوری خولگەی "بەرژەوەندی‌یەکان"دا دەخولێنەوە.. دەبێت ئەم ڕێکوپێکی‌یانە، بەڵگەیەکی ڕوون بن و بە هەموو بارێك شایەت بن لەسەر ئەوەی کە بەدیهێنەر وکارسازی ئەم بوونەوەرانە یەك کەسە و، هەر ئەو یەك کەسە بکەریانە و، هەر ئەویش خاوەنی ئیختیارە و هەر شتێك دێتە ناو جیهانی "بوون" تەنها بە توانستی ئەو دێت و، هەر تەنها بە ویستی ئەویش بارێکی تایبەتی وەردەگرێت و، بە ئیختیاری ئەویش لە شێوەیەکی ڕێکوپێکدا دەردەکەوێت.

هەروەها مادەم چرای تیشك بەخشی ئەم میوانخانەیەی دنیا یەکێکە و.. لامپی هەڵواسراوی ژماردنی ڕۆژەکانی یەکێکە و.. هەورە ڕەحمەت پرژێنەکانی ناو باخچەی ئەم دنیایە یەکێکن و.. چێشتخانە و ئاگردانەکەی یەکێکە و.. ئاوی خواردنەوەی ژیان بەخشی یەکێکە و.. کێڵگە پارێزراوەکەی یەکێکە.. هەروەها یەکێکە.. یەکێکە.. یەکێکە... تا دەگاتە هەزار و یەك دانە..

مادەم وایە، ئەوا ئەم یەك یەکانە، بە ڕوونی و بێ هیچ گومانێك، شایەتن لەسەر ئەوەی کە دروستکەر و خاوەنی ئەم میوانخانەیە "یەکێکە" و لەوپەڕی بەخشندەیی و سەخاوەتمەندیدایە بەرامبەر میوانەکانی، بە ڕادەیەك کە ئەو گەورە فەرمانبەردارانەی خۆی دەکات بە خزمەتگوزاری گوێڕایەڵ بۆ دابینکردنی حەوانەوەی میوانە "زیندوو"ەکانی!

هەروەها مادەم ئەو "ناوە جوان" و "کاروبارە خوایی" و "ئیشوکارە" پەروەردگارییانەی کە لەم گەردوونەدا دەست بەکارن و درەوشانەوە و نەخش و جێ دەستیان لە هەموو شوێنێکی جیهاندا دەردەخەن، یەکێکن..

بۆ نموونە:

هەر ناوە جوانەکانی: "الحكيم، المصور، المدبر، المحيي، المربي" و هاوچەشنیانن کە لە هەموو جێگایەکدا و.. هەمان کاروباری: "دانایی و میهرەبانی و چاودێری" و هاوچەشنیانن لە گشت شوێنێکدا و.. هەمان ئیشوکاری: "وێنەکێشان و بەڕێوەبردن و پەروەردەکردن" و هاووێنەیانن کە لە هەموو جێیەکدا کار دەکەن و ئاوێتەی یەکترین و بەیەکدا ئاڵاون و، هەریەکەیان لە بەرزترین پلە و فراوانترین بواری زاڵبوون و هەمەلایەنگریدان. ئنجا هەر یەکەشیان نەخشی ئەوانی تر تەواو دەکات، بە ڕادەیەك کە دەڵێی ئەو هەموو (ناو) و (کار)انە لەناو خۆیاندا یەکیان گرتووە و، توانست بووە بە دانست و میهرەبانی و، دانستیش بووە بە چاودێری و ژیان. ئەوەتا - بۆ نموونە - کە کارکردنی ناوی: "المحيي" لە هەر شتێکدا دەردەکەوێت، هەر لە هەمان کاتدا و بە هەمان ڕێسا و لە هەموو شوێنێکدا، یەکسەر کاری ناوەکانی: "الخالق، المصور، الرزاق" و چەند ناوێکی تریش دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت.

دیارە ئەمەش - بە ڕوونی و بێ هیچ گومانێك - شایەتە لەسەر ئەوەی کە: خاوەن و ناوداری ئەو ناوە گشتگیرانە و، بکەری ئەو کاروبارە گشتی و هەمەلایییانەی کە لە هەموو جێیەکدا بە هەمان شێوە دەبینرێن، یەکێکی "تاك" و "تەنیا"یە. آمنّا وصدّقنا!

هەروەها مادەم ئەو توخمانەی کە پێکهێنەر و کاکڵە و بناغەی بەدیهێنراوانن، گشت لایەکی سەرزەوی‌یان گرتووەتەوە و تیایدا بڵاوبوونەتەوە.. هەروەها مادەم هەموو جۆرەکانی بەدیهێنراوان، چەندین مۆری "یەکتایی"یان لەسەر نەخشاوە و سەر رووی زەوی‌یان داپۆشیوە، هەرچەندەش کە هەر هەمان جۆرن لە هەموو شوێنێکدا هەن.. ئەوا بێ گومان دەبێت هەموو ئەو توخمانە و ئەوانەش لێیان پێکهاتوون، هەروەها ئەو جۆرانەش لەگەڵ یەك بە یەکی تاکەکانیاندا، موڵك و فەرمانبەردار و بەدیهاتووی تەنها کەسێکی بەتوانا بن کە بە توانستی ڕەهای خۆی ئەو توخمە ڕەها و زاڵانە دەکات بە خزمەتگوزاری گوێڕایەڵ و.. ئەو جۆرە زۆر و پەرش بڵاوانەی هەموو لایەکی سەر ڕووی زەویش، بە چەشنی سەربازی ملکەچی یاسا، دەخاتە کار.

لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور" ئەم ڕاستی‌یەیان چەسپاندووە و بە ڕوونی پێش‌چاویان خستوون، ئەوا لێرەدا تەنها بەم ئاماژە کورتە لێی دواین.

* * *

دوای ئەوەی ئەم هاوڕێ گەشتیار و ڕێبوارەمان، لە ئەنجامی تێگەیشتنی ئەم پێنج ڕاستی‌یەوە ڕێژنەی ئیمانی دەست کەوت و تامی تەوحیدی چەشت، هەستی بە کەیف و شادی و نەشئەی ئیمان کرد و، ئنجا ئەم هەست و بینینانەشی - بە کورتی - بەم جۆرەی خوارەوە بۆ "دڵ"ی خۆی گێڕایەوە:

سەیری لاپەڕەی ڕەنگینی پەڕاوی گەورەی گەردوون بکە!
ببینە کە خامەی زێڕینی "توانست" چ نەخشێکی ناوازەی کێشاوە!
دەبینیت یەك دانە خاڵی تەماوی و ڕەش بۆ خاوەن هەستان نەماوەتەوە.
دەڵێی خواوەند ئایەتەکانی خۆی بە "نوور" نووسیوە!
هەروەها بزانە کە:

پەڕە و صەفحەی کتێبی "عالەم"ن ئەبعادی نامەحدوود
سطووری حادیثاتی دەهرە گشت ئاساری نامەعدوود
لە دەزگای لەوحی مەحفووزی حەقیقەتدا وەها نووسرا:
وشەی بەرجەستەیە؛ پاراوە؛ پڕ واتایە: هەر مەوجوود

هەروەها گوێ بگرە کە:

هەموو شتێك پێکەوە بەرامبەر بە یەك "لا إلــه إلاّ الله" دەڵێن و بۆ یەکتریی دەسێننەوە و، هەردەم هەموویان "یا حق" و هەمیشە گشتیان "یاحي" دەڵێنەوە.

بەڵێ:

وفي كُلِّ شَيْءٍ له آيةٌ     تدلُّ على أنّه واحِدٌ

بەم جۆرە، "دڵ"ی ئەم گەشتیارە تەسدیقی "دەروون"ی کرد و، ئنجا هەردوو کیان پێکەوە وتیان:

بەڵێ.. بەڵێ.. ڕاستە.. وایە.

لە مەنزڵی دووهەمی بەشی دووهەمی مەقامی یەکەمیشدا، بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو پێنج ڕاستی‌یە تەوحیدی‌یانە کراوە کە ئەم گەشتیارە میوانەی ناو گەردوون بینیونی:

(لا إله إلاّ الله الواحد الأحد الّذي دلّ على وحدته في وجوب وجوده: مشاهدة حقيقة الكبرياء والعظمة في الكمال والإحاطة.. وكذا مشاهدة حقيقة ظهور الأفعال بالإطلاق وعدم النهاية لا تقيدها إلاّ الإرادة والحكمة.. وكذا مشاهدة حقيقة إيجاد الموجودات بالكثرة المطلقة في السرعة المطلقة، وخلق المخلوقات بالسهولة المطلقة في الإتقان المطلق وإبداع المصنوعات بالمبذولية المطلقة في غاية حسن الصنعة وغلو القيمة.. وكذا مشاهدة حقيقة وجود الموجودات على وجه الكلّ والكلّية والمعية والجامعية والتداخل والمناسبة.. وكذا مشاهدة حقيقة الإنتظامات العامة المنافية للشركة.. وكذا مشاهدة وحدة مدارات تدابير الكائنات الدالّة على وحدة صانعها بالبداهة، وكذا وحدة الأسماء والأفعال المتصرفة المحيطة، وكذا وحدة العناصر والأنواع المنتشرة على وجه الأرض).

* * *

●●

پاشان کاتێ ئەم گەشتیارەی جیهان بەناو "سەردەمەکان"دا گوزەری دەکرد، ڕێی کەوتە قوتابخانەکەی نوێکاری هەزارەی دووهەم (ئیمامی ڕەببانی: ئەحمەدی فاروقی، خوا لێی ڕازی بێت)[1] و ڕۆشتە ناو ئەو قوتابخانەیە و لەوێ گوێی لە ئیمام ڕاگرت. لەو کاتەدا ئیمامی ڕەببانی لە وانەکانیدا دەیفەرموو:

(گرنگترین ئەنجامی تێکرای تەریقەتە سۆفییەکان بریتییە لە: دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ڕاستییەکانی ئیمان)[2].

هەروەها:

(ڕوون بوونی مەسەلەیەکی ئیمانم لە هەزار کەرامەت پێ باشترە)[3].

هەروەها دەیفەرموو:

(هەندێ لە گەورە پیاوانی پێشین وتوویانە: لەمەولا یەکێك لە زانایانی زانستی

---

(١)"ئیمامی ڕەببانی" (٩٧١-١٠٣٤ ك) ناوی (ئەحمەدی کوڕی عەبدولئەحەد)ە و خەڵکی (سەرهەند)ی هیندستانە و نازناوی بە "فاروقی" بڵاوبووەتەوە چونکە لە نەوەی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتابە، خوای لێ ڕازی بێت. نوێکاری ئایین(مجدد) بووە لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی کۆچیدا و بە ڕاستیش ئەرکی تازەکردنەوەی بەجێهێناوە. لە زانستەکانی سەردەمی خۆیدا دەستێکی تابڵێی باڵای بووە، جگە لەوەی کە خاوەنی دەروونێکی پاك و ئیخلاصێکی کەم وێنە و ڕۆحێکی پەروەردەکراو بووە لە بەندایەتییدا بۆ خوای گەورە و، دڵێکی هەمیشە بێداری بووە. چەندین جار پلەوپایەی بەرزی دراوەتێ هیچیانی وەرنەگرتووە. ئەو ئاشووبەی (ئەکبەرشا)ی هیند بۆ لەناوبردنی ئیسلام هەڵی گیرساند، ئەم زاتە توانیی بەرەنگاری بێتەوە و ڕووبەڕووی ڕابوەستێت و دەوڵەتی مەغۆل لە هیندستاندا لە "ئیلحاد" و "بێبڕوایی" و "بەرهەمی"یەوە بگێڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام لە ڕێی بڵاوکردنەوەی پەیڕەوی بەیعەت و برایەتی و ڕێنمایی خەڵکییەوە. هەروەك توانیی (تەصەووف) لەو شتانەی تێکەڵی بووبوون و لێڵیان کردبوو، پاك بکاتەوە. بەم پێیە ئیمامی ڕەببانی بە خۆری تیشکداری قوتابخانەی نەقشبەندی دەژمێررێت لە تەصەووفدا. بانگەوازەکەی بە شێوەیەکی بەربڵاو لە نیوە دوورگەی هیندا بڵاو بووەوە و، یەکێك لە بەروبوومەکانی (ئۆرنگ زیب)شای خواناس بوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا سەری ئیسلام و موسڵمانان بەرز بووەوە و کافرانیش سەرشۆڕ کران. تەریقەتەکەی بەهۆی گەورە زانا و کەسایەتیی بەناوبانگی کورد: "مەولانا خالیدی نەقشبەندی"یەوە (١١٩٢-١٢٤٢ ك) لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووەتەوە.. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، بەناوبانگەکەیان "مەکتووبات"ە کە "محەممەد موراد مەنزیلەوی" کردوویەتی بە عەرەبی. (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە: (مكتوبات الإمام الرباني) ج١/ص١٨٢. مامۆستا نوورسی لێرەدا پوختەی قسەکەی ئیمامی ڕەببانیی هێناوە. (وەرگێڕ)

(٣) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە. ئەمە پوختەی وتەیەکی ئیمامی ڕەببانییە لە مەکتووبی دووسەد و دەهەمی مەکتووباتەکەیدا. (وەرگێڕ)

"کەلام" دێـت و هـەموو ڕاستیـیەکانی ئیمـان و ئیسـلام بـە ڕوونـی و بـە بەڵگـەی عـەقڵی دەچەسپێنێت. خۆزگا ئـەو کەسـە مـن بوومایـە، بـەڵکو لەوانەشـە هـەر مـن بم[1]، چونکـە "ئیمـان" و "تـەوحید" بناغـە و کاکڵـە و نـوور و ژیـانی هـەموو کـەمالاتێکی مرۆڤـن و، دەسـتووری: "تَفَكُّرُ ساعةٍ خيرٌ مِنْ عِبـادةِ سَـنَةٍ"یش[2] تایبەتـە بـە بیرکردنـەوەی ئیمانی‌یەوە و، ئەو گرنگی‌یەش کە "زیکری خـەفی"ی تەریقـەتی نەقشـبەندی هەیـەتی هـی ئەوەیە کە جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەم بیرکردنەوە ئیمانی‌یە).

لەو کاتەدا کە ئەم گەشتیارە ڕێی کەوتە ئـەو قوتابخانەیە، ئیمـامی ڕەببـانی بـەم شـێوەیە وانەکانی دەوتەوە. ئەمیش بەوپەڕی گرنگی و بایەخ پێدانەوە گوێـی لـێ ڕاگـرت. دوای ئەوە، لەگەڵ دەروونی خۆیدا دوا و بە خۆی وت:

مـادەم ئـەم پێشـەوا قارەمانـە وا دەفـەرموێ و، مـادەم زیـادبوونی هـێزی ئیمـان – بـا بـە ئەنـدازەی گـەردیلەیـەکیش بێـت – لـە دەستکـەوتنی باتمـانێك زانیـاری و کـەمالات بەنرختـرە و، سەد جاریش تامی لە هی چێژەکانی حاڵ و جەزبەی تەریقەت بەلەزەت‌ترە..

هـەروەها مـادەم ئـەو دوودڵـی و گومانانـەی کـە لەسـەر ئیمـان و قورئـان کەڵەکـەیان بەستووە و هەزار ساڵی ڕەبەقە فەیلەسـووفەکانی ئـەورووپا دەیـانوروژێنن و ڕووەو ئیمـان ئاراستەیان دەکەن، ئێسـتا لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا ڕێگایـان بۆ نـاو دڵـی ئیمـانداران لـێ خراوەتە سەرپشت و هێرشیان بۆ دەبەن و دەیانەوێت پایـە و بناغـەکانی ئیمانیـان لـە دڵـدا لـەق بکـەن، کـە بنچینـەی بەختـەوەریی هەمیشـەیی و خولگـەی ژیـانی نـەبڕاوە و کلیلـی بەهەشتی هەتاهەتایین.

مادەم وایە، ئەوا دەبێت پێش هەموو شتێك هێزی ئیمانمان زیاد بکـەین و لـە ئیمـانێکی لاسایی و چاولێکەری‌یـەوە بیگۆڕیـن بـە ئیمـانێکی تـەحقیقیی دامـەزراو لەسـەر بناغـەی بەڵگە و لێکۆڵینەوە.

---

(١) ڕۆژگار چەسپاندی کە ئەو کەسە نە "کەس" و نە "پیاو"ە، بەڵکو "پەیامەکانی نوور"ە. هەندێ جار ئـەهلی کەشف پەیامەکانی نووریان لە کەسی ڕاگەیەنەرەکەیدا دیوە – کـە هیـچ نرخ و گرنگی‌یـەکی نی‌یـە – لەمـەوە وتوویانە: "ئەوە کەسە". (وەرگێڕ)

(٢) قال الحافظ العراقي في تخريج الإحياء ٥٨/١: حديث: "تفكر ساعة خير من عبادة سنة": ابـن حبـان كتاب العظمة من حديث أبي هريرة بلفظ ستين سنة بإسناد ضعيف ومن طريقه ابن الجوزي في الموضوعـات ورواه أبو المنصور الديلمي في مسند الفردوس من حديث انس بلفظ ثمانين سنة وإسناده ضعيف جـداً، ورواه أبو الشيخ من قول ابن عباس بلفظ: خير من قيام ليلة. ا هـ . وانظر كشف الخفـاء ٣١٠/١ والأحـاديث المشكلة ص١١٣. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی)

کەواتە ئەی دەروونەکەم! با لەگەڵ ئەم بیست و نۆ پلە ئیمانی‌یانەی دەستمان کـەوتن - کە هەر یەکـەیان بـە ئـەندازەی چیا سـەختەکان مەحکـەم و ڕەگداکوتـاون - هـەنگاو بـەرەو پێش بنێـین و بیانگەیەنینـە "سـی و سـێ پلـە" کـە ژمـارەی زیکـر و تەسـبیحاتە پیرۆزەکانی دوای نوێژن.. دەبا لە جیهانی زیندەوەراندا - کە جیهانێکـە دەرس و پـەندی لـێ دەچـۆڕێت - لـە دەرگـای: "بـەڕێـوەبـردن" و "ژیانسـازی"ی پەروەردگاری‌یانـەیان بدەین و بە کلیلی "بسم الله الرحمن الرحيم" بیکەینەوە، تاکو بڕۆینە ناو "مەنزڵی سێ‌هەم" کە کۆمەڵگای شتانی سەیر و سەرسووڕهێنەر و نایابە.

ئنجا ئەم گەشتیارە، بە نەرمونیانی و لەسەرخۆیی لەو دەرگایەی دا و، بە: "بســـم الله الفتاح" کردیەوە و، مەنزڵی سێ‌هەمی لـێ دەرکەوت و، ڕۆشتە ناوی. لەوێدا بینیـی کـە چـوار ڕاسـتیی مـەزنی هەمەلایـەنگر هـەن دەورانـدەوری ئـەو مەنزڵـەیان داوە و، چەشـنی خۆری درەخشان "تەوحید" ئاشکرا دەکەن:

## ٣٠

**ڕاستیی یەکەم: ڕاستیی "فەتتاحییەت"**

واتە: "پشکووتنی چەندەها شێوە و ڕوخسـار"ی جۆراوجـۆر لـە یـەك ماددەی تـەواو ساکار و، دەرکـەوتنیان لـە هـەموو جێیـەکی گشـت جیـهاندا، لـە یـەك کـاتدا و بـە یـەك کار.. هەموو ئەمانەش تەنها بە دەرکەوتنی ناوی "الفتاح"ی خوای گەورە لێیان.

بـەڵێ، هـەروەك توانستی بەدیهێنـەر، بـە چەشـنی پشـکووتن و دەمکردنـەوەی گـوڵ، دەمـی گشـت بوونـەوەرە جۆراوجـۆرە لەسـنووربەدەرەکانی باخچـەی گـەردوونی کـردووەتـەوە و، بـە نـاوی "الفتـاح" تـەرزێکی لـەبـاری ڕێـك و، کەسێتی‌یەکی تـاك و تایبەت و جوداکەری بە یەك بە یەکیان بەخشیوە.. هەر ئەو توانستە، بە جۆرێکی ئیعجـاز بەخشـتر شێوەیەکی ڕێـك و ڕازاوە و جوداکـەرەوەی بـە هـەموو "دانـە" و "تـاك"ێکـی چوارسـەد هـەزار جـۆری زینـدەوەری باخچەی ڕووی زەوی - بەوپـەڕی وردەکـاری و ڕازاوەیی - بەخشیوە.

بەڵێ، ئەم شێوە نەخشـاندنانە، بـەهێزترین بەڵگـەی "تـەوحید" و سەرسـووڕهێنەرترین موعجیزەی توانستی خواوەندن، وەك ئەم ئایەتانە دەری دەخەن:

﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطونِ أُمَّهاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُماتٍ ثَلاثٍ ذلِكُمُ اللهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لا إِلَهَ إِلاَّ هوَ فأنّى تُصْرَفونَ﴾ (الزمر:٦).

﴿إِنَّ اللهَ لا يَخفى عَلَيْهِ شَيءٌ فِي الأَرضِ ولا فِي السَّماءِ ۞ هوَ الَّذي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحامِ كَيْفَ يَشاءُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ العَزيزُ الحَكيمُ﴾ (آل عمران:٥-٦).

لەسەر بناغەی ئەم "دانایی"یە، پەیامەکانی نوور بە چەندین تەرز و شێوازی جۆراوجۆر ڕاستیی: "پشکووتن و نەخشاندنی شێوە و ڕوخسارەکان"یان ڕوون کردووەتەوە. بە تایبەت لە پلەی شەشەم و حەوتەمی بەشی یەکەمی ئەم پەیامەدا. لەبەر ئەوە، خوێنەری بەڕێزیان بۆ لا ڕەوانە دەکەین و، لێرەدا هەر ئەمەندە دەڵێین کە:

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەردەوام و توێژینەوەی وردی هەردوو زانستی "ڕووەکزانی" و "گیانەوەرزانی"یەوە و بە شایەتیی هەردووکیان، دەرکەوتووە کە: ئەم نیگارکێشانەی شێوە و ڕوخساری بوونەوەران، هێندە گشتی و هەمەلایەنگرە کە مەگەر خواوەندی "تاك" و "تەنیا" و "خاوەن توانستی ڕەها" - کە هەموو شتێك دەبینێت و دروستی دەکات - خاوەنی ئەم کارە بێت. چونکە ئەم شێوەکێشانە پێویستی بە بوونی ئەوپەڕی دانایی و وردەکاری و هەمەلایەنگری دەبێت، لە نێوان توانستێکی ڕەهای وادا کە لە هەموو "شوێن" و "کات"ێکدا زاڵ و دەستەڵاتدار بێت. کەواتە هیچ کەسێك نی‌یە خاوەنی توانستێکی ئاوا بێت مەگەر ئەو "تاك" و "تەنیا"یەی کە جڵەوی زەوی و ئاسمانەکانی بەدەستە.

بەڵێ، وەك ئەو ئایەتە ناوبراوە پیرۆزە فەرمووی: ﴿فِي ظُلُماتٍ ثَلاثٍ﴾ ئەوا: بەدیهێنانی مرۆڤ لە ماددەیەکی ساکار و، دەم پێ کردنەوە و نەخشاندنی یەك بە یەکی شێوەکانی لە ڕەحمی دایکاندا، بە: تەرازووکاری و ئارایشتدان و ڕێکوپێکی و جیاکردنەوەی لە شتانی تر، بێ هیچ تێکەڵبوون و هەڵە و ناتەواوی‌یەك.. ئەم کارە، بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر: "یەکتایی" خواوەندی بەدیهێنەر.

ئنجا گشتگیری و هەمەلایەنیی ئەم ڕاستی‌یە - واتە: ڕاستیی نەخشاندنی شێوەکان - بە هەمان توانست و هەمان دانست و هەمان سنعەت، بۆ تێکڕای هەموو مرۆڤ و زیندەوەران و ڕووەکەکانی سەر ڕووی زەوی، بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە. چونکە کاری: "گشتگیری" لە خۆیدا تەنها یەك کارە و هیچ بوارێك بە بوونی هاوبەش نادات.

پاشان هەروەك نۆزدە ڕاستییەکانی بەشی یەکەم بە "بوون"یان شایەتییان لەسەر "پێویستیی بوون"ی بەدیهێنەری مەزن دا، ئەوا بە "گشتگیری"شیان شایەتی لەسەر "یەکبوون" و "تاکی"ی ئەو خواوەندە بەدیهێنەرە دەدەن.

دوای ئەمە، ئەو ڕاستییەی کە هاوڕێ گەشتیارەکەمان لە مەنزڵی سێ‌هەمدا دیی، بریتیبوو لە:

## ٣١

**ڕاستیی دووهەم: ڕاستیی "ڕەحمانییەت"**

واتە: تەنها یەکێکە ئەو کەسەی کە: وەك لەبەرچاودایە، زەویی بۆ کردووین بە میوانخانەیەکی دڵڕفێن و، بە هەزاران دیاریی میهرەبانیی خۆی ڕووی زەویی داپۆشیوە و، بە هەمان میهرەبانیش سفرەیەکی بۆ ڕاخستووین کە سەدان هەزار خۆراکی بە تامولەزەتی جۆراوجۆری لەسەر ئامادە کراوە و، هەر بەو میهرەبانی و داناییەی خۆیشی ناوەوەی زەویی بۆ کردووین بە گەنجینەیەکی گشتی و مەزنی خۆی و، بەوپەڕی میهرەبانی پەروەردەمان دەکات. ئەوەتا ئەم گۆی زەوییەی کە دەڵێی کەشتییەکی بازرگانییە، لە سووڕی ساڵانەیدا، بە هەزاران جۆری بە نرخ و باش و جوانی شمەك و پێداویستییەکانی مرۆڤ لە جیهانی پەنهانەوە بار دەکات و، هەموو ساڵێك بە وێنەی کەشتی و شەمەندەفەری بارکراو بۆ گرۆی مرۆڤی دەنێرێت.

دەبینین "بەهار" وەك "شەمەندەفەر"ێك وایە کە ڕۆزی و پۆشاکی بۆ ئێمە هێناوە! ئنجا بۆ ئەوەش سوود لەو دیاری و نیعمەتە زۆرانە وەربگرین، سەدان بگرە هەزاران ڕۆزی و پێداویستی و هەست و نەست و ئارەزووی پێ بەخشیوین.

بەڵێ، وەك ئەوەی لە "تیشکی چوارەم"دا - کە تەفسیری ئایەتی: ﴿**حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل**﴾ە - ڕوون کراوەتەوە و چەسپاوە کە:

ئەو خواوەندە مەزنە گەدەیەکی ئەوتۆی پێ بەخشیوین کە دەتوانین چەندین خۆراکی لەسنووربەدەری پێ هەرس بکەین و تامیان بچێژین.. هەروەها ژیانێکی پێ داوین - بەڵام چۆن ژیانێك! - کە بەهۆی هەستەکانیەوە سوود لە چەندین نیعمەتی لەژمارەبەدەری پەرش و بڵاوی ناو ئەم جیهانە مەزنەی بەرچاومان، کە دەڵێی سفرە و خوانێکی ڕاخراوی پڕ لە نیعمەتە، وەردەگرین.. هەروەها ئەو خواوەندە مەزنە بە مرۆڤایەتییەکی

ئەوتۆ ڕێزی لێ ناوین کە بە ئامێرە زۆر و زەبەندەکانی چەشنی "ژیری" و "دڵ" تامی دیاری‌یە بێ کۆتاییی‌یەکانی جیهانی ماددە و جیهانی مەعنا دەچێژین.. ئنجا ئیسلامێکی فێر کردووین کە خۆی لە خۆیدا چاکترین ڕووناکی‌یە و لە چەندین گەنجینەی بێ برانەوەی جیهانی بینراو و جیهانی نەبینراویشدا بەهرەمەندی ڕووناکی دەبێت.. پاشان بۆ لای ئیمانێکی ئەوتۆ ڕێنمایی کردووین کە نیعمەتێکی بێ وێنەیە و بە هۆیەوە لە "نوور" و "دیاری"یە زەبەندە و لەژمارەبەدەرەکانی جیهانەکانی هەردوو دنیا بەهرەوەر دەبین. وەك بڵێیت ئەم بوونەوەرانە کۆشکێکی ڕازاوەی ئاوەدانی ئەوتۆ بن کە لە لایەن میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەوە بە چاکترین و بەهادارترین شت و بوونەوەر ڕازێنرابێتەوە و، کلیلی گەنجینە و مەنزڵە لە ژمارەبەدەرەکانیشی بە دەستی مرۆڤ سپاردبێت و گشت ئەو داخوازی و هەستە پێویستانەش لە سروشتیدا دانرابن کە لە ڕێیانەوە بتوانێت سوود لە هەموو شتانی ناو ئەم کۆشکە وەربگرێت.

جا میهرەبانی‌یەکی ئاوا، کە دنیا و قیامەت و هەموو شتێکی گرتووەتەوە، دەبێت یەکێك بێت لە درەوشانەوەکانی "تەنیایی" لە نێوان ئەو "تاکی"یەی بەدیهێنەردا[1]. واتە: هەروەك گشتگیری و هەمەلایەنیی "خۆر" بۆ ئەو شتانەی بەرامبەر بە خۆرن، نموونەیەکی بەرجەستەی "تاکی"یە، بە هەمان جۆر کە هەموو شتێکی ڕوون و بریقەداریش - بەپێی توانای خۆی - ڕووناکی و حەوت ڕەنگەکان و تیشکدانەوەی خۆر وەردەگرن، ئەم کارە، نموونەی "تەنیایی"یە. لەبەر ئەوە، هەرکەسێك ڕووناکیی جیهانگیری "خۆر" دەبینێت یەکسەر ئەو بڕیارە دەدات کە: خۆری ڕووناککەری هەموو لایەکی زەوی "یەکێك"ە.. ئنجا کە ڕووناکی دانەوەی خۆری خاوەن گەرمی لە هەر شتێکی بریقەدار تەنانەت لە دڵۆپی ئاویشدا دەبینێت، ئەوا دەتوانێت باوەڕ بە "تەنیایی" خۆر بهێنێت. واتە "خۆر" بەهۆی سیفەتەکانیەوە لە هەموو شتێکەوە نزیکە. کەواتە ئاوێنەی دڵی هەموو شتێکە.

جا هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە. "گشتی‌بوون" و "هەمەلایەنگری"ی میهر و سۆزی خواوەندی خاوەن میهرەبانی و جوانیش، کە وەك "ڕووناکی" هەموو شتێکی گرتووەتەوە، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە: ئەو میهرەبانە "یەکێك"ی وایە کە لە هیچ شوێنێکدا هاوبەشی نی‌یە.. پاشان بوونی: درەوشانەوەی نوورەکانی زۆربەی "ناوە

---

(١) "تەنیایی" واتە: (الأحدية) و "تاکی"یش واتە: (الواحدية). مامۆستا نوورسی لە دەقەکەی سەرەوەدا نموونەی لەسەر هێناونەتەوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە پەراوێزی ل (٤١٢). (وەرگێڕ)

جوانەکان"ی ئەو خواوەندە میهرەبانە و، بوونی جۆرێك لـە دەرکەوتن و درەوشانەوەی "زات"ی پیرۆز و خاوێنی خۆی لە هەموو شتێکدا، بە تایبەت لە هەموو زیندەوەرێکدا، بە تایبەتتر لـە مرۆڤدا (بەوەی کە ئەو خواوەندە میهرەبانە لـە ژێر پەردەی میهرەبانی‌یە فراوانە گشتی‌یەکەی خۆیدا ژیانێکی گشتیی بە هەموو یەکێك بەخشیوە، بە رادەیەك کـە بەهۆی ئەو ژیانەوە دەتوانێت ڕوو لە گشت بوونەوەران بکات و پەیوەندی‌یان لـە گەڵدا بەستێت).. بوونی ئەم درەوشانەوانە، "تەنیایی" ئەو خواوەندە میهرەبانـە و، ئامادەبوونی لە هەموو شوێنێکدا، دەچەسپێنێت. دەیشی‌سەلمێنێت کە هەر ئەو خواوەندەیە بۆ هەر شتێك بیبەوێت، هەموو شتێك دەکات.

بەڵێ، هەروەك ئـەو میهرەبانە بە: "یەکبوون" و "گشتگیری"ی ئەو میهرەبانی‌یەی، سام و هەیبەت و ڕەونەقی شکۆمەندیی خۆی بەسەر هەموو گەردوون و ڕووی زەویدا ئاشکرا دەکات.. هەروەها بە درەوشانەوەی "تەنیایی" خۆیشی لـە هـەموو زیندەوەرێك، بـە تایبـەت لـە مرۆڤـدا و.. بـە کۆبوونـەوەی گشـت نموونـەکانی نیعمەتـەکان و جێگیرکردنیان لـە ئەندام و کۆئەندامەکانی ئەو زینـدەوەرەدا و، ڕێکخسـتنی یـەك بـە یەکیان.. بەوەش کە وا لەو زینـدەوەرە دەکات هـەموو بوونـەوەران – لـە ڕوویەکەوە – وەك خانە و لانەی ئەو وابن..

ئـەو خـواوەنـدە میهرەبـانە، بـە هەمـوو ئەمانـە، "میـهرەبانیی جوانـی"ی خـۆی ڕادەگەیەنێت و، کۆبوونەوەی گشت جۆرەکانی "چاکەکاری"ی خۆی لـە مرۆڤـدا، دەناسێنێت.

ئەگەر "کاڵـەك" وەك نموونەیەك وەربگرین، ئەوا دەبینین ئەو کاڵەکە لەناو هەموو یەکێکی تۆوەکانیدا هەیە. کەواتـە دەبێـت بەدیهێنەری هـەموو یـەکێك لـەو تۆوانـە بەدیهێنەری خودی کاڵەکەکەش بێت، چونکە بەدیهێنەر ئەو "تۆ"وە لەو "کاڵەك"ە بـەدی دەهێنێت و کۆی دەکاتەوە و، بە تـەرازووی تایبـەتیی زانستی خـۆی و یاساکانی دانـایی تایبەتیی خۆیشی، بەرجەستەیان دەکات. کەواتە جگە لە داهێنـەری "تـاك و تـەنیا"ی ئەو کاڵەکە هیچ شتێکی تر ناتوانێت ئەو تۆوە بەدی‌بهێنێت، تەنانەت هەر مەحاڵە ئەو "تـۆ"وە لای غەیری ئەو بەدیهێنەرە بەدی‌بهێنرێت!

جا لەسەر بناغەی ئەمە:

هـەموو بوونـەوەران، بـەهۆی لێدرەوشـانەوەی "ڕەحمانییـەت"ەوە، وەك درەخـت و بێسـتان دەردەکـەون و.. زەویـش بەوێنـەی بـەر و کاڵـەکی ئـەو بێستانە وایـە و.. خـاوەن

هەستان و مرۆڤیش تۆوی ئەو بەر و کاڵەکانەن! کەواتە دەبێت بەدیهێنەری هەموو گۆی زەوی بێت و، پەروەردگاری وردترین شتی زیندووش پەروەردگاری گشت بوونەوەران بێت!

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

بەدیهێنان و پشکووتن و نەخشاندنی هەموو شێوە ڕێکوپێکەکانی گشت بوونەوەران لە ماددەیەکی ساکار، بەهۆی ڕاستیی "فەتتاحییەت"ەوە کە ڕاستییەکی گشتگیری هەمەلایەنە، بە ڕوونی "یەکتایی" خوای گەورە دەچەسپێنێت..

ئنجا پەروەردەکردنی تەواو ڕێکوپێکی هەموو ئەو زیندەوەرانەی هاتوونەتە "بوون" و ژیانی دنیا، بە تایبەت ئەوانەی کە تازەکی هاتوون، پەروەردەکردنی هەموو ئەمانە بەهۆی ڕاستیی "ڕەحمانییەت"ەوە کە هەمەلایەنە و گشتییە.. هەروەها گەیاندن و دابینکردنی پێداویستییەکانی یەك بە یەکی ئەو زیندەوەرانە، بێ لەبیرچوونەوەی هیچ کامێکیان و، بەسەرکردنی هەموو ئەوانە لە لایەن ئەو میهرەبانییەوە لە گشت شوێن و کاتێکدا..

سەرجەم ئەم کارانە، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی "یەکتایی" بەدیهێنەری میهرەبان دەردەخەن و، لە نێوان ئەو "یەکتایی"یەشدا "تەنیایی" ئەو بەدیهێنەرە میهرەبانەمان پیشان دەدەن.

لەبەر ئەوەی تێکڕای " پەیامەکانی نوور" ئاوێنەی ڕەنگدەرەوەی درەوشانەوەی دوو ناوی جوانی: "الحكيم" و "الرحيم"ی خوای گەورەن.. هەروەها لەبەر ئەوەی نەرمونیانی و درەوشانەوەی "ڕاستیی میهرەبانی" لە چەندین جێی پەیامەکاندا چەسپێنراوە.. لەبەر ئەمانە، لێرەدا تەنها بەم دڵۆپەی ئەو دەریا فراوانە ئاماژەمان بۆ کرد.

ئنجا ئەوەی کە هاوڕێ گەشتیارەکەمان - دوای ئەمە - لە مەنزڵی سێهەمدا بینیی، بریتی بوو لە:

## ٣٢

**ڕاستیی سێهەم: ڕاستیی کارسازی و بەڕێوەبردن**

واتە ڕاستیی بەڕێوەبردنی:

قەبارە و تەنە هەرە گەورە و زەبەلاحەکانی ئاسمان..

تۆخمەکان کە لەوپەڕی تێکەڵاویدان..

بوونەوەرانی گۆی زەوی، کە لەوپەڕی موحتاجی و لاوازیدان..

بەڵێ، بەڕێوەبردنی هەموو ئەمانە بە: ڕێکوپێکی و هاوسەنگیی تەواو، هەروەها یارمەتیی یەکتردانی نێوانیان، هەرچەندەش لەناو خۆیاندا گەلێ تێکەڵی یەکترین..

بە واتایەکی تر: ڕاستیی کارسازی و بەڕێوەبردنی کاروباری هەموو ئەوانە پێکەوە و، بوونی ئەم جیهانە لە شێوەی: وڵاتێکی کامڵ و، شارێکی مەزنی قەشەنگ و، کۆشکێکی جوانی ڕازاوەدا.

وا تەنها یەك دانە وێنەی بچووکی کارگوزاریی ئەو بەڕێوەبردنە لەسەر تەنها یەك لاپەڕەی ڕووی زەوی و یەك لاپەڕەی وەرزی بەهاردا بە نموونە دەهێنینەوە و، واز لە بازنە هەرە گەورە و لاپەڕە یەکجار فراوانەکانی تر دەهێنین، کە هەر هەموویان "میهرەبانی"یان لێ دەچۆڕێت، چونکە لە چەندین پەیامی نووری گرنگی وەك: وتەی دەهەم (پەیامی حەشر)دا ڕوون کراونەتەوە و چەسپێنراون. ئەوەی لێرەدا لێی دەدوێین بەم جۆرەی خوارەوە و بە هێنانەوەی نموونەیەك ڕوونی دەکەینەوە:

گەر - بۆ نموونە - کەسێکی مەزنی نائاسایی، سوپایەکی گەورەی لە چوارسەد هەزار تیرە و نەتەوەی جیاجیا پێکهێنا و.. سەرجەم پێداویستییەکانی چەشنی: پۆشاك و چەك و ڕۆزی و تەعلیمات و پشووپێدان و کارە جۆراوجۆرەکانی تر و، گشت ئامێرە هەمە چەشنەکانی یەك بە یەکی سەربازەکانی ئەو تیرە و نەتەوە جیاوازانەی - بێ هیچ ناتەواوی و هەڵەیەك - دابین کرد و، لە کاتی خۆیدا بێ لێتێکچوون و دواکەوتن و بەوپەڕی ڕێکوپێکی، ئامادەی کردن..

ئەم بەڕێوەبردنەی کە لەوپەڕی: فراوانی و، تێکەڵی و، وردی و، هاوسەنگی و، زۆری و، دادگەریدایە.. دەبێت تەنها لە توانای نائاسایی ئەو پێشەوا ناوازەیەدا بێت. کەواتە هیچ هۆکارێك ناتوانێت دەست لەو بەڕێوەبردنە بدات، چونکە گەر دەستی بۆ ببردایە، ئەوا دەیئاڵۆزاند و هاوسەنگییەکەی دەشێواند.

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، بە هەمان جۆریش لە هەموو بەهارێکدا بە چاوی خۆمان دەبینین کە دەستێکی پەنهان سوپایەکی بەسام و شکۆی پێکهاتوو لە چوارسەد هەزار جۆر زیندەوەری جیاجیا پێك دەهێنێت و دروستی دەکات و بەڕێوەی دەبات.. پاشان لە شێوەی مردن و لە وەرزی پایزدا کۆتایی بە کاری سێ سەد هەزار جۆر لەو چوارسەدە دەهێنێت.. ئنجا تەنها لە چەند هەفتەیەکی وەرزی بەهاردا - کە وەرزێکە نموونەی حەشرە - سێ سەد هەزار وێنە و نموونەی حەشری مەزن، بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەخاتە ڕوو. بە ڕادەیەك کە خوای گەورە، دوای ئەوەی لە تەنها یەك درەختدا بە:

یەکسەر لەم وەڵامەوە بناغەی مەسەلەیەکی سەرسووڕهێنەر و سەرەتای ڕاستییەکی گەورە و گرنگ دەرکەوت، کە بەم جۆرە بوو:

هەروەك "بەهەشت" بەرهەم و ئەنجامەکانی گشت جیهانەکانی بوون(عوالم الوجود) کۆ دەکاتەوە و، هەموو ئەو تۆوانەی لە دنیادا چێنراون لە بەهەشتدا بەردەگرن و بەهەشت وایان لێ دەکات کە بەروبوومی خۆیان بە هەمیشەیی پێشکەش بکەن، هەر بەم پێیەش، "دۆزەخ" هەموو بەروبوومەکانی جیهانی نەبوون(العدم) دەبرژێنێت و دایاندەتەکێنێت، بۆ ئەوەی ئەنجامە پڕ لە سوێ و ئازاراوییەکانی جیهانە بێ‌سنوورەکانی فەنا و نەبوون دەربخات. چونکە کارگەی ترسناکی دۆزەخ سەرەڕای ئەرك و فەرمانە زۆرەکانی خۆی، جیهانی بوونیش لە چڵك و چەپەڵییەکانی جیهانی "نەبوون" پاك دەکاتەوە.

پشت بە خوا ئەم مەسەلە گرنگە لە پاشاندا ڕوون دەکەینەوە، چونکە نامانەوێت لێرەدا دەرگای لێ بخەینە سەرپشت و، هەڵی دەگرین بۆ جێگایەکی تر.

* * *

هەروەها یەکێکی تر لە بەروبوومەکانی (باوەڕ بە مەلائیکەت) دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕبوون بە: "نەکیر و مونکەر"(١)، کە بەم چەشنەی خوارەوەیە:

---

(١) روى الترمذي (جنائز/٧٠) وأبو داود بمعناه (٢/٥٤٠،٥٤١) وابن ماجة (جنائز/٦٥) وأحمد (٣/١٢٦،٤/٢٨٨): "إذا قبر الميت أتاه ملكان أسودان أزرقان يقال لأحدهما المنكر وللآخر نكير فيقولان: ما كنت تقول في هذا الرجل؟ فيقول ما كان يقول: هو عبدالله ورسوله، فيقولان: قد كنا نعلم أنك تقول هذا، ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعاً في سبعين ثم ينور له فيه، ثم يقال له: نم. فيقول: أرجع إلى أهلي فأخبرهم فيقولان: نم كنومة العروس الذي لا يوقظه إلاّ أحب أهله إليه، حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك. وإن كان منافقاً قال: سمعت الناس يقولون قولاً فقلت مثله، لا أدري. فيقولون: قد علمنا أنك تقول ذلك، فيقال للأرض التئمي عليه، فتختلف أضلاعه فلا يزال فيها معذباً حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك". واتە: ئیمامی تیرمیذی و ئەبوو داوود و ئیبنوماجە و ئەحمەد ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە: "هەرکە مردوو لە گۆڕەکەیدا دانرا، دوو مەلائیکەتی ڕەش و شین کە یەکێکیان پێی دەوترێ "مونکەر" و ئەوی تریشیان "نەکیر" دێن بۆ لای و پێی دەڵێن: لە دنیادا چیت سەبارەت بەم پیاوە دەوت؟ (مەبەست لەو پیاوە پێغەمبەرە ﷺ) ئەویش لە دنیادا چیی وتووە ئەوە دەڵێتەوە و دەڵێت: "بەندە و پێغەمبەری خوایە". ئنجا پێی دەڵێن: دەمانزانی وا دەڵێیت. پاشان بە ئەندازەی حەفتا گەز پانی و حەفتاش درێژی گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت و ڕووناك دەکرێتەوە. پاشان پێی‌دەڵێن: بخەوە. ئەویش دەڵێت: با بڕۆمەوە ئەم هەواڵە بە کەسوکارم بدەم. پێی‌دەڵێن: بخەوە و هەڵمەسە وەکو ئەو بووکەی کە هەر لە خەودایە تاکو خۆشەویستترین کەسی هەڵی‌دەسێنێت. ئنجا ئەو مرۆڤە لەوێ

ڕۆژێکیان لەبەر خۆمەوە وتم:

(دەبێ من - وەك هەموو کەسێکی تر - بێ چەند و چۆن بچمە ناو گۆڕەوە)!

کە ئەممەم وت، یەکسەر بە خەیاڵ وام دانا کە ڕۆشتوومەتە ناو گۆڕەکەمەوە. لەو کاتە و لەو گۆڕە تاریکەدا کە دەتگوت زیندانی یەك کەسی‌یە، هەستم بە نائومێدی و بێ هاوڕێی و تەنیایی دەکرد. بەم جۆرە لەو جێگا تاریك و تەنگ و ساردەدا بە تەنیا مابووم، لەپڕ دوو مەلائیکەت لە دەستەی "نەکیر و مونکەر" هاتن بۆ لام و لەگەڵمدا کەوتنە وتووێژ، بە چەشنێ کە دڵی تەنگ و گۆڕی تەسکی منیان بۆ فراوان کردم و، بەم جۆرە گۆڕەکەم و دڵم ڕووناك و گەرم بوونەوە و، هەستم کرد کە چەند دەروازەیەکم بەسەر جیهانی بەرزەخدا لێ خرایە سەرپشت..

هەر لەو ئەندێشەیەدا دڵم بەو حاڵە گەشایەوە و، بۆ ئەو بارودۆخەی کە ئێستا بە خەیاڵ دیم و لە ئایندەشدا بە حەتمی دێتەدی، سوپاس و ستایشی زۆری خوای خۆمم کرد.

جا هەروەك دەگێڕنەوە کە جارێك قوتابی‌یەك لەو کاتەدا خەریکی خوێندنی وانەکانی (نەحو و صەرف) دەبێت، کۆچی دوایی دەکات. نەکیر و مونکەر لە گۆڕدا لێی دەپرسن: (مَنْ رَبُّكَ)؟ پێیان دەڵێت: (مَنْ) موبتەدایە و (رَبُّــــكَ)ش خەبەرەکەیەتی، پرسیارێکی قورسم لێ بکەن ئەمە ئاسانە!! لای وایە هێشتا لە قوتابخانەدایە و خەریکی وانە خوێندنە! جا هەروەك ئەم وەڵامە هەموو ئەو مەلائیکەتانە و ئەو ڕۆحیانەتانەی کە لەوێ ئامادە بوون و ئەو (وەلی)یەش کە گۆڕی پیشان درا و ئەم ڕووداوەی بینی؛ هەموو ئەوانەی خستە پێکەنین، تەنانەت هەروەك بەزەیی خوای گەورەش کەوتە زەردەخەنە و لە ئازار ڕزگاری کرد.. بە هەمان جۆر، پاڵەوانێکی شەهیدیش لە پاڵەوانانی پەیامەکانی نوور (واتە: حافظ عەلی) [1] کە لە بەندیخانەدا و لە کاتی خوێندنەوە و نووسینەوەی

---

دەنوێت تاکو خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە. ئەگەر ئەو مرۆڤە مونافیق بوو بێت، لە وەڵامی ئەواندا دەڵێت: نازانم! گوێم لێ بوو خەڵکی لە بارەی ئەوەوە شتێکیان دەوت، منیش ئەوەم دەوتەوە. ئەوانیش پێی‌دەڵێن: دەمانزانی وا دەڵێیت. دوای ئەوە بە زەوی دەوترێ: لە ئاستی ئەم مردووەدا بە یەکەوە بلکێ، زەویش بە یەکەوە دەلکێتەوە و پەراسووەکانی بۆ ڕاست و چەپ دەکات و، تا خوای گەورە لەوێ زیندووی دەکاتەوە، هەر بەو چەشنە لە سزادا دەبێت. (وەرگێڕ)

(١) "حافظ عەلی" یەکێکە لە قوتابی‌یە دێرین و پێشینەکانی مامۆستا نوورسی کە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە. لەبەر هیممەتی بەرز و خەتە خۆشەکەی گەلێ خزمەتی لە بواری نووسینەوەی پەیامەکاندا ئەنجام داوە،

پەیامی (بەری درەختی ئیمان)دا کۆچی دوایی کرد، هەروەك لە دادگادا وەڵامی پرسیارەکانی بە ڕاستیەکانی ئەو پەیامە دایەوە، لە گۆڕەکەشیدا وەڵامی پرسیاری ئەو دوو مەلائیکەیە بە ڕاستیەکانی ئەم پەیامە دەداتەوە. هەروەها من و هەموو قوتابیانی تری پەیامەکانی نووریش وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە ئێستا "مەجاز"ن و لە ئایندەدا "حەقیقەت"ن، بە بەڵگە ڕەنگین و بەهێز و توندوتۆڵەوەکانی پەیامەکانی نوور دەدەینەوە و، کارێك دەکەین کە ئەو مەلائیکەتانە تەسدیق و پەسەندی بکەن و ڕێزی خۆیان لە ئاستیدا بنوێنن.

* * *

هەروەها نموونەیەکی تری هەندەکیی "باوەڕ بە مەلائیکەت" هەیە کە دەبێت بە تەوەرەی بەختەوەریی ژیانی دنیا، کە بەم جۆرەیە:

لە کاتێکدا منالێکی پاکی بێ گوناهـ خەریکی خوێندنی وانەکانی ئیمان و سەرەتاکانی (فیقهـ) بوو، منالێکی هاوڕێی هات بۆ لای و باسی مردنی برایەکی خاوێن و بێ گوناهی خۆی بۆ کرد. ئەمیش دڵخۆشیی دایەوە و پێی وت:

(برام! مەگری.. شوکری خوا بکە.. چونکە براکەت لەگەڵ مەلائیکەتەکاندا ڕۆشتووە بۆ بەهەشت و لەوێ بەوپەڕی ئازادیەوە دەگەڕێت و، دڵنیابە کە حەوانەوە و خۆشیی ئەو لەوێ، لەچاو هی ئێمە لێرە گەلێ زیاترە. ئەو لەوێ لەگەڵ مەلائیکەتاندا دەفڕێت و هەموو جێگایەك دەگەڕێت و دەبینێت).

بەم جۆرە، گریە و زاریی هاوڕێکەی لابرد و گۆڕیی بە خۆشی و پێکەنین.

جا منیش (واتە نووسەر) وەك ئەو منالە چاو پڕ لە فرمێسکە وام. چونکە سەرەڕای ئەو بارە ئازاربەخشەی کە لەم زستانە پڕ لە پەژارە و خەفەتەدا هاتە ڕێم دەنگوباسی پڕ لە خەم و پەژارەی کۆچی دوایی دوو کەسیشم لە خۆشەویستانم پێ گەیشت..

یەکەمیان: (فوئادی برازام) بوو، کە یەکەمیی قوتابخانە باڵاکانی بەدەست هێنابوو، هەروەك ڕاستیەکانی پەیامەکانی نووریشی بڵاو دەکردەوە.

---

تا لە ساڵی ١٩٤٤ز لە بەندیخانەی "دەنیزلی"دا ژەهری دەرخوارد دراوە و شەهید کراوە. خوای گەورە نوقمی میهرەبانیی فراوانی خۆی بکات. (وەرگێڕ)

دووهەمیشیان: (خانمی خوشکم) بوو کە ئافرەتێکی زانا بوو، لە کاتی حەج و تەوافی کەعبەدا گیانی سپارد.

لە کاتێکدا کە دەنگوباسی مردنی ئەم دوانە منی کردە گریان بە چەشنی ئەو گریانەی لە مردنی "عەبدوڕڕەحمان"دا[1] هاتە ڕێم (وەك لە پەیامی پیراندا باس کراوە) لەم کاتـەدا، بە دڵ و دەروون هاوڕێیەتیی مەلائیکەت و حۆرییەکانم لەگـەڵ ئـەو لاوە پاك و ئافرەتـە خواپەرستەدا، لـە بریـی هاوڕێیـەتی خـەڵکی، دەبینـی. هـەروەها ڕزگاربوونیـانم لـە دەردیسەری و تاوانەکانی دنیا دەبینی. ئیتر کە ئەمەم بەهۆی نووری ئیمانەوە دی، دەستم بە شوکرانەبژێریی خوای گەورە کرد، کە ئەو خەفەت و پەژارە و ئازارەی بۆ گۆڕیـم بـە خۆشـی و هەسـتکردن بـە شـادمانی. ئنجـا پیرۆزبـاییم لـەوان و لـــە خـــۆم و بـــاوکی فوئادیش(عەبدولمەجیدی برام)[2] کرد.

بۆیـە لێرەشـدا ئەمـە نووسـرا، تـاکو ئـەو دوو خـوا لێخۆشـبووە بەرەکـەتی دوعایـان پێ بگات.

هـەرچـــی بـــەراوردکاری و تـــەرازووکاریی عەقـــڵی لـــە پـــەیامەکانی نـــووردا بەکارهێنراون و باس کراون، هـەموویان بـۆ مەبەسـتی ڕوونکردنـەوەی بەروبوومـەکانی بەختەوەری و ئاکامەکانی ئیمانە، چ لە دنیادا و چ لە دواڕۆژدا. جا هـەروەك بەروبوومـە هەمەکییەکانی ئیمـان بەختـەوەریی ژیـانی دنیـا پیشـان دەدەن و لـە درێژایـی تەمـەندا ئـەو بەختەوەرییە بـەو خـاوەن ئیمانـە دەبەخشـن و پێـی دەچێژن، هـەروەها هـەمان بـەروبووم ئەوەش دەردەخەن کە ئیمانی هەر باوەڕدارێك بەختەوەریی دواڕۆژی پێ دەبەخشێت و،

---

(١) ناوی "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلا"یە و برازای مامۆستا نوورسییە. لە سالی ١٩٠٣ز لـە گونـدی "نوورس" لە دایك بووە و، لە سالی ١٩٢٨ زیشدا لە گوندی "ذوالفضـــــل"ی نزیکی ئەنقـەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. ژیاننامەیەکی مامۆستا نوورسیی نووسیوە کە هـەر لـە سـەرەتای ژیـان و لەدایکبوونی مامۆستاوە تا سالی ١٩١٨ز باسی ژیانی ئەوی تێدا کردووە و، لـە کتێبێکـدا کـە لـە ئەستەمبوڵ چاپی کردبوو، بڵاوی کردەوە. (وەرگێڕ)

(٢) بچووکترینی براکانی مامۆستا نوورسییە. بەشێکی لـە پەیامەکانی نوور کردووە بە عـەرەبی، هـەروەك "إشارات الإعجاز" و "المثنوي العربي النوري"یشی کردووە بە تورکی. لە پێشـدا مامۆستای زمانی عـەرەبی و، پاشان موفتی و، ئنجا مامۆستای زانسته ئیسلامییەکان بووە لـە پەیمانگای باڵای شاری "قونیـا". لـە سـالی ١٩٦٧ز لە تەمەنی هەشتا و سێ سالیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

ئاماژەن بۆ ئەوەی: ئەم بەختەوەری‌یەی ئیمان، کە لەم دنیـادا بـەری گـرت، لـەو دنیاشـدا بەر دەگرێت و دەردەکەوێت.

لەو نموونانـەی کـە چـەند بـەروبوومێکی هەمـەکیی ئـەو ئیمانـە دەردەخـەن، (دە) دانـە بەروبوومم نووسی، پێنجیان هی میعراجە لە کۆتایی وتەی سی و یەکەمدا و، پێنجیشـیان لـە "لقی پێنجەمی وتەی بیست و چوارەم"دایە.

* * *

هەروەك پێش ئێستا باسی ئەوەمان کرد کـە هەریەکە لـە پایـەکانی ئیمـان بـەروبوومی لەئەندازەبەدەری خۆی هەیە، هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم پایانەی ئیمان پێکەوە و بە گشتی چەندین بەروبوومی لەژمارەبەدەریان هەیە..

یەکێك لەوانە: بەهەشتە..

یەکێکی تریان: بەختەوەریی هەمیشەیی‌یە..

یەکێکی تر: کە لە هەموویان بەتامولەزتترە، بینینی خوای گەورەیە لە بەهەشتدا.

لەو بەراوردکاری‌یەی کە لە کۆتایی "وتەی سی و دووهەم"دایە چەند بـەروبوومێکی ئەو ئیمانەی کە تەوەرەی بەختەوەریی هەردوو دنیایە، باس کراوە.

* * *

بەڵگە لەسەر ئەوەش کە "باوەڕ بە قەدەر" بەروبوومی گەورە و بەنرخی هـەر لـە ژیـانی دنیـادا هەیـە، ئـەو وتەیـە کـە بەسـەر زمـانی هەموانەوەیـە و وەك پـەندێك دەمـاودەم دەیگێڕنەوە، کە دەڵێت: "من آمَنَ بالقدر أمِنَ من الكدر". واتە: ئەو کەسەی باوەڕی بـە "قەدەر" ببێت، دڵنیایە لەوەی کە ئیتر هیچ ناخۆشی و لێڵی‌یەك ڕوو ناکاتە ژیانی.

لـە کۆتـایی "پـەیامی قـەدەر"یشـدا، یـەکێك لـە بەروبوومـە گشـتی‌یەکانی "بـاوەڕ بـە قـەدەر"م بـە نموونەیـەکی جـوان ڕوون کردووەتـەوە، کـە ڕۆشتنی دوو پیاوەکەیـە بـۆ نـاو باخچەی کۆشکی پادشایەك.. هتد.

تەنانەت من خۆیشم لە درێژایی ژیانمدا، بە هەزاران تاقیکردنەوە، بۆم ڕوون بووەتـەوە کە بە بێ ئیمان بوون بە "قەدەر" هیچ بەختەوەری‌یـەك لـە ژیـانی دنیـادا نـامێنێت. چونکـە ئەگەر ئەم ئیمانە نەبێت ئەو بەختەوەری‌یە لەناو دەچێت. لەوەش زیاتر؛ سـەرنجم داوە کـە

هەرکات لە گۆشەی باوەڕ بە قەدەرەوە دەمڕوانییە ئەو گیرو گرفتە ئازاربەخشانەی دەهاتنە ڕێم، یەکسەر ئەرك و قورسی ئەو گرفت و موسیبەتانەم لەسەر شان کەم دەبوونەوە. ئنجا بە سەرسووڕمانەوە لە خۆمم دەپرسی:

(ئایا ئەو کەسەی باوەڕی بە قەدەر نییە، چۆن دەتوانێت بژی)؟!

* * *

لە مەقامی دووهەمی "وتەی بیست و دووهەم"دا ئاماژەمان بۆ یەکێك لە بەروبوومە هەمەکییەکانی پایەی ئیمانیی "باوەڕ بە مەلائیکەت" بەم چەشنەی خوارەوە کردووە:

حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - عەرزی خوای کرد:

(کاتێ من فەرمانی گیانکێشان ئەنجام دەدەم، بەندەکانت لێم وەڕس دەبن و سکاڵام لە دەست دەکەن).

لە وەڵامدا پێی وترا:

(هەرچی نەخۆشی و بەڵا و موسیبەت هەن، دەیانکەم بە پەردە و، لە بەردەم ئەم کارمەندییەی تۆدا دایاندەنێم، بۆ ئەوەی سکاڵا لە دەست تۆ نەکەن و بە هی ئەو هۆکارانەی بزانن).

لە ڕاستیدا خودی فەرمانبەرییەکەی حەزرەتی عیزرائیلیش پەردەیەکە وەك ئەو پەردانە، تاکو سکاڵای ناڕەوا ڕوو لە خوای گەورە نەکات! چونکە لەبەر ئەوەی خەڵکی تەنها سەیری دیوی دەرەوەی شتان دەکەن، ئەوا ئەو دانایی و میهرەبانی و جوانی و بەرژەوەندییەی کە لە مردندا هەن، هەموو کەسێك نایانبینێت و دەست بە بیانوو و سکاڵا کردن دەکات. جا لەبەر ئەم دانستە (واتە: لەبەر ئەوەی سکاڵای ناڕەوا ڕوو لە خواوەندی میهرەبان نەکات) حەزرەتی عیزرائیلیش کراوە بە پەردەیەك لە بەردەم قەدەرەکانی خوای گەورەدا، وەك هەموو پەردەکانی تر.

کار و ئەرکەکانی هەموو مەلائیکەتان و گشت هۆکارە ئاشکراکانیش تێکڕا وەك ئەمەی باسمان کرد، بریتین لە چەند پەردەیەك کە لە بەردەم عیززەتی پەروەردگارێتیی خوادا دانراون. تاکو توانست و پاکی و بێگەردی و میهرەبانییە فراوانەکەی عیززەتی خوا لەو شتانەدا کە لایەنە جوانەکانیان نابینرێن و ڕاستییەکانی حیکمەتیان نازانرێن،

پارێزراو بن و هیچ سكالآیه‌كی ناڕه‌وا ڕوویان تێ نه‌كات و، ده‌ستی ڕاسته‌وخۆی توانستی خوا له‌و شته‌ هه‌نده‌كی‌یانه‌دا نه‌بینرێت كه‌ به‌ سه‌یر كردنی ئاشكرا و ڕواڵه‌تی به‌ كه‌م‌نرخ و پێچه‌وانه‌ی به‌زه‌یی دێنه‌ به‌رچاو.

به‌ڵێ، هه‌موو ئه‌مانه‌ په‌رده‌ن له‌ به‌رده‌م ئه‌و توانسته‌دا، ده‌نا هیچ هۆكارێك نی‌یه‌ كاریگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌ی ببێت. ته‌نانه‌ت هه‌ر له‌ تواناشیدا نی‌یه‌ هیچ شتێك له‌ نه‌بوونه‌وه‌ بهێنێته‌ بوون. له‌ لایه‌كی تریشه‌وه‌، په‌یامه‌كانی نوور به‌ به‌ڵگه‌ زۆر و فراوانه‌كانیان چه‌سپاندوویانه‌ كه‌:

ته‌مغه‌ و مۆری یه‌كتایی خوای گه‌وره‌ له‌سه‌ر هه‌موو شتێكی ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌ دراوه‌ و، چه‌سپاندووشیانه‌ كه‌: به‌دیهێنان تایبه‌ته‌ ته‌نیا به‌ خوای گه‌وره‌وه‌ و، هۆكاره‌كان له‌ په‌رده‌ زیاتر هیچی تر نین. مه‌لائیكه‌تانیش، كه‌ خاوه‌ن هه‌ست و شعوورن، ته‌نها به‌شێكی "جوزئی ئیختیاری" نه‌بێت هیچی تریان نی‌یه‌. ئه‌م جوزئه‌ ئیختیاری‌یه‌ش توانای به‌ده‌ستهێنان(الكسب)ی هه‌یه‌، نه‌ك به‌دیهێنان(الخلق)، كه‌ ئه‌م به‌ده‌ستهێنانه‌ش ته‌نها جۆره‌ خزمه‌ت و په‌رستشێكی عه‌مه‌لی‌یه‌ و هیچی تر نی‌یه‌.

به‌ڵێ، عیززه‌ت و گه‌وره‌یی خوا، خواستیان له‌سه‌ر دانانی په‌رده‌ ئاشكراكانه‌ له‌ به‌رده‌م چاوی ژیریدا، به‌ڵام یه‌كتایی(التوحید) و شكۆمه‌ندی(الجلال)ی خواوه‌ندیش ده‌ستی ئه‌و هۆكارانه‌ ده‌به‌نه‌ دواوه‌ و له‌ كاریگه‌ریی ڕاسته‌قینه‌ دووریان ده‌خه‌نه‌وه‌.

جا هه‌روه‌ك مه‌لائیكه‌ته‌كان و هۆكاره‌ ئاشكراكان له‌ كاروباری "خێر" و "بوون"دا و له‌و شتانه‌دا كه‌ لایه‌نی جوانی‌یان نابینرێت، ده‌خرێنه‌كار و، به‌مه‌ش ده‌بن به‌ چه‌ند هۆیه‌ك بۆ ته‌قدیس كردن و ڕێزلێنانی په‌روه‌ردگار، تاكو توانسته‌كه‌ی بپارێزن له‌وه‌ی كه‌ ته‌قسیر و سته‌می بدرێته‌ پاڵ.. به‌ هه‌مان جۆر، به‌كارهێنانی شه‌یتانه‌كانی جینی و ئینس و تو‌خمه‌ زیانبه‌خشه‌كانی "شه‌ڕ" و "نه‌بوون"یش جۆره‌ خزمه‌تگوزاری‌یه‌كه‌ بۆ ته‌قدیس كردن و ڕێز لێگرتن و پاك بۆڕوانینی په‌روه‌ردگار له‌ هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی كه‌ له‌ بوونه‌وه‌ردا به‌ ته‌قسیر و ناته‌واوی به‌رچاو بكه‌ون.

له‌به‌ر ئه‌مه‌، هه‌موو ئه‌وانه‌ توانستی خواوه‌ند ده‌پارێزن له‌وه‌ی كه‌ سته‌می بدرێته‌ پاڵ یان سكالآی ناڕه‌وای ئاراسته‌ بكرێت. چونكه‌ هه‌موو ته‌قسیر و ناته‌واوی‌یه‌ك له‌ "نه‌بوون" و كۆڵه‌واری(العجز) و، پشتگوێ خستنی ئه‌ركه‌كانی سه‌رشانه‌وه‌ په‌یدا ده‌بن،

کە هەریەك لەوانەش – لە ڕاستیدا – "نەبوون"ە. هەروەها لەو کردەوانەوە پەیدا دەبن کە "نەبوو" و عەدەمن و "بوون"یان نی‌یە.

کەواتە ئەم پەردانەی کە لە شەیتانەکان و شتە زیانبەخشەکان پێکهاتوون، بەهۆی ئەوەی کە هەرچی سکاڵا و ڕەخنەی لەمەڕ ئەو تەقسیرانە هەیە، دەیانگرنە خۆیان، ئەوا لەم ڕێیەوە بوون بەهۆی ئەوەی خواوەند تەقدیس بکرێت و لەو سکاڵایانە بپارێزرێت.

چونکە هەموو کردەوەیەکی زیانبەخش و ڕووخێنەر و نەبوو، هەرگیز پێویستی بە هێز و دەستەڵات نی‌یە. بەڵکو تەنها کردارێکی بچووك یان هێزێکی هەندەکی، تەنانەت لە هەندێ کاتدا پشتگوێ خستنی کارێك، سەری لە "نەبوون" و "فەساد"ەوە دەردەچێت. هەر لەبەر ئەوەشە گومان وا دەبرێت کە ئەو کەسەی کردەوە زیانبەخشەکەی ئەنجام داوە خاوەنی توانابێت. کەچی – لە ڕاستیدا – لە "نەبوون"دا نەبێت هیچ کاریگەری‌یەکی نی‌یە و، لە بەدەستهێنانی هەندەکی بەولاوە هیچ هێزێکی تری نی‌یە.

جا لەبەر ئەوەی ئەو کردەوە خراپانە لە "نەبوون"ەوە پەیدا بوون، ئەوا خراپکاران بە بکەری ڕاستەقینەیان دادەنرێن. خۆ ئەگەر خاوەن هەست و شعوور بوون، ئەوا شایستەی ئەوە دەبن کە سزای خۆیان بچێژن.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو خراپکارە زیانبەخشانە بە بکەری کردەوە خراپەکانیان دادەنرێن، بەڵام لە کردەوەی خێر و چاکەدا، لەبەر ئەوەی ئەو کردەوانە دارای "بوون"ن ئەوا ئەو خێرخواهانەی کە ئەنجامیان داون، بە بکەری ڕاستەقینەیان ناژمێررێن، بەڵکو شایستەی ئەوەن ئەو کردەوە چاکانەیان لەسەر دەست ڕووبدات. پاداشتدانەوەشیان لەسەر ئەو کردەوانە تەنها بەهۆی لێشاوی بەرەکەتی خوای گەورەوەیە. ئەمەش قورئانی پیرۆز لەم فەرمانەدا ڕوونی کردووەتەوە کە دەفەرموێ:

﴿ما أصابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ الله وما أصابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفسِكَ﴾ (النساء:٧٩).

**بە کورتی:**

کاتێ کە جیهانەکانی "بوون" و جیهانەکانی "نەبوون" بەیەکدا دێن و، "بەهەشت" و "دۆزەخ" بەرهەم دەهێنن..

کاتێ که هه‌موو جیهانه‌کانی بوون (الحمد لله.. الحمد لله) و، جیهانه‌کانی نه‌بوونیش (سبحان الله.. سبحان الله) ده‌ڵێنه‌وه و دووپاتیان ده‌که‌نه‌وه..

ته‌نانه‌ت کاتێ مه‌لائیکه‌ت و شه‌یتانه‌کان و، کرده‌وه چاك و خراپه‌کان ده‌که‌ونه زۆرانه‌وه..

له‌وه‌ش زیاتر؛ کاتێ که له ده‌وری دڵدا "ئیلهام" و "وه‌سوه‌سه" ده‌ست به ده‌مقاڵی و موناقه‌شه ده‌که‌ن..

کاتێ به‌پێی یاسای زۆرانبازیی گشتی هه‌موو ئه‌مانه ڕوو ده‌ده‌ن، ئه‌و کاته یه‌کێك له به‌روبوومه زۆره‌کانی "باوه‌ڕ به مه‌لائیکه‌ت" ده‌رده‌که‌وێت و مه‌سه‌له‌که کۆتایی پێ ده‌هێنێت و گیروگرفته‌کانیش چاره‌سه‌ر ده‌کات و، بوونه‌وه‌ری تاریك و نوته‌ك ڕووناك ده‌کاته‌وه و، یه‌کێك له نووره‌کانی ئایه‌تی: ﴿اللّٰهُ نورُ السَّموات وَالأَرْض﴾ ده‌رده‌خات و هه‌ندێکمان له شیرینی ئه‌و نووره پێ ده‌چێژێت، که تابڵێی شیرین و به‌تامه!!

* * *

له لایه‌کی تریشه‌وه "وته‌ی بیست و چواره‌م" و "وته‌ی بیست و نۆهه‌م" ئاماژه‌یان بۆ به‌روبوومێکی تری هه‌مه‌کی کردووه و، بوونی مه‌لائیکه‌ت و ئه‌رك و فه‌رمانه‌کانی ئه‌وانیان چه‌سپاندووه.

به‌ڵێ، پێویسته له به‌رامبه‌ر ئه‌و په‌روه‌ردگارێتی‌یه گه‌وره و فراوان و میهره‌بانه‌ی که به هه‌رچی شتی هه‌مه‌کی و هه‌نده‌کی هه‌یه - که له هه‌موو سووچ و گۆشه‌یه‌کی بوونه‌وه‌ردا بڵاوی کردوونه‌ته‌وه - خۆی ده‌ناسێنێت و خۆی له لای ئه‌وان خۆشه‌ویست ده‌کات.. پێویسته له به‌رامبه‌ر ئه‌مه‌وه، به‌ندایه‌تی‌یه‌کی گه‌وره و فراوان ببێت که له چوارچێوه‌ی ته‌قدیس و شوکر و ستایشدا پێشکه‌شی بکات.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی جه‌ماده‌کان و لایه‌نه گه‌وره و مه‌زنه بێ هه‌ست و گیانه‌کانی بوونه‌وه‌ر ناتوانن ئه‌م به‌ندایه‌تی‌یه گه‌وره‌یه ئه‌نجام بده‌ن، ئه‌وا مه‌لائیکه‌ته له‌ژماره‌به‌ده‌ره‌کان له بریی ئه‌وان ئه‌م به‌ندایه‌تی‌یه ده‌نوێنن. هه‌ر مه‌لائیکه‌تانن که به‌وپه‌ڕی دانست و گه‌وره‌یی‌یه‌وه ده‌توانن کاروباره‌کانی په‌روه‌ردگارێتیی خواوه‌ند له هه‌موو گۆشه و که‌نارێکی بوونه‌وه‌ر و گشت به‌شه‌کانیدا به‌ڕێ بکه‌ن، هه‌ر له‌سه‌ر ڕووی

زەوی‌یەوە هەتا ئەستێرەکان و، هەر لە ناخی زەویشەوە تا دەگاتە بڵندترین جێگای ناو بۆشایی ئاسمانەکان.

بۆ نموونە:

ئەو یاسا بێ گیان و مردووانەی کە فەلسەفە لە بۆچوونی خۆیدا بۆ دروستبوونی زەوی و کارمەندی‌یە سروشتی‌یەکەی، بە شێوەیەکی تاریك و سامناك دەریاندەبڕێت و پیشانیان دەدات، ئەم بەرهەمەی ئیمان دەیگۆڕێت و لە شێوەیەکی دڵرفێنی ڕووناکدا پیشانی دەدات. ئەوەتا ئەو دوو مەلائیکەتەی کە بە: "گا" و "نەهەنگ" ناونراون، گۆی زەوی لەسەر شانی خۆیان – واتە: لە ژێر چاودێری‌یاندا – هەڵدەگرن و، ئەو ماددەیەش کە سەر بە ژیانی دواڕۆژە و بە سەنگ(الصخرة) ناونراوە و لە بەهەشتەوە هێنراوە، بۆ ئەوەیە کە ببێت بە بەردی بناغەی هەمیشەیی و لەناونەچووی ئەم زەوی‌یە فانی‌یە. واتە هێمای ئەوەیە کە هەندێ لە بەشەکانی ئەم زەوی‌یە، زەوی‌یان لێ چۆڵ دەکرێت و دەنێررێن بۆ بەهەشت و، بۆ ئەوەش کە ببێت بە پاڵپشت و جێ پێی ئەو دوو مەلائیکەتەی کە بە "گا" و "نەهەنگ" ناونراون.

ئەم ڕیوایەتە بەم جۆرە لە هەندێ پێغەمبەرانی پێشووی بەنی ئیسرائیل گێڕراوەتەوە و، بە هەمان جۆریش لە ئیبن عەبباسەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – دەیگێڕنەوە. بەڵام زۆر جێی داخە کە ئەم تەشبیهە جوان و ناوەرۆك و واتا بەرز و بڵندە – بە درێژایی کات – لە لایەن نەزانانەوە بگۆڕرێت و ئەو دوو مەلائیکەتە بە جەستەی ماددی لە قەڵەم بدرێن، بە چەشنێك کە هەرگیز لە چوارچێوەی بیرکردنەوەکانی ژیریدا جێی نەبێتەوە! بەڵێ، ئەمە زۆر جێی داخە، چونکە مادەم مەلائیکەت لەناو خاك و گڵ و بەرد و هەموو جێگایەکی سەرزەویدا (هەروەك لە هەوادا) بتوانن بێن و بڕۆن و ئەرکی سەرشانی خۆیان جێ‌بەجێ بکەن، ئیتر چ ئەوان و چ گۆی زەویش هیچ پێویستی‌یەکیان بە جەستەیەکی ماددیی بەردین یان گا و نەهەنگ نی‌یە تاکو لەسەری ڕاگیر بن. بە واتایەکی تر: مەبەست لەم ڕیوایەتە تەنها لێچواندن(تشبیه)ە و هیچی تر نی‌یە[1].

---

(١) عن مالك في قوله عز وجل: ﴿وسع كرسيه السموات والأرض﴾ قال: إن الصخرة التي تحت الأرض السابعة، ومنتهى الخلق، على أرجائها أربعة من الملائكة، لكل ملك منهم أربعة وجوه: وجه إنسان ووجه أسد، ووجه نسر، ووجه ثور، فهم قيام عليها قد أحاطوا بالأرض والسموات ورؤسهم تحت الكرسي والكرسي (تحت) العرش. قال: وهو واضع رجليه تبارك وتعالى على الكرسي.

نموونەیەکی تر:

لەبەر ئەوەی گۆی زەوی بە ژمارەی سەری جۆرەکان(الانواع)ی ناو خۆی لە ڕووەك و گیاندار و بێ گیان و، بە ئەندازەی زمانی تاکەکانی ئەو جۆرانە و، بە ئەندازەی ئەندام و گەڵا و بەروبوومەکانیان، سوپاس و تەسبیحاتی خوای خۆی دەکات. ئاشکراشە کە پێشکەش کردن و نواندن و ڕاگەیاندنی ئەم تەسبیحات و سوپاسە سروشتی‌یە بێ هەست و زۆر گەورەیە (لە ڕێگای هەست و شعوورەوە) لە بەردەم بارەگای موقەددەسی خواوەندا، کارێکە لە توانای خۆیدا نی‌یە. لەبەر ئەوە، بە حەتمی پێویستی بە مەلائیکەتێك دەبێت ئەم کارە ئەنجام بدات کە چل هەزار سەری ببێت و، لە هەر سەرێکیشدا چل هەزار زمانی ببێت، کە بە هەریەکەیان چل هەزار تەسبیحاتی خواوەند بکات، هەروەك هەواڵدەری ڕاستگۆ ﷺ ڕایگەیاندووە.

بەڵێ، یەکێك لە داخوازی‌یەکانی گەورەیی و شکۆمەندیی پەروەردگاریێتیی خواوەند ئەوەیە: حەزرەتی جیبریل – درووودی لەسەر بێت – کە ئەرکی گەیاندن و پەیوەندی‌یەکانی نێوان پەروەردگار و ئەو مرۆڤەی پێ سپێرراوە کە پوختەترین و بەڕێزترینی بەدیهێنراوانی بوونەوەرە، یەکێك لەو داخوازی‌یانە ئەوەیە کە ئەم مەلائیکەتە (جبریل) لەسەر شێوە و چۆنێتی‌یەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر بێت[1].

هەروەها داخوازی ئەوە دەبن کە عیزرائیل و ئیسرافیلیش – درووودیان لەسەر بێت – لەسەر شێوە و چۆنێتی‌یەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر بن و، دەوری نواندنی – تەنها نواندن – کاروبارە تایبەتی‌یەکانی خواوەندی بەدیهێنەر ببینن و، بە پەرستنێکی خاوێن و دڵسۆزانەوە سەرپەرشتیی گەورەترین شتی لەمەڕ جیهانی بوونەوەران بکەن، کە بریتی‌یە لە مردن و زیندوو کردنەوە.

---

أخرجه عبدالله بن الإمام احمد في كتاب (السنة) برقم ٥٨٩، ٣٠٣/١ في إسناده مجهول والمـدى معروف بالوهم وبقية رجاله ثقات. وعزاه السيوطي في الدر المنثور ٣٢٩/١ لعبد بن حميد وأبو الشيخ في العظمة وأخرجه أيضاً البيهقي في الأسماء والصفات ص/٤٠٣ وقد أخرجه عبد الرزاق وعبد بن حميد وابن المنذر كما في الدر المنثور باختلاف في السياق ٢٦١/٦ من كلام وهب بن منبه وهو ثقة كثير النقل من كتب الإسرائيليات. (انظر الميزان ٣٥٢/٤). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی)

(١) لە حەدیثی صەحیحدا، کە ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، ئەوە هاتووە کە حەزرەتی جیبرائیل شەش سەد باڵی هەیە، سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: صحيح البخاري ١٤٠/٤٦، صحيح المسلم ١٠٩/١، اللوءلوء والمرجان ٤١/١. (وەرگێڕ)

هەروەها داخوازی ئەوە دەبن کە میکائیلیش - دروودی لەسەر بێت - بە هەمان جۆر لەسەر شێوە و چۆنێتی‌یەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر بێت. چونکە ئەم مەلائیکەتە بە هەست و شعوورێکی تەواوەوە، هەموو جۆرەکانی ئەو شوکر و ستایشە بێ‌هەستانە لەسەر چاکە و بەخشایشەکانی خواوەند، دەردەبڕێت و دەنوێنێت لەو ڕۆزی‌یەدا کە گەورەترین بازنەی ژیان و بەرینترین کەمەرەی بەزەیی‌یە و، لە هەموویشیان زیاتر هەست پێ کراوە. ئەمە چ جای ئەوەی کە سەرپەرشتیشیان دەکات.

بەڵێ، یەکێك لە داخوازی‌یەکانی گەورەیی و شکۆمەندیی پەروەردگاریتی خوای گەورە: "مانەوەی گیان"ە و بوونی ئەو مەلائیکەتانەیە لە چۆنێتی‌یەکی سەیر و سەرسووڕهێنەردا. چونکە بوونی ئەوان و هەموو تیرە تایبەتی‌یەکانیان هیچ گومانێکی تێدا نی‌یە و بە دڵنیایی و بە ئەندازەیەکی ئەوتۆ چەسپاوە کە شایانی چەسپاندنی بوونی ئەو پەروەردگاری و شکۆمەندی‌یە ئاشکرا و ڕوونەیە کە لە بوونەوەردا وەك خۆر ئاشکرا و دیارە. جا با ئیتر بەشەکانی تری مەلائیکەت بەم پێ‌یە و بەم تەرازووە بەراورد بکرێن.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە چوارسەد هەزار جۆری زیندەوەر لەسەر ڕووی زەویدا بەدی دەهێنێت، تەنانەت لە ئاسایی‌ترین مادده و شتە بۆگەنەکان چەندین گیانداری زۆر بەدی دەهێنێت و سەر ڕووی زەوی‌یان پێ ئاوەدان دەکاتەوە و، وایان لێ دەکات کە لە بەردەم موعجیزەی کرداری خوادا بە سەرسووڕمانەوە بڵێن: "ماشاء الله، بارك الله، سبحان الله"..

ئەو خوایەی کە وای لە گیاندارە وردەکانیش کردووە کە لە بەردەم چاکە و نیعمەتە فراوانەکەی میهرەبانیی خوادا پڕ بە دەم بڵێن: "الحمد لله والشكر لله والله اكبر"..

ئەو خواوەندە شکۆمەند و خاوەن گەورەیی و جوانی و توانستەی کە ئەم کارانە ئەنجام دەدات، بێ هیچ گومانێك، ئاسمانە بەرین و فراوانەکان بە چەندین خاوەن گیان(روحانیات)ی ئەوتۆ کە لەگەڵ ئەو ئاسمانانەدا بگونجێن، نیشتەجێ کردووە، لەوانەی کە لە فەرمانەکانی دەرناچن و هەردەم لە بەندایەتیدان.

کەواتە ئەو ئاسمانانە بە چۆڵی ناهێڵێتەوە و بەوان ئاوەدانیان دەکاتەوە. بۆ ئەمەش ئەوەندە مەلائیکەتی جۆراوجۆری بەدی‌هێناوە کە گەلێ لە جۆر و چینەکانی زیندەوەرانی تر زیاترن. چونکە جۆرێکیان ئەوەندە بچووکن کە سواری پشتی کلووی

بەفر و دڵۆپی بارانەکان دەبن و، بە زمانی تایبەتیی خۆیان شەوق و خۆشەویستی‌یان لە بەرامبەر بەدیهێنان و میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە دەردەبڕن.. هەندێکی تریشیان سواری هەسارە گەڕۆکەکان دەبن و هەردەم لە گەشتی بۆشایی بەرینی گەردووندان و، بەم زیکر و تەهلیلەیەی کە لە بەردەم گەورەیی و پەروەردگاریتیی خوادا دەیکەن، بەندایەتیی خۆیان بۆ خواوەند، بۆ هەموو جیهان ڕادەگەیەنن[1].

بەڵێ، یەکگرتنی وتەی گشت کتێبە ئاسمانی‌یەکان و هەموو ئایینەکان، لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە – دروودی لەسەر بێت – تا ئێستا، لەسەر بوونی مەلائیکەتان و بەندایەتی‌یان بۆ خوای خۆیان، هەروەها ئەو ڕیوایەت و فەرموودە زۆر و دوور لە گومانانەی کە باسی وتووێژ دەکەن لەگەڵ مەلائیکەتدا کە بە درێژایی گشت چەرخەکان ئەم وتووێژە ڕووی داوە.. هەموو ئەمانە، بە بێ ئەوەی هیچ گومانێك بهێڵنەوە، "بوونی مەلائیکەت و پەیوەندی‌یان لەگەڵماندا" دەچەسپێنن، بە چەشنی گومان نەبوونمان لە بوونی ئەوانەی کە نەماندیون و لە ئەمریکادا دەژین.

ئێستاش تامی ئەم بەروبوومە هەمەکی‌یەی دووهەمی ئیمان بچێژە و، بە نووری ئیمان بۆی بڕوانە و، بزانە کە چۆن هەموو گەردوون و بوونەوەرانی خستووەتە شەوق و مەراقەوە و، ئاوەدانی کردووەتەوە و، ڕازاندوویەتەوە و، کردوویەتی بە پەرستگا و مزگەوتێکی گەورە و فراوان. چونکە ئەو بوونەوەرەی کە فەلسەفە و زانست تاریك و سارد و بێ ژیان پیشانی دەدەن، بەهۆی ئیمانەوە، دەبێت بە بوونەوەرێکی خاوەن ژیان و هەست و شعوور و، ڕووناك دەبێتەوە و، تام و لەزەتێکی خۆش دەبەخشێت. جا ئەم بەرهەمەی ئیمان تیشکێکی لەزەتی خۆشی ژیانی ئەودنیا، هەر لەم دنیایەدا، بە ئیمانداران – هەر کەسەو بەپێی پلەی ئیمانەکەی – دەبەخشێت.

* * *

(١) روى أبو داود بسند صحيح أن النبي ﷺ قال: أُذن لي أن أتحدث عن مَلَكٍ من حَمَلة العرش رجلاه في الأرض السفلى وعلى قرنه العرش، ومن شحمة أذنه وعاتقه خفقان الطير سبعمائة عام فيقول ذلك الملك: سبحانك حيث كنت! (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

## پاشماوە:

هەروەك بەهۆی نهێنی "وەحدەت" و "ئەحەدییەتەوە" لە هەموو سووچ و گۆشەیەکی بوونەوەردا: هەمان توانست و، هەمان ناو و، هەمان داهێنان هەیە و.. هەموو بەدیهێنراوێك - بە هەمەکی و هەندەکی‌یانەوە - بە زمانی حاڵ: یەکتایی و، توانست و، پەروەردگاریتی و، بەدیهێنان و، قودسییەتی خواوەندی بەدیهێنەر رادەگەیەنن.. بە هەمان جۆر، ئەو خواوەندە لە هەموو جێیەکی بوونەوەریشدا چەندین مەلائیکەت بەدی دەهێنیت، تاکو بە زمانە زۆرەکانیان - کە هەردەم لە زیکری خوادا پاراون - تەسبیحاتی ئەو بەدیهێنراوانە دەربڕن و پێشکەشیان بکەن کە بە زمانی حاڵ و پێوستیی خۆیان دەیانکەن. چونکە مەلائیکەتەکان هەرگیز سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوای گەورە ناکەن و، جگە لە "بەندایەتی" هیچی تر شك نابەن و، هەرگیز توانای بەدیهێنان و دروستکردنیان نی‌یە. تەنانەت ناتوانن هیچ کارێك، بە بێ فەرمان و ڕوخسەت، بکەن. لەوەش زیاتر؛ هیچ پاڕانەوە و تکا و شەفاعەتێکیان پێ ناکرێت مەگەر ڕوخسەت لە خوای گەورە بخوازن. هەر لەبەر ئەوەشە کە بەم پایە و پلەیە شەرەفمەند بوون کە خوا باسی دەکات و دەفەرموێ:

﴿بل عبادٌ مُكرَمون﴾ (الأنبياء:٢٦).

﴿ويَفعلون ما يُؤمرون﴾ (التحريم:٦).

# تیشکی دوازدەهەم

## بەرگریی بەردەم دادگای دەنیزلی[1]

باسمه سبحانه

بەڕێزان!

دووپاتی دەکەمەوە بۆتان کە ئەو کەسانەی لێرەدان یان هیچ پەیوەندییەکیان بە "پەیامەکانی نوور"ەوە نییە، یاخود تەنها پەیوەندییەکی سادە و ساکاریان لەگەڵ پەیامەکاندا هەیە. لە کاتێکدا کە من گەلێ برای ڕاستەقینەم هەیە، بە هەموو واتایەکی "برایەتی" کە بتوانن تەسەووری بکەن. هەروەها چەندین هاوڕێشم لەسەر ڕێ و ڕێبازی حەقیقەتدا هەیە لەوانەی کە گەیشتوونەتە حەقیقەت.

بەڕێزان! ئێمە یەقینی نەبزواوی تەواوەتیمان بەوە هەیە کە "مردن"مان - بەهۆی نهێنیی قورئانی پیرۆزەوە - هەرگیز ئیعدامی هەتاهەتایی نییە، بەڵکو ڕوخسەتنامەی حەوانەوەیە. کەچی دڵنیایین لەوەی کە "مردن" سەبارەت بە نەیارەکانمان و ئەوانەی لەسەر ڕێبازی گومڕایین، مردنێکی بێ گومان و ئیعدامێکی هەمیشەییە (گەر هیچ باوەڕێکیان بە قیامەت نەبێت). یان مردن سەبارەت بەوان بەندیخانەیەکی تاکەکەسی و هەتاهەتایی و تاریکە (گەر باوەڕیان بە دوارۆژی قیامەت بێت، بەڵام نوقمی ژیانی هەرزەیی و گومڕایی بووبن).

---

(١) مامۆستای بەڕێزمان "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" هەندێ دەستکاریی لابردن و لێ زیادکردنی لەم بەرگرییەی بەردەم "دادگای دەنیزلی"دا ئەنجام داوە و، پاشان وەك بەرگرییەك پێشکەشی "دادگای ئافیوون"یشی کردووە، چونکە کێشەی هەردووکیان هەر یەکێك بووە. ئنجا بەشی هەرە گەورەی ئەم بەرگرییەشی لەگەڵ بەرگرییەکەی دادگای ئافیووندا پێکەوە گرێ داوە و ناوی (تیشکی چواردەهەم)ی لێ ناوە. (قوتابیانی نوور).

وا من لێتان دەپرسم کە: ئایا هیچ کێشەیەك لەم دنیایەدا هەیە لە کێشەی مردن گەورەتر بێت؟.. ئایا هیچ مەسەلەیەك لەناو گرۆی مرۆڤدا هەیە کە لەمە گرنگتر بێت؟ ئیتر ئایا چۆن دەگونجێت ئەم مەسەلە و کێشە گەورەیە لە پێناوی شتی تردا بەکار بهێنرێت مادەم هیچ شتێکی تر نەبێت کە لەم مەسەلە و کێشەیە گەورە و گرنگتر بێت؟ ئیتر بۆچی ئێوە بەم جۆرە خۆتان بە ئێمەوە سەرقاڵ کردووە؟!

ئێمە قورسترینی سزاکانتان وەك ڕوخسەتنامە و پسوولەیەکی سەفەر دەبینین بەرەو جیهانی ڕووناکی، بۆیە بە دامەزراوی‌یەکی تەواوەتی‌یەوە چاوەڕوانی دەرچوونی ئەو ڕوخسەتنامەیە دەکەین. بەڵام لە هەمان کاتدا بە دڵنیایی‌یەوە دەزانین کە ئەو کەسانەی لە دژمان ڕاوەستاون و بڕیارەکانیان لەسەر ئێمە دەردەکەن، بەم نزیکانە یان بە ئیعدامی هەتاهەتایی یان بە زیندانی و بەندیخانەی تاکەکەسی ڕووبەڕووی سزا و تۆڵەی ترسناکی خۆیان دەبنەوە. ئێمە هێندە لەم ئاکامە دڵنیاین کە هەروەك بە چاوی خۆمان ئێوە لەم کۆڕ و ئەنجومەنەدا دەبینین دەڵێی ئەوانیش بە هەمان جۆر لەناو سزاکانیاندا دەبینین. بەڵێ، بەم جۆرە دەیانبینین و، لە ڕووی مرۆڤایەتی‌یەوە گەلێ بەزەییمان بە حاڵیاندا دێتەوە. بە تەواوی ئامادەشم کە ئەم ڕاستی‌یە گرنگە بچەسپێنم و بەڵگەی لەسەر بهێنمەوە و گەورەترین کەسی سەرسەخت و ملنەدەریش لەمەدا بێدەستمەوە. هەروەك ئامادەیی تەواوەتیشم بۆ قبووڵ کردنی هەر سزایەك دەردەبڕم کە ئەگەر ڕوونتر لە خۆری ناوجەرگەی ئاسمان ئەم ڕاستی‌یە لە بەردەم گەورەترینی زانا و فەیلەسووفەکانتاندا نەچەسپێنم، چ جای لە بەردەم پسپۆڕانی ئەم لیژنەیەدا، کە لە زانین و پسپۆڕی بێ بەشن و، دڵیان لە ڕق و کینە پڕ بووە و، هیچ ئاگایەکیان لە مەعنەوییات نی‌یە و بایەخی پێ نادەن!

وەك نموونەیەك لەسەر ئەمە: لە ماوەی دوو حەفتەدا پەیامی "بەری درەختی ئیمان"مان بۆ بەندکراوەکان دانا، کە پەیامێکە پوختەی ئامانج و بناغەکانی پەیامەکانی نوور دەخاتە ڕوو، هەروەك بەرگری لە "پەیامەکانی نوور"یش دەکات. وا ئەم پەیامەتان پێش‌چاو دەخەم و، بۆ مەبەستی ئەوەش کە بخرێتە بەردەست دەزگا ڕەسمی‌یەکانی ئەنقەرە، ئەوا بە نهێنی ئەرك و ماندووبوونێکی قورس هەڵدەگرین لە پێناوی نووسینەوەیدا بە پیتە نوێکان[1] و، ئێستا ئێوەش بۆ خوێندنەوەی ئەم پەیامە بانگ دەکەم. جا ئەگەر دوای

(١) واتە بە پیتی لاتینی. (وەرگێڕ)

خوێندنەوەی، دڵەکانتان – نەك دەروونەکانتان – تەسدیقیان نەکردم، ئەوا بە هەموو جۆرێکی ئەشکەنجە و سووکایەتیی ناو ئەم زیندانە تاکەکەسییەم ڕازیم کە ئێستا تیایدام و، دەمم بە دەربڕینی هیچ سکاڵایەك ناکەمەوە!

**بە کورتی:**

ئێوە تەنها دوو ڕێگاتان لە بەردەمدایە: یان سەربەستیی تەواوەتی بە پەیامەکانی نوور بدەن.. یان – گەر دەتوانن – بەسەر ڕاستییەکانی ناو ئەو پەیامانەدا زاڵ ببن و لەناویان بەرن!

من تا ئێستا نە بیرم لە ئێوە دەکردەوە و نە لە دنیاکەشتان. تەنانەت نیازم نەبوو لە ئایندەشدا بیریان لێ بکەمەوە. بەڵام خۆتان ناچاری ئەمەتان کردم و، لەوانەشە ئەمە بۆ بێدارکردنەوەی ئێوە پێویست بووبێت و قەدەری خواوەندیش بۆ ئەم مەبەستە ئێمەی هێنابێتە ئێرە. بەڵام ڕابەری ئێمە تەنها ئەو دەستوورەیە کە دەڵێت: "من آمن بالْقَدَر أمِنَ من الْكَدر". لەبەر ئەوە، بڕیارمان داوە بەوپەڕی ئارامییەوە هەموو جۆرە گوشار و تەنگ پێ هەڵچنینێك هەڵبگرین کە بیهێننە ڕێمان.

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

بەڕێزان!

لە ئەنجامی چەند بەڵگە و نیشانەیەکی زۆرەوە قەناعەتی تەواوم بۆ دروست بووە کە هۆی ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەرمان ئەو بۆچوونە هەڵەیە نییە کە گوایا ئێمە (هەست و نەستی ئاینیی لە پێناوی تێکدانی ئاسایشی ناوخۆدا بەکار دەهێنین). نەخێر، ئەو هێرشەی کە لە ژێر ئەو پەردە ساختە و ڕووکەشەدا دەکرێتە سەرمان تەنها لە پێناوی کوفر و ئیلحاددایە و، مەبەست لەناوبردنی ئیمانەکەمان و کۆتاییهێنانە بە هەوڵ و تەقالاکانمان و ڕێ گرتنە لە خزمەتەکانمان لە پێناوی ئەم ئیمانە و ڕاگیرکردنی ئاسایش و هێمنیی وڵاتدا. ئێمە گەلێ بەڵگەی زۆرمان لەسەر ئەمە بەدەستەوەیە. با تەنها یەك دانە لەو بەڵگانەتان پێش چاو بخەین:

بیست هەزار کەس لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا بیست هەزار نوسخەی پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە و بەو پەیامانە ڕازی بوون و قبووڵیان کردوون، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها یەك دانە ڕووداوی تێکدانی ئاسایش لە لایەن قوتابیانی نوورەوە لەم ماوە درێژخایەنەدا ڕووی نەداوە و دەزگا ڕەسمی یەکان هیچ ڕووداوێکی لەم جۆرەیان لەسەر تۆمار نەکردوون، هەروەك دادگای پێشین و ئەم دادگایەی ئێستاش نەیانتوانی هیچ ڕووداوێکی لەم جۆرە بدۆزنەوە، لە کاتێکدا کە دەبوو ئەنجامی ئەم پڕوپاگەندە بەهێز و بەربڵاوە، نەك لە بیست ساڵدا، بەڵکو لە ماوەی بیست ڕۆژدا و لە شێوەی چەند ڕووداوێکدا دەربکەوتایە!

کەواتە یاسای ژمارە "١٦٣"[1] تەنها پەردەیەکی ساختە و درۆینەیە لە ڕووی سەربەستیی ویژدان و ئازادیی بیروباوەڕدا بەرز دەکرێتەوە و، یاسایەکی پلاستیکیی وایە کە هەموو ئایینداریك و گشت ئامۆژگاران و بانگەوازکاران بگرێتەوە و، مولحیدانیش تەنها ئەوەندەیان دەوێت کە هەندێ بەرپرسی حکوومەت بخەڵەتێنن و بۆ لێدانمان و شکست پێهێنانمان بەکاریان بهێنن.

مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئەوا بە هەموو هێزێکمانەوە دەنگی لێ هەڵدەبڕین و دەڵێین:

ئەی ئەو بەدبەختانەی کە بەربوونەتەوە بۆ ناو چاڵی قووڵی کوفری موتلەق! ئەی ئەوانەی کە ئایینەکەتان بە دنیاتان فرۆشتووە!

چیتان لەدەست دێت دریغی مەکەن! یاخوا ئاکامی دنیاکەتان هەر ناکامی بێت، هەروەك دەشبێت. بەڵام ئێمە ئامادەین سەری خۆمان لە پێناوی ئەو ڕاستی‌یە خاوێنەدا بەخت بکەین کە سەدان ملیۆن پاڵەوان سەری خۆیان لە پێناودا بەخت کردووە. بۆیە ئێمە ئامادەی پێشوازی لێکردنی هەموو جۆرە سزایەکتانین، تەنانەت ئامادەین بۆ بڕیاری لەسێدارەدانیش کە لە دژمان دەری بکەن.

حاڵی دەرەوەی بەندیخانەمان - لەم بارودۆخانەدا - سەد جار خراپترە لە حاڵمان لەناو بەندیخانەکاندا. ئیتر دوای ئەم ئیستبدادە ڕەهایەی کە ئاراستەی ئێمە کراوە، هیچ

---

(١) دەقی ئەم یاسایە بە ڕاشکاوی سزا لەسەر ئەو کەسە دادەنێت کە هەوڵ بدات دەوڵەتێکی ئایینی لە تورکیادا دابمەزرێنێت، یان هەست و نەستی ئایینی لەم پێناوەدا بەکار بهێنێت. هەر ئەم یاسایەشە کە تا ئێستا سەرجەمی حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا (تەنانەت هەندێ لەوانەش کە هەست و نەستی ئایینی جەماوەر دەقۆزنەوە لە هەڵبژاردنەکاندا) بۆ لێدانی کار و چالاکی‌یە ئیسلامی‌یەکان پشتی پێ دەبەستن. (وەرگێڕ)

جۆرە سەربەستی و ئازادییەکمان بۆ نەماوەتەوە؛ نە ئازادیی زانستی، نە ئازادیی ویژدان، نە ئازادیی ئایین. واتە جگە لە "مردن" یان "چوونە بەندیخانە" هیچ ڕێگایەکی تر لە بەردەم ئەهلی شەهامەت و غیرەت و ئایین و پشتگیرانی ئازادی و خۆشەویستانیدا، نەماوەتەوە.

سەبارەت بە خۆیشمانەوە هەر ئەوەندەمان پێ دەکرێت کە هانا تەنها بۆ پەروەردگار ببەین و دەستی لێ گیر بکەین و بڵێین:

﴿إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾.

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

بەڕێز عەلی ڕەزا، سەرۆکی دادگا!

بۆ ئەوەی بتوانم داکۆکی لە مافەکانی خۆم بکەم، ئەوا تکا و داواکارییەکی گەرمتان پێش‌چاو دەخەم:

من پیتە نوێکان شارەزا نیم و لە پیتە کۆنەکانیشدا دەستخەتم باش نییە، پاشان چاوپێکەوتنی کەسانی تریشیان لێ قەدەغە کردووم. واتە وەك ئەوە وام کە لە دابڕانێکی تەواوەتی یان زیندانی تاکەکەسیدا بم، بە ڕادەیەك کە کاتێ تۆمەتنامەی داواکاری گشتی(المدّعي العام)یان دایە دەستم یەکسەر دوای چارەکە سەعاتێك لێیان سەندمەوە! هەروەك لە ڕووی داراییشەوە ناتوانم پارێزەرێك بگرم بۆ بەرگری کردن لە خۆم و، دوای ماندووبوونێکی زۆریش ئنجا توانیم بەرگرییەکەی خۆمتان پێشکەش بکەم و، بە شێوەیەکی نهێنیش توانیم نوسخەیەکی ئەم بەرگرییەم دەست بکەوێتەوە کە بە پیتە نوێکان نووسراونەتەوە. ئنجا پەیامی "بەری درەختی ئیمان"یشم (کە وەك بەرگرییەك وایە لە پەیامەکانی نوور و پوختەی ڕێبازی ئەو پەیامانە دەردەخات) نووسییەوە تاکو پێشکەشی "داواکاری گشتی"ی بکەم و، یەكدوو نوسخەشی بۆ لایەنە ڕەسمییەکانی ئەنقەرە بنێرم. بەڵام پەیامەکەیان لێ سەندم و نەیاندامەوە. لە کاتێکدا کە لایەنە

دادوەرەكانی "دادگای ئەسكی شەهر" ئامێرێكی چاپی دەستی‌یان بۆ ناردمە ناو بەندیخانەو، توانیمان لەو ڕێیەوە چەند نوسخەیەكی بەرگری‌یەكەم بە پیتە نوێكان بنووسینەوە، هەروەك دادگا خۆیشی ئەو بەرگری‌یەی نووسی‌یەوە.

جا ئەو داوایەم كە بەلامەوە گرنگە بریتی‌یە لەوەی ئامێرێكی چاپی دەستیمان بۆ بنێرن، یان بوارمان بدەن كە خۆمان بیهێنین، تاكو بتوانین چەند نوسخەیەكی پەیامی "بەری درەختی ئیمان"ی پێ بنووسینەوە، كە وەك زووتر وتم: بە وێنەی بەرگری وایە لە خۆم و لە پەیامەكانی نوور بۆ ئەوەی چەند نوسخەیەكی لێ بنێرین بۆ وەزارەتی داد و ئەنجوومەنی وەزیران و ئەنجوومەنی پەرلەمان و ئەنجوومەنی شوورای دەوڵەت. چونكە ئەو تۆمەتانەی كە داواكاری گشتی ئاراستەی ئێمەی كردوون هەموویان لە بارەی پەیامەكانی نوورەوەن. خۆ بێ گومان هەر دەعوا و ئیعتیرازێك لەسەر پەیامەكانی نوور بێت هەرگیز بە شتێكی ئاسایی و سووك دانانرێت و وەك مەسەلەیەكی كەسیی بێ‌بایەخ تەماشا ناكرێت، بەڵكو مەسەلەیەكی گشتی‌یە و ڕووداوێكی گەورە و گرنگە سەبارەت بەم وڵات و نەتەوە و حكوومەتەوە، كە ئەمەش سەرنجی بایەخی سەرانسەری جیهانی ئیسلامیی بەلادا ڕادەكێشێت.

ئەو پەنجانەی كە لە پشتی پەردەوە لەگەڵ پەیامەكانی نووردا دەجەنگن چەند پەنجەیەكی بیانی و دەرەكین و دەیانەوێت ئەو خۆشەویستی و برایەتی‌یە تێكبشكێنن كە لە دڵی جیهانی ئیسلامیدا هەیە بەرامبەر بەم نەتەوە و نیشتمانە، كە هەر تەنها ئەم خۆشەویستی و برایەتی‌یەشە بە گەورەترین هێزی ئەم نەتەوەیە دادەنرێت. جا بۆ مەبەستی تێكشكاندنی ئەم برایەتی و خۆشەویستی‌یە و گۆڕینی بە ڕق و نەفرەت، ئەوا چەند پەنجەیەك هەن كە لە پشتی پەردەوە هەوڵ دەدەن سیاسەت بقۆزنەوە و بیكەن بە ئامێر و هۆكارێك بۆ برەودان بە ئیلحاد و كوفری موتڵەق. بەمەش فێڵ لە حكوومەت دەكەن و لە خشتەی دەبەن. هەر ئەو پەنجانەش بوون كە دووجار سەریان لە "دادگەری" شێواند و وتیان: "قوتابیانی نوور ئایین لە پێناوی سیاسەتدا بەكار دەهێنن و، گریمانیش هەیە ئاسایشی وڵات لەمەوە زیانی پێ بگات".

ئێمەش پێیان دەڵێین: ئەی بەدبەختینە! پەیامەكانی نوور هیچ پەیوەندی‌یەكیان بە سیاسەتەوە نی‌یە، بەڵكو ئەو كوفرە موتڵەقە تێكدەشكێنن و وردوخاشی دەكەن و بەرەودوا دەیگێڕنەوە كە لای خوارووەكەی: فەوزایە و لای سەرووەكەشی: ئیستبدادێكی ڕەهایە! باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە پەیامی "بەری درەختی ئیمان"ە كە وەك

یەك دانە بەڵگە وایە لە نێوان سەد بەڵگەدا لەسەر ئەوەی کە پەیامەکانی نوور بۆ دامەزراندن و سەقامگیرکردنی ئاسایش و ڕێسا و ئازادی و دادگەری لەم وڵاتەدا تێدەکۆشن. لەبەر ئەوە، داوا دەکەم دەستە و لیژنەیەکی بەرزی زانستی و کۆمەڵایەتی بۆ لێ وردبوونەوەی ئەم پەیامە پێك بهێنرێت. جا ئەگەر ئەم دەستەیە قەناعەتی بەم قسانەم نەکرد، ئەوا من بە هەموو سزایەك و بە گشت جۆرێکی ئیعدام ڕازیم.

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

سەرۆکی بەڕێز!

لە بڕیاری دادگادا سێ بناغە دەستنیشان کراوە:

**ماددەی یەکەم:** "کۆمەڵە".

من هەموو قوتابیانی نووری ئێرە و گشت ئەو کەسانەی منیان دیوە و قسەیان لەگەڵدا کردووم و سەرجەمی ئەوانەش کە پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە یان نووسیویاننەتەوە، دەگرم بەشایەت و، خۆشتان دەتوانن لێیان بپرسن تاکو دڵنیا ببن لەوەی کە من بە هیچ کەسێکم نەوتووە: ئێمە "کۆمەڵەیەکی سیاسی" یان "تەریقەتێکی نەقشبەندی" پێکدەهێنین. بەڵکو هەمیشە وتوومە: "ئێمە هەوڵ دەدەین ئیمانەکەمان ڕزگار بکەین" و، هەرگیز قسەیەکمان لە نێواندا نەبووە کە هی دەرەوەی سەرجەمی ئەهلی ئیمان و دەرەوەی ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە خاوێنە بێت کە ژمارەیان لە سێ سەد ملیۆن[1] موسڵمان زیاترە و، هیچ جێ‌یەکمان لە دەرەوەی ئەو ناوی "حزب اللّٰه"یەدا بۆ خۆمان دانەناوە کە ناوێکە قورئانی پیرۆز لە هەموو موسڵمانانی ناوە و سەرجەمی ئیماندارانی لە ژێر سایەی ئیماندا کۆکردووەتەوە. جا لەبەر ئەوەی ئێمە هەموو هەوڵێکمان لە خزمەتی قورئاندا چڕ کردووە، ئەوا بێ گومان ئێمە لە "حیزبی قورئان" و

(١) ئەمە نزیکەی ژمارەی موسڵمانانی جیهان بووە لەو کاتەدا. (وەرگێڕ)

"حزب الله"ین. جا ئەگەر بڕیاری تۆمەتبارکردنمان ئاماژە بۆ ئەمە دەکات، ئەوا ئێمە بە هەموو هێزێکی گیان و هەناومان و بەوپەڕی سەربەرزی و شانازییەوە دان بەمەدا دەنێین. بەڵام گەر ئاماژە بۆ هەر واتایەکی تر بکات، ئەوا ئێمە هیچ شتێك لەو واتایانەی تر نازانین.

**ماددەی دووهەم:**

بڕیاری تۆمەتبارکردنەکە پشت بە ڕاپۆرت و شایەتیی "پۆلیسی قەستەمۆنی" دەبەستێت و دان بەوەدا دەنێت کە "پەیامی حیجاب" و "پەیامی شەش هێرشەکان و پاشکۆکەی" لەناو چەند سندووقێکی داخراوی بزمارڕێژکراودا دۆزراونەتەوە کە لە ژێر چەند لیژنەدار و کۆمەڵە خەڵووزێکدا هەڵگیرابوون. واتە هەرگیز بۆ "بڵاوکردنەوە" ئامادە نەکرابوون. ئنجا ئەو پەیامە ناوبراوانە لە ژێر ڕەخنە و لێ وردبوونەوەی دادگای "ئەسکی شەهر" دەرچوون و، ئەنجامەکەشیان دەرکردنی سزایەکی سووك بوو لەسەر من. بەڵام داواکاری گشتیی کە هەندێ ڕستەی ئەم پەیامانەی بە دەستەوە گرتووە و هەندێ واتای نادروستی بۆ لێ داونەتەوە، دەیەوێت نۆ ساڵ بەرەو دواوە بمانباتەوە و، بەرپرسیارێتییەکی نوێ بخاتە ئەستۆمانەوە لەسەر تۆمەتێك کە پێشتر سزا دراوین لەسەری.

**ماددەی سێهەم:**

لە چەند شوێنێکی بڕیاری تۆمەتنامەکەدا چەند دەستەواژەیەکی وەك: "دەگونجێ ئاسایشی وڵات تێك بدات" بەکار هێنراوە. واتە "گریمانەکان" لە جێی "ڕووداوە چەسپاوەکان"دا دانراون!

منیش دەڵێم:

دەگونجێ هەموو کەسێك تاوانی "کوشتن" ئەنجام بدات، بەڵام ئایا دەکرێت هەموو کەسێك لەسەر بناغەی ئەو گریمانە تاوانبار بکرێت؟!

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

بەڕێز سەرۆکی دادگا!

هاودەم لەگەڵ ئەم نامەیەدا وێنەیەکی ئەو بەرگرییەشم دەنێرم کە وەك عەرزو حالێك خستمە بەردەست سەرۆك كۆمار و لایەنە ڕەسمییەکانی ئەنقەرە، لەگەڵ ئەو وەڵامنامەیەدا کە سەرۆکایەتیی وەزارەت ناردیانەوە و مەودای قبوول کردن و بایەخدانیان بە عەرز و حاڵەکەم دەردەخات.

جا لەم بەرگرییەمدا ئەو وەڵامە بەهێزانەم نووسیوەتەوە کە بەرپەرچی بەیانە پڕ لە وەهم و تۆمەتە بێ بناغەکانی "داواکاری گشتی"م پێ داونەتەوە. هەروەك لە بەیانەکەی ئەم ئیددیعایەدا چەند گوفتارێك هەن کە لەسەر بناغەی مەزبەتە ڕووکەش و قین لەدڵانەکەی "پۆلیس" بنیات نراون و پێچەوانەی ڕاپۆرتی خەبیرەکانن و پێشتر ڕەخنەکانی خۆمم لەسەر پێشکەش کردوون، کە دەتوانرێت پوختەکەیان بەم جۆرەی خوارەوە بخرێتە ڕوو:

وەك زووتر بۆم باس کردن، کاتێ دادگای ئەسکی شەهر ویستی بەپێی ماددەی ژمارە "١٦٣" تاوانبارم بکات، پێم وت:

(١٦٣ پەرلەمانتاری حکوومەتی کۆماری کە ژمارەیان دووسەد کەس بوو - واتە بە ژمارەی ماددەی ١٦٣ - ڕەزامەندییان بۆ تەرخان کردنی سەد و پەنجا هەزار لیرە نواند، بۆ مەبەستی دامەزراندنی زانکۆکەی شاری وان. جا ئەم ڕەزامەندییەی ئەوان و ئەو بایەخەش کە حکوومەتی کۆماری بەرامبەر بە من دەری بڕی، ئەو تۆمەتە دەسڕێتەوە کە بەپێی ماددەی ١٦٣ ئاراستەم کراوە).

کاتێ ئەمەم بە دادگا وت، لیژنەی ئیستیشاریی ئەو دادگایە قسەکەی منیان گۆڕی، گوایا ١٦٣ پەرلەمانتار لێکۆڵینەوەیەکیان لەبارەی سەعیدەوە ئەنجام داوە و داوایان کردووە دادگایی بکرێت!

بەم جۆرە و بە پشت بەستن بەم چەشنە تۆمەتە ناڕەوایانەی ئەو لیژنە ئیستیشارییە، داواکاری گشتی دەیەوێت بەرپرسیاریی ئەم تۆمەتانەمان بخاتە ئەستۆ، لە کاتێکدا ئەو دەستە و لیژنە تایبەتمەندەی کە لە ئاستێکی بەرزی زانستیدان و بە بڕیاری ئەنجومەنی پەرلەمان پێکهێنراوە و لێ وردبوونەوەی پەیامەکانی نووریان پێ سپێرراوە، بە یەکدەنگی ئەمەی خوارەوەیان دەربڕیوە کە:

(هەرچی سەعید و قوتابیانی نوور نووسیویانە هیچ بەڵگـە و نیشـانەیەکی ڕاشکاویان تێدا نییە سەبارەت بەوەی کە ئایین و موقەددەسـات وەك ئـامراز و ئـامێرێك بـۆ تێکدانـی ئاسایشـی دەوڵـەت یـان هـاندانی خـەڵکی بـۆ ئـەم کـارە بـەکار بـهێنرێن، هـەروەها هیـچ نیشانەیەکیشیان تێدا نییە لەسەر هەوڵدان بۆ دامەزراندنی "کۆمەڵە"یەك یان لەسەر هیچ نیاز و ئامانجێکی خراپ. هەروەها لە نامە گۆڕینەوەکانی قوتابیانی نووردا هیـچ نیـازێکی خراپمان نەدی لـە دژی حکوومەت یـاخود هیـچ مەبەسـت و ئامـانجێك بـۆ پێکـهێنانی کۆمەڵەیـەك یـان تەریقـەتێکی سـۆفی. هـەروەك بۆمـان دەرکـەوت کـە ئـەوان لـە جموجووڵیاندا لەم چەشنە ڕوانینگە و بۆچوونەوە ناجووڵێنەوە).

هەر ئەم لیژنە و دەستە تایبەتمەندە، بە یەکدەنگی، ئەمەی خوارەوەشیان ڕاگەیاند کە:

(لە سەدا نەوەدی پەیامەکانی نوور هێندەی سەرە پەنجەیەکیش لـە بناغـە و بنـەماکانی ئـایین و زانسـت و حەقیقـەت لایـان نـەداوە و، بـە ئیخـلاس و بێ گـەردی و دوور لـە هیـچ ئامانجێك نووسراون. زۆر ئاشکرایە کە ئەم پەیامانە نایانەوێت "ئـایین" بـۆ هیـچ ئامـانجێك بەکار بهێنن، یـان "کۆمەڵـە"یـەك دروست بکەن، یـاخود هـەوڵی تێکدانـی ئاسایشـی دەوڵەت بدەن. هەروەك نامەکانی نێوان قوتابیـانی نـوور و هـی نێـوان ئـەوان و سـەعیدی نوورسیش هـەمان مۆرك و نیشـانەیان پێوەیە و، جگـە لـە چـەند نامەیـەکی نـهێنی – کـە ژمارەیان لـە دە نامەیـەك تێپـەڕ ناکـات – لـە بابـەتی زانستی نـادوێن و سکاڵا و ئازاریـان لـەخۆ گرتـووە. ئیـتر هـەموو "پەیامـەکانی نـوور" یـان بـۆ تەفسـیری ئایـەتێك، یـاخود ڕوونکردنەوەی واتای فەرموودەیەکی پیرۆز نووسـراون. هـەروەك زۆربـەی پەیامـەکانی نوور ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانی ئایین و ئیمانیان لەخۆ گرتووە و لـە بـارەی عـەقیدەی باوەڕ بە خوا و پێغەمبەران و ڕۆژی دواییەوە دەدوێن. پاشان بۆ ئەوەی ئەم ڕاستییانە بـە شێوەیـەکی جوانتر و باشـتر ڕوون ببنەوە ئـەوا پەیـامەکانی نـوور شـێوازی هێنانەوەی نموونە و چیرۆکیان گرتووەتە بەر. ئنجا ڕای زانستیی خۆیـان و ڕێنمـایی و ئامۆژگارییـە ڕەوشتییەکانیان لـە نـاوەندی چـەند ڕەفتـارێکی جـوان و چـەندین ئـەزموونی ژیـان و چیرۆکی پڕ لە پەندا پێشکەش کردووە و، هەرگیز ئەم پەیامانە شتێکی وەهایان تێدا نییە کە بگونجێ خۆی لە قەرەی حکوومەت یان لایەنە ڕەسمییەکان بدات).

لەبەر ئەوە، ئێمە لە ڕاستیدا زۆر دلگرانین بەوەی کە داواکاری گشتی ڕاپۆرتی ئەم دەستە و لیژنە زانستییە تایبەتمەند و بەرزە دەخاتە لاوە و، پشت بە ڕاپۆرتە کۆنـە ناتـەواوە

شپرز و شێواوە کە دەبەستێت و، پاشان تۆمەتە نامۆکانیان لەسەر بنیات دەنێت. بۆیە زۆر بە لامانەوە سروشتی‌یە کە ئەو کارە بە شایستەی شان و شکۆی دادگەریی ئەم دادگایە نەزانین کە باوەڕمان بە دادگەری و ویژدانی هەیە. ئەم کارە کتومت وەك ئەو نموونەیە وایە کە دەگێڕنەوە جارێکیان بە کەسێکی "بەکتاشی"[1]یان وت: بۆچی نوێژ ناکەیت؟ لە وەڵامدا وتی: چونکە لە قورئاندا ئەوە هاتووە کە: ﴿لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ﴾! پێیان وت: ئەی بۆچی ئایەتەکە بە تەواوی ناخوێنیتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنْتُمْ سُكارى﴾؟ وتی: (من قورئانم لەبەر نی‌یە)!

هەر بە هەمان جۆر ڕستەیەکی دیاریکراوی پەیامەکانی نوور دەهێنرێت و تۆمەتەکانیان لەسەر بنیات دەنرێت لە دژی ئێمە، بێ ئەوەی بە وردی ڕستەکانی تری دوایی بخوێنرێنەوە کە ئەو ڕستەیەی پێشوو ڕوون دەکەنەوە. لەمەولا بە چاوی خۆتان نزیکەی چل نموونەی وەك ئەمە دەبینن لەو یادداشتی بەرگری‌یەدا کە پێشکەشتانی دەکەم و، لێرەدا وەك نموونەیەك ئەم ڕووداوە سەیرەتان پێش‌چاو دەخەم:

لە یادداشتی داواکاری گشتیی "دادگای ئەسکی شەهر" و لە کاتی لێکدانەوەی ئاسەواری وانە ئیمانی‌یەکانی پەیامەکانی نووردا، بە هەڵە دەستەواژەی: "پەیامەکانی نوور گەل تێکدەدەن" بەکار هێنرا بوو. خۆ هەرچەندە دادگا دوایی ئەم ڕستەیەی سڕی‌یەوە، بەڵام پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەو دادگایەدا یەکێك لە قوتابیانی نوور کە ناوی "عەبدوڕڕەزاق"ە، وتی:

ئەی بەدبەخت! کێ دەتوانێت بە "ڕێنمایی" پەیامەکانی نوور بڵێت: "تێکدان"؟ ئایا شتی وا بە پەیامەکانی نوور دەوترێت کە نرخی ئایینی‌یان بۆ هەموو کەسێك دەرکەوتووە و چەسپاوە و، ئنجا لە ماوەی بیست ساڵی ڕەبەقیشدا هیچ خراپە و زیانێکیان نە بۆ کارگێڕیی حکوومەت و نە بۆ هیچ کەسێك نەبووە و، تەنانەت ڕێنمایی هەزاران لاویان کردووە و ئیمانی بەهێز کردوون و ڕەوشتیشی ڕاست کردوونەتەوە؟ ئایا ئیتر چۆن دەتوانیت "ڕێنمایی"ی پەیامەکانی نوور بە "تێکدان" وەسف بکەیت؟ ئایا لە خوا ناترسیت؟ خوا زمانت ببڕێت!

---

(١) مەبەست لە "بەکتاشی" شوێنکەوتووانی تەریقەتی "بەکتاشی"یە، کە یەکەم جار لەسەر چەند بناغەیەکی ڕاست و دروست دامەزرابوو، بەڵام دوایی لە ڕێ ترازا و، شوێنکەوتووانی بۆ "نوێژ نەکردن" و "ڕۆژوونەگرتن" و "ئارەق خواردنەوە" بە نموونە دەهێنرێنەوە! (وەرگێر)

بۆیە ئێمە وتەکەی داواکاری گشتی، کە لە دوای بینینی قسە حەق و ڕەواکانی ئەو قوتابی‌یەی نوور کردوویەتی و وتوویەتی: (سەعید فەساد لە دەوروبەری خۆیدا بڵاو دەکاتەوە)، بە ویژدان و هەست و نەستی ئێوە دەسپێرم!

جا بۆ ئەوەی داواکاری گشتی دەرفەتێك بدۆزێتەوە بۆ تانە و تەشەرگرتن لە وانە کۆمەڵایەتی‌یەکانی پەیامەکانی نوور، وتوویەتی:

(ویژدان لە شوێنی ئاییندایە و، ئایین پەیوەندیی بە حوکم و یاساوە نی‌یە، چونکە لەو کاتانەی پێشوودا کە ئایین پەیوەندیی بە حوکم و یاساوە بوو، فەوزای کۆمەڵایەتی سەری هەڵدا).

منیش دەڵێم:

ئایین تەنها بریتی نی‌یە لە "ئیمان". بەڵکو "کردەوەی چاك"یش بەشی دووهەمی ئایینە. چونکە ئایا ترسان لە بەندیخانە و پۆلیسی حکوومەت دەستی تاوانبارەکان لەو تاوانانەی چەشنی کوشتن و زینا و دزی و قومار دەگێڕێتەوە کە ژیانی کۆمەڵایەتی ژاراوی دەکەن؟ ئایا هەر تەنها ئەم ترسە وایان لێ دەکات کە لەو تاوانانە دوور بکەونەوە. خۆ ئەگەر وابێت ئەوا دەبێ پۆلیسێکی چاودێر بۆ هەموو کەسێك تەرخان بکەین تاکو دەروونە بێ‌ئاگا و خراپکارەکان لەم چەشنە کارە چەپەڵانە دوورەپەرێزی بکەن! جا پەیامەکانی نوور لە ڕووی "کردەوەی چاك" و "ئیمان"ەوە چاودێرێکی مەعنەوی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دادەنێن. دیارە هەرکات مرۆڤ بیری لە بەندیخانەی دۆزەخ و خەشم و قینی خوای گەورە کردەوە ئەوا دەتوانێت بە ئاسانی خۆی لە گوناهـ و کردەوەی خراپ بپارێزێت.

داواکاری گشتی نیشانەیەکی نابەجێی پێش‌چاو خستووە کاتێ ناوی ئەو کەسانەی کردووە بە بیانوو کە ئیمزایان لەسەر تەوافوقە ئاشکراکانی یەکێك لە پەیامەکان کردووە و، وتوویەتی: ئەمانە ئەندامی کۆمەڵەیەکن!

ئایا دەگونجێت ناوی "کۆمەڵە" لە خاوەنی ئەو ئیمزایانە بنرێت کە ناویان لە دەفتەری دوکاندارەکاندا هەیە؟!

لە دادگاکەی "ئەسکی شەهر"یشدا وەهمێکی وەك ئەمە ڕووی دا و، منیش وەڵامم دایەوە.

ئەگەر ئێمە کۆمەڵەیەکی دنیاییمان لە نێواندا ببوایە، ئەوا هەموو ئەو کەسانەی کە بەهۆی منەوە زیانیان پێ دەگەیشت تا دەیانتوانی نەفرەتیان لێ دەکردم و لێم هەڵدەهاتن!

بەڵام هەروەك من و هەموو یەکێکی ئێمە پەیوەندییەکی نەبچڕاومان بە ئیمامی غەزالییەوە هەیە، چونکە پەیوەندییەکی قیامەتییە نەك دنیایی، بە هەمان جۆر ئەو ئاییندارە بێتاوان و بێ گوناهانەش پەیوەندییەکی بەهێزیان بەم هەزارەوە هەیە بەهۆی ئەو دەرسە ئیمانییانەی کە لە پەیامەکانی نوورەوە دەستیان کەوتووە و، ئا لێرەوەیە کە وەهمی "کۆمەڵەی سیاسی" سەری هەڵداوە!

دوا وشەم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.

بەندکراو

لە زیندانی تەنیایی و تاکەکەسیدا

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## ئەم بەشە گەلێ گرنگە

باسمه سبحانه

بەڕێزان!

بەڕێز سەرۆکی دادگا!

تکام وایە بێدار ببنەوە و بە باشی تێبگەن لەوەی کە: دەرکردنی هەر بڕیارێك بە سزادانی قوتابیانی نوور تەنها خزمەتێکی ڕاستەوخۆیە بۆ کوفر و ئیلحاد و، تاوانبارکردنی ئەو ڕاستییانەی قورئان و ئیمانە کە هەموو ساڵێك بە درێژایی ماوەی هەزار و سێ سەد ساڵ سێ سەد ملیۆن موسڵمان لەبەر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانیاندا هەنگاویان ناوە. واتە هەر بڕیارێك کە لەم ڕووەوە دەری بکەن بریتی دەبێت لە هەوڵێك بۆ داخستنی ئەو ڕاستە شەقامەی کە نزیکەی سێ سەد ملیار موسڵمان دەگەیەنێتە ڕاستی و بەختەوەریی هەردوو دنیا. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی ڕەخنە و نەفرەتی هەموو ئەو ژمارە زۆرە ئاراستەی دەرکەرانی ئەو چەشنە بڕیارە بکرێت. چونکە دوا ڕێڕەوانی ئەم ڕاستە شەقامە هەمیشە دوعا بۆ پێشینەکانیان دەکەن و، بە دوعا و کردەوەی

چاك يارمەتيى ئەوانەی پێش خۆيان دەدەن[١]. پاشان ئەو كەسانەی كە لە هەڵوێستی دوژمنایەتیدان بەرامبەر بە ئیمان، لە دواییدا دەبن بەهۆی ورووژاندن و نانەوەی کێشەیەکی گەلێ گەورە لەم نیشتمانەدا.

جا ئەگەر لە ڕۆژی قیامەت و دادگای گەورەی ئەوێدا سێ‌سەد ملیار کەس لە دژتان ڕاوەستان و لێیان پرسین:

(بۆچی بوارتان بە نووسراوی ئیلحادی و ئەو جۆرە کتێبانە دا کە بە ڕاشکاوی هێرش دەکەنە سەر ئایینی ئیسلام، وەك کتێبی "مێژووی ئیسلام"ی دکتۆر دوزی[٢] و، کتێبخانەکانتان لێ پڕ کردن و، بەوپەڕی ئازادی ڕێتان بە خوێندنەوەیان دا و، بواریشتان بۆ قوتابیانی ڕەخساند کە بەپێی یاساکانتان چەندین کۆمەڵە پێك بهێنن و، هەرگیز دەستتان نەهێنایە ڕێی ئیلحاد و شیووعی و فەوزا و ڕێکخراوە گێرەشێوێنە دێرینەکان و توورانیزمی ڕەگەزپەرستی، لە کاتێکدا کە نەیاری سیاسەتەکانتان بوون، کەچی دەستتان هێنایە ڕێی کەسانێك کە هەر هیچ پەیوەندییەکیان بە سیاسەتەوە نەبووە و، تاقانە خەم و پەژارە و خەفەتیان گرتنەبەری ڕێی ڕاست و دروستی ئیمان و قورئانی پیرۆز بوو، لەوانەی کە پەیامەکانی نووریان دەخوێندەوە، کە چەند پەیامێکن لە حەق و ڕاستی دەدوێن، چونکە تەفسیری ڕاستیی قورئانی پیرۆزن. ئەو پەیامانەشیان بۆیە دەخوێندەوە تاکو خۆیان و هاووڵاتییانیان لە ئیعدامی هەتاهەتایی و زیندانی تەنیایی و تاکەکەسی ڕزگار بکەن و، لە هەمان کاتیشدا هیچ پەیوەندییەکیان بە هیچ کۆمەڵەیەکی سیاسییەوە نەبوو، بەڵام ئێوە بەو بیانووە دەستتان هێنایە ڕێیان کە پێتان وابوو هاوڕێیەتی و برایەتیی نێوانیان لە پێناوی خوادا - کە دڵی ئەوانی پێکەوە گرێ دابوو -

(١) چونکە فەزڵی خوای گەورە داخوازی ئەوە بووە کە بەهۆی پێشینانەوە وەچەکانی دوای خۆیان بە نیعمەتی ئیمان بەهرەمەند بن. بۆیە هەر کردەوەیەکی چاك کە لە لایەن پاشینانەوە ئەنجام بدرێت وێنەیەکیشی لە تۆماری کردەوە چاکەکانی پێشینانیدا دەنووسرێت. هەر بۆیە قورئانی پیرۆز ڕێنماییمان دەکات کە هەردەم بڵێین: ﴿رَبَّنا اغْفِرْ لَنا وَلِإِخْوانِنا الَّذِينَ سَبَقُونا بِالإِيمانِ﴾ (الحشر: ١٠). (وەرگێر)

(٢) دکتۆر دوزی (١٨٢٠ - ١٨٨٣ز) ناوی: "ڕینهارد پیتەر ئان دوزی"یە و خۆرهەڵاتناسێکی پرۆتستانت مەزهەبی هۆڵەندیی بە ڕەچەڵەك فەرەنسییە و، لە شاری "لیدن" لە دایك بووە و مردووە. نزیکەی سی ساڵ لە زانکۆکانی ئەو شارەدا وانەی وتووەتەوە. ئەندامی چەند کۆڕێکی زانیاری بووە. لە پێشدا بایەخی بە زمانەکانی ئەورووپا دەدا و پاشان بە زمانی عەرەبی. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی بریتین لە: "فەرهەنگی دوزی" لە دوو بەرگدا و، "مێژووی ئیسلام" لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا ساڵی ١٨٦٣ز. ئەم کتێبە بە زمانی هۆڵەندی دانراوە و پاشان کراوە بە تورکی. بڕوانە: (الأعلام ٣/٣٨). (وەرگێر)

ئەنجامی پەیوەندی‌یان بێت بە کۆمەڵەیەکی تایبەتی‌یەوە و، لەسەر بناغەی ئەو گومانە تاوانبارتان کردن و بە یاسایەکی سەیر بڕیارتان لەسەر دەرکردن)؟!

گەر لە بەردەم ئەو دادگایەدا ئەم پرسیارەیان لێ کردن، ئێوە بە چی وەڵامیان دەدەنەوە؟ خۆ ئێمەش هەر هەمان پرسیارتان لێ دەکەین؟

ئەوانەی کە ئێوەیان لەخشتەبرد و سەریان لە لایەنەکانی دادگەری شێواند و حکوومەتیشیان بە شتێکەوە سەرقاڵ کرد کە زیانی نەتەوە و نیشتمانی تێدایە، ئەو مولحید و زەندیق و مونافیقانەن کە نەیاری ئێمەن. هەر ئەوانەشن کە ئێوەیان خەڵەتاند و حکوومەتیشیان سەرقاڵ کرد کاتێ کە ناوی "کۆماری"یان لە ئیستبدادی موتلەق نا و ناوی "ڕێسا"(نظـام)یان بۆ پاشگەزبوونەوەی ڕەها دانا و ناوی "شارستانێتی"یان بۆ هەرزەیی تەواوەتی بەکارهێنا و ناوی "یاسا"شیان بۆ ئەو کاروبارە کافرانە و هەڕەمەکی و خۆسەپێنانە دانا کە بە دەستی خۆیان دایان ناون و، بەم کارەشیان ئازاری ئێمەیان دا و تەنگیان پێ هەڵچنین و لە پێناوی خزمەتکردندا بە بیانی‌یەکان مشتەکۆڵی توندیان ئاراستەی حوکمی ئیسلام و حوکمی نەتەوە کرد.

بەڕێزان!

ڕوودانی چوار بوومەلەرزەی سامناك لە ماوەی چوار ساڵدا و هاوکات بوونیشیان لەگەڵ بەرواری گرتنی قوتابیانی نووردا و ستەم لێ کردنیان و تەنگ پێ هەڵچنینیان، ئنجا هاوکات بوونی تەواوبوونی ئەو بوومەلەرزانەش لەگەڵ کۆتایی هێنان بە دەستدرێژی کردن لەو قوتابیانە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئێوە بەرپرسی ئەو بەڵا و موسیبەتە ئەرزی و ئاسمانی‌یانەن کە لەم دادگایەی ئێستاماندا ڕوو دەدەن[1].

بەندکراوی زیندانی تاکەکەسی
لە بەندیخانەی دەنیزلی
**سەعیدی نوورسی**

---

(١) مامۆستا نوورسی مەبەستی ئەوەیە کە پەیامەکانی نوور چەند وتەیەکی خاوێنن و لە جۆری ئەو صەدەقە قبووڵکراوەن کە دەبێت بەهۆی گێڕانەوەی بەڵا و موسیبەتەکان. کەواتە ڕێنەدان بە بڵاوبوونەوەی ئەم پەیامانە و شاردنەوەیان لە بەرچاوی خەڵکیدا، دەرگا لەسەر داباریینی بەڵا و موسیبەتەکان دەکاتەوە. (وەرگێڕ)

باسمه سبحانه

## بەشێکی دواهەمین وتە

بەڕێزان!

لەبەر ئەوەی ناتوانم هیچ شتێك لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێستاوە بزانم و، لەبەر ئەو ئاراستەگەیەش کە داواکاری گشتی پیایدا دەڕوات و، سووربوونتان لەسەر دەرکردنی بڕیارێك لەسەرم بە بیانووی تاوانبارکردن بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەك، لە کاتێکدا کە من وەڵامی ئەم تۆمەتەم دایەوە و بە چەند بەڵگەیەکی گومانبڕ پووچەڵم کردەوە و، ئەو لیژنە ئیستیشاریەیەش کە لە ئەنقەرە لە زانایان و پسپۆڕان پێکهاتبوو بە هەمان جۆر و بە یەکدەنگی پووچەڵیان کردەوە.. ئەوا من سەرم لەم سووربوونەی ئێوە لەسەر دەرکردنی ئەو چەشنە بڕیارە سووڕماوە و لە بەرامبەر ئەمەشەوە ئەم واتایەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

مادەم هاوڕێیەتی و حەز و مەیلی کۆبوونەوەی برایانە و کۆمەڵەی قیامەتییانە، یەکێکن لە بناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێداویستییەکی سروشتیی مرۆڤن و، لە هەموو پەیوەندییەکانی تریش گرنگترن، هەر لە ژیانی خێزان و خێڵ و عەشرەتەوە تا دەگاتە ژیانی نەتەوە و ژیانی ئیسلامی و ژیانی گرۆی مرۆڤ.. هەروەك خاڵێکی پاڵ پێوەدان و دڵدانەوەشە بۆ هەموو مرۆڤێك لە بەرامبەر ئەو سەختی و گیروگرفتانەی کە لەم گەردوونەدا دێنە ڕێی و بە تەنها خۆی ناتوانێت ڕووبەڕوویان ڕابوەستێت.. هەروەها بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو ئەو تەگەرە و بەربەستە ماددی و مەعنەوییانەدا کە ڕێی ئەنجامدانی ئەرك و واجبە مرۆیی و ئیسلامییەکانی لێ دەگرن..

لە کاتێکدا کە ئەو هاوڕێیەتی و برایەتییەی قوتابیانی نوور لەسەری کۆدەبنەوە هیچ لایەنێکی سیاسی تێدا نییە، بەڵکو برایەتییەکی ڕاست و بێگەردە و هۆکارێکە بۆ دەستخستنی خێری دنیا و بەختەوەریی قیامەت. چونکە ئەوان لە وانەکانی ئیمان و قورئاندا لە ژێر سایەی هاوڕێیەتییەکی خاوێن و بێگەردی ڕێگای حەقدا کۆدەبنەوە و، لە دژی هەموو ئەو شتانەی زیان بە نەتەوە و نیشتمان دەگەیەنن، پشتی یەکتر دەگرن..

لەبەر ئەوەی کە ئەوان لەم جۆرە بە یەك گەیشتنە ئیمانی‌یانەدا کۆ دەبنەوە، دەبوو گەلێ مایەی ڕێز و تەقدیر بوونایە..

بەڵام ئەو کەسەی کە واتای "کۆمەڵەی سیاسی" لەم کۆبوونەوانە دەداتەوە، یان ئەوەیە بە جۆرێکی گەورە و فراوان خەڵەتاوە.. یاخود ئاژاوەچی‌یەکی غەددارە و بە جۆرێکی وەحشی‌گەری‌یانە دژایەتی مرۆڤایەتی دەکات و دوژمنایەتی‌یەکی نەمرووددانەش بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام دەنوێنێت و، بە چەپەڵترین شێوازەکانی ئاژاوەچێتی دژایەتیی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکات. واتە بە وێنەی مورتەد و دوژمنە سەرسەختەکان لەگەڵ نیشتمان و نەتەوە و دەستەڵاتی ئیسلامی و موقەددەساتی ئایینیدا دەجەنگێت.. یان زەندیقێکی سەرسەختە و بۆ حساب و بەرژەوەندیی بیانی‌یەکان کار دەکات و، دەیەوێت بۆریی خوێنبەری ژیانی ئەم نەتەوەیە بقرتێنێت و بیشێوێنێت و، لەم پێناوەدا حکوومەت دەخەڵەتێنێت و لایەنەکانی دادگەری بە هەڵەدا دەبات، تاکو بتوانن ئەو چەکە مەعنەوی‌یانەی کە ئێمە تا ئێستا لە دژی فیرعەونەکان و ئاژاوەچی‌یەکان بەکارمان هێناون، لە دژی نیشتمانەکەمان بەکاریان بهێنن، یان بتوانن ئەو چەکانە تێك بشکێنن.

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

* * *

بەرێزان!

ڕێکخراوێکی پەنهان هەیە کە نزیکەی چل ساڵە لە پێناوی بیانی‌یەکاندا و بە ناوی کوفر و ئیلحادەوە بۆ تێکدانی ئەم نەتەوەیە کار دەکات و، لە ڕێی هێرش کردنەوە بە هەموو هۆکار و شێوازێك بۆ سەر ڕاستی‌یەکانی ئیمان و قورئان، دەیەوێت ئەم نیشتمانە پارچە پارچە بکات.

جا ئەم دەستە تێكدەرە نهێنی‌یـە، چـەند شـكڵ و شـێوەیەكی جیاجیـا دەگرنـە خۆیـان. بۆیە حەز دەكەم ڕێم پێ بدەن كە لە بەردەم ئێوەدا چەند گوفتارێك ئاراستەی هەندێ لـەو كارمەندە بێ‌ئاگا و دوور لە ویژدانانە بكەم كە ئەم دەستە نهێنی‌یە كردوونی بە پەردە و لـە پشتیانەوە خۆیان دەشارنەوە و لە ڕێیانەوە سەر لە دادگا دەشێوێنن.

(بـەڵام دەرچوونـی بڕیـاری تەبریـەبوون لــە ڕۆژی دوای ئەمــەدا، ئــەو گوفتــارە توندوتیژەی دواخست).

بەندكراوی زیندانی تەنیایی و
دابڕاوی تەواوەتی لە خەڵكی:
**سەعیدی نوورسی**

* * *

## وەڵامێكی ڕاستەقینە
# بۆ پرسیارێكی گرنگ

چەند كارمەندێكی گەورە لێیان پرسیم:

(كاتێ كـە مستەفا كـەمال ویسـتی بـە "ئامۆژگـاری گشـتی" و بەرپرسـی هـەموو كوردستان و پارێزگاكانی خۆرهەڵات لـە بریـی شـێخی سەنووسی[1] و بـە مووچەیـەكی سێ‌سەد لـیرەیی[2] دات بمەزرێنێت، بۆچی پێـی ڕازی نـەبوویت؟ خـۆ ئەگـەر پێـی ڕازی بوویتایە دەبوویت بەهۆی ڕزگـاركردنی سـەدان هـەزار كـەس لـەو پیاوانـەی كـە بـوون بـە قوربانیی شۆڕشەكە)[3]؟

---

(١) شێخی سەنووسـی واعـیزێكی ئـایینی بـووە لـە كوردسـتان و پارێزگاكـانی خۆرهـەڵاتدا و، لـە دەمـی داگیركاریی ئینگلیزیشدا ڕۆڵێكی لە بەرچاوی بووە لە دەركردنی فەتوای جیهاد لە دژی ئینگلیزەكان. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم مووچەیە لەو ڕۆژگارەدا گەلێ زۆر بووە و هی وەزیرەكان بووە. (وەرگێڕ)

(٣) لەو دەمەدا كوردستانی توركیا چەند شۆڕشێكی بەخۆوە بینـی گرنگترینیـان شۆڕشـەكەی شـێخ سـەعیدی پیران بوو لە دژی سیاسەتی مسـتەفا كەمال كە "دژایەتیی ئیسلام" و سیاسـەتی "ڕەگەزپەرستی"ی پیـادە دەكرد.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەیاندا وتم:

لە جیاتی ئەوەی بیست سی ساڵی ژیانی دنیایی ئەو پیاوانە ڕزگار بکەم، پەیامەکانی نوور بوون بەهۆی ڕزگارکردنی ملیۆنەها ساڵی ژیانی ئەو دنیای سەدان هەزار هاوولاتی. واتە کارێکیان ئەنجام دا کە ئەو زیانەیان بە هەزاران ئەوەندەی خۆی قەرەبوو کردەوە. خۆ ئەگەر من ئەو کاتە ئەو داواکاریەم قبوول بکردایە، "پەیامەکانی نوور" کە نهێنیی ئیخلاسیان لەخۆدا هەڵگرتووە و نابن بە شوێنکەوتە و هۆکار و ئامرازی هیچ شتێك، پەیدا نەدەبوون. تەنانەت لە بەندیخانەدا بە هاوڕێ بەڕێزەکانی خۆمم وت: (گەر پەیامەکانی نوور ئیمانی ئەو کاربەدەستانەی ئەنقەرە ڕزگار بکەن کە زللەی توندوتیژی پەیامەکان ئازاری دان و بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرکردم و، ئەم پەیامانە ئەوان لە ئیعدامی هەمیشەیی دەرباز بکەن، ئەوا ئێوە بە شایەت بن کە من لە ناخی دڵمەوە لێیان خۆش دەبم)!

هەروەها دوای دەرچوونی بڕیاری تەبرییەمان لە دادگای "دەنیزلی" بە بەڕێوەبەری پۆلیس و ئەو پشکنیارانەشم وت کە لەڕادەبەدەر بە چاودێری کردنیان بێزار دەبووم:

بێ گومان یەکێك لەو کەرامەتانەی پەیامەکانی نوور کە ناتوانرێت ئینکاریی بکرێت بریتی‌یە لەوەی کە:

دوای لێکۆڵینەوە و پشکنینی نۆ مانگی ڕەبەق، کەس نەیتوانی بەڵگەنامەیەك یان پەیوەندی‌یەك لەگەڵ هیچ تەوژمێك یان هیچ کۆمەڵە و دەستە و تاقمێکی ناوخۆ یان دەرەوە، لە سەدان پەیام و نامەمدا بدۆزێتەوە کە لە ماوەی بیست ساڵی ژیانی پڕ لە ستەم و ئازارمدا نووسیومن. هەروەك نەشیانتوانی ئەمە لەو نامانەدا بدۆزنەوە کە بۆ هەزاران کەس لە قوتابیانی نوور نووسراون. جا ئایا هیچ بیر و تەگبیرێك دەتوانێت ئەم دەرەنجامە درەخشانەمان پێ ببەخشێت. چونکە ئەگەر نهێنی‌یەکانی چەند ساڵێکی تەمەنی کەسێك ئاشکرا ببن، ئەوا بێ گومان بیست ماددەی ئەوتۆیان تێدا دەردەکەوێت کە ئابڕووی ببەن و تۆمەتباری بکەن!

کەواتە ڕاستی هەر ئەوەیە کە پێش‌چاومان خستووە.

---

بەڵام مستەفا کەمال توانیی بەسەر ئەم شۆڕشەدا زاڵ ببێت و لە ئەنجامدا شێخ سەعید خۆی و چل و حەوت کەسی تر لە هاوڕێیانی لە ١٩٢٥/٤/١٥دا لە سێدارە دران. (وەرگێڕ)

بەڵام ئەگەر ئێوە بڵێن:

(زیرەکی و بلیمەتی‌یەکی بێوێنە لە گۆڕێدا هەیە کە ئەم کارە ڕێك دەخات و بە ڕێی دەکات)..

یان گەر بڵێن:

(چاودێری‌یەکی پەروەردگاریی لەڕادەبەدەر و پارێزگاری‌کردنێکی خوایی لەم کارەدا هەیە).

ئەوا منیش لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێم:

کەواتە دژایەتی کردنی ئەم بلیمەتی‌یە کارێکی هەڵەیە، چونکە زیانێکی گەورەی بۆ نەتەوە و نیشتمان تێدایە. هەروەك ڕووبەڕووبوونەوەی چاودێریی پەروەردگار و پارێزگاریی خوایی، جگە لە ملنەدان و سەرپێچیی فیرعەونانە، هیچی تری تێدا نی‌یە.

خۆ ئەگەر بیشڵێن:

(ئەگەر ئێمە چاودێریی جموجوڵەکانت نەکەین، ئەوا دەتوانیست بەهۆی وانە و نهێنی‌یە پەنهانەکانت ژیانی کۆمەڵایەتیمان لێڵ بکەیت).

ئەوا منیش پێتان دەڵێم:

حکوومەت سەرجەمی وانە و دەرسەکانی منی - بێ پەراندنی هیچیان - لە بەردەستدایە و، شتێکی ئەوتۆی لە هیچ کامیاندا نەدۆزیوەتەوە کە مایەی سزادان بێت. هەروەك نزیکەی پەنجا هەزار نوسخەی پەیامەکانی ئەم وانە و دەرسەش لە بەردەستی کەسانی ئەم گەلەدان و، بەوپەڕی شەوق و بایەخ پێدانەوە دەیانخوێننەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ زیانێکیان بە هیچ کەسێك نەگەیاندووە. بەڵکو بە پێچەوانەوە سوودەکانی ئەم پەیامانەمان بە چاوی خۆمان بینی.

ئنجا دادگای پێشوو و ئەم دادگایەش دانیان بەوەدا نا کە: هیچ شتێك لەو پەیامانەدا نەدۆزراونەتەوە کە مایەی تۆمەتبارکردن و سزادان بێت. ئەوەبوو دادگاکەی ئێستا بە یەکدەنگی بڕیاری تەبرییەبوونی دەرکرد. بەڵام دادگای پێشوو چەند وشەیەکی لە ناوەندی سەد و سی پەیامدا کرد بە بیانوو، تاکو بەهانەیەك بێت بۆ دەرکردنی بڕیاری بەندکردنی شەش مانگ بۆ پازدە کەس لە قوتابیانی نووری نێوان سەد و بیست قوتابیی بەندکراودا و، ئەمەش لە پێناوی کەسێکدا کە لەم جیهانەدا ناوبانگی هەبوو[1]. کەواتە

---

(١) مەبەست مستەفا کەمالە. (وەرگێڕ)

ئەمە بەڵگەیەکی بەهێز و بێ گومانە لەسەر ئەوەی کە ئێوە لە ئەنجامی وەهمێکی پروپووچی بێ بناغە و بە ستەمێکی چەپەڵ و ناشیرین، دەست دەهێننە ڕێی من و پەیامەکانی نوور. ئنجا ئەوەش هەیە کە من جگە لەو پەیامانە دەرسی نوێم لەلا نی‌یە و هیچ نهێنی‌یەکی پەنهانیشم لای خۆم نەشاردووەتەوە تاکو ئەم چەشنە چاودێری‌یەم لەسەر دابنێن.

من ئێستا پێویستی‌یەکی زۆرم بە سەربەستی و ئازادیی خۆم هەیە. ئایا هێشتا ئەم چاودێری‌یە بێ‌سوود و نەزۆك و بەدواداچوونە ستەمکارانەیە بەس نی‌یە کە ماوەی بیست ساڵە بەردەوامە؟ وا من ئارامم لەلا بڕا و، لەوانەیە بەهۆی لاوازی و پیریمەوە دوعایەکتان لێ بکەم کە زووتر نەمکردووە. ڕاستی‌یەکی بێ گومان و چەسپاویشە کە: "هیچ پەردەیەك لە نێوان دوعای ستەم لێ‌کراو و عەرشی مەزنی خوای گەورەدا نی‌یە"[١].

بەڵام ئەو ستەمکارە و، ئەو بەدبەختانەش کە چەند کارمەندی‌یەکی بەرزی دنیایان لە ئەستۆدایە، پێیان وتین:

(تۆ ماوەی بیست ساڵە تەنانەت بۆ یەك جاریش شەپقەکەی ئێمەت نەکردووەتە سەر و، لە بەردەم دادگاکانی پێشین و دواتریشدا سەرت ڕووت نەکردووە، بەڵکو هەر لەسەر پۆشاکە کۆنەکەی خۆت ماویتەوە، لە کاتێکدا کە حەڤدە ملیۆن کەس پۆشاکە نوێکەیان پۆشیوە).

پێم وتن:

(ئەوانە نە حەڤدە ملیۆن و نە حەوت ملیۆن کەسیش نین، بەڵکو جگە لە حەوت هەزار کەسی مەست لە چاولێکەران و خۆرئاوا پەرستان کەسی تر بە ویست و ئیختیاری خۆی ئەو پۆشاکەی نەپۆشیوە.

جا لە بریی ئەوەی پۆشاکێك لەبەر بکەم کە زەبر و زەنگی یاسا پێم لەبەر بکات و ڕوخسەتی شەرعییش بوارم بدات[٢]، ئەوەم پێ باشترە پۆشاکێك لەبەر بکەم کە حەوت ملیار کەسی بەڕێز لەبەریان کردووە و ڕێگایەکیش بگرمە بەر کە ڕێی عەزیمەت و تەقوایە.

---

(١) ناوەرۆکی دەقی ئەم فەرموودەیە: "واتق دعوة المظلوم فانه ليس بينها وبين الله حجاب". رواه مسلم: كتاب الإيمان ٢٩. والبخاري: الجهاد ١٨٠، الزكاة ٦٣، المظالم ٩، المغازي ٦٠.

(٢) چونکە بە زۆرەملێ و ئیکراهە. (وەرگێڕ)

كەسێكی وەك من كە ژیانی كۆمەڵایەتیی واز لێ هێناوە، هەرگیز پێی ناوترێت: (نەیار و دوژمنمانە و، سەرسەختیمان لەگەڵدا دەنوێنێت). با وا دابنێین سەرسەختی و عینادیش دەنوێنێت، بەڵام مادەم خودی مستەفا كەمال خۆی و دوو دادگا و والیی سێ پارێزگا نەیانتوانی ئەم سەرسەختی و عینادیەی بشكێنن، دەبێ ئێوە چی بن كە خەریكی ئەم هەوڵە بێسوود و نەزۆكە بن! یان بۆچی هەوڵێكی ئاوا بێ ئەنجام دەدەن لە كاتێكدا كە هیچ خێرێكی نە بۆ نەتەوە و نە بۆ ئەم حكوومەتە تێدا نییە؟

تەنانەت ئەگەر گریمانی ئەوەش بكەین كە من نەیارێكی سیاسی بم، ئەوا لەبەر ئەوەی خۆتان دان بەوەدا دەنێن كە من كەسێكم ماوەی بیست ساڵە پەیوەندیم بە دنیاوە بچڕاوە و لەلایەنی مەعنەوییەوە بیست ساڵە بە كەسێكی مردوو دادەنرێم، ئەوا هیچ سوودێك لەوەدا نابێت كە ئەم كەسە مردووە لە ململانێی ژیانی سیاسی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئێوەدا زیندوو بكرێتەوە، بەڵكو ئەم كارە زیانێكی زۆری بۆ ئەو تێدایە. كەواتە چاوەڕوانی كردنی موعارەزەی سیاسی لەم جۆرە كەسە جگە لە شێتییەكی سەرتاسەری هیچی تر نییە. جا مادەم قسەكردنی جیددی لەگەڵ شێتاندا بە شێتی دادەنرێت ئەوا من واز لە قسەكردن دێنم لەگەڵتاندا و، ئێوەش چیتان لە دەست دێت دریغی مەكەن)!

ئەم گوفتارەم، هەروەك بێدەنگی كردن، تووڕەییشی وروژاندن!

دوا وتەم:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.

﴿حَسْبِيَ اللهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾.

* * *

لە پوختە بەرگرییەكەی ئەم جارەمدا پێم وتن:

ئەو "حەقیقەت" و "میهرەبانی" و "ڕاستی"یەی كە لە پەیامەكانی نووردان، ڕێیان پێ نەدایین كە خۆمان لە سیاسەتەوە بگلێنین، چونكە خۆتێوەردان لە سیاسەت دەبێت

بەهۆی تووشبوونی کەسانی بێ تاوان بە چەندین گیرو گرفتی زۆرەوە و، لەم ڕێیەوە دەبم بە ستەمکارێك سەبارەت بەوان.

هەندێك کەس داوای ڕوونکردنەوەی ئەمەیان لێ کردم. منیش پێم وتن:

بەهۆی ئەو خۆپەرستی و دەمارگیری‌یە ڕەگەزایەتی‌یەی کە لەم چەرخە زریانیاوی‌یەدا لە شارستانێتیی غەددارەوە سەری هەڵداوە و، لە ئەنجامی ئەو دیکتاتۆری‌یەتە سەربازی‌یەی کە لە دوای جەنگی جیهانی‌یەوە هاتە کایەوە و، بەهۆی ئەو دڵڕەقی و بەزەیی نەبوونەشەوە کە "گومڕایی" بەرهەمی هێناوە، سەخت ترینی جۆرەکانی ستەم و ئیستیبداد پەرەیان سەندووە و جڵەوی کاروباریان گرتووەتە دەست، بە ڕادەیەك کە ئەگەر ئەهلی حەق هێزیان بخەنە کار بۆ بەرگری‌کردن لە مافەکانی خۆیان ئەوا لە ئەنجامی دوورکەوتنەوە و لادانەوە لە ڕێی دادگەری، گەلێ کەسی لاواز و بێ تاوان دووچاری ستەم دەکرێن. ئیتر هەر بەو بێ‌دەستەڵاتی‌یەوە بەدەست سەخت‌ترینی جۆرەکانی ستەمەوە گیرۆدە دەبن و دەناڵێنن. چونکە ئەو ستەمکارانەی کە هاندەرە ناوبراوەکانی پێشوو دەیانجووڵێنن، هیچ کات دوو دڵ نین لەوەدا کە لەسەر هەڵە و تاوانی یەك دوو کەس و بە چەند بیانوویەکی لاواز و جۆراوجۆر، دەستی ئازاردان و ستەم لە بیست سی کەسی بێ‌تاوان بووەشێنن..

جا ئەگەر ئەهلی حەق لە پێناوی حەق و دادگەریدا لەو شوێنە ستەمکارە بدەن، ئەوا لە بەرامبەر یەك زیانەوە سی دانە زیانیان لێ دەکەوێت. خۆ ئەگەر دوای قاعیدە و دەستوورە پڕ لە ستەمەکەی "حەق بە حەق"یش بکەون و ئەوانیش لەسەر تاوانی یەك دوو ستەمکار دەست لە بیست سی کەس بووەشێنن، ئەوا بە ناوی حەق و لەژێر دروشمی حەقدا ئەوانیش ستەمێکی گەورە و نابەجێ ئەنجام دەدەن!

ئەمەیە هۆکار و حیکمەتی هەڵهاتن و نەفرەتی زۆرمان لە حوکم و سیاسەت، ئەمەش بەپێی فەرمانی قورئان. دەنا ئێمە هێندە هێزی "حەق"مان لەلایە کە بەوپەڕی شایستەیی بتوانین بەرگری لە مافی خۆمان بکەین. پاشان مادەم هەموو شتێك نامێنێت و کۆتایی پێ دێت و، مادەم مردنیش لە ڕێدایە و دەرگای گۆڕیش هەر هێشتا دەمی کردووەتەوە و، مادەم ئازاریش دەگۆڕێت و دەبێت بە سۆز و میهرەبانی، ئەوا بێ‌دەنگی و سەبر و ئارامان پێ باشترە و، پشت بە خوای گەورە دەبەستین و، شوکرانەبژێریی پێشکەش دەکەین.

بـەڵام هـەوڵدانی زۆرەملێـی تێکدانـی ئـەم بـێ دەنگـی و ئارامی‌یـەمان لـە ڕێـی ئازاردانمانـەوە، کارێکـە دژ و پێچـەوانەی هەمـوو چـەمکێکـی دادگـەری و غـیرەتی نیشتمانی و نەتەوایەتی‌یە.

**پوختەی قسـە:**

هیچ بیانوویەك لـە ئارادا نی‌یـە بـۆ ئـەهلی سیاسـەت و حوکـم و کـارگێڕانی وڵات و پۆلیـس و فەرمانگـەکانی داد، کـە داخـوازی ئـەوە بێـت دەسـتدرێژیمان بکەنـە سـەر. هەرچی‌یەك هەیە بریتی‌یە لەوەی کە چەند زەندیقێکی پشتی پەردە بە شـەیتانێتیی خۆیـان و دەمارگیریی زەندیقیی ئەنجامی کوفرە موتڵەقەکەیان (کە تاعوونێکی بەشەری و بەرهـەمی فەلسـەفەی ماددی‌یـە و، لـە هـەموو دنیـادا حکوومـەتێك نی‌یـە داکۆکیـی لـێ بکـات و، کەسێکی ژیر و عاقڵیش نی‌یـە پێـی بـاش بێـت) ئـەوان بـەم شـەیتانێتی‌یەی خۆیـان توانیـان هەندێ کەس لە کارمەندانی دەوڵەت بخەڵەتێنن و چـەند وەهـم و تـرس و بیمێکیـان بخەنـە دڵەوە تاکو چاوەڕوانی مەترسی بن لێمانەوە و، بـەم کـارەش ئـەو کارمەندانـەیان کـرد بـە گژماندا.

ئێمەش دەڵێین:

بە پشتیوانیی خوای گەورە و بەو هێزەش کە لە قورئانی پـیرۆزەوە بەدەستی دەهێنـین، هەرگیز ئێمە مەیدان چۆڵ ناکەین و لێی هەڵنایەین تەنانەت ئەگەر هەموو دنیاش بکەن بـە گژماندا، چ جای ئەو چەند کەسەی کە دووچاری وەهم و گومان بوون و، پشت بە خوا لە بەرامبەر ئەو کافرە مورتەد و زەندیقانەوە ئێمە هەرگیز چەك دانانێین.

**سەعیدی نوورسی**

# تیشکی سیازدەهەم

**ئەم تیشکە بریتی‌یە لە چەند نامەیەك کە لەوپەڕی ڕووناکی و گرنگیدان و مامۆستا نوورسی ناردوونی بۆ قوتابیانی لەناو بەندیخانەدا و، بە ئاشکرا تێکۆشانی ڕوون و درەخشانی "پەیامەکانی نوور" دەردەخەن.**

باسمه سبحانه

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بە هەموو هێز و توانایەکمەوە پیرۆزبایی شەوی پیرۆزی "قەدر"ی ڕابوردوو و "جەژن"ی پیرۆزی داهاتووتان لێ دەکەم و، ئێوە بە میهرەبانی و یەکتایی خوای بەخشندەی میهرەبان دەسپێرم.

خۆ هەرچەندە پێم وایە کە ئێوە پێویستتان بە دڵدانەوە نی‌یە، چونکە ناوەرۆکی: "مَنَ آمَنَ بالقَدَر أمِنَ مِنَ الْكَدَر" سەروزیادتانە، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

بە بینینی یەقینی و بێ گومان ئەو دڵدانەوە تەواوەتی‌یەم بینی کە واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیبەخشێت:

﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ (الطور:٤٨).

چونکە لەو کاتەدا کە بیرم لە بەسەربردنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز دەکردەوە بە حەوانەوە و دڵنیایی و لە بیربردنەوەی خەم و خەفەتی دنیا، کەچی تووشی ئەم ڕووداوە ترسناك و سەختە بووین کە لە خەیاڵماندا نەبوو. جا بە ئاشکرا دەبینم ئەم ڕووداوە سەرتاپا چاودێری‌یەکی خوایی‌یە بۆ من و بۆ پەیامەکانی نوور و بۆ ئێوە و بۆ مانگی ڕەمەزانەکەمان و بۆ برایانیشمان.

سەبارەت بە سوودە زۆرەکانیەوە کە تایبەتن بـە خۆمـەوە، وا تەنـها چەند دانەیـەکیان لـێ باس دەکەین:

*یەکەمیان:*

هـانی دام لـەم مانگـە پـیرۆزەی ڕەمـەزاندا بـە گەرموگوڕیـەکی توندوتـۆڵ و پەنابردنێکی بەهێز و لالانەوەیـەکی ناسـك و بەکوڵـەوە لـە هـەوڵی بـەردەوامدا بم و خـۆم بەسەر نەخۆشیدا زاڵ بکەم.

*دووهەمیان:*

ئەمساڵیش گەلـێ حەزم لـە بینین و نزیکیـی یەك بە یەکتان بـوو. بۆیـە لـە بەرامبـەر چاوپێکەوتنی یەك کەسی ئێوە و هـاتندا بـۆ "ئیسپارتە" بـەم گـیروگرفت و ئازارانـە ڕازی بووم.

*سێهەمیان:*

سەرجەمی حاڵەتە ئازاربەخشەکان، چ لە قەستەمۆنی و چ لە ڕێگادا و چ لـێرەدا و بـە شـێوەیەکی نائاسـایی و چـاوەڕوان نـەکراو – بـە پێچەوانـەی حـەز و ئـارەزووی منـەوە – کتوپڕی ئالوگۆڕیان بەسەردا دەهات، بە ڕادەیەك کە دەستێکی چـاودێریی پـەروەردگار لە پشتی ڕووداوەکانـەوە دەبینـرێت. ئەمـەش وامـان لـێ دەکـات کـە بڵێین: "الخير فيما اختاره الله". ئنجا "پەیامەکانی نوور" – کە من هەمیشە بیرم بە لایانەوەیە – تەنانەت ئەو کەسانەشیان ناچاری خوێندنەوەیان کردووە کە نوقمی "بێئاگایی" بـوون، لەوانـەی کـە چـەندین کارمـەندیی دنیـایی بـەرزیان لـە ئەستۆدایە. ئـەم پەیامانـەش بـەم کارەیـان چـەند گۆڕەپانێکی نوێی کارکردنیان لە چەندەها بواری تردا کردووەتەوە.

سەرباری ئازارەکانی خۆم، ئازار و پەژارەکانی هەموو یەکێکی ئێوەش کە لـەسەر من کۆبوونەتـەوە و هەسـت و سـۆزی زۆری مـن دەورووژێنێـت بـۆ ئێـوە و، ڕوودانـی ئـەم موسیبەتەش لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا کە هەموو سەعاتێکی لە حوکمـی سـەد سـەعات پەرستشدایە.. ئەمانە هەموویان، کارێك دەکەن کە هەموو سـەعاتێکی ئـەو سـەد سـەعاتە پاداشتە وەك دە سەعاتی پەرستش وابێـت و بیانگەیەنێتـە ئاستی پاداشتی هـەزار سـەعاتی پەرستش و بەندایەتی.

پاشـان کەسـانی دڵسـۆز و خـاوەن ئیخلاسـی وەك ئێـوە کـە پەیامـەکانی نووریـان خوێندووەتەوە و بە ڕاستی لێیان تێگەیشتوون و، هەستیان بەوە کردووە کـە دنیـا فـانی و ڕێبوارە و تەنها شوێنێکی کاتی‌یە بۆ بازرگانیی دواڕۆژ و، هەرچی‌یەکیان هەیە لە پێنـاوی

ئیمانەکەیان و دوارۆژی خۆیاندا بەختیان کردووە و، لەو باوەڕەدان کە ئەو گیروگرفتە کاتی و فانی‌یەی لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا دووچاری بوون چەندین چێژ و لەزەت و سوودی بەردەوام و هەمیشەیی هەیە.. کەسانی وەك ئێوە، کە بەم جۆرە بیر دەکەنەوە و، سوودی ئاوا هەمیشەیی‌یان دەستگیر بووە، لە بریی گریانی سۆز و بەزەیی و ئازارچەشتن بۆ حالتان، شایانی ئەوەن پیرۆزباییتان پێشکەش بکرێت و ڕێزی شایان لە خۆڕاگریتان بگیرێت. بۆیە لە لایەن خۆمەوە وتم:

"الحمد لله على كل حال سوى الكفر والضلال".

هەر بە وێنەی ئەم سوودانەی کە تایبەتن بە خۆمەوە، چەندین سوودی تریش هەن کە تایبەتن بە: ئێوە و، برایانمان و، پەیامەکانی نوور و، ئەم مانگی ڕەمەزانە پیرۆزەمان. بە ڕادەیەك کە ئەگەر پەردەیان لەسەر لا بدرێت و بیانبینن ئەوا هانتان دەدەن کە بڵێن: (شوکر و سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگار! چونکە بە ڕاستی ئەم قەزا و قەدەرەی هاتە ڕێمان چاودێری‌یەکی خوای گەورەیە کە بۆ ئێمەی خستووەتە کار). من لەمە دڵنیام و قەناعەتی تەواوم پێیەتی.

برایانم! هەرگیز گلەیی لەو کەسانە مەکەن کە هۆکاری ئەم ڕووداوە بوون. چونکە لە مێژە ئەم پلانە فراوان و ترسناکە ساز کراوە، بەڵام تا ڕادەیەك بە سووکەڵە و ئاسانی هاتە ڕێمان. پشت بەخوا بە خێرایی دەڕوات و کۆتایی پێ دێت. کەواتە ئێوەش دڵگران مەبن، بەڵکو بە ڕێنمایی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەنگاو بنێن کە دەفەرموێت:

﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة:٢١٦).

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیزەکانم!

من خۆم زۆر بە بەختەوەر دەزانم کە لێتانەوە نزیکم. هەندێ جار کە بە ئەندێشە دەتاندوێنم هەست بە دڵنەوایی دەکەم. ئەوەش بزانن کە ئەگەر بکرایە پڕ بە دڵ هەموو گیروگرفت و تەنگانەیەکی ئێوەم، بەوپەڕی پێخۆشحاڵی و شانازی‌یەوە، هەڵدەگرت.

من لەبەر ئێوە "ئیسپارتە" و دەوروبەریم بە گوڵ و دار و بەردی‌یەوە خۆش دەوێت، تەنانەت وتوومە و لە دەزگا ڕەسمی‌یەکانیشدا دەیڵێم: کە ئەگەر لە ئیسپارتەدا بەرپرسەکانی دەوڵەت سزام بدەن و پارێزگایەکی تریش تەبرییەم بۆ دەربکات، هەر هێشتا فەزڵی ئەم شارەی بەسەردا دەدەم.

بەڵێ، من لە سێ ڕووەوە خەڵکی ئیسپارتەم، هەرچەند لە ڕووی مێژوویی‌یەوە ناتوانم ئەمە بچەسپێنم، بەڵام قەناعەتم وایە کە بنەچەی "سەعید" کە لە ناحیەی "ئیسپاریت"[١] لە دایك بوون، لێرەوە کۆچیان بۆ ئەوێ کردووە.

هەروەها پارێزگای ئیسپارتە هێندە برای ڕاست و ڕاستگۆی پێ بەخشیوم کە نەك تەنها "عەبدولمەجید" و "عەبدوڕڕەحمان" بەڵکو بەوپەڕی ڕەزامەندی و منەتباری‌یەوە "سەعید"یش لە پێناوی هەموو یەکێکیاندا بەخت بکەم.

لەو باوەڕەدام کە ئێستا لە سەرانسەری گۆی زەویدا هیچ کەسێك نی‌یە کە ئازار و گیروگرفتی گیانی و دڵی و فیکریی لە هی قوتابیانی نوور کەمتر بێت، چونکە بە فەزڵی ڕووناکی‌یەکانی "ئیمانی تەحقیقی" دڵ و گیان و ژیریی قوتابیانی نوور گیرۆدەی تەنگانە و گیروگرفت نابن. خۆ سەبارەت بە سەختی و گیروگرفتە ماددی‌یەکانی دنیاشەوە بە سنگێکی پڕ لە ئارام و شوکرانە ڕووبەڕووی دەبنەوە، چونکە لە پەیامەکانی نوورەوە تێ گەیشتوون کە ئەو گیروگرفتە دنیایی‌یانە ڕێبوار و فانی و بێ‌نرخن و، پاداشت دەستی مرۆڤ دەخەن و، هۆکاریکیشن بۆ کردنەوە و فراوانبوونی بواری کارکردن لە خزمەتی ئیماندا. ئەو قوتابیانە بەم حاڵانەی خۆیان دەیچەسپێنن کە ئیمانی تەحقیقی مایەی بەختەوەریی مرۆڤە تەنانەت لەم دنیاشدا.

بەڵێ، قوتابیانی نوور بە گەرموگوڕی تێدەکۆشن بۆ ئەوەی ئەم گیروگرفتە فانی‌یانە بگۆڕن بە چەندین میهرەبانیی نەبڕاوەی بەردەوام و، دەڵێن:

ئاخۆ چ کارێك بکات ئەو یارە        هەرچی ئەو دەیکات جوانترین کارە

لە خوای بەخشندەی میهرەبان دەپاڕێینەوە کە هاوونەی ئەو قوتابیانە زۆر بکات و، بیانکات بە مایەی شەرەف و شانازی و بەختەوەریی ئەم وڵاتە و، لە بەهەشتی فیردەوسیشدا بەختەوەریی هەمیشەیی‌یان پێ ببەخشێت. ئامین.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

ئەم قەزا خوایی‌یەی کە لە گۆشەی "دادگەریی قەدەر"ەوە هاتە ڕێمان، هی ئەوەبوو کە چەند کەسێکی نوێی قوتابیانی نوور حەزیان لە بەدەستهێنانی هەندێ دەستکەوتی

---

(١) مەڵبەندی ناحیەیەکە لە نزیکی گوندی "نوورس" کە مامۆستا نوورسی تیایدا لە دایك بووە. (وەرگێڕ)

دنیایی بوو بە پەیامەکانی نوور، کە ئەمەش لەگەڵ نـهێنیی "ئیخلاس"دا ناگونجێت! بۆیـە خۆیان لە ڕووبەڕووی چەند مونافیسێکی هەلپەرستی دنیاییدا بینییەوە!

دۆزینەوەی پەیامێك لـە شـوێنێکی دووردا کـە ئەسـڵەکەی بیسـت و پێنـج سـاڵ پێش ئێستا نووسراوە (واتە تیشکی پێنجەم) و، لـە مـاوەی هەشـت سـاڵدا تەنـها یـەك دوو جـار بەردەستی خۆم کەوتووەتەوە و یەکسەریش ون کـراوە.. دۆزینـەوەی ئـەم پەیـامـە، نیمچـە زانایـانی خستووەتە دۆخـی ڕکەبەر و، وەهـم و گومانیـان لـە بـارەی ئـەم پەیامـەوە لـە ریزەکانی فەرمانگەکانی "داد"دا بڵاو کردووەتەوە.

هەر لە هەمان کاتدا هەواڵی چاپبوونی پەیامی "الآية الكبرى"ش بـە پیتـە نوێکـان بـە بێ ڕەزامـەندیی خـۆم و گەیشتنی چـەند نووسـخەیەك لێـی بـۆ ئێرە، لـە بریـی چـاپکردنی پەیامی "کلیلی ئیمان"[1] کە حەزم لە چاپکردنی بوو، ئەم هەواڵـە بـە پێچەوانـە شـکایەوە بەسەر فەرمانگەکانی حکوومەتدا و هەریـەك لـەم دوو مەسـەلەیەیان لـە لا بـوو بـەوی تر. وەك بڵێی پـەیامی "تیشـکی پێنجـەم" بـە پێچەوانـەی یاسـا مەدەنییـەکان چـاپ کرابێـت. ئەمەش کارێکی کرد کەسانی خاوەن غـەرەزی شەخسـی بـە کارەسـاتێکی گـەورەی لـە قەڵەم بدەن و دەنکە گەنمێك بە سەد هێندەی گومەزێك پیشان بدەن، تا بە ناحـەق و ستەم ئێمەیان ترنجاندە ئەم شوێنی ئیعتیکاف و گۆشەگیرییەوە.

قەدەری خواوەندیش بۆیە ئێمەی گەیاندە ئێرە تاکو لـێرەدا چـەند سـوودێك بەدەسـت بهێنین، چونکە ئەم شوێنە پاداشتی گەورەی گەلـێ زیاتری لە هی زاهیدە گۆشـەگیرەکان دەست خستین کە لـە خـەڵوەتگا ئیختیارییـەکانی خۆیـاندا بەدەستی دەهێنـن. هـەروەها قەدەری خوایی بۆیـە جـارێکی تر بانگێشتی کردیـن بـۆ "قوتابخانـەی یووسـفی" تـاکو بـە تەواوەتی وانەی ئیخلاسمان فێر بکـات و پەیوەندییـە لارەکانمـان بـەم دنیـا بێنرخـەوە پێ ڕاست بکاتەوە.

ئێمە لە بەرامبەر وەهم و گومانەکانی ئەهلی دنیاوە دەڵێین:

"تیشکی حەوتەم" هەر لە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی لـە بـارەی ئیمانـەوە دەدوێـت و، ئێـوە سەرتان لـێ شێواوە و خەڵەتاون. "تیشکی پێنجەم" بە تەواوەتی لەو جیـاوازە و پـەیامێکی تایبەتی و لەڕادەبەدەر نهێنییە، بە جۆرێـك کـە سـەرباری پشـکنینی وردیـش کـەچی لای

(١) نامیلکەیەکە چەند هەڵبژاردەیەکی پەیامەکانی لەخۆ گرتووە. (وەرگێڕ)

ئێمە نەیاندۆزییەوە. ئەسڵی ئەم پەیامەش بیست ساڵ پێش ئێستا نووسراوە. ئێمە ڕازی نین کە بە تەنها خۆی چاپ بکرێت تەنانەت هەر ڕازیش نین کە لەم کاتەی ئێستادا پیشانی هیچ کەسێك بدرێت، چونکە پەیامێکە هەواڵی چەند ڕووداوێکی ئاینده ڕادەگەیەنێت و، واقیعیش لەوێ تەسدیقی کرد و، تەحەددای هیچ کەسێکیش ناکات.

* * *

باسمه سبحانه

لەگەڵ ئەوەدا کە جارێکی تر پیرۆزبایی جەژنتان ئاراستە دەکەم، دەشڵێم: خەفەتی ئەوە مەخۆن کە ئێمە بە ڕواڵەت چاومان بە یەکتر ناکەوێت، چونکە ئێمە لە ڕاستیدا هەمیشە بە یەکەوەین و، پشت بەخوا ئەم هاودەمی و بە یەکەوە بوونەشمان لە ڕێی هەتاهەتاییدا بەردەوام دەبێت.

من لەو قەناعەتەدام کە ئەو پاداشتە هەمیشەییانەی بە کارەکانتان لە پێناوی ئیماندا بەدەستی دەهێنن و، سەرجەمی ئەو تایبەتکارییە گیانی و شادمانییەی ناو دڵیشتان، گشت خەم و دڵتەنگییەکتان دەسڕێتەوە کە ئێستا بە شێوەیەکی کاتی دێنە ڕێتان.

بەڵێ، تا ئێستا جگە لە "قوتابیانی نوور" بۆ کەسی تر نەڕەخساوە کە لە پێناوی گەورەترین کاری پیرۆز و خاوێندا دووچاری کەمترین گیروگرفت و دەردیسەری بووبن.

بەڵێ، بەهەشت گرانە؛ بە هەرزان و ئاسانی دەست ناکەوێت. هەروەك ڕزگارکردنی ئیمانیش لە چنگی ئەو کوفرە موتڵەقەی کە هەردوو ژیانەکە پێکەوە لەناو دەبات، لەم کاتەدا لەڕادەبەدەر گرنگە. تەنانەت گەر هەندێ گیروگرفتیش ڕوو بدات دەبێ بە شەوق و شوکرانەبژێری و ئارامگرتنەوە ڕووبەڕووی ببینەوە. چونکە مادەم بەدیهێنەرەکەمان کە بۆ ئەم خزمەتە دەمانداتە بەر و تیایدا دەمانخاتە کار، میهرەبان و دانایە، ئەوا دەبێ بە خۆشحاڵی و ڕەزامەندییەوە پێشوازیی هەموو گیروگرفتێك بکەین کە بێتە ڕێمان و، پەنا بۆ میهرەبانییەکەی ئەو بەدیهێنەرە ببەین و، لە دانستەکەشی دڵنیا بین.

یەکێك لە برا قارەمانەکانمان بەرپرسیاریی تەواوەتیی چاپکردنی پەیامی "الآیـــة الکبری"ی گرتە ئەستۆی خۆی. بە ڕاستی دەریخست کە شایانی فەزڵ و شەرەفی

بەرز و بڵندی ئاخیرەتە، چونکە "الحزب القرآني"[(١)] و "الحزب النوري"[(٢)]ی نووسی‌یەوە.
ئەم حاڵەتەی ئەو برایەمان منی خستە گریانێکی تێکەڵ بە شادمانی‌یەکی قووڵەوە!

تیشکی حەوتەم(الآیة الکبری) سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، چونکە ئەم دەست بەسەردا گرتنە کاتی‌یەی ئێستا حیکمەتی ڕێ خۆشکردن و بواردانی لەخۆ گرتووە بۆ چەندین فتووحاتی شایستەی ئەو پەیامە لە ئایندەدا. ئێمە لە میهرەبانیی خواوەند ئومێدەوارین کە خەرجی و مەسرەف و خزمەتگوزاری‌یەکانی برای ناوبراومان و هاوڕێیانی بەزایە نەدات و درەخشانی‌یان پێ ببەخشێت.

ئەو کەسەی کە هەر هەمووتان دەخاتە ناوەندی دوعاکانیەوە بە شێوەی "کۆ"، وەك: "أجرنا، ارحمنا، احفظنا" بێ جیاکردنەوەی هیچ کامتان و، بەپێی دەستوورەکەی خۆمان تێدەکۆشێت کە بریتی‌یە لە "هاوبەشایەتیی مەعنەوی" کە وەك چەند جەستەیەکی زۆر وایە بە یەك گیان بژین و، لە ئازار و گرفتەکانی ئێوە زیاتر ئازار دەچێژێت و، چاوەڕوانی هیممەت و یارمەتی و دامەزراوی و توندوتۆڵی و شەفاعەتە لە کەسی مەعنەویتان، ئەو کەسە بریتی‌یە لە:

براتان

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برای ئازیز و ڕاستگۆم کاك ڕەئفەت!

پرسیارەکانتان کە نیشانەی "زانست"یان پێوەیە، بوون بە چەند کلیلێك بۆ چەندین ڕاستیی گەورە و گرنگی کۆمەڵە پەیامی "مەکتووبات"ی سەرجەمی پەیامەکانی نوور. بۆیە پرسیارەکانتان پشتگوێ ناخەم. جا وەڵامی پوختی ئەم پرسیارەتان ئەمەی خوارەوەیە:

مادەم قورئانی پیرۆز گوفتارێکی ئەزەلی‌یە ئاراستەی هەموو چینەکانی مرۆڤ و سەرجەمی خاوەن پەرستشەکان کراوە، ئەوا دەبێ گەلێ واتای جۆراوجۆری بە

(١) کۆمەڵە ئایەتێکی هەڵبژاردەن لە قورئانی پیرۆز، "ئیمان" لە ناخی دڵی مرۆڤدا دادەمەزرێنن و تایبەتن بە بیرکردنەوەی ئیمانی لە گەردوون. (وەرگێڕ)

(٢) بریتی‌یە لە پوختەی چەند تێرامانێکی فیکری کە مامۆستا نوورسی بە زمانی عەرەبی نووسیویەتی. (وەرگێڕ)

گوێرەی تێگەیشتنی ئەوان تێدا بێت و واتـا هەمەکی‌یەکەشـی گەلـێ پلـەی زۆری لـەخۆ گرتبێـت. هـەندێ لـە تەفسیرنووسـان تەنـها واتـا هـەرە گشـتی‌یەکە، یـان تەنـها واتـای ڕاشکاو، یـان تەنـها واجـب، یـان ئـەو واتایـەی کـە سـونەتێکی موئەککـەد دەگەیـەنێت، هەڵدەبژێرن.

بۆ نموونە دەڵێت: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَمِنَ الَّيْلِ فَسَبِّحْهُ﴾ (الطـــور:٤٩) دوو ڕکاتەکەی شـەونوێژ دەردەخـات کـە سـونەتێکی نەبـەویی گرنگـە، هـەروەها لـە فەرمایشتی ﴿وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾یش ئەوەی دەرهێناوە کـە مەبەست سونەتی موئەککـەدی بەیانی‌یە.

لە کاتێکدا کە واتای یەکەم، جگە لەم واتایە، گەلـێ شتی زۆری تر دەگرێتەوە.

برام! گفتوگۆ لەگەڵ تۆدا نەبڕاوە و بەردەوامە.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

ئێستا نوێـژی نیـوەڕۆم ئـەدا کـرد و لـە کـاتی زیکرەکـاندا ئێـوەم بـە بـیردا هـات کـە هەریەکەتان خەفەت بۆ خۆی و حاڵی کەسوکارەکانی دەخوات کە لەگەڵیا نیشـتەجێن. یەکسـەر ئەمەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

ئەو کەسانەی کە لە ڕابوردوودا فەزڵی ئاخیرەتیان بەسەر ژیـانی ئـەم دنیایـە دەدا و لـە ئەشکەوت و پەرسـتگاکاندا بـۆ ڕزگـارکردنی خۆیـان لـە گوناهباری‌یـەکانی ژیـانی کۆمەڵایەتی گۆشەنشین دەبوون، تاکو بە هـەوڵ و کۆششـێکی خـاوێن ئـەودنیا بەدەسـت بهێنن و ژیانی خۆیان لە وەرزشی ڕۆحیدا بـە بەردەوامی دەبـردە سـەر.. گـەر ئەوانـە لـەم ڕۆژگارەدا بژیانایە، دەبوون بە قوتابیی پەیامەکانی نوور.

بێ گومـان ئەمانـەی کـە لـەم بارودۆخانـەی ئێسـتادان، دە هێنـدەی ئەوانـەی پێشـین موحتاجن و، دە هێندەی ئەوانیش چاکە و تایبەتکاری بەدەست دەهێنن و بە دە پلە لـەوان زیاتریش دڵنیایی‌یان دەست دەکەوێت.

* * *

برا ئازیز و پیرۆزەکانم!

سڵاوێکی زۆرتان لێ بێت.

جاران لە شارەکەی خۆماندا ڕۆژی عەرەفە هەزار جار سوورەتی "ئیخلاس"مان دەخوێند. بەڵام ئێستا هەر ئەوەندە دەتوانم کە ڕۆژی پێش عەرەفە پێنجسەد جار و ڕۆژی عەرەفەش پێنجسەد جار بیخوێنم. جا هەر کەس لە ئێوە دەتوانێت با هەمووی بە یەك جار بخوێنێت. خۆ هەرچەند تەنانەت چاوم بە یەك کەسیشتان ناکەوێت، بەڵام زۆربەی جار دەتوانم هەمووتان ببینم و لە ناوەندی دوعاکانمدا بە چاوپێکەوتنی تایبەتی و هەندێ جاریش بە ناوەکەی خۆی پێی بگەم.

* * *

برا ئازیزەکانم!

لە زیکرەکانی نوێژی بەیانیی ئەمڕۆدا زۆر خەم و ئازارم بۆ حاڵی "حافظ توفیقی شامی" چەشت، چونکە بیرم کردەوە لەوەی کە ئەمە دووهەم جاریەتی دووچاری زەحمەت و گیروگرفت دەبێت. بەڵام یەکسەر ئەوەم بە دڵدا هات کە: پیرۆزبایی لێ بکە! چونکە ئەو دەیویست هەندێك خۆی لە پلەوپایەی مەزنیی پەیامەکانی نوور بکشێنێتە دواوە و لەبەر حەزەرێکی بێسوود لە دەستکەوتە مەزنەکەی ئەم پەیامانە دوا بکەوێت. بەڵام خاوێنی و مەزنیی کارەکەی بۆ دەستکەوتنی ئەو بەشە مەزن و پاداشتە زۆرە تەوفیقیان دا. بەڵێ،.

بەڵێ برایانم! مادەم هەموو شتێك فانی و کاتییە، ئەوا ئەو شتە ئەگەر چێژ و لەزەت و خۆشی بێت بێسوود لە دەست دەچێت و خەم و خەفەت بەجێ دەهێڵێت، بەڵام ئەگەر ماندووبوون و تەنگانەیەك بێت لە گۆشەی ڕوانینی ئەم خزمەتە موقەددەسەوە ئەوا گەلێ سوودی گرنگی سەر بەم دنیا و ئەودنیاش بەرهەم دەهێنێت، چونکە هێندە سوودی شیرین و بەلەزەتی تێدا دەبێت کە ئەو ئەرك و تەنگانە و گیروگرفتانە لادەبات.

جا من بۆ دڵنیاییتان دەڵێم: لەم حاڵەی خۆم ڕازیم و بە سەبر و ئارامی جوان و شوکرانەکردنی تەواوەتییەوە ڕووبەڕووی دەبمەوە، هەرچەندەش من لە یەکێکتان نەبێ لە هەمووتان بە تەمەنترم و گیروگرفت و ئازارەکانیشم لە هی هەمووتان زیاترە.

شوكرانەبژێری بەرامبەر بە موسیبەت لەبەر ئەو پاداشت و سوودە دنیـایی و قیامەتی‌یانەیە كە لەو موسیبەتەدان.

* * *

برا ئازیزەكانم!

چەند ڕێگرێك هەبوون ڕێ‌یان لە تەواوكردنی مەسـەلەكانی پەیامی "بـەری درەختـی ئیمـان" دەگرت. یەكێكیان سـەرما و سـۆڵەی توندوتیـژی زسـتان و، ئـەوی تریشـیان سەرسام بوونـی ماسۆنی‌یەكانە لـە هێزی ئەو پەیامە. بـەڵام پشـت بـەخوا بـە نـەمانی ئـەو ڕێگرانە دەست بە تەواوكردنی دەكرێت.

مـن هـەر كـە لـە ڕووی قـەدەری خـوای گـەورەوە بیر لـەم موسـیبەتە دەكەمـەوە كـە دووچاری بووین، هەرچی گیروگرفتم هەن نامێنن و دەبن بە میهرەبانیی خوای گەورە.

بەڵێ، هـەروەك لـە "پەیامی قـەدەر"دا ڕوون كراوەتـەوە، هـەرچی ڕووداوە دوو جۆر هۆكاری هەیە:

یەكەمیان: هۆكارێكی ڕواڵەتی‌یە و خەڵكی بەپێی ئـەو ڕووە بڕیـار دەدەن و، زۆربـەی جاریش ستەمی تێدا دەكەن.

ئەوی تریان: هۆكارێكی ڕاستەقینەیە، قەدەری خوای گـەورە بـە گوێـرەی ئـەوە بڕیـار دەدات.

كەواتە "قەدەر" لە ژێر پەردەی "ستەم"ی مرۆڤدا و لە هەمان ڕووداودا بە "دادگەری" ڕەفتار دەكات.

نموونەی ئەمە، وەك ئەوەی كە:

یەكێك بـە تۆمـەتی دزی‌یـەك (كـە نـەیكردووە) دەخرێتـە بەندیخانـەوە، بـەڵام قـەدەری خـوای گـەورە لەسـەر تـاوانێكی (تـری شـارراوەی ئـەو) فـەرمانی بـەندكردنی دەدات. كەواتە لە ناوەندی ئەو "ستەم"ەی كە مرۆڤ هێناویەتیە ڕێـی، قـەدەری خـوای گـەورە بـە "دادگەری" بڕیاری لەسەر دەركردووە.

جا لەم كێشەیەی خۆماندا و لەم تاقیكردنەوە سەختەی كە بۆ مەبەستی:

جیاكردنەوەی ئەڵماس لە وردە شووشـە و.. هـاوڕێی فیداكـار لـە كەسـانی دوودڵ و بەدگومان و.. دڵسۆز و بێگەرد لەوانـەی كـە واز لـە خۆویستی و بـەرژەوەندیی كەسـیی خۆیان ناهێنن.. دووچاری بووین، دوو هۆكار هەیە:

یەکەم: خزمەتکردنی بەرز و باش و بێگەردی ئیمان لە ناوەند پشتگیری و ئیخلاسێکی توند و بەهێزی نێوانمان. بە ڕادەیەك کە ڕق و قینی ئەهلی دنیا و سیاسەتی هەڵگرساند. جا کە مرۆڤ بۆ ئەم هۆکارەیان ڕوانی، ستەمیان لێ کردین.

دووهەم: هەموو یەکێك لە ئێمە ئیخلاس و پشتگیریی تەواومان دەرنەخست و بە تەواوی ئەو شیاوییەمان دەرنەبڕی کە خزمەتکردنی بێگەرد و پیرۆز داخوازیەتی. بۆیە قەدەری خوای گەورە کە بۆ ئەم ڕووەی ڕوانی، دادگەریی لە ئاستدا نواندین.

جا ئەم قەدەرەی خوای گەورە، هەروەك "دادگەری"یە لە هەمان کاتیشدا "میهرەبانی"یەکی خوای گەورەیە بۆ ئێمە. چونکە لە یەك کۆڕدا چەندین برای تاسەمەندی یەکتریی کۆکردەوە و.. گیروگرفتەکانیشی بوون بە عیبادەت و.. ماڵ و سامانە بەزایەچووەکانیش بوون بە سەدەقە و.. سەرنجی خەڵکی بۆ لای پەیامە دەستنووسەکانی نوور ڕاکێشران و.. تێی گەیاندین: ماڵ و منالی دنیا و حەوانەوەی مرۆڤ لە دنیادا چەند شتێکی فانی و کاتین و، ڕۆژێك دێت کە بە حەتمی بەجێیان دەهێڵێت و دەڕوات بۆ ناو خاك، کەواتە شایانی ئەوە نییە مرۆڤ لە پێناوی ئەم دنیایەیدا ئەودنیای لەکیس خۆی بدات.. هەروەها باشتر وایە مرۆڤ خۆی لەسەر ئارامگرتن ڕابهێنێت و، بۆ ئەو برایانەش کە لەمەولا دێن ببێت بە ڕابەر و پێشڕەوێکی پاڵەوان لەم چەشنە کارانەی کە هەموویان میهرەبانیی خوای گەورەن.

بەڵام تەنها یەك لایەن هەیە بیری منی سەرقاڵ کردووە، ئەویش ئەوەیە کە: هەروەك کاتێ پەنجەیەکی مرۆڤ زامدار دەبێت، ئەوا ژیری و دڵ و چاوی واز لە کار و پیشەی خۆیان دەهێنن و بەو زامەوە سەرقاڵ دەبن، بە هەمان جۆر "دڵ" و "گیان"یش بە زامی تەنگانە و گیروگرفتەکانی ئەو ژیانەوە سەرگەرم دەبن کە بە حوکمی زەرووڕەت دووچاری بووین و چووینەتە ناوی. بە ڕادەیەك کە ئەو حاڵەتە بیرکردنەوەی منی بەرەو کۆڕ و ئەنجومەنی ماسۆنییەکان دایە بەر. لە کاتێکدا کە دەبوو لەو کاتەدا دنیاشم لە بیری خۆم ببردایەتەوە، کەچی بیری خۆمم بە نازڵبوونی زللەی تەمێ کردنی ئەوانەوە سەرقاڵ کردبوو!

دڵنەوایی خۆم لە گریمانی ئەوەدا دەبینم کە خوای گەورە ئەم حاڵەتی بێئاگاییەم بە جۆرە جیهادێکی فیکری لێ وەربگرێت.

سلاوى كاك "عەلى گولّ"ى براى "حافظ محەممەد"ى وانەبێژى بەتواناى پەيامەكانى نوورم پێ گەيشت. منيش لە لايەنى خۆمەوە هەزار دوعا و سلاو بۆ خۆى و هەموو برايانى و سەرجەمى زيندووان و مردووانى خەلكى گوندى "ساو"(١) دەنێرم.

* * *

برا ئازيز و بەوەفاكانم!

خۆڕاگرى و توندوتۆلّيى ئێوە، پشت بەخوا، هەموو فێلّ و پيلانێكى ماسۆنى و دووڕووەكان پووچەلّ دەكاتەوە و هيچ ئەنجامێك بەدەست ناهێنن.

بەلّێ برايانم! هيچ پێويست بە شاردنەوە و قسەى پەنامەكى ناكات. ئەو زەنديقانە، قوتابيان و پەيامەكانى نووريان وەك تەريقەتە سۆفىيەكان بە تايبەت تەريقەتى نەقشبەندى لێكدايەوە، ئەوەبوو بە خودى ئەو پلانانەى كە بە هۆيانەوە بەسەر شوێنكەوتووانى تەريقەتە سۆفىيەكاندا زالّ بوون، هێرشيان كردە سەر ئێمەش، بەو هيوايەى لە يەكمان دابڕن و لە شان و شكۆمان كەم بكەنەوە.

ئەوەبوو ئەم هۆكارانەى خوارەوەيان لە دژمان بەكار هێنا:

يەكەم: هۆكارەكانى ترساندن و دوورخستنەوەى خەلكى لێمان و پێشچاو خستنى چەند كارێك كە بە خراپى لەو ڕێبازەدا بەكار هێنراوە.

دووهەم: جاڕدان و بلاوكردنەوەى ناتەواوى و كەموكووڕىيەكانى ئەركان و پەيوەنديدارانى ئەو ڕێبازە.

سێهەم: ئەو هۆكارانەى كە لە دژى تەريقەتى نەقشبەندى و تەريقەتەكانى تر بەكاريان هێنا بريتين لە:

بلاوكردنەوەى فەساد بەهۆى فەلسەفەى ماددى و.. پەرەدان بە هەرزەيى شارستانێتىيە لەخشتەبەرەكەى ئەو فەلسەفەيە و.. ئاسانكردنى دەستخستنى لەزەتە بەنجكەرە ژەهراوىيەكەى بۆ مەبەستى تێكشكاندنى پشتگيرى و پەيوەندىيەكانى برايەتيى نێوانيان و.. شكاندن و داگرتنى شان و شكۆى مامۆستا و ڕابەرەكەيان بە

(١) گوندى ساو گوندێكى نزيكە لە "بارلا" كە مامۆستا نوورسى بۆ ئەوێ نەفى كرابوو. سەرجەمى خەلكى ئەم گوندە، بە ژن و بە پياو بە پير و لاويانەوە، لە ڕێى نووسينەوە و بلاوكردنەوەى پەيامەكانى نوورەوە خزمەتى ئيمانيان كردووە. (وەرگێڕ)

سوو کایەتی پێ کردنی و.. شکاندنی بایەخ و گرنگیی ڕێبازەکەیان بە هێنانەوەی دەستوورەکانی زانست و فەلسەفە..

خۆ هەر خودی ئەم هۆکار و چەکانەن کە لە هێرش کردنیشیاندا بۆ سەر ئێمە بەکاریان دەهێنن.

بەڵام ئەوان خەڵەتاون و بە هەڵەدا چوون! چونکە بناغەی ڕێبازی "پەیامەکانی نوور" بریتییە لە "ئیخلاسی تەواوەتی" و.. وازهێنان لە "خۆپەرستی" و.. هەستکردن بە میهرەبانیی خواوەند لە سەختی و گەرماوگەرمی ئەنجامدانی کارەکاندا و.. گەڕان بە دوای چێژ و لەزەتە باقییەکان لە ناوەندی ئازارە سەرپێیی و کاتییەکاندا و.. دەرخستنی ئازارە سەختەکان لە ناوەندی خودی لەزەتەکانی هەرزەییدا و.. ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە مایەی لەزەتی بێ گەرد و نەبڕاوەی ئەم دنیایەش هەر "ئیمان"ە. ئەمە جگە لەوەش کە ئەم پەیامانە خەڵکییان فێری ڕاستییەکان کردووە و ئەو مەسەلانەیان تێ گەیاندوون کە هیچ فەلسەفەیەك ناتوانێت. بگاتە ئاستیان.

لەبەر ئەوە، هەموو ئاوات و پلانەکانیان پشت بەخوا پووچەڵ دەبێتەوە و ڕووبەڕووی ئەم ڕاستییە دەبنەوە کە: ڕێبازی پەیامەکانی نوور لەگەڵ تەریقەتە سۆفییەکاندا قیاس ناکرێت. ئەو کاتەش لە هەوڵەکەیاندا ڕەنجەڕۆ دەبن.

* * *

بەسەرهاتێکی سەیر!

ئەم بەیانییە لە هۆڵی جەندرمەکانەوە، کە لە تەنیشتمەوەیە، یەکێکیان بانگی لێ کردم. منیش بۆ سەر پەنجەرەکە سەرکەوتم.

وتی: دەرگای هۆڵەکەمان لە خۆیەوە داخرا و هەرچەندە هەوڵیشمان داوە هەر ناتوانین بیکەینەوە!

وتم: ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئێوە کە تێتان دەگەیەنێت ئەوانەی چاودێرتان لەسەر داناون و دەرگایان لەسەر دادەخەن کەسانی بێ تاوان و بێ گوناهی وەك ئێوەیان تێدایە. ئەوەبوو بە بیانووی چاوپێکەوتنێکی یەك دەقیقەییم لەگەڵ برایەکی ئاییینمدا کە دە ساڵە نەم بینیوە سووکایەتییان پێ کردم و، بە بیانوویەکی تر دەرگاکەی تری دەرەوەشیان لەسەر داخستم. وا لە تۆڵەی ئەوەدا دەرگا لەسەر ئێوەش داخرا!

**سەعیدی نوورسی**

برا ئازیزه‌كانم!

وا ماوه‌ی سالێكه له‌ ته‌نها یه‌ك كیلۆ برنج و شه‌عریه‌ خواردنه‌كانم ئاماده‌ ده‌كه‌م! ئیتر هیچ گومانێكم له‌وه‌دا نه‌ما كه‌ به‌ره‌كه‌تێكی مه‌زنی تێدایه‌. به‌ڵام ئێوه‌ ناهێڵن بۆ خۆم لێی بنێم و بیكوڵێنم، بۆیه‌ وه‌ك دیاری‌یه‌كی پیرۆز و به‌پیت پێشكه‌شی ئێوه‌ی ده‌كه‌م.

جارێكیان به‌ره‌كه‌تێكی نائاسایيم له‌و شه‌عریه‌وه‌ بینی، چونكه‌ دوای كوڵاندن ده‌نكه‌كانیم وشك ده‌كرده‌وه‌ و من و چه‌ند كه‌سێكی تر به‌ چاوی خۆمان بینیمان كه‌ هه‌موو یه‌كێكی ده‌نكه‌كانی ده‌ هێنده‌ی خۆی درێژ ده‌بوو!

* * *

برا ئازیزه‌كانم!

ئه‌مشه‌و كه‌ خه‌ریكی خوێندنی ویرده‌كانم بووم، پاسه‌وانه‌كان و كه‌سانی تریش گوێیان له‌ ده‌نگم بوو. له‌م كاته‌دا ئه‌م پرسیارەم به‌ دڵدا هات كه‌: ئایا ئه‌م ده‌نگ به‌رزكردنه‌وه‌یه‌ و ئاشكراكردنی خوێندنی ویرده‌كان پاداشته‌كه‌ی كه‌م ناكاته‌وه‌؟ ئه‌مه‌ دووچاری دڵه‌ته‌پێ و نیگه‌رانیی كردم. به‌ڵام وته‌كه‌ی "حوجه‌جه‌تولئیسلام ئیمامی غه‌زالی"م هاته‌وه‌ یاد كه‌ ده‌فه‌رموێت: "هه‌ندێ شت هه‌ن ئاشكراكردنیان گه‌لێ باشتره‌ له‌ شاردنه‌وه‌یان".

واته‌: خوێندنی ویرده‌كان به‌ ده‌نگی به‌رز و ئاشكرا سوودی بۆ كه‌سانی تر تێدایه‌، چونكه‌ یان ئه‌وانیش چاوی لێ ده‌كه‌ن، یان ئه‌و ویرده‌ له‌ خه‌وی بێئاگایی بێداریان ده‌كاته‌وه‌، یان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی وه‌ك راگه‌یاندنێكی شه‌عائیره‌كانی ئیسلامه‌ ئه‌وا ده‌رخستنی عیززه‌تی ئایینه‌ له‌ به‌رده‌م ئه‌و گومڕایه‌دا كه‌ نوقمی هه‌رزه‌یی بووه‌.. ئه‌مانه‌ و چه‌ندین سوودی تریشیان تێدایه‌، به‌ تایبه‌ت له‌م زه‌مان و ڕۆژگاره‌دا. كه‌واته‌ پشت به‌خوا "ریا" تێكه‌ڵی كاری ئه‌و كه‌سانه‌ نابێت كه‌ به‌ ته‌واوه‌تی فێری ده‌رسه‌كانی "ئیخلاس" بوون. ته‌نانه‌ت ئه‌و ئاشكراكردنه‌ خێری له‌ شاردنه‌وه‌ی گه‌لێ زیاتره‌، به‌ مه‌رجێ مه‌رایی خۆی تێدا هه‌ڵنه‌قورتێنێت.

به‌م جۆره‌ دڵدانه‌وه‌ی خۆمم له‌م قسه‌یه‌دا ده‌ست‌كه‌وت.

كاتێ كه‌ دادوه‌ری توێژینه‌وه‌(حاكم التحقيق) دوو ڕۆژ پێش ئێستا بانگی كردم، بیرم له‌ چۆنێتیی به‌رگری‌كردنم له‌ برایانم ده‌كرده‌وه‌ و، كتێبی "الحزب المصون"ی ئیمامی

غەزالیم کردەوە، یەکسەر ئەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوەم تێدا بینی کە سەرنجی منیان ڕاکێشا:

﴿إنّ اللهَ يُدافِعُ عَنِ الَّذينَ آمَنُوا.....﴾ (الحج: ٣٨).

﴿يَسْعَى نُورُهم بَينَ أيْديهِم وبِأيْمانِهم .....﴾ (الحديد: ١٢).

﴿اللهُ حَفِيظٌ عَليهِم.....﴾ (الشورى: ٦).

﴿طُوبى لَهُم.....﴾ (الرعد: ٢٩).

﴿رَبَّنا أَتْمِمْ لَنا نُورَنا وَاغْفِر لَنا .....﴾ (التحريم: ٨).

* * *

ئەوانەی لەم دوو قوتابخانە یووسفیی‌یە (کۆن و نوێ)یەدا تاقیکردنەوەی سەختیان بڕی و، لەرزەیان پێ‌نەکەوت و، وازیان لە وانەکانی ئیمان نەهێنا و، لە هیچ بارودۆخێکدا دەستیان لە سیفەتی قوتابی هەڵنەگرت و، ئەو هەموو هێرشە زۆر و زەبەندانەش کرایە سەریان ورەی ئەوانی نەڕووخاند..

ئەوانە، مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یەکان ڕێزیان لێ دەنێن و سلاویان لێ دەکەن و بە پێشوازی‌یانەوە دەڕۆن، هەروەك لە لایەن حەقخوازان و بەرەی داهاتوویشەوە بە هەمان جۆر ڕێزیان لێ دەگیرێت. من زۆر قەناعەتم بەمە هەیە. بەڵام گەلێ دڵگرانی ئەوەم کە بیمار و هەژارتان لە نێواندایە، جا با هەموو یەکێك لە ئێوە بۆ ئەوانە ببن بە: پێشەنگی ئارامگر و ڕەوشت جوان و، لە ڕووی نەرمونیانی و پشتگیریی یەکتریشەوە ببن بە برای بەشەفەقەتیان و، زیرەکانە لەگەڵیاندا بدوێن و، لە کاتی دەرسە ئیمانی‌یەکاندا وەڵامی پرسیارەکانیان بدەنەوە و، بەرامبەر بەوان وەك ئاوێنەیەکی بێگەرد وابن بۆ دانەوەی ڕەوشتە بەرز و جوانەکان..

جا کە ئەم کارانەتان ئەنجام دا، ئەوا دەبینن هەرچی ئێش و ئازاری تەنگ پێ‌هەڵچنینەکانی بەندی هەن، تێکڕا پشتیان هەڵکردووە و پەستی و بێزاریتان هیچ نەماوە. بەڵێ، من وا تەسەوور دەکەم و دڵی خۆمی پێ دەدەمەوە، ئەی ئەو برایانەی کە لە گیانی خۆم خۆشترم دەوێن!

ڕۆژێك جوببەکەی "مەولانا خالید"تان(١) – قُدِّسَ سِرُّه – بۆ دەنێرم کە تەمەنی سەد و بیست ساڵە. جا هەروەك ئەو جوبەکەی خۆی لەبەر کردم، منیش لە لایەن خۆمەوە هەرکات بتانەوێت دەینێرم بۆتان تاکو هەریەکەتان بە ناوی خۆیەوە لەبەری بکات.

لە سەرەتای هاتنماندا بۆ ئێرە پزیشکەکە لوقاحی ئاوڵەی لێ دام، لە ئەنجامی ئەمەشەوە قۆڵم ئاوسا و ئاوسانەکەشی بەرەو خوار هات بە ڕادەیەك کە بواری نوستنم نادات و لە کاتی دەستنوێژدا بێزارم دەکات. ئایا بڵێی هی ئەوە بێت کە جەستەم توانای کوتانی ئاوڵەی نەبێت یان شتێکی تر لەم کارەدا هەیە؟ بیست ساڵ پێش ئێستا لە ئەنقەرە لوقاحی ئاوڵەم لە خۆم داوە و تا ئێستاش جار بە جار شوێنی کوتانەکەی دەئاوسێت و بێزارم دەکات، دەترسم ئەمەش وەکو ئەوە وابێت. ئەی ئایا ئەمە لای ئێوە چۆنە؟

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

حیکمەتێکی دادگەریی قەدەری خوا، کە ئێمەی بەرەو قوتابخانەی یووسفی دەنیزلی داوەتەبەر، بریتیە لە پێویستیی بەندکراوان و خەڵکان و لەوانەشە بەرپرسەکان و کارمەندانی فەرمانگەی دادگەری لەم شارەدا بە قوتابیان و پەیامەکانی نوور زیاتر لە هەموو شوێنێکی تر!

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە ئێمە بە ئەرکێکی ئیمانی و قیامەتی ڕۆشتینە ناو تاقیکردنەوەیەکی گەلێ قورسەوە. چونکە پێشتر لە بیست سی کەسدا مەگەر یەك دوو

(١) (مەولانا خالید): ناوی خالید کوڕی ئەحمەدی کوڕی حسەینە و، لە تیرەی جافی میکایلییە و، لە ساڵی ١١٩٣ك لە شارۆچکەی قەرەداغی سەر بە پارێزگای سلێمانی لە کوردستانی باشوور لە دایك بووە و، لە ساڵی ١٢٤٢ك لە شام بە نەخۆشیی تاعوون کۆچی دوایی کردووە. لە زانست و تەقوادا یەکەمی چەرخ و ڕۆژگاری خۆی بووە و، تەریقەتی نەقشبەندیشی لە شێخ عەبدوڵلای دیهلەوی وەرگرتووە. مەولانا نوێکار(مجدد)ی سەردەمی خۆی بووە و، فەر و بەرەکەتی بانگەوازەکەی نەك تەنها وڵاتی خۆمان بەڵکو هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی گرتبووەوە. چەندین زانای گەورە لە خزمەتیدا بڕوانامەی زانستییان وەرگرتووە و چەندەها ئەولیاش لەسەر دەستیدا پێگەیشتوون. ئەم جوببەیەش کە لێرەدا ناوی هاتووە لە قوتابییەکی مەولاناوە بە میراتی بۆ "ئاسیا خانم" ماوەتەوە کە ئەویش لە ڕێی یەکێك لە قوتابیانی نوورەوە ناردوویەتی بۆ مامۆستا نوورسی و، مامۆستاش تا کۆتایی تەمەنی خۆی پارێزگاریی لێ کردووە و، ئێستاش لە لایەن قوتابیانی مامۆستا نوورسییەوە لە کوردستانی باکوور پارێزراوە. (وەرگێڕ)

بەندکراو مافی تەواویان بە نوێژەکانیان بدایە و ڕوکنەکانی نوێژیان بە تەواوی جێبەجێ بکردایە. بەڵام هەر هێندەی چل پەنجا کەس لە قوتابیانی نوور کە هەر هەموویان نوێژەکانیان بە تەواوی ئەدا دەکەن ڕۆشتنە ناو بەندیخانەکەوە، ئەوا زمانی حاڵی نوێژەکانیان دەرسێکی ڕەوان و ڕێنماییەکی عەمەلی بوو بۆ بەندکراوان. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی لابردنی ئەم بێزاری و تەنگانەیە لەسەر دڵیان، بەڵکو لەوانەیە خۆشەویستیشی بکات لایان.

جا هەروەك قوتابیانی نوور بە کردەوە و حاڵەتەکانی خۆیان خەڵکی بۆ لای ئەم ڕاستییە ڕێنمایی دەکەن، بە هەمان جۆر لە میهرەبانیی خواوەندیش ئومێدەوارین کە بەهۆی ئەو ئیمانە تەحقیقییەی لە دڵیاندایە بیانکات بە قەڵایەکی مەحکەم و فایمی ئەوتۆ کە ئەهلی ئیمان لە تیری شوبهە و گومانەکانی گومڕایان بپارێزن.

هیچ زیانێك لەوەدا نییە کە ئەهلی دنیا ڕێی تێکەڵاوی و گفتوگۆمان لەگەڵ خەڵکیدا پێ نادەن، چونکە زمانی حاڵ گەلێ ڕەوانتر و کاریگەرترە لە زمانی گوفتار.

جا مادەم ڕۆشتن بۆ ناو بەندیخانە لە پێناوی پەروەردەکردندایە، ئەوا گەر ئەوان بە ڕاستی نەتەوەیان خۆش دەوێت با ڕێ بە خەڵکانی بەندکراوی ناو بەندیخانەکە بدەن کە تێکەڵی و گفتوگۆ لەگەڵ قوتابیانی نووردا بکەن، تاکو لە ماوەی یەك مانگ بەڵکو یەك ڕۆژدا ئەو پەروەردە پێویستەیان دەست بکەوێت کە چاوەڕوان دەکرا بە ساڵێك زیاتر بەدەستی بهێنن. هەروەها تاکو ئەو بەندکراوانە ببن بە چەند کەسێکی سوودبەخش بۆ وڵات و هاووڵاتییان و، دوارۆژ و ئەودنیای خۆیشیان ڕزگار بکەن.

گەر پەیامی (ڕابەری لاوان)مان لە لا بوایە گەلێ سوودی دەگەیاند. لە خوا داواکارین هێنانی ئەو پەیامە بۆ ئێرە ئاسان بکات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و صیددیقەکانم!

ئەمڕۆ ئەو گفتوگۆیەم بیرکەوتەوە کە لە بارەیەوە ئاگادارن و سەبارەت بە شێخی ضیائەددین لە نێوان من و کاکە مەلا عەبدوڵلامدا ڕووی دا. پاشان بیرم لە ئێوە کردەوە و لە دڵی خۆمدا وتم:

لەم زەمانەدا کە بە دەگمەن یەکێك ببێت خۆی ڕابگرێت، کەسانی ئاوا هەبن تا ئەم پلە و ڕادەیە خۆیان ڕابگرن.. ئەو خاوەن تەقوا و دڵسۆز و موسڵمانە لێبڕاوانەی کە لە

گێژاوی ئەم بارودۆخە سووتێنەر و پڕئێش و ئازارانەدا لەرزەیان پێ نەکەوێت.. کەسانی ئاوا، گەر پەردەی غەیب لـە سـەریان هـەڵبماڵرێت و هەریەکـەیان لـە پلـەی ئـەولیا پیاوچاکەکاندا، تەنانەت لە پلەی "قوتبییەت"یشدا دەربکەون، لە بـەرچاوم نـاگۆڕرێن و مەگەر کەمێك دەنا ئەو بایەخەی ئێستا پێیان دەدەم و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵیاندا هەمە نایگۆڕم. بە هەمان جۆریش گەر لە شێوەی کەسـانی عـەوامی ئاسـاییدا دەربکـەون، هـەر ئەو نرخ و پلە بەرزەی ئێستا پێمداون، کەمی ناکەمەوە.

وام بڕیـار داوە. چونکـە خزمـەتگوزاریی ئیمـان لـەم چەشـنە بارودۆخـە سـەخت و هەلومەرجە قورسانەدا، لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە.

پلەوپایە کەسییەکان و ئەو تایبەتکارییانەی گومان باشی بە مرۆڤ دەبەخشـن، لـەم چەشنە بارودۆخە شلەژاوەدا جێیان پـێ لـەق دەبێـت و لەتوپـەت دەبـن و پاشـان گومـان باشییەکە و ئنجا خۆشەویستییەکەش لە شوێنی خۆیـاندا کـەم دەبنـەوە. زیـاد لەمانـەش، ئەو خاوەن پلە و فەزڵ و چاکەیە خۆی بـە ناچـار دەزانێ تەکـەللوف لـە خـۆی بکـات و ویقاری خۆکرد بە زۆر لە بەرچاوی ئەواندا بنوێنێت.

کەواتە شوکرانەبژێریی بێ کۆتایی و نەبڕاوەمان بۆ خوای گەورە، کە ئێمە پێویستمان بەو چەشنە تەکەللوفە خۆکرد و دەست هەڵبەست و سارد و سڕانە نییە!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

پڕ بە گیان و دڵ و ژیریـم پیرۆزبـایی دە شـەوە پیرۆزەکانتـان لـێ دەکـەم و، لـە خـوای گەورە دەپاڕێمەوە و لـە میهرەبانییـە فراوانەکەشـی ئومێـدەوارم کـە گەلـێ دەسـتکەوتی گەورە و مەزنمان بەپێی "هاوبەشایەتیی مەعنەوی"ی نێوانمان دەست بخات.

ئەمشەو لە خەودا وامدەزانی کە هاتووم بۆ لاتان و، هەر هێندەی ویسـتم بـە ئیمامـەت نوێژتان بۆ بکەم، یەکسەر بێدار بوومەوە و بە خەبـەر هـاتم. جـا لـەو کاتـەدا کـە مـن - بـە گوێرەی تاقیکردنەوەکانی خۆم - چاوەڕوانی هاتنەدیی خەونەکەی خۆمم دەکرد، کتوپڕ دوو بـرای بـەڕێزمان لـە گونـدی "حۆمـا"[1] و "سـاو"ەوە هـاتن و بـە نـاوی هەمووتانـەوە

(١) گوندێکی نزیکی بارلایە. (وەرگێڕ)

تەعبیری خەونەکەیان بەم هاتنەیان لێك دایەوە. ئیتر گەلێ دڵخۆش بووم، وەك بڵێی چاوم بە هەمووتان کەوتبێت.

برایانم!

هەرچەند ئەم بارودۆخەی بەندیخانە جۆرە مەترسی‌یەکی لە لایەن لایەنگرانی حکوومەت و هەندێ کارمەندەوە بەرامبەر پەیامەکانی نوور پەیدا کردووە، بەڵام بایەخ و شەوقێکی بەرامبەر بەم پەیامانە لە لای هەموو نەیارەکان و ئایینداران و کارمەندە پەیوەندیدارەکان وروووژاندووە.

برایانم! خەم مەخۆن ئەو ڕووناکی‌یانە لەمەولا پتر دەدرەوشێنەوە[1].

برا ئازیزەکانم!

من پێم وایە کە ئەو نامیلکە بچووکەی بەندیخانەی دەنیزلی بەرهەمی هێنا دواهەمین بەرگریی ڕاستەقینەمان دەبێت. چونکە ئەو نەخشە و پلانەی کە پێشتر بۆ لەناوبردنمان ئامادە کراوە و لە چەند وەهم و گومانێکەوە پەیدا بووە کە ماوەی ساڵێکە لە دژی ئێمە وروووژاندوویانە، لە ڕووبەرێکی فراواندا نەخشەی بۆ کێشراوە و بریتی‌یە لەم تۆمەتانەی خوارەوە:

کارکردن لە پێناوی تەریقەتێکی سۆفیدا.. ئەوانە ڕێکخراوێکی نهێنین.. ئامرازی دەستی چەند تەوژمێکی دەرەکین.. وروووژاندن و بەکارهێنانی هەست و نەستی ئایینی لە پێناوی سیاسەتدا.. هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی کۆماری و دەست وەردان لە کاروباری دەوڵەت و تێکدانی ئاسایشی وڵات و.. بیانووەکانی تری هاوچەشنیان کە هیچ بناغەیەکی ڕاستی‌یان نی‌یە، بۆیە هێرشیان کردینە سەر.

کەواتە شوکر و سوپاس و پێزانینی نەبڕاوە و بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە، چونکە هەموو فڕوفێڵ و پیلانەکانیان پووچەڵ بوونەوە و لەم مەیدانە فراوانە و لە نێوان سەدان قوتابیی نوور و سەدان پەیام و کتێبدا و بە درێژایی ماوەی هەژدە ساڵ هیچ شتێکیان نەدۆزی‌یەوە جگە لە چەند باس و بابەتێك لە بارەی: ڕاستیی ئیمان و قورئان و هاتنەدیی

(١) ئەی برای بەڕێز! بێداربە و سەرنج بدە! لە کاتێکدا کە هەموو هۆکارەکانی جیهان بە ڕواڵەت لە بەندیخانەی دەنیزلیدا لە دژی مامۆستا دەخرانە کار و بەرەو دادگاکان دەبرا و فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ ئامادە دەکرا، مامۆستا دەیوت: (برایانم! خەم مەخۆن ئەو ڕووناکی‌یانە لەمەولا پتر دەدرەوشێنەوە). بڕوانە چۆن ئەم گوفتارە هاتەدی! (قوتابیانی نوور).

قیامەت و هەوڵدان بۆ دەستخستنی بەختەوەریی هەمیشەیی. لەبەر ئەوە، ئێستا بە دوای چەند بروبیانوویەکی یەکجار بێنرخدا دەگەڕێن کە پلانەکانی خۆیانی پێ بشارنەوە.

بەڵام گریمانی ئەوە هەیە ڕێکخراوێکی ئیلحادیی ترسناك و پەنهان کە ئێستا ڕاستەوخۆ لە پێناوی کوفری موتلەقدا کار دەکات هەندێ لە خاوەن پایەکانی حکوومەت بخلافێنێت و لە خشتەیان ببات و لە دژمان بیان ورووژێنێت و لەوێوە هێرشمان بکرێتە سەر. جا لە بەرامبەر ئەم گریمانەوە پەیامی "بەری درەختی ئیمان" کە وەکو خۆر ڕووناکە و شوبهە و گومانەکان لەناو دەبات و بە وێنەی چیا گەردن کەشەکان چەسپاوە، بەهێزترین بەر گریمان دەبێت لە بەرامبەریانەوە و، پشت بەخوا بێدەنگیان دەکات.

پێم وایە ئەم پەیامەمان لەم پێناوەدا بۆ نووسراوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانم!

هەرچەند شوێنەکەتان تەنگ و تەسکە، بەڵام دڵەکانتان زۆر لەو تەنگییە فراوانترە، جگە لەوەی کە ئێوە سەربەستیتان لە ئێمە زیاترە.

برایانم! بزانن کە گرنگترین بناغەی هێزی ئێمە و خاڵی پاڵپێوەدان و پشت پێ بەستنمان بریتییە لە "پشتگیریی یەکتر". هەرگیز بۆ ئەو کەموکووڕییانەی یەکتر مەڕوانن کە ئەنجامی تووڕەیی و گرژی دەمارەکانە لەم چەشنە موسیبەتانادا. چونکە سکاڵاکردن وەك ڕەخنە و ئیعتیراز وایە لە قەدەری خوای گەورە. کەواتە کەستان نەڵێن: گەر ئەو شتە وا نەبوایە فلان شت ڕووی نەدەدا. هەروەها کەستان لەوانی تر تووڕە نەبێت. چونکە بۆم دەرکەوتووە هیچ چارەیەکمان بۆ ڕزگاربوون لە هێرشی ئەوانە بەدەستەوە نییە و هەر کارێکمان بکردایە ئەوان هەر هێرشیان دەکردە سەرمان. ئێمە تەنها ئەوەندەمان لەسەرە کە بە سەبر و شوکرانە و ڕازی بوون بە قەزای خوا و تەسلیم بوون بۆ قەدەری ئەو، ڕووبەڕووی هێرشەکەی ئەوان ببینەوە، تاکو چاودێریی خواوەند بە هانامانەوە بێت.

کەواتە دەبێت ئێمە لە ماوەیەکی کەمدا و بە کارێکی کەم بۆ بەدەستهێنانی پاداشتی گەورە و چاکەی زۆر هەوڵ بدەین.

دوعا و پاڕانەوەی بێگەرد بۆ سەلامەتیی برایانی ئەوێمان دەكەین.

برا بەوەفا و ڕاستەكانم!

بەیەك گەیشتنی برادەران و دانیشتن لەگەڵ برایاندا سەرچاوەیەكی فراوان و بەپیتی دڵنەواییە بۆ مرۆڤ بەرامبەر بەو دەردیسەرییانەی دووچاریان دەبێت لە ئەنجامی: خێرایی ئاڵوگۆڕ و، لەناوچوون و خراپیی دنیا و، بەسەرچوونی خۆشی و تام و لەزەتەكانی و بێ سوودەكانی و، زللەكانی جودایی و لێكدابڕان كە لە مرۆڤیان دەسرەوێنێت.

بەڵێ، لەوانەیە یەكێك ماوەی بیست ڕۆژ ڕێ ببڕێت و، سەد لیرە خەرج بكات لە پێناوی دیدارێكی چەند سەعاتەی برایەكی.

جا ئەو گیروگرفتانەی دووچاریان بووین و زایەبوونی سامانەكانمان لەم سەردەمەدا كە برادەری ڕاستەقینەی بە دەگمەن تێدا دەست دەكەوێت، بایەخێكی ئەوتۆیان نییە لەچاو ئەوەی كە بە یەك جار چل یان پەنجا برادەری ڕاست و برای دڵسۆز و موخلیس بۆ ماوەی دوو مانگ یەكتر ببینن و لە پێناوی خوای گەورەدا پێكەوە دابنیشن و گفتوگۆ بكەن و دڵی یەكتری بدەنەوە.

من خۆم بەم هەموو گیروگرفتانە ڕازی دەبووم، بە ئومێدی ئەوەی تەنها یەك كەس لەو برایانەم ببینم كە دە ساڵ دەبوو نەم بینیبوون.

بزانن كە: "سكاڵاكردن" ڕەخنەگرتنە لە قەدەر و "شوكرانە"ش ڕازیبوونە پێی!

دڵنیابن – برایانم! – ئەگەر هەر ئێستا ئەجەل بێت و بمرم، بەوپەڕی دڵخۆشی و سنگی فراوانەوە پێشوازیی لێ دەكەم، چونكە قەناعەتێكی تەواوم هەیە كە ئێوە چەندین "سەعید"ی لاوی بەهێز و دامەزراوی ئەوتۆتان تێدایە كە گەلێ لەم سەعیدە هەژارە پیر و دەستەوسان و نەخۆشە باشتر ئەركی "پەیامەكانی نوور" دەگرنە ئەستۆ و پارێزگاری و بەرگرییان لێ دەكەن و، دەبن بە میراتگریان.

* * *

برا بەوەفا و ڕاست و ئازیزەكانم!

مادەم بە نیازی دەستكەوتنی پاداشتی دوارۆژ و ئەنجامدانی جۆرە پەرستنێكی تایبەتی، پەیوەندیتان بە پەیامەكانی نوورەوە كردووە –كە پەیامی دوارۆژ و ئیمانن– ئەوا بێ هیچ گومانێك هەموو یەكێك لە سەعاتەكانی تەمەنتان لەم بار و دۆخ و هەل و مەرجە

سەخت و قورسانەی ئێستادا لە حوکمی بیست سەعات خواپەرستیدایە و، بیست سەعاتی کارگوزاریی خزمەتی ئیمان و قورئانیش، لەبەر ئەوەی بە جیهادێکی مەعنەوی دادەنرێت، بایەخ و گرنگیی سەد سەعاتی هەیە و، سەد سەعاتیش کە لە چاوپێکەوتن و بەیەك گەیشتنی چەندین موجاهیدی ڕاستەقینە و چەند برایەکی باشدا بەسەر ببرێت، کە هەریەکەیان بەرامبەر سەد کەسن و.. بەستنی پەیوەندیی برایانە لەگەڵیاندا و.. یارمەتیدانیان بە: هێزی مەعنەوی و.. یارمەتی لێ وەرگرتنیان و.. دڵدانەوەی ئەوان و دڵی خۆدانەوەش پێیان و.. بەردەوامیی دامەزراویی تەواووەتی و پەیوەندیی ڕاستەقینە لەگەڵیاندا بۆ مەبەستی خزمەتگوزاریی ئیمان و.. سوود وەرگرتن و بەهرەوەر بوون لە ڕەفتار و ڕەوشتە بەرزەکانیان و.. بەدەستهێنانی شایستەیی قوتابیبوون لە قوتابخانەی زەهراءدا، کە ئەویش بەوە دەبێ مرۆڤ بێتە ناو ئەم کۆڕی ئیمتیحانە لەم قوتابخانە یووسفییەدا و.. وەرگرتنی ئەو ڕۆزییەش کە قەدەر بۆ هەر یەکەیانی نووسیوە، بە نیازی پاداشت وەرگرتن..

هەموو ئەمانەی باس کران، داخوازی ئەوەن پڕ بە دڵ شوکرانەبژێری خوای گەورە بن کە ئێوەی گەیاندووەتە ئێرە و، پێویستە هاودەم لەگەڵ بیرکردنەوە لەو سوودانەی باس کران، لە بەرامبەر هەموو گیروگرفت و تەنگانەکانەوە بەئارام و خۆڕاگر بن.

* * *

برایانم!

من لە ناخی دڵمەوە ئارەزوومەندی ئەوەم کە لێرە واتە لە "قەستەمۆنی" و دەوروبەری، بە وێنەی ئیسپارتە و دەوروبەری، چەند پاڵەوانێکی ئازا و دامەزراوی وەك ئاسن و پۆڵا ئاسای چەشنی "حافظ عەلی" و "خەسرەو" پەیدا ببن. دەسا شوکر و سوپاس و پێزانینی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە لەسەر ئەوەی پارێزگای "قەستەمۆنی" ئەم ئاواتەمی بە تەواوەتی هێنایەدی و چەندین پاڵەوانی بە هاناوە ناردین.

سڵاوم بە یەك بە یەکی ئەو برایانم بگەیەنن کە هەمیشە لە ئەندێشەمدان و ناوەکانیانم نەنووسیوە و هەردەم دوعای سەلامەتی و بێ وەییان بۆ دەکەم.

* * *

برا ئازیز و ڕاست و بەوەفا و دامەزراوەکانم!

وا حاڵەتێکی خۆمتان بۆ ڕوون دەکەمەوە نەك بۆ ئەوەی خەمم بۆ بخۆن یان هەوڵی ئەنجامدانی حەزەر و پێداویستیی ماددی بدەن، بەڵکو بۆ ئەوەی سوود لە زیادبوونی دوعاکانتان وەربگرم بەپێی دەستووری: "یەکخستنی هەوڵ و کۆششە مەعنەوییەکان".. هەروەها بۆ پەرەپێدانی خۆڕاگری و حەزەر کردن و سەبر و ئارامگرتن و پاراستنی پەیوەندییە توند و تۆڵەکەی نێوانتان.

ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی لێرەدا بە ماوەی یەك ڕۆژ گیرۆدەی دەبم بە یەك مانگی ڕەبەق لە بەندیخانەی ئەسکی شەهردا دووچاری نەدەبووم. چونکە ماسۆنییە سامناکەکان کەسێکی ماسۆنیی ستەمکاریان بە سەرمدا زاڵ کردووە تاکو تووڕەیی و توندوتیژیی لەڕادەبەدەرم لە بەرامبەر ئەشکەنجە و ئازارەکانیانەوە هانم بدات بڵێم: (ئیتر ئەم سزایە تا ئەم ڕادەیە بەسە) و، ئیتر ئەم قسەیەم بکەن بە هۆکارێك و بیقۆزنەوە بۆ دەستدرێژیی ستەمکارانە و، درۆ و دەلەسەکانیان لە ژێردا بشارنەوە.

من بە شوکرانەبژێرییەوە ئارام دەگرم و ئەم ئارامگرتنەشم بە ئاسەوارێکی دەراسای چاکەکاریی خوای گەورە دادەنێم و، بڕیارم داوە کە لەسەر ئەم شوکرانە و ئارامگرتنە هەر بەردەوام بم.

مادەم ملمان بۆ قەدەری خوای گەورە کەچ کردووە و، ئەم تەنگانانەش کە هەستیان پێ دەکەین هۆن بۆ دەستکەوتنی پاداشتی زۆر و گەورەتر، بەپێی ناوەرۆکی دەستووری: "خیر الامور أحمزها" واتە: " باشترین کار بەهێزترینیانە ". لەبەر ئەوە و لەم ڕووەوە، ئەو تەنگانانە بە نیعمەتێکی مەعنەویی دادەنێین.

پاشان زۆربەی جار بەڵا و موسیبەتەکانی دنیای فانی، بە خێر و خۆشی کۆتاییان پێ دێت. ئێمەش بەوپەڕی دڵنیاییەوە قەناعەتمان هەیە کە ژیانی خۆمان بۆ ڕاستییەکی مەزنی لە ڕۆژ ڕووناکتر و لە بەهەشت جوانتر و بەتامیش چەشنی "بەختەوەریی هەمیشەیی" بەخت کردووە..

لەبەر ئەوە، نابێ ـ هەرگیزاو هەرگیز ـ سکاڵامان لە زار دەربچێت، بەڵکو ئەم حاڵەتە سەختانە هانمان دەدەن کە بڵێین:

(ئێمە لە جیهادێکی مەعنەویداین کە مایەی شانازیمانە و.. شوکرانەبژێری پەروەردگاری بەڕێزمانین کە بە فەزڵی خۆی ئەو نیعمەتەی پێ بەخشیوین).

* * *

برا ئازیزەکانم!

یەکەمین و دواهەمین ئامۆژگاریم: پاراستنی پەیوەندیی نێوانتانە و خۆپاراستنە لە خۆپەرستی و غروور و زەحمەتدانی یەکتری، هاودەم لەگەڵ حەزەرکردن و خۆڕاگریدا.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

لەو ئیددیعایەی کە داواکاری گشتی پێشکەشی کرد، مرۆڤ تێدەگات کە سەرجەمی ئەو پلان و فرو‌فێڵانە پووچەڵ بوونەتەوە کە زەندیق و مولحیدانی پشتی پەردە سازیان کردبوو تاکو هەندێك لە خاوەن پلە و پایەکانی حکوومەت بە هەڵەدا ببەن و لەخشتەیان ببەن. بەڵام ئێستا دەست لە چەند بڕوبیانوویەکی لاواز گیر دەکەن، وەك تۆمەتی دامەزراندنی کۆمەڵە و پێکهێنانی ڕێکخراوێکی نهێنیی. دەیانەوێت بەمەش درۆ و دەلەسەکانیان بپۆشن. ئاسەواری ئەم کارەشیان لەوەدا دەرکەوت کە نەیانهێشت هیچ کەسێك سەردان و چاوپێکەوتنم لەگەڵدا بکات، وەك بڵێی هەر کەسێك ئەگەر چاوی پێمان بکەوێت یەکسەر دێتە ڕیزمانەوە! تەنانەت کارمەندە گەورەکانیش مەترسییان لەمە هەیە و بە تەنگ پێ هەڵچنینی زیاتر لەسەرم خۆیان لای فەرماندەکانیان خۆشەویست دەکەن و لەم ڕێیەوە خۆیان دەبەنە پێشەوە.

نیازم وابوو ئەم بڕگەیەی خوارەوە بخەمە سەر کۆتایی ئەو ئیعتیرازەی پێشکەشی ئەوانمان کرد، بەڵام ڕووداوێك هاتە پێش و ڕێی ئەمەی لێ گرتین. بڕگەکەش بریتییە لەمەی خوارەوە:

بەڵێ، ئێمە کۆمەڵەیەکین کە لە هەموو جەرخێکدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن ئەندامی هەیە و، هەر هەمووشیان هەموو ڕۆژێك پێنج جار بە ئەنجامدانی نوێژەکانیان ئەوپەڕی ڕێز و پەیوەندیی ڕاست و دروستی خۆیان بە بنەماکانی ئەو کۆمەڵە خاوێنەوە دووپات دەکەنەوە و، چ لە ڕێی دوعای پاشملەیانەوە بۆ یەکتری و چ بە دەستکەوتە مەعنەوییە زۆر و زەبەندەکانیانەوە، بەپێی دەستووری خوایی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: ١٠) پێشبڕکێی درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆ یەکتری دەکەن.

که‌واته ئێمه – به‌م جۆره – ئه‌ندامی ئه‌و کۆمه‌ڵه خاوێن و مه‌زنه‌ین. کارمه‌ندیی ئه‌ستۆشمان له چوارچێوه‌ی ئه‌م کۆمه‌ڵه‌یه‌دا بریتی‌یه له ڕاگه‌یاندنی ڕاستی‌یه‌کانی ئیمان و قورئانی پیرۆز به جوانترین و خاوێنترین شێوه، به عه‌ودالآنی حه‌ق و ئیمان، تاکو خۆمان و ئه‌وانیش له ئیعدامی هه‌میشه‌یی و به‌رزه‌خی به‌ندیخانه‌ی تاکه‌که‌سی و هه‌تاهه‌تایی ڕزگار بکه‌ین.

به‌ڵام کۆمه‌ڵه دنیایی‌یه‌کان، که له‌سه‌ر بناغه‌ی فرتوفێڵه سیاسی‌یه‌کان دامه‌زراون، نه له نزیك نه له دووره‌وه ئێمه هیچ په‌یوه‌ندی‌یه‌کمان پێیانه‌وه نی‌یه، ته‌نانه‌ت هه‌ر دانابه‌زینه ئاستیشیان.

* * *

برا ئازیز و به‌وه‌فاکانم!

یه‌که‌م: سه‌ر له به‌یانیی ئه‌مڕۆ هه‌ستم به ئازارێکی ته‌واوه‌تی کرد سه‌باره‌ت به هه‌موو یه‌کێکی ئێوه. به‌ڵام یه‌کسه‌ر "په‌یامی بیماران"م به دڵدا هات و، ئه‌ویش دڵدانه‌وه و دڵنه‌وایی پێ به‌خشیم.

به‌ڵێ، ئه‌م موسیبه‌ت و گیروگرفته وه‌کو جۆره نه‌خۆشی‌یه‌کی کۆمه‌ڵایه‌تی وایه و، زۆربه‌ی ئه‌و ده‌رمانه ئیمانی‌یانه‌ش که له‌و په‌یامه‌دا باس کراون کاریگه‌ری‌یان بۆ چاره‌سه‌ر کردنی ئه‌م نه‌خۆشی‌یه‌ش هه‌یه، به تایبه‌ت ئه‌و ئازارانه‌ی که ئه‌نجامی گیروگرفت و موسیبه‌ته‌که‌ن. چونکه وه‌ك بۆ نه‌خۆشه پیرۆزه "ئه‌رزرۆمی"یه‌که‌م باس کرد:

ئازاره‌کانی پێش ئه‌م سه‌عاته ڕۆشتن و به‌سه‌رچوون، به‌ڵام پاداشت و خێر و سووده ئیمانی و قورئانی‌یه‌کانی سه‌ر به‌م‌دنیا و ئه‌ودنیاشیان له شوێنی خۆیاندا ماونه‌ته‌وه. به‌و واتایه‌ی که ئه‌و تاکه موسیبه‌ته ڕێبوار و ته‌نیایه بووه به چه‌ندین نیعمه‌تی زۆر و به‌رده‌وام.

زه‌مانی داهاتووش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئێستا خاوه‌نی وجوود نی‌یه و نه‌هاتووه، ئه‌وا ئێستا هه‌ست به هیچ ئازارێك ناکرێت سه‌باره‌ت به‌و موسیبه‌تانه‌ی له‌و داهاتووه‌دا دێن و به‌رده‌وام ده‌بن. له‌به‌ر ئه‌وه، ئازارچه‌شتنی وه‌همی له شتی "نه‌بوو" له ڕاستیدا نه‌بوونی باوه‌ڕ و متمانه‌یه به میهره‌بانی و قه‌ده‌ری خوای گه‌وره.

دووهه‌م: زۆرینه‌ی مرۆڤی سه‌ر ڕووی ئه‌م زه‌وی‌یه له دڵ و گیان و بیریاندا گیرۆده‌ی چه‌ندین موسیبه‌تی ماددی و مه‌عنه‌وی ده‌بن. ئه‌م گیروگرفت و موسیبه‌ته‌ی ئێمه‌ش له چاو

هی ئەواندا گەلـێ سووك و ئاسانە، جگـە لـەوەی كـە چـەندین دەستكەوت و سـوودی ماددی و مەعنەویشیان تێدایە بۆ دڵ و گیان و ئیمان و تەندروستی و سەلامەتیمان.

سـێ‌هەم: ئەگـەر لـە نـاوەندی ئـەم تـۆف و زریانـە سـەختانەدا نەهاتینایەتـە ئـەم بەندیخانەیەوە، ئەوا قورسایی ئەم موسیبەتە سووكەڵەیە گەلـێ سەخت و قورستر دەبوو لەسەرمان كاتێ ڕووبەڕووی ئەو كارمەندانە دەبووینەوە كە شـك و گومانیـان لـە دڵدایـە بەرامبەرمان و، ئەو كاتە دووچاری بەڵای مەرایی بۆكردنیان دەبووین.

*چوارەم*: چاوپێكەوتنی ئەو خۆشەویستە ڕاستەقینە و میهرەبانانەی كـە زۆر زیـاتر لـە سۆزی برا بۆ برای خۆی میهرەبانترن، لەم زستانە مـاددی و مەعنەوی‌یـە دووچەندانەیـەدا كە كاروباری تێدا ڕاوەستاوە و لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا كـە یەكێكـە لـە قوتابخانـەكانی زەهراء..

بەیەك شادبوون لەگەڵ برایانی ئاخیرەتدا كە وەكو چەند ڕابەرێكی ئامۆژگـار وان و، هـەروەها سـەرلێدانیان و بەهرەمـەندبوون لـە تایبـەتكاریی یـەك بـە یـەكیان و سـوود وەرگرتنیش لە كـردەوە چاكـەكانیان كـە بـە وێنـەی تەشـەنەكردنی نـوور و ڕوونـاكی لـە مـادده ڕوونەكانـدا، پەرە دەسـێنێت و بڵاو دەبێتـەوە، ئەمـانەش بـەوپەڕی ئـاسـانی و هەرزانی و بە چەند ئەركێكی تابلێی كەم..

سەرەڕای سوود و یارمەتی وەرگرتن لە هاوكاری‌یە مەعنەوی‌یەكانیان و شـادمانی و دڵدانەوەكانیان..

هەموو ئەمانە، كارێك دەكەن كە ئەم گرفت و تەنگانەیـە شێوەی خۆی بگۆڕێـت بـە جۆرە دیمەنێكی چاودێریی مەعنەویی پەروەردگار!

بەڵێ، سەرنجێكی ناسكی ئەم چاودێری‌یە پەنهانە لەوەدایە كە نازنـاوی "عولـەماء" بۆ هـەموو یـەكێكی قوتابیـانی نـوور بـەكار دەهێنـن لەوانـەی كـە هاتوونەتـە ئێرە! دەبینیـت هەموویان بەوپەڕی ڕێزەوە بە وشەی: "عولەماء.. عولەماء" ناویان دەبن.

جا ئاماژەیەكی ناسك لە ناوەندی ئەم سەرنجەدا هەیە كە بریتی‌یە لەوەی بەندیخانە بـوو بـە قوتابخانەیـەكی زانسـتی و، قوتابیـانی نووریـش مامۆسـتا و فێركـارانی نـاو ئـەو قوتابخانەیەن. پشت بەخوا سەرجەمی بەندیخانەكانی تریش بە فـەزڵی ئـەو عولەمایانـە وەك قوتابخانەیان لـێ دێت.

* * *

برایانم!

ئەگەر جار بەجار ئەم نامە بچووکە دڵدەرەوانە بخوێنرێنەوە، هاودەم لەگەڵ خوێندنەوەی پەیامی "بەری درەختی ئیمان"دا، بە تایبەت دوا مەسەلەکانی ئەو پەیامە.. هەروەها ئەگەر برایان لە نێوان خۆیاندا بە شێوەیەکی فیکری ئەو مەسەلانەی پەیامەکانی نوور تاوتوێ بکەن کە بە خەیاڵدا دێت، ئەوا پشت بەخوا مرۆڤ شەرەفمەندیی "قوتابیی زانستە شەرعییەکان"ی دەست دەکەوێت. چەندین زانای گەورە و بەرز بایەخێکی زۆریان بە قوتابیانی زانستە شەرعییەکان داوە، تەنانەت ئیمامی شافیعی – خوای لێ ڕازی بێت – فەرموویەتی: (نوستنی قوتابیانی زانستە شەرعییەکان بە عیبادەت دادەنرێت).

لەبەر ئەوە، گەر لە ئەنجامی ئەم شەرەفە بەرزەی قوتابێتییەوە و لەم چەشنە شوێنە سەخت و ئازاربەخشە و بە تایبەت لەم زەمانەدا کە قوتابخانە شەرعییەکانی تێدا نەماوە، ئەگەر سەد هەزار تەنگانە پەیدا ببن، دەبێ بایەخیان پێ نەدرێت، بەڵکو دەبێ زەردەخەنەی خۆشحاڵی لە ڕووی ئەو گیروگرفتانەدا بنوێنین و، بڵێین: "خير الأمور أحمزها".

سەبارەت بە ئەرکی ژیان و گوزەرانی خێزان و منداڵی برا هەژارەکانیش، ئەوا لەسەر بناغەی قاعیدەیەکی ئیمانی و نوورانیی قورئانی پیرۆز دەبێ لە "موسیبەت"دا سەیری ئەو کەسە بکرێت کە موسیبەتی زیاترە و لە "نیعمەت"یشدا دەبێ سەیری ئەو کەسە بکرێت کە نیعمەتی لە هەموان کەمترە. جا بەم پێیە، لە چاو هەشتا لە سەدی خەڵکیدا لە حەوانەوەیەکی تەواوەتیدان. کەواتە مافی سکاڵایان نییە، بەڵکو دەبێ بە هەشتا پلەی یەك لەسەر یەك شوکرانەبژێری بنوێنن.

پاشان قەدەری خوای گەورە ئەو ڕۆزییەی دەستنیشان کردووە کە لێرە بەدەستی دەهێنین و، دادگەریی میهرەبانییەکەشی ئێمەی لێرەدا کۆکردووەتەوە و، خێزان و منداڵەکانیشی بە ڕۆزیدەری ڕاستەقینەیان سپاردووە و، ئەو برایانەشی بە شێوەیەکی کاتی لە ئەرکی سەرپەرشتی کردنی ڕۆزیی ئەوان حەواندووەتەوە، هەروەك ڕۆژێك دێت کە بە تەواوەتی لەو سەرپەرشتی کردنە دایان دەبڕێت. جا مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا دەبێ ئێمە بڵێین: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ و، هەموو کاروبارێکیشمان بە خوای گەورە بسپێرین و سوپاسی زۆری پێشکەش بکەین.

* * *

برایانی ڕاستگۆ و ئازیزم!

من زۆر بەختەوەرم و، شوکر و سوپاسی خوا دەکەم کە لە نزیکی ئێوە و لەناو یەك بینای بەندیخانەدام، هەرچەندەش ڕووبەڕوو ناتانبینم.

هەندێ جار بە بێ هیچ ویست و ئیختیارێکی خۆم ئەوەم بە بیردا دێت کە چەند حەزەر و خۆپاراستنێکی پێویست ڕەچاو بکەین.

بۆ نموونە: ماسۆنی‌یەکان بەندکراوێکی جاسووس و درۆزنیان ناردووە بۆ ناو زیندانەکەی تەنیشتمان!

جا لەبەر ئەوەی ڕووخاندن و کاولکاری گەلێ ئاسانە، بە تایبەت لەو جۆرە لاوە هەڵەشە و سەرەڕۆیانەدا، ئەوا لە ڕێی ئەو ئازارە سەختەوە کە ئەو ناوبراوە دەیهێنێتە ڕێم و خراپکاریی لە نێوان لاوەکاندا بڵاو دەکاتەوە، تێ‌گەیشتم کە زەندیقەکان لە بەرامبەر ئەو ڕێنمایی و چاکسازی‌یەی ئێوە ئەنجامی دەدەن، هەوڵی بڵاوکردنەوەی فەساد و ڕووخاندنی ڕەوشت و ڕەفتارە جوانەکان دەدەن.

دەسا برایانم! لە بەرامبەر ئەم بارودۆخەوە حەزەر و خۆپاراستنی لەڕادەبەدەر تابڵێی پێویستە و، دەبێ تا لە توانادایە هەستی بێزاری بەرامبەر بەندکراوانی پێشوو دەرنەبڕن و، بوار بەوە نەدەن کە لە ئێوە بێزار ببن. هەروەها نەیەڵن دووبەرەکی و جیاوازیتان بخرێتە نێوانەوە، هاودەم لەگەڵ ئارامگرتن و زاڵبوون بەسەر خۆدا.

هەروەها پێویستە برایانمان بە دەرخستنی قوربانی و فیداکاری و وازهێنان لە خۆپەرستی و نواندنی خۆنەویستی، تا دەتوانن پارێزگاریی هێزی برایەتی و پشتگیریی یەکتر بکەن.

سەرقاڵ بوون بە کاروباری دنیا ئازارم دەدات. لەبەر ئەوە، پشت بە وریایی و زیرەکیتان دەبەستم، چونکە من ئەگەر ناچار نەبم ناتوانم ڕوو لەو کاروبارانە بکەم.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانم!

ڕوونکردنەی مەسەلەیەك، کە ئەم بەیانی‌یە بە دڵمدا هاتووە، بۆ ڕوودانی هەموو گریمانێك زۆر زۆر پێویستە..

وا ماوەی بیست ساڵە نەفس و شەیتانەکەم گەلێ جار ئەو ڕاستی‌یانە دەپشکنن کە ئێمە لە قورئانی پیرۆزەوە دەرمانهێناون و، بە وێنەی خۆر و ڕۆژی ڕووناك هیچ دوودڵی و گومانێك هەڵناگرن. ئەو دوانە دەڵێن:

(ڕای فەیلەسووفە زەندیقەکان بەرامبەر بەمە چی‌یە و پاڵپشتیان دەبێت چی بێت)؟!

جا دوای ئەوەی کە نەفس و شەیتانەکەم هیچ کەلێن و ناتەواوی‌یەکیان لەو ڕاستی‌یانەدا نەدۆزی‌یەوە، بێ‌دەنگ بوون.

لەو باوەڕەشدام کە ئەو ڕاستی‌یەی نەفس و شەیتانی یەکجار هەستیاری منیان بێ‌دەنگ کرد، کە پێکەوە کار دەکەن، دەتوانێت سەرسەخت‌ترین کەسی ملنەدەریش ناچاری بێ‌دەنگبوون بکات.

مادەم ئێمە لە پێناوی حەقیقەتێکدا تێدەکۆشین کە یەکێکە لە ڕاستی‌یە گرنگەکان و لە هەموو شیان چەسپاوترە و زیاتر ڕەگی داکوتاوە و، بە هیچ نرخێکی ماددی - هەرچی‌یەك بێت - هەڵناسەنگێنرێت و، خود و گیان و هاوڕێ و خۆشەویست، تەنانەت هەموو دنیاش، لە پێناوی هاتنەدیی ئەو ڕاستی‌یەدا شایانی بەخت کردنن..

ئەوا دەبێ بەوپەڕی خۆڕاگری و ئارامەوە لە بەرامبەر هەموو بەلاّ و مەینەتی‌یەك بێتە ڕێمان، خۆمان ڕابگرین و بە سنگی فراوانەوە بەرەنگاری هەموو تەنگ پێ هەڵچنینێکی دوژمنان ببینەوە. چونکە لەوانەیە و زۆریش نزیکە هەندێ لەو شێخ و زانایانەی کە بە ڕواڵەت تەقوایان هەیە، بۆ خۆیان خەڵەتابن یاخود بە هاندانی کەسانی تر خەڵەتێنرابن و لە دژمان بخرێنە کار . جا لە هەڵوێستێکی ئاوادا، دەبێ پارێزگاریی خزمەتگوزاری و پشتگیری‌یەکانی نێوانمان بکەین و، کاتەکانمان لە وتوویژ و موناقەشەی بێ سوود و بەتاڵدا بەفیڕۆ نەدەین.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

سەر لە بەیانیی ئەمڕۆ لە ڕێی ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی‌یەوە هەستم کرد کە هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم هێرشە فراوان و دەستدرێژی‌یەی دەکرێتە سەرمان "تیشکی پێنجەم" نی‌یە، بەڵکو: "الحزب النوري" و "مفتاح الإيمان" و "الحجة البالغة"یە[1]. بۆیە بە

(١) الحجة البالغة: بەشی دووهەمی کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا"یە و یازدە بەڵگەی ئیمانیی لەخۆ گرتووە. (وەرگێڕ)

وردی بەشێکی "الحزب النوری"م خوێندەوە و سەرنجیشم لە "مفتاح الایمان" دا، یەکسەر بۆم دەرکەوت کە زەندیقەکان لە بەرامبەر وەشاندنی ئەم دوو شمشێرە ئەڵماسی‌یە تیژەوە ناتوانن پارێزگاریی ڕێبازەکەیان بکەن. بەڵام "تیشکی پێنجەم"یان وەك هۆکارێکی ڕواڵەتی کردووە بە بیانوو و بەهانە! چونکە پەیوەندی‌یەکی جوزئیی بە سیاسەتەوە هەیە و، ئیتر حکوومەتیان پێ خەڵەتاند و لە دژمان هانیان دان.

هاودەم لەگەڵ ئەم بێدارکردنەوە مەعنەوی‌یەدا ئەوەشم بە دڵدا هات کە:

(ئەگەر هەندێ لە برا لاوازەکان بە شێوەیەکی کاتی واز لە کارکردن بهێنن، لەوانەیە لەم موسیبەتە ڕزگاریان ببێت) و، ئیتر ویستم بواری ئەمەیان پێ بدەم.

بەڵام یەکسەر ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هێنرا کە:

کەسێك تا ئەم ڕادەیە پەیوەندی‌یەکەی بەردەوام بووبێت و دووجار لەم تاقیکردنەوەیەدا بەشداریی کردبێت و لەو پێناوەدا گیرۆدەیی و زیانی لەرادەبەدەری تووش بووبێت، نابێت لە دڵەوە واز بهێنێت – کە ئەم کارە شتێکی بێ سوودە و تەنانەت زیانیشی تێدایە – بەڵکو تەنها لەبەر خەڵەتاندنی ئەوان و دەرخستنی دوورەپەرێزی‌یەکی ڕواڵەتیی ڕووت – نەك بە دڵ – دەتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات. دەنا زیان لە خۆی و ئێمە و ڕێبازە خاوێنەکەمان دەدات و، لە سزای کارەکەیدا و بە پێچەوانەی ئامانجەکەی زللەیەکی تەمێ کردنی ئاراستە دەکرێت.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

کەسێك تووشی ئازار و گیروگرفتی ئەم بەندیخانەیە بووبێت کە زۆر سارد و سڕ و تەنگترە لە هەموو شوێنێکی تر، بێ گومان ئەو کەسە – دیارە هەر یەکە و بەپێی پلەی خۆی – حەز دەکات لەو شتە هەڵبێت کە بووە بەهۆی هاتنی بۆ ناو ئەم بەندیخانەیە. بەڵام خۆ هۆکاری ڕواڵەتیی ئەم بەندبوونە پەیامەکانی نوورە کە ئیمانی تەحقیقی و عاقیبەت خێری و پاداشتی زۆری کردەوە چاکەکانی سەدان کارگوزاری هاوبەشی مەعنەوی دەستی ئەو کەسانە دەخات کە گیرۆدەی ئەم سەختی و ئەرك و گیروگرفتانە بوون. بێ گومان ئەم سوودە زۆرانەش سەرجەمی ئەو سەختی و گیروگرفتە تاڵانە دەگۆڕێت بە چەندین سۆز و میهرەبانیی بەلەزەت و شیرین. لەبەر ئەوە، نرخی بەدەستهێنانی ئەم دوو ئەنجامە گرنگە بریتی‌یە لە: دامەزراویی تەواوەتی و، وەفای خاوێن و بێگەردی نەجووڵ.

کەواتە پەشیمانی و وازهێنان لە کار و خزمەت، دوو زیانی گەلێ گەورەن. ئەم بەندیخانەیە شوێنێکی باشە بۆ ئەو قوتابیانەی کە پەیوەندییان بە دنیاوە نییە یان پەیوەندییەکی لاوازیان پێوەی هەیە. بەڵکو لە ڕوویەکەوە شوێنی سەربەستی و ئازادییە بۆ ئەوان.

ئەوانەش کە دەسکەوتیان لە دنیادا هەیە و کاروباری ژیان و گوزەرانیان بە گوێرەی دڵە، ئەوا پارە خەرج کراوەکانیان لە حوکمی سەدەقەی دووچەندانەیە بۆیان و، کات و سەعاتە بەسەرچووەکانی تەمەنی ڕابوردوو شیان بە چەند پەرستشێکی دووچەندانە بۆ دەنووسرێت. کەواتە دەبێ ئەوانە، لە بریی سکاڵا، شوکرانەبژێریی خوای گەورە بکەن.

سەبارەت بە هەژاران و کەسانی لاواز و داماویشەوە، ئەوا ئەم بەندیخانەیە هیچ ئەرکێکیان ناخاتە ئەستۆ، بەڵکو خێر و پاداشتی زۆریشیان دەست دەخات و سەختی و گیروگرفتەکانی بەندیخانەشیان، بە دڵدانەوەی نێوان برایان، لەسەر شان سووك دەکات. لە کاتێکدا ئەوان لە دەرەوەی بەندیخانە پاداشتیان دەست نەدەکەوت، تەنانەت گەلێ ئەرکی قورسیشیان دەکەوتە ئەستۆ. بۆیە ئەم بەندیخانەیە بۆ ئەوان مایەی شوکرانەکردنە بۆ خوای گەورە.

* * *

برا بەوەفا و ئازیزەکانم!

یەکێك لە خاوەن تەقوایانی "قەستەمۆنی" سکاڵای حاڵی خۆی لە لا کردم و، وتی:

(لەچاو حاڵی پێشووم دابەزیومەتە خوار و پشتاوپشت گەڕاومەتە دواوە، چونکە هەموو حاڵ و چێژ و نوورەکانی پێشووم لەدەست دەرچوون).

پێم وت: نەخێر! تۆ بەرز بوویتەوە و، بەسەر ئەو چێژ و کەشفانەدا سەرکەوتوویت کە بە جۆرێکن ختووکەی دەروونی مرۆڤ دەدەن و بەروبوومەکانی ئەودنیای لەم دنیادا پێ دەچێژن و دووچاری لەخۆبایی بوون و خۆویستیی دەکەن! وا ئێستا تۆ بە بۆنەی خۆبیرچوونەوە و وازهێنانت لە خۆویستی و لەخۆباییبوون و نەگەڕانت بە دوای چێژە کاتییەکاندا، بۆ پلەیەکی بڵندتر فڕیویت و بەرز بوویتەوە.

بەڵێ، یەکێك لە چاکەکارییەکانی خوای گەورە، سەبارەت بەو کەسەی وازی لە خۆویستی نەهێناوە، ئەوەیە کە هەست بە چاکەی خوای گەورە نەکات، تاکو لەخۆ بایی و ڕازی نەبێت!

جا براکانم! بەپێی ئەم ڕاستی‌یە، هەر کەسێك وەك ئەم مرۆڤە بیر بکاتەوە، یاخود بایەخ بەو چەشنە پلەوپایانە بدات کە گومان باشی(حُسن الظــن) بە مرۆڤ دەبەخشن، کاتێ بۆ ئێوە دەڕوانێت قوتابیانێك دەبینێت کە پۆشاکی تەقوا و تەوازوعی تەواوەتی و خزمەتکردنی خەڵکی‌یان پۆشیوە و، هیچ کام لەو شتانە لە ئێوەدا نابینێت کە بیری لێ دەکردنەوە، ئەوا بە عەوام و کەسانی ئاسایی‌تان دادەنێت و، دەڵێت:

(بۆچی ئەمانەن پاڵەوانان و مەردانی حەقیقەت؟ ئەمانەن بەرەنگاری هەموو دنیا دەبنەوە؟ شتی وا لەمانەوە گەلێ دوورە! ئەمانە لە کوێ و ئەوانەش لە کوێ کە لە پێناوی ئەم خزمەتە خاوێن و پیرۆزەدا جیهاد دەکەن و ئەولیا و پیاوچاکانی وەختیان ڕەتداوە و پێشیان کەوتوونەتەوە)؟

جا ئەو کەسە کە بەم جۆرە بیر دەکاتەوە، گەر دۆست بێت، دووچاری نائومێدی دەبێت و گەر نەیاریش بێت، وا دادەنێت کە خۆی لەسەر حەق بێت!

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بەروبوومەکانی بەندبوونتان[1] لە پێش چاومدا بە وێنەی بەروبوومی بەهەشت شیرین و گرنگن. چونکە هەروەك هیوا و ئاواتە مەزنەکانی منیان سەبارەت بە ئێوە هێنایە دی و تەسدیقی بۆچوونەکانی منیان کرد، بە هەمان جۆر و بە باشترین شێوەش هێزی پشتگیری و پەیوەندیی نێوان ئێوەشی دەرخست.

هەرکات ئەو پێنووسە پیرۆزانە یەك بگرن، لەم هەل و مەرج و پاڵەپەستۆیەدا نرخ و بەهای سێ‌سەد یاخود چوارسەد قەڵەم پێش‌چاو دەخەن، بە وێنەی یەکگرتنی ئەو سێ چوار ئەلفەی کە لە "پەیامی ئیخلاس"دا باس کراوە. هەروەها ئەو حاڵەتە ڕۆحی‌یەی کە لەم جۆرە بارودۆخە ئاڵۆز و پەشێوەدا پارێزگاریی یەکێتیی ئێوە دەکات، دەعواکەی دوێنێی من دەچەسپێنێت.

بەڵێ، هەروەك وەلی‌یەکی مەزن لە خزمەتکردنی کاروباری ئیسلامدا ناگاتە ئاستی هاوەڵێکی بچووك - وەك ئەهلی سوننەت لەمەدا یەکیان گرتووە - بە هەمان جۆر برایەکی بێگەردمان کە لەم ڕۆژگارەدا وازی لە بەش و حەز و ئارەزووی خۆی

(١) مەبەست نووسینەوەی پەیامەکانە لە بەندیخانەدا. (وەرگێڕ)

هێناوە و، لە خزمەتی ئیماندا و بۆ خۆنەویستی کار دەکات و، چەندەی لە توانادایە پشتگیری و یەکێتیی برایانی دەپارێزێت، ئەم برایە پلەیەکی لە هی وەلی زیاتر بەدەست دەهێنێت.

من خۆم قەناعەتم بەمە کردووە و، ئێوەش لە لایەن خۆتانەوە و بە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری خۆتان پشتی ئەم قەناعەتەی من دەگرن. دەسا هەتا هەتایە خوای گەورە لێتان ڕازی بێت. ئامین.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

پەیامی "بەری درەختی ئیمان" گەلێ گرنگ و بەنرخە. ئومێدەوارم کاتێك بێت کە خوای گەورە دڵی زۆر کەسی پێ فەتح بکات. ئێوەش نرخی ئەو پەیامەتان زانیوە و ڕێزی شایانتان لێ ناوە بە ڕادەیەك کە ئەم قوتابخانە یووسفی‌یەتان لەو دەرسە بێ‌بەش نەکرد.

ئەوەندەی پەیوەندیی بە خۆمەوە هەبێت دەڵێم:

بەرهەمی ئەم ماندووبوونەی کە تووشی دەبن و ئەنجامی ئەو خەرجی و مەسرەفانەش کە بەختی دەکەن، گەر تەنها بریتی بێت لەم پەیامە و لە پەیامی "بەرگری" و چاوپێکەوتنتان لە یەك شوێندا، هێشتا ئەو خەرجی و مەسرەف و ماندووبوونانە بە هەرزان و کەم دادەنرێن لە چاویاندا. تەنانەت ئەگەر دە هێندەی ئەم موسیبەتەم لە کۆڵ بنرێت هێشتا بە هەرزان و کەمی دەزانم لە پێناوی ئەم جۆرە بەرهەمانەدا.

لە ئەنجامی تاقیکردنەوە زۆرەکانمەوە بە تایبەت لەم بەندیخانە تەسکەدا قەناعەتێکی تەواوەتیم پەیدا کرد بەوەی کە:

خەریکبوون بە خوێندنەوە و نووسینەوەی پەیامەکانی نوور گەلێ دڵتەنگی و بێزاری لەسەر شانی مرۆڤ سووك دەکات و دڵخۆشی و حەوانەوەی پێ دەبەخشن. لەو کاتانەشدا کە سەرقاڵی کاروباری ئەم پەیامانە نیم موسیبەتەکەم لەسەر زیاد دەبێت و چەند شتێکی بێ‌نرخ خەفەتم دەدەنێ و ئازارم پێ دەچێژن.

لەسەر بناغەی چەند هۆکارێك پێم وابوو کە "خەسرەو" و "حافظ عەلی" و "طاهیری" لە تەنگانەیەکی سەختدا بن، بەڵام بینیم چ ئەوان و چ ئەو کەسانەش لەگەڵیاندان، لە هەموان زیاتر ملکەچی فەرمانی خوای گەورەن و پتر لە دڵنیاییدان و حەوانەوەی دڵیان زیاتر دەستگیر بووە..

لە خۆمم دەپرسی: ئایا هۆی ئەمە دەبێ چی بێت؟ وا ئێستا تێدەگەم کە ئەوان کارمەندی و ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانی خۆیان جێبەجێ دەکەن و، خۆیان سەرقاڵی شتێك ناکەن کە پەیوەندیی پێیانەوە نەبێت و، لە کاری قەزا و قەدەری خوادا خۆ هەڵناقورتێنن و، خۆیان دووچاری نیگەرانی و دڵەتەپێ ناکەن و، ڕەخنە لە کەس ناگرن، کە ڕەفتارێکە لە خۆپەسەندی و نیازی سوود و بەرژەوەندییەوە سەرچاوە دەگرێت. بە ڕاستی ئەوان بە دامەزراوی و دڵنیایی دڵ و دەروونیان ڕووی قوتابیانی نووریان سپی کرد و، هێزی مەعنەویی پەیامەکانی نووریشیان لە بەرامبەر زەندیقەکانەوە پێش چاو خست.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە خۆنەویستی و عیززەتی تەواوەتی و ڕەوشتەکانی قارەمانی و پێشڕەویی ئەم برایانە تەشەنە بکات و سەرجەمی برایانمان بگرێتەوە. ئامین.

* * *

برایانم!

لە ئەنجامی بێئاگایی و خۆشەویستیی دنیاوە غرووروێکی ترسناك سەری هەڵداوە کە فەرمانی خۆی لەم زەمانەدا ڕایی دەکات.

کەواتە دەبێ ئەهلی حەق واز لە غروور و خۆپەرستی بهێنن و دەست لە بەرژەوەندییەکانیان هەڵبگرن، با لە ڕێیەکی ڕەوا و مەشرووعیشدا بێت.

جا لەبەر ئەوەی قوتابییە ڕاستەقینەکانی پەیامەکانی نوور خۆویستییخۆیان - کە وەك شەختە سەهۆڵ وایە - لە کەسی مەعنەوی و حەوزی هاوبەشی کۆمەڵدا تواندووەتەوە، ئەوا پشت بەخوا لە ناوەندی ئەم تۆف و زریانەدا لەرزەیان پێ ناکەوێت.

بەڵێ، پلانێکی گرنگ و تاقی کراوەی مونافیقان بریتییە لە کۆکردنەوەی هاوچەشنی ئەو قوتابیانە - کە هەر یەکەیان خاوەنی کەسایەتیی ئەفسەر و حاکمێکە - لە یەك مەسەلە و، لە شوێنێکی تەسکی ئەوتۆدا کە دەمارەکان دەورووژێنێت و بێزاری و موناقەشەی توند و تیژ و ڕەخنەگرتن بەرهەم دەهێنێت. ئنجا قڕە و کێشەیان لە نێواندا دەهەژێنن تاکو ورە و هێزی مەعنەوییان پەرتەوازە بکەن، پاشان زۆر بە ئاسانی ئەو کەسە تەمێ دەکەن کە هێزی مەعنەویی خۆی لە دەست داوە.

جا قوتابیانی په‌یامه‌كانی نوور، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ڕێبازی هاوڕێیه‌تی و برایه‌تی و "الفناء في الإخوان"یان گرتووه‌ته‌ به‌ر، ئه‌وا پشت به‌خوا ئه‌م پلانه‌ گرنگ و تاقی كراوه‌یه‌ی مونافیقان پووچه‌ڵ ده‌كه‌نه‌وه‌.

* * *

برا ئازیز و به‌وه‌فاكانم!

كاتی خۆی له‌ شارێكدا شێخێكی مه‌زن گه‌لێ مووریدی له‌ ده‌ور كۆبووبوونه‌وه‌. پیاوانی ده‌وڵه‌تیش له‌و شاره‌دا كه‌وتنه‌ مه‌ترسی‌یه‌وه‌ له‌و موریدانه‌ و، ده‌ترسان ده‌ست له‌ كاروباری سیاسه‌ت وه‌ربده‌ن. له‌به‌ر ئه‌وه‌، ویستیان ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ی ده‌وروبه‌ری شێخ ته‌فروتوونا و په‌رته‌وازه‌ بكه‌ن.

كه‌ شێخ به‌مه‌ی زانی، پێی وتن: (من ته‌نها مورید و نیوێكم هه‌یه‌؛ ئه‌گه‌ر حه‌زیش ده‌كه‌ن تاقی‌یان ده‌كه‌ینه‌وه‌)!

شێخ له‌ ده‌ره‌وه‌ی شار خێوه‌تێكی هه‌ڵدا و، هه‌زاران كه‌سی له‌ موریده‌كانی خۆی بۆ ئه‌وێ بانگ كرد، پاشان پێی وتن:

(وا ئێستا تاقیتان ده‌كه‌مه‌وه‌؛ جا هه‌ر كه‌سێك به‌ ڕاستی موریدی من بێت، ده‌چێته‌ به‌هه‌شته‌وه‌).

ئنجا یه‌كه‌ یه‌كه‌ بانگی ده‌كردن بۆ ناو خێوه‌ته‌كه‌، له‌ هه‌مان كاتیشدا و به‌ چه‌شنێكی په‌نهان به‌رخێكی سه‌ربڕیبوو، موریده‌كانی ده‌ره‌وه‌ی خێوه‌ته‌كه‌ وا تێ گه‌یشتن كه‌ شێخ یه‌كێك له‌ موریده‌ تایبه‌تمه‌نده‌كانی خۆی سه‌ربڕیوه‌ و بۆ به‌هه‌شتی ناردووه‌! ئیتر هه‌ر هه‌موویان پاشه‌كشێ‌یان كرد و گه‌ڕانه‌ دواوه‌ و به‌ گوێی شێخیان نه‌كرد، ته‌نانه‌ت ئینكاریی ئه‌و هه‌ڵوێسته‌ی شێخیشیان ده‌ربڕی. ته‌نها یه‌ك "پیاو" نه‌بێت وتی: (من ده‌ڕۆم؛ با سه‌رم به‌ قوربانی شێخ بێت)! ئه‌مه‌ی وت و، خۆی به‌ ناو خێوه‌ته‌كه‌دا كرد. پاش ئه‌و ژنێكیش هه‌مان هه‌ڵوێستی نواند. هه‌موو ئه‌وانی تر بڵاوه‌یان لێ كرد! ئنجا شێخ به‌ پیاوانی ده‌وڵه‌تی وت: (ئه‌وه‌تا به‌ چاوی خۆتان بینیتان كه‌ من ته‌نها مورید و نیوێكم هه‌یه‌)!

به‌ڵام ئێمه‌ هه‌زار و یه‌ك شوكر و ستایش پێشكه‌شی خوای گه‌وره‌ ده‌كه‌ین كه‌ له‌ تاقیكردنه‌وه‌ و موحاكه‌مه‌كانی "ئه‌سكی شه‌هر"دا، به‌ پێچه‌وانه‌ی ئه‌و شێخه‌وه‌، ته‌نها قوتابی و نیوێكمان له‌ ده‌ست ده‌رچوو، له‌ بریی ئه‌و قوتابی و نیوه‌ له‌ده‌ست چووه‌ش ده‌

هەزار کەس هاتن و بوون بـە قوتـابیی نـوور! ئەمـەش بـە فـەزڵی خـوای گـەورە و ئـەنجامی هەوڵ و کۆششی پاڵەوانانی "ئیسپارتە" و دەورووبەری.

لە خوای گەورە داواکارین کە بەهۆی هیممەتی پاڵەوانانی خۆرهەڵات و خۆرئاوای وڵات، لـەم تاقیکردنەوەیـەدا کەسـانی زۆر بەزایـە نـەچن، بـەڵکو لـە بریـی یـەکێکی لەدەستچوو دە کەس بێنە مەیدانەوە.

* * *

باسمه سبحانه

لە دێر زەماندا مرۆڤێکی ناموسڵمان هۆکـارێکی دۆزیبـووەوە کـە توانیبـووی لـە ڕێـی ئەو هۆیـەوە و لـە نێـوان سەیروسلوکی تەریقـەتی سـۆفیی‌یەوە خـۆی بگەیەنێتـە پلـەی خەلیفەی شێخ و، دەست بە ئیرشاد بکات!

یەکێك لەو موریدانەی کە ئەم پەروەردەی دەکردن و بەرەبەرە پلـەی ڕۆحی‌یـان بـەرز بووبووەوە، بۆی دەرکەوت کە ڕابەرەکەیان لەوپەڕی نزمیدایە.

پاشان ئەو مرۆڤەش - بە فیراسەتی خـۆی - زانیـی لای ئـەو موریـدەی حـاڵی ئاشکرا بووە! پێی وت: کەواتە منت ناسـی؟ موریدەکـەش پێـی وت: مـادەم لـە سـایەی ئیرشـاد و ڕێنمایی تۆوە بەم پلەیە گەیشتووم ئـەوا لـەمـەولا گـەلـێ زیـاتر لـەچاو جـاران ڕێـزت لـێ دەگرم!

پاشان ئەم موریـدە دەستی کـرد بـە نـزا و لالآنـەوە لـە دەرگانـەی خـواوەنـدی مـەزن و بەتوانادا کە ڕابەرەکەی بۆ ڕێی ڕاست هیدایەت بدات، تا خوای گەورە دوعاکانی ئەمی قبووڵ کرد و ئەو مرۆڤەی لەو بارە ڕزگارکرد و، ئنجا لـە بەرزبوونـەوەی پلـەی ڕۆحیـدا پێش هەموو قوتابیانی کەوتەوە و، بەم جۆرە بوو بە ڕابەری ڕاسـتەقینەیان. چونکە جاری وا دەبێ مورید دەبێت بە شـێخی شێخەکەی خۆی!

کەواتە بەرزی و پێشکەوتن لـەم پێشبڕکێ‌یەدا بریتی‌یـە لـەوەی کـە هـەرکات مـرۆڤ خراپەیەکی لە برایەکی خۆیەوە بینی واز لەو برایەی نـەهێنێت، بـەڵکو برایـەتیی لەگـەڵدا زیـاد بکـات و بـۆ چاکسـازیی براکـەی پـتر تێبکۆشـێت. ئەمەیـە ڕەفتـاری بەوەفایانـەی ڕاست. ئەوانەش کە مونافیق بن دەرفەت لەم حاڵەتە وەردەگـرن و دەڵێـن: (ئەوانـەی کـە تۆ بایەخیان پێ دەدەیت، لە چـەند کەسێکی ئاسایی بـەولاوە هیچـی تـر نـین)، تـاکو ئـەو گومانە باشەی برایان بە یەکتری هەیانە، تێکی بدەن و پشتگیریی نێوانیان لاواز بکەن.

بە هەرحاڵ هەرچەند گەلێ زیانی زۆرمان لەم موسبەتەدا تووش دەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کێشەیەکە پەیوەندیی بە هەموو جیهانی ئیسلامی‌یەوە هەیە، ئەوا هێندە بەنرخە کە هەموو شتێك لە بەرامبەریەوە بە کەم دادەنرێت. لە کاتێکدا کە چەندین ڕووداوی تری هاوچەشنی ئەمە، لەبەر چەند هۆکارێکی سیاسی و ئایینی و چەند هۆکارێکی تر، (وەك کێشەی پەیامەکانی نوور) نەبوون بە موڵکی هەموو جیهانی ئیسلامی.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بایەخدانی لەڕادەبەدەرم بە: پەیوەندی و پشتگیریی نێوانتان تەنها لەبەر ئەو سوودانە نی‌یە کە پەیامەکانی نوور دەستی ئێمەیان دەخەن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەو پەیامانە، بەڵکو هۆکەی ئەو سوودانەیە کە دەگەڕێنەوە بۆ عەوامی ئیمانداران لەوانەی کە لەبازنەی ئیمانی تەحقیقیدا نین. چونکە ئەوان لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستیان بە خاڵێکی پشت پێ‌بەستن و ڕاستی‌یەکی دامەزراو هەیە کە کۆمەڵێك بە توندی دەستیان پێوە گرتبێت و لێی لانەدەن. ئەو عەوامانە لە بەرامبەر تەوژمە سامناکەکانی گومڕایی‌یەوە پاڵ بەو ڕاستی‌یە بێ‌گومانەوە دەدەن و خۆیان ڕادەگرن. چونکە ئەم ڕاستی‌یەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن بۆ ئەوان دەبێت بە بەڵگەیەکی بەهێز و ڕابەرێکی دامەزراو و مەرجەعێکی ئەوتۆ کە لێی دڵنیان: نە دەخەڵەتێت و نە کەس دەخەڵەتێنێت و نە پاشەوپاشیش دەگەڕێتەوە و نە جێی پێ لەق دەبێت.

جا هەر کەسێك پەیوەندی و پشتگیریی توندوتۆڵ و بەهێزی ئێوە دەبینێت، لە دەروونەوە لە ئیمانەکەی خۆی دڵنیا دەبێت، چونکە ئەو کاتە هەست دەکات و دەزانێت ڕاستی‌یەکی دامەزراوی ڕەگداکوتاوی ئەوتۆ هەیە لە پێناوی هیچ شتێکدا بەخت ناکرێت و هیچ شتێك بەسەریدا زاڵ نابێت و سەر بۆ گومڕایان دانانەوێنێت. ئیتر ئەو کەسە ئیمانەکەی بەمە بەهێز دەبێت و وورە و هێزی مەعنەویشی پتر قووڵ دەبێت و، پشت بە خوا ڕزگاری دەبێت و ناکەوێتە ناو داوی کەسانی هەرزە و ئەهلی دنیا و، نابێت بە شوێنکەوتەی ڕێڕەوەکانی ئەوان.

* * *

برا ڕاست و بەوەفاکانم!

هەرگیز لـە نێوان خۆتـاندا موجادەلـە مەکـەن.. توخنـی موناقەشـە مەکـەون.. ئـەو گوێیانـەی کـە بـە جاسووسـی گوێتـان لـێ ڕادەگـرن سـوود لـە موناقەشـەی نێوانتـان وەردەگرن.

لەم بارودۆخەی ئێستاماندا کەسی موناقەشەکەر - هەرچی چۆن بێت و لەسەر حەق بێت یان نا - هەر لەسەر ناحەقە! چونکە لەوانەیە لەو کاتەدا کە ئەو "حەقێکی کەمی" بە دەستەوەیە "زیانێکی زۆر و گەورەمان" پێ بگەیەنێت.

وا ئەوەتان بۆ دووپات دەکەمەوە کە لە بەندیخانەکەی "ئەسکی شەهر"دا بۆ ئەو برایانەم گێڕایەوە کە زۆر زوو تووڕە دەبوون:

لە جەنگی جیهانیدا لەگەڵ نەوەد کەس لە ئەفسەرەکانمان لەناو قاوشێکی گەورە لە باکووری ڕووسیادا بەند کرابووین. من لە ڕێی ئامۆژگاری کردنیانەوە هەرگیز بواری دەنگ بەرزکردنەوە و غەڵبەغەڵبم نەدەدا، چونکە لەڕادەبەدەر ڕێزیان لێ دەگرتم. ڕۆژێکیان کتوپڕ لە ئەنجامی ئەو دەمارگرژی و دڵتەنگییەی بەسەر دەروونی ئەو خەڵکەدا زاڵ بووبوو، تووڕەبوونی هەندێکیان چەندین موناقەشەی توندوتیژی لە نێواندا دروست کردن. منیش بە هەندێ لەو هاوڕێیانەم وت: بڕۆن بۆ لای ئەو قرەقڕ و غەڵبەغەڵبە و پشتی ئەوەیان بگرن کە ناحەقە نەك ئەوەی لەسەر حەقە! ئەوانیش بەگوێیان کردم و، بەم کارەش ئەو موناقەشە توندوتیژ و زیانبەخشە، کۆتایی پێهات!

پاشان لێیان پرسیم: بۆ ئەم کارە نارەوایەت کرد؟

وتم: ئەو کەسەی لەسەر حەق بێت هەمیشە بەویژدانە؛ لە پێناوی حەوانەوە و بەرژەوەندیی مەزن و زۆری کەسانی تردا دەست لە مافی خۆی هەڵدەگرێت. بەڵام بابای ناحەق زۆربەی جار لەخۆبایی و خۆپەرستە؛ دەست لە هیچ شتێك هەڵناگرێت و، قرەقڕەکەش هەر لە زیادبووندا دەبێت!

* * *

برایانم! بە وردی و دووپات کردنەوە ئەو شتانە بخوێننەوە کە مایەی دڵدانەوە و ئارامی و خۆڕاگرتنی مرۆڤن و، لە نامە بچووکەکاندا نووسراون.

من لە هەمووتان لاوازترم و کەچی لە هەمووشتان زیاتر لەم موسیبەتە بێزاری بەخشەم بەرکەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا - بە فەزڵی خوای گەورە - لەبەر ئەو تەنگانە و

سەختییەدا خۆم ڕاگرتووە و، سوپاس بۆ خوا لەو کەسانە دڵگران نەبووم کە هەموو هەڵە و ئۆباڵەکانیان خستووەتە ئەستۆی من، هەروەك لەو کەسانەش دڵتەنگ نەبووم کە بەرگرییان لە خۆیان کردووە و لە ناوەرۆکدا ئۆباڵەکانیان خستووەتە ئەستۆی کۆمەڵ و ئەستۆی ئێمەش، لەو ڕووەوە کە مەسەلەکەمان یەکێکە.

جا مادەم ئێمە براین لە پێناوی خوادا، ئەوا تکام وایە لەم سەبر و ئارامەدا ئێوەش چاو لە من بکەن.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

ئەی هاوڕێیانم لەم میوانخانەیەی دنیادا!

ئەمشەو بە هەست و نەستەکانی سەعیدی کۆن - کە عیززەتی نەفسیان لەخۆ گرتبوو - بیرم لەو ڕەفتارەیان کردەوە کە کۆت و کەلەپچەیان لە دەست کردین و لە ناوەندی چەندین سەربازی پڕ چەکدا بە چەکی دەستی و، پێکەوە، براین بۆ دادگا.. ئەم بیرکردنەوەیەش تووڕەبوونێکی توندی تێدا هەژاندم. بەڵام یەکسەر ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هێنرا:

دەبێ بە شوکرانەی هاودەم لەگەڵ شانازی و خۆشحاڵیدا - نەك بە تووڕەیی و توندوتیژی - پێشوازی لەم دیمەنە بکرێت. چونکە ئەو کەسانەی بەو شێوەیە دەبرێن بۆ دادگا، لە پێش‌چاوی خاوەن هەست و شعوورە لەژمارەبەدەرەکان و مەلائیکەت و ڕۆحانییەکان و خەڵکی ئەهلی حەقیقەت و کەسانی خاوەن ویژدان و هەڵگرانی ئیمانی تەحقیقیدا، لە شێوەی کاروانی ئەو پاڵەوانە ئازا و بەغیرەتانەدا دەردەکەون کە لە پێناوی حەق و ڕاستی و بەرزکردنەوەی ئاڵای قورئان و ئیماندا تەحەددای ئەم چەرخەیان کردووە. جا لەبەر ئەوەی میهرەبانیی خوای گەورە و ڕەزامەندیی پەروەردگار ڕووی لێیانە و نرخ و ڕێزیان لێ دەنێن، ئەوا ڕوانینی سووکایەتی و گاڵتەکردنی چەند کەسێکی هەرزە و نەفام هیچ نرخ و بەهایەکی نییە.

تەنانەت کاتێ کە - لەبەر نەخۆشییەکەم - بە ئۆتۆمبێل ڕۆشتم بۆ دادگا، هەستم بە دڵتەنگییەکی زۆر دەکرد، بەڵام ئەمجارە کە لەگەڵ ئێوەدا و وەك ئێوە بە دەستی کەلەپچەکراو برام بۆ دادگا، هەستم بە شادمانییەکی گەورە دەکرد. بەو واتایەی کە ئەو حاڵەتە لەو نهێنییەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەوەی کە چەندین جار وتوومە، ئێستاش دووپاتی دەکەمەوە و دەڵێم:

لە مێژوودا کەسانی وەك قوتابیـانی پەیامەکانی نوور نابینرێن کە لـە پێناوی حەقدا کەمترین گیروگرفت هەڵبگرن و کەچی گەورەترین پاداشتیان دەست بکـەوێت! کەواتە هەرچەندەش سەختی و ئازارمان بێتە ڕێ و دان بەخۆدا بگریـن، هێشتا هـەر لـە بەرامبـەر دەسکەوتەکانیەوە بە کەم دادەنرێت.

* * *

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

لە دوو ڕووەوە ڕزگاربوون و دەربازبوونمان لەم موسیبەتە کـارێکی سـەخت و دژوار بوو:

یەکەمیان: دەبوو هەر بهاتینایە بۆ ئێرە، تـاکو قـەدەری خـوای گـەورە ئـەو ڕۆزییـەی ئێرەی دەرخوارد بدایانایە کە بـۆی نووسیبووین. کەواتـە ئـەم حاڵـەی ئێستامان باشـترە و خێری زیاترە.

دووهەمیان: نـەماندەتوانی لـەو پیـلان و داوەی بۆمـان سـاز کـراوە دەربـاز ببین. خۆ هەرچەندەش من هەستم پێ کردبوو، بەڵام ڕزگاربوون لە توانـادا نـەبوو. تەنانـەت "شـێخ عەبدولحـەکیم"[1] و "شـێخ عـەبدولباقی"[1] یـش ڕزگاریـان نـەبوو. بـەو واتایـەی کـە

---

(١) "شێخ عەبدولحەکیم" کوڕی سەیید مستەفایە و لـە ساداتی ئەرواسە. ساڵی (١٨٦٤ز) لـە گونـدی "باش قەڵا"ی سەر بە پارێزگای "وان" لە دایك بووە. ماوەی بیست ساڵ بۆ خوێندن بە عـێراق و تورکیادا گـەڕاوە و ئیجازەی زانستیی لە عێراق وەرگرتووە، پاشان کە گەڕاوەتـەوە قوتابخانەیـەکی بۆ زانستە ئیسلامییەکان لـە (باش قەڵا) دامەزراندووە و بیست ساڵیش دەرسـی تێدا وتووەتـەوە. هـەروەك کتێبخانەیـەکی گـەورەی لـەوێ دامەزراندووە کە هەموو سامانی خۆی لەپێناودا خەرج کردووە. پلەیەکی بەرزیشـی لـە تەسـەووفدا هەیـە و لـە تەریقـەتی نەقشـبەندیی خـالیدیدا موریـدی شـێخ فـەهیم بـووە. لـە جـەنگی جیـهانیی یەکـەمدا بـەرەنگاریی ڕووسەکان بووەتەوە و بەشداریی جیهادی کردووە. ماوەیەك کۆچی کردووە بۆ مووسڵ و دوایـی گەڕاوەتـەوە لـە ئەستەمبووڵ سـولتان وەحیدەدیـن کردوویـەتی بـە مامۆسـتای "قوتابخانەی پسپۆڕان". کاتێ لـە سـەردەمی دواتردا دەرگای تەکیە و خانەقا و قوتابخانە ئایینییەکان داخران، وتی: دەوڵەت دەرگای تەکیـە و خانـەقاکانی دانەخسـتووە، بەڵکو دەرگای چەند شوێنێکی بێ گیان و ڕۆحی داخستووە، چونکە ئەو جێگایانە لـە مێژە هـەر

سکالاّ کردنی هەندێکمان لەوانی ترمان لەم موسیبەتەدا کارێکی ناڕەوا و بێ واتا و بێ بناغەیە و، زیانی تێدایە و، جۆرە پشت هەڵکردنێکە لە پەیامەکانی نوور.

کەواتە هەرگیز ئەو کار و خزمەتانەی کە برایانی "ئەرکانی تایبەت" نواندیان، هەرگیز بە هۆکاری ئەم موسیبەتە دامەنێن و مەیانکەن بە بیانووی بێزاربوون لێیان. چونکە ئەم کارە دواکەوتنە لە پەیامەکانی نوور و، پەشیمان بوونەوەیە لە فێربوونی ڕاستییەکانی ئیمان و، موسیبەتێکی مەعنەویی گەلێ سەخت و دژوارترە لە موسیبەتە ماددییەکە.

من دڵنیاتان دەکەمەوە و سوێندتان بە خوای گەورە بۆ دەخۆم کە هەرچەندە من بیست تا سی هێندەی هەموو یەکێکی ئێوە بەشی خۆمم لەم موسیبەتە بەرکەوتووە، کەچی لەو کەسە بێزار نابم کە بە نیازی خاوێنی خۆی و لە ئەنجامی چالاکییەکانی لەم خزمەتەدا و گوێنەدانی بە حەزەر، بووە بەهۆی ئەم موسیبەتە. تەنانەت گەر ئەم موسیبەتە دە هێندەی تریش زیاد بکات هێشتا هەر دڵگران و بێزار نابم لێیان. ئنجا هیچ کەڵکێك وەرناگیرێت لە ڕەخنە و بێزاری دەربڕین لەوەی کە ڕووی دا، چونکە تازە هیچ بوارێك بۆ دەستکاری و چاککردنەوەی نەماوە.

برایانم!

"نیگەرانی و دڵتەنگی" زیاتر پەرە بە گیروگرفتەکە دەدات و، دەبێت بە ڕەگ و ڕیشەیەك لەناو دڵی مرۆڤدا کە موسیبەتە ماددییەکەی لەسەر ڕاگیر دەبێت. جگە لەوەی کە ئاماژەیە کیشە بۆنی ئیعتیراز و ڕەخنەی لێ دێت لە "قەدەر"ی خوای گەورە و جۆرێکیشە لە تاوانبارکردنی میهرەبانیی خواوەند.

مادەم هەموو شتێك ڕوویەکی جوانی و دەرکەوتنی "میهرەبانی"ی خواوەندی تێدایە و، قەدەری خوای گەورەش کارەکانی بەپێی "دادگەری" و "دانایی" ڕایی دەکات، ئەوا دەبێ ئێمە بایەخ بەو گیروگرفتە ئاسان و سووکانە نەدەین کە لەم

بۆ خۆیان دەرگاکانی خۆیان داخستبوو! سالی (١٩٤٣ز) لە ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە و، لە گوندی "باگلووم" کە (پازدە کم) لە ئەنقەرەوە دوورە بە خاك سپێرراوە. (وەرگێڕ)

(١) "شێخ عەبدولباقی": سالی (١٨٩٩ز) لە گوندی "ئەرواس"ی سەر بە پارێزگای "وان" لە دایك بووە و، کوڕی مفتیی ئەو دەمەی وان "شێخ مەعصووم" و خزمی زانای بەناوبانگ سەیید محەممەد شەفیقی ئەرواسییە. پێش جەنگی جیهانیی یەکەم قوتابیی مامۆستا نوورسی بووە لە قوتابخانەی "خورخور" لە شاری وان. مامۆستا نوورسی هێندە خۆشی ویستووە بە ناوی خۆیەوە بانگی نەکردووە و، هەر پێی وتووە: "برازاکەم"! سالی (١٩٧٩ز) کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

ڕۆژگارەدا لە پێناوی ئەرکێکی موقەددەسی ئەوتۆدا دێتە ڕێمان کە پەیوەندیی بە سەرجەمی جیهانی ئیسلامی‌یەوە هەیە.

* * *

(حاڵەتێکی جوزئی و ئاسایی تایبەت بە خۆم کە

پێویست بوو بۆ ئێوەی بنووسم)

برایانم!

من قەناعەتی تەواوم کردووە بەوەی کە "چاو" دەمپێکێت و کاریگەریی توندوتیژم تێدەکات و نەخۆشم دەخات. ئەمەشم گەلێ جار تاقی کردووەتەوە.

من پڕ بە گیان و هەناوی خۆم حەز دەکەم لە هەموو حاڵەتێکدا لەگەڵتاندا بم و هاوڕێتان بم. بەڵام بەپێی ئەو قاعیدە بەناوبانگەی کە دەڵێت: "النظرُ يُدخِلُ الْجَمَلَ القِدْرَ والرَّجُلَ القبرَ"(١) چاو دەمپێکێت و کارم تێدەکات. چونکە ئەو کەسەی کە بۆم دەڕوانێت یان بە ڕوانینی دوژمنایەتی‌یەکی یەکجار زۆر و یان بە چاوی ڕێزەوە سەیرم دەکات. خۆ هەردوو ڕوانینەکەش لای هەندێ لەو کەسانە هەن کە تایبەتکاریی چاوپیسی‌یان تێدایە.

لەبەر ئەوە، ئەگەر لە توانامدا بێت و ناچاری هاوڕێیەتیی ئێوەم نەکەن، هەموو جارێك لەگەڵ ئێوەدا نایەم بۆ دادگا.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بەپێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی:

﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة:٢١٦)..

هەروەها بەپێی دەستووری بەناوبانگی: "الخير فيما اختاره الله":

گەیشتنی پەنهانترین پەیام بە دەستی نامۆترین کەس بە ئێمە و، تەحەدداکردنی ئەو پەیامانە بۆ سەرکەشترین کەسانی خاوەن کەشوفش و خۆ بەگەورەزان و، دەرخستنی

---

(١) "العين حق تدخل الجمل القدر والرجل القبر". رواه أبو نعيم عن جابر مرفوعاً. وحديث: (العين حق) بدون الزيادة، متفق عليه عن أبي هريرة. والزيادة ضعيفة. (باختصار عن كشف الخفاء ١٧٩٧، ٢/٧٦).

هەڵەکانی ئەوانەی کە لە بەرزترینی پلەوپایەکانی دەوڵەتدان، وای لەو پەیامانە کردووە لە ژێر پەردەی دەستووری بڕیاردراوی: "سراً تنورت" بێنە دەرەوە!

چونکە مەبەستیان تا ئێستا بچووککردنەوە و بە کەم پیشاندانی کێشەی پەیامەکانی نوور بوو، بەڵام ئێستا - بە هەرحاڵ - زانییان کێشەی ئەم پەیامانە گەلێ مەزن و گەورەیە و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیش بۆ لایان ڕێگا بۆ چەندین فتووحاتی نوێ و درەخشانی پەیامەکان خۆش دەکات و، دوژمنانیشی بە سەرسووڕمان و ڕێزلێنانەوە ناچاری خوێندنەوەیان دەکات. تەنانەت ڕووناکییان بە گەلێ کەسی دوودڵ و سەرگەردان و موحتاج بە ڕووناکی لە دادگاکەی "ئەسکی شەهر"دا بەخشی و لە تاریکی ڕزگاری کردن. ئەمەش کارێکی وای کرد کە ئەو ئەرك و ئازارانەمان بۆ ببن بە سۆز و میهرەبانی. بە پشتیوانیی خوا ئەمجارە لە مەیدانێکی فراوانتر و گەلێ دادگا و مەڵبەندی زۆردا ئەم خزمەتە خاوێنە فتووحاتی خۆی دەردەخات.

بەڵێ، هەر کەسێك شێوازی ڕوونکردنەوەکانی پەیامەکانی نوور ببینێت ناگونجێ بایەخیان پێ نەدات، چونکە پەیامەکان وەك کتێب و نووسراوەکانی تر نین کە تەنها کار لە دڵ و ژیریدا بکەن، بەڵکو جگە لەم دوانە دەروون و هەست و نەستەکانیش ملکەچ و گوێڕایەڵ دەکەن.

تەبریە و بەربوونی ئێوە زیان لەو ڕاستییە نادات، بەڵام تەبریەبوونی من زیانی تێدایە. چونکە تەنانەت دەروونی بەدخوازیشم ڕازی بوو بەوەی کە نەك هەر تەنها ژیانی ئەم دنیایەم لە پێناوی ڕاستییەکدا بەخت بکەم کە پەیوەندیی بە جیهانی ئیسلامییەوە هەیە، بەڵکو - ئەگەر پێویست بکات - ئامادەیە ژیان و بەختەوەریی ئەو دنیاشم لە پێناوی بەختەوەرکردنی ئەهلی ئیماندا "بە پەیامەکانی نوور" بەخت بکەم.

* * *

برا ئازیز و بەوەفا و ڕاستەکانم!

چەند ڕۆژێکە یەکێك لە دوعاکانی خۆم دەستکاری کردووە. چونکە وشەی "الصادقين"م لەو دوعایەمدا لابرد کە: "واغفر لنا" یان "وفق طلبة رسائل النور الصادقين"یان تێدایە، کە تا ئێستا ڕۆژی وا هەیە سەد جار دووپاتی دەکەمەوە. تاکو ئەو برایانەش لەو دوعایانەم بێ بەش نەبن کە خۆیان بە ناچار دەزانن شوێن ڕوخسەتی شەرعی بکەون و، بە ڕواڵەت لە ئێمە تەبەڕڕا دەبن و، لە ئەنجامی تەنگ پێ هەڵچنین و

ورووژاندنی پڕوپاگەندە و گومانەکانەوە بێزاری و نائومێدی و هەڵوێستی پێچەوانەی عەزیمەت و وەفا، دەنوێنن.

* * *

برای ئازیزم حافظ عەلی!

بایەخ بە نەخۆشی‌یەکەت مەدە، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە شیفات پێ ببەخشێت. ئامین.

تۆ گەلێ قازانجت دەست کەوتووە. چونکە هەموو سەعاتێکی پەرستشی ناو بەندیخانە وەکو پەرستشی دوازدە سەعات وایە. ئەگەر پێویستت بە دەرمانە، من هەندێکم لایە با بۆتی بنێرم. ئەوەش هەیە کە سووکەڵە پەتایەك بڵاو بووەتەوە. من هەر ڕۆژێك کە بڕۆم بۆ دادگا بێ هیچ گومانێك لەو ڕۆژەدا نەخۆش دەکەوم. لەوە دەچێ تۆ لەمەدا بوو بیت بە یارمەتیدەرم و هەندێك لە نەخۆشی‌یەکەی منت هەڵگرتبێت، بە وێنەی ئەو قارەمانێتی‌یە دەراسایەی کە جاران ڕووی دەدا و هەندێ جار یەکێك لە جیاتی براکەی نەخۆش دەکەوت، یاخود لە بریی ئەو دەمرد!

* * *

(پرسە و دڵدانەوەیەکی جوان لە گونجاوترین کاتدا)

برایانی ئازیز و بەوەفام!

سەبارەت بە هەموو موسیبەتێك دەڵێین:

﴿إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ (البقرة:١٥٦).

پرسە و سەرەخۆشی لە خۆم و ئێوە و پەیامەکانی نوور دەکەم. بەڵام پیرۆزبایی بۆ گیانی خوالێخۆش بوو "حافظ عەلی" و گۆڕستانی "دەنیزلی" دەنێرم. چونکە ئەم برا پێشڕەوەمان کە بە "علم الیقین" لە ڕاستی‌یەکانی پەیامی "بەری درەختی ئیمان" گەیشتبوو، جەستەکەی لەناو گۆڕدا جێهێشتووە و بە وێنەی مەلائیکەت بەرەو ئەستێرەکان و جیهانی گیانەکان بەرزبووەتەوە، تاکو بگاتە پلەی "عین الیقین" و "حق الیقین". هەروەك کۆتایی بەو ئەرکەی سەرشانی هات کە بە ڕاست و دروستی ئەنجامی داوە و، ئێستا بۆ خۆی لە حەوانەوەدایە.

لە خوای بەخشندەی میهرەبان داواکارین کە بە ژمارەی هەموو پیتە نووسراوە و خوێنراوەکانی پەیامەکانی نوور کرداری چاك لە تۆماری کردەوەکانیدا بنووسێت. ئامین..

هەروەها بەو ژمارەیە ڕێژنەی میهرەبانیی خۆی بەسەردا ببارێنێت. ئامین..

قورئانی پیرۆز و پەیامەکانی نووریشی بۆ بکات بە دڵنەواز و ئارامیبەخش لە گۆڕەکەیدا. ئامین..

بە چاکە و بەخششی خۆیشی (دە) دانە کارگوزار لە بریی ئەو خوالێخۆشبووە بە کارگەی "نوور" ببەخشێت. ئامین.. ئامین.. ئامین.

ئێوەش - برایانم! - وەك من لە دوعاکانتاندا ناوی بهێنن و لە بریی زمانی خۆی هەزار زمان بە دوعا بخەنە کار و لە میهرەبانیی خوا داوا بکەن کە لە بریی ئەو یەك دانە ژیان و یەك دانە زمانەی لە دەستی دا هەزار ژیان و زمانی دەست بخات.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

سوپاس و شوکری نەبڕاوە و بێ کۆتایی پێشکەش بە خوای گەورە دەکەین لەسەر ئەوەی کە شەرەفی پلەی بەرزی قوتابیی زانستەکان و کردارە مەزنەکانی ئەوانی، بەهۆی ئێوەوە، لەم ڕۆژگارە سەیر و شوێنە نامۆیەدا پێ بەخشیوین.

بە چەندین ڕووداوی زۆر لە بینینەکانی ئەو پیاوچاکانەی گۆڕستانیان بۆ کەشف دەبێت، ئەوە چەسپاوە کە: هەر قوتابییەکی زانستخوازی ڕاستەقینە و چوست و چالاك لە خوێندنی زانستدا، گەر لە دەمی خوێندنەکەیدا کۆچی دوایی بکات، خۆی - بە وێنەی شەهیدان - بە زیندوو دەزانێت و خەریکی وانەکانی دەبێت!

تەنانەت یەکێك لە کەسانی بەناوبانگی ئەو چینەی ئەولیا کە گۆڕیان لێ دەردەکەوێت، سەرنجی وەڵامەکانی قوتابییەکی دابوو بۆ پرسیارەکانی نەکیر و مونکەری ناو گۆڕ، کە لە دەمی خوێندنی زانستی نەحو و سەرفدا کۆچی دوایی کردبوو. بینیبووی لە وەڵامی ئەو پرسیارەی مەلائیکەدا کە دەڵێ: (مَنْ ربُّكَ)؟ دەڵێت: "مَنْ" موبتەدایە و "ربُّكَ"ەش خەبەرەکەیەتی! ئەمەش بەپێی زانستی نەحو. پێی وابووە هێشتا هەر لە قوتابخانەدایە و وانەکانی دەخوێنێت.

لەسەر بناغەی ئەم ڕووداوە:

من لـەو بـاوەڕەدام کـە خوالێخۆشبوو "حـافظ عـەلی" ئێستـا بـە پەیامـەکانی نـوورەوە سـەرقاڵە، وەك لـە ژیـاندا هەمیشــە سـەرقاڵ بـوو پێیانـەوە و، لـە شـێوەی قوتابیـیەکی زانستخوازدا بەرز و بڵندترین زانست دەخوێنێت و، بە ڕاستی پلەی شەهیدانی بەدەست هێناوە و، جۆری ژیانی ئەوان بەسەر دەبات.

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە، هەردەم لە نزا و پاڕانـەوەکانمدا دوعـای بۆ دەکـەم. هەروەك دوعا بۆ دوو هاوڕێنەکەی ئەویش (محەممەد زوهدی) و (حافظ محەممەد) دەکەم و، دەڵێم:

ئەی پەروەردگار! ئەوانە تا ڕۆژی قیامـەت بخەرە کـار تـاکو بـە کـەماڵی دڵخۆشـی و شـادمانییەوە سـەرقاڵی ڕاستییەکانی ئیمـان و نهێنییـەکانی قورئـان بـن لـە نـاوەندی پەیامەکانی نووردا. ئامین. إن شاء الله.

* * *

باسمه سبحانه

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

من نـاتوانم کـاك حـافظ عـەلی لـە یـادی خـۆم بەرمـەوە و، هـەواڵی جودایـیشـی زۆر بـە توندی ڕایتەکاندم. پێم وایە ئەو خوالێخۆشبووە لە بریی من کۆچی دوایی کردووە، وەك ئەو گیانفیداییانەی کە هەندێ جار ڕووی داوە لە بریی هاوەڵەکانیان کۆچیـان کـردووە! ئەگـەر کەسـانی وەك ئێـوە، بـە وێنـەی ئـەو، خزمەتگوزاریـیە مەزنـەکانی ئـەوتان ڕانەپەڕاندایە زیـانێکی گـەورە لـە کـاری خزمـەتگوزاریی قورئـان و ئیسـلام دەکـەوت. هـەرکات کـە من بـیر لـە میراتگـرانی ئەو دەکەمـەوە، کـە ئێوەن، ئازارەکـانم نـامێنن و خۆشی و شادمانی لە جێی خۆیاندا بەجێ دەهێڵن.

گەلـێ جێی سەرسامییە! من ئێستا حەز و شـەوقێکی سـەیر لـەخۆمدا شـك دەبەم بۆ کۆچکردن بەرەو ئەو جیهانی بەرزەخەی کـە ئەم برایـەمان بـە ژیـانی مـاددی ومەعنـەویی خۆی کۆچی بۆ کردووە!

هەر لەم حەز و تاسەمەندییەوە دیمەنێکی تر لە ڕۆحم دەرکەوت:

چونکە هەروەك ئێمە کە هێشتا لێرە و لـەم جیهانـەداین، بـە نامەگۆڕینـەوە و گفتوگۆ لەگـەڵ برایـانی "ئیسپارتە"مـاندا دەدوێین و سڵاویان بۆ دەنێرین، بە هـەمان جـۆر ئـەو جیهـانی بەرزەخـەش کـە "حـافظ عـەلی"ی تێدا نیشتەجێ بـووە لـە پێـش چـاومدا وەك

"ئیسپارتە" و "قەستەمۆنی"ی لێ هاتووە. تەنانەت کە بیستم ئەمشەو یەکێك ڕۆشتووە بۆ ئەوێ (واتە کۆچی دوایی کردووە) دە جار زیاتر خەفەتی ئەوەم خوارد کە بۆچی سڵاوم بۆ "حافظ عەلی" پێدا نەنارد؟! پاشان ئەوەم هات بە دڵدا کە پێویست بە هیچ هۆکارێك ناکات بۆ سڵاو ناردن، چونکە پەیوەندیی ئەو وەك تەلەفۆن وایە، جگە لەوەی کە خۆی دێت و سڵاوەکەمان لێ وەردەگرێت!

ئەو شەهیدە مەزنە، شاری "دەنیزلی"ی لە لا شیرین کردووم و حەز ناکەم بەجێی بهێڵم.

خزمەتگوزاری‌یەکانی ئەم شەهیدە و "محەممەد زوهدی" و "حافظ محەممەد" لە پێناوی ئیمان و نووردا، پشت بەخوا هەر بەردەوام دەبێت و، خۆیشیان لە نزیکترین شوێنەوە دەیبینن و، لەوانەشە لە ئەنجامدان و جێ‌بەجێ کردنیاندا یارمەتی و هاوکاری بکەن.

جا لەبەر ئەوەی ئەو برایانە لە ڕووی خزمەتە مەزنەکانیانەوە چەند شوێنێکی بەرزیان لە بازنەی ئەولیا گەورەکاندا بەدەست هێناوە، ئەوا من ئەم دوانە و "حافظ محەممەد"یش لە ناوەندی زنجیرەی ئەقتابەکاندا ناو دەبەم و، دیاری‌یەکانمان دەنێرم بۆیان.

* * *

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

ئەو "ئیخلاس" و "وەفا" و "دامەزراوی"یەی لە ئێوەدا هەیە سەروزیادی ئەوەن کە چاو لە کەموکووڕیی یەکتر بپۆشن، بە تایبەت لەم کاتەدا کە قورسایی ئەم هەموو گیروگرفت و تەنگانەیەتان لە ئەستۆ نراوە. ئنجا پەیوەندیی توندوتۆڵی برایەتیتان، کە بە زنجیرەی پەیامەکانی نوورەوە بەستراوە، "چاکە"یەکی هێندە گەورەیە کە هەزار "خراپە" دەسڕێتەوە. کەواتە دەبێ بەپێی زیادبوونی "چاکە" بەسەر "خراپە"دا و بە خۆشەویستی و چاوپۆشی لە نێوان خۆتاندا مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن. بە وێنەی حەشری مەزن کە دادگەریی خوای گەورە بە زیادبوونی کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان دەسڕێتەوە. دەنا بە پێچەوانەی ئەمەوە؛ واتە هەڵچوون و تووڕەبوون لە بەرامبەر یەك کردەوەی خراپەوە، هەروەها ئاسەوارە زیانبەخشەکانی بێزاری و دڵتەنگی لە یەکتر، بە ستەمێکی زیاد و دوو چەندانە دادەنرێت.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە: بە دڵدانەوە و یارمەتیدانی یەکتر لە تەنگانەدا، دڵتەنگی و بێزاریتان لە نێواندا هەڵبگرێت.

برا ئازیز و بەرێز و بەوەفاکانم!

هۆی ئەوەی کە چەند ڕۆژێکە لەگەڵتان نادوێم، نەخۆشــیەکی توندوتیـژی ئەنجامی دەرخوارددانی ژەهرە، کە تا ئێستا نەخۆشیی وام بە خۆمەوە نەدیوە!

من بە ناوی پەیامەکانی نوورەوە تا دوا هەناسەی ژیانم شـوکر و سـوپاس پێشکەش بـە خوای گەورە دەکەم و شانازی دەنوێنم بەو برا بەهێز و دامەزراوە کارگوزارانەی کـە لـە بازنەی "نوور"[١] و بازنەی "ویرد"[٢]دا لەرزەیان پێ ناکەوێت، هاودەم لـەگـەڵ گیـانفیدا بەوەفاکانی قەستەمۆنیدا. هـەروەك لـە بەرامبـەر هـەموو جۆرەکـانی ئـەو سزایانەوە کــە ستەمکاران ئێمەی پێوە گیرۆدە دەکەن دڵنەوایی و پاڵپشتی خۆم لەواندا دەبینم. تەنانـەت گەر ئێستا بمرم، ئەوا مادەم ئەوان هەن، بە سنگێکی فراوان و دڵێکی شادمانەوە پێشوازی لە ئەجەل دەکەم.

ئەهلی دنیا شك و گومانی بێ بنج و بناغەیان لـە دڵـدا دروسـت بـووە. وەك بڵێـی مـن تەحەددایان بکەم و لە مەیداندا زۆرانیان لەگەڵدا بگـرم، بۆیـە منیـان خسـتە بەندیخانـەوە. بەڵام قەدەری خوای گەورە بۆیە منی خستە ئـەم بەندیخانەیـەوە چونکـە بـانگم نـەکردن بـۆ خێر و هەوڵی ئیصلاح و چاككردنیانم نەدا.

ئەگـەر تەنـها لەگــەڵ چــەند خۆشەویســتێکم لــە بەندیخانــەدا بمامایەتــەوە، داوام لــە کاربەدەستانی ئەنقەرە دەکرد کە دادگایەکی ئاشکرای ئەوتۆیان ئـەنجام بدایـە کـە مایـەی بایەخ و گرنگی پێدانـی جیـهانی ئیسـلامیيە. پشـت بـەخوا چـەند نوسـخەیەك لـە پـەیامی "بەری درەختی ئیمان" و چەند بەشێکی پەیامی "بەرگری" بە پیتە نوێکان بـۆ کاربەدەستە گەورە و گرنگەکان دەنێرین.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بەشێکی فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ نە تایبەتی و نە جوزئین و،نـە ڕوویـان لـە بابەتە گشتیيەکانە، بـەڵکو لـە جـۆری "موتەشـابیهات"ن. بەشـێکی تریشـیان تەنـها یـەك

(١) بازنـەی نوور: مەبەست کۆمەڵـە قوتابیيەکی پەیامـەکانی نـوور بـووە لـە گونـدی "ئیسـلامکۆی" کـە لـە پێشـەنگیانەوە "حافظ عەلی"یە. (وەرگێڕ)

(٢) بازنەی ویرد: مەبەست کۆمەڵە قوتابیيەکی پەیامەکانی نوور بووە لە شاری ئیسپارتە کە لـە پێشـەنگیانەوە "خەسرەو"ە. (وەرگێڕ)

کاتی ئەو فیتنە و تاقیکردنەوە ئایینی‌یانە دەردەخەن کە تووشی نەتەوەی ئیسلام دەبن و، تەنها چەند شوێنێکی تایبەتیی وەك حیجاز و عێراقیشیان بە نموونە هێناوەتەوە.

لە ڕاستیشدا چەند دەستە و تاقمێکی گومڕای وەك موعتەزیلە و ڕافزی و جەبری و زەندیق و مولحیدانی پشتی پەردە لە سەردەمی عەبباسی‌یەکاندا پەیدا بوون و، زیانیان بە موسڵمانان گەیاند. بەڵام پێشەوا مەزنەکانی ئیسلام وەك: ئیمامی مالك و ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیمامی غەزالی و شیخی گەیلانی و جونەیدی بەغدادی[1] - خوایان لێ ڕازی بێت - ئاگری ئەو فیتنە و ئاشووبانەیان کوژاندەوە کە لە بواری شەریعەت و عەقیدەدا هەڵگیرسابوون.

ئنجا دوای ئەوەی کە سێ سەد ساڵ بەسەر ئەم سەرکەوتنە ئیمانی‌یەدا تێپەڕی، ئەو دەستە و تاقمە گومڕایانەی پشتی پەردە موسڵمانانیان - لە ڕێی سیاسەتەوە - خستە گێژاوی ئاشووبی هۆلاکۆ و جەنگیزخانەوە. "فەرموودەی پیرۆز" و "ئیمامی عەلی"ش - خوا لێی ڕازی بێت - بە ڕاشکاوی و بە دەستنیشان کردنی بەرواری ئەم فیتنەیە پێشتر ئاماژەیان بۆ کردبوو.

جا لەبەر ئەوەی فیتنەی ئەم ڕۆژگار و زەمانەی ئێمە بە گەورەترین فیتنە دادەنرێت، ئەوا چەندین فەرموودە و گەلێ ئاماژەی زۆری قورئانی پیرۆز هەواڵی فیتنە و تاقیکردنەوە و ئاشووبەکانی ئەم سەردەمەیان داوە، تەنانەت بە بەروار و کاتی ڕوودانیشیانەوە!

جا بەپێی ئەمە، هەرکات فەرموودەیەکی پیرۆز باسی ئەو ڕووداوانە دەکات، کە بە شێوەیەکی گشتی دێنە ڕێی نەتەوەی ئیسلام، ئەوا هەندێ جار تەنها یەك دانە ڕووداو بە بەروار و مێژووەکەیەوە - وەك نموونەیەك لەو ڕووداوە هەمەکی‌یە- ڕوون دەکاتەوە. ئەم جۆرە فەرموودە موتەشابیهانەش لەوانەیە بە ڕاست و دروستی هەموو واتاکانیان لە لایەن خەڵکی‌یەوە نەزانرێن.

---

(١) ناوی "ئەبولقاسمی زەججاج جونەیدی کوڕی محەممەدی قەواریری بەغدادی"یە و، زانایەکی زاهیدە و، بە "سید الطائفة" بەناوبانگە. لە بەغدا لە دایك بووە و، پاشان زانستە فیقهی‌یەکانی لای پێشەوا "سوفیانی سەوری" خوێندووە و، زانستەکانی تەسەووفیشی لە خاڵی خۆی "شێخ سەریی سەقەتی" وەرگرتووە. لە (٢٩٧ك/٩١٠ز) کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

بەشـەكانی پەیامـەكانی نـوور بـە جۆرێكـی ڕوون تـەئویلی ئـەو فەرموودانـەیان چەسپاندووە و، "وتەی بیست و چوارەم" و "تیشكی پێنجەم"یش ئەم ڕاستییەیان لەگـەڵ دەستوور و بناغەكانیدا ڕوون كردووەتەوە.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

دڵـم ئاگـادار كرایـەوە كـە حەقیقـەتێكتان بـۆ ڕوون بكەمـەوە، تـاكو یـەكتری بـە خۆپەرستی و بێوەفایی تاوانبار نەكەن.

ڕۆژێكیـان وەلییەكی گـەورەم بینی كـە "نەفسـی ئـەممارە"(دەروونـی بـەدخواز)ی سڕابووەوە و وازی لە خۆپەرستی هێنـابوو، كەچی زۆر بە توندی سكاڵای لـە دەست نەفسی ئەممارەی دەكرد! یەكەم جار سەرم لـەم دیاردەیـە سووڕما! پاشـان بـە دڵنیاییەوە زانیم كە لەبەر ئەوەی "موجاهەدە" - كە پاداشتی لەسەرە - تـا كۆتـایی تەمـەن بـەردەوام دەبێت، ئەوا نەفسی ئەممارە كاتێ كـە دەمرێـت كەرەسە و ئامێرەكانی خـۆی بـە دەمـار و هەست و نەستەكانی مرۆڤ دەسپێرێت و، بەم جۆرە ئەو پیاوچاك و ئەولیا مەزنانە سكاڵا لەم دوژمنەی دووهەم دەكەن كە جێگەدار و میراتگری نەفسی ئەممارەی ڕاستەقینەیە.

جگە لەمەش، نـرخ و بـەها و پلـە و پایـە و تایبەتكارییـە مەعنەوییـەكان ڕوویـان لـەم دنیایە نییە، هەتا پێویست بێت خۆیان دەربخـەن و خـەڵكی هەستیان پێ بكـەن. تەنانـەت هەندێك لەو پیاوچاكانەی كە لە بەرزترینی پلەوپایەكاندان خۆیان لە هـەموو خـەڵكی بـە لاوازتر و دەستەوسانتر و نـابوودتر دادەنێـن، چونكـە نایانـەوێ هەسـت بـە هیـچ كـام لـەو چاكە و بەخششانەی خواوەند بكەن كە پێی بەخشـیون. ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی كە ئـەو كەشـف و كەرامـەت و چێـژ و ڕووناكییانـەی لـە پێـش چاوی عـەوامدا مایـەی كەماڵاتی مرۆڤە، هەرگیز نابن بە مەحەك و مایەی پلەوپایە و نرخ و بەها مەعنەوییـەكان. یەكێك لەو بەڵگانەی كە ئەم ڕاستییە دەچەسپێنێت ئەوەیە كـە: لـە كـاتێكدا تەنـها یـەك سەعاتی ژیانی هاوەڵێكی بەڕێز هاوسـەنگە لەگـەڵ یـەك ڕۆژی ژیـانی وەلییـەك، تەنانـەت لەگەڵ چـەند ڕۆژێكـی مانـدووبوون و پەرستش و ئیعتیكـافی ئـەودا، كەچـی حاڵـەتی دەراسا و مەعنەوی و كەشف و كەرامەتی ئەولیاكان لە لای هەموو یەكێكی هاوەڵـەكان نابینرێن.

بەم جۆرە، ئێوەش ئەی برایانم!

بە وردی بیر بکەنەوە و سەرنج لە دەروونـی خۆتـان بـدەن، تـاکو لـە گۆشـەی تەماشـا کردنی کەسانی تر لـە چاوی خۆتانەوە و لـە ڕووی گومـان خراپییـەوە بـە خـەڵکی، "دەروونی بەدخواز" فریوتان نەدات و، گومانی ئـەوەتان بـە دڵـدا نەیـەت کـە پەیامـەکانی نوور قوتابیانی پەروەردە ناکات.

* * *

برایانی صیددیق و ئازیزم!

"وەزیـری پـەروەردە" پـەردەی لـە ڕووی خـۆی لادا و لـە پۆشـاکێکی تـردا کوفـری ئاشـکرای خـۆی دەرخسـت! ئـەوەبوو پێـش ئـەوەی بەرگرییـەکانی ئـەم دواییـەمان وەربگرێت، لە ڕێگای هۆکارێکی ترەوە ئەو بەیاننامەیەی نووسی.

لە ڕاستیدا من لە نیازمدا نەبوو بەرگرییەکانم بۆ ئەو فەرمانگەیە بنێرم، بـەڵام لەسـەر بناغەی ئامۆژگاری و بە باش زانینی برایانمان دەرکەوت کە ناردنیـان بـۆ ئـەوێ کـارێکی پێویست و شیاو بووە. چونکە وەزیرێك تا ئەم ڕادەیە دەمارگیر و لایەنگری ئیلحـاد بێـت هەرگیز ناتوانێت لە بـەردەم ئەو نامـە و وەرەقـە نهێنییانـەی ڕەوانـەی ئەنقـەرە کـران بـێ دەنگ دابنیشێت، یان گوێیان پێ نەدات. چونکە ئەو بەرگرییانەی کە بواری توانـج و ڕەخنەگرتنیان بۆ کەس نەهێشـتووەتەوە، بـە وێنـەی هـەورە بروسـکە دابـاری بـە سـەریدا، کەواتە ئەوەی ڕووی دا شتێکی باش بوو.

پشـت بـەخوا ئـەو نامانـە تـەوژمێکی بـەتین بـۆ پشـتگیریی "پەیامـەکانی نـوور" لـەو فەرمانگەیەشدا دەبزوێنن.

برایـانم! مـادەم حەقیقـەتی هـەندێ کـەس بـەم جۆرەیـە کـە باسمـان کـرد، ئـەوا خـۆ بەدەستەوەدان و تەسلیم بوون بۆ ئەو هەندە کەسە جۆرێکە لە خۆکوژی و، بە پەشیمان بوونەوە دادەنرێـت لـە شـوێنکەوتنی ئیسـلام و، تەنانـەت دەرچوونیشـە لـە ئـایین. چونکـە ئـەوان لـە دەمارگیرییـاندا بـۆ ئیلحـاد گەیشـتوونەتە ڕادەیـەك کـە تەنـها بـە گوێڕایـەڵی و تەسلیم بوون و مەرایی کردن لە ئێمەمانان ڕازی نابن، بەڵکو پێمـان دەڵێـن: واز لـە دڵ و ویژدانی خۆت بهێنە و تەنها بۆ دنیا کار بکە و تێبکۆشە!

لـە بەرامبـەر بـارودۆخی وەك ئەمـەی کـە باسمـان کـرد، دەبێ کـەمالی توندوتۆڵـی و خۆڕاگریمـان بپـارێزین و، تەنـها پشـت بـە خـوای گـەورە ببەسـتین و، کارەکانمـان بـە

چاودێریی ئەو بسپێرین، هاودەم لەگەڵ دوعای سەرکەوتنی پەیامەکانی نوور بە سەریاندا بەو ڕاستیيە بەهێزانەی ئەو پەیامانە کە لە چوار سندووقدا بە دەستیان گەیشت.

ئنجا تاقیکردنەوەکانیش چەندین جار تێیان گەیاندین کە هیچ سوودێکمان دەست ناکەوێت لە خۆدزینەوە و، دوورەپەرێزی و، لە دڵگرتنی هەست و نەستی بێزاری لە یەکتر و، دوورکەوتنەوە لە پەیامەکانی نوور، یان هەوڵی تەسلیم بوون بۆ ئەوان، تەنانەت شوێنکەوتنیشیان. ئەم زەمان و ڕۆژگارە بە چەندین تاقیکردنەوەی زۆر ئەمەی بۆ چەسپاندووین.

هەرگیز دڵتەنگ و نیگەران مەبن. هەرچیيەك بێت مەترسیيەکانی ئەو وەزیرەی کە بە وێنەی مشك ترسی لێ نیشتووە، بەڵگەیە لەسەر ترسنۆکی و لاوازیيەکەی و، هەرگیز نیشانەی هەوڵی دەستدرێژی کردن نیيە بەو ئەندازەیەی کە بەڵگەیە لەسەر ناچاربوونی بۆ خۆ دەربازکردن و بەرگری لەخۆکردن!

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفا و دامەزراو و نرخ شناسانی ڕاستیی تەوەککول!

ماوەی بیست ساڵە حەزم لە خوێندنەوەی هیچ ڕۆژنامەیەك نەکردووە و نەشمویستووە پرسیاری لە بارەوە بکەم. کەچی ئەمڕۆ - بە داخەوە و لەبەر خاتری حەزی چەند برایەکی لاوازمان - سەیری بابەتێکم لە ڕۆژنامەیەکدا کرد. لەم ڕێیەوە تێ گەیشتم کە چەند تەوژمێکی گرنگ بە ئاشکرا و پەنهان ڕۆڵی پڕ لە مەترسی دەبینن و، لەبەر ئەوەش ئێمە لە گۆڕەپانەکەدا دەبینرێین، لەوانەیە وابزانرێت پەیوەندیيەکمان بەو تەوژمانەوە هەبێت.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ئەو پەیامی نوورانەی لەناو چوار سندووقدا ڕەوانەی ئەنقەرە کران و بەڵگەی گومانبڕ و زامدار نەکراویان لەخۆدا هەڵگرتووە، هاودەم لەگەڵ کۆمەڵێك دەفتەری بەرگریيەکانماندا، چەندین ئەنجامی مژدەبەخشی خێریان بۆ ئێمە و ئیمان و قورئان و ئیسلام تێدا بێت.

ئێمە خۆمان لە کاروباری دنیای ئەواندا هەڵنەقورتاندووە و، هیچ بەڵگەیەکیشیان لەم ڕووەوە لەسەر نەچەسپاندووین. بۆیە ئەنقەرە داوای هەموو پەیامەکانی نووری کرد تاکو لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات.

مادەم ڕاستی ئەمەیە و، تا ئێستاش بە چاوی خۆمان چاودێریی پەروەردگارمان لە کاری خزمەتی پەیامی نووردا بە ڕادەیەك دیوە کە ناتوانرێت ئینکاری بکرێت و، هەریەك لە ئێمە چ بە شێوەیەکی جوزئی چ بە شێوەیەکی هەمەکی هەستی بەم چاودێرییە کردووە و، مادەم تەوژمە سیاسییە جیهانییەکان هێز و توانای خۆیان لە بەرامبەر یەکەوە کۆ دەکەنەوە و، ئێمەش جگە لە ڕازی بوون بە قەزای خواوەند و تەسلیم بوون بۆ قەدەرەکەی و دڵدانەوەی بەرز و مەزنی کاری خزمەت بە نوور و ئیمان و قورئان زیاتر هیچ شتێکی ترمان لە تواناادا نییە.. ئەوا پێویستترین کار سەبارەت بە ئێمە خۆپاراستنە لە نیگەرانی و دڵتەنگی و نائومێدی. هەروەها دەبێ هەریەکەمان پشتی ئەوی تر بگرێت و، یارمەتیی ورە و گیانی مەعنەویی ئەوانی تر بدات و، نەترسێت و، بە تەوەککول پێشوازی لەم موسیبەتە بکات و، بایەخ بە قسەی گۆترەکاری و هەڕەمەکیی ئەو ڕۆژنامانە نەدات کە هەموو شتێکی بچووك بە گەورە پیشان دەدەن. بەڵکو دەبێ هەرچی ئەوان بە گەورەی پیشان دەدەن ئێمە بە بچووك و کەم تەماشای بکەین.

برایانم! ئەم ژیانەی دنیا هیچ بایەخێکی نییە، بە تایبەت لەم زەمانە و لە ناوەندی ئەم بارودۆخ و پاڵەپەستۆیانەدا. بەڵێ، دەبێ بە ڕەزامەندییەوە پێشوازی لە هەموو ئەو موسیبەت و گیروگرفتانە بکەین کە ڕووبەڕوومان دەبنەوە.

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ڕاستگۆ و ئازیزم!

چەند برایەکمان دڵدانەوەیەکی جوانیان دۆزیوەتەوە و دڵنەوایی خۆیانی پێ دەکەن. کە بەم جۆرەیە و دەڵێن:

(هەندێك برایانی نوێی ناو بەندیخانەمان ماوەی چەند ساڵێك تەنانەت دە ساڵیش ئەم موسیبەتەی بەندیخانە هەڵدەگرن، کە لە ئەنجامی کارێکی نامەشرووعی ماوەی یەك دوو سەعاتێکەوە دووچاری بوون. تەنانەت هەندێکیان دەڵێن: سوپاس بۆ خوا لە گوناهی تر ڕزگارمان بووە! کەواتە ئیتر بۆچی ئێمە بێزاری لە تەنگانە و سەختییەکی بەپیت و پڕ لە

خێردەربڕین کە چەند مانگێك دەخایەنێت و، لە ئەنجامی کارێکی یەکجار مەشرووع و خزمەتی ئیمانیی پەیامەکانی نوورەوە دووچاری بووین)؟

منیش لە لایەنی خۆمەوە پێیان دەڵێم: هەزار هەزار جار بارك الله.

بەڵێ، گیرۆدەبوون بە سەختی و گیروگرفتی پێنج مانگ و دە مانگ بە نیازی ڕزگار کردنی ئیمانی خۆی و هی غەیری خۆیشی بۆ ماوەی پێنج یان دە ساڵی تەمەن، لە ڕاستیدا مایەی شوکرانە و فەخر و شانازییە لە پێناوی خزمەتێکی شیرین و باش و بەرز و عیبادەتێکی فیکریی بەرز و بڵندا.

لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە: "لئن يهدي اللهُ بك رجلاً خيرٌ لكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَم"[(١)]. دەسا ئێوەش بیر لە ژمارەی ئەو کەسانە بکەنەوە کە بەهۆی خزمەتگوزاری و نووسینەکانتانەوە، چ لێرە و چ لە هەموو شوێنێکی وڵات و چ لە ئەنقەرەدا، ئیمانی خۆیان لە زریانی شك و گومانە ترسناکەکان ڕزگار دەکەن. کەواتە لە ناوەندی سەبر و ئارام و منەتباریی خواوەند و ڕەزامەندیی تەواوەتیدا شوکر و سوپاس پێشکەشی پەروەردگارتان بکەن.

خۆ ئەگەر "پارتی گەلی کۆماری"ی فەرمانڕەوای ئەنقەرە لە بەرامبەر پەیامەکانی نوورەوە، کە بەڵگەی بەهێزیان لە پشتە و ڕەوانەی ئەوێ کراون، هەر سەرسەختیی نواند و، بە سولح کردن لەگەڵ ئەو پەیامانەدا هەوڵی پارێزگاری کردنی ئەو پەیامانەی نەدا، ئەوا بەندیخانە باشترین شوێنە بۆ ئێمە و، دەردەکەوێت کە مولحیدەکان یەکێتییان خستووەتە نێوان زەندیقەکان و شیووعییەکانەوە و، حکوومەتیش ناچارە مل بۆ قسەی ئەوان کەچ بکات. دیارە ئەو کاتەش پەیامەکانی نوور لە مەیدان دەکشێنە دواوە و لە کار ڕادەوەستن و، موسیبەتە ماددی و مەعنەوییەکان هێرش دەهێنن.

* * *

---

(١) جزء من حديث صحيح، أخرجه البخاري في المغازي: باب غزوة خيبر، وفي الجهاد: باب دعاء النبي ﷺ إلى الإسلام والنبوة، وباب فضل من أسلم على يديه رجل، وفي فضائل أصحاب النبي ﷺ باب مناقب علي بن أبي طالب. وأخرجه أحمد ٣٣٣/٥ ومسلم برقم ٢٤٠٦.

باسمه سبحانه

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ﴾ (الأنعام:١٣٠)

(وەڵامی مامۆستامانە بۆ پرسیارێك لە بارەی ناردنی پێغەمبەرانەوە لە جینیی‌یەکان، وەك مەفهوومی ئایەتەکە داخوازیەتی)

برای ئازیزم!

بە ڕاستی ئەم پرسیارەت گەلێ گرنگە. بەڵام لەبەر ئەوەی گرنگترین ئەرکی سەرشانی پەیامەکانی نوور ڕزگارکردنی مرۆڤە لە داوەکانی گومڕایی و تاریکاییەکانی کوفری موتڵەق، ئەوا زنجیرەی بایەخدان و ڕەچاوکردنی شتانی پێویستتر ڕێی گەیشتنمان بەم چەشنە مەسەلە و بابەتانە لێ دەگرن و دەرگای باسکردنی ئەو بابەتانەمان لێ ناکرێتەوە. جگە لەمە، پیاوچاکانی پێشینیش زۆر لە بارەیانەوە نەدواون، چونکە ئەم چەشنە بابەتە غەیبی و داپۆشراوانە لەوانەیە بە شێوەیەکی خراپ بەکار بهێنرێن و، کەسانی فێڵبازیش دەتوانن بیانکەن بە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە ئامانجە زاتییەکانی خۆیان، بە وێنەی ئەو کەسانەی کە لەم سەردەمەدا بەهۆی "نواندنی موگناتیسی"یەوە و بە ناوی هەواڵ وەرگرتنەوە لە جینیی، خەڵکی دەخەڵەتێنن. لەبەر ئەوە، بە زۆری باس لەم جۆرە شتانە ناکرێت، تاکو ڕەفتاری خراپ بەرامبەر ئایین ئەنجام نەدرێت.

پاشان دڵنیابە کە دوای "خاتم الانبياء ﷺ" هیچ پێغەمبەرێك ڕەوانەی جینیی نەکراوە!

پەیامەکانی نووریش لەم زەمان و ڕۆژگارەدا هەوڵیان داوە کە بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ بوونی جینیی و ڕۆحانییەکان بچەسپێنن، تاکو چەمکی ماددییەت پووچەڵ بکەنەوە، کە بە وێنەی تاعوون لەناو گرۆی مرۆڤدا پەرەی سەندووە. ئیتر لە پلەی سێهەمدا سەیری ئەم چەشنە مەسەلە و بابەتانەیان کردووە و، درێژەپێدانی ئەم باسانەیان بۆ غەیری خۆیان بەجێ هێشتووە.

ئومێدە کە خوای گەورە یەکێك لە قوتابیانی نوور بڕەخسێنێت تەفسیری سوورەتی "الرحمن" بکات و ئەم مەسەلەیە شی بکاتەوە.

* * *

باسمه سبحانه

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

سەبارەت بە هەموو موسیبەتێك دەڵێین:

﴿إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ (البقرة:١٥٦).

بە ڕاستی وەفاتی "حافظ علی" و "حافظ محەممەد" و "محەممەد زوهدی" نەك هەر لە دەستچوونێکی گەورە بوو سەبارەت بە ئێمە و ئیسپارتە، بەڵکو زیانێك بوو لە هەموو جیهانی ئیسلامی کەوت. بەڵام تا ئێستا چاودێریی پەروەردگار وا هاتووە کە هەرکات قوتابییەکی نوور لەدەست بچێت، دوو سێ قوتابی لە شێوەی خۆی دێن بە دوایدا و لە مەیدانی کاردا دەردەکەون.

ئێمە گەلێ ئومێدەوارین کە چەند قوتابییەکی چوست و چالاك – بە شێوەیەکی تر – پەیدا بین کە ئەرکی سەرشانی ئەو پاڵەوانانە جێبەجێ بکەن. پشت بەخوا پەیداش دەبن.

بە ڕاستی ئەو سێ پاڵەوانە لە ماوەیەکی کەمدا کاری سەد ساڵیان ڕاپەڕاند. لە خوای گەورە داواکارین کە بە ئەندازەی ژمارەی پیتەکانی ئەو پەیامانەی نوور، کە خوێندوویانەتەوە و نووسیویاننەتەوە و بڵاویان کردوونەتەوە، لێزمەی سۆز و میهرەبانیی خۆی بەسەریاندا ببارێنێت.

پرسە و سەرەخۆشییم بە کەسوکاری "حافظ محەممەد" و گوندە خاوێنەکەی ڕابگەیەنن و، لە لایەن خۆمەوە کردوومە بە هاوڕێی "حافظ عەلی" و "محەممەد زوهدی" و، ناوی هەرسێکیشیانم لە ناوەندی ناوی مامۆستا ئەقتابەکانمدا داناوە لە دەمی دوعا و نزاکانمدا و، "حافظ عاکیف"یشم کردووە بە هاوەڵی "عاصم" و "لوتفی".

* * *

باسمه سبحانه

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بەپێی نهێنیی دەستووری: "الخير فيما اختاره الله" دواکەوتنی ئەم مەسەلەیەمان خێری تێدایە. چونکە خۆشویستنی ئەو پیاوە مردووە ترسناکە[1] لە هەموو قوتابخانەکان و فەرمانگەکانی حکوومەت و لە ناوەندە گشتییەکانی گەلدا هەردەم دەوترێتەوە و بە گوێی خەڵکیدا دەدرێت. ئەم حاڵەتە کاریگەرییەکی یەکجار دڵتەزێن و ئازاربەخشی لە جیهانی ئیسلامی و لە ئایندەشدا دەبێت.

پاشان ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە و دواهەمین کەسن وازی لێ دەهێنن، پەیامەکانی نووریان کەوتووەتە دەست، کە چەندین بەڵگەی چەسپێنەر و گومانبڕ لە بارەی ماهییەتی ئەو پیاوەوە دەخەنە ڕوو. خۆ ئەمەش ڕووداوێکی هێندە گرنگە کە ئەگەر هەزارانی وەك ئێمە بڕۆنە بەندیخانەوە تەنانەت بەرەو سێدارەش ببرێن هێشتا هەر کەمە لە پێناوی بەرگری کردندا لە ئایینی ئیسلام. چونکە ئەو پەیامانە بەلای کەمەوە سەرسەختترین کەسی ملنەدەر لە "کوفری موتڵەق" و "هەڵگەڕانەوە لە ئایین" دەرباز دەکەن و، دەیانخەنە ناو کوفرێکی گومان لێ کراوەوە و، سنوورێك بۆ دەستدرێژیی چاونەترسانە و سنوورشکاندنی سەرسەختانەی ئەوان دادەنێن.

لە کۆتایی بەرگرییەکانی بەردەم دادگامدا ئەم ڕستەیەی خوارەوەم دا بە ڕوویاندا، تاکو ڕایبگەیەنین ئێمە تا کۆتایی هەر دامەزراو دەبین:

(سەرمان بە فیدای ئەو ڕاستییە قودسییەی کە سەری ملیۆنان پاڵەوانی لە پێناودا بەخت بووە).

کەواتە هەرگیز لەم دەعوایەمان واز ناهێنین و، هیواداریشین هیچ کەس لە ئێوە وازی لێ نەهێنێت. چونکە مادەم تا ئێستا ئارامی و خۆڕاگریتان نواندووە، ئەوا لەمەولاش با خۆڕاگری و سەبر و ئارامتان هەر بەردەوام بێت و، هێشتا ئەرکی سەرشان و بەشی ڕۆزیی ئێرەمان کۆتاییان پێ نەهاتووە. پشت بەخوا هیچ دژە بزووتنەوەیەکی سەرسەخت بەرامبەر پەیامەکانی نوور و لە پێناوی بەرگری کردندا لە ڕێبازی ئیعدامی هەمیشەیی و زیندانی تاکەکەسیدا دروست نابێت کە پەیامی "بەری درەختی ئیمان" بە

(١) مەبەست مستەفا کەماله. (وەرگێڕ)

چەندین بەڵگـەی گومـانبڕی ئینکـاری نـەکراو چەسـپاندوویانە. بـەڵکو هـەوڵ بـۆ: دۆزینەوەی هۆکاری سوڵح و ئاشتی، یان واز لـێ هێنان، دەدرێت.

الصبر مفتاح الفرج والسرور.

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەوانـەی کـە ئازارمـان دەدەن، دەستیان لــە هــەموو هۆکارەکـانی ژیـان و جوانیـی شارستانێتی و چێژ و لەزەتەکانی دنیا گیرکردووە و، ئنجا ئێمە بەوە تۆمـەتبار دەکـەن کـە بایەخ بەو جۆرە ژیانە نادەین! تەنانەت دەشیانەوێت لەسەر ئەمـە بـە ئیعدام یـان بـە چـەند سزایەکی سەختی بەندکردن سزامان بدەن. کەچی هیچ بڕوبیانوویەکی یاسایییان بۆ ئەم ئامانجە دەست ناکەوێت.

بەڵام ئێمە دەستمان لەو مردنە گیرکردووە کە پەردەیەکە بەسـەر ڕووی ژیـانی بـاقی و هەمیشــەییدا دادراوەتــەوە و، بــە هــەموو هێزێکمانــەوە بـۆ ڕزگـار کردنـی ئــەوان لــە ئاکامەکانی بەرپرسیاریی ڕاستەقینە و فـەرمان دەرچـوون لـە دژیـان و دەربازکردنیـان لـە ئیعدامی هەتاهەتایی و زینـدانـی تاکـە کەسیی بـەردەوام، هـەوڵ دەدەیـن! تەنانـەت ئەگـەر بەهۆی ئەو نامە و پەیامە بەهێزانەوە کە ڕەوانەی ئەنقەرە کراون، توندترین و سـەختترین سزام لەسەر دەربکرێت، ئەوا "دڵ" و "دەروون"م بـەو سـزا سـەختانە ڕازیـن، ئەگـەر ئـەو کەسـانەی کـە ئـەو بڕیارانـەم لەسـەر دەردەکـەن - بـەهۆی ئـەو پەیامانـەوە - خۆیــان لــە ئیعدامی مردن ڕزگار بکەن.

بـەو واتایـەی کـە ئێمـە لـە هـەردوو جیـهاندا ژیـان و هۆکارەکـانی ژیانمـان بـۆ ئــەوان دەوێت. بەڵام ئەوان دەیانەوێت لەناومان بەرن و بۆ ئەمەش دەست لە چەند بڕوبیانوویـەك گیر دەکەن.

بەڵام ڕاستیی ئاشکرا و خۆرئاسای ئەو مردنەی کە وەکو ڕۆژی ڕوونـاك دەبیـنرێت و ڕۆژانە تەرمی سی هـەزار مـرۆڤ تەسـدیقی دەکـات، سـی هـەزار ئیعدامـی هەمیشـەیی و سیهەزار زیندانی تاکەکەسی پێشچاوی گومڕایان دەخات.

ئێمە هەرگیز لە بەردەم ئەواندا شکستمان پێ نایەت و، چی دەکەن با بیکەن. وا دوازدە ساڵە ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَإِنَّ حِزْبَ اللهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾ (المائدة:٥٦) مژدەی سەرکەوتنمان بەسەر ئەواندا پێ دەدات.

جا مادەم ئەمە بەم جۆرەیە، ئەوا لەمەولا بە دادگایش و بە خەڵکیش دەڵێین:

ئێمە بۆ ڕزگارکردنی خۆمان لە ئیعدامی هەمیشەیی ئەو مردنە تێدەکۆشین کە لەبەر چاوماندایە و بۆمان دەڕوانێت. هەروەها هەوڵ دەدەین خۆمان لە زیندانی تاریکی تاکەکەسی و بەردەوامی ئەو گۆڕە دەرباز بکەین کە بانگمان دەکات و دەرگاکانی لێ خستووینەتە سەر پشت و دەمانخاتە ناو خۆیەوە. هەروەها یارمەتیی ئێوەش دەدەین کە خۆتان لەو موسیبەتە ڕزگار بکەن کە هیچ چارەیەکتان لە ئاستیدا نییە.

بیشزانن کە گرنگترین کێشە و مەسەلەی سیاسی و دنیایی لە پێش‌چاوی ئێوەدا، بایەخێکی یەکجار کەمی هەیە لە پێش‌چاوی ئێمە و لە پێش‌چاوی حەقیقەتیشدا، تەنانەت هەر هیچ نرخ و بەهایەکی نییە لای ئەو کەسانەی کە ئەو ئەرکانەیان پێ نەسپێرراوە و هەرگیز مایەی بایەخی ئەوان نین. بەڵام ئەو کارمەندییە مرۆییە پێویستەی ئێمە سەرقاڵین پێیەوە پەیوەندیی بە هەموو کەسێکەوە لە هەموو کاتێکدا هەیە.

جا ئەو کەسانەی حەزیان لەم کارمەندی و ئەرکی سەرشانەی ئێمە نییە و هەوڵی لابردنی دەدەن، دەبێ لە پێشدا "مردن" نەهێڵن و دەرگای "گۆڕ"یش دابخەن!

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

یەکێك لە دەرکەوتنەکانی چاودێریی پەروەردگار لەوەدا بوو کە وەزیری پەروەردە ڕق و قین و تووڕەیی خۆی پێ ڕشتین و پێش ئەوەی بەرگرییەکانمان ببینێت و لە ئەوراق و نووسینەکانمان بکۆڵێتەوە هێرشی سەختی کردە سەرمان، کە ئەمەش لە هەست و شعوورێکی شاراوەی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو.

جا لە کاتێکدا کە ئێمە چاوەڕوانی ئـەوە بوویـن، بـەپێی گـەورەیی کێشـەکەمان و لـە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئاستە هەرە بەرزەکانی دەوڵەت لـە پەیامـە نهێنی‌یـە تایبەتی‌یـەکانمان چەشنی "تیشکی پێنجەم" و "پاشکۆی شـەش هێرشـەکان" و ئەو بەرگری‌یانـەم کە بـە توندوتیژی دادەبەزێتە سەر کوفری ڕەها و بەوپەڕی ئازایـەتی زللـەیان تێ دەسـرەوێنێت، لـەو کاتـەدا کـە لـە ئـەنجامی ئەمـەوە چـاوەڕوانی هەڵوێسـتی توندوتیـژی ئەنقـەرە بوویـن بەرامبەرمان، کـەچی ئـەو لایەنـە ڕەسمی‌یـە بەرزانـەی ئەنقـەرە هەڵوێسـتی نـەرمیان نوانـد، تەنانەت بە شێوەیەك کە شێوازی ئاشتیخوازانەی لەخۆ گرتبوو.

یەکێك لـە حیکمەتـەکانی دەرکـەوتنی ئـەم چاودێری‌یـەی پـەروەردگار بریتی‌یـە لـە خوێندنـەوەی پەیامـەکانی نـوور بـە شـێوەیەکی گشـتی لـە هـەموو شـوێنێکی وڵاتـدا و لـە ناوەندە بڵندەکانی دەوڵەتیشدا بە وردی و شـەوق و تاسـەمەندی‌یەوە. چونکـە بێ گومـان خوێندنەوەی وانەیەکی بەرزی وەك ئەم پەیامانە و بـە تایبـەت لـەم ڕۆژگـارەدا و لـە چـەند کۆمەڵگایـەکی فـراوان و چـەند فەرمانگەیـەکی بـەرز و گشـتیدا، چاودێری‌یـەکی پەروەردگارە و نیشانەیەکی بەهێزیشـە لەسـەر زاڵبـوون و سـەرکەوتنی پەیامـەکانی نـوور بەسەر کوفری موتڵەقدا.

برایانم!

لەوانەیە بەشێك لەو خێراندارانەی دەرامەتیان کەمە، بەهانە بۆ خۆیـان بدۆزنـەوە کـە لە مـەیدانی کـاری پەیامـەکانی نـوور بکشـێنە دواوە و دوور بکەونـەوە، تەنانـەت لـە ژێـر پاڵەپەستۆی ئـەم توندوتیـژی و تـەنگ پێ‌هـەڵچنین و زیانانـەی تووشـیان بـووە، واز لـە پەیامەکانی نوور بهێنن.

جا لەو کاتەدا کە بیرم لەم گومانە گریمانکراوە دەکردەوە، لـە بەندیخانـە بـەربووین و، دوای بەربوونەکەشمان ئەم بۆچوونەم گۆڕا و، ئێستا دەڵێم:

کەسێك لە پێناوی پاراستنی ئـەم کەرەسـە بـەنرخ وبەهایـەدا هـەموو شتێکی بـەنرخ و گرانی ماددی و مەعنەویی بەخشیبێت و چەندین جۆری ئەشکەنجە و ئازاری لەو ڕێ‌یـەدا تووش بوویێت، گەر دوای ئەمـە وازی لـێ بـهێنێت، زیـانێکی گەلـێ ئاشـکرا دەکـات. چونکە ئەگەر کەسێك واز لە بەشەکانی پەیامەکانی نوور بـهێنێت و لـەو شتانە دابـبڕێت

کە پەیوەندیی لەگەڵیاندا هەیە و دەست لە پارێزگاری کردنمان هەڵبگرێت و یارمەتیمان نەدات و بە تەواوەتی دەستبەرداری ئەم خزمەتە ببێت، ئەوا بێ گومان زیانێکی نابەجێ تووشی خۆی و ئەم خزمەتەش دەکات. لەبەر ئەوە، دەبێ هیچ شتێك بە: وەفا و پەیوەندی و خزمەتی ئیمان و حەزەر و خۆپاراستن، نەگۆڕینەوە.

* * *

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

یەکێك لە دەرکەوتنەوەکانی چاودێریی پەروەردگار و پارێزگاریی خواوەند لەوەدا بوو کە خەبیرەکانی ئەنقەرە لە بەردەم ڕاستییەکانی پەیامەکانی نووردا شکستیان هێنا! خۆ هەرچەندە گەلێ هۆکاری زۆر هەن بۆ ئیعتیراز و ڕەخنەگرتنیان لەو پەیامانە، بەڵام -وەك بیستوومە- بڕیاری بێ تاوانی و بەرائەتی پەیامەکانی نووریان دەرکردووە.

جا لە کاتێکدا کە چەندین دەستەواژەی توند و تیژ لە پەیامە نهێنی و تایبەتییەکاندا بەرچاو دەکەون و.. بەرگرییەکانیشمان چەندین تەحەددای وایان تێدایە کە یەخەیان پێ دەگرێت و.. لەو لاشەوە هێرشە توندوتیژەکەی وەزیری پەروەردە لە ئارادایە و.. دوو ئەندامی سەر بە وەزارەتی پەروەردەش لە دەستەی خەبیرەکاندان و بە فەلسەفەی ماددی پەروەردە بوون و.. زانایەکی گەورەش لەناو لیژنەکەدایە و پشتی ئالوگۆڕە نوێکان دەگرێت و.. ماوەی سالێکیشە ڕێکخراوێکی پەنهان و پشت پەردەی زەندیقەکان حیزبی گەلی کۆماری و وەزارەتی پەروەردە لە دژمان دەورووژێنێت..

کاتێ کە ئێمە لەبەر ئەم هۆکارە ناوبراوانە چاوەڕوانی ئەوە بووین دەستەی خەبیرەکان ڕەخنەی توندوتیژ و تۆمەتی گەورەی ئەوتۆمان ئاراستە بکەن کە بەهۆیانەوە سەخت و قورسترین سزامان لەسەر دەربکرێت، کەچی پارێزگاریی خواوەند و چاودێریی میهرەبانییەکەی هاتن بە هانامانەوە و، پلەوپایەی بەرزی پەیامەکانی نووریان بۆ ئەوان دەرخست و لە ڕەخنەی توندوتیژ لایدان. تەنانەت بۆ ئەوەی ئێمە لە سزاکان ڕزگار بکەن و چاوپۆشی بکرێت لەوەی کە من تاوانبارێکی سیاسی بم و پێشینەم لە کێشەی ئەسکی شەهر و ڕووداوی بەناوبانگی (٣١ی مارت)دا هەبێت و، بۆ ئەوەی دەربکەوێت کە ئێمە تەنها کار بۆ ئایین و بیروباوەڕ دەکەین و، دەری بخەن کە هیچ پلانێکی سیاسی لە کارەکەماندا نییە، وتوویانە:

(سەعیدی نوورسی لە مێژە ئیددیعای میراتگری پێغەمبەر ﷺ دەكات و، لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا شێوەی موجەددید دەگرێتەخۆ، واتە هەندێ جار وەكو كەسێك حاڵ و جەزبەی ڕۆحیی لێهاتبێت ڕەفتار دەكات)!

جا ئەم برگەیە، یەكێكە لە دەستەواژە فەلسەفیيە مولحیدەكان و، ئەوە دەگەیەنێت كە هەركەسێك كار بۆ ئایین بكات ئەوا بە میراتگری نبووەت كار بۆ تەجدید دەكات!

ئەم دەستەواژە فەلسەفیيە مولحیدانەیەشیان بۆ ڕەخنەگرتن بەكار هێناوە لەو خۆش باوەڕیيە زیاد لە پێویستەی كە لە دڵی هەندێ لە برایانماندا هەیە و، مەستی و جەزبەی ڕۆحیشیان بۆ ئەوە داوەتە پاڵ من لە دەمی قسە توندوتیژەكاندا تاكو لە سیاسەت تەبریەم بكەن و نەهێڵن سزام لەسەر دەربكرێت. جگە لەوەی كە ویستوویانە بە جۆرە نەرمونیانی و خاترگرتنێك توندوتیژیی نەیار و دوژمنانمان كەم و تەنك بكەنەوە و، لە هەمان كاتدا خۆپەرستی و حەز لە پلە و پایە و ویستنی سوود و بەرژەوەندی لە مندا بشكێنن كە پێیان وابووە منیش، وەك خەڵكی، ئەو سیفەتانەم تێدا بێت!

بەڵام خۆ پەیامەكانی نوور هەر لە سەرەتاوە هەتا كۆتایی وەڵامێكی ڕوون و ئاشكرای وەك خۆری ڕووناكن بەرامبەر بەو دەستەواژەیە و هەموو واتایەك دەسڕنەوە كە بۆنی شتی وای لێ بێت و، دەری دەخەن كە ڕێبازی ئێمە وازهێنانە لە غروور و خۆپەرستی و پابەندبوونە بە برایەتییەوە. كەواتە ئێمە هیچ شەتەحاتێكمان نییە كە غروور بگەیەنێت. جگە لەوەی كە ژیانی سەعیدی نوێ لە پەیامەكانی نووردا بریتییە لە خۆ زەلیلكردن بۆ خوای گەورە و ڕاستكردنەوەی خۆش باوەڕیی لەڕادەبەدەری برایانی بە چەندین دەرس و ڕێنمایی دووپاتبووی یەك لە دوای یەك، بێ ئەوەی چاودێریی هەستی كەسیان بكات. كە ئەمەش هەموو ئەو واتایانە دەسڕێتەوە كە لەو دەستەواژەیەوە بۆن بكرێت.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئێستا ئەو بڕیارەتان بۆ نانێرم كە دەستەی خەبیرەكان یەكیان گرتووە لەسەری، تاكو هەواڵدەر و نووسەرەكە زیانیان پێ نەگات.

ئەم دەستەیەی دوایی بە هەموو توانایەکیەوە هەوڵی داوە کە دەربازمان بکات و لە شەڕ و زیانی ئەهلی بیدعەت و گومڕایی بمانپارێزێت، چونکە هەستیان بە بەرپرسێتی لە بەردەم ئەو پەیامانەی نووردا کردووە کە چاوڕۆشنی و ڕێنمایییان لێ وەرگرتووە و، بە یەکدەنگی بڕیاری بێتاوانی و بەرائەتی ئێمەیان داوە لە سەرجەمی ئەو تۆمەتانەی دراونەتە پاڵمان و، وتوویانە: زۆربەی پەیامەکان بە شێوازێکی زانستی و ئیمانی نووسراون و، "سەعید"یش بە جۆرێکی خاوێن و بێگەرد ئەو شتانە ڕوون دەکاتەوە کە قەناعەتی پێیان هەیە و، هێز و تواناکەشی هی ئەوە نییە کە -وەك دراوەتە پاڵی- تەریقەتی سۆفی یان کۆمەڵێکی پێکهێنابێت و ڕووبەڕووی حکوومەت وەستا بێتەوە، بەڵکو هێز و تواناکەی تەنها بۆ ڕاگەیاندنی ڕاستییەکانی قورئانە بەو کەسانەی کە موحتاجن بەو ڕاستییانە.

هەروەها لە بارەی ئەو پەیامە پەنهان و تایبەتییانەی کە بە "نازانستی" لە قەڵەم دراون، وتوویانە: (هەندێ جار جەزبەی ڕۆحی دەیگرێت و دووچاری هەڵچوونی هەست و شعوور و تەپاوتلی ڕۆحی دەبێت و پێویستە بەهۆی ئەم نووسینانەیەوە هیچ بەرپرسییەکی نەخرێتە ئەستۆ). ئەم تێگەیشتنە لە بڕیارەکەیان وەردەگیرێت.

هەروەها وتوویانە: بە دەستەواژەی: "سەعیدی کۆن" و "سەعیدی نوێ"دا دەردەکەوێت کە دوو کەسایەتی هەیە و، دووهەمەکەشیان هێزێکی ئیمانیی دەراسا و زانستی ڕاستییەکانی قورئانی لەخۆ گرتووە.

هەروەها بۆ چاودێری کردنی هەست و نەستی شوێنکەوتووانی فەلسەفەی ماددی وتوویانە: (لەوانەیە دووچاری جەزبەی ڕۆحی ببێت و ناتەواوی لە مێشکیدا ببێت). ئەمەشیان لە پێناوی ڕزگارکردنی ئێمەدا وتووە لە ئۆباڵی ئەو دەستەواژە توندوتیژانەی کە لە پەیامە نهێنییە تایبەتییەکاندان و، بۆ ئەوەش هەست و نەستی نەیارەکانمان هێور بکەنەوە. هەروەها لە ناوەندی ئەم هەست و نەستەدا وتوویانە: (لەوانەیە تووشی تێکچوونێکی عەقلیی لەو جۆرە بووبێت کە خەیاڵ بە واقیع دەبینێت)!

ئەو شتەی کە ئەم گریمانەیان لە بناغەدا پووچەڵ دەکاتەوە و وەڵامی تێر و تەسەلی دەداتەوە ئەو پەیامانەی نوورە کە دەستی خۆیان کەوتوون و پێشی هەموو عەقڵ و

ژیریەکیان داوەتەوە و پەیامی "بەرگری" و "بەری درەختی ئیمان"ە کە هەموو پارێزەرەکانی دادگای دووچاری سەرسامی و ڕێز و سەرسووڕمان کرد.

من سوپاسی زۆرم پێشکەشی خوای گەورە دەکەم کە بەم گریمانەی ئەوان ئەوەی پێ بەخشیم کە فەرموودەیەکی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە.

پاشان خەبیرەکان بە یەکدەنگ بڕیاریان لەسەر تەبریەبوونی خۆم و هەموو برایانم لە هەموو تۆمەتەکان دەرکردووە و، وتوویانە: (ئەو قوتابیانە بەهۆی دانراوە زانستیەوردەکانی سەعیدەوە پەیوەندیان پێوە کردووە تاکو ئیمان و دواڕۆژی خۆیان ڕزگار بکەن و، هیچ نیشانەیەك یان شتێکی ڕاشکاومان نە لە نامەکانی نێوانیان و نە لە کتێبەکانیاندا نەدۆزیوەتەوە کە ئاماژە بۆ ئەوە بکات نیازیان لە بەرامبەر حکوومەتەوە خراپ بێت).

بڕیارەکەش سێ کەس ئیمزایان کردووە یەکێکیان: نەجاتی(فەیلەسووف). یەکێکی تریان: یووسف ضیاء (زانا). ئەوی تریان: یووسف(فەیلەسووف).

ئەمەش تەوافوقێکی جوان و ناسکە، چونکە لەو کاتەدا کە ئێمە سەبارەت بە خۆمان بەندیخانەمان ناونـاوە: "قوتابخانەی یووسفی" و، پەیامی "بەری درەختی ئیمان"یش بەروبوومی ئەم قوتابخانەیە.. لەم کاتەدا ئەو دوو "یووسف" ناوە بە زمانی حاڵ وتیان: ئێمەش بەشێکی نادیارمان لە وانەکانی ئەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا هەیە!

بەڵگەی جوانیشیان لەسەر کێش و جەزبەی ڕۆحی، دەستەواژەی: "وتەی سی و سێ‌هەم" و "مەکتووبی سی و سێ‌هەم" و "سی و سێ پەنجەرە" و دەستەواژەکانی هاوچەشنیانە! هەروەها ئەوەیە کە وتوویانە: (گوێی لە تەسبیحاتی "یا رحیم، یا رحیم"ی پشیلەکانە و، خۆی بە کێلی گۆڕ دادەنێت)!

ئیتر ئەم دەستەواژانەیان وەك بەڵگەیەك پێش‌چاو خستووە لەسەر جەزبە و بینینی خەیاڵ لە شێوەی واقیعدا!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

مادەم ئێمە لە ژێر چاودێریی پەروەردگاردایین، وەك چەندین نیشانەی زۆر ئاماژەی بۆ دەکەن و.. مادەم پەیامەکانی نووریش لە بەرامبەر چەندین دوژمنی ستەمکاری زۆر و زەبەندەوە شکستیان نەهێناوە و، تا ڕادەیەکیش وەزیری پەروەردە و حیزبی گەلی کۆماری‌یان دەمکوت و بێ‌دەنگ کردووە و.. مادەم ئەو کەسانەش کێشەکەی ئێمەیان هێندە بە گەورە پیشان دا کە حکوومەتیان دووچاری دڵەتەپێ و نیگەرانی کرد، لەمەولا بە هەموو هۆکارێك هەوڵی شاردنەوەی بوختان و درۆ و دەلەسەکانیان دەدەن.. ئەوا دەبێ ئێمە دان بەخۆدا بگرین و، خۆپاراستن و حەزەر ئەنجام بدەین و، ملکەچیی تەواو بۆ فەرمانی خوا و دامەزراوی لەسەر خزمەت دەربڕین و، خۆمان دووچاری دڵشکاوی و نائومێدی نەکەین و، لە بەردەم زریانە کاتی و فانی‌یەکاندا لەرزەمان پێ نەکەوێت.

بەڵێ، ئەو دڵشکاوی و ئومێدبڕاوی‌یەی کە هێزی مەعنەوی و ورەی ئەهلی دنیا دەشکێنێت، سەبارەت بە قوتابیانی پەیامەکانی نوورەوە، کە لە ژێر کۆڵی سەختی تەنگانە و موجاهەدەکاندا سۆز و نەرمونیانیی چاودێری و میهرەبانیی خوای گەورە دەبینن، دەبێت بە هاندەری کار و کۆشش و لێبڕان.

چل ساڵ پێش ئێستا سیاسەتمەدارانی ئەهلی دنیا شێتی‌یەکی کاتی‌یان دایە پاڵم و خستیانمە خەستەخانەی شێتانەوە! منیش پێم وتن: ئەو شتەی کە ئێوە بە کارێکی ژیرانەی دەبینن من بە پێچەوانەی ژیریی دەبینم. بۆیە خۆم لەم جۆرە شتانە تەبەڕڕا دەکەم و، پێم وایە ئەم قاعیدە و دەستوورە ئێوەشی گرتووەتەوە، چونکە:

وکل النـــاس مجنـــون، ولكـــن          على قدر الهوى اختلف الجنون!

ئێستا هەمان قسە بەو کەسانەش دەڵێمەوە کە بە نیازی ڕزگارکردنی خۆم و برایانم لە بەرپرسی‌یەکی گەورە شێتی‌یەکی کاتی‌یان داوەتە پاڵم! وەك بڵێی لە ڕووی پەیامە نهێنی و تایبەتەکانەوە جۆرە شێتی‌یەك سەرم تێ بکات. بەڵێ، هەمان قسەم دووپات دەکەمەوە. لەگەڵ دەرخستنی ڕەزامەندیم لە شێتی، لە دوو ڕووەوە:

یەکەم: لە واتای فەرموودەیەکی پیرۆزدا هـاتووە کـە: هـەندێك لەوانـەی ئیمانیـان لـە هی هەموو کەسێك کاملترە، خەلکی بە شێتی دادەنێن[1].

دووهەم: من نەك هەر بەوە ڕازیم کە تەنها شـێتیم بدرێتـە پـاڵ، بـەڵکو ئامـادەم عـەقڵی کـامڵ و سـەرجەمی ژیـانم بەوپـەڕی شـانازی‌یەوە لـە پێنـاوی ڕزگـارکردنی برایـانم و سەلامەتی و ڕزگاربوونیان لە تاریکایی‌یەکانی ئەم بەندیخانەیە بەخت بکەم.

ئەگەر پێتان باش بوو نامەی سوپاس بۆ ئەو سێ زاتە بنووسرێت و پێیـان ڕابگەیـەنرێت کە ئێمە لـە دەسکەوتە مەعنەوی‌یـەکانماندا دەیانکـەین بـە بەشـداری خۆمـان، ئـەوا بۆیـان بنووسن.

* * *

برایانی بەوەفا و ڕاست و هاوڕێ و دڵسۆزم لە خزمەتگوزاریی قورئان و ئیماندا!

بـە بۆنـەی نزیـك بوونـەوەی وادەی دوورکەوتنـەوە و جیابوونـەوەمان لـە یـەکتری، دەبێ لە قسووری یەکتر خۆش بین و بە تەواوی چاو لەو بێزاری و گوناهانـە بپۆشـین کـە لە ئەنجامی هەڵچوون و تووڕەبوونەوە سەریان هەڵدا و نەیانهێشت بە تەواوی پارێزگاریی دەستوورەکانی ئیخلاس بکرێن. چونکە برایـەتیی نێـوان ئێـوە لـە هـی پشـت و نەسـەب بەهێزترە و، بـرا لـە قسـووری بـرای خـۆی دەبوورێـت و ئـەو قسـوورەی ئـەوی لـەبیر دەچێتەوە و چاوی لـێ دەپۆشێت.

مـن لـێرەدا جیـاوازیی ڕا و بۆچـوون و خۆویسـتی‌تان دەخەمـە ئەسـتۆی "نەفسـی ئەممارە"تانەوە و بە شیاوی قوتابیانی نووری نازانم و، بـە جـۆرە خۆویستی‌یەکی "کـاتیی" دادەنێم کە تەنانەت لەو ئەولیا و پیاوچاکانەشدا هەیە کە "نەفسی ئەممارە"یان بەسـەریاندا زاڵە.

دەسا برایـانم! گومـانی باشـم پێتانـە، بـە عینـادی و سەرسـەختی لـەو گومانـە باشـەم نائومێدم مەکەن، دەست لە ملی یەکتر بکەن و ئاشت ببنەوە.

* * *

---

(١) گەلێ ڕیوایەت لەم واتایادا هەیە. بۆ نموونە: (أکثروا ذکر الله حتی یقولوا: مجنـــون).رواه أحمـــد ٨٦/٣ والبیهقی فی السنن الکبری ١٥٣/٩ والمنذری فی الترغیب والترهیب ٣٩٩/٢ والحاکم فـــــی المســـتدرك ٤٩٩/١.

# تیشکی چواردەهەم

## (بەرگرییەکان)

### پاشماوەیەکی یەکجار کورتی ئیفادەکەم

بۆ دادگای (ئافیوون)ی ڕوون دەکەمەوە:

ئەو ئیفادەیەم کە خستمە پێش چاوی ئێوە و لە بەردەم دادگەریی یاسادا پێشکەشم کرد و، لەمەڕ پشکنینی ماڵەکەم دەدوێ، کە لە سێ ڕووەوە کارێکی نایاسایی بووە و، باس لە گرتن و لێپرسینەوەم دەکات، هەموو ئەو کارە نایاساییانەی کە لەو ئیفادەیەمدا باسم کردوون، دەستدرێژین بۆ سەر ڕێز و حورمەت و دادگەریی سێ دادگا، تەنانەت سووکایەتی کردنیشن بەو دادگایانە. چونکە هەر سێ دادگاکە و هەر سێ دەستەی کارشناسانیش بە وردی پشکنین و لێکۆڵینەوەیان لە سەرجەمی ئەو نووسراوانەم کە لە ماوەی بیست ساڵدا دامناون و ئەو نامانەش کە نووسیومن ئەنجام دا و، بە یەکدەنگی بڕیاری بێ تاوانیی ئێمەیان دەرکرد. لە ئەنجامی ئەم بڕیارانەشەوە هەموو کتێب و نامەکانیان داینەوە.

ئنجا لە دوای تەبریە بوونم و ماوەی سێ ساڵیشە بە دابڕاوی لە خەڵکی و لە ژێر چاودێرییەکی توندوتیژدا دەژیم، بە ڕادەیەك کە مەگەر تەنها نامەیەك کە هیچ زیانێکی لێ ناوەشێتەوە بۆ هەندێ لە هاوڕێیانم بنووسم. واتە پەیوەندیم بە دنیاوە نیمچە پچڕاوە و، تەنانەت سەرباری ڕێ پێدانیش نەڕۆشتوومەتەوە بۆ ناو نیشتمانەکەی خۆم.

ئێستاش نوێ کردنەوەی هەمان کێشـە بە شـێوەیەك کە گـوێ نەدانی پێـوە دیـارە بـە بڕیـاری دادگەرانەی ئەو سـێ دادگایەی ئاماژەم پێ دان، لـە ڕاسـتیدا سـوو کایەتی پێکـردن و شکاندنی شان و شکۆی ئەو دادگایانەیە.

جا لەبەر پارێزگاری کردن لە ڕێـزی ئەو سێ دادگایـەی کـە دادگـەرییان لەگـەڵدا نواندم، تکا لە دادگاکەتان دەکەم کە بۆ تاوانبار کردنم بـە دوای کێشـەیەکی تـری جگـە لەوەی پێشوودا بگـەڕێت. واتـە جگـە لـە کێشـەکانی: (پەیامـەکانی نـوور و، پێکـهێنانی کۆمەڵەیەك و، دامەزراندنی تەریقەتێکی سۆفی و، گریمانی تێکدانی ڕێسا و ئاسایش).

مـن کەمتەرخـەمی و گوناهـەکانم گەلـێ زۆرن، بۆیـە بڕیـارم دا کـە بـەو ئەندازەیـەی پەیوەندیی بـە ئـەرك و بەرپرسێتیی خۆمـەوە ببێـت یارمـەتیتان بـدەم. چونکـە لـە دەرەوەی بەندیخانە زۆر زیاتر لەناو بەندیخانە ئەشکەنجەم چەشتووە، بە ڕادەیەك وام لـێ هـاتووە کـە ئێستا ناو "گۆڕ" یان ناو "بەندیخانە" بە شوێنی حەوانەوەم دەزانم. بە ڕاستی لـە ژیـان بێزار بووم! دەسا با ئیتر سوو کایەتی پێکردن و ئازاردان و چاودێری کردنم بەس بێت، کـە وەك زیندانی تاکە کەسی وایە و بیست ساڵی ڕەبەقە من پێوەی گیرۆدە کراوم. کـار هێنـدە لـە سنووری خۆی ترازاوە کە نزیکـە غـیرەتی خـوای گـەورە بجۆشێنێ، ئەو کاتـەش مەگـەر خـوای گـەورە هـەر خـۆی بزانێـت کـە ئـەم وڵاتـە چ زیـانێك دەکـات. وا مــن بێدارتـان دەکەمەوە.

مەزنترین و بەهێزترین دالدە و پشت و پەنامان بریتییە لە:

﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيلُ﴾.

﴿حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هُو عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظيم﴾.

* * *

# (بەرپەرچدانەوەی لائیحەی ئیددیعاء)

بسم الله الرحمن الرحیم

وبە نستعین

**دوای بێدەنگییەك كە هەژدە ساڵی خایاند، وا بۆ مەبەستی بەرپەرچدانەوەی لائیحەی ئیددیعاء ناچار بووم كە ئەم داوایەم پێشكەش بكەم، هەرچەندەش پێشكەشی دادگا و وێنەیەكیشیم پێشكەشی بەرپرسە بەرزەكانی ئەنقەرە كردووە.**

ئەمەی خوارەوە پوختەی كورتە بەرگرییەكە، كە خۆی لە خۆیدا عەینی حەقیقەتە و، بەو داواكارە گشتی و ئەفسەرە پۆلیسانەم وتووە كە سێ جار لە "قەستەمۆنی" هاتن بۆ پشكنینی ماڵەكەم. هەروەك بە بەڕێوەبەری پۆلیس و هەندێ لە پۆلیسەكان - لە جاری سێهەمدا - و بە دادگای "دەنیزلی" و "ئافیوون"یشم وتووە.

جا ئێوەش بزانن كە بە هەموو ئەوانەم وتووە:

ماوەی بیست ساڵە من بە گۆشەگیری دەژیم، بۆ نموونە بە درێژایی هەشت ساڵی ڕەبەق لە شاری "قەستەمۆنی" بەرامبەر پاسگای پۆلیس مامەوە و، لە شوێنەكانی تریش بە هەمان شێوە. لە درێژایی ئەم ماوەیەدا لە ژێر چاودێریی بەردەوامدا بووم. هەروەك چەندین جار ماڵیان پشكنیوم، سەرباری هەموو ئەمانەش هیچ نیشانەیەكیان دەست نەكەوت كە ئاماژە بۆ ئەوە بكات پەیوەندیمان بە دنیا و سیاسەتەوە هەبێت. خۆ ئەگەر هەر چەشنە پەیوەندییەكی لەو جۆرەم ببوایە ئەوا پۆلیس و دادگا دەیانزانی، یان زانیویانە و گوێیان پێ نەداوە، واتە لەم حاڵەدا ئەوان لەچاو من زیاتر بەرپرسیارن!

جا مادەم ئەم كێشەیە بەم جۆرەیە، ئەوا بۆچی تا ئەم ڕادەیە و بێ هیچ پێویستییەكیش و بە چەشنێ زیان لە وڵات و هاووڵاتیان بدات دەستدرێژی دەكەنە سەرم؟ لە كاتێكدا كە

هیچ شوێنێك لە دنیادا نی‌یە كاری بەسەر كەسانی گۆشەگیر و سەرقاڵبوو بە دواڕۆژی خۆیانەوە ببێت!

ئێمەی قوتابیانی نوور بڕیارمان داوە كە هەرگیز پەیامەكانی نوور نەكەین بە ئامراز بۆ هیچ تەوژمێكی ڕامیاری، تەنانەت بۆ سەرانسەری دنیاش بە گشتی. جگە لەوەی كە قورئانی پیرۆزیش بە توندی ڕێی سەرقاڵ بوونمان بە سیاسەت لێ دەگرێت.

بەڵێ، ئەركی بنەڕەتیی سەرشانی پەیامەكانی نوور: خزمەتكردنی قورئانی پیرۆز و، وەستانی مەردانە و بەجەرگانەیە لە ڕووی كوفری ڕەهادا، كە ژیانی هەتاهەتایی مرۆڤ لەناو دەبات و خودی ژیانی دنیاش دەكات بە ژەهرێكی تاڵ و دۆزەخێكی لە توانای مرۆڤ بەدەر.

ڕێبازیشی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەركەی سەرشانی دەرخستنی ڕاستی‌یە خاوێنەكانی ئیمانە كە ئەو بەڵگە گومان بڕ و بەهێزانە پشتیان دەگرێت سەرسەخت ترین فەیلەسووف و مولحید ناچاری تەسلیم بوون دەكەن بە ئیمان، هەر بۆیە ئێمە مافی ئەوەمان نی‌یە پەیامەكانی نوور بكەین بە ئامراز و داردەستمان بۆ هیچ شتێك، لەبەر چەند هۆیەك:

یەكەم: تاكو ڕاستی‌یەكانی قورئان، كە نرخیان لە هی ئەڵماس زیاترە، لە پێش چاوی بێ ئاگایاندا دانەبەزێنرێنە ئاستی وردە شووشە شكاوەكان. چونكە ئەگەر بێت و ئەو ڕاستی‌یانە بكرێن بە ئامراز و داردەست بۆ هەر شتێك، ئەوا گومرایان پێیان وا دەبێت كە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستی‌یانە پڕوپاگەندەی سیاسین و خزمەتی چەند ئامانجێكی دیاریكراو دەكەن. هەروەها لەبەر ئەوەی سووكایەتی نەكەین بەو واتا بەنرخانەی قورئانی پیرۆز.

دووهەم: ڕێبازی پەیامەكانی نوور كە بریتی‌یە لە: شەفەقەت و دادگەری و حەق و ڕاستی، بە توندی ڕێی ئەوەمان لێ دەگرێت كە خۆمان لە كاروباری سیاسی و دەستەڵاتی فەرمانڕەوادا هەڵبقورتێنین. چونكە ئەگەر هەندێ كەسیان تێدا بێت كە گرفتاری ئیلحاد بووبێتن و لەو ڕێیەوە شایانی سزا بن، ئەوا لە پشتی هەر یەكێكیانەوە كۆمەڵێك منداڵ و نەخۆش و پیری بێ تاوان هەیە و، گەر هەر كارەسات و گیروگرفتێك بێتە ڕێی هەر كام لەوانەی كە شایانی سزان، ئەوا ئەو بێ تاوانانەش، بەبێ هیچ گوناهێك، بەو ئاگرەی ئەوان دەسووتێن!

هەروەها لەبەر ئەوەی هاتنەدیی ئەو ئامانج و مەبەستەش جێی گومانە، ئەوا بە توندی رێی ئەوەمان نەدراوە کە دەست بخەینە ناو کاروباری ئیدارییەوە و لە رێی هۆکارە سیاسییەکانەوە ئاسایش و رێسای وڵات تێك بدەین.

سێهەم: لە کات و ساتێکی سەیری وەك ئەم زەمەنەی ئێمەدا دەبێ پێنج بنەما جێبەجێ بکرێن تاکو بتوانرێت وڵات و ژیانی کۆمەڵایەتیی رۆڵەکانی لە بەربادی و دابەش بوون بپارێزرێت. ئەو پێنج بنەمایەش ئەمانەن:

١ – رێز گۆڕینەوەی چوون یەك.

٢ – شەفەقەت و میهرەبانی.

٣ – دوور کەوتنەوە لە حەرام.

٤ – پارێزگاری کردنی ئاسایش.

٥ – دەست نان بە رووی فەوزا و هات و هەرانانەوە و، لە هەمان کاتدا ملنان بۆ گوێڕایەڵی کردن.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە رێبازی پەیامەکانی نوور هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئەم پێنج بنەمایە دادەمەزرێنێت و کاریان پێ دەکات و رێزیان بۆ دادەنێت و، بەم کارەشی پارێزگاریی بەردی بناغەی ئاسایشی وڵات دەکات، ئەوەیە کە: پەیامەکانی نوور توانیویانە لە ماوەی بیست ساڵدا زیاد لە سەد هەزار کەس بکەن بە ئەندامی سوودبەخش بە وڵات و هاووڵاتییان، بێ ئەوەی هیچ ئازار و زیانێك لە رێی ئەوانەوە بە هیچ کەسێك گەیشتبێت. لەوانەیە هەردوو پارێزگای "ئیسپارتە" و "قەستەمۆنی" باشترین بەڵگە و شایەت بن لەسەر راستیی ئەم قسەیەمان.

جا ئەگەر راستی ئەمە بێت، ئەوا بێ گومان زۆربەی ئەو کەسانەی کە دەستدرێژی بۆ سەر بەشەکانی پەیامەکانی نوور دەکەن، خیانەت و ناپاکی بەرامبەر نیشتمان و نەتەوە و دەستەڵات سالاریی ئیسلام دەردەبڕن و، بە خۆیان بزانن یان نەزانن لە پێناوی نانەوەی ئاژاوە و توندڕەویدا کار دەکەن.

ئەو سەد وسی بەشەی پەیامەکانی نوور کە سەد و سی چاکە و سوودیان پێشکەش بەم وڵاتە کردووە، هەرگیز ئەو زیانە وەهمییانە ناتوانن لەناویان بەرن کە بێئاگایانی کورت بین و کەسانی گومان بزوێن بە خەیاڵیاندا دێت، گوایا لە دوو سێ پەیامدا

ناتەواوی هەبێت. چونکە ئەو کەسەی کە دەیەوێ بەم شوبهە و گومانانە لە شان و شکۆی ئەو پەیامانە کەم بکاتەوە ستەمکارێکی ئاشکرایە.

سەبارەت بە ناتەواوی و گوناهەکانی کەسی بێ بایەخی خۆیشمەوە، ئەوا ناچارم و بە بێ ئەوەی حەزیشی پێ بکەم و پێم خۆش بێت، کە بڵێم:

کەسێك کە بە درێژایی بیست و دوو ساڵ ژیانێکی نامۆیی وەك ژیانی ناو بەندیخانەی تاکە کەسی بە تەنیایی و گۆشەگیری بەسەر بردبێت و لە شێوەی ژیانی خەڵکی دوور بێت و..

لە درێژایی ئەم ماوەیەشدا بە ویستی سەربەستانەی خۆی نە لە بازارەکان و نە لە مزگەوتە گەورەکاندا تێکەڵی کۆمەڵگا نەبووبێت و..

دژوارترینی جۆرەکانی ئازار و گوشاری هێنرابێتە رێ و..

بە پێچەوانەی سەرجەمی رەهەندە کراوانەوە تەنانەت بۆ یەك دانە جاریش سەردانی دام و دەزگاکانی حکوومەتی نەکردبێت و..

یەك دانە رۆژنامەی نەخوێندبێتەوە و گوێی لە خوێندنەوەشی نەگرتبێت، تەنانەت بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر بایەخیشی پێ نەدابێت. باشترین شایەت لەسەر ئەمە: هاورێ و خۆشەویستە نزیکەکانی ماوەی دوو ساڵی "قەستەمۆنی" و حەوت ساڵی شوێنانی تری ئەون..

تەنانەت ئاگای لە رووداوەکانی جەنگی جیهانی نەبووبێت، بەڵکو نەیشیزانیبێت چ لایەنێك لەو جەنگەدا سەرکەوتووە و چ لایەنێکیش شکستی هێناوە و، بایەخی بە هەواڵی سوڵح و رێکەوتن نەدابێت و هەر نەیزانیبێت لایەنەکانی جەنگ کێن و هیچ حەزێکی بۆ زانینی ئەو لایەنانە تێدا نەبووبێت و، هیچ پرسیارێکیشی لەبارەوە نەکردبن و لە ماوەی سێ ساڵدا سێ جار نەبێت گوێی لە رادیۆ نەگرتبێت کە لە نزیکیەوە هەبوو..

ئەو کەسەی لە رێی پەیامەکانی نوورەوە رووبەرووی کوفری رەها بووەتەوە کە کوفرێکە ژیانی هەمیشەیی مرۆڤ لەناو دەبات و ئازارەکانی ژیانی ئەم دنیاش پتر پەرە پێ دەسێنێت و دەیکات بە ئازارێکی چەند جارە. شایەتیشی لەسەر ئەمە سەد هەزار کەسن لەوانەی کە بەهۆی ئەو پەیامانەی نوورەوە، کە لە رێژنەی نووری قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئیمانی خۆیان دەرباز کردووە. ئەو پەیامانەی کە مردن سەبارەت

بە سەد هەزار کەسەوە لەبریی ئیعدامی هەتاهەتایی دەکات بـە نامـەی لـەکار حەوانـەوە و پشوودان..

جا ئایا کەسێکی ئاوا[1] چ یاسایەك هەیە بـوار بـەوە بـدات کـە دەستدرێژی بکرێتـە سەری و لە ژیان نائومێد بکرێت و بخرێتە گریان و خەفەت خواردن، کە ئەم کارەش سەد هەزار کەس لە برایانی دەخاتـە گریانـەوە؟ تەنانـەت هـەر چ بەرژەوەندییـەك لـەم کـارەدا هەیە؟

ئایا لە ژێر ناوی دادگەریدا غەدرێکی بێ وێنە ئەنجام نادەن بەم کارەیان؟

ئایا هەر بەناوی یاساوە دەرچوون نابێت لە یاسا؟

خۆ ئەگـەر ئێـوەش، بـە وێنـەی هـەندێ لـەو کارمەندانـەی کـە لـەم پشـکنینانەدا کـار دەکەن، بڕوبیانووتان ئەوە بێت کە: خۆت و هەندێ لـە پەیامـەکانت پێچەوانـەی ڕژێـم و بنەماکانی ئێمەن..

**ئەوا لـە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:**

یەکەم: ڕژێم و بنەما دروستکراوەکانی ئێوە هەرگیز مافی خۆهەڵقورتاندنی لە شوێنی مانەوەی کەسانی گۆشەنشین و کەنارگیردا نییە.

دووهەم: بەرپەرچدانـەوەی هـەر شتێك جیایە لە وەرنـەگرتنی ئـەو شتە لـە دڵـەوە و، کارپێ نەکردنیشی شتێکی تری تەواو جیاوازە. خۆ کاربەدەستانیش تەنها سەیری ئەوەی ناو دەست دەکەن نەك ئەوەی لەناو دڵدایە. ئنجـا لـە هـەموو شـوێن و وڵاتێکـدا کەسـانی نـەیاری توندوتیـژی حکوومـەت هـەن کـە دەسـت ناخەنـە نـاو کاروبـاری ئاسـایش و بەڕێوەبردنەوە. تەنانەت لە سەردەمی حـەزرەتی عومەریشـدا - خـوای لـێ ڕازی بێـت - هیچ کارێکیان بەسەر گاورەکانەوە نـەبوو، هەرچـەندەش ئینکـاریی ئیسـلام و یاسـاکانی شەریعەتیان دەکرد.

جا لەسەر ئەم بناغەیە و بە پشت بەستن بە بنەمای ئازادیی بیر و بۆچـوون و شـتانی نـاو دڵ و دەروونەکان: گـەر هـەندێ کـەس لـە قوتابیـانی نـوور ڕژێـم و بنـەماکانی ئێوەیـان نـەوێت و ڕەخنـەی زانستییانە و بنیاتنـەریان لـێ بگـرن، یـان چـەند کـردەوە و هـەڵس و کـەوتێکیان لـێ ببینـرێت کـە لەگـەڵ ئـەو بنەمایانـەدا یـەك نەگرێتـەوە، تەنانـەت کـە لـە

(١) دانەر مەبەستی خۆیەتی. (وەرگێڕ)

دڵیشەوە ڕقیان لە کاربەدەستان بێت، هێشتا هەر یاسا مافی ئەوەی نیيە کە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، بە یەك مەرج، ئەویش خۆهەڵنەقورتاندنە لە کاروباری بەڕێوەبردن و، تێکنەدانی ڕێسا و ئاسایشە.

سەبارەت بە پەیامەکانیشەوە، ئەوا ناوی ئەوەمان لێناون کە نهێنی و تایبەتین و ڕێی بڵاوبوونەوەیانمان نەداوە. تەنانەت لە "قەستەمۆنی"دا و لە ماوەی هەشت ساڵدا یەك دوو جار نوسخەیەکیان لەو پەیامە بۆ هێنام کە بوو بەهۆی ئەم ڕووداوە و، لە هەمان ڕۆژیشدا شاردمانەوە و ونمان کرد، کەچی وا ئێستا ئێوە بە زۆرەملێ ئاشکرای دەکەن و دەری دەخەن. هەر لە ڕاستیشدا بەم کارەی ئێوە ئاشکرا بوو!

شتێکی ڕوونە کە ئەگەر هەر ناتەواوییەك لە هەر پەیامێکدا ببێت کە مایەی تاوانبار بوون بێت ئەوا تەنها هەر ئەو وشانە لا دەبرێن و ڕێ بەوانی تر دەدرێت. خۆ لە دوای لێ وردبوونەوەیەکی چوارمانگی لە سەد پەیامی نووردا لە دادگای "ئەسکی شەهر" تەنها پازدە وشەیان دۆزییەوە کە مایەی ڕەخنە بێت و، لە چوار سەد لاپەڕەی کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"دا تەنها دوو لاپەڕەیان تێدا بینی کە لەگەڵ یاسای شارستانیدا یەك نەگرێتەوە، ئەویش تەفسیری ئەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئانن کە تایبەتن بە میرات و پۆشتەیی ئافرەتەوە و سی ساڵ پێش ئێستا نووسراوە. هەموو ئەمانەش دەیچەسپێنن کە ئامانجی پەیامەکانی نوور دنیا نییە. بەڵکو هەموو خەڵکی پێوستیان بەم پەیامانەیە. کەواتە نابێ ئەو کۆمەڵە پەیامەی "زولفەقار" لەبەر ئەو دوو لاپەڕەیە دەستی بەسەردا بگیرێت. با ئەو دوو لاپەڕەیەی لێ لا ببرێت و کۆمەڵە پەیامەکەمان بدەنەوە.

بەڵێ، مافی خۆمانە داوای ئەوە بکەین کە بماندەنەوە.

بەڵام ئەگەر پێتان وابێت کە ئیلحاد یەکێکە لە داخوازییەکاتی سیاسەت و، لەو گومانە هەڵەیەدا بن کە هەندێ کەس پێوەی گیرۆدە بووە، گوایا دەڵێن: تۆ بەم پەیامانەی بڵاویان دەکەیتەوە شارستانێتییەتەکەمان لێ دەشێوێنیت و ڕێی ئەوەمان لێ دەگریت کە تامی لەزەت و جوانییەکانی ژیانی دنیا بچێژین..

ئەوا منیش دەڵێم:

هیچ گەلێك نییە کە بتوانێت بە بێ ئایین بژی. ئەمەش دەستوورێکی گشتییە و لە سەرانسەری دنیادا دانی پێدا نراوە. بە تایبەت گەر کوفری ڕەها(موتلەق) لە کایەدا

بیێت کە هەر لە دنیادا سزایەکی گەلێ سەخت و دژوارتر لە هی دۆزەخ بۆ خاوەنەکەی فەراهەم دێنێ. وەك لە پەیامی "ڕابەری لاوان"دا بە چەندین بەلگەی بەهێزی ئەوتۆ چەسپاوە کە وتوویژ و چەند و چۆن هەلناگرێ. ئەو پەیامەش بە ڕەسمی چاپکراوە.

چونکە ئەگەر – خوا نەخواستە – موسلمان لە ئایینەکەی خۆی وەربگەڕێ ئەوا یەکسەر دەکەوێتە ناو کوفری موتلەقەوە و هەرگیز لە ناوەندی ئەو کوفرە گومان لێکراوەدا نامێنێتەوە کە تا ڕادەیەك مۆلەتی ژیان بە خاوەنەکەی دەدات، بەلکو هێشتا وەك مولحیدانی بیانیشی لێ نایەت، تەنانەت لە ڕووی چەشتنی تام و چێژەکانی دنیاوە کە خۆی تەسەووریان دەکات دادەبەزێتە ئاستێکی ئەوەندە نزمەوە کە سەد هێندەی پلەی ئاژەل نزمتر بێت، چونکە ئاژەل هەست بە واتای ڕابوردوو و داهاتوو ناکات، بەلام مردنی بوونەوەرانی پێشین و دوایین و جودایی و لێکدابڕانی هەمیشەییان گەلێ ئازاری یەك لە دوای یەك دەرخواری ئەو مرۆڤە دەدات کە دووچاری گومڕایی بووە.

بەلام هەر ئەوەندەی ئیمان هات و تێکەلی پەڕەکانی دلی مرۆڤ بوو، ئەوا یەکسەر سەرجەمی ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەی کە لە ژمارە نایەن زیندوو دەبنەوە و بە زمانی حال دەلێن: (ئێمە نەمردووین.. لەناو نەچووین)! ئیتر بەم جۆرە ئەو بارە دەروونییە دۆزەخ ئاسایەی پێشوو دەگۆڕێت بە چەندین تام و چێژی خۆش و باخ و گولزاری دلگیر.

جا مادەم "ڕاستی" ئەمەیە.. ئەوا من ئەمەی خوارەوەتان یاد دەخەمەوە:

مەڕۆنە مەیدانی زۆران لەگەل "پەیامەکانی نوور"دا کە پالیان بە قورئانی پیرۆزەوە داوە، چونکە ئەو پەیامانە هەرگیز شکست ناهێنن. دەنا ئەگەر کەسێك هەولی کوژاندنەوەی ئەو ڕووناکییانە بدات ئەوا کاروباری ئەم ولاتە جێی داخ و پەژارە دەبێت و[1] پەیامەکان لێرە دەڕۆن بۆ شوێنێکی تر و ئەوێش ڕووناك دەکەنەوە.

دەسا باش بزانن کە:

ئەگەر بە ئەندازەی ئەو مووانەی بە سەرمەوەیە "سەر"م هەبێت و هەموو ڕۆژێکیش یەکێکیان لە جەستەم بکرێتەوە، ئەوا ئەم سەرەی کە بۆ ڕاستییەکانی قورئان بەختم

(١) ئەو بوومەلەرزە توندوتیژانەی لە کاتی شەڕفرۆشتن بە پەیامەکانی نوور روویان دا لەوانەیە ڕاستیی ئەو بڕیارە بچەسپێنێت کە: کاروباری ئەم ولاتە جێی داخ و پەژارە دەبێت. (دانەر)

کردووه هەرگیز لە بەردەم زەندەقە و کوفری موتلـەقدا دانانەوێنم و هـەرگیزاو هـەرگیز واز لەم خزمەتە نوورانی‌یە ناهێنم ، تەنانەت هەر ناشتوانم وازی لـێ بهێنم. بێ گومان نابێ سـەیری ناتەواوی‌یـەکانی ئیفـادەی کەسـێك بکرێـت کـە مـاوەی بیسـت سـاڵە لـە گۆشەگیریدا دەژی و پێی ناوترێ لە مەبەست لایداوە. چونکـە مـادەم دادگـای "ئەسکی شەهر" ماوەی چوار مانگی ڕەبەق لە پشکنین و لـێ وردبوونەوە لە سەد پـەیامی پەنـهان و ئاشکرادا یەك دوو ماددە نەبێت لە یەك دوو پەیامدا هیچ شتێکی نەدۆزی‌یەوە کە مایـەی تاوانبارکردن بێت، کە ئەو دوو ماددەیەش سزایەکی سووکەڵە دەسەپێنن، تەنانـەت ئەو دادگایە تەنها بڕیاری بەند کردنی ماوەی شەش مـانگی بەسـەر پـازدە کەسـدا دەرکـرد لـە نێوان سەد و بیست کەسدا و، ئێمەش ئەو ماوەی سزایەمان لە بەندیخانەدا بەسەر برد..

هـەروەها مـادەم سـەرجەم بەشـەکانی پەیامـەکانی نـوور پێش چـەند سـاڵێك کەوتنـە بەردەستی بەرپرسـان و، ئنجـا لـە دوای لێکۆڵینەوەیـەکی ورد لـەو پەیامانـەدا کـە چـەند مانگێکی خایاند هەموویان درانەوە بە خاوەنەکانیان..

هەروەها مادەم ماوەی هەشت ساڵ لـە شـاری "قەستەمۆنی"دا و سـەرباری پشـکنینی وردیش هیچ نیشانەیەکی وا دەرنەکەوت کە پەیوەندیی بە کاری دادگەری و ئاسایشـەوە ببێت..

هـەروەها مـادەم چـەند سـاڵێك پێش ئێستا بۆ دواهـەمین دەسـتەی کارشناسـان لـە "قەستەمۆنی" ڕوون بووەوە کە هەندێ لەو پەیامانە لە ژێر لیژنە دارێکدا دۆزراونەتەوە و، ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی کە بڵاو نەکراونەتەوە، بەڵکو ون کراون..

هەروەها مادەم بەڕێوەبەری پۆلیس و بەرپرسی دادگەری لە "قەستەمۆنی" بـە جـەخت لەسەر کردنەوە بەڵێنیان پێ دام کە کتێبە شارراوەکانم بدەنەوە، بەڵام ڕۆژی دوای ئەوە و پێش ئەوەی وەریان بگرمەوە و تەنها بە گەیشتنی فەرمانی گرتن، گیرام و بەند کرام..

هـەروەها مـادەم هـەردوو دادگـای "دەنیزلی" و "ئەنقـەرە" بڕیـاری بێ‌تاوانی‌یـان بـۆ دەرکردین و سەرجەم پەیامە گیراوەکانیان داینەوە..

جـا لەسـەر بناغـەی ئـەم شـەش ڕاستی‌یانە، مـن پێـم وایـە کـە خواسـت و پێویسـتیی سەرشانی دادگا و داواکاری گشتیی "دەنیزلی" و ئەرکی شەرشـانی دادگـا و داواکـاری گشـتیی "ئـافیوون"ە کـە سـەرجەم مافـە گرنگـەکانم ڕەچـاو بکـەن. مـن ئومێـدم وایـە و

چاوەڕوانیشم لەو داواکارە گشتییەی کە بەرگری لە مافە گشتییەکان دەکات بەرگری لە مافە کەسییەکانی منیش بکات کە بە بۆنەی پەیامەکانی نوورەوە ئەو مافانەم بوون بە مافی گشتی.

"سەعیدی نوێ" کە بیست و دوو ساڵە لە مەیدانی ژیانی کۆمەڵایەتی کشاوەتە دواوە و هیچ شتێك لەبارەی یاساکانی ئێستا و شێوازەکانی نوێی بەرگری نازانێت و.. پێشتریش سەد لاپەڕە بەرگریی پڕ لە بەڵگەی بەهێزی پووچەڵ نەکراوی پێشکەش بە دادگاکانی "ئەسکی شەهر و دەنیزلی" کرد و.. تا ئەو کاتە و دواتریش لە "قەستەمۆنی" و "ئەمیرداغ"دا و لە ئەنجامی قسوورەکانی خۆیەوە ژیانی بە گیرۆدەیی بەسەر برد، چونکە لە ژێر چاودێریی بەردەوام و بە وێنەی زیندانی تاکە کەسی ئەو ماوەیەی ژیانی بردە سەر.. ئەم "سەعیدە نوێ"یەی کە ئەمە حاڵیەتی، بێ دەنگی هەڵدەبژێرێت و بواری قسە کردن بۆ "سەعیدی کۆن" بەجێ دەهێڵێت.

"سەعیدی کۆن" دەڵێت:

"سەعیدی نوێ" پشتی لە دنیا هەڵکردووە و، لەگەڵ ئەهلی دنیا نادوێ و، ئەگەر ناچار نەکرێت هیچ پێویستییەکیش نابینێت بۆ بەرگری لەخۆ کردن.. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کێشەیە پەیوەندیی بە گەلێ کەسی بێ تاوانەوە هەیە لە جووتیاران و کاسبکاران، کە بەهۆی پەیوەندییەکی لاوازیان پێمانەوە بەند دەکرێن و کار و پیشەیان نوشوستی دەهێنێت و، لەم وەرزی کارکردنەدا ناتوانن پێداویستیی خێزان و منالیان جێبەجێ بکەن و.. ئەم دیاردەیەش لە ناخەوە منی خستە گریانەوە..

بۆیە سوێند بە خوای گەورە دەخۆم کە ئەگەر لە توانامدا ببوایە سەرجەم دەردیسەرییەکانی هەموو ئەوانەم دەخستە ئەستۆی خۆمەوە، چونکە ئەگەر هەر تاوان و گوناهێك ببێت ئەوا تەنها هی منە و، ئەوانە هەموویان بێ تاوانن..

جا هەرچەندەش "سەعیدی نوێ" لایەنی بێ دەنگیی گرتووە، بەڵام من لەبەرامبەر ئەم حاڵەتە دڵتەزێن و ئازاربەخشەوە دەڵێم:

لەبەر ئەوەی "سەعیدی نوێ" وەڵامی سەد پرسیاری بێنرخی داواکاری گشتیی پارێزگاکانی: ئیسپارتە و دەنیزلی و ئافیوون دەداتەوە، منیش مافی خۆمە کە سێ پرسیار

ئاراستەی وەزارەتی ناخۆ بە سەرۆکایەتیی شوکری قایا و وەزارەتی دادی ئێستا بکەم و بڵێم:

**پرسیاری یەکەم:**

بە چ یاسایەك من و سەد و بیست کەسی تر بەند دەکرێین لە ئەنجامی شەڕە قسەیەك کە هیچ ئاکامێکی لێ نەکەوتووەتەوە لە نێوان چاوش(عەریف)ێکی پۆلیس و کەسێکی ئاساییدا لە "ئەگریدیر" کە لە قوتابیانی نووریش نییە، تەنها بە بیانووی ئەوەی کە نامەیەکی ئاسایی منی پێ بووە.. پاشان ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە بۆ ماوەی چوار مانگ لە لایەن دادگاوە لەسەر ئەو نامەیە، کە لە پاشاندا هەموو ئەو کەسانە تەبریە بوون، پازدە کەسی لاوازی هەژار نەبێت، هاودەم لەگەڵ گەیاندنی زیانی دارایی بە زیاتر لە سەد کەس کە بە هەزار لیرە زیاتر مەزەندە دەکرێت؟

ئایا بە چ بنەمایەکی یاسایی دەکرێت گریمانەکان وەك شتی ڕووداو حسابیان بۆ بکرێت؟ ئایا بەپێی چ دەستوورێك زیانێکی دارایی بە بڕی هەزاران لیرە لە حەفتا کەسی خەڵکی دەنیزلی دەدرێت، دوای ئەوەی کە بێتاوانی و تەبریە بوونیان لە دادگادا بەدەست هێنا؟

**پرسیاری دووهەم:**

دەستووری خوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الأنعام:١٦٤).

پەیامێکی بچووك کە بڵاوکردنەوەمان قەدەغە کردووە و لە ماوەی هەشت ساڵدا یەك دوو جار نەبێت دەستم نەکەوتووە و، بناغەکەشی بیست و پێنج ساڵ پێشتر دانراوە و، لە چەند خاڵێکی گرنگیدا ئیمانی خەڵکی لە شوبهە و گومانەکان ڕزگار دەکات و، مرۆڤ لە ئینکاری کردنی فەرموودە موتەشابیهەکان دەپارێزێت.. دۆزینەوەی ئەم نامیلکە بچووکە لە شوێنێکی دوور و لە لای پیاوێك کە نایناسین و، پاشان بەخشینی واتایەکی پێچەوانە و دوور لەو اتای ڕاستەقینەی خۆی بەو پەیامە و.. دۆزینەوەی نامەیەك لە شاری "کووتاهیە" و "بالیکەسیر" کە بە ئاستەم ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی کە نایاسایی بێت و، دەستگیر کردنمان لە ئەنجامی ئەمەدا هەر ئەو کاتە لە مانگی ڕەمەزاندا و ئێستاش بەم سەرما و سۆڵە سەختە لەگەڵ خەڵکانێکی زۆری جووتیار و کاسبکاری بێ تاواندا و.. گرتنی کەسێك تەنها لەبەر ئەوەی کە نامەیەکی ئاسایی کۆنی منی پێ بووە، یان بە ئۆتومبێلەکەی خۆی منی گێڕاوە، یان پەیوەندیی هاوڕێیانەی بەرامبەرمان

دەربڕیوە، یان کتێبێکی منی خوێندووەتەوە و، زیان گەیاندنی ماددی و مەعنەوی بەوان و بەم نیشتمان و نەتەوەیە بە ئەندازەی هەزاران لیرە، بە بیانووی گومانێکی بێ نرخ..

جا من دەپرسم و دەڵێم:

بە چ یاسایەکی دادگەری هەموو ئەمانە ڕوو دەدات؟ یان بە چ ماددەیەکی یاسایی ئەم کارانە ئەنجام دەدرێت؟ ئێمە دەمانەوێ ئەو یاسایانە بزانین تاکو نەکەوینە هەڵەوە!

بەڵێ، ڕاستیی یەکێك لە هۆکارەکانی گرتنمان لە "دەنیزلی" و "ئافیون"دا پەیامی: "تیشکی پێنجەم"ە. لە کاتێکدا کە بناغەکەی ئەم پەیامە زۆر لە پێش ماوەی ئەندامێتیم لە "دار الحكمة الإسلامية"دا نووسراوە، ئەویش بە نیازی ڕزگار کردنی ئیمانی خەڵکانی عەوام لەو کەسانەی کە ئینکاریی هەندێ فەرموودەی پیرۆز دەکەن لەبەر ئەوەی واتا و تەئویلەکانی ئەو فەرموودانە نازانن، بە ڕادەیەك کە وتویانە: ژیری قبوولی ناکات!

گریمان ئەم پەیامە ڕووی لە دنیا و سیاسەتە و ئێستاش نووسراوە.. بەڵام لەبەر ئەوەی پەیامێکی نهێنییە و، لە دەمی پشکنیندا لای ئێمە نەدۆزراوەتەوە و، هەواڵدانەکانیشی سەبارەت بە ئایندە هەموویان ڕاستن و، کاری بەسەر ئاسایش و ڕژێم و کەسانێکی دیاری کراوەوە نییە، بەڵکو بە ڕوونی و تێر و تەسەلی ڕاستییەکی زانستی ڕوون دەکاتەوە.. دەڵێم: تەنانەت گەر بە فەرزی مەحالیش ئەم گریمانە دابنێین، ئەوا هەر هیچ تاوان و گوناهێك پێکناهێنێت، چونکە پێش ئەوەی دادگاکان ئاشکرای بکەن زۆر بە نهێنی هەڵگیراوە، تاکو موناقەشەی لەسەر دروست نەبێت.

پاشان وەرنەگرتنی شتێك و ڕەفز کردنی بە تەواوی جیایە لە قبووڵ نەکردنی لەڕووی زانستەوە و، بە تەواوەتیش جیاوازە لە کار پێ نەکردنی. جا ئەو پەیامە لە ڕووی زانستییەوە ئەو ڕژێمەی پێ قبووڵ نییە کە لە ئایندەیەکی نزیکدا دێتەکایەوە. خۆ بەپێی هەموو یاساکانی دادگەریی سەرانسەری دنیا گریمانی تاوانباری لەمەدا نابینین.

**پوختەی ئەم قسانە:**

"کوفری موتڵەق" ژیانی هەمیشەیی لەناو دەبات و، ژیانی دنیاش دەکات بە ژەهرێکی کوشندە و خۆشی و تام و چێژەکانی دەسرێتەوە. جا پەیامەکانی نوور ماوەی سی ساڵە ئەم جۆرە کوفرە قەڵاچۆ دەکەن و، لە پووچەڵکردنەوە و شکست پێ هێنانی ئەو چەمکە کوفرییە سامناکەی کە ماددییان هەڵیان گرتووە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە و، بە

چەندین بەڵگەی درەخشان یاسا و دەستوورەکانی بەختەوەریی هەردوو ژیانی ئەم نەتەوەیە دەچەسپێنن و، لەمەشدا پشت بە حەقیقەتی بەرز و بڵندی قورئان دەبەستن.

جا ئەو پەیامانەی کە ئەمە پیشە و ئەرکی سەرشانیانە، گەر هەزار و یەك ناتەواویشیان تێدا بێت – نەك تەنها یەك دوو مەسەلە – ئەوا چاکەکارییەکانیان، کە لە هەزاران تێپەڕ دەبێت، ڕەچاو دەکرێت و بەسەر ناتەواوییەکانیاندا پێش دەخرێت. تەنانەت سەرجەمی ئەو ناتەواوییانە دەسڕێتەوە. ئێمە ئەم ئیددیعایە دەکەین و ئامادەین بۆ چەسپاندنیشی.

**پرسیاری سێهەم:**

وەك ئاشکرایە: ئەگەر نووسراوێکی بیست وشەیی تەنها پێنج وشەی تێدا بێت کە یاسا قبوولّی نەکات، ئەو پێنج وشەیە لادەبرێت و بوار بە بڵاوکردنەوەی وشەکانی تر دەدرێت..

لە دادگای ئەسکی شەهردا و دوای وردەکاری و لێکۆڵینەوەی چوار مانگی ڕەبەق، بە ڕواڵەت وا گومان برا کە تەنها پازدە وشە لە ڕووی یاساوە مایەی تاوانبار کردن بن. هەروەها دەستەی پارێزەرانیش لە سەرانسەری کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"دا – کە چوار سەد لاپەڕەیە – جگە لە دوو لاپەڕە هیچ شتێکی تریان تێدا نەدۆزییەوە کە لەگەڵ ئەم یاسایانەی ئێستادا نەگونجێت، لە کاتێکدا کە ئەو دوو لاپەڕەیە تەفسیری دوو ئایەتی قورئانی پیرۆزیان کردووە و سی ساڵ پێش ئێستا نووسراون. هەروەها کارشناسانی یاسایی لە هەردوو دادگای "دەنیزلی" و "ئەنقەرە"دا تەنها پازدە شوێنی "سەهوو"یان لە پەیامەکانی نووردا دۆزییەوە، ئەو پەیامانەی کە تا ئێستا بوون بەهۆی چاکسازیی سەدان هەزار کەس و، هەزار سوودیان بۆ وڵات و نەتەوە هێناوەتەدی.

پاشان ئایا زیندانی کردنی بنەماڵەی "چالیشقان" لەم وەرزی کار و ناوەڕاستی زستانە ساردەدا لەگەڵ کام بنەمای کۆماریدا دەگونجێت و کام لە یاساکانی بوار بەوە دەدات؟ لە کاتێکدا کە هەموو ئەو کارەی ئەم بنەماڵەیە ئەنجامیان داوە تەنها ئەوەیە کە چەند خزمەتێکی سادەیان پێشکەش بە پەیامەکانی نوور کردووە و، بە مەبەستی ڕزگار کردنی ئیمانی خۆیان ئەو پەیامانەیان نووسیوەتەوە و، لە دەمی غەریبیمدا لە "ئەمیرداغ" بەزەیییان بە پیریی مندا هاتووەتەوە و لەبەر خوای گەورە یارمەتییان داوم.

خۆ مادەم یاساکانی کۆماری، بەپێی بنەمای سەربەستیی ویژدان، کاریان بەسەر مولحیدانەوە نی‌یە، باشتر و حەقتر وایە کە هیچ کارێکیان بەسەر ئەو کەسانەشەوە نەبێت کە پەیوەندی‌یان بە دنیاوە نی‌یە و لەگەڵ خەڵکی دنیاشدا دەمقاڵێ و وتوویژ ناکەن و، بە شێوەیەکی سوودبەخش کار بۆ ئاخیرەت و ئیمان و نیشتمانی خۆیان دەکەن. هەروەك سیاسەتمەدارانی خاوەن دەستەڵات لە کیشوەری ئاسیادا – کە بە پەیدا بوونی پێغەمبەران تیایدا شەرەفمەند بووە – نابێ گەلانی خۆیان ناچار بکەن واز لە صەلاحەت و تەقوا و دینداری بهێنن، کە هەموو ئەمانە ماوەی هەزار ساڵە بوون بە خۆراك و چارەسەر و شتانی پێویست بۆ ئەو گەلانە.

یەکێك لە خواستەکانی مرۆڤایەتی چاوپۆشی‌یە لەو قسوور و ناتەواوی‌یانەی کە لە ناوەندی پرسیارەکانی کەسێکدا هاتوون بیست ساڵی تەمەنی بە گۆشەگیری و دوور لە خەڵکی بەسەر بردووە و، بە عەقڵی "سەعیدی کۆن" بیست ساڵ پێش ئێستا ئەو پرسیارانەی ئاراستە کردووە.

وا من لەبەر سوودی نەتەوە و ئاسایش و، وەك ئەرکێکی نیشتمانیی سەرشانم، ئەمەی خوارەوەتان یاد دەخەمەوە:

بەندکردن یان هەوڵی خراپەکاری لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە پەیوەندی‌یەکی لاوازیان بە ئێمە و پەیامەکانی نوورەوە هەیە، لەوانەیە هانی زۆر لەو کەسانە بدات کە تا ئێستا سوودی ئیجابی‌یان بۆ نیشتمان و ڕژێم هەبووە، هەڵبگەڕێنەوە و ببن بە کەسانێکی دوژمن بە کارگێڕیی وڵات و، ئەو کارە بوار بۆ ئاشووب و تیرۆر و تۆقاندن بڕەخسێنێت.

بەڵێ، ئەو کەسانەی کە ئیمانی خۆیان لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە ڕزگار کردووە و مەترسی و زیانیان لە کۆمەڵگا دوور کەوتووەتەوە، تەنانەت بوون بە ئەندامی ئیجابی و سوودبەخش بۆ وڵات، ژمارەیان لە سەد هەزار کەس گەلێ زیاترە و، پلەوپایەی بەرزیان لە سەرجەم فەرمانگەکانی حکوومەتی کۆماریدا هەیە و، هەموو توێژ و چینەکانی خەڵکی دەنوێنن و، بەوپەڕی خۆنەویستی و دڵسۆزیی تەواوەتی و بە جوانترین شێوەی ڕاستی و سوود گەیاندن و ئیستیقامەت کارەکانیان ڕادەپەڕێنن.. جا ویژدان داخوازی ئەوەیە کە هەموو ئەوانە پارێزگاری بکرێن و پشتیان بگیرێت، نەك هەوڵ بدرێت خراپەیان لەگەڵدا بکرێت.

دەستەیەك لە کارمەندە ڕەسمی یەکان گوێیـان لـە سکاڵای ئێمـە کەڕ کـرد و بـواری قسەکردنیان پێ نەداین و، چەندین بڕوبیانووی پووچەڵ و نابەجێ دەهێننەوە بۆ گوشـار و تەنگ هەڵچنین پێمان. ئەم هەڵوێستەشیان وامان لـێ دەکـات کـە بـاوەڕێکی پتـەو بـهێنین بەوەی کە ئەوان بۆیە ئەم کارانە ئەنجام دەدەن تاکو بوار بۆ ئاشـووب و ئـاژاوە نانـەوە لـە وڵاتدا بڕەخسێنن.

پاشان من بە ناوی بەرژەوەندیی حکوومەتەوە دەڵێم:

مادەم هەردوو دادگای "دەنیزلی" و "ئەنقەرە" و دوای ئـەنجامدانی وردەکـاری لەسـەر پەیامی "تیشکی پێنجەم" هیچ کارێکیان لە دژی ئەو پەیامە نەنواند و دایانەوە بـە خۆمـان، ئـەوا پێویستە کـارگێڕیی دەوڵـەت جـارێکی تـر ئـەو پەیامـە نەترنجێنێتـەوە کاروبـاری ڕەسمی یەوە و نەیکات بە مایەی دەمقاڵێ و گفتوگۆ لەسەر کردن.

هەروەك ئێمـە لـە لایـەنی خۆمانـەوە ئـەو پەیامـەمان شـاردبووەوە پێـش ئـەوەی دەسـتی دادگـا بکـەوێت و ئاشـکرای بکـات. دەبێ دادگـای "ئـافیوون"یـش نـەیکات بـە مایـەی پرسیار و وەڵام، چونکە ئەو پەیامە هێندە بەهێزە کە بەرپەرچ نادرێتەوە و، لـەبارەی چـەند ڕووداوێکەوە پێش ڕوودانیان هەواڵی داوە کـە لـە دوایـیدا وەك هەواڵـەکانی ئـەو پەیامـە ڕووداوەکـان هاتـەدی و ڕوویـان دا! ئەمـە جگـە لـەوەی کـە پەیامەکـە پـەیوەندیی بـە کاروبـاری دنیـاوە نییـە، تەنـها ئـەوە نـەبێت کـە یـەکێك لـە واتـا زۆرەکـانی کەسـێك دەگرێتەوە کە مرد و کۆتایی پێ هات(١).

ویـژدانم هـانم دەدات کـە لەبـەر خـاتری بـەرژەوەندیی وڵات و نەتـەوە و لـە پێنـاوی پاراستنی ئاسایش و ڕێسا و کارگێڕیی وڵاتدا ئەمەی خوارەوەتان یاد بخەمەوە:

دەمارگیریتـان بـۆ ئـەو پیـاوە مـردووە واتـان لـێ نەکات کـە ئـەو هەواڵـە غەیبی یـە و واتاکەی کە لەو پەیامەدا هاتووە، بترنجێننـە چـەند کاروبـارێکی ڕەسمی یـەوە، چونکـە ئـەو چەشنە کارە پتر بوار دەڕەخسێنێت بۆ بڵاوبوونەوەی زیاتری ناوی ئەو پەیامە و ناسـاندنی بە خەڵکی!

* * *

(١) مەبەست لەو کەسە مستەفا کەمالە. (وەرگێڕ)

# بۆ بەڕێزان سەرۆکی دادگای ئافیوون و داواکاری گشتی و ئەندامانی دادگا!

لێرەدا دەقی ئەو بەرگرییەتان پێشکەش دەکەم کە خستمە بەردەستی لایەنەکانی داد لە شاری "دەنیزلی" و لە (نۆ) بناغە پێکهاتووە:

وەك دەزانن من کەسێکم وازم لە ژیانی کۆمەڵایەتی هێناوە، بە تایبەت ژیانی ڕەسمی و سیاسی کە چەند لایەنێکی وردی هەیە. لەبەر ئەوە من نازانم دەبێ لە ئاستی ئەو ژیانەدا چ کارێك ئەنجام بدەم. تەنانەت هەر بیریشی لێ ناکەمەوە، چونکە بیر لێکردنەوەی گەلێ ئازارم دەدات، بەڵام ناچارم ئەم بەرگرییەم تۆمار بکەم، چونکە لە دادگایەکی پێشوودا لە لایەن کەسێکی بێ ویژدانەوە چەند پرسیارێکی دووپات بووم ئاراستە کرا کە هیچ پێویست نەبوون. جا ئەم بەرگرییەش (کە وەك کۆتایی ئەو وەڵامانە وایە کە ئەو کاتە پێشکەشم کردن) هەندێ جار لە مەبەست لا دەدات و لەوانەیە دووپات بوونەوەی ئەوتۆی تێدا بێت کە هیچ پێویست نەکات و، ڕێکوپێکیی تێدا نەبێت و، لەوانەشە هەندێ دەستەواژەی توندوتیژی وەهای تێدا بێت کە بگونجێت لە دژم بقۆزرێتەوە، یان هەندێ ڕستەی لەخۆ گرتبێت کە پێچەوانەی هەندێ لەو یاسایانە بێت کە شارەزایان نیم. بەڵام مادەم ئەو بەرگرییە ڕووی لە حەقیقەتە ئەوا دەکرێت لە پێناوی حەقیقەتدا چاو لەو ناتەواوییانە بپۆشرێت.

ئەم بەرگرییەم پاڵی بە نۆ بناغەوە داوە:

**بناغەی یەکەم:**

مادەم حکوومەتی کۆماری لە ژێر دروشمی ئازادیی ویژداندا کاری بەسەر هەرزە و مولحیدانەوە نییە، ئەوا دەبێ بە شێوەیەکی باشتر کاری بەسەر کەسانی خاوەن تەقوا و ئاییندارەوە نەبێت.

هەروەها مادەم هیچ نەتەوەیەك ناتوانێت بە بێ ئایین بژی، بە تایبەت گەر ئەوە ڕەچاو بکەین کە نەتەوەکانی کیشوەری ئاسیا لە ڕووی ئایینەوە لە نەتەوەکانی ئەوروپا ناچن و،

ئایینی ئیسلامیش لە ڕووی ژیانی کەسی و قیامەتی‌یەوە لە ئایینی نەصرانی ناچێت، ئەوەتا گەر موسڵمانێك بوو بێت بە مولحید هەرگیز وەك مولحیدانی تر نی‌یە.. لەبەر هەموو ئەمانە، ئەم ئایینە بووە بە پێویستی‌یەکی سروشتی لە ناخی ئەم نەتەوەیەی کە بە ئایینەکەی و بەرگریی قارەمانانەی لە دەستگرتنی پێیەوە لە بەرامبەر هەموو هێرشەکانی سەرانسەری جیهاندا ماوەی هەزار ساڵە ڕووی دنیای ڕووناك کردووەتەوە..

هیچ پێشکەوتن و شارستانێتی‌یەك ناتوانێت جێی فێربوونی چاکەکاری و ئایین و ڕاستی‌یەکانی ئیمان لە دەروونی ئەم نەتەوەیەدا بگرێتەوە، یان هیچ کام لەمانەی لەبیر بباتەوە.

کەواتە هەر حکوومەتێك جڵەوی فەرمانڕەوایی ئەم نەتەوەیە دەگرێتە دەست و، دادگەری و ئاسایش ڕەچاو دەکات، دەبێ هەڵوێستی خراپ بەرامبەر پەیامەکانی نوور دەرنەبڕێت و هیچ کەسێکیش بۆ هەڵوێستی لەو چەشنە ڕاپێچی نەکات.

**بناغەی دووهەم:**

جیاوازی‌یەکی گەورە لە نێوان ڕەتکردنەوەی شتێك و کار پێ نەکردنیدا هەیە. ئەوەتا لە هەموو حکوومەتێکدا کۆمەڵێك هەن کە بە توندی نەیاری ئەو حکوومەتەن. هەندێ جار ڕێ دەکەوێ کۆمەڵێك موسڵمان لە ژێر دەستەڵاتی مەجووسیدا دەبن، هەروەك دەگونجێ کەسانێکی جولەکە یان گاور لە ژێر سایەی حوکمی ئیسلامدا دەبن، وەك سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب – خوای لێ ڕازی بێت – کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئازادیی خۆیی و سەربەستیی کەسی سەبارەت بەوانەی کە ئاسایش تێك نادەن و خۆیان لە قەرەی کارگێڕیی حکوومەت نادەن، پارێزراوە. چونکە حکوومەتەکان ڕواڵەتیان بەلاوە گرنگە و، پەردە لە ڕووی شتانی ناو دڵ و دەروونەکان هەڵنادەنەوە.

ئاشکرایە کە هەر کەسێك بیەوێت خۆی لە قەرەی ئاسایش و سیاسەت و کارگێڕیی دەوڵەت بدات، دەبێ هەردەم ڕۆژنامەکان بخوێنێتەوە و بە دوای هەواڵی ڕووداوەکانی دنیادا بگەڕێت، تاکو زانیاری لەبارەی ئەو تەوژم و بارودۆخانەوە پەیدا بکات کە یارمەتیی دەدەن، بۆ ئەوەی لە هەڵسوکەوتەکانیدا بە هەڵەدا نەچێت وپێی نەترازێت..

کەچی پەیامەکانی نوور زۆر بە توندی ڕێی ئەم کارەی لە قوتابیانی گرتووە، تەنانەت هاوڕێ نزیکەکانم دەزانن کە ماوەی بیست و پێنج ساڵە وازم لە ڕۆژنامەکان هێناوە و

هەواڵی هیچ ڕۆژنامەیەکم لە کەس نەپرسیوە و حەز و ئارەزووم لێی نەبووە، چ جای ئەوەی بیانخوێنمەوە. وا ئێستاش ماوەی دە ساڵە جگە لە هەواڵی شکستی ئەڵمان و سەرکەوتنی بەلشەفیەکان هیچ هەواڵێکی تری جیهان و بارودۆخی دنیا نازانم.. پەیامەکانی نوور تا ئەم ڕادەیە ڕێی ئەو کارەیان لێ گرتم و لە ژیانی کۆمەڵایەتی دووریان خستومەتەوە.

کەواتە دەبێ دانایی حکوومەت و یاسای سیاسەت و دەستووری دادگەری ڕێ بەوە نەدەن کە هیچ کەسێك خۆی لە قەرەی من و برایانی هاوڕێنەی من بدات. خۆ ئەگەر کەسێك کاری وا بکات ئەوا لە ژێر کاریگەریی وەهم و سەرسەختی و ڕق و قینەکانی خۆیدا دەیکات!

**بناغەی سێهەم:**

ناچار بووم ئەم ڕاڤە کردنە دوور و درێژەی خوارەوە پێشکەش بکەم لە وەڵامی چەند ڕەخنەیەکی هەڵە و بێ واتا و دوور لە پێویستی داواکاری گشتیی دادگای پێشوودا سەبارەت بەوەی کە لە پەیامی "تیشکی پێنجەم"دا هاتووە. ئەو داواکارەش لە ڕەخنەکانیدا پاڵی بە هیچ ماددەیەکی یاساوە نەدابوو، بەڵکو پاڵی بە خۆشەویستی و دەمارگیریی خۆیەوە دابوو بۆ کەسێکی مردوو.

یەکەم: ئێمە "تیشکی پێنجەم"مان بە شێوەیەکی نهێنی پاراستبوو، پێش ئەوەی بکەوێتە دەستی حکوومەت. ئەوەبوو وێڕای ئەو پشکنینە وردانەی کە ئەنجام دران حکوومەت تەنانەت یەك دانە نوسخەی ئەو پەیامەی لە لای من دەست نەکەوت.

ئنجا تاکە ئامانجی ئەم پەیامەش ڕزگار کردنی ئیمانی خەڵکانی عەوامە و نەهێشتنی دوودڵی و گومانەکانیانە تاکو ڕزگاریان بکات لە ئینکاریی هەندێ لە فەرموودە موتەشابیهەکان. هەروەها ئەم پەیامە، مەگەر لە پلەی سێهەم و چوارەم و بە شێوەیەکی لاوەکی، دەنا ئاوڕی لە کاروباری دنیا نەداوەتەوە. لە کاتێکدا ئەو هەواڵەی پەیامەکە ڕایگەیاندووە ڕاست و دروستە و، کاری بەسەر دنیا و ئەهلی دنیاوە نییە و ڕکەبەری و زۆرانی لەگەڵدا نەگرتوون. بەڵکو تەنها هەواڵەکانی هێناوە، بێ ئەوەی کەسەکان دەستنیشان بکات، یان ناوەکان بدرکێنێت و، هەر تەنها ڕاستیی فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەریان ﷺ بە شێوەیەکی گشتی و هەمەکی ڕوون کردووەتەوە. کەچی ئەوان ئەم

ڕاستی‌یەیان بەسەر کەسێکی سەرسووڕهێندا شکاندەوە کـە لـەم چەرخـەدا ژیـاوە و پڕاوپڕی ئەو دەرچووە. ئیتر ئەوان ڕەخنەکەیان لەو ڕووەوە ئاراستە کرد کە پێیـان وابوو ئەم پەیامە لـەم سـاڵانەی دواییدا نووسرابێت. کەچی مێژووی دانانی ئەم پەیامـە زۆر کۆنترە لە مێژووی پەیوەندی کردنم بە "دار الحكمـة الإسـلامية"وە، بەڵام دواتر سەر لـە نوێ ڕێکخرایەوە و ڕۆشتە ناو پەیامەکانی نوورەوە.

وا لە خوارەوەدا ئەمەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە:

"چل ساڵ پێش ئێستا، واتە یـەك سـاڵ پێش ڕاگـەیاندنی سەربەسـتی[1]، هـاتم بـۆ ئەستەمبووڵ، فـەرماندەی گشتیی ئـەو کاتـەی سوپای ژاپۆنـی هـەندێ پرسیاری ئـایینیی ئاراستەی زانایانی ئیسلام کردبوو، ئـەوانیش پرسیارەکانی ئـەویان ئاراستەی مـن کـرد، هەروەك بەو بۆنەیەوە هەندێ پرسیاری تریشیان لەگەڵدا ئاراستە کردم.

یەکێك لەو پرسیارانە لەسەر ئەو فەرموودە پیرۆزە بوو کە دەفەرموێ:

(لە ئاخرزەماندا کەسێکی سامناك بەیانی‌یـەك کـە ڕۆژی لـێ دەبێتـەوە لـە ناوچـاویدا نووسراوە: ئەمە کافرە).

منیش وتم:

کەسێکی سەیر و سەرسووڕهێن کاروباری ئەم نەتەوەیـە دەگرێتـە دەسـت و، ڕۆژێـك دێت کە شەپقە لەسەر دەکات و خەڵکیش بە زۆرەملێ ناچار دەکات بیکەنە سەریان.

دوای ئەم وەڵامە لێیان پرسیم:

ئایا ئەو کەسەی کە لەو ڕۆژگارەدا شەپقە لەسەر دەکات پێی کافر نابێت؟

وتم:

کاتێ شەپقەکە لەسەری جێگیر دەبێت بەو مرۆڤە دەڵێت: سوژدە مەبە. بەڵام پشت بە خوا ئیمانی ناو سەری ئەو کەسە شـەپقەکە ناچـاری سـوژدە بـردن دەکـات و موسـڵمانی دەکات!

پاشان وتیان: ئەم کەسە ئاوێك دەخواتەوە و، دەستی کونی تێ دەبێت، ئیـتر ئـەو کاتـە هەمووان دەزانن کە ئەوە "سوفیانی"یە.

وەڵامم دانەوە:

---

مەبەست [illegible] گەیاندنی دووهەم جاری دەستوورە لە دەوڵەتی عوسمانیدا، کە بە "مەشرووتیەتی دووهەم" [illegible] ساڵی ١٩٠٨ز لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمەوە ڕاگەیەنراوە. (وەرگێڕ)

پەندێك هەیە بۆ مرۆڤی هەڵەخەرج بەکار دەهێنرێت و، لەبارەیەوە دەوترێت: "دەستی کونی تێ بووە". واتە: سەروەت و سامان لە دەستیدا نامێنێتەوە، بەڵکو دەڕوات و بەزایە دەچێت.

بەم جۆرە، ئەو کەسە سەرسووڕهێنەرە گیرۆدەی مەی خواردنەوە دەبێت (کە شلەمەنی‌یە) و، لە ئەنجامی ئەم مەی خواردنەوەیەدا نەخۆش دەکەوێت و، ئەمەش بەرەو چەندین ئیسراف و هەڵەخەرجیی بێ سنوور دەیداتەبەر و، خەڵکانی تریش لەسەر ئیسراف و هەڵەخەرجی ڕادەهێنێت.

یەکێکیان پرسیی:

کاتێك ئەو کەسە دەمرێت شەیتان لەناوچەی "دەیکیلی تاش"ی ئەستەمبوڵ هەموو دنیا ئاگادار دەکاتەوە و هاوار دەکات کە: فڵانە کەس مرد!

هەر ئەو کاتە وتم:

"ئەو هەواڵە لە ڕێی برووسکەوە ڕادەگەیەنرێت".

بەڵام دوایی کە بیستم "ڕادیۆ" پەیدا بووە، زانیم وەڵامەکەی پێشووم ناتەواو بووە و، دوای هەشت ساڵ کە لە "دار الحكمة"دا بووم، وتم:

"هەواڵەکە بەهۆی ڕادیۆوە بە هەموو جیهان ڕادەگەیەنرێت".

پاشان هەندێ پرسیاری تریان لە بارەی بەربەستی "زولقەرنەین" و "یەئجووج و مەئجووج" و "دابة الأرض" و "دەجاڵ" و "هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - " لێ کردم و منیش وەڵامم دانەوە. تەنانەت هەندێ لەو وەڵامانە لە دانراوێکی کۆنمدا تۆمار کراون.

پاش ماوەیەك مستەفا کەمال دوو نامەی بە پەرلە(شفرە) نارد بۆ تەحسین بەگی هاوڕێم کە ئەو کاتە والی بوو لە شاری (وان). لەو دوو نامەیەدا بانگهێشتی دەکردم بۆ ئەنقەرە تاکو پاداشتم بداتەوە لەسەر بڵاوکردنەوەی نامیلکەی (شەش هێرشەکان)[1].

(١) ئەو کاتە تورکیا دوو حکومەتی تێدا بوو: حکومەتی خەلافەت لە ئەستەمبوڵ، کە لە ژێر ڕکێفی سوپای داگیرکەری ئینگلیزدا بوو.. ئەوی تریان لە ئەنقەرە بە سەرۆکایەتیی مستەفا کەمال و لە دژی دەوڵەتانی داگیرکەر دەجەنگا. مامۆستا نوورسیش ئەو دەمە لە ئەستەمبووڵدا دەژیا. ئەو نامیلکەیەشی لە دژی ئینگلیزی داگیرکەر و بەرپەرچدانەوەی سیاسەتیان بڵاوکردەوە و کاریگەریی گەورەی بۆ ئەو بارودۆخە لە بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکیدا هەبوو. (وەرگێڕ)

منیش ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە. لەوێ ئەوەی بۆ پێشنیاز كردم كە بە "واعیزی گشتی" لە پارێزگاكانی خۆرهەڵات(كوردستان)دا بە مووچەیەكی سێ سەد لیرەیی لە جێگەی شێخی سەنووسی دام بمەزرێنێت، چونكە شێخی ناوبراو زمانی كوردیی نەدەزانی، هەروەها لەگەڵ دامەزراندنم بە ئەندام لە ئەنجومەنی مەبعووسان(پەرلەمان)دا و، ئەندامێتیش لە سەرۆكایەتیی كاروباری ئایینی، هاودەم لەگەڵ مانەوەی ئەندامێتیم لە (دار الحكمـــــة الإســلامية)دا. مەبەستیشی ڕازی كردنی من و قەرەبوو كردنەوەی كارمەندییەكەی پێشووم بوو.

كاتی خۆی سولتان ڕەشادیش نۆ هەزار لیرەی زێڕی تایبەت كرد بۆ قوتابخانەی زەهراء كە هەر خۆم بناغەكەیم دانابوو، هەروەها بۆ زانكۆكەی شاری وان، جا لەم سەفەرەدا ئەنجومەنی.مەبعووسانی ئەنقەرەش بڕیاری دا ئەم بڕە پارەیە زیاد بكات بۆ سەد و پەنجا هەزار لیرەی وەرەقی، ئەوەبوو سەد و شەست و سێ پەرلەمانتار لە كۆی دووسەد ئەندامی ئەنجومەندا ئیمزای ئەو بڕیارەیان كرد و ڕەزامەندییان لەسەر نواند.

بەڵام كە سەرنجم دا بەشێك لەو هەواڵانەی لە دەقی ئەسڵیی "تیشكی پێنجەم"دا هەیە بە پڕاوپڕی لە كەسێكدا دیتەدی كە لەوێ بینیم، ناچار بووم واز لەو كارمەندییە گرنگانە بهێنم، چونكە بە قەناعەتی تەواو زانیم لەیەك تێگەیشتن لەگەڵ ئەو كەسەدا، یان مامەڵە لەگەڵ كردنی، یاخود ڕێ لێ گرتنی كارێكی ئەستەم و مەحاڵە. ئیتر دوای ئەوە وازم لە كاروباری دنیا و سیاسەت و ژیانی كۆمەڵایەتی هێنا و، هەموو كاتەكانم تەنها لە پێناوی خزمەتی ئیماندا تەرخان كرد. كەچی هەندێ كارمەندی لەخۆبایی و دوور لە ویژدان دوو سێ نامەیان پێ نووسیم كە ڕوویان لە دنیایە، پاشان لەبەر هێنانەدیی حەز و خواستی چەند زاتێك و بە بۆنەی ئەو پرسیارانەوە كە ئاراستە كران و پەیوەندییان بە فەرموودە موتەشابیهەكانی لەمەڕ نیشانەكانی قیامەتەوە هەیە، بناغەكانی ئەو پەیامە كۆنانەم كۆ كردەوە و سەر لەنوێ ڕێكم خستنەوە و پەیامەكە ناوی "تیشكی پێنجەم"ی پەیامەكانی نووری لەخۆ گرت. دەبێ ئەوەش بزانین كە ڕەنووسی پەیامەكانی نوور هەمیشە بە پێی تەرتیب و مێژووی دانانیان نییە، بۆ نموونە: مەكتووبی سی و سێهەم لە پێش مەكتووبی یەكەمدا نووسراوە. هەروەك ئەسڵی ئەم "تیشكی پێنجەم"ەش لەگەڵ هەندێ بەشی پەیامەكانی نووردا لە پێش پەیامەكانی نووردا دانراون.

بە هەر حاڵ.. دەمارگیری و هاوڕێیەتیی داواکاری گشتی - کە ئەم چەشنە مەقامەی هەیە - بۆ مستەفا کەمال بوو بەهۆی چەند پرسیار و پەڵپ و بیانوویەکی نایاسایی و هەڵە و دوور لە پێویست. هەر ئەوەش ناچاری کردم ئەم ڕوونکردنەوانە پێشکەش بکەم کە لە دەرەوەی باسەکەدایە.

لێرەدا، وەك نموونەیەك لەسەر گوفتاری نایاسایی تێکەڵ بە میزاجی کەسیی ئەو، یەکێك لە قسەکانی خۆی دەهێنم:

پێی وتم:

ئایا لە هەموو دڵی خۆتەوە لەو قسانەت پەشیمان نیت کە لە "تیشکی پێنجەم"دا هێناوتە؟ چونکە تۆ سووکایەتیت بەو کردووە کاتێ لەبارەیەوە وتووتە: هێندە ئارەق و شەرابی خواردووەتەوە کە وەکو کوندەی ئاوی لێ هاتووە.

منیش لە وەڵامی دەمارگیرییە تەواو هەڵە و نەفرەت لێ کراوەکەیدا، کە هی هاوڕێیەتیی خۆیەتی بۆی، دەڵێم:

شەرەفی سەرکەوتنی سوپای پاڵەوان نابێت تەنیا بدرێتە پاڵ ئەو، بەڵکو تەنها بەشێکی دیاریکراوی لەو سەرکەوتنەدا هەیە، چونکە ستەمێکی ئاشکرا و دەرچوونە لە دادگەری کە دەستکەوت و ماڵ و سامان و ڕۆزیی سوپا بدرێت بە تەنیا یەك کەسی سەرکردە.

جا هەروەك ئەو داواکارە گشتییە دوور لە ویژدانە بەوە تۆمەتبارم دەکات کە ئەو کەسە خاوەن عەیب و عارەم خۆش ناوێت، بە ڕادەیەك وەك کەسێکی خیانەتکار بە نیشتمان دامدەنێت! منیش لە لایەنی خۆمەوە بەوە تاوانباری دەکەم کە سوپای خۆش ناوێت، چونکە کاتێ کە ئەو هەموو شەرەف و دەستکەوتە مەعنەوییانەی سوپا دەبەخشێت بە هاوڕێکەی، ئەوا بەم کارەی سوپا لە شەرەفمەندیی خۆی بێ بەش دەکات. کەچی حەقیقەت ئەوە پێویست دەکات کە سەرجەمی چاکەکاری و کارە ئیجابییەکان بەسەر کۆمەڵ و سوپادا دابەش بکرێت، بەڵام ناتەواوی و خراپکاری و کارە سەلبییەکان دەبێ ئاراستەی سەرکردە و کەسی جڵەو بە دەست بکرێت، چونکە "بوون"ی هەر شتێك بە هاتنەدیی سەرجەم پایە و هەل و مەرجەکانی ئەو شتە دێتە دی. سەرکردەش لێرەدا تەنها یەکێکە لەو هەل و مەرجانە. بەڵام بۆ نەهاتنەدی و تێکچوونی ئەو شتە، نەهاتنەدیی تەنها یەك دانە مەرج، یان تێکچوونی یەك دانە لە پایەکانی

سەروزیادە. بۆیـە دەتوانرێـت ئـەو خراپکاری‌یـە بدرێتـە پـاڵ نەخشەسـاز و سـەرۆکی ئـەو کارە، چونکە چاکەکاری و لایەنە باشەکان چەند شـتێکی ئیجـابی و خـاوەن "بـوون"ن، کەواتە ناکرێ تەنها لەو کەسـانەدا جـەم بکرێـن کـە لـە سـەرۆکایەتیی دەوڵـەتدان. بـەڵام ناتەواوی و خراپکاری‌یەکان بریتین لە کاولـکـاری و شـتی "نـەبوو"، بۆیـە سـەرکردەکان بەرپرسن لێیان!

مادەم حەق و ڕاستی ئەمەیە، ئەوا چۆن دەکرێ هۆزێـك کـە چـەندین سـەرکەوتنی بـە دەست هێنابێت، بە سەرۆکەکەیان بوترێت: "دەستت خـۆش ئـەی حەسـەن ئاغـا"؟ بـەڵام گەر ئەو هۆزە شکست بهێنێت سووکایەتی ئاراستەی یەك بە یەکی ڕۆڵەکانی ئـەو هـۆزە بکرێت؟ دیارە ئەم چەشنە ڕەفتارە بە تەواوی پێچەوانە و دژی حەق و ڕاستی‌یە.

بە هەمان شێوە، ئەو داواکارە گشتی‌یەش کە منی تاوانبار کردووە، لە حەق و ڕاسـتی لایداوە، کەچی بە خەیاڵی خۆی بە ناوی دادگەری‌یەوە بڕیار دەدات!

هەر بە وێنەی هەڵەکەی ئەم داواکارە، ماوەیەکی کەم پێش جەنگی جیهانیی پێشـوو، هەندێ کەسی ئایینداد و خاوەن تەقوا هاتن بۆ لام لە شاری وان و، وتیان:

"هەندێ لە سەرکردەکان چەند کارێکی دژ بـە ئـایین ئـەنجام دەدەن. دەمانـەوێ لێـان هەڵبگەڕێینەوە. تۆیش بەشداریمان بکە"!

پێم وتن:

"ئـەو کـارە بێ دینی و خراپکاری‌یانـەی کـە ئێـوە باسـی دەکـەن هـی ئـەو چەشـنە سەرکردانەیە و، نـاکرێ بەرپرسیارێتی‌یان بخرێتـە ئەستۆی سـوپاوە. چونکـە ئـەم سـوپای عوسمانی‌یە لەوانەیە سەد هەزار ئەولیای خوای گەورەی تێدا بێت، بۆیە ناتوانم شمشـێر لـە ڕووی ئەم سوپایەدا هەڵبرم و بەشداریتان بکەم".

دوای ئەمـە، وازیـان لـە مـن هێنـا. بـەڵام خۆیـان چـەکیان هـەڵگرت و، ئاکامەکەشی ڕووداوەکەی "بەتلیس"(١) بوو، کە هیچ ئامانجێکی ئەوانی نەهێنایە دی..

---

(١) ئەو ڕووداوە بریتی‌یە لە هەڵسـانەوەی هـۆزە کوردەکـانی دەوروبـەری شـاری "بەتلیس" بـە سـەرۆکایەتیی شێخ سەلیم لە دژی هەڵسوکەوتی ناموسڵمانانەی هەندێ لە ئەفسەرەکانی حوکمی "ئیتتیحاد و تـەرەقی" و لـە مـانگی حوزەیرانی سـاڵی (١٩١٣ز) واتـە لـە پێش هەڵگیرسـانی جـەنگی جیـهانیی یەکەمدا ڕووی داوە و بـۆ ماوەی حەفتەیەك شارەکەیان لە ژێر دەستدا بووە. (وەرگێڕ)

پاش ماوەیەکی کەم جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا و، ئەو سوپایە لە ژێر ئاڵای ئاییندا بەشداریی لەو جەنگەدا کرد و ڕۆشتە ناو گەرمەی جیهادەوە و، سەد هەزاریان لێ شەهید بوو، لەم ڕێیەشەوە ئەو شەهیدانە بۆ پلەی ئەولیاکان بەرز بوونەوە و، بە خوێنەکەیان ئیمزایان لەسەر بڕوانامەی "ویلایەت" کرد! ئەو ئاکامەش بوو بە بەڵگەیەك و پشتی ڕاستیی ڕەفتارەکەی منی گرت لەو کێشەیەدا.

بە هەر حاڵ.. ناچار بووم نەختێ درێژە بەم باسە بدەم و، ڕەفتار و هەڵسوکەوتە سەیرەکانی داواکاری گشتی – کە سووکایەتیی پێوە دیارە بە من و پەیامەکانی نوور – بۆ ئەم درێژە پێدانە ڕایپێچام.

لە کاتێکدا کە ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەی بە ناوی دادگەرییەوە دەدوێت ئەوەیە کە بوار بە هیچ هەست و سۆزێکی کەسیی خۆی و هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی نەدات کاری تێ بکەن و بە هەڵەیدا ببەن، تەنانەت گەر بە شێوەیەکی جوزئییش بێت، یان بێ لایەنیی پێ لە دەست بدەن و، هەرگیز بە کاردانەوەی دەروونی و شەخسیی خۆی بڕیار دەرنەکات.

**بناغەی چوارەم:**

دوای ئەوەی کە دادگای "ئەسکی شەهر" بە درێژایی چوار مانگ بە وردی لە سەدان پەیامی نووری کۆڵییەوە، بڕیاری بەند کردنی شەش مانگیتەنها بۆ پازدە کەس دەرکرد لە نێوان سەد و بیست کەسدا کە تۆمەتیان ئاراستە کرابوو. سەبارەت بە خۆیشم بڕیاری تەنها یەك ساڵ بەندییان لەسەر دەرکردم.

خۆ ئەوان هەرچەندە لە سەد دانە پەیامی ئێمە ورد بوونەوە، کەچی تەنها پازدە وشە نەبێت لە یەك دوو پەیامدا هیچ شتێکی تریان نەدۆزییەوە و، بڕیاری بێ تاوانییان سەبارەت بە دامەزراندنی تەریقەتی سۆفی و کۆمەڵەی سیاسی و مەسەلەی شەپقەدا بۆ دەرکردین و، ماوەی حوکمەکەشمان لە بەندیخانەدا بەسەر برد.

پاش ئەوە لە "قەستەمۆنی"شدا چەند جارێك پشکنین و گەڕانی زۆریان ئەنجام دا، کەچی هیچ شتێکیان دەست نەکەوت کە بکرێت بە مایەی تاوانبار کردنمان.

چەند ساڵێك پێش ئێستا حکوومەت لە "ئیسپارتە" دەستی بەسەر هەموو بەشەکانی پەیامەکانی نووردا گرت، بە بێ جیاوازی لە نێوان پەیامە ئاشکرا و پەیامە تایبەتە پەنهانەکاندا. کەچی دوای لێکۆڵینەوەی وردی ماوەی سێ مانگ هەموویان درانەوە بە خاوەنەکانیان.

چەند ساڵێك دوای ئەوە، هەموو پەیامەکان بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ژێر لێکۆڵینەوەی وردی دادگای "دەنیزلی" و دادگای "ئەنقەرە"دا بوون، پاشان هەموو ئەو پەیامانەیان پێ داینەوە.

کەواتە مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا تاوانبارکردنی ئێمە و پەیامەکان و قوتابیانی نوور لە لایەن کەسانێکەوە کە بە ناوی یاساوە دەدوێن، بەڵام بە ڕق و قینەوە ڕەفتار دەنوێنن و، لە ژێر کاریگەریی هەست و نەست و هەوا و ئارەزووی کەسیی خۆیان و بە شێوەیەکی نایاسایی سەرزەنشتمان دەکەن، ئەم کارەیان تەنها تاوانبار کردنی ئێمە ناگەیەنێت، بەڵکو پێش ئێمە تاوانبار کردنی دادگای "ئەسکی شەهر" و دادگای "قەستەمۆنی" و، کارمەندانی ئاسایشی ئەو پارێزگایە و، دام و دەزگای دادی شاری "ئیسپارتە" و، دادگای "دەنیزلی" و، دادگای تاوانە گەورەکانی "ئەنقەرە" دەگرێتەوە..

واتە ئەو کەسانە دەچن هەموو ئەو دام و دەزگایانە دەکەن بە هاوبەشی تاوانەکەمان (گەر تاوانمان هەبێت)! چونکە ئەگەر ئێمە هەر تاوانێکمان لە ئەستۆدا بێت دەبێ ئەو لایەنە ناوبراوانەی ئاسایش لەو سێ چوار پارێزگایەدا وێڕای چاودێریی وردیان نەیانبینیبێت، یان بینیبێتیان بەڵام چاویان لە ئاستیدا نووقاندبێت. هەروەها ئەو دوو دادگایەش سەرباری پشکنین و لێ وردبوونەوەی ماوەی دوو ساڵ نەیانتوانیبێت بەو تاوانە بزانن، یاخود بە گرنگی و بایەخ پێدانەوە نەیانخوێندوونەتەوە..

کەواتە دەبێ ئەم لایەنانە لە ئێمە زیاتر تاوانبار بن!

لە کاتێکدا کە ئەگەر هەر چەشنە حەزێکمان لە کاروباری دنیا ببوایە، ئەو دەنگەی کە لێمانەوە دەبیسترا وەك هی ویزەی مێش نەدەبوو، بەڵکو کارەکەمان بە وێنەی زرمەی تۆپ دەنگی دەدایەوە!

بەڵێ، پیاوێك کە بەوپەڕی توندوتیژی و بە بێ هیچ ترس و بیمێك لە بەردەم ئەو دادگا عورفی‌یە سەربازی‌یەدا کە بەهۆی ڕووداوی ٣١ی مارتەوە[1] سازکرا بەرگری‌یەکی یەکجار کاریگەر و دلێرانەی کرد و، لە بەردەم ئەنجومەنی (مەبعووسان)یشدا بە هەمان شێوە، بێ ئەوەی گوێ بە تووڕەیی و هەڵچوونی مستەفا کەمال بدات.. چۆن ئەو کەسە بەوە تۆمەتبار دەکرێت کە گوایا بە نهێنی و بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت ماوەی هەژدە ساڵی ڕەبەق پیلانی سیاسی دەگێڕێت؟ ئەو کەسەی تۆمەتی وای ئاراستە بکات بێ هیچ گومانێك کەسێکی قین لە دڵە. جا هەروەك لە داواکاری گشتیی دادگای "دەنیزلی" ئومێدمان دەکرد، لە داواکاری دادگای "ئافیوون"یش ئومێدەوارین کە لە ڕەخنە و ڕقی ئەو داخ لە دڵانە ڕزگارمان بکات و، حەقیقەت و ڕووی ڕاستەقینەی دادگەری دەربخات.

**بناغەی پێنجەم:**

یەکێك لە دەستووره بنەڕەتی‌یەکانی قوتابیانی نوور تونەخن نەکەوتنی سیاسەتە بە پێی توانا و خۆهەڵنەقورتاندنە لە کاروباری حکومەت. چونکە خزمەتکردنی قورئان – بە ئیخلاس و خاوێنی – سەروزیادیانە و پێویستی‌یان بە هیچ شتێکی تر ناهێڵێتەوە..

---

(١) ڕووداوی ٣١/مارت/١٣٢٥ (بە تەقویمی ڕۆمی) بریتی‌یە لە هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازی و ملنەدانی سەربازەکان بۆ فەرمانی فەرماندەکانیان. ئەم ڕووداوە یەکەم جار لە سەربازگەی "تاش قشلە"ی ئەستەمبوڵ سەری هەڵدا، پاشان سەربازگەکانی تری شاری گرتەوە و، ئنجا سەربازە هەڵگەڕاوەکان ڕژانە ناو شەقامەکان و هەندێ وەزیر و پەرلەمانتار و ئەفسەریان کوشت. خۆ ئەگەر ئەو وتارانەی مامۆستا نوورسی نەبوایە کە دەرۆشت لەناو سەربازگەکانیاندا ئاراستەی دەکردن لەوانەبوو گەلێ ئاکامی ناهەموار لەو هەڵگەڕانەوەسەربازی‌یە بکەوتایەتەوە، بەڵام وتارەکانی مامۆستا هۆکارێکی گرنگ بوون لە هێدی کردنەوەی سەربازە هەڵگەڕاوەکاندا. ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژی ١٣/نیسان/١٩٠٩زدا دەستی پێ کرد، واتە دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتیەت(ڕژێمی پەرلەمانی)ی دووهەم و هاتنەسەرحوکمی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی. ئنجا سوڵتان عەبدولحەمید تاوانبار کرا بە سازدانی ڕووداوەکە و، کۆمەڵەی ناوبراو کۆمەکی سەربازیی لە شاری سولانیکەوە — کە بنکەی سەرەکی‌یانی لێ بوو — هێنایە ناو شاری ئەستەمبوڵ. خۆ هەرچەندە سوڵتان عەبدولحەمید دەیتوانی ئەو هێزە سەربازی‌یە تەفروتوونا بکات، بەڵام لەبەر نەڕشتنی خوێنی ناهەق لە ڕووداوێکدا کە دەستێکی پەنهانی لە پشتەوە بوو ڕووبەڕووی ئەو کۆمەکە سەربازی‌یە نەبووەوە. دوابەدوای گەیشتنی هێزە سەربازی‌یەکە باری نائاسایی ڕاگەیەنرا و هەڵگەڕانەوەکەش سەرکوت کرا و دادگای سەربازی پێك هێنرا و گەلێ کەسی پێ لە سێدارە درا. ئنجا کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی ئەم ڕووداوەی قۆزتەوە و لە ٢٧/نیسان/١٩٠٩دا سوڵتان عەبدولحەمیدی لەسەر کورسیی حوکم لابرد. بەم جۆرە و لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت کە ڕووداوەکە هەر لە بناغەدا بۆ ئەو دەرەنجامە ساز کرابووا (وەرگێڕ)

پاشان ئەوانەی کە ڕۆشتوونەتە ناو گۆڕەپانی سیاسەتەوە، لەم کاتەدا کە چەندین تەوژمی بەهێز لە ئارادایە، هەرگیز کەسیان ناتوانێت پارێزگاری لە سەربەخۆیی و ئیخلاسی خۆی بکات، چونکە یەکێك لەو تەوژمانە بەلای خۆیدا کێشی دەکات و وای لێ دەکات کە لە بەرژەوەندیی ئەودا و بۆ حسابی ئەو کار بکات. کە بەمەش پاکوخاوێنیی کار و خزمەتەکەی لە دەست دەدات.

پاشان سەخت ترینی جۆرەکانی ستەم و توندوتیژترینی جۆرەکانی خۆسەپاندن و ئیستیبداد کراون بە دەستوور و یاسای ململانێ و کێشەی ماددی لەم سەردەمەدا، کەئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە زۆر کەسی بێ تاوان ببێت بە قوچی قوربانیی هەڵەی تەنیا کەسێك، یان بە جۆرێ گیرۆدە دەبێت کە کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەدات. ئەو کاتەش هەر کەسێك لەبەر دنیا وازی لە ئایینەکەی هێناوە یان ئایینەکەی خۆی کردووە بە هۆکارێك بۆ بەدەستهێنانی دنیا، پێی وا دەبێت کە ڕاستییەکانی قورئان - ئەو ڕاستییانەی کە نابێت بۆ هیچ شتێك بەکار بهێنرێن و بقۆزرێنەوە - لە بواری پڕوپاگەندەی سیاسیدا بەکارهێنراوە.

پاشان هەموو کەسێکی سەرجەم چینەکانی نەتەوە، نەیاران و لایەنگران.. کارمەندان و خەڵکانی تر، هەر یەکەیان بەشی خۆی لەو ڕاستییانەی قورئاندا هەیە و پێویستی پێیانە..

لەبەر ئەمانە، دەبێ قوتابییانی نوور هەر وا بە بێ لایەنیی تەواوەتی بمێننەوە و، گەلێ پێویستە کە خۆیان لە قەرەی سیاسەت و ململانێی ماددی نەدەن و بەشداریی تێدا نەکەن.

**بناغەی شەشەم:**

کەس مافی ئەوەی نییە کە بە بیانووی قسوور و ناتەواوی لە مندا یان لە هەندێ لە براکانمدا هێرش بکاتە سەر پەیامەکانی نوور، چونکە "پەیامەکانی نوور" ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە قورئانی پیرۆزەوە، قورئانیش پەیوەستە بە عەرشی مەزنی خوای گەورەوە. کەواتە کێ هەیە بتوانێت دەست بۆ ئەوێ درێژ بکات و ئەو پەتە قایمانە خاو بکاتەوە!

پاشان هەرگیزاو هەرگیز ناکرێ پەیامەکانی نوور بەرپرس بکرێن لە نەنگی و ناتەواوییەکانی ئێمە، چونکە بەرەکەتی ماددی و مەعنەویی ئەم پەیامانە و خزمەتە

مەزنەکانیان بە ئاماژەی سی و سێ ئایەتی قورئانی پیرۆز و سێ کەرامەتی ئیمامی عەلی - خوای لێ رازی بێت - و هەواڵەکانی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّه - هاتووەتە دی. دەنا ئەم وڵاتە ڕووبەڕووی چەندین زیانی ماددی و مەعنەویی ئەوتۆ دەبێتەوە کە چارەسەر و قەرەبوو نەکرێتەوە.

بە پشتیوانیی خوای گەورە، سەرجەم فرت و فێڵ و پیلانە شەیتانییەکان و هێرشەکانی مولحیدانی دوژمنی پەیامەکانی نوور شکست دەهێنێت و پووچەڵ دەبێتەوە، چونکە قوتابیانی نوور وەکو کەسانی تر نین. بە پشتیوانی و چاودێریی خواوەند ناتوانرێت پەرتەوازە بکرێن و ناچار بکرێن واز لە بانگەوازەکەیان بهێنن، یان بە سەریاندا زاڵ ببن.

قوتابیانی نوور کە لە هەموو شوێنێکدا هەن و ڕێز و خۆشەویستیی جەماوەری ئەم نەتەوەیەیان بەدەست هێناوە - کە ئەمەش بە شتێکی زیندوو دادەنرێت لەم نەتەوەیەدا - ئەو قوتابیانەی نوور، جگە لەوەی کە قورئان ڕێی بەرگریی ماددییان پێ نادات، خۆیشیان هەرگیز بەشداری لە ڕووداوێکی جوزئیی وەك ڕووداوەکانی لەمەڕ شێخ سەعیدی پیران و ڕووداوی "مەنمەن"دا[1] ناکەن. چونکە ئەگەر خوا نەخواستە ستەمێکی توندوتیژی لە ڕادەبەدەریان لێ بکرێت و هێرش بکرێتە سەر پەیامەکانی نوور ئەوا ئەو مونافیق و مولحیدانەی کە حکومەتیان خەڵەتاند، بێ هیچ گومانێك پەشیمان دەبنەوە.

**بە کورتی:**

مادەم ئێمە کارمان بەسەر دنیای ئەهلی دنیاوە نییە، دەبێ ئەوانیش حەقیان بەسەر قیامەتمان و خزمەتی ئیمانیمانەوە نەبێت.

* * *

(١) پێ دەچێ کە ڕووداوێکی دروستکراو بووبێت لە لایەن حکومەتی مستەفا کەماڵەوە. گوایا لە مزگەوتێکی ناحیەی "مەنمەن" بە سەرکردایەتیی کەسێکی شێت خەڵکەکە لە حکومەت هەڵگەڕاونەتەوە! ئەمە کرا بە بیانوویەك بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دڕندانە دەست لە خەڵکی شارەکە بووەشێنن و هەست و نەستی ئیسلامیی موسڵمانانیش زامدار بکەن. (وەرگێڕ)

(وا لە خوارەوەدا خاتیرەیەکی دێرین و بەسەرهاتێکی جوانی بەرگری لە بارەی دادگای "ئەسکی شەهر"ەوە دەهێنین کە تا ئێستا پەنهان بووە و، لەناو دۆسیە ڕەسمی‌یەکانی دادگادا نی‌یە و، لەو بەرگری‌یەشمدا نەهاتووە کە لە بەردەم دادگای ناوبراودا کردم).

لەوێ لێیان پرسیم:

ڕات سەبارەت بە سیستەمی کۆماری چی‌یە؟

پێم وتن:

دەتوانن لە ڕێی کتێبی (مێژووی ژیان)مەوە، کە لە بەردەستی خۆتاندایە، دڵنیا ببن لەوەی کە من پێش ئەوەی ئێوە بێنە دنیا - جگە لە سەرۆکی دادگا کە مرۆڤێکی بە تەمەنە - کەسێکی ئاییندار و لایەنگری سیستەمی کۆماری بووم. پوختەی ئەوەش بەم جۆرەیە کە :

"ئەو کاتە من - وەك ئێستام - گۆشەگیر بووم لە ژێر گومەزێکی چۆڵدا. کاتێ کە شۆربایان بۆ دەهێنام دەنك و دانەکانی ناو شۆرباکەم دەردەهێنا و بۆ مێرووڵەکانم ڕۆدەکردن و، خۆیشم نانەکەم بە شلەکەی تەڕ دەکرد. جا ئەو کاتە کە لێیان پرسیم بۆچی وات دەکرد، وتم:

- نەتەوەی مێرووڵە و هەنگ لە ژێر سایەی ڕژێمێکی کۆماریدا دەژین، منیش لەبەر ڕێزنانم لە ڕژێمە کۆماری‌یەکەیان دانی ناو شۆرباکەم بۆ ڕۆ دەکردن.

پێیان وتم:

- تۆ بەم کارەت ڕەفتارێکی پێچەوانەی سەلەفی صالحت کردووە.

لە وەڵامدا وتم:

- خەلیفە ڕاشیدەکان هەروەك خەلیفە بوون، لە هەمان کاتدا سەرۆك کۆماریش بوون. ئەوەتا صیددیقی مەزن (خوای لێ ڕازی بێت) بێ هیچ گومانێك وەك سەرۆك کۆمار وا بووە بۆ عەشەرەی موبەششەرە و سەرجەمی هاوەڵان، بەڵام نەك لە ژێر ناونیشان و لە قاوغێکی بەتاڵدا، بەڵکو هەریەکەیان سەرۆك کۆمارێکی ئایینداربوون و، واتای دادگەریی ڕاستەقینە و سەربەستیی شەرعی‌یان لەخۆدا هەڵگرتبوو.

کەواتە ئەی داواکاری گشتی و ئەی ئەندامانی دادگا! ئێوە بە دوژمنایەتی کردنی بیرێك تۆمەتبارم دەکەن کە من ماوەی پەنجا ساڵە هەڵگری ئەو بیرەم!

خۆ ئەگەر پرسیارەکەتان سەبارەت بە کۆمارێتیی عیلمانی‌یەوە بێت، ئەوا من هێندەی لـێ دەزانم کـە واتـای "عیلمانیـەت" مانەوەیـە لـە بێ لایـەنیدا. جـا هـەروەك ئـەو چەشـنە حکوومەتە بە بیانووی ئـازادیی ویژدانـەوە کـاری بەسـەر مولحیـدان و کەسـانی هـەرزەوە نی‌یە، دەبێ بە هەمان شێوە حەقی بەسەر ئایینداران و ئەهلی تەقواشەوە نەبێت. جـا ئێستا من ئاگام لە بارودۆخی سیاسی و ئەو حاڵەتانـە نی‌یـە کـە حکوومـەتی کۆمـاری تیایدایـە، چونکە بیسـت و پێنـج ساڵە لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی دابـڕاوم و دووره پـەرێزم. جـا ئەگـەر ڕۆشتبێتە ناو قۆناغێکی ترسناکەوە لە بەرژەوەندیی مولحیدان و یاسـای وای دارشتبێت - خوا پەنامان بدات - هەموو ئەو کەسانە تاوانبار بکات کە بۆ قیامەت و ئیمانی خۆیـان تێدەکۆشن، ئەوا من بە بـێ هیـچ تـرس و بیمێـك پێتـان دەڵێم: ئەگـەر هـەزار گیـانم ببێـت هەرگیز دوودڵ نیـم لـەوەدا کە هەرهـەموویان لـەپێناوی قیامـەت و ئیمانەکەمدا بـەخت بکەم. ئێوەش چیتان پێ دەکرێت بیکەن و، دوا گوفتاری من ئەوە دەبێت کە:

﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوكيل﴾.

جـا ئەگـەر ئیعدامـم بکـەن بـە ناحـەق و سـتەم، یـان بڕیـاری بـەندی و کـاری قورسـم بەسەردا بسەپێنن، ئەوا من بەم وتەیەم بەرپەرچتان دەدەمەوە و، دەڵێم:

بە فەزڵی ئەو ڕاستی‌یانەی کە پەیامەکانی نوور ئاشکرایان کردوون، مـن ئیعـدام نـابم، بەڵکو تەسریح دەبم و دەڕۆم بۆ جیهانی ڕووناکی و بەختەوەری. بەڵام ئێوە ئەی دوژمنانی پەنهان و خۆشارەوەی پشتی پەردە کـە لـە پێنـاوی گومڕاییـدا دەمانـهاڕن! بزانـن کـە مـن بەوپەڕی دڵنیایی و ئاسـوودەیی‌یەوە ئامـادەم گیـانم ببەخشـم، چونکـە دەزانم و دەبینـم کـە ماوەیەکی تر بڕیاری ئیعدامی هەمیشەیی و زیندانـی تاکـە کەسـی و هەتاهـەتاییتان لـەسـەر دەردەکرێت. کەواتە تۆڵەی من لە ئێوە بە تەواوی دەسێنرێتەوە.

لە دادگادا ئەمەم پێ وتن.

**بناغەی حەوتەم:**

بە پشـت بەسـتن بـە چـەند لێکۆڵینەوەیـەکی ڕووکـەش کـە لـە چـەند شـوێنێکی تـردا کراون، دادگای "ئـافیوون" ئێمـە بـە (هـەوڵدان بـۆ دامـەزراندنی کۆمەڵەیـەکی سیاسـی) تاوانبار دەکات.

منیش لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێم:

یەکەم: هەموو ئەو کەسانەی هاورێیەتیی منیان کردووە شایەتی دەدەن کە وا ماوەی نۆزدە سالی ڕەبەقە تەنانەت یەك دانە ڕۆژنامەم نەخوێندووەتەوە و گوێم لە خوێندنەوەی نەگرتووە و پرسیاریشم لەبارەوە نەکردووە. ئنجا لە ماوەی دە سال و پێنج مانگدا جگە لە هەوالی شکستی ئەلمانیا و مەترسیی شیووعی هیچ هەوالێکی ترم نەزانیوە و حەز و ئارەزووشم لە زانینی نەبووە.

کەواتە کەسی ئاوا هەرگیز ناگونجێ بچووکترین پەیوەندیی بە سیاسەت و کۆمەلە سیاسییەکانەوە هەبێت.

دووهەم: هەر سەد و سی پەیامەکانی نوور لە بەردەست و پێش چاودان، دادگای "ئەسکی شەهر"یش قەناعەتی کرد بەوەی کە جگە لە ڕاستییەکانی ئیمان هیچ ئامانجێکی تر و هیچ مەبەستێکی دنیایی لەم پەیامانەدا نییە. هەر لەبەر ئەوە بوو کە یەك دوو پەیام نەبێت، بە خراپە توخنی هیچ کام لەو ئەو پەیامانە نەکەوت.

بەلام دادگای "دەنیزلی" توخنی هیچ کام لە پەیامەکان نەکەوت و، دەزگای مەزنی ئاسایشی "قەستەمۆنی"یش سەرباری ئەوەی کە ماوەی هەشت سالی تەواو چاودێر و پشکنینی بەردەوامیان لەسەر دانایین، یەك دوو کەس نەبێت لەوانەی کە لە کاروبارەکانمدا یارمەتیم دەدەن و سێ کەسی تر نەبێت کە بە چەند بیانوویەکی لاواز تۆمەتباریان کردن، هیچ کەسێکی تریان دەست نەکەوت کە تۆمەتیان ئاراستە بکەن.

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە قوتابیانی نوور بە هیچ شێوەیەك کۆمەلەیەکی سیاسی پێکناهێنن.

خۆ ئەگەر چەمکی (کۆمەلە) لای داواکاری گشتی بریتی بێت لە کۆمەلێکی ئیماندار کە بۆ قیامەتی خۆی تێبکۆشێت، ئەوا لە وەلامدا پێی دەلێین: هەرکات ناوی (کۆمەلە)تان بۆ خوێندکارانی زانکۆ و پیشەوەرانی هەر پیشەیەك بەکارهێنا، ئەو کاتە دەکرێ ناوی (کۆمەلە) بەو چەمکە لە ئێمەش بنرێت.

بەلام ئەگەر مەبەست کۆمەلە کەسانێك بن کە بە هاندەری ئایینی ئاسایشی ناوخۆ تێك بدەن، ئەوا لە بەرپەرچیدا دەلێین:

تێوەنەگلانی قوتابیانی نوور لە ماوەی بیست سالدا و لە هیچ شوێنێکدا بە هیچ ڕووداوێکەوە کە ئاسایش تێك بدات و تۆمار نەکردنی هیچ ڕووداوێك لە دژی ئەوان نە

لە لایەن حکوومەت و نە لە لایەنی دادگاوە، درەخشانترین بەڵگەیـە لەسەر بەتاڵی و بێ بناغەیی ئەو تۆمەتە.

خۆ ئەگەر لەو گومانەشدا بن کە بەهێزکردنی هەست و سۆزی ئایینی لە داهاتوودا - نەك ئێستا - دەبێت بەهۆی تێکدانی ئاسایشی ناوخۆیی و، مەبەستیشتان لە تۆمەتبارکردنی ئێمە بە تۆمەتی دامەزراندنی "کۆمەڵە" ئەمەیە، ئەوا دەڵێین:

یەکەم: هەموو واعیزەکان (لە پێشەنگیانەوە سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی) هەمان خزمەت ئەنجام دەدەن.

دووهەم: قوتابیانی نوور نەك هەر دوورن لە زیان گەیاندن بە ئاسایش و تێکدانی ئارامی، بەڵکو بە هەموو هێز و قەناعەتێکیان بۆ پاراستنی نەتەوە لە ئاژاوە و پشێوی کار دەکەن و، بە هەموو توانایەکیشیان هەوڵی دابین کردنی ئاسایش و ئارامی دەدەن. بەڵگەی ئەمەش لە بناغەی یەکەمی سەرەوەدا هاتووە.

بەڵێ، ئێمە کۆمەڵێکین ئامانج و بەرنامەمان لە پێشدا ڕزگار کردنی خۆمان و پاشان ڕزگارکردنی نەتەوەکەمانە لە ئیعدامی هەمیشەیی و بەندیخانەی تاکە کەسیی هەتاهەتایی بەرزەخ و، پاراستنی هاونیشتمانییەکانمان لە ژیانی پشێوی و هەرزەیی و، پارێزگاریی خۆیشمانە (بە ڕاستییە پۆڵایینە بەهێزەکانی پەیامەکانی نوور) لەو ئیلحادەی کە دەیەوێت ژیانی دنیا و قیامەتمان لەناو بەرێت.

**بناغەی هەشتەم:**

ئەوانە دەچن چەند وشەیەکی کاریگەری پەیامەکان دەکەن بە بیانوو و، پشت بە چەند لێکۆڵینەوەیەکی ساکاری هەندێ شوێن دەبەستن و، بەو بەهانەیە تۆمەتمان ئاراستە دەکەن. ئێمەش لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:

مادەم ئامانجمان تەنها لە ناوەندی ئیمان و دوارۆژدایە، نەك لە ململانێ و مشتومڕ لەگەڵ ئەهلی دنیادا..

مادەم ئەو گوفتارە توندوتیژەی لە یەك دوو پەیامدا هاتووە لەلایەن ئێمەوە جێی مەبەست نەبووە، بەڵکو بە شێوەیەکی لاوەکی و لەو کاتەدا کە بەرەو ئامانجەکەمان دەڕۆشتین دووچاری بووین..

مادەم گریمان و ئەگەرەكان شتێكن و ڕووداوە ڕاستەقینەكانیش شتی تری تەواو جیاوازن، چونكە ئەو تۆمەتەی ئاراستەمان كراوە ئەوە نی‌یە كە ئێمە ئاسایشمان تێكدابێت، بەڵكو ئەوەیە كە گوایا گریمانی ئەوە هەیە و دەگونجێ تێكی بدەین. دیارە ئەمەش تۆمەتێكی لە بناغەدا بەتاڵ و نابەجێیە و، وەك ئەوە وایە كەسێك بە تاوانی كوشتن تاوانبار بكرێت لەسەر ئەو بناغەیەی كە لەوانەیە ئەو كوشتنە ئەنجام بدات!

لە كاتێكدا كە سەرجەمی دادگاكان لە "ئەسكی شەهر" و "قەستەمۆنی" و "ئیسپارتە" و "دەنیزلی" وێرای لێكۆڵینەوەی وردیش كەچی نەیانتوانی یەك دانە بەڵگەی تاوانبار كردن لە نێوان هەزاران نوسخەی پەیامەكانی نوور و نامە گۆڕینەوەی نێوان دەیان هەزار كەس لە ماوەی بیست ساڵدا بدۆزنەوە.

خۆ هەرچەندە دادگای "ئەسكی شەهر" جگە لە پەیامێكی بچووك شتێكی تری دەست نەكەوت بیكات بە بیانوو، بەڵام لە ڕێی بەكارهێنانی ماددەیەكی یاسایی بە شێوەیەكی پلاستیكی بەرپرسیاریی خستە ئەستۆمانەوە. ئنجا هەرچەندەش ئەو دادگایە بە چەشنێك ڕەفتاری نواند كە ئیدانەی تێدا بێت بۆ هەر كەسێك وانەیەكی ئایینی بلێتەوە، كەچی نەیتوانی جگە لە تەنها پازدە كەس و بۆ ماوەی تەنها شەش مانگ لە نێوان سەد كەسدا بڕیار لەسەر كەسی تر دەربكات.

خۆ ئەگەر وا دابنێین كەسێكی وەك ئێمە لە نێوان ئێوەدا بێت و لێكۆڵینەوەی ورد لەسەر بیست نامەی بكرێت كە لە ماوەی یەك ساڵدا ئەو نامانەی نووسیبێت، ئایا ناگونجێ بیست ڕستەیان تێدا بدۆزرێتەوە كە دووچاری هەڵوێستی سەخڵەت و بەرپرسیاریی بكات؟

كەواتە دەستەوسانی لە دۆزینەوەی بیست ڕستەی ڕاستەقینە كە خاوەنەكەی ئیدانە بكات لە نێوان بیست هەزار نوسخەی پەیامەكان و نامە گۆڕینەوەی نێوان بیست هەزار كەس لە ماوەی بیست ساڵدا، بەڵگەیەكی گومان بڕە لەسەر ئەوەی كە ئامانجی ڕاستەوخۆی پەیامەكانی نوور ئەودنیایە و، پەیوەندیی بەم دنیاوە نی‌یە.

**بناغەی نۆهەم:**

لە بڕیاری داواكاری دادگای "ئافیوون"دا هەمان ئەو ماددانە تۆمار كراونەتەوە كە داواكاری گشتیی بە ویژدانی دادگای "دەنیزلی" و، چەند دادوەرێكی لێكۆڵینەوەی بێ

ویژدان و ڕوالـەت بینی چـەند شـوێنێکی تر هێنابوویـان. وەك لـەو مامەڵـەوە هەستی پێ دەکرێ کە لە دەمی لێکۆڵینەوەدا لەگەڵماندا کرا و، ماددەکانیش هەر ئەوانەی دادگای پێشوون و، ئەو نامانەش کە لە ماوەی دە ساڵ یان پازدە بیست ساڵدا نووسراون، بە بێ دەستنیشان کردنی هیچ بەروارێك پێش چاو خراون.

خۆ هەموو ئەو ماددانە لە بناغەی سێهەم و پرسیاری دووهەمدا وەڵام دراونەتەوە کـە لـەبارەی تیشکی پێنجەم و هـەر سـی و سـێ پـەیام و نامەکانەوەن و، دادگـای "ئەسـکی شەهر" بە وردی لێکۆڵینەوەی لەسـەر کـردن و ماوەیـەکمان لـە سـزایاندا بەسـەر بـرد و پاشـان یاسـاکانی لێبـوردن گرتنیەوە و، دادگـای "دەنیزلی"ش بڕیـاری بـێ تـاوانیی بـۆ دەرکردن. کەچی وا ئێستا هـەوڵی دۆزینـەوەی چـەنـد بڕوبیانـوویەکی لاواز دەدەن لـەو پەیامانەدا تـاکـو - جـارێکی تر - بیکەن بە مایەی تۆمەتبار کردنمان.

ئایـا کەسـێك کـە لـە ڕووداوی (٣١)ی مـارتدا تەنـها بـە وتـارێکی خـۆی هەشـت کەتیبەی سوپای هێنایەوە ژێـر گوێڕایـەڵی، لـە کـاتێکدا کـە هیـچ بایـەخێکیان بـە قسـەی شێخولئیسلام و زانایان نەدا.. ئایا دەگونجێ ئەو کەسە لە ماوەی ئەم هەشت ساڵەدا تەنها ئەو چەند مرۆڤە کەمانـە بخافڵێنێت؟ ئایـا دەگونجێ بوترێ: ئـەو کەسـە لـە پارێزگایـەکی گەورەی وەك قەستەمۆنیدا تەنها دەرفەتی پێنج کەسی بۆ ڕەخساوە کە فریویان بدات؟

ئەوەتا هەموو کتێبەکانم و نامە تایبەتی و ئاشکرا ونهێنییەکانی منتان لـە قەستەمۆنی و ڕووداوەکانی "دەنیزلی"دا هێنایەدەر و، دوای لـێ ورد بوونەوەی ماوەی سـێ مـانگ لـەو پارێزگـا گەورەیـەدا جگـە لـە فـەیزی و ئـەمین و حیلمـی و تۆفیـق و صـادق کەسـی تریـان نەدۆزییەوە. کە ئەو پێنج کەسەش لەبەر خوای گەورە لە کاروباری کەسی و تایبەتیمدا یارمەتیم دەدەن. لە ماوەی سێ ساڵ و نیویشدا لە "ئەمیرداغ" تەنها سـێ هـاوڕێی ئێمـەیان شك برد، ئەوانیشیان نارد بۆ لامان..

جا ئەگەر من بەو جۆرە کارم بکردایە کە لـەو لێکۆڵینـەوە سـاکارانەدا هـاتووە، ئـەوا نەك پێنج کەس و دە کەس، بەڵکو دەمتوانی پێنج سەد، بگـرە پێـنج هـەزار، تەنانـەت پێنج سەد هەزار کەس بخافڵێنم و فریویان بدەم!

وا لـە خـوارەوەدا یـەك دوو نموونـەی ئەو قسـەیەم ڕوون دەکەمـەوە کـە لـە دادگـای "دەنیزلی" لە پێناوی ڕاستی و بۆ دەرخسـتنی مـەودای هەڵـەی ئـەواندا پێـم وتـن، ئـەوەبوو وتم:

ئەوان گوایا لەسەر ئەوە یەخەمان پێ دەگرن کە ئێمە - وەك شوێنکەوتنی عادەتێکی ئیسلامی کە هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە - چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزمان کۆ کردووەتەوە لەوانەی کە یارمەتیی مرۆڤ دەدەن بۆ تێفکرین لە نیشانەکانی گەورەیی و دەستەڵاتی خوای گەورە لە گەردووندا، کە هەر ئەو ئایەتانەن سەرچاوەی پەیامەکانی نوور پێکدەهێنن و ناومان ناون: (حزب القرآن).. ئایا دەگونجێ کەسێك کە ئەم چەشنە کارە ئەنجام بدات پێی بوترێ: ئەوانە دەستکاریی ئایین دەکەن؟

پاشان دوای ئەوەی کە ساڵێك سزام چەشت لەسەر "پەیامی حیجاب" کە لە ژێر چەندین لیژنە دار و کەرەسەی سووتەمەنیدا دۆزییانەوە و، ئەم ساڵ نووسراوەتەوە و بڵاوکراوەتەوە، دەیانەوێ جارێکی تر تاوانبارمان بکەنەوە لەسەری.

ئنجا کاتێ کە من بە چەند وشەیەکی توندوتیژ ڕەخنەی ڕاستەوخۆم ئاراستەی ئەو کەسە ناسراوە کرد کە سەرۆکایەتیی حکوومەتی لە ئەنقەرە گرتە دەست، خۆی هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو بەرامبەرم، بەڵکو بێدەنگیی هەڵبژارد. کەچی لە دوای مردنی، ڕاستیی فەرموودەیەکی پیرۆز - کە من پێش چل ساڵ نووسیبووم - هەڵەکەی ئەوی دەرخست..

جا ئەو ڕاستییە و ئەو ڕەخنانەش کە سروشتی و پێویست بوون، ئێمە لە لایەنی خۆمانەوە بە نهێنی و تایبەت، نەك گشتی و ئاشکرا، هەڵمان گرتبوون. بەڵام داواکاری گشتی بە فێڵ شکاندیەوە بەسەر ئەو کەسەدا و بەرپرسیارییەکەشی خستە ئەستۆی ئێمەوە.

ئیتر ئایا دادگەریی یاسا، کە ڕەمز و یادگاریی نەتەوەیە و یەکێکە لە درەوشانەوەکانی خوای گەورە، لە کوێ و.. خاتری کەسێکیش کە مرد و پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە نەما، لە کوێ؟

پاشان ئازادیی ویژدان و بیروباوەڕ کە حکوومەت کردوویەتی بە بناغەی کارەکانی، ئێمە پاڵمان پێوە داوە و پشتمان پێ بەستووە و، هەر بەو ماددەیەش داکۆکیمان لە مافەکانمان کردووە، کەچی دادگا کردوویەتی بە مایەی بەرپرسیاریی ئێمە، وەك بڵێی ئێمە دژی ئازادیی ویژدان و بیروباوەڕ بین.

لە پەیامێکی تردا ڕەخنەم لە لایەنە خراپ و ناتەواوەکانی شارستانێتیی ئێستا گرت، کەچی فایلی لێکۆڵینەوەکە شتێکی وای داوەتە پاڵم کە هەرگیز بە ئەندێشەمدا نەهاتووە و، منی وەکو کەسێك پیشان داوە کە بەکارهێنانی ڕادیۆ[1] و سواربوونی شەمەندەفەر و فڕۆکە ڕەت بکاتەوە و، دەیەوێ بەرپرسم بکات لەوەی کە دژی پێشکەوتنی شارستانێتیی سەردەم بم!

جا بە سەرنجدان لەم چەشنە نموونانە، ڕادەی دووریی ئەم مامەڵەیە لە دادگەرییەوە دەزانرێت. ئومێدەوارین کە دادگای "ئافیوون" بە وێنەی دادگای گشتیی "دەنیزلی" و داواکارە گشتییەکە بە ویژدانەکەی، بایەخ بەو چەشنە وەهم و گومانانە نەدات کە لەو دۆسیەدا هاتوون.

لە هەموو ئەوانە نامۆتر ئەوەیە: نیعمەتە مەزنەکانی فڕۆکە و شەمەندەفەر و ڕادیۆ، کە دەبوو شوکری خوای گەورەیان لەسەر پێشکەش بکرایە، کەچی مرۆڤەکان لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەوە شوکری خوایان نەکرد و، لە ئەنجامی ئەمەدا بۆمبای فڕۆکەکانیان بەسەردا باری!

ڕادیۆش نیعمەتێکی هێندە مەزنی خوای گەورەیە کە دەبێ شوکری ئەو نیعمەتە بەکارهێنانی بێت وەك ئامێرێکی قورئان خوێنی ئەوتۆ قورئان بە گوێی گرۆی ئادەمیزاددا بدات..

لە "وتەی بیستەم"دا وتم: قورئانی پیرۆز هەواڵی لەبارەی کارە دەراساکانی شارستانێتیی نوێ داوە و، لەوێ لە دەمی باسکردنی ئاماژەیەکی قورئانی پیرۆزدا ڕوونمان کردەوە کە کافرەکان لە ڕێی "شەمەندەفەر"ەوە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا زاڵ دەبن.

جا لەو کاتەدا کە من موسڵمانان بۆ بەدەستهێنانی ئەم چەشنە داهاتووە نوێیانە هان دەدەم، کەچی داواکاری گشتیی چەند دادگایەکی پێشوو کردوونی بە مایەی تاوانبارکردنمان، وەك بڵێی من لە دژی ئەم داهێنانە نوێیانە بم.

(١) بە مەبەستی پێشکەش کردنی شوکرانەبژێری بۆ خوای گەورە لەسەر نیعمەتی ڕادیۆ، کە نیعمەتێکی گەورەی خواییە، وتم: "ئەو شوکرانەیە بە خوێندنی قورئانی پیرۆز دەبێ لە ڕادیۆدا، تاکو ئەو دەنگە زوڵاڵە بدات بە گوێی هەموو جیهاندا، بەمەش هەوا دەبێت بە خوێنەری قورئانی پیرۆز". (دانەر)

ئنجا کەسێك وتی: پەیامەکانی نوور لە نووری قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە، واتە ئیلهامیان لەو وەرگرتووە و میراتگرێکە ئەرکی ڕیسالەت و شەریعەت ئەنجام دەدات. کەچی داواکاری گشتی واتایەکی تەواو هەڵەی لەو قسەیە دایەوە و شتێکی وت کە هەرگیز پەیوەندیی پێوە نییە، گوایا پەیامەکانی نوور (پێغەمبەرن)! ئەمەشیان کرد بە مایەی تاوانبار کردنمان.

لە بیست شوێنی بەرگرییەکەمان و بە چەندین بەڵگەی گومان بڕ چەسپاندمان کە ئێمە قورئان و پەیامەکانی نوور ناکەین بە ئامراز و هۆکار تەنانەت بۆ بەدەستهێنانی سەرانسەری دنیاش. بەڵکو یەك دانە ڕاستیی ئەوان ناگۆڕینەوە بە هەموو دەستەڵاتی دنیا بە گشتی. لە ڕاستیشدا هەر وەهاین. هەزاران نیشانە لەسەر ئەم دەعوایەمان هەیە.

بەڵام لە بەڕێوەچوونی کارەکانی دادگای "ئافیوون" و ئەو بڕیارەشی کە لەسەر بناغەی لێکۆڵینەوەی تر دەری کردووە، وا دەردەکەوێ کە پێیان وابێت ئێمە دنیامان مەبەستە و، تەنها خەریکی پیلان دارشتن و بەدەستهێنانی چیلکە و چەوێڵی دنیاین و، ئایین دەکەین بە ئامرازی دەستخستنی چەند ماددەیەکی بێ نرخ و لە شان و شکۆی دادەگرین و، لەسەر ئەم بناغەیە تاوانبارمان دەکەن.

جا مادەم وایە، ئەوا بە هەموو توانایەکمان دەڵێین:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

## پاشماوەی ئەو ئیعتیرازەی کە پێشکەش بە دادگای "ئافیوون" کرا

**ڕووی گوفتارم لەم ئیعتیرازەدا لە دادگای "ئافیوون" و داواکارە گشتییەکەی نییە، بەڵکو لەو کارمەندانەیە کە لێرە و لە فەرمانگەی لێکۆڵینەوەکاندان، لەوانەی کە شك و گومان و مەبەستی کەسییان لەخۆدا هەڵگرتووە و، سەنگەر لە دژمان دەگرن و، پشت بە چەند لێکۆڵینەوەیەکی ناتەواو یان بە چەند هەواڵێکی هەڵبەستراو دەبەستن کە هەندێ داواکاری گشتی و هەواڵدەران و پشکنەرانی شوێنانی تر کردبوویان بە بڕوبیانووی دەستیان.**

یەکەم: بڕینی ناوی کۆمەڵە – کە هەر بە خەیاڵدا نایەت و هیچ بناغەیەکی نییە – بەسەر قوتابییە بێ تاوانەکانی پەیامەکانی نووردا، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە سیاسەتەوە نییە.. پاشان لەقەڵەمدانی ئەو داماوانەی کە ڕۆشتوونەتە ناو ئەو بازنەیە و جگە لە ئیمان و ئاخیرەت هیچ ئامانجێکی تریان نییە، بە ئەندامانی کارا و بڵاوکەرەوەی ئەو کۆمەڵەیە.. هەروەها تاوانبار کردنی ئەو کەسانەی کە پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە، یان ئەو پەیامانەیان بە کەسێك داوە بیانخوێنێتەوە، یاخود نووسیویانەتەوە، ئنجا بردنیان بەرەو دادگا لەسەر ئەوە.. هەموو ئەم چەشنە کارانە، دوورکەوتنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لە دادگەری.

بەڵگەی بێ گومانیش لەسەر ئەم قسەیەمان ئەوەیە کە:

خوێنەرانی کتێبە زیانبەخشە ژەهراوییەکانی وەك کتێبەکەی دکتۆر دووزی و هاوچەشنی لەو کتێبانەی کە هێرش دەکەنە سەر قورئانی پیرۆز، لە ژێر ناوی دەستووری ئازادیی فیکر و ئازادیی زانستیدا چاوپۆشییان لێ دەکرێت و بە تاوانبار دانانرێن، کەچی خوێندنەوە و نووسینەوەی ئەو پەیامانەی نوور بە تاوان دادەنرێت کە لە

ڕاستی‌یەکانی قورئان و ئیمان دەدوێن و، وانەی ئەو ڕاستی‌یانە بەو کەسانە دەڵێنەوە کە پێویستیان پێیانە و، تاسەمەندی زانینیانن و، وەك خۆری درەخشان بۆیان ڕوون دەکەنەوە!

ئەوان لەسەر چەند ڕستەیەك تاوانبارمان دەکەن کە لە هەندێ پەیامی پەنامەکیدا هاتوون لەو پەیامانەی کە لەبەر ئەوەی بە هەڵە لێك نەدرێنەوە بە پەنهانی هەڵمان گرتبوون، پێش ئەوەی دادگاکان ئاشکرایان بکەن. لە کاتێکدا کە ئەو پەیامانە - یەکێکیان نەبێت - هەموویان دادگای "ئەسکی شەهر" لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر کردن و هەنگاوی پێویستی لەبارەیانەوە نا و، یەك دوو مەسەلەی "پەیامی حیجاب" نەبێت ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت، کە وەڵامی ئەو خاڵانەشم لە عەرزوحاڵەکەم و لە ئیعتیرازەکەمدا بە بەڵگەی گومان بڕ دایەوە و، وتمان:

(ئەوەی لە دەستماندایە نوورە و، گورز و کوتەکی سیاسەت نی‌یە)..

ئەمەشمان لە بیست ڕووەوە لە دادگای "ئەسکی شەهر"دا ڕوون کردەوە.

ئنجا دادگای "دەنیزلی"ش وردبوونەوەی لە سەرجەمی پەیامەکان - بە بێ جیاکردنەوەی هیچیان - ئەنجام دا و ڕەخنەی لە هیچ کامیان نەگرت. بەڵام ئەو داواکارە بێ ویژدانانە حوکمی ئەو دوو سێ ڕستە ڕەخنە لێ گیراوەیان بەسەر هەموو پەیامەکاندا شکاندەوە و، تەنانەت دەستیان بەسەر کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"یشدا گرت کە چوار سەد لاپەڕەیە، تەنها لەبەر چەند لاپەڕەیەکی ئەو کتێبە! خوێنەران و نووسەرەوانی ئەو پەیامانەیان بە تاوانبار لە قەڵەم دا و، منیشیان بەوە تۆمەتبار کرد کە تەحەددا و دژایەتیی حکوومەت دەکەم.

من لە لایەنی خۆمەوە هەموو هاوڕێ نزیکەکانم و ئەوانەش کە سەردانم دەکەن دەگرم بە شایەت و، سوێندیش بە خوای گەورە دەخۆم کە:

لە نێوان سەرانی حکوومەت و وەزیر و سەرکردە و کارمەند و پەرلەمانتارانیدا جگە لە دوو سەرۆك کۆمار و ئەندام پەرلەمانێك و پارێزگاری قەستەمۆنی کەسی تریان لێ ناناسم و، بە دوای ناسینیشیاندا ناگەڕێم، مەگەر یەك دوو کەس نەبێت کە پێش ساڵێك پەیوەندی‌یان لەگەڵدا بەستم و لە ڕێیانەوە پێنج شەش کەسم لە سەرانی حکوومەت ناسی.

جا ئایا دەگونجێ کەسێك کە ململانێ لەگەڵ حکوومەتدا بکات نەزانێ لەگەڵ کێدا دەیکات؟ یان حەز بە ناسینیان نەکات و بایەخ بەوانەی بەرامبەری نەدات کە ئایا دۆستن یان دوژمن؟

لەم حاڵەتانەوە دەزانرێت کە: ئەوانە بڕوبیانووی بێ بناغە لە دژمان هەڵدەبەستن. جا مادەم وایە، ئەوا من بەو بێ ویژدانانە - نەك بەم دادگایە - دەڵێم:

هیچ بایەخێك بەو سزایە نادەم - چەندەش توندوتیژ بێت - کە نیازتانە بە سەرمدا بیسەپێنن! چونکە ئێستا من لەسەر دەرگای گۆڕەکەم و لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدام. ئایا چ بەختەوەرییەك لەوە گەورەترە کە یەك دووساڵی تەمەنێکی ستەم لێکراوی و بێ تاوانی بگۆڕمەوە بە پلەی شەهیدی؟

پاشان لەوپەڕی دڵنیاییدام و هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە: "مردن" سەبارەت بە ئێمە: پشوودان و پسوولەی ڕوخسەت وەرگرتنە بۆ ئەوەی بڕۆینە ناو جیهانی دڵنیایی و بەختەوەری. هەزاران بەڵگەشمان لە پەیامەکانی نووردا لەسەر ئەم ڕاستییە بە دەستەوەیە. تەنانەت گەر مردن بۆ ئێمە ئیعدامێکی ڕواڵەتی بێت، ئەوا گیروگرفتی ئەو یەك سەعاتەی کۆتایی تەمەن سەبارەت بە ئێمە دەبێت بە کامەرانی و کلیلی دەرگای میهرەبانی و هەلێکی گەورە بۆ گواستنەوەمان بەرەو جیهانی مانەوە و هەمیشەیی.

بەڵام ئێوە، ئەی دوژمنە خۆحەشاردەرە پەنهانەکان و، ئەی ئەوانەی کە لە پێناوی ڕازی کردنی ئیلحاددا دام و دەزگای "داد" لە خشتە دەبەن و، دەبن بە هۆی هەڵبەستنی وەهم و گومانی درۆینە لە زەینی کاربەدەستانی دەوڵەتدا، بۆ ئەوەی بە ناحەق و خۆڕایی بە ئێمەوە سەرقاڵیان بکەن..

باش بزانن و با لەرز بە جەستەتاندا بێت کە: ئێوە بڕیاری ئیعدامی هەمیشەیی و زیندانی تاکەکەسیی بەردەوام لەسەر خۆتان دەردەکەن و، تۆڵەی ئێمە بە چەندین قات لە ئێوە دەسێنرێتەوە. ئەوەتا ئێمە ئەم ڕاستییە دەبینین و بەزەییمان بە حاڵتاندا دێتەوە! بێ گومان ڕاستیی ئەو مردنەی کە سەد جار ئەم شارە لە دانیشتووانی خاڵی دەکاتەوە و بەرەو گۆڕستانەکان بەڕێیان دەکات، دەبێ خواست و ئامانجێکی لە خواست و ئامانجی ژیان و گوزەران گەلێ بەرزتری بێت و، هەوڵی خۆ ڕزگار کردنیش لە چنگی ئەو ئیعدامە هەمیشەییە لە پێشەکیی سەرجەمی کێشەکانی مرۆڤایەتییەوە بێت، تەنانەت لە هەموو خواستەکانی مرۆڤایەتی گرنگتر و پێویست تر بێت.

جا مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئایا کارێکی نامۆ و مایەی سەرسوورمان نیە کە خەڵکانێك هەبن قوتابیانی نوور تاوانبار بکەن، ئەو قوتابیانەی کە ڕێیان بەو نهێنییە بردووە و ئەو ڕاستییەیان دۆزیوەتەوە.. یان تۆمەتی ناڕەوا ئاراستەی پەیامەکانی نوور بکەن، کە ئەو ڕاستییەیان بە هەزاران بەڵگەی خۆیان چەسپاندووە؟

خۆ هەر کەسێك هێندەی تۆزقاڵێك خاوەنی ژیری بێت – تەنانەت ئەگەر شێتیش بێت – دەزانێت کە ئەو خەڵکانەی کاری وا ئەنجام دەدەن خۆیان لە بەردەم ڕاستی و دادگەریدا دەخەنە هەڵوێستی تۆمەتبارییەوە!

سێ ماددە هەیە کە گومانی بوونی "کۆمەڵە" بە خەیاڵدا دەهێنێت و ئەو ستەمکارانە دەخەڵەتێنێت، کە شتێکە هەرگیز ئێمە پەیوەندیمان پێوەی نییە.

یەکەمیان:

ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی کە قوتابیانی پێشووم بە یەکەوە گرێ دەدات، گومانی بوونی "کۆمەڵە"ی لە لا دروست کردوون.

دووهەم:

هەندێ لە قوتابیانی نوور بە شێوازی کاری بە کۆمەڵ ئیش دەکەن، وەك ئەوەی کۆمەڵە ئیسلامییەکانی هەموو شوێنێك ئەنجامی دەدەن و، یاساکانی کۆماریش بواری پێ داوە و کاری بەسەریەوە نییە. لەبەر ئەوە، هەندێ کەس پێی وا بووە کە قوتابیانی نوور "کۆمەڵە"یەك بن، کەچی کۆمەڵە نین. نیازی ئەو چەند کەسە کەمەش هەرگیز پێکهێنانی کۆمەڵە و شتانی هاوچەشنی نییە، بەڵکو تەنها پەیوەندییەکی بێگەرد و برایەتییەکی قیامەتییانەی خاوێنە.

سێهەم:

ئەو ستەمکارانە خۆیان دەناسن کە چۆن نوقمی دنیاپەرستی بوون و بە تەواوی لە ڕێ ترازاون، هەندێ یاسای حکوومەتیشیان دیوەتەوە کە لەگەڵ ئەواندا گونجاوە. بۆیە ئەو قسەیە دەڵێن کە بە زەینیاندا دێت: سەعید و هاوەڵانی نەیاری ئێمە و ئەو یاسایانەی حکوومەتن کە لەگەڵ هەوا و ئارەزووی ئێمەدا یەك دەگرنەوە. کەواتە ئەوانە کۆمەڵەیەکی سیاسین.

منیش دەڵێم:

ئەی بەدبەختینە!

ئەگەر دنیا هەمیشەیی بوایە و، مرۆڤیش بە هەتاهەتایی تیایدا بمابایەتەوە و، کار و ئەرکەکانی ئەم دنیایەش تەنها بتربخایەتە سیاسەتەوە، ئەوا ئەو کاتە بوختانەکەیان جێیەکی دەگرت..

بەڵام باش بزانن کە ئەگەر من لە دەرگای سیاسەتەوە کارم بکردایە، ئەوا نەك تەنها دە ڕستە، بەڵکو هەزار و یەك ڕستەتان دەبینی کە بە شێوازی تەحەددای سیاسی دادەڕێژران!

گریمان بە فەرزی مەحاڵ – وەك ئێوە دەڵێن – ئێمە بە هەموو توانایەکمان بۆ چەند ئامانجێکی دنیایی و بەدەستهێنانی تام و چێژە کەم نرخەکانی و لە پێناوی دەستکەوتنی ئامانجی سیاسیدا کار دەکەین، کە ئەوەش گریمانێکە تەنانەت شەیتانیش نەیتوانیوە بە هیچ کەسێکی بسەلمێنێت، بەڵام خۆ مادەم هەموو بەسەرهاتەکانی ماوەی بیست ساڵمان شتێك پێش چاو ناخات کە مایەی لێپرسینەوە و بەدواداگەڕانمان بێت، چونکە حکومەت سەیری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مرۆڤ دەکات، نەك ئەو شتەی کە لە دڵیدایە. جگە لەوەی کە لە هەموو حکومەتێکدا و بە شێوەیەکی بەهێز نەیاری حکومەت هەیە..

ئەوا بێ هیچ گومانێك ئێوە ناتوانن لە ڕێی یاساکانی دادگەرییەوە ئێمە تۆمەتبار بکەن.

دوا وتەم:

﴿حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هو عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وهوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيم﴾.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## ڕووداوێکی نایاسایی

**دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیمان لە دادگای "دەنیزلی" و، دوورەپەرێزیم لە خەڵك و، گۆشەگیریم بۆ ماوەی سێ ساڵ و، دابڕانی تەواوەتیم لە سیاسەت، ئەم ڕووداوە نوێیەی کە ئێمەیان هێناوە بۆ بەندیخانەی "ئافیوون" هیچ پەیوەندییەکی بە یاساوە نییە، تەنانەت لە دە ڕووەوە پێچەوانەی یاسایە:**

**یەکەم:**

پەیامەکانی نوور بە سێ دادگا و سێ دەستەی کارشناس و حەوت لایەنی بەرپرسدا لە "ئەنقەرە" تێپەڕیون و، لە ماوەی دوو ساڵیشدا چەندین کەسی وردبینی فەرمانگەکانی "داد" لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە.. هەموو ئەوانە - بێ جیاوازی - قسەکانیان لەسەر بێ تاوانیی پەیامەکان و "سەعید" و هەر حەفتا و پێنج هاوڕێکەی یەکی گرتووە و، تەنانەت سزای یەك ڕۆژیشیان بۆ دەرنەکردوون. کەواتە دوای ئەمە، دەستدرێژی کردن بۆ سەر پەیامەکان، وەك ئەوەی زیان بە ئاسایشی وڵات بگەیەنن، وا لە هەموو کەسێکی خاوەن ویژدان دەکات کە بزانێت چەندە ئەم کارە لە یاساوە دوورە.

**دووهەم:**

ئەو کەسەی کە دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانی، سێ ساڵی بە غەریبی و گۆشەگیری لە "ئەمیرداغ" بردەسەر، کە تەنانەت دەرگای ماڵەکەی لە ناوەوە و دەرەوە دادەخرا و، مەگەر لەبەر پێویستییەکی ناچارەکی دەنا بواری بە چاوپێکەوتنی کەس نەداوە و، وازی لە نووسین هێناوە کە بیست ساڵی ڕەبەق لەسەری بەردەوام بووە.. ئەم کەسە، پشکنەران دێن قفڵی دەرگاکەی دەشکێنن و لە پێناوی سیاسەتێکی دنیاییدا پەلاماری ماڵەکەی دەدەن و خۆیان دەکەن بە ژوورەکەیدا!

**سێهەم:**

کەسێك، کە وەك خۆی لە دادگادا پێی وتن: بە شایەتیی حەفتا کەس، بایەخی بە هەواڵەکانی جەنگی جیهانی نەدا و هەر پرسیاریشی لەبارەوە نەکرد و تا ئێستاش لەسەر ئەو حاڵەی هەر بەردەوامە و، بیست و پێنج ساڵیشە یەك دانە رۆژنامەی نەخوێندووەتەوە و گوێیشی بۆ خوێندنەوەی نەگرتووە و، سی ساڵە وتوویەتی: (**أعوذ بالله من الشيطان والسياسة**) و، بە هەموو توانایەکیەوە دوورە پەرێزیی لە سیاسەت کردووە و، بیست و دوو ساڵی ڕەبەقە مەگەر خوا خۆی بزانێت چ سزا و ئازارێکی چەشتووە و، بۆ مەبەستی حەوانەی خۆی و سەرنج ڕاکێشانیش بە لایدا تەنانەت بۆ یەك دانە جاریش سەردانی فەرمانگەکانی حکوومەتی نەکردووە، چونکە خۆی لە کاروباری سیاسەت هەڵناقورتێنێت..

وێرای هەموو ئەمانە، ئایا هیچ یاسایەك هەیە بوار بەوە بدات کە هەڵمەت ببرێتە سەر ماڵ و خەڵوەتگەکەی، وەك ئەوەی کەسێك بێت پیلان ساز بکات و، بە جۆرێکی بێ وێنە گوشاری بخرێتەسەر؟

کەسێك کە هێندەی تۆزقاڵێك ویژدانی تێدا بێت ئازار بەم حاڵە دەچێژێت.

**چوارەم:**

دوای لێ وردبوونەوەی ماوەی شەش مانگ، دادگای "ئەسکی شەهر" بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکانی نووری لە تۆمەتی دامەزراندنی "کۆمەڵە" و پێکهێنانی "تەریقەتی صۆفی" ڕاگەیاند.

خۆ هەرچەندە سەرۆکە گەورەکە[1]، بە هاندەری وەهم و گومانەکان و ڕق و قینی خۆی، هەندێ کەس و کارمەندی وەزارەتی "داد"ی لە دژمان هان دا، بەڵام بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکانی نوور لە تۆمەتی دامەزراندنی هەر "کۆمەڵە" و "تەریقەت"ێکی سۆفی لە دادگاوە دەرچوو، جگە لە (پەیامی پۆشتەیی) کە بەشێکی یەکجار بچووکی پەیامەکانی نوورە. ئەویش نەك وەکو بەڵگەیەکی یاسایی، بەڵکو بە قەناعەتی زاتیی خۆیان کردیان بە بیانووی دەستیان. کە ئەمەش بوو بەهۆی دەرچوونی بڕیاری بەندکردنی شەش مانگ بۆ چەند کەسێکی قوتابیانی نوور کە لە دە کەس تێناپەڕن لە

(١) مەبەست مستەفا کەماڵە. (وەرگێڕ)

نێوان سەد کەسدا. خۆ لەبەر ئەوەی ئـەو قوتابیانـەی نـوور لـە سـەرەتای دەستگیر کردنیانـەوە تـا کـاتی پشـکنینی پەیامەکان چوار مـانگ و نیویـان لـە بەندیخانـەدا بەسـەر بردبوو، ئەوا دوای بڕیارە کە تەنها مانگ و نیوێك لە بەندیخانەدا مانەوە.

پـاش دە سـاڵ دادگـای "دەنـیزلی"ش مـاوەی نـۆ مـانگی ڕەبـەق پشـکنین و لـێ وردبوونەوەی باشی لە سـەرجەمی ئەو نامە و پـەیام و کتێبانـەدا ئـەنجام دا کـە لـە مـاوەی بیست ساڵدا نووسرابوون، دوای ئەوەی ئەو دانراوانە بەوە تاوانبار کـران کـە هاندانیـان تێدایە بۆ دامەزراندنی تەریقەتێکی سۆفی.

ئنجـا پێـنج سـندووقی ئـەم کتێبانـەش ڕەوانـەی دادگـای گـەورەی جـەزا لـە شـاری "ئەنقەرە" کران. ئەوەبوو لە لایەن ئەو دادگا ناوبراوە و لە لایەن دادگای "دەنیزلی"شـەوە ماوەی دوو ساڵ بە وردی لـەو کتێـب و پەیامانـەیان کۆڵییـەوە. دوایـی بڕیـاری هـەردوو دادگاکە لەسەر بێ تاوانیی ئەو کتێب و پەیامانـە یـەکی گـرت سـەبارەت بـەو تۆمەتانـەی درابووە پـاڵیـان، کـە بریتی بـوون لـە تۆمـەتی: دامەزراندنی "کـۆمەڵە" و "تەریقـەت"ی سۆفی و تۆمەتەکانی تری هاوچەشنیان[1]. هەروەك هەموو پەیام و کتێبەکانیان دایـەوە بـە خاوەنەکانیان و، سەعید و هاوڕێکانیشی بڕیاری بێ تاوانییان بۆ دەرکرا.

جا ئیتر دوای هەموو ئەمانە، تاوانبار کردنی سەعید بەوەی کـە (پیـاوێکی سیاسـیيە و هـەوڵی دامـەزرانـدنی کـۆمەڵـەیـەك دەدات) یان (پیـاوی پیلانگێڕییـە) یـان شـتانی وەك ئەمانە و، هاندانی کارمەندانی دام و دەزگای "داد" لە دژی ئەو بەو بیانووەی کە (پیـاوی تەریقـەت)ە.. چـەندە کـارێکی لـە یاسـا دەرچوونـە؟ هـەر کەسـێك هەسـت و نەستی نەمردبێت پەی بەو لە یاسا دەرچوونە دەبات.

(١) بناغە و ئامانجی پەیامەکانی نوور دەرخستن و ئاشکراکردنی ڕاستییەکانی قورئان و کارکردنە لـە پێنـاوی "ئیمانی تەحقیقی"دا. لەبەر ئەوە، لە سێ دادگادا بڕیاریی بێ تاوانییـان لـەمـەڕ تۆمـەتی دامـەزراندنی تەریقـەتی سۆفی بەدەست هێنا. پاشان نابێ پەیوەندی کردنی زۆرینەی باپیرانی ئەم نەتەوەیە بە ڕێبازێکی دیاری کراوەوە لە ماوەی هەزار ساڵدا، هیچ تاوانباری و بەرپرسیارییەك بۆ ئێمە پێکبـهێنێت. مونافیقـانی پشتی پـەردە دەچـن ناوی "تەریقەت" بەسەر حەقیقەتی ئیسلامدا دەبڕن و لەم ڕێیەوە هەرکەسێك بۆ داکۆکی کردن لە ئـایینی ئـەم نەتەوەیە لـێ ببڕێت بەوە تۆمەتبار دەکرێت کە خاوەنی تەریقەتە! سەبارەت بە تۆمەتی "کۆمەڵـە"ش دەڵـێم: ئێمـە تەنها ئەو برایەتییەی ئیسلامان لە نێواندایە کە ئامانجی برایەتیی قیامەتییە و، هەرگیز کۆمەڵەی سیاسـی نییـە. هەر بۆیە سێ دانە دادگا بڕیاری بێ تاوانییان سەبارەت بەم تۆمەتەش بۆ دەرکردین. (دانەر)

**پێنجەم:**

لەبەر ئەوەی ماوەی سی ساڵە "شەفەقەت" دەستووری ژیانم و بناغەی ڕێبازی من و پەیامەکانی نوورە، ئەوا نەك هەر کارم بەسەر ئەو تاوانبارانەوە نییە کە ستەمیان لێ کردووم، بەڵکو ناتوانم تەنانەت دوعاشیان لێ بکەم، نەکو ببم بەهۆی زیان گەیاندن بە هیچ کەسێکی بێ تاوان. بگرە هەر ئەم شەفەقەتە بوو نەیهێشت بەرپەرچی ئەو فاسقانە بەڵکو ئەو ستەمکارە بێدینانە بدەمەوە یان دوعایان لێ بکەم کە بە ڕق و قینێکی زۆر تیژەوە بۆ ستەم لێ کردنم ڕاپەڕین، تاکو نەبم بە مایەی گەیاندنی زیانێك بە داماوانی پیر و پەککەوتەی وەك باوك و دایکی ئەو ستەمکارە، یان کەسانی بێ گوناهی وەك منداڵەکانی. ئیتر بەو هۆیە و لەبەر خاتری پێنج شەش کەسی ئاوا بێ تاوان، ناتوانم هەڵوێست لە دژی ئەو کەسە ستەمکارە غەددارە بگرم، تەنانەت هەندێ جار لێشیان خۆش دەبم!

بەم جۆرە و بەهۆی ئەو شەفەقەتەوە، نەك هەر من کارم بەسەر حکومەت و ئاسایشەوە نییە، بەڵکو هەمان وەسیەتیش بۆ هاوڕێکانم دەکەم. ئەمەش لە ڕادەیەکدایە کە هەندێ لە پیاوانی بەویژدانی ئاسایش لە سێ پارێزگادا دانیان بەوەدا نا و وتیان: (قوتابیانی پەیامەکانی نوور پیاوانی مەعنەویی ئاسایشن، چونکە پارێزگاریی ئاسایش و ڕێسا دەکەن). ئەمەش ڕاستییەکە هەزاران کەس شایەتن لەسەری و، ماوەی ژیانی بیست ساڵیشم لەگەڵ هەزاران قوتابیی نووردا تەسدیقی دەکات، ئەوەبوو لەو ماوەیەدا پیاوانی ئاسایش هیچ ڕووداوێکی دژ بە ئاسایشیان لەسەر ئەوان تۆمار نەکردووە.

لەگەڵ هەموو ئەم بەڵگانەدا، کەچی هەڵیان کوتایە سەر ماڵی ئەم لاوازە، وەك ئەوەی پیاوی شۆڕش و پیلانگێڕان بێت و، لە لایەن ئەو کەسە زبر و توندوتیژانەوە مامەڵەیەکی هێندە بێ ویژدانانەی لەگەڵدا کرا وەك ئەوەی خوێنڕێژێك بێت سەد تاوانی ئەنجام دابێت! خۆ هەرچەندە هیچ شتێکیان لە ماڵەکەیدا دەست نەکەوت، بەڵام دەستیان بەسەر نوسخەیەکی نایاب و دەگمەنی قورئانی خاوەن ئیعجاز و تابلۆکانی پشت سەریدا گرت، وەك ئەوەی چەند پارچە کاغەزێکی زیانبەخش بن.

جا ئایا چ یاسایەك بوار بە پیادە کردنی ئەم چەشنە ڕەفتارانە دەدات لە دژی هەزاران کەسی ئیماندار کە بە ڕەوشتی جوانی خۆیان پارێزگارییان لە ئاسایشی وڵات

کردووە؟ یان چ بەرژەوەندییەك لە هاندان و پاڵ پێوەنـانی زۆرەملێی ئەوانـەدا هەیـە کـە ناچار بکرێن لە دژی ڕێسا و ئاسایش هەڵبسن؟

**شەشەم:**

من کەسێکم کە بە فەزڵی خوای گەورە ماوەی سی ساڵە لە ڕێژنەی پیت و بەرەکەتی قورئانی پیرۆزەوە لەوە تێگەیشتووم کە ناوبانگی کاتی و فانیی دنیا و پلە و پایەکانی، کـە خۆپەرستی و خۆویستییان لەخۆ گرتووە و، ناوبانگ پەرستی.. هیـچ کـام لەمانـە، هیـچ خێر و واتا و سوودێکیان بۆ مرۆڤ تێدا نییە. بۆیە هەزاران شوکر و سوپاس لەسـەر ئـەم تێگەشتنەم پێشکەشی خوای گەورە دەکەم.

لەبەر ئەوە، ئەم کەسە لەو کاتەوە تا ئێستا بـە هـەموو توانایەکیـەوە لـە هـەوڵی ململانێدایە لەگەڵ دەروونی بەدخواز(نەفسی ئەممارە)ی خۆیدا. وێڕای ئـەوەی کـە هاوڕێکانی و ئەو کەسانەش خزمەتێکیان پێشکەش کردووە دەزانـن و شایەتی دەدەن کە تا ئەوپەڕی توانا زەبروزەنگ و کەشوفشی دەروونی بەدخوازی خۆی شکاندووە و، لـە خۆپەرستی خۆی قوتـار کـردووە و، دوورەپـەرێزیی نوانـدووە لـە دووڕوویـی و ڕیـا و خۆنواندن. ماوەی بیست ساڵیشە بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە لەبەر خـۆش بـاوەڕی و گومانی باشیان پێی – کە دەروونـی هـەموو کەسێك بـۆی دەشـێت – مـەدح و سـەنایان کردووە و، بۆچوونی بە پێچەوانەی ئەوانەوە بووە کە بە شایانی پلە و پایەی مەعنـەوییان زانیوە. تەنانەت بە هەموو هێز و توانایەکیەوە لە دەستیان هەڵهاتووە. هەروەك بەگژی ئەو گومان باشییە لـە ڕادەبەدەرەدا چووەتەوە کـە هـاوڕێ نزیـك و تایبەتـەکانی بەرامبـەری بوویانە، بە ڕادەیەك کە هەست و نەستیشی زامدار کردوون! لە وەڵامنامـەکانیدا بـە هیـچ جۆرێـك مـەدح و سـەنا و گومـان باشیی ئەوانی پێ قبـووڵ نـەبووە و، هـەموو فـەزڵ و چاکەیەکی بۆ پەیامەکانی نـوور گێڕاوەتـەوە – کە تەفسیری قورئـانی پیـرۆزن – نـەك بـۆ خۆی، بەڵکو خۆی لە هەموو فـەزڵ و چاکەیـەك بـێ بـەش کـردووە و، قوتابیـانی نـووری بەرەو پەیوەندی کردن بە کەسێتیی مەعنەویی پەیامەکانی نوور ئاراستە کردووە و، خـۆی تەنها بە خزمەتکارێکی ئاسایی قورئانی پیرۆز داناوە..

ئەمەش بە بێ گومـانی دەیچەسپێنێت کـە هـەرگیز بـۆ خـۆ دەرخسـتن و خۆشەویسـت کردنی خۆی لای خەڵکی هەوڵی نەداوە، بەڵکو کاری وای ڕەت کردووەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئایاهیچ یاسایەك هەیە بوار بەوە بدات کە بەرپرسیاری بخرێتە ئەستۆی کەسێکی ئاوا و، هێرش ببرێتە سەر ماڵی ئەوی غەریب و نەخۆش و یەکجار پیر و گۆشەگیر لە ژوورەکەی خۆیدا کە هیچ توانا و هێزێکیشی نییە. هەروەها شکاندنی قفڵی دەرگاکەی و خۆبەژووراکردنی کارمەندانی پشکنین وەك ئەوەی تاوانبارێکی ئامادە و لەسەر پێ بێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە هەندێ لەو هاورێیانەی لێیەوە دوورن، بە پێچەوانەی حەز و پێخۆشبوونی ئەمەوە، زیاد لە شایستەیی خۆی مەدحیان کردووە و لەبەر گومان باشییان بەرامبەری بە شایستەی پلە و پایەیەکی مەعنەوییان زانیوە، پاشان لەبەر وتنی چەند وشەیەك لەبارەیەوە لە لایەن ئامۆژگار(واعظ)ێکی شاری "کووتاهیە"وە کە هەر نایناسێت کێیە؟

خۆ هەرچەندە من هیچ نامەیەکم بۆ ئەو شارە نەناردووە، بەڵام نامەیەك بۆ ئەو شارە ڕەوانە کراوە و ئیمزایەکی ساختەی بە ناوی منەوە لەسەر دانراوە، کە ئەمەش بووە بەهۆی ئەوەی گومانی بەرپرسیارێتیی من لەبارەیەوە دروست ببێت.. هەروەها بوونی کتێبێکی کاریگەر - کە نووسەرەکەی ناناسرێت - لە شاری "بالیکەسیر"..

جا ئایا ئەم شتانە بوار بەوە دەدەن کە بەو جۆرە هەڵبکوتنە سەر ماڵان و پشکنینی تێدا ئەنجام بدەن؟ لە کاتێکدا کە جگە لە ویرد و دوعا و تابلۆکان هیچ شتێکی تریان تێدا نەدۆزییەوە..

ئایا چ یاسا و سیاسەتێك لە دنیادا هەیە بوار بەم چەشنە هێرشە بدات؟

**حەوتەم:**

لەم چەشنە کاتەدا کە ئەم هەموو لایەن و تەوژمە حیزبییە زۆروزەبەندەیە لە ناوەوە و دەرەوەدا هەیە، واتە لەو کاتەدا کە هەلی سوود وەرگرتنی ئەوەی بۆ ڕەخسا کە چەند کەسێکی سیاسیی زۆر بە لای خۆیدا ڕابکێشێت لە بریی چەند کەسێکی کەم لە هاورێکانی.. کەچی بەم واتایەی خوارەوە نامەی بۆ هەموو هاورێیانی خۆی نووسی کە: "تەوژمی هیچ کام لەو لایەنانە ڕاپێچتان نەکات و تێکەڵی ململانێی سیاسەت مەبن و هەرگیز ئاسایش تێك مەدەن". ئەمەش بە مەبەستی دوورەپەرێزیی تەواوەتی لە سیاسەت و، زیان نەدان لە ئیخلاس و، دوورکەوتنەوە لە سەرنج ڕاکێشانی حکوومەت لە دژی و، خەریك نەبوون بە کاروباری دنیاوە.

کاتێ کە تـەوژمی پێشـوو، لـە ئەنجامی وەهـم و گومانـەکانی خـۆی، دەسـتی ستەم و زیانی بۆ درێژ دەکـرد، ئـەم دووره پەرێزی‌یەی ئـەوی دەکـرد بـە بیـانوو. بـەڵام ئێسـتا ئـەم تەوژمە نوێیە لەبەر ئەوە ستەمی لـێ دەکات کە دەڵێ: "یارمەتیمان نادات و هاوکاریمان لەگەڵ ناکات"! بە هەردوو کیشیان ئەم هـەژارەیان دووچـاری سـەختی و گـیرو گرفتێکی یەکجار زۆر کرد. کەچی لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم بـە هیـچ شـێوەیەك خـۆی لـە کاروبـاری ئەهلی دنیا هەڵنەقورتاند، بەڵکو خۆی بە کاروباری ئەودنیای خۆیەوە سـەرقاڵ کـرد، بە رادەیەك کە بە درێژایی بیست و دووسـاڵ تەنانـەت یـەك دانـە نامەشـی بـۆ براکـەی خـۆی نەنارد لە گوندی "نوورس" و، لە ماوەی بیسـت ساڵیشـدا دە نامەی بۆ هاورێکانی نەنارد لەو پارێزگایانەدا..

ئایـا چ یاسـایەك هەیـە بـوار بـەم چەشـنە خـۆ هـەڵقورتاندن و شـەڕ پێ فرۆشتنە بـدات سەبارەت بەم کەسە لاوازەی کە بەکاروباری دوارۆژی خۆیەوە سەرقاڵە؟

لـەو کاتـەدا کـە بـە نـاوی یاسـای ئازادی‌یـەوە کـەس حـەقی بەسـەر چاپەمـەنیی شیوعی‌یەکان و کتێبـی مولحیدانـەوە نی‌یـە کـە گەلـێ زیانبەخشـن بـۆ وڵات و نەتـەوە و ڕەوشت و ئاکارەکان.. هـەر لـەو کاتـەدا دەسـت بەسـەر بەشـەکانی پەیامـەکانی نـووردا دەگیرێت و دەبرێنـە بـەردەم دادگـا، وەك ئـەوەی چـەند کاغـەزێکی زیانبـەخش بـن. کـە دەشزانن سێ دادگا هیچ شتێکی زیانبەخشیان لەم پەیامەدا نەبینی، چونکە ماوەی بیسـت ساڵە بانگەشەیان بۆ خێر وچاکەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەم وڵات و نەتەوەیە و پتەو کردنی ڕەوشت و توندوتۆڵ کردنی ئاسایش کـردووە و، بانگـەوازیان بـۆ بەهێز کردنی برایـەتیی موسڵمانانە لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەو برایەتی‌یـەی کـە پشـت و پەنایـەکی قـایم و هـێزی ڕاستەقینەی ئەوانـە و، داواکـاری گێڕانـەوەی هاوڕێیـەتیی جیهانی‌ئیسـلامی‌یە بـۆ ئـەم نەتەوەیە و بەهێزکردنیەتی بە شێوازێکی کاریگەر.

وەزیری ناوخۆ فەرمانی بۆ زانایانی سـەرۆکایەتیی کاروبـاری ئـایینی دەرکـرد کـە بـە نیازی ڕەخنـە لێگرتن بـە وردی لـە پەیامـەکانی نـوور بکۆڵنـەوە. دوای سـێ مـانگی لـێ وردبوونەوە، نەك هەر ڕەخنەیان لەو پەیامانە نـەگرت، بـەڵکو نـرخ و بـەهای ڕاستەقینەی ئەو پەیامانەی بۆ دەرکەوت و، بـە "دانـراوی گـەورە و بـەنرخ" ناوزەدیـان کـرد و، چەند پەیامێکی وەك "زولفەقار" و "عەسای مووسـا"شـیان لـە کتێبخانەکـەیاندا دانـا! هـەروەك

حاجی‌یەکان لە سەفەری حەجدا کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا"یان لە ڕەوزەی خاوێنی پێغەمبەری سەروەرماندا ﷺ بینیبوو.

جا ئایا هیچ ویژدان و یاسایەك هەیە بوار بەوە بدات دەست بەسەر پەیامەکانی نووردا بگیرێت و کۆ بکرێنەوە و ببرێن بۆ دادگا؟

**هەشتەم:**

دوای بیست و دوو ساڵی نەفی کردنی ناحەق و بێ هۆی پڕ لە تەنگانە و ڕۆژگاری سەخت و، پاش ئەوەی کە ئازادی‌یان بۆ گێڕایەوە، ئەو نەڕۆشتەوە بۆ شارەکەی خۆی کە تیایدا لە دایك بووە و، هەزاران کەسوکار و خۆشەویستی ئەوی تێدایە، بەڵکو ژیانی نامۆیی و گۆشەگیریی هەڵبژارد، تاکو نزیکی دنیا و ململانێی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی نەکەوێت و، نوێژی جەماعەتی مزگەوتی - کە پاداشتێکی زۆری تێدایە - واز لێ هێنا و بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆیدا نوێژەکانی دەکات.. واتە کەسێکە خۆی لەو ڕێز و ئیحترامە دوور دەگرێت کە خەڵکی بەرامبەری دەری دەبڕن. هەروەك بیست ساڵی تەمەنی و هەزاران کەسایەتیی بەڕێز و ویقاری تورکیش شایەتیی ئەوەی بۆ دەدەن کە یەك دانە کەسی تورکی دیندار و خاوەن تەقوای لە چەندەها کوردی دوور لە ئایین پێ باشترە، هەروەك لە دادگادا چەسپاندی کە برایەکی تورکی خاوەن ئیمانی توندوتۆڵی وەك حافظ عەلی لەسەد کورد باشترە کە وەك ئەو نەبن.

واتە کەسێکە مەگەر لەبەر ناچاری و پێویستی‌یەکی زۆر، دەنا خۆی لە تێکەڵیی خەڵکی دوور دەگرێت تاکو لە ڕواڵەتی ڕێز و ئیحتیرامیان کەنار بگرێت و، تەنانەت بۆ مزگەوتیش ناڕوات و، بە هەموو توانایەکی خۆی و لە ڕێی نووسینەکانیەوە ماوەی چل ساڵە بۆ توندوتۆڵ کردنی برایەتیی ئیسلامی کاری کردووە و، لە پێناوی بووژاندنەوەی خۆشەویستی لەناو موسڵماناندا تێکۆشاوە و، نەتەوەی تورکی بە هەڵگری ئاڵای ئیسلام و بەدەستهێنەری سەنا و ستایشی قورئان داناوە و، ئەم نەتەوەیەی بەم هۆیەوە زۆر خۆش ویستووە و، ژیانی خۆی لەو پێناوەدا بەخت کردووە..

ئایا دەبێ والی‌یەکی پێشوو نووسراوێکی ڕەسمیی غەددارانە و بە مەبەستی بڵاو کردنەوەی پڕوپاگەندەیەکی دیاریکراو لە دژی و بۆ ترساندنی هاوڕێکانی لێی، لەبارەی ئەو کەسەوە بڵێت: (ئەو کوردە و ئێوە تورکن.. ئەو شافیعی‌یە و ئێوە

حەنەفین)؟! بە نیازی بڵاو کردنەوەی ترس و بیم لە دڵی هەمووواندا و هاندانیان بۆ ئەوەی لێی دوور بکەونەوە و نزیکی نەبنەوە؟!

پاشان من دەپرسم کە: ئایا هیچ یاسا و بەرژەوەندی‌یەك بۆ ئەوە هەیە کەسێکی گۆشەگیر ناچار بکرێت شەپقە لەسەر بکات، لە کاتێکدا کە بە درێژایی بیست ساڵ و لە دوو دادگادا هیچ کەسێك بۆ ئەوە ناچاری نەکردووە و، تەنانەت نیوەی سەربازەکانیش شەپقەیان لەسەر لابراوە؟

**نۆهەم:**

خاڵێکی گرنگ و بەهێز[1] لێرەدا هەیە. بەڵام لێی بێ‌دەنگ دەبم، چونکە پەیوەندیی بە سیاسەتەوەیە.

**دەهەم:**

ئەمەش بە هەمان جۆر هیچ یاسایەك بواری پێ نادات و هیچ بەرژەوەندی‌یەکی تێدا نی‌یە، بەڵکو چەند وەهم و گومانێکی بێ واتا و چەند زیادەڕەوی‌یەکی ئەوتۆیە کە شتێکی بچووکی هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەك بە قەدەر گومەزێك گەورە دەکات و، هێرش و شەڕ پێ فرۆشتنێکی وایە کە هیچ یاسایەك بە ڕاستی نازانێت. لێرەشدا بێدەنگ دەبم، بۆ ئەوەی خۆمان نەدەین لە قەرەی ئەو سیاسەتەی کە بە پێی ڕێبازمان سەیر کردنیمان بەلاوە قەدەغەیە.

بەم جۆرە و لەو کاتەدا کە لە بەردەم (دە) ڕووی مامەڵەی نایاساییدا‌ین، دەڵێین: ﴿حَسْبُنا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(١) بوونی گاور و جولەکەکان لە سایەی حکومەتە ئیسلامی‌یەکان و بوونی موسڵمانانیش لەناو حکومەتە گاور و مەجووسی‌یەکاندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە ڕووی یاساوە بوار بەوە نادرێت دەستدرێژی بکرێتە سەر هیچ کەسێکی نەیار، مادەم بە کردەوە کاری بەسەر کارگێڕیی دەوڵەت و ئاسایشیەوە نەبێت، چونکە گریمان و ئەگەرەکان نابن بە مایەی لێپرسینەوە، دەنا دەبوو هەموو کەسێك بە بیانووی گریمانی ئەنجامدانی تاوان ببرانایە بەرەو دادگاکان! (دانەر)

## چەند خاڵێکی تر کە دەمەوێ بیانخەمە پێش چاوی بەڕێوەبەرایەتیی شاری "ئافیوون" و دادگا و پۆلیسی ئەم شارە

**یەکەم:**

پەیدا بوونی زۆربەی پێغەمبەران - دروودی خوایان لەسەر بێت - لە خۆرهەڵات و ئاسیا و، سەرهەڵدانی زۆرینەی فەیلەسووفەکانیش لە خۆرئاوا و ئەورووپادا ئاماژەیەکی ئەزەلیی قەدەری خوای گەورەیە بۆ ئەوەی کە لە ئاسیادا "ئایین" زاڵ و فەرمانڕەوایە و لەوێ فەلسەفە لە پلەی دووهەمدا دێت. جا لەسەر بناغەی ئەم هێمایەی قەدەری خوای گەورە: ئەگەر کاربەدەست لە ئاسیادا بۆ خۆی ئاییندار نەبێت دەبێ لانی کەم کاری بەسەر کارگوزارانی ئایینەوە نەبێت، بەڵکو پێویستە پشتیان بگرێت و هانیان بدات لە کارەکانیاندا بەردەوام بن.

**دووهەم:**

قورئانی پیرۆز وەك بیر و ژێریی زەوی وایە. خۆ ئەگەر خوا نەخواستە قورئان لەم زەوییە بڕواتەدەر، ئەوا زەوی شێت دەبێت و، دوور نییە ئەو کاتە سەری خۆی -کە ژێریی تێدا نەماوە- بکێشێت بە یەکێك لە هەسارەکاندا و ئەم کارەساتەش ببێت بەهۆی بەرپابوونی قیامەت.

بەڵێ، قورئان دەستاوێزێکی قایم و ئەو پەتە توندوتۆڵەیە کە عەرش و فەرش بە یەکەوە گرێ دەدات و، زیاتر لە "هێزی کێش" زەوی ڕاگیر دەکات! پەیامەکانی نووریش تەفسیری ڕاستەقینە و بەهێزی ئەم قورئانە گەورەیەن. خۆ ئەم پەیامانەی کە وا ماوەی بیست ساڵە کاریگەریی خۆیان لەم نیشتمانە و لەم سەردەمەدا پێش چاو خستووە، بە نیعمەتێکی گەورەی خواوەند و موعجیزەیەکی خامۆش نەبووی قورئانی پیرۆز دادەنرێن. کەواتە نەك هەر نابێ حکوومەت دەستدرێژییان بکاتە سەر و قوتابیانی بترسێنێت بە مەبەستی دوور خستنەوەیان لەو پەیامانە، بەڵکو دەبێ پارێزگاری لەم پەیامانە بکات و خەڵکی بۆ خوێندنەوەیان هان بدات.

**سێهەم:**

لەسەر بناغەی ئەوەی کە ئیماندارانی ئایندە کردەوە چاکەکانیان بە دیاری بۆ ئیماندارانی پێشینی خۆیان دەنێرن و دوعای لێخۆشبوونیان لە حوزووری خوای گەورەدا بۆ دەکەن.. لەسەر ئەم بناغەیە، لە دادگای "دەنیزلی" پێم وتن:

ئەگەر لە دادگای هەرە گەورەی قیامەتدا ملیارەها کەسی ئەهلی ئیمان پرسیاریان لەوانە کرد کە لە دنیادا گوشاریان دەخستە سەر قوتابیانی نوور و بڕیاری بەندکردنیان بۆ دەردەکردن (ئەو قوتابیانەی کە لە پێناوی دەرخستنی ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزدا تێدەکۆشن) ئەگەر پرسیاریان لێ کردن و وتیان:

ئێوە لە دنیادا بەوپەڕی سنگ فراوانی و بە ناوی یاسای ئازادییەوە بوارتان بە کتێب و بڵاوکراوەی شیوعی و مولحیدان دەدا و چاوپۆشیتان لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانە دەکرد کە نانەوەی پشێوی و ئاڵۆزییان لە ئامێز گرتبوو، تەنانەت هەر هیچ ئاستەنگ و لەمپەرێکتان لەبەردەم کارەکانی ئەواندا دانەنا، کەچی لە ڕێی بەندکردن و چەندین هۆکاری تری گوشار و تەنگ پێ هەڵچنینەوە دەتانویست پەیامەکانی نوور و قوتابیانی لەناوبەرن، لە کاتێکدا کە ئەوان لە پێناوی ڕزگار کردنی نیشتمان و نەتەوە لە ئیلحاد و فەساد و، هاوولاتیانیش لە ئیعدامی هەمیشەیی تێدەکۆشان.. ئەگەر لەوێ ئەم پرسیارەیان ئاراستە کردن چ وەڵامێکیان دەدەنەوە؟ خۆ ئێمەش لێرە هەر هەمان پرسیارتان لێ دەکەین؟

لەو دادگایەدا ئەمەم پێ وتن. ئیتر ئەو زاتە بەڕێزانەی کە خاوەنی ویژدان و دادگەری بوون، بڕیاری بێ تاوانیی ئێمەیان دەرکرد و، دادگەریی دام و دەزگای "داد"یان پێش چاو خست.

**چوارەم:**

من لە لایەنی خۆمەوە چاوەڕوانیی ئەوەم دەکرد کە "ئەنقەرە" یان "ئافیوون" بۆ بەردەم لیژنەیەکی ڕاوێژکار بانگم بکات و، پرسیار و وەڵام لە نێوانماندا بگۆڕێنەوە سەبارەت بەو بابەتە گەورە و گرنگانەی کە پەیامەکانی نوور خستوویانەتە ئەستۆی خۆیانەوە..

بەڵێ، پەیامەکانی نوور بەهێزترین هۆکـار و کاریگـەرترین دەرمـان و چارەسـەرە لـەم وڵاتـەدا بـۆ گێڕانـەوەی برایـەتیی ئیسـلامیی پێشـوو و خۆشەویستیی ڕابوردوو، هـاودەم لەگەڵ گومـان باشـی و هاوکـاری لـە نێـوان سێ سـەد و پەنجا ملیـۆن موسـڵماندا و، بـۆ دۆزینەوەی ڕێگاکانی ئەم هاوکارییەش. وا لە خوارەوەدا نیشانەیەکی ڕوونی ئەمە پێش چاو دەخەم:

ئەمساڵ زانایەکی گەورە لە "مەککەی پیرۆز" چەند بەشێکی گەورەی لە پەیامـەکانی نوور وەرگێڕا بـە زمـانی هینـدی و عـەرەبی و، ئـەم وەرگێڕانانەشـی نـارد بـۆ هیندستان و حیجاز و، وتی:

(پەیامـەکانی نـوور بـۆ هێنانـەدیی یـەکێتی و برایـەتیی ئیسـلامیمان تێدەکۆشـن، کـە بەهێزترین پشتگیری ئێمەیە. بەمەش بۆمان دەردەخات کە خەڵکی تورکیـا لـە بوارەکـانی دین و ئیماندا هەمیشە لە پێشەنگی شوێنانی ترەوەن).

هەروەها چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد ئەو مەسەلە و بابەتـە گرنگانـە بورووژێنرایـە کـە بـە وێنەی چیا گەردن کەشەکان مەزن و گەورەن، وەك:

"ئایا ڕادەی خزمەتی پەیامەکانی نوور و قوتابیانی چەندەیە لە دژی ئەو شـیوعی‌یەتەی کە لە نیشتمانی ئێمەدا بووە بە بزووتنەوەیەکی ئاژاوەچی؟ چۆن دەتوانرێت ئـەم نیشتمانە پیرۆزە لەم لافاوە ڕامالەر و ترسناکە بپارێزرێت"؟

لـەو کاتـەدا کـە مـن چـاوەڕوانی ئەمانـەم دەکـرد، کـەچی دەبینـم ڕووبـەڕووی چـەند کێشـەیەکی هێنـدە بـێ نـرخ دەکرێمـەوە کـە کێشـی باڵـە مێشـێکیان نی‌یـە و، ئـەوەندە هـەندەکین کـە هیـچ بەرپرسـیاری‌یەك هـەڵناگرن و، ڕق وقـین و بوختـان و قسـەی دەمهەڵبەستی کەسـانێکن کـە شتی بچووکـی وەك دەنکـە گەنمێك هێنـدەی گومـەزێك گەورە دەکەن..

بەم جۆرە و لەم چەشنە هەل و مەرج و بارودۆخە دژوارەدا هێندە ئـازارم چەشـت کـە پێشـتر و تـا ئێسـتاش ئـازاری تـری هاوچەشـنی ئـەوەم نەچەشتووە. هـەر هـەمان ئـەو پرسیارانەشمان لـە هـەمان ئەو مەسـەلانەدا ئاراسـتە کراوەتـەوە کـە سێ دادگـای پێشـوو ئاراستەی کردین و بێ تاوانیی ئێمەیان لەبارەیانەوە ڕاگەیاند، جگە لە یەك دوو مەسەلەی کەسی و بێ نرخ نەبێ کە هیچ واتایەکیان تێدا نی‌یە.

**پێنجەم:**

ئاستەنگ دانان لە بەردەم پەیامەکانی نووردا و زۆران گرتن لە گەڵیاندا لە توانای کەسدا نی‌یە! چونکە ئەم پەیامانە شکست ناهێنن و بە هیچ کەسێك نابەزێن. ئەوەتا وا ماوەی بیست ساڵە سەرسەخت ترین فەیلەسووف دەمکوت و بێ دەنگ دەکەن و، بە وێنەی خۆری ئاسمانیش لە ڕۆژی ڕووناکدا ڕاستی‌یەکانی ئیمان ئاشکرا دەکەن. کەواتە دەبێ ئەوانەی حوکمی ئەم نیشتمانەیان لە دەستدایە سوود لە هێزی ئەم پەیامانە وەربگرن.

**شەشەم:**

سووك سەیر کردنی من لە ڕێی دەرخستنی هەڵەکانی "کەسێتیی" بێ بایەخی خۆمەوە و، شکاندنم لە پێش‌چاوی خەڵکیدا بە سووکایەتی پێ کردنم، هیچ زیانێك بە "پەیامەکانی نوور" ناگەیەنێت، بەڵکو لە ڕوویەکەوە پتر یارمەتیی ئەو پەیامانە دەدات! چونکە ئەگەر زمانی فانیی من بێ‌دەنگ بکرێت، ئەوا هەرگیز زمانەکانی سەدان هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور لە گوفتار و ڕاگەیاندن ناکەون. هەروەك هەزاران قوتابیی وەفاداری ئەم پەیامانەش، کە توانای گوفتار و ڕوونیی بەڵگە هێنانەوەیان پێ بەخشراوە، بە پشتیوانیی خوای گەورە هەتا ڕۆژی قیامەت ئەم فەرمانبەری‌یە پاك و پیرۆزە گشتی‌یە بە بەردەوامی بەڕێوە دەبەن، وەك تا ئێستا بەڕێوەیان بردووە و ئەنجامیان داوە.

**حەوتەم:**

وەك لە دادگاکانی پێشوودا، کە بەڵگەکانی خۆمان تێدا خستووەتە ڕوو، باسمان لەوە کردووە دوژمنە نهێنی و نەیارە ڕەسمی و ناڕەسمی‌یەکانمان کە حکوومەتیان خەڵەتاندووە و بە هەڵەیاندا بردووە و گومان و مەترسیی هەندێ لە پایەکانی حکوومەتیان قۆزتووەتەوە و دامودەزگای "داد"یان لە دژمان ئاراستە کردووە.. ئەوانە: یان بە شێوەیەکی یەکجار خراپ خەڵەتاون، یان خەڵەتێنراون، یان لە بەرژەوەندیی ئەو ئاژاوەچی‌یانە کار دەکەن کە بە شێوەیەکی غەددارانە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی حوکم تێدەکۆشن، یان لە کەسانی دوژمنی ئیسلامن، یاخود لەو مورتەددانەن کە دوژمنایەتیی ڕاستی‌یەکانی قورئان دەکەن، یان لە زەندیق و مولحیدانن.. چونکە ئەوانە لە دەمی دژایەتی کردنی ئێمەدا هیچ سڵێکیان لەوە نەکردەوە کە ناوی "ڕێسا" لە هەڵگەڕانەوە

(مورتەددی)ی تەواوەتی بنێن و، سیفەتی "مەدەنییەت" بۆ هەرزەیی و بەرەڵایی ترسناکی ڕەوشتی دابنێن و، ئەو ڕێسا کوفری و بەرەڵا و خۆسەپێنەش کە پابەندی هەوا و ئارەزووەکانە بە "یاسا" ناوزەد بکەن..

بەم جۆرە، توانییان گوشارێکی توند بخەنە سەرمان وحکوومەتیان خافڵاند و لە خشتەیان برد و، بێ هیچ پێویستییەك دام و دەزگای "داد"یان بەو ڕووکارەدا ئاراستە کرد کە بە ئێمەوە سەرقاڵ ببێت.

بۆیە ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە هەموو ئەوانە بە قەهر و غەزەبی خوای قەهھاری شکۆمەند دەسپێرین و، هانا بۆ قەڵای ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ دەبەین، تاکو لە شەڕ و زیانی ئەوانە بمانپارێزێت.

**هەشتەم:**

ساڵی پار وڵاتی ڕووسیا چەندین حاجیی نارد بۆ حەجی ماڵی خوا، بە نیازی پڕوپاگەندە بۆ خۆی و دەرخستنی ڕووس لە شێوەیەکدا کە زۆر زیاتر لە نەتەوەکانی تر ڕێز لە قورئان دەگرێت و، بە مەبەستی هاندانی جیهانی ئیسلامیش – لە ڕووی ئایینییەوە – لە دژی ئەم نەتەوە ئایینداری کە لەم نیشتمانەدا دەژی!

پاشان لەبەر بڵاوبوونەوەی جوزئیی چەند بەشێکی گەورەی پەیامەکانی نوور لە مەککەی پیرۆز و مەدینەی منەوەرە و دیمەشق و حەلەب و میسر و، بەدەستهێنانی ڕێز و تەقدیری زانایان و، شکاندنی پڕوپاگەندەی شیوعیی‌یەکان لە لایەن ئەم پەیامانەوە، ئەوا بەم کارانەیان ئەوەیان بۆ جیهانی ئیسلامی دەرخست کە خەڵکی تورکیا و برایانیان لەوێ بە توندی دەستیان لە قورئان و ئایینەکەیان گیر کردووە و، وەك برای گەورەی جیهانی ئیسلامی و بە وێنەی سەرکردەی ئازا و بە جەرگیانن لە پێناوی خزمەتی قورئاندا. واتە "پەیامەکانی نوور" لەو شار و مەڵبەندانەی ئیسلامدا ئەم ڕاستییەیان دەرخستووە و ڕوونیان کردووەتەوە.

جا ئەگەر ئەم خزمەتانەی پەیامەکانی نوور بەم جۆرە گوشار و ئازارانە پاداشت بدرێنەوە، ئایا ئیتر گریمانی ئەوە نابێت کە گۆی زەوی تووڕە ببێت ونارەزایی خۆی دەرببڕێت؟

**نۆهەم:**

لێرەدا پوختەی چەسپاندنی مەسەلەیەك دەهێنم کە لە دەمی داکۆکیم لە دادگای "دەنیزلی"دا هێناومە:

گریمان سەرکردەیەکی ترسناك و بلیمەت، بە زیرەکیی خۆی توانیی هەموو کردەوە باشەکانی سوپا بە هی خۆی لەقەڵەم بدات و کردەوە خراپ و لایەنە سەلبی‌یەکانی خۆیشی بداتە پاڵ سوپا، ئەوا بەم کارەی سەرجەمی کردەوە چاکەکانی - کە بە ژمارەی هەموو کەسانی سوپا دەبن - کەم کردووەتەوە بۆ کردەوەی چاکی یەك دانە کەس. هەروەها کاتێ کە خراپە و هەڵەکانی خۆیشی دایە پاڵ سوپا، ئەوا ژمارەی ئەو خراپانەی بە ئەندازەی ژمارەی کەسانی ناو سوپا پەرە پێداوە و زیادی کردووە. دیارە ئەمەش ستەمێکی ترسناکە و دژی ڕاستی‌یە.

هەر لەبەر ئەوە، لە دادگایەکی پێشوومدا کە داواکارە گشتی‌یەکەی لەسەر ئەوە هێرشی کردە سەرم کە لە دەمی لێکدانەوەی فەرموودەیەکی پیرۆزدا پێش چل ساڵ زللەیەکی تەمێ کردنم ئاراستەی ئەو کەسە کردووە[1]، بەو داواکارە گشتی‌یەم وت:

بەڵێ ڕاستە، من بە هێنانی چەند هەواڵێك کە فەرموودە پیرۆزەکان ڕایان گەیاندووە لە شان و شکۆی ئەو کەسە کەم دەکەمەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا شەرەفی سوپا لە هەڵە گەورەکان دەپارێزم. بەڵام تۆ دەچیت لە پێناوی یەك کەسی هاوەڵی خۆتدا شەرەفی‌ئەو سوپایە چەپەڵ دەکەیت کە هەڵگری ئاڵای قورئان و سەرکردەیەکی بە هەڵمەتی جیهانی ئیسلامی بووە و، چاکەکانی لە بناغەدا هەڵدەوەشێنیتەوە.

بەم قسەیەم، ئەو داواکارە سەری بۆ ویژدان نەوی کرد و، بە پشتیوانیی خوای گەورە لەو هەڵەیە ڕزگاری بوو.

**دەهەم:**

لە کاتێکدا کە دەبێ دامودەزگای "داد" حەقیقەتی دادگەری و مافی سەرجەمی هاووڵاتی‌یان - بە بێ جیاوازی - بپارێزێت و، تەنها بە ناوی "حەق" و لە پێناوی "حەق"دا کار بکات.. ئەوەتا ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - لە سەردەمی

---

(١) مەبەست: مستەفا کەمالە. (وەرگێڕ)

خەلافەتیدا شان بە شانی جوولەکەیەك لە دادگادا وەستان بۆ دادگایی کردنیان و، پەرپرسێکی "داد"یش جارێکیان کارمەندێکی بینی لە کاتی جێبەجێ کردنی سزای دزی بەسەر دزێکدا ڕق و تووڕەیی خۆی پێ ڕشت، یەکسەر لەسەر کارەکەی لایبرد و، بە داخ و خەفەتەوە وتی: "هەرکەسێك هەست و نەستە خۆییەکانی لەگەڵ جێبەجێ کردنی فەرمانی دادگەریدا ئاوێتە بکات ستەمێکی گەلێ گەورە ئەنجام دەدات"..

بەڵێ، کاتێ کارمەند فەرمانی یاسا جێبەجێ دەکات، گەر بەزەیی بەو کەسەدا نەهاتەوە کە فەرمانەکەی لەسەر جێبەجێ دەکرێت، لانی کەم نابێ لێی تووڕە ببێت. خۆ ئەگەر کاری لەو جۆرەی لێ دەربکەوێت ئەوا بە ستەمکار دادەنرێت. تەنانەت حاکمێکی دادگەر وتوویەتی: (ئەو کەسەی تۆڵەی کوشتنەوە(قصاص) لە بکوژێك دەسێنێتەوە، ئەگەر ڕق و تووڕەیی خۆی لە وکارەدا نواند بە قاتڵ دادەنرێت)!

جا لە کاتێکدا کە دەبێ تەنها ڕاستیی بێگەرد و دوور لە هەموو مەبەستێکی خۆیی بەسەر دادگادا زاڵ بێت، کەچی ئەو دیاردە نامۆیەی بە زەقی لە پێش چاودا خۆی دەنوێنێت ئەوەیە قوتابیانی بێ تاوانی پەیامەکانی نوور، کە پێویستیان بە دڵدانەوە و پیادە کردنی دادگەرییە لە کێشەکەیاندا، لێرەدا ڕووبەڕووی چەندین سووکایەتی و مامەڵەی توندوتیژ دەبنەوە، سەرباری دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیمان لە سێ دادگاو، بوونی چەندین نیشانەی زۆر لەسەر ئەوەی کە لە سەدا نەوەدی ئەم نەتەوەیە ئامادەن – گەر پێی بزانن – شایەتی لەسەر ئەوە بدەن کە هەرگیز ناگونجێ قوتابیانی نوور هیچ زیانێکیان لێ بووەشێتەوە، بەڵکو پێچەوانەی ئەمەیان لێ چاوەڕوان دەکرێت، ئەوەتا گەلێ سوودی گرنگ پێشکەش بەم نەتەوە و نیشتمانە دەکەن. لەبەرئەوە بڕیارمان داوە کە بەوپەڕی ئارامگرتنەوە بەرامبەر هەموو موسیبەت و سووکایەتییەك بێ دەنگ بین. هەر لەبەر ئەوەش کارەکانمان بە خوای گەورە دەسپێرین و دەڵێین: (بەڵکو ئەم کارانە خێریان تێدا بێت).

بەڵام من مەترسیی ئەوەم هەبوو ئەم چەشنە مامەڵانەی کە لە ئەنجامی خەبەرلێدان و بوختانی ڕق و قینی کەسانی قین لە دڵەوە ئاراستەی ئەو بێ تاوانانە کراوە، گیروگرفتەکان سەرهەڵبدەن. بۆیە ناچار بووم ئەمە بنووسم.

خۆ ئەگەر هەر کەموکووڕی و گوناهێك لـەم کـارەدا هـەبێت، ئەوا هـی منـە و، ئـەو هەزارانەش تەنها بە هاندەری ئیمانەکەیان و لە پێنـاوی دواڕۆژیـاندا و لەبـەر ڕەزامـەندیی خوای گەورە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ کردووم.

جا لە کاتێکدا کە ئەوانە شایانی ڕێز و ستایشن، کەچی ئەم چەشنە مامەڵـە سـەخت و دژوارانە لەگەڵیاندا، تەنانەت زستانیشی تووڕە کردووە.

هەروەها یەکێك لەو شتە نامۆ و سەرسـووڕهێنەرانە ئـەوەبوو کـە جـارێکی تـر هـەمان وەهم و گومانی دامەزراندنی "کۆمەڵە"یان هێنایەوە کایە، لە کاتێکدا کە سـێ دادگـا بـە وردی لـەم لایەنەی کۆڵیوەتەوە و پاشان بڕیاری بێ تـاوانیی بـۆ دەرکردووین. ئنجا هیـچ شـتێکی ئـەوتۆ لـە نێـوان ئێمـەدا نییـە کـە داخـوازی ئـەوە بێـت تـاوانی دامـەزراندنی "کۆمەڵـە"مـان بدرێتـە پـاڵ. ئـەوەتا دادگاکـان و پـاوانی ئاسـایش و پسـپۆڕان هیـچ نیشـانەیەکیان لەسـەر ئـەوە نەدۆزیوەتـەوە. چونکـە بـە وێنـەی پـەیوەندیی مامۆسـتای خوێندنگا بە قوتابیانیەوە و هی مامۆستای زانکۆ بە خوێندکارەکانیـەوە و هـی مامۆسـتای وانەبێژ و قورئـان خوێـن بـە قوتابیەکانیـەوە، ئێمـەش بە هـەمان شـێوە جگـە لـە پـەیوەندیی برایەتیی قیامەتی هیچ پەیوەستێکی تر لە نێوانماندا نییە..

کەواتە ئەوانەی قوتابیانی نوور بە تۆمەتی "دامەزراندنی کۆمەڵە" تاوانبار دەکەن دەبێ بە هەمان چاویلکە بڕواننە سەرجەم پیشـەوەران و قوتابیـان و ئامۆژگـاران. بۆیـە خـۆم بـە ناچار زانی بەرگری لەو کەسانە بکەم کە لە ئەنجامی چەند تۆمەتێکی بێ نرخ و بـێ بناغـە هێنراون بۆ ئەم بەندیخانەیەی ئێرە.

جـا هـەروەك سـێ جـار داکۆکیـم لـەو پەیامانـەی نـوور کـرد کـە ئـەم وڵاتـە و هـەموو جیهانی ئیسلامی بایەخی پێ دەدەن و، گەلـێ سوودی ماددی و مەعنـەویی گـەورەیان بـۆ ئەم نەتەوەیە پێشکەش کردووە.. جارێکی تریش و لە هـەمان ڕوانگـەوە داکۆکییـان لـێ دەکەمـەوە و، هیـچ هێزکـارێك نییـە ڕێـی بـەرگریم لـێ دابخـات، هـەروەك هیـچ یاسـا و سیاسەتێکیش ناتوانێت ڕێم لێ بگرێت.

بەڵێ، ئێمە کۆمەڵەیەکین کە لە هەموو سەردەمێکدا سێ سەد و پەنجا ملیـۆن ئـەندامی هەیە و، هەموو یەکێکی ئەو ئەندامانەش هەموو ڕۆژێك پێنج جـار لـە ڕێـی نوێـژەوە ڕێـز و حورمەتی خۆی بـۆ بیروبـاوەڕ و بنـەماکانی ئـەو کۆمەڵەیـە دەردەبڕێـت و ئامـادەیی خـۆی

دەردەخـات بـۆ خزمـەتکردنی ئـەو بیروبـاوەڕە و، بـە دوعاکـان و دەسـتکەوتە مەعنەوی‌یەکانیان و بە پێی دەستووری ﴿إِنَّمَـــا الْمُؤْمِنُـــونَ إِخْـــوَةٌ﴾ (الحجرات: ١٠) بۆ یارمەتیی یەکتر ڕادەپەڕن. ئەوەتا ئێمە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە مەزن و خاوێنەین.

ئەرکی سەرشانمان گەیاندنی ڕاستی‌یە ئیمانی‌یەکانی قورئانی پیرۆزە بە شێوەیەکی یەقینی و بێ گومـان بـە ئیمـانداران و، ڕزگـارکردنی ئـەوان و خۆیشـمانە لـە ئیعدامـی هەمیشەیی و زیندانی تاکە کەسی.

بەڵام هەرگیز هیچ پەیوەندی‌یـەکمان بـە کۆمەڵـە دنیـایی و سیاسـی‌یەکانەوە نی‌یـە کـە زیـاتر گەمـە و یاری‌یـان پێـوە دیـارە و شـێوازە لار و چەوتـەکان دەگرنەبـەر. هـەروەك پەیوەندیشـمان بـە گەمـەی "کۆمەڵـەکان" و هیـچ کۆمەڵەیـەکی نهێنی‌یـەوە نی‌یـە، کـە تۆمەتێکە هەمیشە دەدرێتە پاڵمان و، ئێمە هەر لە بناغەدا دانابەزینە ئەو چەشنە ئاستانە.

دوای ئەوەی کە چوار دادگا لەم بابەتەیان کۆڵی‌یەوە و بە وردی شەن و کەویان تێـدا کرد، بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکردین.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## پاشماوە و هاوپێچی

ئەو بەرگرییەی کە پێشکەش بە شەش لایەنی داد

لە "ئەنقەرە" و دادگای تاوانە گەورەکان لە شاری "ئافیوون" کرا

بە ڕوونی و ڕاشکاوی بە دادگای "ئافیوون" دەڵێم:

سەبر و ئارامم نەماوە و، دەبێ سنوورێك بۆ ئەم کارە دابنرێت. وا ئێمە بە بێ هیچ هۆیەك بیست و دوو ساڵە نەفی کراوین و لە ژێر چاودێریی بەردەوامدا دانراوین. ئنجا وەك بڵێی زیندانی تاکە کەسیم و دابڕینم لە جیهان هێشتا کەم بێت، بۆیە شەش جار بۆ بەردەم دادگایان بردم و سێ جاریش بەندیان کردم، بە بێ هیچ بیانوویەکی یاسایی (لە دووسێ مەسەلەدا نەبێت). هەموو ئەمانەش لە ئەنجامی چەند وەهم و گومان و گریمان دانانێك. چونکە ئەوان لە سەد دانەی پەیامەکانی نووردا تەنانەت یەك شوێنی ئەوتۆیان دەست نەکەوت کە لە ڕووی یاساوە بیکەن بە بیانووی دەستیان لە دژی ئێمە.

بڕیاری لێ سەندنی سەدان هەزار لیرە "غەرامە"شیان لەسەر قوتابیانی نوور دەرکرد، کە ئەوەش غەدر و ستەمێکی بێ وێنەیە و، نەوەکانی داهاتوو بەوپەڕی توندوتیژی لەعنەت بۆ ئەنجامدەران و هۆکارەکانی ئەو ستەم و کارە ناڕەوایە دەنێرن.

سەبارەت بە دادگای گەورەش ئەوا ئێمە باوەڕی تەواوەتیمان بەوە هەیە کە لەوێ ئەو ستەمکارانە فڕێ دەدرێنە بنکی دۆزەخ و پلە هەرە نزمەکانیەوە. هەر ئەم باوەڕەشمانە کە هەندێ خەمڕەوێنیمان پێشکەش دەکات. دەنا دەمانتوانی بە هەموو هێزێکمانەوە بەرگریمان لە مافەکانی خۆمان بکردایە.

بەم جۆرە، لە ماوەی پازدە ساڵدا ڕۆشتینە بەردەم شەش دادگا و، ماوەی بیست ساڵیش لێکۆڵینەوەی ورد لە پەیامەکانی نوور و نامەکانماندا کرا. ئەنجامی هەموو ئەمانەش ئەوەبوو کە لە پێنج دادگادا بە تەواوی بێ تاوانیمان ڕاگەیەنرا.

سەبارەت بە دادگای "ئەسکی شەهر"یش تەنها چەند ڕستەیەکی کەمی لە پەیامێکی بچووکدا کە، "پەیامی پۆشتەیی"یە، کرد بە بیانوو تاکو بەپێی ماددەیەکی یاسایی، کە وەك لاستیك دەیانکشاند، بڕیاری سزایەکی کەم و سادەیان لەسەر دەرکردین. بەڵام

ئێمە لەو لائیحەی هەڵەگیرییەدا کە دوای دادگای تەمیز بە ڕەسمی نووسیمان و پێشکەشی "ئەنقەرە"مان کرد، ئاماژەمان بۆ یەك شت کرد کە نموونەیە لەسەر نایاسایی بڕیارەکە و، وتمان:

ئایەتی "پۆشتەیی" کە یەکێك لەو دابە ئیسلامییە بەهێزانە ڕوون دەکاتەوە کە لەو دەستوورەدا هاتووە لە لایەن سێ سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمانەوە بە درێژایی هەزار و سێ‌سەد و پەنجا ساڵ بە بەرز و پیرۆزی ڕاگیراوە.. ئەم ئایەتە، پەڵپ و بیانووی کەسێکی مولحید و ڕەخنەی شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارەی ئاراستە کراوە. بۆیە تەفسیری ئەو ئایەتە پیرۆزەم نووسی و بەرگریم لێ کرد. لە تەفسیرەکەشمدا شوێن یەکدەنگیی سێ‌سەد و پەنجا هەزار تەفسیر کەوتم[1] و بە شوێن پێی باپیرانی خۆماندا هەنگاوم نا لە درێژایی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا. جا ئەگەر لە هەموو دنیادا "دادگەرییەك" هەبێت دەبێ بڕیارێك دەربکات پێچەوانەی ئەو سزایە بێت کە ئێستا لەسەر پیاوێك دەرکراوە تەفسیرێکی لەو جۆرەی نووسیوە، بۆ ئەوەی ئەو پەڵە سەیرە لە دەموچاوی دامودەزگای "داد"ی ئەم وڵاتە ئیسلامییە بسڕێتەوە!

کاتێ ئەم لائیحەی هەڵەگیرییەم نووسی و پێشکەشی داواکاری گشتییئەوێم کرد، لەرزی لێ هات و، وتی:

"تکات لێ دەکەم! پێویست بەمانە ناکات، چونکە سزاکەت تەنکە و ئەو ماوەیەش کە ماوتە زۆر کەمە. بە پێویستی نازانم ئەم لائیحەیە پێشکەش بکەیت "!

بێ گومان ئێوە ئاگادارن کە من لە ناوەندی ئەو ئیعتیرازانەی کە هاوشێوەی ئەمەی سەرەوەن و، بۆ ئێوە و لایەنە ڕەسمییەکانی "ئەنقەرە"م ناردوون، چەند نموونەیەکی ترم لەم چەشنە تۆمەتە سەیر و سەمەرانە نووسیوە. بۆیە من داوا لە دادگای "ئافیوون" دەکەم و بە ناوی "دادگەری"یەوە ئومێدەواری ئەوەم لێیان کە سەربەستیی تەواوەتی بە پەیامەکامی نوور بدەن، ئەو پەیامانەی کە لە پێناوی بەرژەوەندیی ئەم نەتەوە و نیشتمانەدا خزمەت و خێر و بەرەکەتی هێندەی خزمەتی سوپایەکی تەواو پێشکەش دەکەن. دەنا بەندکردنی هەندێ لە هاوڕێیانم بەهۆی منەوە هانم دەدات گەورەترین تاوانی ئەوتۆ ئەنجام بدەم کە شایانی گەورەترین سزا بێت، بۆ ئەوەی ئەم ژیانە بەجێ بهێڵم. چونکە ئەمەی خوارەم بە دڵدا هات:

---

(١) لەوانەیە مەبەستی هەموو ئەو کتێبانە بێت کە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزیان تەفسیر کردووە. (وەرگێڕ)

لە کاتێکدا کە دەبوو حکوومەت بیپاراستمایە و دەستی یارمەتی و هاوکاریی بۆ درێژ بکردمایە، چونکە ئەو کارە بەرژەوەندییەکی گەورەی بۆ نەتەوە و سوودێکی زۆری بۆ نیشتمان تێدایە، کەچی تەنگ پێ هەڵچنین و گوشار خستنە سەرم لە لایەن حکوومەتەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی دەستەی پەنهانی ئیلحاد کە ماوەی چل ساڵە دژایەتیم دەکەن و هەندێك لە تاقمی شیوعییەکانیش کە ئێستا ڕۆشتوونەتە ریزی ئەوان، توانیویانە چەند شوێنێکی گرنگی ناوەندە ڕەسمییەکان داگیر بکەن و ئێستا لەوێوە سەرکردەیی ئەو هێرشە دەکەن لە دژم. ئیتر حکوومەتیش یان بەمە نازانێت، یان پێی دەزانێت و بواری پێ داون. چەند نیشانەیەکی نیگەرانی بەخش لەسەر ئەمە هەیە.

ئەی سەرۆکی بەڕێزی دادگا!

گەر بوارم پێ بدەن پێم خۆشە پرسیارێك ئاراستە بکەم کە گەلێ سەرسامم دەکات:

بۆچی سیاسەتمەداران لە هەموو مافێکی مەدەنی و سەرجەم مافەکانم لە ئازادیدا و تەنانەت لە مافەکانی ژیانیشم بێ بەشم دەکەن؟ لە کاتێکدا کە من بەشداریم لە سیاسەتدا نەکردووە و نەڕۆشتوومەتە ململانێی سیاسەتەوە؟ ئەوەتا بە وێنەی خوێنڕێژێك کە دەستی بە خوێنی سەدان کەسی بێ تاوان سوور بووبێت مامەڵەیان لەگەڵ کردووم و، سێ مانگ و نیو لە زیندانێکی تەنیاییدا بەندیان کردم و، هەوڵیان دا دەستدرێژی بکەنە سەر ژیانم و یازدە جار ژەهریان دەرخوارد دام..

خۆ کاتێکیش هاوڕێ دڵسۆز و قوتابییە ڕاستەکانم ویستیان لە شەڕ و زیانی ئەوانە بمپارێزن، ڕێیان لێ گرتن و نەیانهێشت پەیوەندیم پێوە بکەن. تەنانەت لە خوێندنەوەی کتێبە پیرۆز و بێ زیانەکانم بێ بەشیان کردم، کە لەم تەنیا باڵی و نەخۆشی و پیری و غەریبییەمدا مایەی دڵنەواییمن.. ئەوەبوو داوام لە داواکاری گشتی کرد کە تەنها یەك دانەم لە کتێبەکانی خۆم بداتێ، هەرچەندە بەڵێنی پێ دام کەچی نەیبردە سەر. بۆیە ناچار بووم بە تەنیایی لەناو هۆڵێکی داخراوی گەورە وسارد و سڕدا بمێنمەوە، بێ ئەوەی هیچ شتێکم لابێت کە خۆمی پێ سەرقاڵ بکەم. خزمەتکار و پاسەوانەکانیشیان گاڵ دابوو کە بە دوژمنایەتی و زبری مامەڵەم لەگەڵدا بکەن، لە بریی نەرمونیانی، کە دەگونجا نەختێ دڵنەوایی و خەمڕەوێنیم تێدا دەست بکەوتایە!

وا نموونەیەکی بچووکتان لەم جۆرە مامەڵەیەی ئەوان پێش چاو دەخەم:

عەرزوحالێکم بۆ بەڕێوەبەر و بۆ داواکاری گشتی و بۆ سەرۆکی دادگا نووسی و، ناردم بۆ یەکێك لە برایانم تاکو بەم پیتە نوێیانە بینووسێتەوە کە من نایانزانم. ئەویش نووسینیەوە و پێشکەش بەوانە کرا کە باسم کردن. ئەوان ئەم کارەیان لەسەر من بە تاوانێکی یەکجار گەورە ژمارد و، هەموو کەلێن و پەنجەرەکانی ژوورەکەمیان داپۆشی و بزماررێژیان کرد و، تەنانەت یەك دانە پەنجەرەشیان نەهێشتەوە داینەخەن و پەردەی پیا نەدەن، لە کاتێکدا کە من دوو کەڵ گەلێ بێزاری دەکردم..

ئنجا هەرچەندە یاساکانی بەندیخانە ڕێ بەوە نادەن ماوەی زیندانی تاکە کەسی لە پازدە ڕۆژ زیاتر تێپەڕ بکات، کەچی ئەوان سێ مانگ و نیو منیان لە زیندانی تاکە کەسیدا هێشتەوە و، نەیانهێشت هیچ کەس لە هاوڕێیانم پەیوەندیم پێوە بکات..

پاشان لائیحەیەکی چل لاپەڕەیی ئیتیهامیان پیشان دام کە بە ماوەی سێ مانگ نووسیبوویان و ئامادەیان کردبوو. جا لەبەر ئەوەی من ئەم پیتە نوێیانە شارەزا نیم و نەخۆشم و خەتیشم ناخۆشە، تکام لێ کردن کە یەکێك بنێرن بۆ لام تاکو بۆم بخوێنێتەوە لەگەڵ دوو کەس لە هاوڕێیانم کە لە زمانی من تێدەگەن بۆ ئەوەی ئیعتیراز و بەرگرییەکەمم بۆ بنووسن، کەچی ئەمەیان قبووڵ نەکرد و، وتیان: "با پارێزەرەکە بێت بۆی بخوێنێتەوە". بەڵام دوایی بواریان تەنانەت بەوەش نەدا و، بە یەکێك لە برایانیان وت: "ئەو لائیحەیە بە پیتە کۆنەکان بنووسەرەوە و بیدەرێ". بەڵام نووسینەوەی ئەو لائیحەیە بە شەش حەوت ڕۆژ ئنجا تەواو دەبێت..

بەم جۆرە و لە بریی خوێندنەوەیەك کە بە ماوەی سەعاتێك ئەنجام دەدرێت، کارەکەیان بۆ ماوەی شەش حەوت ڕۆژ درێژ کردەوە، بۆ ئەوەی ڕێ لە هەموو پەیوەندییەك بگرن پێمەوە. دیارە ئەمەش کارێکی ئیستیبدادی و خۆسەپێنیی ئەوتۆیە کە هەموو مافێکی من لە بەرگری و داکۆکیدا پووچەڵ دەکاتەوە..

خۆ ئەگەر خوێنڕێژێك سەد تاوانی کردبێت و بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرچووبێت، لە هیچ شوێنێکی دنیادا ڕووبەڕووی ئەم چەشنە مامەڵەیە نابێتەوە.

لە ڕاستیدا من زۆر پەرۆشی ئەوەم کە هۆی ئەم چەشنە ئازاردانەم نازانم.

بیستم کە: سەرۆکی دادگا مرۆڤێکی دادگەر و بە بەزەییە. بۆیە ئەم سکاڵایەم وەك تاقیکردنەوەیەکی یەکەم جار و دواجار پێشکەش کردن.

چوار بناغە لە لائیحەی ئیتیهامەکەدا هەیە.

**بناغەی یەکەم:**

"ئیددیعاکردنی ئەوەی کە گوایا من کەسێکم شانازی بە خۆمەوە دەکەم و پیایدا هەڵدەدەم".

پێشتر بە هەموو هێزێکمەوە بەرپەرچی ئەم ئیددیعایەم داوەتەوە. کاتی خۆیشی لیژنەی تایبەت لە دادگای "دەنیزلی"دا وتبووی: "ئەگەر سەعیدی نوورسی ئیددیعای ئەوە بکات کە مەهدیی چاوەڕوانکراوە، قوتابی‌یەکانی لاری‌یان لێی نابێت".

**بناغەی دووهەم:**

"شاردنەوەی نووسراوەکانیەتی".

دەبێ لە لایەن دوژمنانی پشتی پەردەوە واتای هەڵەی لێ نەدرێتەوە. چونکە شاردنەوەیان نە بە نیازی سیاسی و نە بە هیچ نیازێکەوە نەبووە کە زیانی بۆ ئاسایشی وڵات تێدا بێت.

ئنجا بوونی ئامێرێکی چاپ بە پیتە کۆنەکان، هەرگیز نابێتە مایەی بیانوو گرتن بۆ ئەوەی هێرش بکرێتە سەرمان.

سەبارەت بە مەسەلەی ئەو زللەیەش کە لە لایەن پەیامەکانی نوورەوە ئاراستەی مستەفا کەمال کراوە[1]، ئەوا شتێکی پەنهان نی‌یە و، شەش دادگا و سەرجەم لایەنە

---

(١) داواکاری گشتی بەهۆی تێگەیشتنی هەڵەی لەوەی کە لەبارەی کەرامەتی پەیامەکانی نوورەوە هاتووە، لەوەدا زللەی تەمێ کردنیان تێدا دەرکەوتووە، ئیتیهامێکی هێناوە و بە خەیاڵی خۆی پێی وایە کە ئێمە دەڵێین: ئەو بوومەلەرزە و بەڵاو موسیبەتانەی لە دەمی هێرش کردندا بۆ سەر قوتابیان و پەیامەکانی نوور ڕوو دەدەن چەند زللەیەکن لە لایەن پەیامەکانەوە ئاراستە کراون. بەڵام ئێمە دەڵێین: نەخێر.. نەخێر. هەرگیز شتی وامان نەوتووە و نەشمان نووسیوە. بەڵکو لە زۆر شوێن و لە دەمی هێنانەوەی بەڵگەکاندا وتوومانە: "پەیامەکانی نوور" وەك سەدەقەی وەرگیراو وان، کەواتە هۆکاری دوورخستنەوەی بەڵاو موسیبەتەکانن، چونکە هەرکات هێرش دەکرێتە سەر پەیامەکانی نوور، ڕووناکی‌یەکان کز دەبن و بەڵا و موسیبەتەکانیش هەڵی پەیدابوونیان بۆ دەڕەخسێت. بەڵێ، سەدان ڕووداو هەن لەگەڵ شایەتیدان و تەسدیقی هەزاران کەسی قوتابیانی نووردا کە پیشانمان دەدەن هاوکات بوونی ئەو ڕووداوانە لەگەڵ هێرش کردندا بۆ سەر پەیامەکان ئەستەمە کاری ڕێکەوت بێت. جا هەروەك ئەممان بە شێوەیەکی جوزئی لە دادگاکاندا پێش چاو خست، باوەڕی تەواوەتیشمان بەوە هەیە کە ئەم هاوکات بوونانە بەڵگەیە لەسەر قبووڵ بوونی پەیامەکانی نوور لای خوای گەورە و، بەڵگەی ڕێزی خوایی‌یە و، جۆرە کەرامەتێکە لە لایەن قورئانی پیرۆزەوە پێشکەش بە پەیامەکانی نوور کراوە. (دانەر)

ڕەسمی‌یەکانی "ئەنقەرە" لێی ئاگادارن و، هیچ ئیعتیرازێکیان لێ نەگرتووە و، بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکردین و، سەرجەم کتێبەکانیان داینەوە، کە لە نێوانیاندا "تیشکی پێنجەم"یشی تێدایە. پاشان کاتێ کە من خراپکاری‌یەکانی ئەو دەردەخەم، لە پێناوی پاراستنی ڕێز و حورمەتی سوپادایە. واتە: خۆش نەویستنی تەنیا کەسێك لەبەر ستایش کردنی پڕ لە خۆشەویستیی سوپایە.

**بناغەی سێهەم:**

وێڕای بوونی سەد هەزار قوتابیی نوور و بردنی سەد هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور بۆ بەردەم شەش دادگا لە ماوەی بیست ساڵدا، کەچی لە لایەن بەرپرسانی ئاسایشی دە پارێزگاوە هیچ شتێکمان لەسەر تۆمار نەکراوە کە ئاسایش تێك بدات یان ئارامیی وڵات بخاتە نیگەرانی‌یەوە. ئاشکرایە کە نەبوونی هیچ ماددەیەك ئاماژە بۆ بوونی ئەم چەشنە تێکدانە بکات، نە لەو شەش دادگایە و نە لای کارمەندانی ئەو دە پارێزگایەوە، گەورەترین بەڵگە و باشترین بەرپەرچدانەوەیە لە دژی ئەو هێرشە سەیر و سەمەرەیەی دەکرێتە سەرمان کە گوایا ئێمە هانی خەڵکی دەدەین بۆ تێکدانی ئاسایشی وڵات.

سەبارەت بەم لائیحەی ئیتتیهامە نوێیە، ئەوا وەڵامدانەوەی بە کارێکی زیاد لە پێویست و گاڵتەجاری دەزانین، چونکە دووپات کردنەوەی هەمان تۆمەتەکانی پێشووە کە چەندین جار وەڵامیان لەسەر دراوەتەوە و سێ دادگاش بڕیاری بێ تاوانیی ئێمەیان لەو تۆمەتانە دەرکردووە و، چەند مەسەلەیەکی بێ بایەخن. جا لەبەر ئەوەی تاوانبار کردنی ئێمە سەبارەت بەم بابەتانە لە ڕاستیدا بە تاوانبار کردنی دادگای "ئەنقەرە" بۆ تاوانە گەورەکان و دادگای "دەنیزلی" و دادگای "ئەسکی شەهر" دادەنرێت ( چونکە ئەو دادگایانە ئێمەیان لەم بابەتانەدا بێ تاوان دەرکردووە) ئەوا وەڵامی ئەم لائیحەی ئیتتیهامە بەو دادگا ناوبراوانە دەسپێرم.

جگە لەمەش، دوو سێ مەسەلەی تر هەن:

*مەسەلەی یەکەم:*

لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکردین و، دوای لێکۆڵینەوەیەکی تەواوەتی و وردی ماوەی دوو ساڵیش لە دادگای "دەنیزلی" و دادگای تاوانە گەورەکان لە "ئەنقەرە" بڕیاریان دا هەموو کتێبەکانمان بدەنەوە، کەچی وێڕای ئەوە، ئاماژە بۆ یەك

دوو مەسەلەی نێوان مەسەلەکانی "تیشکی پێنجەم" دەکەن کە تایبەتن بە سەرکردەیەك مرد و کۆتایی پێ هات[1] بۆ ئەوەی وەك ماددەیەکی تاوانبار کردن لە دژی ئێمە بەکاری بهێنن.

ئێمەش دەڵێین: ئاراستە کردنی ڕەخنەیەکی ڕاست و ڕەوا و هەمەکی سەبارەت بە کەسێکەوە کە مرد و کۆتایی پێ هات و پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە نەما، هەرگیز بەلای یاساوە بە تاوان دانانرێت.

پاشان داواکاری گشتی تەئویلێکی لێزانانەی بۆ واتایەکی گشتی و هەمەکی کرد و بەسەر ئەو سەرکردەیەدا شکاندیەوە. شتێکی ئاشکرایشە کە واتایەکی هێندە ورد عامەی خەڵکی لێی تێ نەگەن و لە نێوان سەد کەسدا مەگەر یەك کەس پەیی پێ ببات و لە پەیامێکی نهێنی و تایبەتدا بێت، هیچ یاسایەك نییە بە تاوانی دابنێت.

پاشان ئەو پەیامە تەئویلی فەرموودە موتەشابیهەکانی بە شێوەیەکی ڕەنگین لێکداوەتەوە. جا ئەگەر ئێمە خەریکی ڕوونکردنەوەی واتای فەرموودەیەکی پیرۆز بین و ئەو واتایەش لە کەسێکی تەفسیربارادا هاتە دی، ئەوا هیچ یاسایەك ئەمە بە تاوان دانانێت. بە تایبەتی کە ئەم ڕوونکردنەوەیە لە چل ساڵ پێش ئێستاوە هەیە و خراوەتە بەردەم سێ دادگا و دادگاکەی ئێوەش، هەروەك لە ماوەی سێ ساڵدا براوە بۆ شەش لایەنی بەرپرس لە "ئەنقەرە" و، هیچ ڕەخنەیەك لە بەرگرییەکەم و ئەو ئیعتیرازانەشم نەگیرا کە بە شێوەیەکی قەتعی وەڵامم تێدا دابوونەوە.

پاشان ڕەخنەگرتن لە کەسێك کە لە ناوەندی کوودەتایەکی ئەوتۆدا بووە گەلێ خراپکاریی لێ بووەتەوە و، هەرگیز چاکەکارییەکانی ئەو کوودەتایە بە هی تەنیا ئەو دانانرێن، بەڵکو بە هی سوپا و هی حکوومەت دادەنرێن. لەوانەیە ئەو تەنها یەك بەشی کەمی لەو چاکەکاریانەدا بێت[2]، ئەم ڕەخنەگرتنە هەرگیز تاوانی تێدا نییە. جا

---

(١) مەبەست مستەفا کەمالە. (وەرگێڕ)

(٢) دوای ئەوەی مستەفا کەمال دەستی بەسەر حوکمدا گرت، چەند یاسایەکی لە دژی ئیسلام دەرکرد. ئەوەبوو خەلافەتی هەڵوەشاندەوە و، قوتابخانە ئایینییەکانی نەهێشت و، پیتی نووسینی لە هی عەرەبییەوە کرد بە لاتینی و، ڕێی لە بانگی شەرعی گرت (چونکە فەرمانی دا بانگ بە تورکی بدرێت) و، یاسای بەرگ و پۆشاکی دەرکرد و، لە سویسرا و فەرەنساوە یاسای هێنا بۆ کار پێ کردن و... هتد. جا هەموو ئەمانە بە خراپکارییەکانی ڕژێمەکەی دادەنرێن. بەڵام جەنگەکانی سەربەخۆیی کە ئەویش بەشداریی تێدا کرد و

هەروەك ڕەخنەگرتنمان لێی لە ڕووی خراپکاری‌یەکانیەوە، بە تاوان دانانرێت، ناشبێت بوترێت ئەم ڕەخنە گرتنە هێرشە بۆ سەر بزووتنەوەی کوودەتاکە. ئایا چ گونا هـو چ تاوانێك لـەوەدا هەیـە ڕەخنـە لـە پیـاوێك بگریـت و خۆشـت نـەوێ کـە "مزگـەوتی ئـەیاصۆفیا"ی (کـە مایـەی شـانازیی هەمیشـەیی نەتەوەیـەکی پالـەوان و گەوهـەری درەخشانی خزمەت و تێکۆشانیەتی لە پێناوی قورئـاندا و دیاری‌یەکی بەنرخی شمشێری باپیرە قارەمانەکانیەتی) کرد بە خانەی بتان و، بارەگای مەشیەخەتی ئیسلامیی گـۆڕی بـە دواناوەندیی کچان؟

*مەسـەلەی دووهـەم سـەبارەت بـە هۆکارەکـانی تاوانبارکردنمـان لـە لائیحەکـەی داواکاری گشتیدا:*

دوای ئـەوەی کـە لـە سـێ دادگـادا بڕیـاری بـێ تاوانیمـان بـە دەسـت هێنـا، ڕوونکردنەوەیەکی ڕەنگینی تەئویلی فەرموودەیەکی پیرۆز کە چل ساڵ پێش ئێستا لـە "تیشکی پێنجەم"دا ڕوون کرایەوە، موسڵمانانی ڕزگار کرد. ئـەوەبوو "شیخ الإسلام": (زەنبیللی عەلی ئەفەندی) وتوویەتی:

"تەنانەت لە ڕووی گاڵتە کردنیشەوە دروست نی‌یە شەپقە لەسەر بکرێت".

هەروەك زانایان و "شیخ الإسلام"ەکانی تر لەسەر کردنـی شـەپقەیان بـەلاوە دروست نەبووە. ئەمەش کارێکی کرد کە خەڵکانی عەوامی موسڵمان کاتـێ ناچـار کـران شـەپقە لەسەر بکەن[1] لەبەردەم هـەڵبژاردنی یـەکێك لـەم دووانـەدا بـن: یـان واز لـە ئایینەکـەیان بهێنن، یان بزووتنەوەیەکی یاخی بوون بەرپا بکەن.

بەڵام یەکێك لە بڕگەکانی پەیامی "تیشکی پێنجەم" دەڵێت:

---

سەرکردەی هەندێکیشیان بوو، لەئەنجامەکەشیان سەرکەوتنی تورکیا و دەرکردنی هێزە بیانی‌یەکان بوو، بە هەندێك لە چاکەکاری‌یەکانی ئەو کوودەتایە دادەنرێت. بـەڵام ئـەم چاکەکاری‌یانـە چـەند سەرکردەیەکی تر بەشداری‌یان تێدا کردووە و، بەشی هەرە زۆری هی سەرکردەکانی تر و ئەفسەرە پلە نزمەکان و سەربازە ئازا و بـە جەرگەکانـە. کـەچی ڕۆژنامـەکانی و سـەرچاوەکانی تـری ڕاگەیاندنەکـەی هـەوڵیان دا هـەموو ئـەو چاکەکاری‌یانە بە هی ئەو لەقەڵەم بدەن و، خۆیان گێل کرد لەوەی ئاماژە بۆ ڕۆڵـی سـەرکردەکانی تـر و سوپا بکەن. (وەرگێڕ)

(١) ئەوەش بەپێی یاسای بەرگ و پۆشاك کە مستەفا کەمال دەری کرد و، لـەو ڕێیـەوە خـەڵکی ناچـار کـرد شەپقە لەسەر بکەن! (وەرگێڕ)

"ڕۆژێك دێت شەپقە دەکرێتە سەر خەڵکی و، شەپقەکەش بەو سەرە دەڵێت: سوژدە مەبە. بەڵام ئەو ئیمانەی کە لەو سەرەدایە تەنانەت ئەو شەپقەیەش ناچار دەکات بڕواتە سوژدە و، پشت بە خوا موسڵمانی دەکات"!

جا ئەم بڕگەیە خەڵکانی عەوامی ئیمانداری لەوە ڕزگار کرد کە هەڵگەڕانەوە و یاخی بوون ڕابگەیەنن. هەروەك لەوەش دەربازی کردن کە واز لە ئایینەکەیان بهێنن.

ئەمە وێڕای ئەوەی کە هیچ یاسایەك نی‌یە داوای شتی وا لە کەسانی گۆشەگیر بکات. ئەوەبوو شەش حکوومەت لە ماوەی بیست ساڵدا بۆ لەسەر کردنی شەپقە زۆریان لێ نەکردم. هەروەك ژن و منداڵ و پێش نوێژی مزگەوتەکان و کارمەندان لە فەرمانگەکانیاندا و زۆربەی خەڵکانی لادێ نشین زۆریان لێ نەکراوە بۆ لەسەر کردنی و، سەربازەکانیش لابراوە لەسەریان. ئنجا لەسەر کردنی سەروپێچ و کڵاو لە زۆربەی پارێزگاکاندا قەدەغە نی‌یە..

کەچی وێڕای هەموو ئەمانە، ئەم بابەتە[1] کراوە بە ماددەیەکی تاوانبار کردن لە دژی من و برایانم. جا ئایا لە هەموو جیهاندا یاسایەك یان بەرژەوەندی‌یەك یان بناغە و ئەسڵێك هەیە ئەم چەشنە تۆمەتە (بێ واتایە) بە تاوان دابنێت؟

*سێ‌هەم مەسەلە کە کراوە بە مایەی تۆمەتبارکردنمان:*

ئەوەیە کە گوایا لە "ئەمیرداغ"دا خەڵکمان بۆ تێکدانی ئاسایش هان داوە.

لە بەرپەرچی ئەمەدا دەڵێم:

یەکەم:

ئاماژە بۆ ئەو ئیعتیرازە دەکەم کە بە ئاگاداری و ڕوخسەتی ئەم دادگایە پێشکەشی خودی ئەم دادگایە و شەش لایەنی بەرپرسم کردووە لە "ئەنقەرە". کە ئیعتیرازێکە بەرپەرچ نەدراوەتەوە. بۆیە خودی ئەو ئیعتیرازە وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ لائیحەی ئیتیهام پێشکەشی دادگا دەکەم.

دووهەم:

هەموو ئەو کەسانەی لە "ئەمیرداغ" قسەیان لەگەڵ کردووم و خەڵکەکەی ئەوێ و کارمەندانی ئاسایش شایەتن کە دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیمان، لەو

(١) مەبەست: لەسەر نەکردنی شەپقەیە. (وەرگێڕ)

گۆشەگیری‌یەمدا، بە هەموو هێزێکمەوە لە بەشداری کردنی هەموو سیاسەتێکی دنیا دوور کەوتوومەتەوە. تەنانەت واز م لە نووسین و نامە گۆڕینەوەش هێناوە، ئەوەتا دوو بڕگەی بچووك نەبێت سەبارەت بە مەلائیکەت و حیکمەتی دووپات بوونەوە لە قورئانی پیرۆزدا هیچ کتێب و پەیامێکم نەنووسیوە و، لە حەفتەیەکدا یەك نامە زیاترم نەدەنووسی کە تیایدا هانی خوێندنەوەی پەیامەکانی نوورم دەدا. بگرە برا موفتی‌یەکەم - کە بیست ساڵ قوتابیم بووە - لە ماوەی سێ ساڵدا سێ چوار نامە زیاترم بۆ نەناردووە، هەرچەند ئەو بەردەوام کارتی جەژنە پیرۆزەی بۆ دەناردم و زۆریش نیگەرانی حاڵم بوو. خۆ براکەی ترم کە لە شارەکەی خۆمدایە، بە درێژایی بیست ساڵ هیچ نامەیەکم بۆ نەناردووە..

کەچی لەگەڵ ئەمەشدا دەبینین لائیحەی ئیتیهامەکە بە فێڵبازی‌یەکی بێ وێنە هەمان قەوانی کۆن لێ دەداتەوە و بە تێکدانی ئاسایش و دژایەتی کردنی بزووتنەوەی کودەتاکە تاوانبارم دەکات.

ئێمەش لە بەرپەرچی ئەمەدا دەڵێین:

زیاد لە بیست هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور لە ماوەی بیست ساڵدا لە لایەن بیست هەزار کەس بگرە سەد هەزار کەسەوە بەوپەڕی حەز و شەوق وقبووڵ کردنەوە خوێنراونەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شەش دادگا و پیاوانی ئاسایشی دە پارێزگای پەیوەندیدار هیچ شتێکیان لە دژیان نەدۆزیوەتەوە..

ئەمەش دەری دەخات کە ئەگەر تەنانەت یەك دانە گریمانیش لە نێوان هەزاران گریماندا هەبێت لە دژمان، ئەوا ئەو گریمانە دەکەن بە بیانوو، وەك ئەوەی لە ڕاستیدا ڕووی دابێت! لە کاتێکدا کە ئەگەر یەك گریمان لەناو دووسێ گریماندا بێت و ئاسەواری ڕوودانی دەرنەکەوتبێت هەرگیز بە تاوان دانانرێت. خۆ لێرەدا تەنانەت یەك دانە گریمانیش لە نێوان هەزاردا لە ئارادا نی‌یە.

خۆ ئەگەر کار لەسەر ئەم چەشنە گریمانانە بکرێت ئەوا گریمانێك سەبارەت بە هەموو کەسێکەوە هەیە - کە داواکاری گشتیش یەکێکە لەوانە - ئەویش گریمانی ئەوەیە چەند تاوانێکی کوشتن ئەنجام بدات، یان لەبەر خزمەتکردنی شیوعی و ئاژاوەچی‌یەکان ئاسایشی وڵات تێك بدات..

کەواتە لێکدانەوەی ئەم زیادەڕەوی‌یانە لە گریمان دانراندا، وەکو ئەوەی ڕوویان دابێت و، بەکارهێنانیان لەسەر ئەم بناغەیە، خیانەتە بە دادگەری و یاسا.

پاشان کارێکی زۆر سروشتی‌یە کە هەموو حکوومەتێك نەیار(موعارەزە)ی تێدا بێت. موعارەزەی "فیکری"ش هەرگیز بە تاوان دانانرێت، چونکە حکوومەت سەیری ڕواڵەت دەکات و لێپرسینەوە لە هیچ کەسێك ناکات لەسەر ئەوەی لە دڵیدا هەیە.

ئەوانەی کە ئەم چەشنە تۆمەتە ناڕەوایانە ئاراستەی کەسێك دەکەن کە هیچ زیانێکی لە دژی ئەم نیشتمان و نەتەوەیە نەبووە، بەڵکو خزمەت و سوودی زۆری پێشکەش کردووە و، خۆی لە کاروباری ژیاندا هەڵنەقورتاندووە، تەنانەت ناچاریان کردووە لە گۆشەگیری‌یەکی تەواودا بژی و، کتێبەکانیشی لە گرنگترینی مەڵبەندەکانی ئیسلامدا بە هەموو ڕێزێکەوە پێشوازیی لێ کراوە[1]..

دەترسین ئەو کەسانەی کە ئەم تۆمەتە ناڕەوایانە ئاراستەی کەسێکی وا دەکەن، ئامرازێك بن لە خزمەتی شیوعیەت و ئاژاوەچی‌یەکاندا، بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن.

گەلێ نیشانەی زۆر هەن کە بەهۆیانەوە دەزانم دوژمنە پەنهانەکانمان هەوڵی دەستدرێژی بۆ سەر پەیامەکانی نوور و کەم کردنەوەی شان و شکۆ و گرنگی‌یان دەدەن. ئەوەتا – لە ڕووی سیاسی‌یەوە – وەهم و گومانی بوونی بیری "مەهدی‌یەت"

---

(١) لە هەشتاهەمینی ئەوسەد هەڵەیەی کە داواکاری گشتی تێی کەوتبوو، دەڵێت: "ئەو تەئویلەی لە تیشکی پێنجەمدا هاتووە، هەڵەیە". لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێم: لە "تیشکی پێنجەم"دا ئەم ڕستەیە هاتووە: (یەکێك لە تەئویلەکان – والله أعلم – ئەمەیە). واتای ئەم ڕستەیەش ئەوەیە کە: (دەگونجێ ئەمە واتای فەرموودە پیرۆزەکە بێت). کەواتە لە ڕووی مەنتیقی‌یەوە ناتوانرێت ئەم ڕستەیە بەدرۆ بخرێتەوە، مەگەر بە بەڵگە بچەسپێنرێت کە ئەو واتایە مەحاڵ و ئەستەمە.

دووهەم: وا ماوەی بیست ساڵە، تەنانەت چل ساڵیشە هیچ کەسێك بە شێوەیەکی مەنتیقی و زانستی بەربەرچی ئەو تەئویلانەی نەداوەتەوە کە لەو پەیامەدا هێناومانە، چ لەو کەسانە بن نەیاری منن یان لەوانەی کە هەوڵی موعارەزەکردنی پەیامەکانی نوور دەدەن. هیچ کەسێکیش لە زانا نەیارەکانمان نەیوتووە: "ئەم تەئویلانە جێی قسەیان تێدایە". بەڵکو هەموویان هاوکات لەگەڵ هەزاران زانای قوتابیی نووردا تەسدیقیان کردووە. لەبەر ئەوە، من لێکدانەوەی مەودای دووری لە ویژدانەوە بۆ بەرێزتان بەجێ دەهێڵم کە کەسێك ئەم تەئویلانە وەرناگرێت خۆی تەنانەت ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزیش نازانێت!

بە کورتی: واتای تەئویلی فەرموودەیەك یان ئایەتێکی پیرۆز ئەوەیە کە: ئەمە یەکێکە لە واتا زۆرەکان کە دەگونجێت و ڕێی تێ دەچێت بۆ ئەو فەرموودەیە یان ئەو ئایەتە دەست بدات. (دانەر)

بڵاو دەکەنەوە و، ئیددیعای ئەوە دەکەن کە گوایا "پەیامەکانی نوور" هۆکاری ئەم بیرەن و، بە وردی دەگەڕێن تاکو بەڵگە و پاڵپشتێك بۆ ئەو وەهمە نارەوایە بدۆزنەوە. لەوانەیە ئەو ئازارانەی کە دەهێنرێنە ڕێم لەو وەهم و گومانەوە سەرچاوەیان گرتبێت.

منیش بەو ستەمکارانەی کە لە پشتی پەردەوە خۆیان شاردووەتەوە و بەو کەسانەش کە گوێیان لێ دەگرن و دوژمنایەتیمان دەکەن، دەڵێم:

نەخێر.. نەخێر.. من هەرگیز لافی شتی وام لێ نەداوە و، سنووری خۆمم نەشکاندووە و، ڕاستییەکانی ئیمانم نەکردووە بەهۆکارێك بۆ مەبەستەکانی کەسی خۆم یان ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و پایەبەرزی. ئەم سی ساڵەی دوایی تەمەنم - بە تایبەتی - کە گەیشتووەتە حەفتا و پێنج ساڵ و.. پەیامەکانی نووریش لە گەڵیاندا، کە دەگەنە سەد و سی پەیام و.. هەزاران کەس لەوانەی کە بە ڕاستی هاوڕێیەتیان کردووم، شایەتن لەسەر ئەمە.

بەڵێ، قوتابیانی نوور ئەمە دەزانن و.. ئەو بەڵگانەش کە لە دادگادا هێنامانن‌ەوە دەریانخست کە من هەرگیز لە پێناوی پلە و پایەی کەسیی خۆم و تەنانەت بەدەستهێنانی ناوبانگ و پلەی مەعنەوی و قیامەتیشدا هەوڵ نادەم. بەڵکو بە هەموو توانایەکم بۆ بەدەستهێنانی خزمەتێکی ئیمانی بۆ ئیمانداران تێکۆشاوم. لەوانەیە نەك بۆ بەختکردنی پلە و پایە فانییەکانی دنیا، بەڵکو گەر پێویست بکات ئامادە بم پلە و پایە قیامەتی و هەمیشەییەکانی ژیانی ئەودنیاشم لەو پێناوەدا بەخت بکەم، لە کاتێکدا کە هەموو خەڵکی هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم پلانە دەدەن. هاوڕێ نزیکەکانم دەزانن کە ئەگەر پێویست بکات ڕازیم واز لە بەهەشت بهێنم و بڕۆمە ناو دۆزەخەوە تەنها بۆ ئەوەی ببم بە هۆی ڕزگار کردنی چەند هەزارێکی ئەهلی ئیمان. ئەمەشم لە دادگاکاندا باس کردووە و لە چەند ڕوویەکەوە بەڵگەشم لەسەر هێناوەتەوە..

بەڵام ئەوان بەم تۆمەتە دەیانەوێ "بێ ئیخلاسی" بدەنە پاڵ خزمەتە ئیمانی و نوورییەکانم و، مەبەستیشیان کەم کردنەوەی نرخ و بەهای "پەیامەکانی نوور"ە لە بەرچاوی خەڵکیدا و بێبەش کردنی نەتەوەیە لە ڕاستییەکانی ئەو پەیامانە.

ئایا ئەو بەدبەختانە پێیان وایە ژیانی دنیا هەمەیشەییە؟ یان لەو وەهم و گومانەدان کە خەڵکانی تریش وەك ئەوان ئیمان و ئایین بۆ بەرژەوەندییەکانی دنیا دەقۆزنەوە؟

ئەو وەهمەیان هانیان دەدات هێرش بۆسەر كەسێك بەن كە تەحەددای هەموو گومڕایانی دنیای كردووە و.. لە پێناوی خزمەتی ئیماندا ژیانی دنیای خۆی بەخشیوە و، ئامادەیە لەو پێناوەدا - گەر پێویست بكات - ژیانی ئەودنیاشی بەخت بكات و.. هەرگیز یەك دانە ڕاستیی ئیمان بە هەموو موڵكی دنیا ناگۆڕێتەوە، وەك لە دادگاكاندا بە ڕاشكاوی ئەمەی ڕوون كردەوە..

هەروەها ئەو وەهم و گومانەیان هانیان دەدات هێرش بەرنە سەر كەسێك كە بەهۆی نهێنیی ئیخلاسەوە و بەوپەڕی هێز و توانای خۆی لە دەست سیاسەت و پلە و پایە دنیاییەكانی و هەر شتێك چ لە دوور و چ لە نزیكەوە بۆنی سیاسەتی لێ بێت هەڵهاتووە و.. ماوەی بیست ساڵ ئازارێكی بێ وێنەی چەشتووە و، لەگەڵ ئەوەشدا و بە پێی ڕێبازی ئیمانیی خۆی دانەبەزیوەتە ئاستی كاری سیاسی.. پاشان ئەو كەسە - لە ڕووی نەفسەوە - خۆی زۆر لە خوار قوتابیەكانیەوە دەبینێت، بۆیە هەمیشە چاوەڕوانی دوعای لێخۆشبوون و نزای خێریان لێ دەكات. جا هەرچەندە خۆی بە لاواز و بێ بایەخ دادەنێت، بەڵام هەندێ لە برا دڵسۆزەكانی لە نامە تایبەتییەكانیاندا هەندێ چاكەكاریی پەیامەكانی نووریان داوەتە پاڵ ئەو، لەو ڕووەوە كە ڕوونكەرەوەی ئەو ڕێژنە ئیمانییە بەهێزانەیە كە لە پەیامەكانی نوورەوە بەدەستیان هێناوە و، لەمەشدا هیچ واتایەكی سیاسییان بە دڵدا نەهاتووە، بەڵكو هەر تەنها وەك دابێكی ئاسایی قسە و گوفتار. ئەوەتا هەندێ جار مرۆڤ لەگەڵ كەسێكی ئاساییدا دەدوێت و پێی دەڵێت: "تۆ هۆی ئەو نیعمەتەی خوا پێی بەخشیوم.. تۆ گەورەی منی". واتە لە ڕووی گومان باشییەوە پلەیەكی دەدەنێ كە ئەو شایانی نییە و، هەزار جار لە پلە و بەهای خۆی زیاترە. خۆ هەروەك هەموان دەزانن هەر لە دێر زەمانەوە داب و عادەتێك لە نێوان مامۆستا و قوتابیانیدا هەیە و كەس ڕەخنەی لێ نەگرتووە، كە زیادەڕەوی كردنی قوتابیانە لە مەدح و سەنای مامۆستاكەیاندا، وەك سوپاس و پێزانینێك و، پیاهەڵدان و مەدحی زیاد لە پێویستە لە ئاخری كتێبە باشەكاندا..

جا ئایا ئەمە لە هیچ ڕوویەكەوە بە تاوان دادەنرێت؟

ڕاستە، زیادەڕەوی - لە ڕوویەكیەوە - پێچەوانە و دژی ڕاستییە، بەڵام یەكێكی وەك من كە بێ كەس و تەنیایە و بە دەست غەریبییەوە دەناڵێنێت و گەلێ دوژمنی هەیە و

هۆکاری زۆریش هەن بۆ ئەوەی یاریدەدەرانی لێی دوور بکەونەوە.. ئایا ئەو بێ ویژدانانە بە لایانەوە زۆرە کە ورەی ئەو یارمەتیدەرە کەمانە لە دژی نەیارە زۆرەکان بەرز بکەمەوە و، نەهێڵم دوور بکەونەوە و، لە پەرۆشی و خوێن گەرمی‌یان دانەشکێنم کە لە زیادەڕەویی مەدح و سەنایاندا دەردەکەوێت و، ئەو مەدح و سەنایە ئاراستەی پەیامەکان بکەم و بە تەواوی دەست بە ڕوویانەوە نەنێم؟

بەم جۆرە، ڕادەی دوورکەوتنەوەی هەندێ کارمەندی ڕەسمی لە حەق و یاسا و ویژدانەوە دەردەکەوێت، کاتێ کە هەوڵی ئەوە دەدەن دەستدرێژی بکەنە سەر ئەو خزمەتە ئیمانی‌یەی کەسێك ئەنجامی دەدات کە بە ساڵا چووە و لەسەر لێواری گۆڕەکەیدایە. وەك ئەوەی پێیان وابێت ئەم خزمەتە بۆ ئامانجێکی دنیایی بەکارهێنرابێت.

دوا وتەمان بەرامبەر هەموو موسیبەتێك:

﴿إِنَّا لله وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## پاشبەند

لــە کۆتــایی بڕیــاری ئــەم لێکۆڵینەوەیــەی دوایيــدا، کــە لــە لایــەن دادگــای لێکۆڵینەوەکانەوە ئەنجام دراوە، ئەمەی خوارەوە هاتووە:

(پێش چوار مانگ ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا بڵاوکردنەوەی پەیامی "موعجیزاتی قورئـانی" - وتـەی بیسـت و پێنجـەم - قەدەغـە بکـات و، دەسـت بەسـەر هـەموو نوسخەکانی ناوبازاڕیشدا بگرێت، لەبەر ئەوەی تەفسیر و لێکدانەوەی سێ ئایەتی لـەخۆ گرتووە کـە ئـەو لێکدانەوەیـە لەگـەڵ یاسـای مـەدەنیی ئێسـتادا نـاگونجێت و بـەرەنگاری شارستانێتی دەبێتەوە".

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:

پەیامی "موعجیزاتی قورئانی" ئێستا لە ناوەندی کۆمەڵە پـەیامی (زولفـەقار)دایە، کـە نزیکی چوارسەد لاپەڕەیە و، کاتی خۆی بـۆ بەرپەرچدانـەوەی ڕەخنـەکانی شارسـتانێتیی خۆرئاوا لـەسەر قورئانی پیرۆز بڵاوم کردەوە، کە هێندە بەهێزە لە لایەن هیـچ کەسێکەوە زامـدار نـاکرێت و ڕەخنـەی ئاراستە نـاکرێت. ئـەو بەرپەرچدانەوەیـەش تەنـها لـە دوو لاپەڕەی ئەو کتێبەدایە کاتێ کـە تەفسـیری سێ ئایـەتی قورئـانی پـیرۆزی کـردووە و، ئـەو تەفسـیرەش بـە جیاجیـا لـە سێ نامیلکـەی کۆنـی خۆمـدا هەیـە. ئایـەتی یەکـەمیان ئایـەتی "حیجاب"ە و، دووهەمیان لەبارەی میراتەوەیە کە بریتی‌یە لە ئایەتی: ﴿فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء:١١) سێ‌هەمیشیان هەر لەبارەی میراتەوەیە کە بریتی‌یە لە ئایەتی: ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ (النساء:١٧٦). خۆ هەرچەندە من حیکمەتی ڕاستی‌یەکانی‌ئەم ئایەتانەم پێـش بیست ساڵ (هەندێکیشی پێش سی ساڵ) ڕاڤە کردووە، بە چەشنێ کـە فەیلەسووفەکانی بێدەنگ و دەمکوت کرد، کەچی ئەوان گومانیان وا بردووە کە ئەمڕۆ نووسرابن.

ئەوان لە بریی ئەوەی کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار" - کە چوار سـەد لاپەڕەیـە - قەدەغـە بکەن، دەیانتوانی تەنها ئەو دوولاپەڕەیە دەربهێنن و، پاشان کتێبەکەیان بدایانەیـەوە، کـە ئەمـەش مـافێکی یاسـایی خۆمانـە؛ چونکـە ئەگـەر یـەك دوو وشـەی زیانبـەخش لـە هـەر وتارێکدا بن، تەنها ئەو دوو وشـەیە قەدەغـە دەکرێـن و بـوار بـە بڵاوکردنـەوەی وتارەکە

دەدرێت. جا بەپێی ئەمە، ئێمەش داوای ئەم مافەی خۆمان لە دادگای دادگەری ئێوە دەکەین.

لەبەر ئەوەی کە ڕێ نادرێ بە هیچ کەسێك بێت بۆ لام تاکو لائیحەی ئیتیهامەکەم بۆ بخوێنێتەوە، کە چل لاپەڕەیە و یەك مانگ پێش ئێستا دەرچووە، ئەوا ئەمڕۆ بۆیان خوێندمەوە و منیش گوێم بۆ ڕاگرت. بینیم ئەو بەرگرییەی کە دوو مانگ پێش ئێستا نووسیومە و پاشماوە و پاشکۆی ئەو بەرگرییەش کە مانگێك لەمەوپێش نووسیم و ناردم بۆ بەڕێزتان و بۆ شەش لایەنی داد لە "ئەنقەرە"، بە تەواوی بەرپەرچی ئەم لائیحەیە دەدەنەوە. کەواتە پێویست بە نووسینی بەرگریی تر ناکات. بەڵام پێم خۆشە دوو سێ خاڵ یادی داواکاری گشتیی لای خۆتان بخەمەوە..

بۆیە دەڵێم:

هۆی ئەوەی کە وەڵامی ئەم لائیحەیەم نەدایەوە ئەوەیە کە نەمویست ڕێز و حورمەتی سێ دادگای دادگەر برووشێنم و خیانەتی لێ بکەم کە بڕیاری بێ تاوانیی ئێمەیان دەرکرد. چونکە ئەو دادگایانە بە شێوەیەکی ورد لە سەرجەمی ئەو بناغانەیان کۆڵییەوە کە لەم لائیحەی ئیتیهامەدا هاتوون، ئنجا دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە بڕیاری بێ تاوانییان بۆ دەرکردووین. دیارە ڕێز نەگرتن لەم بڕیارانە و پشتگوێ خستنیان وەك ئەوەی هەر نەبووبن، لە ڕاستیدا دەستدرێژییە بۆ سەر شەرەفی دامودەزگای "داد".

**خاڵی دووهەم:**

داواکاری گشتی هەوڵی دا بە گزی و فێڵزانی چەند واتایەك - کە ئێمە هەر بیرمان لێ نەکردوونەتەوە - لە دووسێ مەسەلە بداتەوە لە نێوان ئەو هەزاران مەسەلانەی کە ئێمەیان پێ تاوانبار کراوە. لە کاتێکدا کە ئەو مەسەلانە لەناو پەیامە سەرەکییەکانی نووردا باسکراون و، ڕەزامەندیی زانایانی لێکۆڵەری ئەزهەری میسر و زانایانی شام و حەلەب و زانایانی مەککە و مەدینە و بە تایبەتی زانایانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینییان بەدەست هێناوە. بۆیە من زۆر سەرم سووڕما لەوەی کە بینیم داواکاری گشتی لە لائیحەی ئیتیهامەکەدا چەند بەرپەرچدانەوە و ڕەخنەیەکی زانستی باس دەکات، وەك بڵێی خۆی زانایەکی ئایینی بێت!

گریمان من چەند هەڵەیەکم کردبێت. بەڵام خۆ ئەو هەڵانە شتێك نین کە یاسا لێپرسینەوەیان لەسەر بکات، بەڵکو هەڵەی زانستین. دەبێ ئەوەش بزانین کە تەنانەت یەك

کەسی زانا لە نێوان هەزاران زانادا ئەو هەڵانەیان نەدیوە و ڕەخنەیان لێ نەگرتووە کە داواکاری گشتی ئاماژەیان بۆ دەکات!

پاشان سێ دادگا ئێمە و پەیامەکانی نووریان بێ تاوان دەرکرد، جگە لە پازدە وشەی "بریسکەی بیست و چوارەم" لە بارەی "پۆشتەیی"یەوە. ئەوەبوو دادگای "ئەسکی شەهر" چەند سزایەکی سووکەڵەی لەسەر من و پازدە لە سەدی برایانم دەرکرد. خۆ لە پاشماوەی بەرگرییەکەمدا کە پێشکەشی ئێوەم کرد، وتم: ئەگەر دادگەری لەسەر زەویدا هەبێت ئەو بڕیارە قبووڵ ناکات کە لەبەر ئەو تەفسیرە لە دژم دەرکراوە، لە کاتێکدا کە من لە تەفسیرەکەمدا شوێن بڕیاری سێسەد و پەنجا هەزار تەفسیرنووس کەوتووم.

داواکاری گشتی بە زیرەکیی خۆی و بە بروبیانووی جۆراوجۆر هەوڵی دا چەند ڕستەیەك کە لە کتێبێکدا یان لە چەند نامەیەکدا کە هی بیست ساڵ پێش ئێستان، هەڵبژێرێت و دەستکارییان بکات و لێکدانەوەیەکیان بۆ دابنێت کە لە دژی ئێمە بێت. لە کاتێکدا کە نەك هەر تەنها سێ دادگا، بەڵکو پێنج شەش دادگا لەوانەی بڕیاری بێ تاوانییان بۆ دەرکردین بوون بە هاوبەشی ئێمە لەم تاوانە گومانکراوەدا! من ئەوە یادی داواکاری گشتی دەخەمەوە کە پێویستە خۆی لە قەرەی ڕێز و حورمەتی ئەو دادگا دادگەرانە نەدات!

**خاڵی سێهەم:**

ڕەخنەگرتن لە سەرۆکێك کە مرد و کۆتایی پێ هات و پەیوەندیی بە حکوومەتەوە نەما، لەسەر ئەوەی کە هۆکاری هەندێ لە ئەنجامە سەلبییەکانی کوودەتاکە بوو، بەلای یاساوە بە تاوان دانانرێت. ئنجا ئێمەش بە ڕاشکاوی ئەو ڕەخنەیەمان دەرنەبڕیوە، بەڵکو ئەو شتەی کە لە ڕوونکردنەوەکەی ئێمەدا بە شێوەیەکی گشتی و هەمەکی باسی لێ کراوە، داواکاری گشتی بە فێڵزانی بەسەر ئەو سەرۆکەدا شکاندیەوە و، ئەو واتایانەی کە نهێنی بوون و ئێمە ڕوونمان نەکردبوونەوە داواکاری گشتی لە پێش چاوی هەمواندا ئاشکرای کردن و پەردەی لەسەر لابردن و سەرنجی هەموو خەڵکیی بۆ لا ڕاکێشان! جا ئەگەر هەر تاوانێك لەم واتایانەدا هەبێت دەبێ داواکاری گشتی هاوبەش بێت تیایاندا، چونکە ئەو سەرنجی جەماوەری بۆ لا ڕاکێشان و هانی دان بۆ زانینیان.

**خاڵی چوارەم:**

وێڕای ئەوەی کە سێ دادگا بە جۆرێکی گومان بڕ بڕیاری بێ تاوانیی لەمەڕ دامەزراندنی "کۆمەڵە" بۆ دەرکردین، کەچی داواکاری گشتی هەوڵ دەدات قەوانە کۆنەکەی جاران لێ بداتەوە سەبارەت بەو گومان و وەهمانەی تایبەتن بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی و، خۆی ماندوو دەکات کە بڕوبیانووی نادروست و هەڵبەستراو لەم بارەیەوە بدۆزێتەوە.

خۆ هەرچەندە گەلێ کۆمەڵەی سیاسی هەن کە زیان بەم نەتەوە و نیشتمانە دەگەیەنن، کەچی بوار بە چالاکییەکانیان دەدرێت و، تۆمەتی "قۆزتنەوەی ئایین لە پێناوی هاندانی خەڵکیدا بۆ تێکدانی ئاسایش" تەنها ئاراستەی ئێمە دەکرێت. لە کاتێکدا کە هەزاران شایەت و هەزاران بەڵگە و بڕیارەکانی شەش پارێزگاش کە حەقیان بەسەرمانەوە نەبووە، دەیچەسپێنن کە ئەو هاوڕێیەتییەی لە نێوان قوتابیانی نووردا هەیە لە خزمەتی بەرژەوەندیی نەتەوە و ئایین و لە پێناوی دابین کردنی بەختەوەریی هەردوودنیایاندایە. هەروەها دەیچەسپێنن کە ئەو قوتابیانە بە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە دژی هەموو تەوژمە تێکدەر و خراپکارەکانی ناوخۆ و دەرەوە ڕاوەستاون. کەواتە ئاراستە کردنی تۆمەتی "دامەزراندنی کۆمەڵەی نهێنی و تێکدانی ئاسایش" سەبارەت بەو قوتابیانە، لە کاتێکدا کە بە درێژایی بیست ساڵ هیچ ڕووداوێکی تێکدانی ئاسایش لە دژی هیچ قوتابییەکی نوور تۆمار نەکراوە، کە ژمارەیان لە سەدان هەزار تێدەپەڕێت.. ئەم چەشنە تۆمەتە سەبارەت بەوان، نەك هەر تەنها ڕەگەزی مرۆڤ، بەڵکو ئەم گۆی زەوییەش مافی ئەوەی هەیە کە نارەزایی لە بەرامبەریەوە دەرببڕێت و بەرپەرچی ئەم تۆمەتە بداتەوە.

بە هەرحاڵ.. من درێژەدان بەم باسە بە پێویست نازانم. چونکە ئەو بەرگرییەم کە پێش ئەم لائیحەی ئیتیهامە نووسیم و، پاشماوەی بەرگرییەکەم، سەروزیادن بۆ وەڵام و بەرپەرچدانەوەی داواکاری گشتی.

بەندکراو لە بەندیخانەی "ئافیون"

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

ئەمەی خـوارەوە بۆ دادگـای "ئـافیوون" و بۆ سـەرۆکی دادگـای تاوانـە گـەورەکان ڕوون دەکەمەوە:

بە تەواوەتی پەیوەندیم بە دنیاوە بچڕیوە، چونکە هەر لـە سـەرەتاوە سروشـتم وایـە کـە ناتوانم خۆسەپاندنی کەس قبووڵ بکەم. ئێستاش ژیانم هێندە لـە بـەرچاودا قـورس و دژوار بووە کە ناتوانم لەم جۆرە ژیانەدا گوزەران بکەم کە پڕە لە خۆسەپاندنی نابەجێ. چونکـە خۆسـەپاندن و ئـارەزووی خـۆ زاڵ کردنـی سـەدان کەسـی ڕەسمیـی دەرەوەی بەندیخانـەم لەتواناادا نییە. بە تەواوی لەم چەشنە ژیانە بێزار بووم و، بە هـەموو هـێزێکم داواتـان لـێ دەکـەم کـە سـزام بـدەن! خـۆ مـادەم مـن نـاتوانم مـردن بەدەسـت بـهێنم، ئـەوا مانـەوەم لـە بەندیخانەدا کارێکی پێویستە.

ئێوە باش دەزانن کە ئەو تۆمەتە بێ بناغـە و ناڕەوایانەی داواکـاری گشـتی ئاراستەی کردووم، وجوودیان نییە و هەر لە ئارادا نین، کەواتە بۆ ئەوە دەست نادەن سزام لەسـەر دەربکرێـت. بـەڵام تەنـها تەقسیر و ناتەواوییـەکانم سـەبارەت بـە ئەرکـە ڕاسـتەقینەکەی سەرشانم دەبێـت بـەهۆی سـزادانی مەعنـەویم. خـۆ ئەگـەر ئـەوەتان بـە گونجـاو زانـی کـە پرسیارم ئاراستە بکەن، من ئامادەم وەڵامی پرسیارەکانتان بدەمەوە.

بەڵێ، تەنیا گونـاهی مـن، کـە لـە نوقسـانی و ناتەواوییـە گەورەکانمـەوە سـەرچاوەی گرتووە و لە ڕووی حەقیقەتەوە لێبوردن نایگرێتەوە، ئەوەیـە لەبـەر ئاوڕنەدانـەوەم لـە دنیـا ئـەو کارمـەندی و ئەرکـە گرنگـەم جێبەجێ نـەکرد کـە لـە پێنـاوی نیشـتمان و نەتـەوە و ئاییندا خرابووە ئەستۆم. ئەم نەتوانینەشم لە ڕاستیدا نایێتە بەهانە بە دەستمەوە. ئێستا لـەم بەندیخانەی "ئافیوون"ەدا گەیشتوومەتە ئەم قەناعەتە.

ئەو کەسانەی قوتابیانی نـوور تۆمـەتبار دەکـەن، کـە پـەیوەندیی بێگـەرد و قیامـەتییان تەنـها لەگـەڵ پەیامـەکانی نـوور و دانـەری ئـەو پەیامانەدایـە و، دەیانـەوێ بەرپرسـیاریی دامـەزراندنی کۆمەڵەیـەکی سیاسـییان بخەنـە ئەسـتۆ، ئەوانـــە تـــابلێی لـــە ڕاســتی و دادگەرییەوە دوورن. ئەمەش بڕیارەکانی سێ دادگـا لـەبارەی بێ تاوانییانـەوە لـە سێ ڕووەوە دەیچەسپێنێت. جگە لەمەش، دەڵێین:

ناوەرۆك و بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی، نەخوازەڵا هـی نەتـەوەی ئیسـلام، بریتی‌یـە لـە: بوونی خۆشەویستیی بێگەرد لـە نێـوان خزمـان و، پـەیوەندیی توندوتـۆڵ لـە نێـوان تـیرە و هۆزەکـان و، برایـەتیی مەعنـەوی و هـەرەوەزی بەرامبـەر برایـانی ئیمـاندار لـە نـاوەندی نەتـەوەی ئیسـلامدا و، پـەیوەندیی فیداکارانە بەرامبـەر نەتـەوە و هاوڕەگـەزی خـۆی و، پابەند بوونی بەهێز و پەیوەندیی تۆکمە و قایم و نەبزواو لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی ئیماندا کـە ژیانی هەمیشـەیی مرۆڤ ڕزگار دەکەن و لـەگـەڵ بلاوکەرەوانی ئەو ڕاستی‌یانەدا..

ئەمانە و پەیوەندی‌یەکانی تر کە بناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن و، ئینکـاری کردنیان ئاکامەکەی ڕازی بوون دەبێت بەو مەترسی‌یە سوورەی کـە لـە بـاکوورەوە لـە مەڵاسـدایە بۆمـان و تـۆوی ئـاژاوە و بـەربادی دەچێنێــت و هـەوڵی نەهێشـتنی نەتـەوە و ڕۆڵەکانی نەوەی داهاتوو دەدات و مناڵان کۆ دەکاتەوە و دەیانخاتە ژێر ڕکێفی خـۆی و، دەیەوێ هەستی خزمایەتی و نەتەوایەتی نـەهێڵێت و بـە تـەواوی شارسـتانێتیی ئـادەمیزاد و ژیانی کۆمەڵایەتی لەبەریەك هەڵبووەشێنێت و تێکی بدات..

دەڵێـم: تەنها بە ئینکاری کردنی ئەو پەیوەندی‌یـە ناوبراوانـە و، بـە قبـووڵ کردنـی ئـەو مەترسی‌یانە دەتوانرێت ناوی (کۆمەڵە) لە قوتابیانی نوور بنرێت!

لەبەر ئەوە، قوتابیانی ڕاستەقینەی نوور پەیوەندیی خاوێنیان بە ڕاستی‌یەکانی قورئان و پەیوەندیی توندوتۆڵ و نەبزواویان لەگەڵ برایانی ئاخیرەتی خۆیاندا ئاشکرا دەکـەن. جـا لەبەر ئەوەی بە سنگێکی فراوانەوە ڕازین بە هەر سـزایەك لەبـەر ئـەم برایەتی‌یـە لەسـەریان دەربکرێت، ئەوا دان بەم ڕاستی‌یەدا دەنێن، وەك ئەوەی لە حـوزووری بـەڕێزتاندا دانیـان پێـدا نـا و، دانابەزنـە ئاسـتی داکۆکـی لـەخۆ کـردن بـە درۆ و دووڕوویــی و فێــڵ و ساختەکاری.

بەندکراو:

**سەعیدی نوورسی**

# پاشکۆی پاشماوەی ئەو ئیعتیرازەی کە پێشکەشی داواکاری گشتیی دادگای "ئافیوون" کرا

**یەکەم:**

بۆ دادگای ڕوون دەکەمەوە کە:

ئەم داوا(دەعوا) نوێیەش لەسەر بناغەی چەند داوایەکی کۆنی دادگاکانی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" و ڕاپۆرتێك کە چەند خەبیرێکی ڕواڵەت بین دوای لێکۆڵینەوەی سەرپێیی پێشکەشیان کردبوو، بنیات نراوە. لە دادگاکەی ئێوەدا وتم: ئەگەر سەد دانە هەڵەم لەم داوا نوێیەدا نەچەسپاند ئەوا ڕازیم سزای سەد ساڵ بەندیم لەسەر دەربکرێت. وا ئێستا من ئامادەیی خۆم دەردەبڕم کە ئەو هەڵانە بچەسپێنم. گەر حەز دەکەن ئەم خشتەیەتان پێشکەش دەکەم کە زیاد لە سەد هەڵەی دەست نیشان کردووە.

**دووهەم:**

کاتێ لە دادگای "دەنیزلی"یەوە دۆسیە و نووسراوەکانی ئێمە ڕەوانەی "ئەنقەرە" کران و، لە نیگەرانی و چاوەڕانیی بڕیارێکدا بووین لە دژمان دەربکرێت، ئەو بڕگەیەم بۆ برایانم نووسی کە لە کۆتایی هەندێ لە بەرگرییەکانمدا هەیە و، بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئەگەر کارمەندانی "داد" کە بە نیازی ڕەخنە و هەڵسەنگاندن پەیامەکانی نوور دەخوێننەوە، توانییان ئیمانی خۆیان بەهێز بکەن و بیپارێزن، پاشان بڕیاری ئیعدامیان لەسەر دەرکردم، ئەوا ئێوە شایەت بن کە من دەست لە هەموو مافێکی خۆم بەرامبەر بەوان هەڵدەگرم. چونکە ئێمە خزمەتگوزاری ئیمانین و، ئەرکی سەرەکیی سەرشانی پەیامەکانی نووریش بریتییە لە بەهێزکردن و ڕزگارکردنی ئیمانی خەڵکی. کەواتە ئێمە خۆمان بە ناچار دەزانین کە خزمەتە ئیمانییەکان پێشکەش بکەین، بە بێ جیاوازی لە نێوان دۆست و دوژمن، یان لایەنگرتنی هیچ لایەنێکی دیاری کراو.

بەم جۆرە.. ئەی ئەندامە بەڕێزەکانی دادگا! بە پشت بەستن بەم ڕاستییە و لە ژێر تیشکی ڕووناکییەکەیدا: پەیامەکانی نوور بەهۆی ڕاستییە خاوێن و بەڵگە

درەخشانەکانیانەوە توانییان دڵی زۆر کەس لە ئەندامانی دادگا بەلای خۆیاندا و هاوسۆزییان لەگەڵیاندا رابکێشن. ئیتر بە لامەوە گرنگ نییە کە چیتان دەوێ بیکەن بەرامبەرم و چ بریارێك لەبارەمەوە دەربکەن. کەواتە چی دەکەن بیکەن. من لێتان خۆش دەبم.. هەرگیز بەگژتاندا نایەم و لێتان تووڕە نابم. هەر ئەمەش تاکە هۆکاری ئەوەیە کە هەموو جۆرەکانی ئازار و ستەم و، دووبارە کردنەوەی چەندین جارەی سووکایەتیم قبووڵ کردووە کە دەمارەکانیان دەورووژاندم لەوانەی کە پێشتر لە هەموو ژیانمدا شتی وام نەهاتووەتە رێ. تەنانەت دوعای شەڕم لە هیچ کەسێك نەکردووە.

هەروەها کۆمەڵە پەیامەکانی نوور کە لە بەردەستتاندایە، داکۆکی و بەرگریی رەخنە هەڵنەگری منە و، باشترین بەڵگەیە لەسەر پووچەڵیی ئەو داوایانەی لە دژمان وروروژێنراون.

ئەوەی کە مایەی سەرسووڕمان و جێی سەرسامییە ئەوەیە کە لەو کاتەدا چەندین زانای گەورەی میسر و شام و حەلەب و مەدینەی منەووەرە ومەککەی پیرۆز و چەند زانایەکی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی لە چەند کۆمەڵەیەکی پەیامەکانی نووریان بە وردی کۆڵیوەتەوە و هیچ رەخنەیەکیان ئاراستە نەکردووە، بەڵکو رێز و ستایشی شایستەیان بەرامبەری دەربڕیوە.. هەروەها لەو کاتەدا کە ئەو پەیامانە، سەرباری بارودۆخی دژواری دەوروبەر، سەد هەزار کەسی ئەهلی حەقیقەتیان وا لێ کردووە تەسدیقیان بکەن..

لەو کاتەدا کە پەیامەکان بەم جۆرە رێز دەگیرێن و ستایش دەکرێن، کەچی ئەو زیرەکە(!)ی کە چەند داوایەکی لاوازی لە دژمان کۆ کردووەتەوە هەڵەیەکی هێندە ئابڕووبەری لە زار دەردەچێت کە ساکاریی خۆی و سەرزارەکیی تێڕوانینەکانی بۆ شتان دەردەخات، ئەوەتا وتی: قورئانی پیرۆز سەد و چل سوورەتە!

جا ئەو شتەی کە مایەی سەرسووڕمان و جێی سەرسامییە ئەوەیە کە ئەم کەسە دێت پەیامەکانی نوور هەڵدەسەنگێنێت و دەڵێت: "پەیامەکانی نوور هەرچەندە هەوڵی تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆز و تەئویلی فەرموودە پیرۆزەکان دەدەن، بەڵام لە رووی پێشکەش کردنی زانیارییەوە بە خوێنەرانیان هیچ نرخ و بەهایەکی زانستیی بەرزیان لەخۆ نەگرتووە".

جا ئایا لەم ڕەخنەیەوە دەرناکەوێت کە هەتا بڵێیت لە یاسا و ڕاستی و حەق و دادگەریەوە دوورە!

هەروەها سکاڵای ئەوەشتان لەلا دەکەم کە:

ئێوە دوو سەعاتی تەواو قسەکانی داواکاری گشتیتان بەگوێدا دایـن کـە دڵی هەموومانی زامدار کرد، لەبەر هەڵەکانی کە لە سەد دانە تێدەپەڕن و لە چل لاپەڕەدا تۆمارمان کردوون. بەڵام من هەرچەند جەختم لێ کردن کەچی بواری دوو خولەك کاتتان پێ نەدام کە بە لاپەڕە و نیوێك وەڵامی بدەمەوە. بۆیە بە ناوی دادگەریەوە داواتان لێ دەکەم کە بە تەواوی ئیعتیرازەکەم بخوێننەوە.

**سێهەم:**

هەموو حکوومەتێك کەسانی نەیاری هەیە.. یاسایش بوار نادات دەستدرێژی بکرێتە سەریان، مادەم کاریان بەسەر تێکدانی ڕێسا و سیستەمی وڵاتەوە نەبێت.

جا ئایا دەگونجێ من و کەسانی هاوشێوەی من لەوانەی کە پشتمان لە دنیا هەڵکردووە و بەرەو گۆڕەکانمان هەنگاو دەنێین، واز لە هەوڵ و تێکۆشانمان بهێنین بۆ ژیانی نەبڕاوەی هەتاهەتایی بەپێی ئەو ڕێبازەی کە باپیرە بەرێزەکانمان لە درێژایی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵ پیایدا ڕۆشتوون و، بە ڕێنمایی قورئانە مەزنەکەمان و، لە ڕۆشنایی ئەو دەستوورانەی کە لە هەموو چەرخێکدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن ئیماندار تەقدیسی دەکەن.. ئایا دەگونجێت کە ئێمە واز لەمە بهێنین و، بە ژیانێکی کورت و فانیی دنیاوە سەرقاڵ ببین و، بۆ چەند یاسا و دەستوورێکی نارەوشتیی شارستانێتیی هەرزە، تەنانەت چەند یاسایەکی وەحشیگەری و ستەمکارانەی وەك هی "بەلشەفیەکان" ملکەچ بکەین و لە ژێر گوشار و فڕوفێڵی دوژمنانماندا لایەنی یاسای لەم جۆرە بگرین؟ خۆ لە سەرانسەری دنیادا هیچ یاسایەك و هیچ مرۆڤێك نی‌یە کە هێندەی گەردیلەیەك ویژدانی هەبێت خەڵکانی تر ناچار بکەن واز لەوە بهێنن بۆ ئەمە.

بەڵام بەو نەیارانە دەڵێین:

ئێمە کارمان بەسەرتانەوە نەبووە، دەسا ئێوەش کارتان بەسەرمانەوە نەبێت.

بەم جۆرە و لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یە: هەرگیز ئێمە لەگەڵ سەرکردەیەکدا نین کە بەپێی ئارەزووی خۆی فەرمانەکانی بە ناوی یاساوە دەرکرد بۆ گۆڕینی مزگەوتی "ئەیاسۆفیا" بە بتخانە و گۆڕینی بارەگای مەشیەخەتی ئیسلامی بۆ دواناوەندی‌یەکی

کچان.. ئێمە نە بە هزر و بیر و نە لە ڕووی بابەت و نە لە ڕووی هاندەر و نە لە ڕووی ئاکامەکانەوە لەگەڵ ئەودا نین و، خۆشمان بە ناچار نازانین کە شتی وا قبووڵ بکەین.

لە ڕاستیدا وێڕای بەسەربردنی ژیانی دیلی و ئاوارەیی لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا، کە چەندین جۆری ئازار و دژوارترین شێوازی ستەم و خۆسەپاندنم هاتووەتە ڕێ و، وێڕای ئەوەی کە سەدان هەزار برای نووری و بەوەفام هەیە، کەچی خۆمان لەکاروباری سیاسیدا هەڵنەقورتاندووە و تەنانەت یەك دانە ڕووداویش تۆمار نەکراوە کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کارمان بەسەر ئاسایشەوە بوو بێت یان ڕێسامان تێکدابێت.

ئەو سووکایەتی پێکردنە یەك لە دوای یەك و مامەڵە سەرتاپا ستەمەی کە ڕووبەڕووم دەکرێتەوە و لەم دوارۆژانەی ژیانمدا دێنەڕێم و، ژیانی نامۆیی و ئاوارەیی کە بەسەری دەبەم و و پێشتر هاوشێوەیم نەبینیوە، وایان لێ کردووم لە ژیان بێزار بم..

من لە "ئازادیی دەست بەستراو" بێزار بووم، کە ئازادی‌یەکە خۆسەپاندن و ستەم سنووری بۆ دادەنێت! بۆیە داواکاری‌یەکم خستووەتە بەردەستتان نەك بۆ ئەوەی – وەك شتێکی ئاسایی‌یە لەم جۆرە حاڵەتانەدا – ئازادم بکەن، بەڵکو بۆ ئەوەی قورسترین و سەخت ترین سزام لەسەر دەربکەن.. بەڵێ، قورسترین و سەخت ترین سزا، نەك سووکەڵەترین و ئاسانترین! چونکە هیچ ڕێگایەك بۆ ڕزگاربوون لەم چەشنە مامەڵە ناحەزە سەیروسەمەرەیە لە بەردەم مرۆڤدا نی‌یە جگە لەم دوو ڕێگایە: بەندیخانە یان گۆڕ. خۆ ڕێگای گۆڕم لە بەردەمدا داخراوە و ناتوانم بە دەستی بهێنم، چونکە لە ڕووی شەرعەوە خۆکوژی حەرامە و، ئەجەلیش پەنهانە و مرۆڤ نازانێت کەی کۆتایی بە تەمەنی دێت چ جای ئەوەی دەستی پێی بگات. بۆیە بە مانەوەم لەم بەندیخانەیەدا ڕازی بووم کە شەش مانگە بە تەنیایی تیایدا بەند کراوم[1]. بەڵام ئەم سکاڵایەم لە کاتی ئێستادا ڕاگرت لەبەر داوا و ئارەزووی برا بێ تاوانەکانم.

**چوارەم:**

من لە ماوەی ئەم سی ساڵەی دوایی ژیانمدا کە ناوی "سەعیدی نوێ"م لێ ناوە، هەتا توانیومە تێکۆشاوم دەروونی بەدخوازم لەغاو بکەم و، لە چاوگێڕانی بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و شانازی بەخۆوە کردن و لەخۆڕازی بوون بیپارێزم، تەنانەت سەد جار زیاتر

(١) دوای بەسەرچوونی حەڤدە مانگ هەمان حاڵ هەر بەردەوامە. (دانەر)

هەستی قوتابیانی نوورم زامدار کردووە لەوانەی کە لەرادەبەدەر گومانی باشیان پێم هەیە..

ئەو شتانەی کە لە پەیامەکانی نووردا نووسیومن و ئەو ڕاستییانەش کە لەو پەیامانەدان و پەیوەندییان بە خۆمەوە هەیە و.. ئەو خاوەن ویژدانانەش کە بە لێبڕانەوە هامشۆم دەکەن و.. هەموو برادەران بە گشتی، شایەتی لەسەر ئەمە دەدەن. چونکە من خاوەنی کالاّ و تفاقی "نوور" نیم، بەڵکو تەنها دەلاّلێکی لاواز و سادەی دووکان و پیشانگای گەوهەری قورئانی پیرۆزم.

هەروەها برا نزیکەکانم، بەو نیشانە زۆرانەی کە دیویانە، لەوەدا تەسدیقم دەکەن کە بڕیارم داوە نەك تەنها قوربانی بە پلە و پایە درۆینە و قەڵبەکانی دنیا بدەم و هەموویان بەخت بکەم، بەڵکو ئەگەر - وا دابنێین - چەندین پلەی مەزنی مەعنەوییشم بدرێتێ، ئەوا هەر هەموویان بۆ خزمەتگوزاریم لە ڕێی ئیمان و قورئاندا بەخت دەکەم، نەبادا بەشی نەفسی خۆم ئاوێتەی ئیخلاسم ببێت لەو خزمەتگوزارییەدا. لە ڕاستیدا ئەمەشم ئەنجام داوە.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دادگای بەڕێزتان هەست و سۆزی ڕێزی هەندێ لە برایانم کە لە ئاستی مندا دەریان بڕیوە لە بەرامبەر سوودوەرگرتنیان لە پەیامەکانی نوور، وەك سوپاسێکی مەعنەوی و زیاد لە ڕێزی کوڕ بۆ باوکی خۆی، کە من دەستم بە ڕوویەوە ناوە و قبوولم نەکردووە، دادگای بەڕێزتان ئەو ڕێزەی ئەوانی کردووە بە مایەی لێپرسینەوەمان، وەك بڵێی بابەتێکی سیاسی بێت و، هەندێك لەو برایانەتان هان داوە کە نکوولی لەو ڕێزلێنانە بکەن!

بەسەر سامییەوە دەپرسم کە: ئایا چ تاوان و گوناهێك لە مەدح و سەنایەکدا هەیە کە لەسەر زمانی کەسێکی تردا هاتووە و، ئەم هەژارەش پێی ڕازی نەبووە و خۆی بە شایانی نازانێت؟

**پێنجەم:**

من بە ڕاشکاویی تەواوەتی بە ئێوەی ڕادەگەیەنم کە هەوڵی چەسپاندنی تۆمەتی "پەیوەندی کردن بە دەستە و کۆمەڵەکان و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری ناوخۆدا" بە قوتابیانی نوورەوە کە بە هیچ جۆرێك پەیوەندییان بە حیزبایەتی و دەستە و تەوژمە

سیاسی‌یە جۆراوجۆرەکانەوە نی‌یە، تەنها پیلانی ئەو ڕێکخراوە نهێنی‌یەی پشتی پەردەیە کە چل ساڵە هەوڵی ڕووخاندنی ئیسلام و سڕینەوەی ئیمان دەدات، مەبەستیشی خزمەتی جۆرە بەلشەفی‌یەکە و، هەر ئەو ڕێکخراوەشە پەرە بە گیانی توندڕەوی و ئاژاوە نانەوە دەدات لەم وڵاتەدا، چ بە خۆی بزانێت یان نەزانێت و، دژە هەڵوێستی لێ گرتووین.

بەڵام خۆ سێ دادگای جیاجیا قسەیان لەسەر بێ تاوانیی پەیامەکانی نوور و قوتابیانی یەکی گرت، تەنها یەك دادگا نەبێت، کە دادگای "ئەسکی شەهر"ە و، بڕیاری ساڵێك لەسەر من و شەش مانگی لەسەر پازدە کەس لە برایانم لە کۆی سەد و بیست کەسدا دەرکرد. لەوانەیە ئەو شتەی وای لە دادگای "ئەسکی شەهر" کردبێت کە ئەو بڕیارە دەربکات، بوونی بڕگەیەکە لە مێژە نووسیومە و لە ناوەندی پەیامێکی بچووکدایە و پەیوەندیی بە کێشەی "پۆشتەیی"یەوە هەیە. دەقی ئەو بڕگەیەش ئەمەیە:

(بیستمان کە: ژنی پیاوێکی پلەوپایە بەرزی دنیایی، شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی جەستەی بە دەرەوە بووە و، بۆیاخچی‌یەکی پێڵاویش بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕۆشنا و لە ناوجەرگەی ئەنقەرەی پایتەختدا پەلاماری داوە! جا ئایا ئەم ڕووداوە "نارەوایە" زلـلەیەکی توندوتیژ نی‌یە لەسەر ڕووی دوژمنانی داوێن پاکی و پۆشتەیی، لەوانەی کە هیچ ئاگایەکیان لە واتا و ناوەرۆکی شەرم و حەیا نی‌یە؟!).

کەواتە هەڵبەستنی بڕوبیانووی لاواز و تۆمەتی نارەوا ئێستا لە دژی قوتابیانی پەیامەکانی نوور، وەك ئەوە وایە بڕیار لە دژی ئەو سێ دادگایە بدرێت و، تۆمەتیان ئاراستە بکرێت و بە نەنگی و خیانەت لەکەدار بکرێن.

**شەشەم:**

زۆرانگرتن لەگەڵ پەیامەکانی نووردا لە توانای کەسدا نی‌یە؛ چونکە وتەی ئەو زانایانەی ئیسلام کە پەیامەکانی نووریان دیوە لەسەر ئەوە یەکی گرتووە کە: ئەم پەیامانە تەفسیرێکی ڕاستی قورئانی پیرۆزن. واتە چەندەها بەڵگەی بەهێز و توندوتۆڵیان لەخۆ گرتووە بۆ ڕاستی‌یە درەخشانەکانی و، موعجیزەیەکی مەعنەوی‌یە لە موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز لەم چەرخەدا و، بەربەستێکی پۆڵایینە لە بەردەم ئەو مەترسی‌یانەی لە مەڵاسدان بۆ ئەم وڵات و نەتەوەیە لە باکوورەوە.

کەواتە لە ڕووی مافە گشتی‌یەکانەوە "پێویستی" داخوازی ئەوەیە کە دادگای بەڕێزتان هانی خەڵکی بدات بۆ پێشوازی کردن لەم پەیامانە، نەك ئەوەی قوتابیانی

بترسێنرێن و لە پەیامەکان دوور بخرێنەوە. ئەوەی ئێمە لێی دەزانین ئەمەیە و، هەر تەنها چاوەڕوانی ئەمەشتان لێ دەکەین.

ئاشکرایە کە گوێ نەدان بە کتێبی مولحیدان و هەندێ لە سیاسەتمەدارە بێ بڕواکان و، گۆڤار و ڕۆژنامەکانیان، لە ژێر پەردەی ئازادیی زانستیدا، کە زیانی لە ڕادەبەدەریان بۆ نەتەوە و وڵات و ئاسایشی گشتی ڕوون و ئاشکرایە، ئەم دیاردەیە بۆ ئەم پرسیارە هانمان دەدات کە: ئایا چ ڕوویەکی قەدەغەکراو لەوەدا هەیە لاوێکی بێ تاوان کە پێویستی بە یارمەتی هەیە بڕواتە ڕیزی قوتابیانی نوورەوە، بە نیازی ئەوەی ئیمانەکەی ڕزگار بکات و لە مەترسیی بەربوونەوەی بەرەو کەندەڵانی ڕەوشتە چەپەڵەکان دەرباز ببێت؟

ئایا کارێکی پێویست و ئەوپەڕی دانایی و دادگەری نییە کە وەزارەتی پەروەردە ئەم کارە لە ئامێز بگرێت و پشتیوانیی لێ بکات و ڕێزی شایانی بۆ دابنێت، لە بریی ئەوەی هەوڵی نەهێشتنی ئەم کارە و ڕاوەدوونانی ئێمە بدات، بە بێ هیچ هۆیەکی پێویست؟

دوا وتەم:

لە خوای گەورە داواکارین کە یارمەتیی دادوەرەکان بدات بۆ پیادە کردنی حەق و جێبەجێ کردنی دادگەری.. ئامین.

حسبنا الله ونعم الوكيل.. نعم المولى ونعم النصير.

الحمد لله رب العالمين.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## دوا وتەم

حەز دەکەم ئەمەی خوارەوە بۆ دەستەی دادگا ڕوون بکەمەوە:

لە ڕێی لائیحەی ئیتتیهامەکە و دانانمەوە بۆ چەندین جاری درێژخایەن لە زیندانی تاکە کەسیدا، هەستم کرد کە لەم کێشەیەدا خودی خۆمیان مەبەستە. چونکە تێبینیی ئەوەیان کردووە کە بەرژەوەندییەك لە شکاندنی شان و شکۆی من و زامدارکردنی کەسایەتیم بەدەست دەهێنن و، گومانی ئەوە کراوە کە من کەسێکی زیانبەخش بم بە کارگێڕیی وڵات و ئاسایش و نیشتمان و ، لە ژێر پەردەی ئایین و لە پێناوی جۆرە سیاسەتێکدا هەوڵی بەدەستهێنانی چەند ئامانجێکی دنیایی بدەم.

لە بەرپەرچی ئەمەدا بەوپەڕی بێ گومانی بۆتان ڕوون دەکەمەوە کە:

لە پێناوی ئەم وەهم و گومانانە و لەبەر هەوڵی شەڕ فرۆشتن بە کەسی من، دەستی ئازاردان بۆ پەیامەکانی نوور و قوتابییە بەڕێزەکانیان درێژ نەکەن، چونکە هەر ئەوان ڕۆڵەی فیداکارن لە پێناوی ئەم نیشتمان و نەتەوەیەدا. دەنا زیانێکی گەورە بەم نەتەوە و نیشتمانە دەگات و لەوانەیە ببێت بەهۆی مەترسی لەسەر نەتەوە و نیشتمان.

دەمەوێ بە دڵنیاییەوە جەخت لەسەر ئەوەش بکەمەوە کە:

لە ڕووناکیی ئەم ڕێبازەی ئێستامدا بڕیارم داوە هەر ئازار و سووکایەتی و ئەشکەنجە و سزایەك قبووڵ بکەم کە ئاراستەی کەسی من بکرێت، بە مەرجێك کە بەهۆی منەوە زیان بە پەیامەکان و قوتابیانی نوور نەگات. چونکە ئەمە پاداشتی دوارۆژی بۆ من تێدایە و هۆیەکیشە بۆ ڕزگاربوونم لە شەڕ و خراپەکانی دەروونی بەدخوازم. بۆیە لە لایەکەوە دەگریم و لە لایەکی تریشەوە دڵخۆشم.

خۆ ئەگەر ئەو بێ تاوانە هەژارانە لەسەر ئەم مەسەلەیە لەگەڵ مندا نەخرانایەتە بەندیخانەوە، ئەوا شێوەی ئاخاوتنم لە بەرگرییەکەمدا زۆر توندوتیژ دەبوو. ئێوەش بۆ خۆتان بینیتان کە ئەو کەسەی لائیحەی ئیتتیهامەکەی نووسیوە چۆن هەوڵی پەیدا کردنی بڕوبیانووی لاواز و بەهانەی نارەوای داوە و، هەرچی کتێبم داناوە و ئەو نامە نهێنی و تایبەتییانەش کە لە درێژایی بیست تاکو سیساڵی ژیانمدا نووسیومن پێشکەشی

دادگای کردوون وەك ئەوەی هەر هەموویانم ئەمساڵ نووسیبێت! ئنجا واتای هەڵەی لە هەندێکیان داوەتەوە، وەك بڵێی تا ئێستا نەبینرابن و نەڕۆشتبنە هیچ دادگایەك و هیچ یاسایەکی لێبوردن نەیگرتبنەوە و بەسەرچوونی کاتیش کۆنی نەکردبن. هەموو ئەمانە لە پێناوی ئەوەی زەفەرم پێ ببەن و لە بەها و شان و نرخم دابگرن..

خۆ هەرچەندە زیاتر لە سەد جار وتوومە: من دان بە کەمی و بچووکیی نرخ و بەهای خۆمدا دەنێم و، وێڕای ئەوەش کە نەیارەکانم هەموو ڕێگا و هۆکارێك بەکاردەهێنن کە مستەکۆڵم تێ بسرەوێنن و سووکایەتیم پێ بکەن، بەڵام خۆشەویستیی خەڵکی بەرامبەرم، کە لە ڕادەیەکدایە سیاسەتمەدارانی نیگەران کردووە، هی ئەوەیە کە لەم زەمان و ڕۆژگارەدا "بەهێزکردنی ئیمان" پێویستییەکی گرنگ و تەواوەتیی بە کەسانێك هەیە کە - لە بابەتی ئاییندا - "ڕاستی" نەکەنە قوربانی لە پێناوی هیچ شتێکدا و، کەسیان ئایین نەکات بە هۆکار و ئامراز بۆ هیچ ئامانج و مەبەستێك و، هیچ بەشێك لەو خزمەتەدا بۆ خۆی دانەنێت، تاکو بتوانرێت سوود لە ڕێنماییەکانی وەربگیرێت لە وانەکانی ئیماندا و قەناعەتی تەواوەتی بۆ بەرامبەرەکەی بێتەدی.

بەڵێ، لە هیچ بارودۆخێکدا بە وێنەی ئەم چەرخەی ئێمە پێویستیی زۆر نەهاتووەتە ئاراوە بۆ خزمەتی ڕاستییەکانی ئیمان. چونکە مەترسییەکان بە توندوتیژی و دڕندەییەکی لە ڕادەبەدەر لەدەرەوە ئاراستەمان کراوە. خۆ هەرچەندە من دان بەوەدا دەنێم و ڕایدەگەیەنم کە نەهێشتنی ئەم پێویستییە و پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە تەنیا بە کەسی دەستەوسانی من نایەتەدی، کەچی هەندێ کەس لەو گومانەدان کە هەندێ لەو ئەرکە لەسەر دەستی من دێتەدی، نەك لەبەر تایبەتکارییەك کە لە مندا هەبێت، بەڵکو لەبەر پێویستیی زۆر و لەڕادەبەدەر بۆ کەسێك کە ئەم ئەرکە ڕاپەڕێنێت و، سەرهەڵنەدانی ئاشکرای کەسێك کە ئەو بەرپرسییە مەزنەی گرتبێتە ئەستۆ.

لە مێژە بە سەرسوورمان و سەرسامییەوە بیرم لەم مەسەلەیە کردووەتەوە. چونکە وێڕای هەڵە و نەنگییە سەرسووڕهێنەکانی کەسیی خۆم وناشایستەییم لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ئەنجامدانی ئەم چەشنە کارە مەزنە، ئێستا لە حیکمەتی ئاوڕدانەوەی عامەی خەڵکی لە من و دەربڕینی هەستی جۆرە ڕێزنانێك بەرامبەرم تێدەگەم. ئەو حیکمەتەش ئەمەیە:

ئـەو ڕاسـتی‌یانەی کـە پەیامـەکانی نـوور لـەخۆیان گرتـوون و ئــەو کەســایەتی‌یە مەعنەوی‌یـەش کـە قـەوارەی قوتابیـانی ئـەم پەیامانــە دەینوێنێــت، ڕووی ئـەو پێویســتی‌یە ناوبراوەیان ئاراستەی خۆیان کردووە، نەخوازەلاّ لە  بارودۆخێکی وەك ئـەم بـارودۆخ و دەوروبـەرەی ئێستاماندا. خۆ لەگەڵ ئەوەشدا کـە بەشی مـن لـەم خزمەتـەدا لەوانەیـە تەنانەت یەك لە هــەزاریش نـەبێت، بـەڵام هـەندێ کـەس باوەڕیـان وایـە کـە ئـەو ڕاستی‌یە دەراسایە لە مندا بەرجەستە بووبێت و نوێنەری ئـەو کەسێتی‌یە ئـەمین و دڵسـۆزە بم. بۆیـە ئەو جۆرە ئاوڕلێدانەوەیەم بۆ دەردەبڕن.

لە ڕاستیدا ئەم جـۆرە ئاوڕلێدانەوەیـە چـەندە زیـانی بـۆ مـن تێدایـە بـە هـەمان ئـەندازە لەسەر دەروونیشم قورس و گرانە، بـە ڕادەیەکی‌ئـەوتۆ کـە بـە ناحـەقی و لـەبەر پاراستنی ڕاستی‌یە نوورانی‌یەکان و کەسێتی‌یە مەعنەوی‌یەکەی، بێ دەنگیـم لـە ئاستی ئـەو زیانـە مەعنەوی‌یانەدا هەڵبژارد.

لــەوانەیە هــۆی ئـەو چەشـنە ئـاوڕلێدانەوەیەی خـەڵکـی، ئاماژەیـەکـی ئـایندەیی ئیمــامی عـەلی – خـوای لـێ ڕازی بێـت – و شـێخی گـەیلانی – قُدِّسَ سِـرُّه – و هـەندێ ئەولیای تـر بێـت کـە بـە ئیلـهامێکی خوایی ئاماژەیـان بـۆ ڕاسـتیی پەیامـەکانی نـوور و کەسێتیی مەعنەویی قوتابیانی ئەو پەیامانە کردووە. ئەوەش لەبـەر ئـەوەی کـە پەیامـەکانی نـوور ئاوێنەیـەکی پیشـاندەری موعجیزەی مەعنـەویی قورئـانی پـیرۆزن لــەم چەرخــەی ئێستادا.

دوور نی‌یە ئـەو هـەندە خەڵکـە کەسـی لاوازی منیـان لەمـەدا ڕەچـاو کردبێـت، تەنـها لەبەر ئەوەی کە خزمەتگوزاری ئەو ڕاستی‌یە دەراسـایەم. منیـش لـەوەدا هەڵـەم کـرد کـە ئاوڕلێدانـەوەی جوزئیـی ئـەوانم بەرامبـەر کەسـی خـۆم تـەئویل نـەکرد و نەمگێڕایـەوە بـۆ پەیامەکانی نوور. هۆی ئەوەش لاوازیی خۆم و زۆریی ئەو هۆکارانەیـە کـە یارمـەتیدەرانم بەرەو ترسان ببەن. قبوولکردنیشم بۆ ئەو بەشەی کە تایبەتـە بـە کەسـی خۆمـەوە تەنـها بـۆ دانانی نیشانەی پشت پێ بەستن و مۆرکی باوەڕکردنە بە گوفتارەکانم و، هیچ شتێکی تـر نی‌یە.

من بەمەی خوارەوە وریاتان دەکەمەوە:

هەرگیز پێویست بە لەناوبردنی کەسی لاوازی مـن ناكـات كـە بەسـەر لێـواری گۆڕەکەمدا شۆڕ بوومەتەوە و، پێویستیش بەم چەشنە گرنگی دانە بە بوونی من ناکات.

ئەوەش زۆر پێویستە کە بزانن زۆرانگرتن لەگـەڵ پەیامـەکانی نـووردا هـەوڵێکی سەرنەگرتووە. چونکە هەرگیز ئێوە ناتوانن زۆرانـی لەگەڵدا بگرن، بگرە هـەر هـەوڵی ئەوەش مـەدەن و هـەرگیز بەسـەر پەیامـەکانی نـووردا سـەرناکەون. خۆ ئەگـەر هـەوڵی زۆرانکاریتان دا لەگەڵ ئەو پەیامانەدا ئەوا جگە لە گەیاندنی زیـانێکی مـەزن بـە نەتـەوە و نیشتمان هیچی تر دروێنە ناکەن.

بەڵام هـەرگیز نـاتوانن – هەرچـەندەش هـەوڵ و تـەقالای زۆر بـدەن – قوتابیـانی ئـەو پەیامانە پەرتەوازە بکەن و یەکێتیی نێوانیان هەڵبووەشێننەوە. چونکە ناچار کردنی ڕۆڵـە و نەوەکانی باپیرانی قارەمانمان کە زیـاد لـە پـەنجا ملیـۆن شـەهیدیان لـە پێنـاوی پارێزگـاری کـردنی قورئـان و ڕاسـتی‌یە بەنرخـەکانیدا پێشـکەش کـردووە، ناچـار کـردنیان بـۆ لەبیربردنەوە و بێ ئەمەکی بەرامبەر ڕابوردووی پرشنگداریان، یاخود بتانـەوێ پەردەیـەك لـە نێوان ئـەوان و پاڵەوانێتی‌یـە ئایینی‌یـەکانیان دابنێـن کـە مایـەی سـەرنج و جێـی ڕێـز و سەرسووڕمانی جیهانی ئیسلامی‌یە، ئەو هەوڵە هەرگیز کارێکی ئاسان نی‌یە. خـۆ ئەگـەر ئەوان لە مەیدان بکشێنە دواوە، ئـەوا قوتابیانی‌بـەوەفای پەیامـەکانی نـوور دەستبەرداری ئـەو پەیامانـە نـابن کـە ئاوێنەیـەکی دەرخـەری ئـەو ڕاستی‌یەن و، ڕازی نـابن کـە – بـەو دەستبەرداری‌یە – زیان بە نیشتمان و نەتەوە و ئاسایش بگات.

دوا وتەم:

﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هو عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وهوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظيم﴾.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## پێشنیازێك
## کە بۆ ئەنجومەنی وەزیران ڕەوانە کراوە

تکایەکی یەکجار گرنگم هەیە:

لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دا کە زیاتر لە سێسەد لاپەڕەیە، پازدە لاپەڕەی تێدایە - کە "تیشکی پێنجەم"ە - لە مێژە نووسراوە و، بوو بە هۆی ئەوەی ئەنجومەنی وەزیران بڕیار دەربکات بە کۆکردنەوە و دەست بەسەردا گرتنی ئەو کۆمەڵە پەیامە.

دەتوانرێت ئەو بەشەی کە گومانی زیانی لێ دەکرێت دەربهێنرێت لە کۆمەڵە پەیامی "سراج النور" کە سوودی بۆ هەموان چەسپاوە، بە تایبەت بۆ کەسانی گیرۆدەی بەڵا و گیرو گرفتەکان و پیران و ئەوانەش دوودڵی و گومانیان لە بابەتەکانی ئیماندا هەیە و، بوار بە بڵاوکردنەوەی پاشماوەی ئەو سێسەد لاپەڕەیە بدرێت. بۆیە بە ناوی هەموو ئەوانەی کە سوودیان لەم کۆمەڵە پەیامە وەرگرتووە و دڵدانەوەیان تێدا بەدەست هێناوە لە کەسانی گیرۆدەی بەڵاو گیر وگرفت و پیران و، بە ناوی هەموو موحتاجانی ڕاستییەکانی ئیمانەوە، تکا لە ئەنجومەنی وەزیران دەکەین ڕێ بە بڵاوکردنەوەی بدەن.

لە کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"یشدا کە چوار سەد لاپەڕە دەبێت و سی ساڵ پێش ئێستا بۆ بەرپەرچدانەوەی فەیلەسووفەکانی ئەورووپا نووسراوە، تەنها دوو لاپەڕەی تێدایە کە تەفسیری دوو ئایەت دەکەن لەبارەی میرات و پۆشتەیی ئافرەتانەوە.

یەك دێڕیش لە بارەی بانقەکانەوە لە پەیامی "إشارات الإعجاز"دا هەیە کە پێش سی ساڵ لە دەمی باسکردنی ئایەتی: ﴿وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾دا (البقرة: ٢٧٥) هاتووە.

سی ساڵ پێش ئێستا کە ئەندام بووم لە "دار الحكمـــة الإســلامية"دا وەڵامی شەش پرسیارم دایەوە کە سەرۆکی قەشەکانی ئەنگلیکانی ئینگلتەرا ئاراستەی مەشیەخەتی ئیسلامیی کردبوون. تەنها یەك دانە دێڕ لەو وەڵامەدا هەیە کە یاسای شارستانیی ئێستا بواری پێ نەدات.

ئێمە تکاتان لـێ دەکەین کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"مان بدەنەوە کە بە بیانووی بوونـی تەنـها دوو لاپەڕە و یـەك دێڕ دەستی بەسـەردا گیراوە؛ گوایـا یاسـای شارسـتانیی نـوێ بواریان پێ نادات. لە کاتێکدا کە ئەم پەیامە لە لایەن جیهانی ئیسـلامی‌یەوە بـە ستایش و ڕێزێکـی زۆرەوە پێشـوازیی لــێ کـراوە و، سـوودە زۆرەکانیشـی بـە کـردەوە چەسـپاوە، چونکە بە شێوەیەکی ڕەنگین بەڵگەیان لەسەر سێ دانە پایەی ئیمان هێناوەتەوە..

کەواتە داوای گێڕانەوەی ئەو پەیامە بۆمان مافی خۆمانە، چونکە ئەگەر پێنـج وشـەی قەدەغە لە پەیامێکدا هەبێت تەنها ئەو وشانە لادەبرێن و بوار بـە بڵاوکردنـەوەی پاشماوەی پەیامەکـە دەدرێـت. بۆیـە داوای دەستەبەر کردنیئەم مافـە یاسـایی‌یە گرنگـەی خۆمـان دەخەینـە پێـش چاوتـان و، بـە نـاوی هـەموو ئـەو کەسـانەوە کـە خزمـەتی ئیمـان و قورئـان دەکەن و بۆ هێنانـەدیی ڕێسـا و ئاسـایش تـەقالا دەدەن و لـە ڕێـی پەیامـەکانی نـوورەوە بـۆ خزمەتی ئەم نەتەوە و نیشتمانە تێدەکۆشن، داواتان لـێ دەکەین لە ستەمی داسـەپاوی ئـەو کەسانە ڕزگارمان بکەن کە دەنکە دانەوێڵەیەك هێنـدەی گومـەزێك بـە گـەورەیی پیشـان دەدەن.

پاشــان پــەیامی "شــەش هێرشــەکان" کــە هــەژدە ســاڵ پێــش ئێســتا و لـــە دەمــی تووڕەبوونێکی زۆردا نووسیومە، لەو کاتەوە نەمدیوەتەوە و بە نـهێنی هێشتمەوە و بـوارم بە بڵاوکردنەوەی نەدا. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کەوتە بەردەستی سێ چوار دادگا، بـەڵام ئەو دادگایانە هەر بۆ خۆیان ئەو پەیامەیان دایەوە بە خاوەنەکانیان.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## سوپاسنامەیەك

باسمه سبحانه

**ئەمەی خوارەوە سوپاسنامەیەکە پێشکەشی دەستەی کارشناسانی دەکەم لە دیوانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی و، "سێ خاڵ"ی تێدا ڕوون دەکەمەوە بۆ ئەوەی یارمەتییان بدەم لە ڕاستکردنەوەی چەند ڕەخنەیەکی جوزئیی لە پێداچوونەوە و وردبینییەکانیاندا، کە لێرەدا بە ڕوونی وەڵام دراونەتەوە.**

**خاڵی یەکەم:**

من سوپاسی خۆم پێشکەش بەو زانا بەڕێزانە دەکەم، چونکە بە سیفەتی کەسیی خۆم لە سێ ڕووەوە منەتباریانم:

یەکەم: لەبەر ئەوەی سیازدە پەیامیان لە کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا" - جگە لە پەیامی "تیشکی پێنجەم" - بە شێوەیەکی هێندە جوان کورت کردووەتەوە کە سەرنجی ڕێز و سەرسووڕمان ڕادەکێشێت.

دووهەم: لەبەر ئەوەی ئەو تۆمەتانەیان بەرپەرچ داوەتەوە کە ئێمەی پێ تاوانبار کراوین، کە بریتییە لە: دامەزراندنیتەریقەتی سۆفی و، پێکهێنانی کۆمەڵەیەك و، تێکدانی ئاسایش.

سێهەم: لەبەر ئەوەی داواکەی منیان پشت ڕاستکردەوە کە لە بەردەم دادگادا وتم: "ئەگەر تاوانێك لە ئارادا هەبێت، ئەوا تەنها هی منە و قوتابیانی نوور لێی بەرین و، لەبەر ڕزگارکردنیئیمانی خۆیان لە ڕێی پەیامەکانی نووردا تێکۆشاون".

جا ئەو کارشناسانەش بە هەمان شێوە قوتابیانی نوور ڕزگار دەکەن و بێتاوانییان ڕادەگەیەنن و گوناهەکان تەنها ئاراستەی من دەکەن. منیش لە لایەنی خۆمەوە پێیان دەڵێم: خوای گەورە لێیان ڕازی بێت. بەڵام ئەوان هەریەك لە خوا لێخشبووان: "حەسەن فەیزی" و "حافظ عەلی" و هاوشێوەکانیان و میراتبەرانی ئەم دوو شەهیدەیان کردووە بە هاوبەشم لە گوناهەکاندا. لەبەر ئەوە، لێرەدا هەڵەیان کردووە. چونکە ئەو بەڕێزانە کەسانی پێشەنگ و پێشکەوتوون لە خزمەتی ئیماندا و هەرگیز هاوبەشی

گوناهەکان نین و، لە هەڵە و گوناهەکانی من بەرین و، چاودێریی خوای گەورە بەزەیی بە لاوازیی مندا هاتەوە کە ئەوانی بۆ یارمەتیدانم نارد.

**خاڵی دووهەم:**

ئەو کارشناسانە ڕەخنەیان لە هەندێ ڕیوایەتی ناو "تیشکی پێنجەم" گرت و، سەبارەت بە هەندێکی وتیان: زەعیفە و بۆ هەندێکی تری وتیان مەوزووعە و، تەئویلی بەشێکی تریشیان بە هەڵە لە قەڵەم دا. داواکاری گشتیی دادگای ئافیوونیش لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا ڕاپۆرتەکەی نووسی. لە کاتێکدا کە ئێمە هەشتا و یەك دانەمان لە هەڵەکانی ئەو لە لیستێکی پازدە لاپەڕەییدا دەستنیشان کرد. با کارشناسە بەڕێزەکان سەیری ئەو لیستە بکەن.

وا لە خوارەوەدا نموونەیەکی لێ پێش چاو دەخەین:

ئەو داواکارە وتی: هەموو تەئویلەکانی هەڵەن و، ڕیوایەتەکانیش یان مەوزووعن، یان زەعیفن.

ئێمەش دەڵێین:

واتای "تەئویل" ئەوەیە کە: دەگونجێ ئەم واتایە مەبەست بێت لە فەرموودەکەدا. واتە: ئەم مانایە هەڵدەگرێت. بەڵام ڕەتکردنەوەی گریمانی هەڵگرتنی ئەو واتایە - بە پێی زانستی مەنتیق - بەوە دەبێت کە مەحاڵی‌یەکەی بە بەڵگە بچەسپێت. کەچی ئەو واتایە بە چاو بینراوە و، یەك دانە لە هەمەکێتیی چینە ئاماژەیی‌یەکەی فەرموودەکە لە ڕاستیدا هاتەدی. کەواتە هەرگیز ئیعتیراز لەو واتایە ناگیرێت، چونکە فەرموودەکە لە ڕێی بریسکەیەکی ئیعجازەوە ئەو واتایەی دەرخست و ئەم چەرخەشی لەسەر گرت بە شایەت! جگە لەمەش لەو لیستەی ئاماژەم پێ دا لە سێ ڕووەوە هەڵەکانی داواکاری گشتیمان چەسپاند:

یەکێکیان:

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە یەك ملیۆن حەدیسی لەبەر بووە و، ئیمامی بوخاریش کە پێنج سەد هەزار فەرموودەی لەبەر بووە، ئاوا بە ڕەهایی پڕکێشیی نەفی کردنی ئەو ڕیوایەتانەیان نەکردووە. دەبێ بیشزانین کە چەسپاندنی ئەو نەفی‌یە هەرگیز لە توانادا نی‌یە و، خودی داواکاری گشتیش هەموو کتێبەکانی فەرموودەی پیرۆزی نەخوێندووەتەوە. ئنجا زۆرینەی نەتەوەی ئیسلامیش لە هەموو چەرخێکدا چاوەڕوانی بینینی واتاکانی ئەو ڕیوایەتانە، یاخود دانەیەك لە واتا هەمەکی‌یەکانی بوون. تەنانەت ئەو

واتایانە نزیکە لە وەرگرتنەوە لە لایەن نەتەوەی ئیسلامەوە. هەروەك لە ڕاستیدا خودی چەند دانەیەك لەو واتا هەمەکی‌یە دەرکەوتوون و بە چاو بینراون.

لەبەر ئەوە، ئینکاری کردنی ئەو ڕیوایەتانە، لە "دە" ڕووەوە، کارێکی هەڵەیە.

ڕووی دووهەم:

"ڕیوایەتی مەوزووع" ئەوە دەگەیەنێت کە: (حەدیسێکی خاوەن سەنەد – واتە فلان لە فلانی وەرگرتووە – نی‌یە).. ئنجا هەموو کاتێکیش ئەوە ناگەیەنێت کە "واتا"کەی هەڵە بێت.

جا مادەم نەتەوەی ئیسلام ئەو واتایەیان پێ قبووڵ بووە، بە تایبەت ئەهلی کەشف و حەقیقەت و بەشێکی زانایانی فەرموودە و موجتەهیدان، تەنانەت چاوەڕوانی هاتنەدیی واتاکانیان بوون، ئەوا دەبێ ئەو ڕیوایەتانە – بە وێنەی نموونە و پەندەکان – چەند ڕاستی‌یەك بن و ڕوویان لە عموومی موسڵمانان بێت.

ڕووی سێ‌هەم:

من دەپرسم: ئایا هیچ مەسەلەیەك یان هیچ ڕیوایەتێك هەیە کە لە کتێبەکانی زانایانی جیاواز لە مەشرەب و ڕێچکە و ڕێبازدا هاتبێت و ڕەخنەی لێ نەگیرابێت؟ بۆ نموونە یەکێك لەو ڕیوایەتانەی کە باس لە هاتنی چەند دەجاڵێك دەکات لەم نەتەوەیەدا، ئەم فەرموودە پیرۆزەیە:

(لن تزالَ الخلافةُ في ولدِ عمي – صِنوِ أبي – العباس حتى يسلِّمَها إلى الدجال)[1].

ئەم فەرموودە پیرۆزە هەواڵی ئاشووبی جەنگیزخان و هۆلاکۆ ڕادەگەنێت و ئەوەش کە دەجاڵێك دوای پێنج سەد ساڵ پەیدا دەبێت خەلافەت دەڕووخێنێت. ئەمانە و ڕیوایەتەکانی تری وەك ئەمانە کە هەواڵ لەبارەی کەسانی ئاخر زەمانەوە دەدەن، گەلێ زۆرن. سەرباری هەموو ئەمانەش، هەندێ کەسی بەڕێزی ئەهلی مەزهەب لەوانەی کە زیادەڕەوی لە بیروبۆچوونەکانیاندا دەکەن، وتوویانە: ئەمە ڕیوایەتێکی زەعیف یان مەوزووعە..

بە هەرحاڵ.. هۆی درێژە نەدانم بەم بابەتە و واز هێنانم لێی بەو ئەندازەیەی باسم کرد، کە دەبوو درێژەم پێ بدایە، ڕوودانی دوو بوومەلەرزە بوو کە لێرە و لە کاتی نووسینی

---

(١) بڕوانە: كنز العمال ١٤/ ٢٧١ برقم ٣٣٤٣٦ ومسند الفردوس ٣/ ٤٤٧، مجمع الزوائد ١٨٦/٥ جمع الفوائد ١/ ٨٤٩ (لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە – وەرگێڕ)

ئەم وەڵامەدا ڕووی دا، وەك ئەوەی كە لـە دەمـی هێرش بردنـدا بۆسـەر پـەیام و قوتابیـانی نوور چوار بوومەلەرزە ڕووی دا. ئەو شتەش بەم جۆرە بوو كە:

دوو بوومەلەرزە لـەو كاتـەدا ڕووی دا كـە مـن بـەدەم ئـازاری ئـەو نەشـتەرگەری‌یەوە دەتلامەوە كە ڕاپۆرتی كارشناسەكان لە مندا ئەنجامی دا، كە ئەم ئێوارەیە درایـە دەسـتم! وێـڕای خـەم و خەفـەتی خۆیشـم كـە لـە ئەنجامی تـەنیایی و كـەس نەبینینـەوە سـەری تـێ كردووم.

بەڵێ، دوای هەشت مـانگی زیندانـی تاكـە كەسـی و چەشـتنی تـەنگ پـێ هـەڵچنین و گوشارە سەختەكان، ڕاپۆرتی كارشناسانی سـەرۆكایەتیی كاروبـاری ئـایینیم بـە دەسـت گەیشت.. جا لەو كاتـەدا كـە مـن چـاوەڕوانی پشتگیریی ئەوانم دەكـرد، كـەچی دەبینـم پشتی داواكاری گشتی دەگرن، ئەوەتا لە ڕاپۆرتەكەیاندا هـاتووە كـە: "سـەعید دەڵێـت: چوار بوومەلەرزەكەی پێشوو كەرامەتی پەیامەكانی نوورن".

جا هەروەك لە لیستەكەدا نووسیم، لێرەشدا دەڵێم: پەیامەكانی نوور وەك "سەدەقەی قبـووڵ كـراو" وان؛ دەبـن بـەهۆی دوورخسـتنەوەی موسـیبەتەكان. ئـەوەتا هـەر كاتێ هێرشیان دەكرێتە سـەر، موسیبەتەكان دەرفـەتیان بـۆ دەرەخسێت و دادەبـەزن، تەنانـەت هەندێ جار زەوی بە "بوومەلەرزە" تووڕەبوونی خۆی دەردەخات.

جا هەر ئـەوەندەی ویسـتم ئەمـە بنووسـم، دوو بوومەلـەرزە لـێرە ڕووی دا(١). ئەمـەش هانی دام كە واز لە نووسینی ئەو باسە بهێنم. بۆیە دەگوێزینەوە بۆ خاڵی سێ‌هەم:

**خاڵی سێ‌هەم:**

دەسا ئەی زانا خاوەن حەقیقەت و وردەكار و بەویژدانەكانمان!

هەر لە مێژە زانایان لە نێوان خۆیاندا لەسەر نەریتێك ڕاهـاتوون كـە دانـانی ستایش و پیاهەڵدانە - هەندێ جار بە زیادەڕەویشەوە - لە داوێنی كتێبێك كە تـازە دانرابێـت. خۆ لەو كاتەدا كە نووسەری ئەو كتێبـە سـوپاس و پێزانینی خـۆی بـۆ خـاوەنی ئـەو ستایشـانە دەردەبڕێت، لە لایەن كەسانی تەنانەت ڕكەبەریشیەوە بەوە تاوانبار ناكرێت كە لە خـۆی ڕازی‌یە و حەز بە خۆدەرخستن دەكات..

---

(١) ئەم بوومەلەرزەیە لە چێشتەنگاوی ڕۆژی هەینیی ڕێكەوتی ١٩٤٨/٩/١٨زدا ڕووی دا.

بە ناوی قوتابیانی نوورەوە لە بەندیخانەی ئافیوون:

(خەلیل مستەفا، محەممەد فەیزی، خەسرەو)

جا چەند کەسێکی قوتابی‌یە بێگەرد و تایبەتمەندەکانی نووریش، وەك خوا لێخۆشبوو حەسەن فەیزی و شەهید حافظ عەلی کە چەند ستایش و پیاهەڵدانێکیان نووسیوە، لەبەر دەستەوسانی و لاوازی و غەریبیم و نەبوونی کەسوکارم و، لە بەرامبەر هێرشی چەند دوژمنێکی ستەمکاری زۆرەوە و، بە مەبەستی هاندانی موحتاجانی پەیامەکانی نوور، نووسیویانە..

ئێوە ئەم ستایشەی ئەوانتان بە غروور و لەخۆڕازی بوونی من لە قەڵەم داوە، هەرچەندە ئەو بەشە مەدح و ستایشەی کە تایبەتە بەخۆمەوە من بۆ پەیامەکانم گێڕاوەتەوە و، بە تەواوی دەستم بە ڕووەوە نەناوە.. هەرچەندم کرد نەمتوانی ئەم لێکدانەوەیەی ئێوە لەگەڵ ئەو وردەکاری‌یە زانستی و هاوکاری‌یە بەسۆزەتاندا پێکەوە کۆ بکەمەوە و یەکیان بخەم! بۆیە من زۆر لەمە دڵگرانم. دەبێ بیشزانن: ئەو هاوڕێیانەم کە خاوەنی ئەو ستایشانەن هەرگیز سیاسەتیان بە خەیاڵدا نەهاتووە.

هەروەها نابێ سەبارەت بەو قسەیەی ئەوان کە دەڵێن: "پەیامەکانی نوور لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا واتای دانەیەك و جوزئی‌یەکی واتا ئاماژەیی‌یە هەمەکی‌یەکەی تێدا هاتووەتەدی".. بوترێت: ئەم قسەیەی ئەوان هەڵەیە و زیادەڕەویی تێدایە. چونکە زەمان تەسدیقی ئەو قسەیە دەکات.. گریمان ئەو قسەیە زیادەڕەویی زۆری تێدا بێت و تەنانەت هەڵەش بێت، خۆ هێشتا هەر هەڵەیەکی زانستی‌یە و هیچی تر نی‌یە و، هەموو کەسێکیش دەتوانێت قەناعەتی خۆی بنووسێت. ئێوە لە هەموو کەسێك زیاتر شارەزای بیروبۆچوونە جیاواز و قەناعەتە جۆراوجۆرەکانن لەو کتێبانەی شەرعدا کە خاوەنی دوازدە مەزهەبەکان، بە تایبەت شوێنکەوتووانی مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و مالیکی و حەنبەلی و، نزیکەی حەفتا دەستەی ناو بازنەی زانستی کەلام و ئوسوولی دین نووسیویانە.

لە ڕاستیدا هیچ کاتێك وەك ئەم زەمانەی ئێمە پێویستیی زۆر لە ئارادا نەبووە بۆ ئەوەی زانایان یەکبگرن و وتوویژەکانی نێوانیان بخەنە لاوە. کەواتە ئێمە ناچارین واز لە جیاوازیی ڕا و بۆچوونەکانمان لە بابەتە لاوەکی‌یەکاندا بهێنین و نەیانکەین بە مایەی وروژاندنی وتوویژ و لێدوان.

* * *

## سێ پرسیار کە ئاراستەی زانایانی بەویژدانی کارشناسەکانیان دەکەم

**یەکەم:**

کەسێك بە نیازێکی خاوێن ستایشی کەسێکی تر دەکات.. ئایا ستایشکراو بەرپەرسی ئەو ستایشەیە، بە تایبەت کە بە هەموو هێز و توانایەکی بەو ستایشە ناڕازی بێت و بۆ غەیری خۆی بگێڕێتەوە؟ تەنها ئەوەندە هەیە کە سەرزەنشتی هاوڕێ دڵسۆزەکەی خۆی نەکردووە و هەر هێندەی پێ وتووە کە: ئەم ستایشە سەد پلە زیاتر لە سەرووی سنووری منەوەیە. جا ئایا ئەم بێدەنگی‌یەی بەوە لێکدەدرێتەوە کە لە خۆی ڕازی‌یە و بە دوای بەرژەوەندیی خۆیدا دەگەڕێت؟

**پرسیاری دووهەم:**

لە گەرماوگەرمی ئەو هێرشە سەختەی کە ئێستا دەکرێتە سەر ئایین، ئەگەر قوتابی‌یەکی نوور لە شەیدایانی حەقیقەت قەناعەتی هەڵەی خۆی وەك هەڵەیەکی زانستی دەربڕێت، ئایا شایانی ئەم سووکایەتی پێکردنە دەبێت؟ لە کاتێکدا کە هێندە کێشەی ئایینی هەن بە ئەندازەی چیا گەردن کەشەکان دەبن و پێویستیان بە ئاوڕلێدانەوەیە؟

جا لەو کاتەدا کەسی ستایشکراو چاوەڕوانی یادخستنەوەیەکی بە شەفەقەتانەیە لە زانایان و مامۆستایانی وەك بەڕێزتان لەسەر ئەو هەڵەیە، ئایا دروستە لە لایەن دامودەزگای دادەوە سزا بدرێت؟

**پرسیاری سێهەم:**

ماوەی بیست ساڵە پەیامەکانی نوور ڕووبەڕووی سەرسەخت ترینی نەیارەکانیان بوونەتەوە کە لە ژمارە نایەن و، ئیمانی سەدان هەزار کەسیان ڕزگار کردووە و پشتی ئیمانی ئەوانیان گرتووە.. ئایا ڕەخنەگرتن لەو پەیامانە لە یەك دوو مەسەلەدا کارێکی شیاوە؟

من ئەوە یادی ئەو زانا بەڕێزانە دەخەمەوە کە:

ئەوان ڕەخنەیان لەو پێشەکی‌یە گرتووە کە لە سەرەتای باسی ستایشەکەی ئەحمەد فەیزیدایە. وەك ئەوەی پێیان وابێت من بەو پێشەکی‌یە ستایشی خۆمم کردبێت. کەچی ئەو پێشەکی‌یە بەرپەرچدانەوە و لابردنی ئەو ستایشەی ئەوە. هەر لە ڕاستیشدا هەندێکی لابرا و بەشەکەی تریشم ڕاست کردەوە، بەڵام لەبەر پەلەکردن نەمتوانی تەواوی

بکەم و، ئەو پێشەکی‌یەم بە تەواوی نارد بۆ یەکێك لە برایانم و، ئەوانیش لە شوێنی دیاری کراوی ئەو باسەدا دایان نا کە زۆر تایبەتی‌یە و هی ئەوە نی‌یە دەستاودەستی پێ بکرێت. بەڵام لەو کاتەدا کە ناردیان بۆ برایەکی تر حکوومەت دەستی بەسەردا گرت.

جا ئایا ستایش و پیاهەڵدانێکی زانستی و یەکجار تایبەت کە لە قەناعەتی زاتی‌یەوە سەرچاوەی گرتووە و، تەنها لە نێوان چەند هاوڕێ‌یەکدا دەستاودەستی پێ دەکرێت، تاکو بە تەواوی هەڵەکانی ڕاست بکەنەوە، ئایا ئەمە شایستەی ئەو ڕەخنە و ئیعتیرازە توندوتیژەیە؟

پاشان چەند نامەیەك کە تایبەتن بە پیرۆزبایی و هاندانی قوتابیان بۆ کار و خزمەت، لە یەك دوو بەرگدا کۆکراونەتەوە و بەرگیان تێ گیراوە بە مەبەستی پاریزگاری لێکردن و، ئێستا کەوتووەتە بەردەستی پۆلیس لە دەمی پشکنیندا.. جا ئایا دەگونجێ بڕیار لەم چەشنە نامانە دەربهێنرێت و، بکرێت بە مایەی پرسیار و وەڵام و، هەوڵی لکاندنیان بدرێت بە سیاسەتەوە؟ یان ئایا ئەم کارە پێویست بەوە دەکات؟

ئەم کارە کتومت وەك هی ئەو کەسە وایە کە چەندین هەژدیهای سەرسەخت نابینێت کە هێرش دەکەنە سەر قورئان، کەچی هەر لەو کاتەدا خۆی بەوە سەرقاڵ دەکات کە مێشوولە پێوەی داوە! ئایا وا نی‌یە؟

لە ڕاستیدا واز هێنان لە "سیراج ئۆغلو"[1] کە ئایینی ئیسلام و پەروەردەی محەممەدی بە ژەهری کوشندە دادەنێت و، خۆ سەرقاڵ کردن بە کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"ەوە کە بە وێنەی خۆری درەخشان حەقیقەت ڕوون دەکاتەوە و دەرمان و چارەسەری شیفا بەخشی سەرجەم زامەکانی گرۆی مرۆڤایەتیی تێدایە، بە تایبەت بۆ کەسانێك کە پێویستیان پێ‌یەتی، بە بیانووی ئەوەی: لە کۆتایی‌یەکەیدا تەئویلی چەند فەرموودەیەکی لاوازی تێدایە، ئایا ئەم کارە نابێت بە یاریدەدانی دەست بەسەردا گرتنی؟

ئێمە سەرباری ئەوەی کە لە ڕەخنە جوزئی‌یەکانتان دڵگران نین، بەڵام - ئەی زانایانی بەڕێز! - چاوەڕوانی ئەوەین لێتان کە زامەکانمان ساڕێژ بکەن و، بە هێزی فیراسەتی خۆتان پشتگیرمان بن.

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتە بووە. (وەرگێڕ)

باسمە سبحانە

# پێشەکی

(ئەم بڕگانەی خوارەوە)

بە مەستی پێشکەش کردنی هەندێ یارمەتی بە دادگای بەڕێزی "تەمییز" کە لە بەرژەوەندیی ئێمەدا بە پێنج بەڵگەی ڕاست و دروست ئەو بڕیارەی دادگای "ئافیوون"ی هەڵوەشاندەوە کە ئێمەی پێ تاوانبار کردبوو، وا بە پوختی ئاماژە بۆ بەشێکی هەڵەکانی بڕیاری ناوبراوی دادگای "ئافیوون" دەکەین و، لە خوارەوە ئەو بڕگانە دەهێنین کە لە پەیامە تایبەتە نهێنییەکانمان دەرهێنراون و دادگا، بە نیازی تاوانبار کردنمان، بە گوناهی لەقەڵەم دابوون. بۆیە لێرەدا هەڵەکانیان دەردەخەین و خۆیان دەخەینە هەڵوێستی بەرپرسیاری.

بۆ نموونە: لە کۆتایی بڕیارەکەیاندا شتێکیان نووسیوە کە بەلایانەوە وەك لیستێك وابێت هەموو تاوانەکانی منی لەخۆ گرتبێت، تاکو سەخت ترین سزام بدەن:

"یەکێك لەو شتانەی باسی دەکەین و یەکێکە لەو ماددانەی کە سەعید نوورسی دەست بە ڕوویانەوە دەنێت: هەڵوەشاندنەوەی پادشایی و خەلافەتە".

ئەم قسەیە هەروەك سەهوە، لە هەمان کاتدا هەڵەیشە. چونکە ئەوەی کە من لە بریسکەی "پیران"دا نووسیومە ئەمەیە: "خەفەتم بە کۆچی دوایی خەلافەت خوارد". پازدە ساڵ پێش ئێستا لە سەر ئەمە وەڵامی پرسیارێکی دادگای "ئەسکی شەهر"م بە شێوەیەك دایەوە کە بێدەنگی کردن. جا ئەو کەسەی خاتیرەیەکی ئەوتۆ بە تاوان دادەنێت کە گرنگیی نییە و ئەم ماوە درێژخایەنەشی بەسەردا تێپەڕیوە و چەندین جار بڕیاری بێ تاوانی و لێخۆشبوون گرتوویەتیەوە.. ئەو کەسەی ئەمە بە تاوان دادەنێت خۆی تاوانبارە.

ئنجا بە مەبەستی پشتگرتنی ئەو تاوانە گومانکراوە، بڕیارەکە ئەو فەرموودە پیرۆزەی هێناوە کە من لە بریسکەیەکی کتێبی بریسکەکان و لە پەیامی موعجیزاتی ئەحمەدیدا هێناومە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

(الخلافة بعدی ثلاثون سنة ثم تكون ملكاً عضوضاً وفساداً وجبروتاً)[١].

لە پەیامێکی کۆنمدا نووسیومە: ئەم فەرمووده پـیرۆزە سێ موعجیزەی غـەیبیی تێدایـە کە لە ئایندەدا دێنەدی. کەچی لە بڕیارەکەدا وەك تاوانێك باسی لێ کراوە و ئەوەی تێدا هـاتووە کـە: "سـەعید لـە پەیامێکیدا دەڵێـت: لـە دوای خەلافـەت فەسـاد و سـتەم پـەیدا دەبێت"؟

منیش پێیان دەڵێم:

ئەی ئەندامانی دەستەی کارشناسە ڕواڵەتی و ساکارەکان!

ئەو کەسـەی کـە ڕوونکردنەوەی فەرموودەیـەکی پیرۆز کـە بـە ئاماژەیـەکی غـەیبی هەواڵی ڕووداوێکـی گـەیاندووە کـە لـەم زەمانـەی ئێمـەدا ڕوودەدات و فەسـادەکەی لـە سەرانسەری گۆی زەویدا تەشەنە دەکات و هەواڵی فەسادێکی ماددی و مەعنەویی ئەوتۆ دەگەیـەنێت کـە هـەموو گـرۆی مـرۆڤ دەگرێتـەوە.. ئـەو کەسـەی کـە ئەمـە بـە تـاوان دادەنێت، خۆی لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە تاوانبارە.

هـەروەها نووسـیویانە: "یـەکێك لـە تاوانـەکانی ئەوەیـە کـە دەسـتکەوتەکانی شـۆڕش (بزووتنەوەکانی کوودەتاکە) بە گومڕایی و بیدعەت و ئیلحاد دادەنێت، ئەوەتا پێـی وایـە کـە: داخسـتنی تەکیـە و خانـەقا و قوتابخانـە ئایینیـەکان و، چەسـپاندنی لائیکیـەت و، دانـانی بناغـەکانی نەتەوەگـەری لـە بریـی بنـەماکانی ئیسـلام و، سـەپاندنی شـەپقە لەسـەر کردن و، قەدەغەکردنی پۆشتەیی و، داسەپاندنی پیتی لاتینی لەبریی پیتە قورئانییەکان و، بـانگ و قامـەت وتـن بـە زمـانی تورکـی و، نەهێشـتنی وانـەی ئـایین لـە قوتابخانـەکاندا و، بەخشینی مافی میرات بە ئافرەت وەك هی پیاوان و، نەهێشتنی فرەژنی و، کارەکانی تـری هاوشێوەی ئەمانـە، بــە گومڕایــی و بیدعــەت و ئیلحــاد دادەنێــت. کەواتــە کەسـێکی کۆنەپەرستە".

ئێمەش پێیان دەڵێین:

ئەی ئەندامانی دەستەی کارشناسە بێ ویژدانەکان!

ئەگەر لە تواناتاندا هەیە ئینکاریی فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز بکەن، کە پێشـەوایەکی ئاسمانی و خاوێنی سێ سەد ملیۆن کەسە لە هەموو چەرخێکدا و، پرۆگرامی بەختەوەریی

---

(١) صحيح: عن سفينة أن الرسول ﷺ قال:"الخلافة بعدي في أمتي ثلاثون سنة، ثم ملك بعد ذلـــك". رواه أحمد والترمذي وأبو يعلى في مسنده وابن حبان في صحيحه (صحيح الجامع الصغير برقم ٣٣٣٦ قال المحقـق: صحيح). (الفتح الرباني للساعاتي ٢٣/١٠). وفي (سلسلة الأحاديث الصحيحة ٤٦٠٠) بعدة سياقات.

هەموویانی لەخۆ گرتووە و، گەنجینەیەکی پاکی ئەوتۆیە کە نهێنییەکانی هەردوو ژیانی تێدا کۆبووەتەوە.. ئەم قورئانە پیرۆزەی کە لە چەندین ئایەتیدا و بە ڕاشکاوییەکی وەها تەئویل هەڵنەگرێت، فەرمان بە: پۆشتەیی و دەستوورەکانی میرات و بوار بە فرەژنی دەدات و، بانگی خەڵکی بۆ لای یاد و زیکری خوا دەکات و، هانی موسڵمانان دەدات کە زانستە ئایینییەکان بە دەرس بڵێنەوە و بڵاویان بکەنەوە و پارێزگاری لە شەعائیرەکانی ئایین بکەن..

هەروەها ئەگەر لە تواناتاندایە سەرجەمی موجتەهیدان و قازییەکان و زانایانی مەزنی ئیسلام تاوانبار بکەن..

ئەگەر توانیتان ئینکاریی گوزەرکردنی زەمان بەسەر ئەو پەیامانەدا و بڕیاری چەندین دادگا لەسەر بێ تاوانییان و یاساکانی لێخۆشبوون لەبارەیانەوە بکەن و، ئینکاریی ئەوەش بکەن کە ئەو پەیامانە تایبەتی و نهێنی بوون و بڵاونەکراونەتەوە..

هەروەها ئەگەر لە تواناتاندایە ئازادیی ویژدان و هزر و بیر و بڕوا لەم وڵاتە و لە حکوومەتەکاندا لابەن و، ئینکاریی ئەوەش بکەن کە تەنها لە لایەنی هزر و بیر و لە ڕووی زانستییەوە ئەو پەیامانە بۆچوونیان جیاوازە..

دەڵێم: ئەگەر هەموو ئەمانەتان لە توانادایە، ئەوا بەپێی ئەو شتانە من بە تاوانبار دابنێن. دەنا هەرخۆتان لە دادگای حەق و ڕاستی و دادگەریدا بە تاوانبار دادەنرێن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(ئەمەی خوارەوە بڕگەیەکە لە دادگادا وتوومانە و، دادگاش بە سەرسووڕمانەوە لە دژمان نووسیویەتی، لە کاتێکدا کە لە دژی خۆیانە):

(منیش بە دادگای بەڕێزی وەزارەتی دادگەری دەڵێم:

تاوانبارکردنی کەسێك کە بەرز و پیرۆزترین دەستووری خوایی تەفسیر دەکات، ئەو دەستوورەی کە حەقی ڕاستەقینەیە و لە هەموو سەردەمێکدا و لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتییاندا پرس و ڕایان پێیەتی و ڕەفتاری پێ دەکەن.. ئەو کەسەی کە لە تەفسیرەکەیدا پشت بەو شتانە دەبەستێت کە سێ سەد و پەنجا تەفسیرنووس تیایاندا یەکیان گرتووە و

سەلماندوویانە و، شوێن ئەو بیروباوەڕە کەوتووە کە باپیرانی پێشوومان لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا باوەڕیان پێی بووە.. تاوانبارکردنی ئەم تەفسیرنووسە، بڕیارێکی ستەمکارانەیە و، بێ هیچ گومانێك دادگەری - ئەگەر لە ڕووی زەویدا هەبێت - ڕەفزی دەکات و دەست بە ڕووی ئەو بڕیارەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە).

* * *

(ئەمەی خوارەوە بڕگەیەکە دادگا لە بڕیارەکەیدا بە ڕێز و سەرسوووڕمانەوە نووسیویەتی، وەك ئەوەی پێیان وابێت دەگونجێ بکرێت بە ماددەیەك لە دژمان، کەچی لە دژی خۆیانە):

سەعیدی نوورسی لە مەکتووبی بیست و شەشەمدا لەبارەی خۆیەوە دەدوێت و دەڵێت:

(ئەم برا هەژارەتان سێ کەسایەتیی تێدایە کە زۆر لە یەکەوە دوورن، تەنانەت دووری‌یەکی یەکجار زۆریشیان لە نێواندایە:

**یەکەمیان:**

کەسایەتی‌یەکی کاتی و بێگەرد و تایبەتە تەنها بە خزمەتی قورئانەوە، لەو ڕووەوە کە من دەڵاڵی گەنجینە بەرز و بەنرخەکەی قورئانی حەکیمم. جا ئەو ڕەوشت و ڕەفتارە بەرزانەی کە فەرمانبەریی دەڵاڵی کردن بۆ قورئان و بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای قورئان داخوازی دەبن، هی من نین و من خاوەنیان نیم. بەڵکو چەند ڕەوشتێکی بەرزن کە ئەو پلەوپایە بەرز و کارمەندی‌یە مەزنە داخوازی دەبن. کەواتە هەرچی ڕەوشتی بەرز و فەزائیلی لەم چەشنە دەبینن هیچیان هی من نین، بەڵکو تایبەتن بەو پلەوپایەیەوە. کەواتە لەو ڕوانگەیەوە بۆم مەڕوانن.

**کەسایەتیی دووهەم:**

کاتێ ڕوو دەکەمە دەرگانەی خواوەند و لێی دەلاڵێمەوە، خوای گەورە لە کاتەکانی پەرستش و بەندایەتیدا کەسایەتی‌یەکی تایبەتیم پێ دەبەخشێت کە هەندێ ئاسەواری ئەوتۆ بەرهەم دەهێنێت لە بناغەی واتای "بەندایەتی"یەوە سەریان هەڵداوە. ئەم بناغەیەش بریتی‌یە لەوەی مرۆڤ لە بەردەم خوای گەورەدا تەقسیرەکانی خۆی بزانێت و بەی بە هەژاری و دەستەوسانیی خۆی لە بەردەم خوای گەورەدا ببات و بە زەلیلی و شکستەیی و نەوازشەوە پەنای بۆ ببات. جا من - بەم کەسایەتی‌یە - خۆم لە هەموو

کەسێك بە دەستەوسانتر و بەدبەختتر و هەژارتر و تەقسیربارتر دەبینم لە بەردەم خوای گەورەدا. خۆ ئەگەر سەرانسەری دنیا کۆ ببنەوە و لەسەر مەدح و ستایشم یەك بگرن، هێشتا هەر ناتوانن قەناعەتم پێ بکەن کە من مرۆڤێکی باش و سالح بم.

**سێهەمیان:**

کەسایەتی‌یە ڕاستەقینەکەی خۆمە. واتە ئەو کەسایەتی‌یەمە کە هەڵوەشاوەی سەعیدی کۆنە و چەند دەمارێکی میراتیی ئەوە بۆم ماوەتەوە. دەبینیت هەندێ جار حەز لە ڕیا و پلەوپایە دەکات و، چەند خوو و ڕەفتارێکی نزم لە مندا دەردەخات، هاودەم لەگەڵ "ڕژدی"م لە بواری دەستپێوەگرتندا، چونکە من لە بنەماڵەیەکی خاوەن حەسەب و پلەوپایە نیم.

دەسا برایانم!

لەمە زیاتر لە خراپکاری‌یەکان و لایەنە چەوتەکانی ئەم کەسایەتی‌یەم نادرکێنم، تاکو بە تەواوی لە خۆم دوورتان نەخەمەوە!

خوای گەورە چاودێریی خۆی لە مندا بەوە دەرخست کە ئەم کەسایەتی‌یەی منی - کە وەك سەربازێك وایە - لە خزمەتی نهێنی‌یەکانی قورئاندا - کە لە حوکمی بەرزترینی پلەوپایەکانی موشیرێتیدایە - گوێڕایەڵ و ملکەچ کرد.

دەسا سەدان هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە.

کەواتە "نەفس" لە هەموان نزمترە و، کارمەندی‌یەکەش لە هەموو شتێك بەرز و بڵندترە.

الحمد لله هذا من فضل ربـــي.

* * *

(ئەمەی خوارەوە ڕستەیەکە دادگا لەناو بڕیارەکەیدا بە مەترسی و دوودڵی‌یەکی زۆرەوە لە دژی ئێمە تۆماری کردووە. لە کاتێکدا ئەو ڕستە توندوتیژەی کە پازدە ساڵ پێش ئێستا نووسرا، بەم شێوەیەی خوارەوە ڕاست کرایەوە):

"برایانم! لەبەر چاودێری کردنی هەست و سۆزی پیران و بێتاوانەکان، حەقم لەو کەسە مەسێننەوە کە بە ناحەق دەمکوژێت، چونکە سزای گۆڕ و سزای دۆزەخ سەروزیادیانە".

دەبوو ئەم بڕگەیەی خوارەوە بۆ بەکارهێنانی ویژدان هانی بدانایە:

(ئێوە پێتان وایە کە ئێمە نەیاری ئێوەین و دژایەتی‌یەکمان لەگەڵتاندا هەیە. مامەڵە و ڕەفتارە سەختەکانتان لەگەڵماندا شایەتە لەسەر ئەم دەرەنجامە. ئەوەتا ئێوە ئایین و دواڕۆژی خۆتان لە ڕێی دنیاتاندا دادەنێن، کەچی ئێمە هەمیشە ئامادەین دنیاکەمان لە پێناوی ئایین و ڕێی دواڕۆژماندا بەخت بکەین.

ئەمەش نهێنیی ئەو نەیاری و دژایەتی‌یەیە کە پێتان وایە لە نێوانماندا هەیە..

بێ گومان بەخت کردنی چەند ساڵێکی ئەم ژیانەمان کە لە ژێر سایەی حوکمڕانی‌یە توندوتیژ و وەحشی‌گەری‌یەکەی ئێوەدا بە زەلیلی و ڕسوایی بەسەر دەچێت، بۆ ئەوەی شەهیدی‌یەکی بێگەردمان لە پێناوی خوادا دەست بکەوێت، ئەم ژیان بەخت کردنە بۆ ئێمە وەکو ئاوی کەوسەر وایە.

بەڵام من پشت بە ڕێژنە و ئاماژەکانی قورئانی حەکیم دەبەستم و ئەم هەواڵەی خوارەوەتان پێ ڕادەگەیەنم تاکو لەرز بە جەستەتاندا بهێنێت:

لە دوای کوشتنی من ئێوە ناژین، چونکە دەستێکی بە زەبروزەنگ لەم دنیایەتان – کە بەهەشتی ئێوەیە و خۆشتان دەوێت – هەڵتان دەگرێت و دەرتان دەکات و فڕێتان دەداتە ناو چەندین تاریکستانی ئەبەدی‌یەوە.. هەروەها دوای من ئەو سەرکردانەشتان کە وەکو نەمروودیان لێ هاتووە و لە خۆیان بایی بوون، بە کوشتنی ئاژەڵانە دەکوژرێن و منیش لە بەردەم حوزووری خوای گەورەدا یەخەیان دەگرم و حەقی خۆمیان بەوە لێ دەسێنمەوە کە دادگەریی خواوەند دەیانخاتە ناو "أسفل سافلین"ەوە!

دەسا ئەی ئەو بەدبەختانەی کە ئایین و دواڕۆژی خۆتان بە خاشاکی دنیا گۆڕیوەتەوە! گەر ئێوە بە ڕاستی دەتانەوێت بژین، ئەوا بە هیچ جۆرێك توخنی من مەکەون و بە نیازی خراپ دەستم بۆ درێژ مەکەن! خۆ ئەگەر هەر دەتانەوێت خراپەم لەگەڵدا بکەن، ئەوا بزانن کە بە چەندین قات تۆڵەی منتان لێ دەسێنرێتەوە.

ئەمە باش بزانن، تاکو لەرز بە جەستەتاندا بهێنێت!

من لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدم وایە کە مردنم زیاتر لە ژیانم خزمەت بە ئایین بکات. دڵنیاشم مردنی من بە وێنەی بۆمبا بە سەرتاندا دەتەقێتەوە و تەفروتووناتان دەکات!

جا ئەگەر جورئەت و ئازایەتیتان تێدایە، ئەوا دەست بهێننە ڕێم! خۆ ئەگەر ئێوە بتوانن هەر زیانێك بە من بگەیەنن، ئەوا چاك ئاگاداری ئەو تۆڵە و سزایەش بن کە چاوەڕێی دەکەن و ڕووبەڕووی دەبنەوە).

* * *

(ئەم برگەیە دادگا بە مەبەستی تاوانبار کردنم هێناویەتی، کەچی تۆمەتی "زیادەڕەوی" دەداتە پاڵ ئەوان):

لە پەیامەکاندا هەیە کە:

(مستەفا کەمال بەوپەڕی تووڕەیی‌یەوە ڕۆشتە ناو دیوانی سەرۆکایەتیی کۆماری لە ئەنقەرە و پێی وت: "لەبەر ئەوە بانگمان کردیت بۆ ئێرە تاکو بیروبۆچوونی بەرز و ڕای بەنرخمان پێشکەش بکەیت، کەچی هەر هێندەی گەیشتیتە ئێرە چەند شتێکت لەبارەی نوێژەوە نووسی و، دووبەرەکی و جیاوازیت خستە نێوانمانەوە". سەعیدیش بەرپەرچی دایەوە کە: "هەرکەسێك نوێژ نەکات خائینە و، حوکمی خائینیش وەرناگیرێت".

پاشان مستەفا کەمال جۆرە ڕازی کردن و دڵ ڕاگرتنێکی لە ئاستدا نواند و لە تووڕەبوونەکەی پاشگەز بووەوە. خۆ هەرچەندە ئەو - واتە سەعید - هەست و نەستی مستەفا کەمالی زامدار و بیرو باوەڕەکانیشی پێشێل کرد، بەڵام مستەفا کەمال هیچ شتێکی بەرامبەر نەنواند.

لە ڕاستیدا ئەوە یەکێك لە کەرامەتە درەخشانەکانی پەیامەکانی نوور و هێزێکی گەورەی دەراسایە بۆ کەسی مەعنەوی و قوتابی‌یە پێشەنگ و قارەمانەکانی ئایینەدیان کە چەندین سەرکردەی سەرسەخت لێیان بترسن، وەك لە سەعیدی کۆن دەترسان).

* * *

(ئەمەی خوارەوە برگەیەکە هەرچەندە لە بڕیارەکەدا لە دژی ئێمە هێنراوە، بەڵام دادگا بێدەنگ و بەرپرس دەکات):

لە پەیامەکاندا دەڵێت: (هەرگیز ئێمە لەگەڵ سەرکردەیەکدا نین کە بەپێی ئارەزووی خۆی فەرمانەکانی بە ناوی یاساوە دەرکرد بۆ گۆڕینی مزگەوتی "ئەیاسۆفیا" بە بتخانە و بارەگای "مەشیەخەتی ئیسلامی"ش بۆ دواناوەندی‌یەکی کچان.. ئێمە نە بە

هزر و بیر و نه لە ڕووی بابەت و نه لە ڕووی هاندەر و نه لە ڕووی ئاکامەکانەوە لەگەڵ ئەودا نین و، خۆشمان بە ناچار نازانین کە شتی وا قبووڵ بکەین).

هەروەها لە عەرزوحاڵەکەی بەرواری ١٩٤٨/٨/٢٩زدا نووسیویەتی:

(ئەم بیرەی خوارەم بە دڵدا هات:

لە کاتێکدا کە دەبوو حکوومەت بیپاراستمایە و دەستی یارمەتی و هاوکاریی بۆ درێژ بکردمایە، چونکە ئەو کارە بەرژەوەندی‌یەکی گەورەی بۆ نەتەوە و سوودێکی زۆری بۆ نیشتمان تێدایە، کەچی تەنگ پێ هەڵچنین و گوشار خستنە سەرم لە لایەن حکوومەتەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی دەستەی پەنهانی ئیلحاد، کە ماوەی چل ساڵە دژایەتیم دەکەن و، هەندێك لە تاقمی شیوعی‌یەکانیش کە ئێستا ڕۆشتوونەتە ڕیزی ئەوان، توانیویانە چەند شوێنێکی گرنگی ناوەندە ڕەسمی‌یەکان داگیر بکەن و ئێستا لەوێوە ئەو هێرشە دەکەنە سەرم و ڕووبەڕووم دەبنەوە. ئیتر حکوومەتیش یان بەمە نازانێت، یان پێی دەزانێت و بواری پێ داون)..

(ئایا چ گوناه و چ تاوانێك لەوەدا هەیە ڕەخنە لە پیاوێك بگریت و خۆشت نەوێ کە "مزگەوتی ئەیاصۆفیا"ی (کە مایەی شانازیی هەمیشەیی نەتەوەیەکی پاڵەوان و گەوهەری درەخشانی خزمەت و تێکۆشانیەتی لە پێناوی قورئاندا و دیاری‌یەکی بەنرخی شمشێری باپیرە قارەمانەکانیەتی) کرد بە خانەی بتان و، بارەگای مەشیەخەتی ئیسلامیی گۆڕی بە دواناوەندیی کچان؟).

* * *

(ئەمەی خوارەوە بەهێزترین بڕگەیە کە دادگا پێی وابوو سزا دەسەپێنێت بەسەر سەعیددا و، ئەو گوفتارەیە کە لە دادگای دەنیزلیدا سەعید ئاراستەی دوژمنە پەنهانەکانی کرد، بەڵام دادگا زۆر بە هەڵە لێی تێگەیشت و پێی وابوو لە دژی حکوومەت وتراوە و، کردی بە بیانوویەك بۆ ئەوەی سزا بدرێم):

هەندێ لەو یاسا نوێیانەی ئەم دەوڵەتەی کە ئەم یاسا شۆڕشگێڕانانەی داناوە و پیادەی کردوون، ئەو ناوی: "خۆسەپاندنی هەڕەمەکیی کافرانە" و، ڕژێمی کۆماری ناوی: "ئیستیبدادی ڕەها" و، سیستەمی فەرمانڕەوا ناوی: "مورتەدبوونی ڕەها" و، شیوعیەت و مەدەنیەتیش ناوی: "هەرزەیی ڕەها"ی لێ ناون.

* * *

(ئەمەش بڕگەیەکە لە بڕیاری دادگادا بە سەرسووڕمان و ڕێزەوە نووسراوە):

هەروەها باس لەوە دەکات کە نووسینەوەی پەیامەکانی نوور چەندین سوودی دنیایی و قیامەتیانەی هەیە، لەوانە:

١ - نووسینەوەی پەیامەکان جیهادی هەرە گرنگی مەعنەوین لە بەرامبەر گومڕایانەوە.

٢ - ئەو کەسەی کە دەیاننووسێتەوە، یارمەتیی مامۆستاکەی دەدات لە بڵاوکردنەوەی "حەقیقەت"دا.

٣ - لە ڕووی ئیمانەوە خزمەتێکە بۆ هەموو موسڵمانان.

٤ - بەدەستهێنانی زانستە لە ڕێی نووسینەوەیانەوە.

٥ - عیبادەتێکی فیکریی ئەوتۆیە کە لەوانەیە ماوەی یەك سەعاتی وەك یەك ساڵ پەرستش پاداشتی بۆ بنووسرێت.

٦ - عاقیبەت خێری و ڕۆشتنە ناو گۆڕ بە ئیمانەوە.

پێنج سوودی دنیاییشی تێدایە:

١ - بەرەکەت لە ڕۆزیدا.

٢ - دڵخۆشی و شادمانی لە دڵدا.

٣ - ئاسانی لە ژیان و گوزەراندا.

٤ - سەرکەوتن لە کاروباردا.

٥ - بەشداربوون لە دوعا تایبەتەکانی هەموو قوتابیانی نووردا، بەهۆی بەدەستهێنانی ناونیشانی "قوتابیی زانست".

لە ئایندەیەکی نزیکدا لاوانی زانکۆ لەم شتانە تێدەگەن و زانکۆ دەکەن بە قوتابخانەیەکی نوور.

* * *

(زۆر جێی سەرسامییە کە ئەم فیداکارییە بێگەردە بە تاوان دابنرێت):

(یەکێك لەو دوو پیلانەی کە مونافیقانی پشتی پەردە لە تاریکیدا هۆنیویانەتەوە: شکاندنی شان و شکۆی منە. وەك بڵێی پێیان وابێت بەم کارە نرخ و بەهای ڕووناکییە بەرزەکانی پەیامەکانی نوور لە بەرزایی خۆیانەوە دەخەنە خوارەوە.

دووهەمیان: بڵاوکردنەوەی نیگەرانی و پشێوی‌یە لەناو ڕیزەکانی قوتابیانی نووردا. وەك بڵێی بیانەوێت بەمە ڕێ لە بڵاوبوونەی پەیامەکانی نوور بگرن.

دەسا برایانم! نیگەران مەبن.. ئەو ڕاستی‌یە بەرزەی کە ملیۆنەها سەر بوونەتە سەرگەردی، ئێمەی لاوازیش سەری خۆمانی لە پێناودا بەخت دەکەین).

* * *

(ئیعتیرازیان لە یەکێکی ئەو هۆکارانە گرتووە کە هۆی ناولێنانی "پەیامەکانی نوور"ن بەو ناوە و، وتوویانە: لەناو قوتابی‌یە تایبەت و دیارەکانیدا کەس شك نابەین ناوی "نوور"ی تێدا بێت. خۆ هەرچەندە لە پەراوێزەکەدا وەڵامی ئەمەمان دایەوە، ئەوا هەریەك لە "نووری بەنەلی" و "نووری سەعاتچی" لە کەسانی تایبەت و هەڵبژاردەی ئێستای خزمەتی نوورن. بەو واتایەی کە ئەوان شتێکیان دەست ناکەوێت بۆ ئەوەی ڕەخنەی لێ بگرن، بەڵام دەست لە داوێنی چەند بڕوبیانوویەکی جوزئی و بێبایەخ گیر دەکەن):

لە پەیامی بیست و شەشەمدا باس لەوەدەکات کە:

("پەیامەکان" کە بریتین لە سی و سێ "وتە" و سی و سێ "مەکتووب" و سی و یەك "لەمعە" و سیازدە "تیشك"، لەبەر ئەوە ناونراون بە "پەیامەکانی نوور" چونکە وشەی "نوور" لە هەموو شوێنێکدا و بە درێژایی ژیانم ڕووبەڕووم بووەتەوە، کە ئەمانە هەندێکیانن:

گوندەکەم ناوی "نوورس"ە..

دایکی خوالێخۆشبووم ناوی "نووریە"یە..

مامۆستاکەم لە تەریقەتی نەقشبەندیدا ناوی "سەیید نوور محەممەد"ە..

یەکێك لە مامۆستاکانم لە تەریقەتی قادریدا ناوی "نوورەددین"ە..

یەکێك لە مامۆستاکانم لە قورئاندا ناوی "نووری"یە..

زۆربەی ئەو قوتابیانەی لەگەڵمدا دەمێننەوە ناوی "نور"یان پێوەیە.(وتوویانە: سەیر لەوەدایە لەناو قوتابی‌یە تایبەتەکانیدا کەسیان ناوی نووری نی‌یە)..

زۆربەی ئەو شتەی کتێبەکانم ڕوون و ڕووناك دەکاتەوە، نموونەهێنانەوە نوورانی‌یەکانن..

ئەو یەکەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە "ژیری" و "دڵ"م ڕووناك دەکاتەوە و "بیر"یشم بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات، بریتی‌یە لە ئایەتی:

﴿اللهُ نورُ السَّمٰوات وَالأرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكوةٍ﴾ (النور:٣٥)..

زۆربەی جار گیروگرفتەکانم لە بارەی حەقیقەتە خوایی‌یەکانەوە ناوی جوانی "النور"ی خوای گەورە بۆم شی دەکاتەوە..

ئنجا لەبەر ئەوەی زۆر موشتاقی قورئانم و خزمەتەکەشم تەنها بۆ قورئانە، ئەوا پێشەوای تایبەتیم حەزرەتی "عثمان ذوالنورین"ە، خوای لێ ڕازی بێت)!

* * *

(پەیامی "شەش هێرشەکان" و پاشکۆکەی بیست ساڵ پێش ئێستا و لە بەرامبەر دەستدرێژی‌یەکی توندوتیژی ستەمکارانەوە نووسراوە و، پەیامێکە لەوپەڕی تایبەتی و نهێنێتیدایە و، لە بەردەستی چەندین دادگای زۆردا گوزەری کردووە و، لە کاتی تووڕەبوونێکدا نووسراوە کە لە دەمی جەنگی جیهانیی دووهەمدا تووشی بووم. جا ئەو پەیامە هەروەك بە ڕاستی ئەو تووڕەبوونە دەردەخات، کەچی دەست بەسەردا گرتنی وەك ئەوەی ئێستا نووسرابێت و بە تاوان لەقەڵەم دانی لەسەر ئەم بناغەیە، لە ڕاستیدا دووری‌یەکی گەورەیە لە دادگەری‌یەوە).

پێشەکیی پاشکۆی پەیامی "شەش هێرشەکان" بەم سەرەتایە دەست پێ دەکات:

(ئەم پاشکۆیە بۆ ئەوە نووسرا کە بە جۆرێکی تایبەت دەستاودەستی پێ بکرێت و، بۆ مەبەستی خۆپاراستن لە وشەکانی سووکایەتی پێکردنی هەستی نەفرەت کە لەوانەیە لە ڕۆژگارانی ئایندەدا ئاراستەمان بکرێت. واتە بۆ ئەوەی تفی سووکایەتی پێکردنی کەسانی ئایندە بەر دەموچاومان نەکەوێت، یاخود ڕوخسارمان بسڕێتەوە کاتێ کە دەوترێت: دەك پیاوانی بێ غیرەتی ئەو سەردەمە ئەولاتر بچن!!

هەروەها وەك ڕاپۆرت و لائیحەیەکیش نووسرا، تاکو گوێی کەڕ و کاسی سەرۆکە دڕندەکانی ئەورووپای پێ بزرنگێتەوە کە لە ژێر پەردەی ڕووبەندی مرۆڤایەتی‌یەوە خۆیان مەلاس داوە و.. وەك دەرزی‌یش لە چاوی کوێری ئەو بێ ویژدانانەدا بچەقێت کە ستەمکارە غەددارەکانیان بە سەرماندا زاڵ کردووە و.. زللەیەکی چەکوش‌ئاساش بێت بۆ سەروگوێلاکی کۆیلەکانی "مەدەنییەتی دەنی" کە چەندین ئازاری وەك هی دۆزەخی

دەرخواردی مرۆڤایەتیی ئەم چەرخە دا، بە ڕادەیەك کە گرۆی مرۆڤ لە هەموو شوێنێکدا دەنگ و هاواری: "بژی دۆزەخ"ی لێ هەڵبڕیوە!

لەم ماوەیەی دواییدا لە لایەن ئەو مولحیدانەی کە لە پشت پەردەوە خۆیان مەڵاس داوە، گەلێ دەستدرێژیی نابەجێ کرایە سەر مافی ئیمانداره لاوازەکان، بە تایبەت ئەو دەستدرێژی‌یە ئاشکرایەی کردیانە سەرم و خۆیان کوتایە ناو مزگەوتە تایبەتی‌یەکەمەوە کە بۆخۆم ئاوەدانم کردبووەوە و لەگەڵ چەند کەسێکی کەمی هاوەڵە ئازیزەکانمدا نوێژمان تێدا دەکرد و بە نهێنی بانگ و قامەتمان تێدا ئەنجام دەدا..

پێمان وترا: بۆچی نوێژ بە زمانی عەرەبی دەکەن و بە نهێنیش بانگ دەدەن؟

منیش ئارامم لە لا بڕا و نەمتوانی بێ دەنگ بم..

وا ئێستا ڕووی گوفتارم ئاراستەی ئەو چەشنە کەسە دەنی و نزمانە ناکەم کە لە ویژدان بێ بەش کراون و شایانی ئەوە نین قسەیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو ڕووی گوفتارم دەکەمە ئەو سەرۆکە فیرعەونئاسایانەی سەرکردایەتی، کە بە گوێرەی هەوا و ئارەزووی ستەم و لەسنوور دەرچوونیان یاری بە چارەنووسی نەتەوە دەکەن و، پێیان دەڵێم:

ئەی ئەهلی بیدعەت و ئیلحاد!

داوای وەڵامی شەش پرسیارتان لێ دەکەم:

پرسیاری یەکەم:

هەر حکومەتێك کە هی هەر نەتەوەیەك بێت، تەنانەت هی ئەوانەش کە گۆشتی ئادەمیزاد دەخۆن، بگرە سەرۆکی هەر کۆمەڵە چەتە و چەکدارێکی دڕندەش، خاوەنی ڕێباز و چەند بنەما و دەستوورێکن کە حوکمیان پێ دەکەن..

جا ئایا ئێوە لەسەر بناغەی چ دەستوور و بنەمایەکی یاسایی خۆتان ئەم دەستدرێژی‌یە ئابڕووبەرە دەکەن؟.. پیشانمانی بدەن؟ یان ئێوە هەوا و ئارەزووی چەند کارمەندێکی بێ نرخ بە یاسا دادەنێن؟!

چونکە لە هەموو جیهاندا یاسایەك نی‌یە بوار بە خۆهەڵقورتاندن لە بەندایەتی و پەرستشێکی کەسی و تایبەتیدا بدات و، هەرگیز یاسا بۆ کاری وا دانانرێت)!

* * *

(جێی داخ و خەفەتە کە یەك دوو ڕستەی پەیامی "حەوت ئاماژەکان" بکرێت بە بیانوو بۆ دەست بەسەردا گرتنی و بەڵگەش لە دژی ئێمە. لە کاتێکدا کە پەیامێکی کۆن و تایبەت و نهێنی‌یە و، ڕاستی‌یەکی هێندە بەهێز و توندوتۆڵی لەخۆ گرتووە کە شایانی ئەوەیە لە پێناوی بەرژەوەندیی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە ناو گرۆی مرۆڤ و سەرانسەری جیهاندا بڵاو بکرێتەوە).

(نەفامترین کەسی گەوج و گەلحۆ لە دنیادا ئەو کەسەیە کە پێشکەوتن و بەختەوەریی ژیان لەو چەشنە مولحیدە هەرزانەوە چاوەڕوان بکات!

یەکێك لەو گەوجانە، کە مەنسەبێکی گرنگی هەیە، وتوویەتی:

ئێمە بۆیە دواکەوتین چونکە وتمان: "الله.. الله.." بەڵام ئەورووپا بۆیە پێشکەوت وتی: "تۆپ.. تفەنگ"!

وەڵامی ئەو چەشنە کەسانە بریتی‌یە لە "بێ دەنگی" بەپێی دەستووری: "جواب الأحمق السكوت"! بەڵام ڕووی گوفتارمان ئاراستەی ئەو خاوەن ژیری‌یە بەدبەختانە دەکەین کە شوێن ئەو جۆرە ئەحمەقانە کەوتوون و، پێیان دەڵێین:

ئەی بەدبەختینە! ئەم دنیایە میوانخانەیە..

جا مادەم مردن هەیە و، چارەنووسمان بە یەقینی بەرەو گۆڕە و، ئەم ژیانەش دەڕوات و کۆتایی پێ دێت و ژیانێکی باقی و هەمیشەیی دێتە جێ، ئەوا گەر یەك جار پێویست بێت بوترێ: "تۆپ.. تفەنگ.." دەبێ هەزار جار بوترێت: "الله.. الله").

* * *

(یەکێك لەو شتانەی مرۆڤ سەرسام دەکات ئەوەیە ڕستەیەکی بریسکەی شازدەهەمیان، کە لە بەرژەوەندیی ئێمەیە، هەڵگێڕاوەتەوە لە دژمان و، حەزی خۆیان دەربڕیوە کە دەستی بەسەردا بگیرێت).

لە بریسکەی شازدەهەمدا هاتووە کە:

(لە ڕاستیدا گیروگرفت و بەڵای جەنگیش زیانێکی زۆر لەم خزمەتە قورئانی‌یەمان دەدات..

ئەو خواوەندە بەتوانا شکۆمەندەی کە لە ماوەی یەك خولەکدا ڕووی گرژی ئاسمان لە هەور خاوێن دەکاتەوە و خۆری درەخشان لە ڕووی ئاسماندا دەردەخات، دەشتوانێت

ئەم پەڵە هەورە ڕەش و تاریك و بێبەزەییانەش بڕەوێنێتەوە و، بەوپەڕی ئاسانی و بێ هیچ زیانێکیش خۆری ڕووناکی "ڕاستییەکانی شەریعەت" دەربخات.

ئێمە لە میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە داوای ئەمە دەکەین و، لێیشی دەپاڕێینەوە کە هاتنەدیی ئەم خواستەمان گران نەخات لەسەرمان و، ژیری و فام بە مێشکی سەرکردەکان و ئیمانیش بە دڵانیان ببەخشێت. خۆ ئەمەش سەروزیادمانە و ئەو کاتەش هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا ڕاست دەبێتەوە.

دەڵێن:

مادەم ئەو شتەی بە دەستتانەوەیە "نوور"ە و گورز و کوتەکی سیاسەت نییە، نووریش موعارەزە ناکرێت و کەس لێی هەڵنایەت و ئاشکراکردنیشی زیانی بۆ هیچ کەسێك لێ نابێتەوە. ئەدی بۆچی ئامۆژگاریی هاوەڵانتان دەکەن کە وریا و بێدار بن و، ڕێیان پێ نادەیت گەلێ پەیامی ڕووناکی بەخش لە پێش چاوی هەموو خەڵکیدا دەربخەن؟!

ناوەرۆکی وەڵامی ئەم پرسیارە بە پوختی بریتییە لەوەی کە:

کەللەی زۆربەی سەرکردەکان مەستە؛ شت ناخوێننەوە. ئەگەر بیشی خوێننەوە لێی تێناگەن و واتایەکی هەڵەی لێ دەدەنەوە و، بەهانە دەدۆزنەوە و هێرش دەبەن..

لەبەر ئەمە و بۆ ڕێ نەدان بەم هێرشە، دەبێ تا ئەوان لەو مەستییە بێدار دەبنەوە و دێنەوە سەر هۆشی خۆیان، نووریان پیشان نەدرێت!

پاشان گەلێ کەسی بێ ویژدان هەن کە ئینکاریی نوور دەکەن، یاخود لەبەر چەند ئامانجێکی کەسیی تایبەت، یان لە ترسدا، یاخود لەبەر تەماع، چاو لە ئاستی ئەو نوورەدا دەنووقێنن.

لەبەر ئەمە، ئامۆژگاریی برایانم دەکەم کە: وریا بن و ئاگایان لە خۆیان بێت و، ڕاستییەکان بە هیچ کەسێك نەدەن کە شایستەیان نەبێت، دەنا بەو کارەیان شك و گومانی ئەهلی دنیا لە خۆیان دەورووژێنن).

* * *

(پۆشتەیی فەرمانی قورئانی پیرۆزە و، لە نامەکاندا وەڵامی تێروتەسەل لەبارەیەوە دراوەتەوە. دەبێ بیشزانرێت کە ئەو پەیامە زوو نووسراوە و سزامان لەسەر چەشتووە. کەچی سەرباری ئەوە، بە تاوانێکی ئێمەیان لەقەڵەم داوە و کراوە بە بەڵگە لە دژمان.. پاشان سەرەتای ڕاستییەکی مەزن کە لە پەیامی "پیران" و "ڕابەری لاوان"دا هاتووە و، ڕاستییەکی بەنرخ و سوودبەخشە بۆ هەموو کەسێك، بە تاوانێکی ئێمەیان داناوە و کردوویانە بە بیانووی دەست بەسەردا گرتنی ئەو پەیامە. هەموو ئەمانە دەیسەلمێنن کە هیچیان دەست ناکەوێت مایەی گازندە و زامدارکردن بێت).

لە بریسکەی بیست و چوارەمدا و، دوای ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە "پۆشتەیی" فەرمانێکی قورئانی پیرۆزە، وتوویەتی:

(بیستمان کە: ژنی پیاوێکی پلەوپایە بەرزی دنیایی، شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی جەستەی بە دەرەوە بووە و، بۆیاخچییەکی پێڵاویش بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕۆشنا و لە ناوجەرگەی ئەنقەرەی پایتەختدا پەلاماری داوە! جا ئایا ئەم ڕووداوە "نارەوایە" زللەیەکی توندوتیژ نییە لەسەر ڕووی دوژمنانی داوێن پاکی و پۆشتەیی، لەوانەی کە هیچ ئاگایەکیان لە واتا و ناوەرۆکی شەرم و حەیا نییە؟!).

لە بریسکەی بیست و شەشەمی تایبەت بە پیرانەوە وتوویەتی:

(لە ڕۆژێکی کۆتایی پایزدا ڕۆشتمە سەر لوتکەی قەڵاکەی ئەنقەرە، کە لە من گەلێ زیاتر دووچاری پیری و پرتووکان بووبوو! لەوێ ئەو قەڵایەم وەك ڕووداوە مێژووییە بەردبووەکان هاتە بەرچاو!

جا بەهۆی پیربوونی ساڵ لە وەرزی پایزدا و، پیریی خۆم و، پیریی قەڵاکە و، پیریی مرۆڤایەتی و، پیریی دەوڵەتی مەزنی عوسمانی و، مردنی خەلافەت و، پیربوونی دنیا بە گشتی، خەفەتێکی زۆر و خەمێکی قووڵ، ناخی دەروونمی گرتەوە..

ئەو حاڵەتە، ناچاری کردم کە لەسەر لوتکەی ئەو قەڵایەوە چاو بەناو بەرزاییەکانی ئاییندە و شیو و دۆڵەکانی ڕابوردوودا بگێڕم.

ئەوەبوو ڕابوردوو لە بریی ئەوەی دڵم بداتەوە و نوورێکم پێ ببەخشێت، کەچی ئەوەندەی تر بێزاری کردم و دڵی داگرتم!

ئایندەشم لە شێوەی گۆڕستانێکی گەورە و تاریکی خۆم و هاوچەشنەکانم و نەوەکانی داهاتوودا هاتە بەرچاو! بۆیە ئەم لایەش لە بریی ئەوەی بێزاریم نەهێڵێت، تووشی سەرسامیی کردم!

پاشان سەیرێکی کاتی "ئێستا"م کرد. یەکسەر لەبەر چاوی شەکەت و ڕوانینی مێژوویمدا ئەم کاتەم لە شێوەی تابووتی تەرمی جەستەی شپرز و پەرێشانمدا هاتە پێش‌چاو کە بە وێنەی سەربڕاوێك وابێت لە نێوان ژیان و مردندا)!

* * *

(دەبوو ڕێزی شایانیان لەم ڕستەیە بگرتایە، کەچی ڕەخنەیان لێ گرت و کردیان بە بەڵگەیەك لە دژمان):

باس لەوە دەکات کە:

(بەشێکی زۆری ئەو مووچەیەم خەرج کرد کە لە "دار الحكمـــة الإسلامية" وەرم دەگرت و، بەشێکی کەمیشیم لێ پاشەکەوت کرد بە نیازی بەجێهێنانی فەرزی حەج. هەر ئەو پارە کەمە، بەهۆی بەرەکەتی قەناعەت و دەست پێوەگرتنەوە بەشی کردم و ئاوی ڕووم نەتکا. ئێستاش پاشماوەی بەپیتی ئەو پارەیە هەر ماوە).

پاشان لە بریسکەی بیست و دووهەمدا، دوای ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نامەیەکی نهێنیی تایبەتە بە برا ڕاست و دڵسۆزەکانیەوە، دەڵێت:

(ئاماژەی یەکەم: بۆچی ئەهلی دنیا هەرکات دەرفەتیان بۆ برەخسێت خۆیان لە کاروباری قیامەتیی تۆدا هەڵدەقورتێنن، لە کاتێکدا کە تۆ دەست لە ئیشوکاری دنیای ئەوان وەرنادەیت؟

وەڵام: ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە حکوومەتی پارێزگای ئیسپارتە و خەڵکەکەیەتی).

* * *

(ئەو کەسانەی کە ئەم هیوا بێگەرد و حەزە خاوێنەی کە لە شەفەقەتی ئیمانەوە سەرچاوەی گرتووە و شایانی ڕێزە، بە تاوانێکی ئێمەی دادەنێن، خۆیان تاوانبارن).

لە نامەیەکدا کە ئیمزای سەعیدی پێوەیە باس لەوە دەکرێت کە:

(چ حیکمەتێك لەوەدا هەیە منالآنی بێتاوانی تەمەن حەوت تا دە ساڵ هەر هێندەی هەست دەکەن کە من بە عارەبانەی ئەسپەکە دەگەڕێم، خێرا ڕادەکەن بۆ لام و دەورەم دەدەن؟ من لە بەردەم ئەم دیمەنەدا سەرم سوور دەما. بەڵام دوایی ختوورەیەکم بە دڵدا هات و تێگەیشتم کە ئەو منالە بێتاوانانە لە ڕێی هەستی پێش ڕوودانەوە هەستیان بەوە کردووە کە لە ئاییندەدا بەهۆی پەیامەکانی نوورەوە بەختەوەری بەدەست دەهێنن و لە چەندین مەترسیی لەناوبەری مەعنەوی ڕزگاریان دەبێت کە دێنە ڕێیان).

* * *

(بە تاوان دانانی ئەم بڕگەیەی خوارەوە، کە لە پێشدا وەك بەرگرییەکی من وابوو، بەڵام لە دواییدا بە حەز و ئاواتێکی من دانرا، ئەوپەڕی ستەم و دوور لە ویژدانییە):

باسی ئەوە دەکات کە:

(بەشێکی ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکان پێکەوە ئاماژە بۆ ڕاستییەکی نوورانی دەکەن لەم چەرخەدا و، ئەو موجەددیدە هەرە مەزنە ئاشکرا دەکەن کە لە ئاخر زەماندا دێت و، گرنگترینی سێ ئەرکەکانی ئەستۆی دەردەخەن کە ڕزگارکردنی ئیمانە). هەروەها باسی ئەوە دەکات کە: (زیندووکردنەوەی شەریعەت و خەلافەت و کارمەندییە گەورەکانی وەك ئەمانە کە بازنەیەکی یەکجار فراوان دەگرنەوە، باس نەکردنیان زیانی تێدا نییە، چونکە ئەو باسانە ڕێگا بۆ ڕەخنەی نەیارەکان و هێرشی سیاسییەکان خۆش دەکەن). بۆیە هەندێ ڕستە لادەبات و ڕاستیان دەکاتەوە و دوایی دەیاننێرێتەوە بۆ برا وردەکارەکانی.

هەروەها لە نامەیەکدا بە ئیمزای سەعید ئەمەی خوارەوە هاتووە:

(هەردوو ئایەتی پیرۆزی : ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً﴾ (الفتح:١) و ﴿وَيَنْصُرَكَ اللَّهُ نَصْراً عَزِيزاً﴾ (الفتح:٣) کە لەسەر دەرگای دەرەوەی تەلاری وەزارەتی بەرگری (کە ئێستا کراوە بە زانکۆ) نووسراون، ماوەیەکی پێشتر بە مەرمەڕ داپۆشران، بەڵام ئێستا کە دەرخراونەتەوە و ئاشکرا کراون بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بوار بە نووسین و بەکارهێنانی پیتە قورئانییەکان دەدرێت و، هۆکارێکە بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی

پەیامەکانی نوور لـە بـەکارهێنانی ئـەو پیتـە قورئانی‌یانـە و ئاماژەیـە بـۆ گۆڕانـی زانکـۆ بـە قوتابخانەیەکی نوور).

* * *

(وەڵامی دەموتکەر بۆ ئەو ڕەخنەیەی لەسەر ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستی‌یە نووسیومە کە تایبەتە بە پەیامی "الله أکبری حاجیان"ەوە. وەڵامی دەمکوتکـەر و قەناعەت بەخش ئەو پەراوێزەیە کە خەسرەو دایناوە).

لە پەیامێکدا بە ناوی: "الله أکبری حاجیان" کە ئیمزای سەعیدی نوورسیی لەسـەرە، دەڵێت:

(بەشێك لەو قـوتابیـانەی نوور کـە شـوێنیان دیـارە و گرنگی‌یـان هەیـە، پێیـان وایـە و سووریشن لەسەر ئەم بۆچوونەیان کە تۆ ئەو ڕابەرە هەرە مەزنەی ئالی بەیتیت کە لە ئـاخر زەمـاندا دێـت و، هەرچـەندە خـۆت لەمـە بپـارێزیت ئـەوان زیـاتر لەسـەر بۆچوونەکـەیان سوور دەبن. تۆش لە لایەنی خۆتەوە لەسـەر نەویستنی بیر و بۆچوونەکەی ئەوان سـوور دەبیت و بـە زۆری خـۆتی لـێ دەپـارێزیت. دیـارە ئـەم دوو هـەڵوێسـتەش پێچـەوانەی یەکترن و، داوای ڕوونکردنەوەی ئەم دوو دژە هەڵوێستە لە بەرێزتان دەکەین).

پاشان لە دوای پرسیارەکەیان، دەڵێت:

ئـەو کەسێتی‌یە مەعنەوی‌یـەی کـە نوێنـەری کەسـی مەعنـەویی "مـەهدی" ئـالی بـەیتی پێغەمبەرە ﷺ، سێ کارمـەندیی لـە ئەستۆدایە؛ گرنگترینیـان ڕزگـارکردنی ئیمانـە، پاش ئەوە زیندووکردنەوەی شەعائیرەکانی ئیسلامە بە ناوی خەلافەتی محەممەدی‌یـەوە. جا ئـەو کەسـە بەهۆی لەکارکـەوتنی زۆرێـك لـە فەرمانەکانی قورئـان و یاسـاکانی شـەریعەتی محەممەدی بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گرنگە تێدەکۆشێت.

"قوتابیانی نوور" پێیان وایە ئەنجامدانی ئـەم ئەرکـەی یەکـەم بـە تـەواوەتی لـە ئەستۆی "پەیامـەکانی نـوور"دایـە و، کارمـەندیی دووهـەم و سـێ‌هەم لـەچاو ئـەم کارمەندی‌یـەدا بەلایانەوە دێنە پلەی دووهەم و سێ‌هەم. هـەر لەبەر ئەوەشـە کـە وەك جـۆرە مەهدی‌یـەك دەڕواننـە کەسـی مەعنـەویی پەیامـەکانی نـوور و، هـەندێ جـاریش ئـەم نـاوە بـەم لاوازە دەستەوسانە دەبەخشن لەبەر ئەوەی پێیان وایە کە نوێنـەری ئـەو کەسایەتی‌یە مەعنەوی‌یـە بێـت.تەنانـەت هـەندێ لـە ئـەولیایانی پێشـین لـە کەرامەتـە غەیبی‌یـەکانیاندا پەیامـەکانی

نووریان بە مەهدی و ڕابەری ئاخر زەمان بینیوە و، دەڵێن: ئەمە بە لێکۆڵینەوە و تەئویل دەردەکەوێت. واتە ئالۆزی لە دوو خاڵدا هەیە و پێویست بە تەئویل دەکات:

یەکەمیان: دوو کارمەندییەکەی دوای ئەمە (واتە دووهەم و سێهەم) هەرچەند لە گۆشەی ڕوانینی حەقیقەتەوە هێندەی کارمەندیی یەکەم گرنگ نین! بەڵام خەلافەتی محەممەدی و یەکێتیی ئیسلامی، لەبەر چاوی خەڵکیدا هەزار جار لە کارمەندیی یەکەم فراوانترە، بە تایبەت بەلای عەوامەکان و ئەهلی سیاسەتەوە، بە تایبەتتر بەلای بیر و بۆچوونەکانی ئەم چەرخەوە.

خۆ هەرچەند گەلێ ڕێنوێن و ڕابەر لە هەموو چەرخێکدا هاتوون و لەمەولاش دێن، بەڵام هیچ کامیان نازناوی ئەو مەهدییە گەورەیە لەخۆی نانێت کە لە ئاخر زەماندا دێت، چونکە ئەو کەسە هەر تەنها یەکێك لەو سێ ئەرکەی لە شوێنێکدا پێ ئەنجام دەدرێت!!

دووهەمیان: ئەو کەسە مەزنەی کە لە ئاخر زەماندا دێت لە ئالی بەیت دەبێت. خۆ هەرچەند لەو ڕووەوە کە من وەك کوڕێکی مەعنەویی حەزرەتی عەلی - خوا لێی ڕازی بێت - وام و دەرسی حەقیقەتم لەلا خوێندووە و، یەکێك لە واتاکانی "ئالی محەممەد ﷺ" شموولی قوتابییە ڕاستەقینەکانی نوور دەکات و، دەکرێت لەم ڕووەوە لە ئالی بەیت دابنرێم، بەڵام ڕێبازی نوور بە هیچ جۆرێك بوار بە حەزکردن لە خۆویستی و خۆدەرخستن نادات و، بە دوای پلەوپایەی بەرزدا ناگەڕێت و، جێی بەدەستهێنانی شەرەفمەندی و ناوبانگی تێدا نابێتەوە، تەنانەت گەر چەندین پلەی بەرزی سەر بە قیامەتیشم بدرێتێ، هەر خۆم بە ناچار دەزانم کە واز لە هەموویان بهێنم، تاکو ئەو ئیخلاسە زامدار نەکەم کە لە ڕێبازی نووردا هەیە).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وەڵامەکەی بۆنی ئەوەی لێ دێت ڕەزامەندییەکی جوزئی لە بابەتەکە دەردەبڕێت، چونکە وەڵامدانەوەیەکی یەکلاییکەر و گەرموگوڕ بۆ ئەم مەسەلەی "مەهدیەت"ە ناداتەوە[1].

* * *

(١) ئەی دەستەی بێویژدانی دادگا! هێشتا دوای ئەمە ئایا دەبێ وەڵامی یەکلاییکەرەوە چۆن بێت؟ (بە ناوی قوتابیانی نوورەوە: خەسرەو)

(ئەم ڕووداوانەی کە لەم بڕگەیەدا باس کراون هەر لە ڕاستیدا و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر ڕوویان داوە، چونکە ڕوودانی بوومەلەرزە تەنها سێ خولەك لە دوای ئەو قسەیەم کە وتم: "خەفەتم مەدەنێ دەنا زەوی لێتان تووڕە دەبێت" دەبوو بە پێی داخوازیی شەفەقەت مەسەلەکەیان بە هەند وەربگرتایە و هەلوێستەکەیان پێ جوان بوایە، چونکە شتێك نییە مایەی ڕەخنە و ئیعتیراز لێگرتن بێت).

(دە سەعات دوای وەرگرتنی ئیفادەکەی کە چوار سەعاتی خایاند و، لە ژێر گوشاردا دەتلایەوە، ئاگر لە فەرمانگەی پەروەردە کەوتەوە، تەنانەت دەتوت لە هەمان کاتدایە. ئەم ڕووداوەش ئەوەی دەرخست کە "پەیامەکانی نوور" هۆی دوورخستنەوەی بەلا و موسیبەتەکانن، بە چەشنێ کە هەر ئەوەندەی هێرشیان بکرێتە سەر بەلاکان یەکسەری دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت و دادەبەزن).

لە نامەی ژمارە سەد و چل و یەکیشدا:

(دوای وەرگرتنی ئیفادەکەی کە چوار سەعات و نیوی خایاند، باسی ڕووداوەکانی ئاگرکەوتنەوە دەکات کە لە فەرمانگەی پەروەردەی "ئەنقەرە" و، گەراجی ئوتومبیلەکان و، کارگەیەکی "ئیزمیر" و، بالەخانەیەکی گەورەی "ئەدەنە" ڕوویان دا. پاشان دەڵێ: " لە پەیامەکانی نوور بێبەشم مەکەن، دەنا زیانێکی گەورە لە من و لەم نیشتمانەش دەکەوێت، چونکە زەوی بە بوومەلەرزە تووڕەیی و ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت". هەر تەنها سێ خولەك دوای ئەم وتەیە بوومەلەرزە ڕووی دا و سێ چرکەی خایاند و ڕقی زەویی دەرخست و، لە کاتی هێرش کردندا بۆ سەر پەیام و قوتابیانی نوور ئاگر لە فەرماندەی پەروەردەش بەربوو. ئەوەش بە تەواوی بۆ دادگا چەسپا کە ڕوودانی بوومەلەرزەکان و ئاگرکەوتنەوە هەردەم هاوکاتن لەگەڵ هێرش کردندا بۆ سەر پەیامەکانی نوور. جا ئەم چەشنە ڕووداوانە هەرگیز ناگونجێ کاری ڕێکەوت بن.

بێ هیچ گومانێك پەیامەکانی نوور بوون بەهۆی دوورخستنەوەی گەلێ بەلا و گیروگرفت لەم ولاتە. ڕووداوی زۆر هەن شایەتن لەسەر ئەم ڕاستییە).

لە نامەی ژمارە سەد و چل و حەوتدا دەڵێت:

(لەو کاتەدا کە هێرش کرایە سەرمان، زستان گەلێ تووڕە بوو، تەنانەت هەوا ڕق و تووڕەیی خۆی بە زریان و سەرما و سۆڵەی سەخت دەربڕی. بەڵام هەرکات هێرش بۆ

سەر پەیامەکان و قوتابیانی نوور دەوەستێت ئەوا دڵخۆشی و شادمانیی قوتابیانی نوور ئەو زریانە سەختانە دەگۆڕێت بە ڕۆژانی گەشی بەهار.

ئەو ئاگرەی کە لە فەرمانگەی پەروەردە کەوتەوە زڵلەیەکی بەهێزە).

* * *

(ئەو حاڵەتەی کە مایەی پیرۆزبایی لێ کردنە، نابێ بە چاوی ڕەخنەوە سەیر بکرێت):

(ئەم جارە لە دادگا لە ناوەندی چەند پرسیارێکی نابەجێدا لێیان پرسیم: بەچی دەژییت؟ وتم: بە پیت و بەرەکەتی دەست پێوە گرتن، ئەو کەسەی کە مانگی ڕەمەزان لە ئیسپارتە بە یەك دانە نان و یەك کیلۆ شیر و یەك کیلۆ برنج بژی، هەرگیز لەبەر هەموو ژیانی دنیا تەنازول بۆ هیچ شتێك ناکات و ناچار نابێت دیاریی خەڵکی وەربگرێت).

* * *

(ستایشە درەخشانەکەی زوبەیر[1] و بەرگرییەکەی کە لە بەردەم دادگادا خوێندیەوە، پشت بەخوا بەرەو تەقدیر و ڕێزلێنان دەیانبات، بە ڕادەیەك کە بە سەرسووڕمانەوە لەناو بڕیارەکەدا دایان ناوە).

ئەوەی کە زوبەیر بە ناونیشانی (لاوەکانمان زانست و ڕەوشتێکی بەرزی وایان دەوێت کە ڕاستی و حەقیقەتیان فێر بکات) و لە فۆرمێکدا بە ئامێری چاپی دەستی چاپ کراوە، لە لاپەڕەی دەهەمیدا دەڵێت:

(پەیامەکانی نوور کە موسڵمانانی سەدەی بیستەم و سەرجەمی مرۆڤایەتی لە تاریکیی بیروباوەڕە نارەوا و ڕەش و تاریکەکان دەپارێزن، هەرگیز زادەی بیری نووسەرەکەیان نین، بەڵکو ئیلهامێکن پەروەردگاری هەموو جیهانەکان خستوونیەتە دڵی دانەرەوە. کەواتە چەند پەیامێکی بەرز و بەنرخن).

---

(١) زوبەیر گوندوزئالب (١٩٢٠-١٩٧١ز) خەڵکی یەکێکە لە قەزاکانی سەر بە پارێزگەی "قۆنیا". دوای تەواوکردنی خوێندنی ناوەندی لە فەرمانگەی تەلگراف دامەزراوە. پاشان خۆی بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە بەخشیوە. نموونەی ئیخلاس و لێبڕان بووە، بە ڕادەیەك کە نزیکترین قوتابیانی نوور بووە لە مامۆستا نوورسییەوە. دوای کۆچی دوایی مامۆستا نوورسی سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی قوتابیانی نووری لە ئەستۆدا بووە. کتێبێکی داناوە لە بواری پاکسازی و لێپرسینەوەی دەروون و بەهێزکردنی ویستی مرۆڤدا. (وەرگێڕ)

لە لاپەڕە دوازدەیدا هاتووە:

(ئەگەر بە قوتابییەك كە لە بواری پەیامەكانی نووردا كار دەكات بوترێ: لە بریی پەیامەكانی نوور ئەم كتێبانەی تر بنووسەرەوە و لە بەرامبەریەوە سەروەت و سامانی "فۆرد"ت دەدەمێ، ئەوا پێش ئەوەی نووكی قەڵەمەكەی لە نووسینەوەی پەیامەكان بەرز بكاتەوە لە وەڵامدا دەڵێت: ئەگەر سامان و دەسەڵاتی سەرانسەری دنیاشم بدەنێ شتی لەو جۆرە قبووڵ ناكەم)!

لە لاپەڕە پازدەشدا دەڵێت:

(ئەگەر پلەی پەیوەندیمان بە نووسەرانی خاوەن بیر و هزری خاوێنەوە سەد پلە بێت، ئەوا پلەی پەیوەندیمان بە كەسایەتییەكی مەزنی وەك بەدیعوززەمانەوە كە بۆ بەختەوەریی دنیا و قیامەت ڕێنمایی كردووین، بلیۆنەها بلیۆنە. بەڵكو بێ كۆتاییە).

لە لاپەڕەی دوازدە هەمدا هاتووە كە:

(كەسی مەعنەویی پەیامەكانی نوور نەخۆشییە كۆمەڵایەتی و ڕۆحی و ئایینییەكانی ئەم سەردەمەی دەستنیشان كردووە و، بە چاودێریی خوای گەورە دەرمان و چارەسەری ئەوتۆشی لە سەرچاوەی ڕاستییەكانی قورئانەوە پێش چاوی مرۆڤی سەردەم خستووە كە لە نەخۆشییە سەخت و درێژخایەنەكانی چاكی بكاتەوە و برینی سارێژ بكات).

لە لاپەڕەی چل و چوارەمدا هاتووە كە:

(بەدیعوززەمان دەڵێت: "هەركەسێك بۆ ماوەی ساڵێك ئەم پەیامانە بخوێنێتەوە دەگونجێ ببێت بە زانایەكی مەزن لەم زەمانەدا". بەڵێ، ڕاستە هەروەهایە).

لە لاپەڕەی پەنجا و چوارەمدا هاتووە:

(ئەو دادوەرانەی كە پەیامەكانی نووریان خوێندووەتەوە، چاوەڕوانی دەركردنی بڕیاری نادروستیان لێ ناكرێت).

* * *

# بۆ سەرۆکایەتیی دادگای تەمییز

**لەو دانیشتنەی دادگای تەمییزدا کە (بۆ مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارە ستەمکارانەکەی دادگای "ئافیوون " سەبارەت بە ئێمە) بەنامان بۆ برد، هیچ بوارێکی قسە کردنیان پێ نەدام، بەڵکو تۆمەتێکی تری سێهەمیان بەسەردا خوێندەوە کە بە زبری و توندوتیژی دارێژرابوو، تەنانەت نەیانهێشت هیچ کەسێك لە نووسینەوەدا یارمەتیم بدات. ئنجا وێڕای ناخۆشیی خەتەکەم، لەو کاتەدا نەخۆشیش بووم. جا ئەم سکاڵایەی کە بەدەم نەخۆشییەوە نووسیومە وەك لائیحەیەکی تەمییز پێشکەشی مەقامی بەرێزتانی دەکەم کە تا ئێستا دوو جار بە تەواوی ویژدانی لەگەڵدا بەکارهێناوم.**

باسمه سبحانه

ئەمە عەرزوحاڵێکە پێشکەشی دادگای هەرە مەزنی حەشری دەکەم و بۆ مەقامی خوای گەورەی بەرز دەکەمەوە، با دادگای تەمییزی ئێستا و نەوەکانی داهاتوش بیبیستن و، بەرگوێی مامۆستایانی زانکۆ و قوتابیی‌یە ڕۆشنبیرەکانیشی بکەوێت. وا لە نێوان سەدان بەلاّ و گیروگرفتدا کە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا ڕووبەڕووی بوومەتەوە تەنها (دە) دانەیان هەڵدەبژێرم، بۆ ئەوەی وەك سکالاّیەك بیانخەمە پێش چاوی دادگەریی مەقامی خوای گەورەی شکۆمەند و دادوەری ڕەها.

**یەکەم:**

هەرچەندە من لە خۆمدا کەسێکی خاوەن کەموکووڕی و ناتەواویم، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ژیانی خۆم بۆ بەختەوەریی ئەم نەتەوەیە و ڕزگارکردنی ئیمانەکەی تەرخان کردووەو، بە هەموو توانایەکم هەوڵم داوە کار بۆ پەیامەکانی نوور بکەم، تاکو خۆم بکەم بە قوربانیی ڕاستی‌یەك کە هەزاران کەس خۆیان لە ڕێیدا بەخت کردووە، کە ڕاستیی قورئانی پیرۆزە. هەر لەم ڕێیەشدا و بە پشتگیری و فەزلّی خوای گەورە

توانیومە هەموو جۆرێکی ئازاردان و ئەشکەنجە هەڵبگرم و، بە هیـچ جۆرێـك پاشەکشێم نەکردووە و بەرەو دواوە نەگەڕاومەتەوە.

وا تەنـها یـەك نموونـە دەهێنمـەوە بۆ ئـەو ڕەفتـاری غـەدر و سـتەمکاری‌یەی کـە لـە بەندیخانەی "ئافیوون" و دادگاکەیدا ڕووبەڕووی بوومەوە:

هەرچەند ئەوان سێ جار لائیحەی تاوانبارکردنەکەیان - کە پڕیان کردبوو لە تۆمەتی ناڕەوا و دەمهەڵبەست - دا بە گوێی من و قوتابیانی بێ تـاوانی نووردا (کە چاوەڕوانیی دڵدانەوەیان دەکرد لە دادگـەریی دادگـا) و، هـەموو جـارێکیش خوێندنـەوەی لائیحەکە بـەلای کەمـەوە دوو سـەعاتی دەخایـاند، کـەچی تەنـها بـواری یـەك دوو خولـەکی قسەکردنیان پێ دام، لـە کـاتێکدا کە تکـام لـێ کـردن مـاوەی دە خولـەك یـان چارەکە سەعاتێکم بدەنێ بۆ بەرگری کردن لە مافەکانمان.

وێڕای ئەوەی کە ماوەی بیسـت مـانگ لـە زیندانێکی تاکـە کەسیدا بـە دابڕاوی لـە خەڵك مامەوە، ئەوان ڕێیان نەدا کەس سەردانم بکات، دوو سێ هـاوڕێ نـەبێت، ئـەویش تەنـها بۆ مـاوەی سێ چـوار سـەعات! ئـەم سـەردانەش یارمەتی‌یـەکی جوزئیـی دام بـۆ نووسینەوەی بەرگری‌یەکـەم. دوایـی ڕێیـان لـەوانیش گـرت و مامەڵەیـەکی توندیـان لەگەڵدا نوانـدن و سزایشیان دان! هـەروەك ناچاریـان کـردین گـوێ لـە خوێندنـەوەی لائیحەی تۆمەتبارکردنەکەی داواکاری گشتی بگرین کە پازدە لاپـەڕە دەبێـت و پڕی کـردووە لـە درۆودەلەسـەی ڕق لـە دڵانـە و قسـەی دەمهەڵبەسـت و تێگەیشـتنی هەڵـە و خراپ. تەنانەت من هەشتا و یەك دانە هەڵەم لـەو لائیحەیـەدا دەستنیشـان کـرد. بـواری قسە و بەرپەرچدانەوەشیان پێ نەداین، خۆ ئەگەر ڕێی قسەیان بدامایە، پێم دەوتن:

ئێوە ئینکـاریی ئـایینی خۆتـان و سـووکایەتیش بـە باپیرانتـان دەکـەن، لـەو ڕووەوە کـە پێتـان وایـە لەسـەر گومڕایـی بـوون. هـەروەك نکـوولی لـە پێغەمبەرەکـەتان ﷺ دەکـەن و یاساکانی قورئانی پیرۆزتان پێ قبووڵ نی‌یـە. کـەچی لـە هـەمان کـاتدا و لـە ژێـر دروشمـی ئازادیی بیر و سەربەستی ویژداندا دەست ناهێننە ڕێی مەجووس و جوولەکـە و گـاوران و مونافیقانی مورتەددی ئاژاوەچی لە پشتگیرانی بەلشەفی‌یەکان.

حکوومەتی بـەریتانیا، کـە هـەموومان ڕادەی دەمارگیریی بـۆ نەصرانیـەت و مـەودای لووت بەرزیی دەزانین، هەموو کاتێك ڕێ بە ملیۆنەها موسـڵمانی ژێـر دەستەڵاتی خـۆی دەدات کـە قورئـان بخوێننـەوە و وانـەی لـێ وەربگـرن، ئـەو وانانـەی کـە بەرپـەرچی سەرجەمی بیروباوەڕە ناڕەوا و دەستوورە کافرەکانی ئینگلیز دەدەنەوە..

پاشان نەیارەکانی هەموو حکوومەتێك دەتوانن بە ئاشکرا ڕا و بۆچوونەکانی خۆیان دەربېڕن و بڵاویشیان بکەنەوە، بێ ئەوەی دادگاکانی ئەو حکوومەتانەش کاریان بەسەریانەوە بێت..

کەچی سەبارەت بە من، وردەکاریان لەسەر چل ساڵی ژیانم و سەد و سی دانە لە کتێبەکانم و سەرجەم نامەکانم، تەنانەت نهێنییەکانیشیان، لە دادگای "ئیسپارتە" و دادگای "دەنیزلی" و دادگای جەزای "ئەنقەرە" و لە سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینیشدا بە ئەنجام گەیاند. هەروەك دادگای تەمییزیش دوو جار، لەوانەیە سێ جاریش، ئەو لێکۆڵینەوە و وردەکارییە ناوبراوەی کرد و، نوسخە تایبەتی و نا تایبەتییەکانی پەیامەکانی نووریان نزیکەی سێ ساڵ لە لا مایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شتێکیان تێدا نەدۆزییەوە کە مایەی هیچ سزایەکی تەنانەت بچووکیش بێت.

جا من دەپرسم: ئایا ئەو گوناهە چییە کە ئێمە کردوومانە هەتا سزایەکی ئاوا سەختمان بدەن و لە زیندانی تاکە کەسیدا بەندمان بکەن، لە کاتێکدا کە من بەم ڕادەیە لاوازم و لەم بارودۆخە دژوارەی ژێر دەستی زۆرداری و ستەمدام؟ ئایا چ یاسایەك یان چ بەرژەوەندی و ویژدانێك بەمە ڕازی دەبێت؟ لە کاتێکدا کە پەیامەکانی نوور (کە ئێستا سەرجەمەکەیتان بە تەواوی لە بەردەستدایە) بووە بە ڕابەرێکی بەهێز و ڕاستی زیاتر لە دووسەد هەزار قوتابیی نووری ڕاستەقینە کە ئامادەن بۆ قوربانی و خۆ بەخت کردن و، بەمەش خزمەتێکم پێشکەش بە ئاسایش و ئارامیی وڵات کردووە. پاشان ئەو بەرگرییەی پێشکەشم کرد و چوارسەد لاپەڕە دەبێت، بە جۆرێکی بێ گومان بێ تاوانیی ئێمەی سەلماند. بۆیە هەر ئەم پرسیارانەتان - بە بێ گومانی - لە بەردەم دادگای هەرە گەورەی ڕۆژی حەشردا لێ دەکرێت.

**دووهەم:**

ئەو تەفسیرەم کە بۆ چەند ئایەتێکی ڕاشکاوی قورئانی پیرۆز نووسیومە سەبارەت بە "پۆشتەیی" و "میرات" و "یادی خوا" و "فرەژنی" و، بەرپەرچدانەوەم بۆ ئەو ڕەخنە و بەهانە و بیانووانەی کە لە لایەن شارستانێتیی نوێی خۆرئاواوە لە دژیان وروژێنراوە.. ئەمانەیان بە هەندێ لەو تۆمەتانە داناوە کە ئاراستەیان کردووم.

وا لێرەشدا هەمان بڕگە دووپات دەکەمەوە کە پێش پازدە ساڵ لە دادگای "ئەسکی شەهر" و پاشان لە دادگای تەمیزی "ئەنقەرە"دا وتوومە و، هەر ئەم بڕگەیە سکاڵای منە لە دادگای حەشری هەرە مەزندا و، وریاکردنەوەشە بۆ کۆمەڵانی ڕۆشنبیری ئایندە و،

لەگەڵ پەیامی "الحجة الزهراء"دا دەبێت بە لائیحەیەکی تەمییز. هەروەك هەمان برگە بۆ ئەو داواکارە گشتییە دووپات دەکەمەوە کە هەڵی قسەکردنی بۆ نەڕەخساندم و هەشتا دانە هەڵەشم لەو لائیحەی ئیتیهامەیدا چەسپاند کە پڕی کردبوو لە قسەی هەڵە و لەخشتەبردن. جارێکی تریش دەیخەمەوە پێش چاوی ئەو دادگایەی کە بڕیاری دوو ساڵی زیندانی تاکەکەسیی سەخت و دوو ساڵیش نەفی و دەست بەسەریی لەسەر دەرکردم:

(منیش بە دادگای بەڕێزی وەزارەتی دادگەری دەڵێم:

تاوانبارکردنی کەسێك کە بەرزترین و پیرۆزترین دەستووری خوایی تەفسیر دەکات، ئەو دەستوورەی کە حەقی ڕاستەقینەیە و لە هەموو سەردەمێکدا و لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتی‌یاندا پرس و ڕایان پێ‌یەتی و ڕەفتاری پێ دەکەن.. ئەو کەسەی کە لە تەفسیرەکەیدا پشت بەو شتانە دەبەستێت کە سێ‌سەد و پەنجا هەزار تەفسیرنووس تیایاندا یەکیان گرتووە و سەلماندوویانە و، شوێن ئەو بیروباوەڕە کەوتووە کە باپیرانی پێشوومان لە ماوەی هەزار و سێ‌سەد و پەنجا ساڵدا باوەڕیان پێی بووە.. تاوانبارکردنی ئەم تەفسیرنووسە، بڕیارێکی ستەمکارانەیە و، بێ هیچ گومانێك دادگەری - ئەگەر لە ڕووی زەویدا هەبێت - ڕەفزی دەکات و دەست بە ڕووی ئەو بڕیارەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە).

هەروەها با گوێ کەڕەکانی سەردەمی ئێستاشمان ئەمە ببیستن!

ئایا تاوانبارکردنی کەسێکی ئاوا کە وازی لە سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایەتی هێناوە و، لە ڕووی فیکری و زانستی‌یەوە باوەڕی بە هەندێ لەو یاسا بیانی‌یانە نی‌یە کە بە هۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە لەم وڵاتەدا قبووڵ کران، ئایا ئیدانە کردنی کەسێکی ئاوا لەبەر ئەوەی تەفسیری ئەو ئایەتانەی کردووە، بە ئینکاریی ئەوان بۆ ئیسلام و بە خیانەت کردن دانانرێت بەرامبەر ملیارەها کەس لە باپیرانی ئایینداری قارەمانمان و، ئاراستە کردنی تۆمەت نی‌یە بەرامبەر بە ملیۆنەها تەفسیری قورئانی پیرۆز؟

**سێ‌هەم:**

یەکێك لەو هۆکارانەی کردوویانە بە بیانووی ئەوەی حوکم بدرێم ئەوەیە کە وتوویانە: ئارامی و ئاسایش تێك دەدات. هۆی ئەمەش لێکدانەوەی هەڵەیانە بۆ هەندێ ڕستەی چەند نامەیەکی کەسی و چەند نامەیەکی تایبەت کە لە پەنجا ڕستە تێناپەڕن، لە کاتێکدا کە پەیامەکانی نوور زیاتر لە سەد هەزار وشە و ڕستەیان لەخۆ گرتووە و، ئەوان

تەنها بۆ گریمانێکی لاواز و یەکجار دووریان ڕوانیوە کە ڕێژەکەی یەك لە سەد تەنانەت یەك لە هەزاریش دەرناچێت و، ئەم گریمانە دوورەیان وەك ئەوەی ڕووی دابێت لێك دایەوە و لەسەر ئەو بناغەیە دەیانەوێت سزامان بدەن.

من لە لایەنی خۆمەوە هەموو ئەو کەسانەی کە ئاگاداری ئەم سی چل ساڵەی دوایی ژیانمن و، هەزاران قوتابیی نووری خاوێنیش دەگرم بە شایەت و، دەڵێم:

کاتێ ئەو سەرکردە ئینگلیزەی کە ئەستەمبوڵی داگیر کرد دەستی دایە نانەوەی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان موسڵماناندا و، تەنانەت "شێخولئیسلام" و هەندێ زانای تری خەڵەتاند و وای لێ کردن کە هێرش بکەنە سەر یەکتری و، جیاوازیی نێوان کۆمەڵی "ئیتتیحادییەکان" و کۆمەڵی "ئیئتیلاف"ی[1] فراوان کرد تاکو کەش و بارودۆخ بۆ سەرکەوتنی یۆنانییەکان ئامادە بکات و شکست بە بزووتنەوەی میللیی نیشتمانی بهێنێت، لەو دەمەدا من کتێبی "شەش هەنگاوەکان"م لە دژی ئینگلیز و یۆنانییەکان دانا و بەڕێز: "ئەشرەف ئەدیب"یش[2] لە چاپی دا و بڵاوی کردەوە. کە ئەمەش یارمەتییەکی باشی دا بۆ پووچەڵ کردنەوەی کاریگەریی ئەو پلانە دۆزەخییانەی کە ئەو سەرکردەیە دایڕشتبوو..

جا ئەو کەسەی کە بایەخی بە هەڕەشەی ئیعدامی ئەو سەرکردە ئینگلیزە نەدا و ڕای نەکرد بۆ ئەنقەرە، لە کاتێکدا کە حکوومەتی ئەنقەرە[3] بانگهێشتیان کردبوو بۆ ڕێزنان لە خەباتەکەی..

لە ڕووسیاشدا گوێی نەدا بە بڕیاری لەسێدارەدان کە سەرکردە ڕووسەکە بۆی دەرکرد..

لە ڕووداوەکەی (٣١)ی مارتیشدا توانیی بە ئاراستە کردنی تەنها یەك وتار هەشت کەتیبەی یاخی و هەڵچووی سوپا هێور بکاتەوە و بیانهێنێتەوە ژێر فەرمان و گوێڕایەڵیی سەرکردەکانیان..

---

(١) کۆمەڵی ئیتتیحادییەکان: مەبەست کۆمەڵی ئیتتیحاد و تەرەقییە، کە دوای شکستی دەوڵەتی عوسمانی لە بەردەم هاوپەیمانەکان لە یەکەم جەنگی جیهانیدا سەرکردەکانیان ڕایان کرد بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام کۆمەڵی ئیئتیلاف دەستەیەکی سیاسی بوون کەمێك دوای جەنگی یەکەمی جیهانی سەریان هەڵدا و ڕکەبەری ئیتتیحادییەکان بوون. (وەرگێڕ)

(٢) یەکێکە لە تێکۆشەرانی ئەو دەمە و سەرنووسەری گۆڤاری ئیسلامیی "سبیل الرشاد" بووە. (وەرگێڕ)

(٣) بۆ زانیاری لەبارەی ئەو حکوومەتەوە بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٥٥٢). (وەرگێڕ)

کـاتێکیش ژەنڕاڵـەکانی دادگـای عورفیـی سـەربازی[١] پێیـان وت: "تۆیـش کۆنەپەرستیت، چونکە داوای حوکمی شەریعەت دەکەیت" ئـەو تەنانـەت کـەمترین بایەخیشی بۆ هەڕەشـەکانیان دانـەنا و، وەڵامـی دانـەوە کـە: "ئەگـەر مەشـرووتییەت لای ئێوە بریتی بێت لە خۆسەپاندن و دیکتاتۆریێتیی دەستەیەکی دیاری کـراو، ئـەوا بـا هـەموو گرۆی جینی و ئادەمیزاد بزانن کە من کۆنەپەرستم و ئامادەم گیانی خۆم لە پێناوی تەنها یەك دانە مەسـەلەی شـەریعەتدا بـەخت بکـەم". کە بەم وەڵامـەش هـەموو ئەفسـەرەکان حەپەسان و واقیان وڕ ما. خۆ لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی دەرکردنی بڕیاری ئیعدام بوو لە لایەن ئەوانەوە، کەچی بڕیـاری بێ تـاوانی و بـەردانیان بـۆ دەرکـرد. ئـەویش لەسـەر ئـەم بڕیـارە هیـچ سوپاسێکی نـەکردن، بـەڵکو بـەدەم دەرچوونیـەوە لـە دادگـادا دەنگـی لــێ هەڵبڕی و وتی: (با بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران)..

کاتێ لە دیوانی سەرۆکایەتیشدا لە ئەنقەرە – وەك لە بڕیاری دادگای ئافیووندا تۆمار کراوە – مستەفا کەمال بە تووڕەیی‌یەوە پێی وت:

"بۆیـە بانگهێشـتمان کردیـت بـۆ ئـێرە هـەتا سـوود لـە ڕا و بۆچوونـە ڕاسـت و دروستەکانت وەربگرین، کـەچی چـەند شتێکت لــەبارەی نوێـژەوە نووسـی و تـۆوی دووبـەرەکیت لـە نێوانـدا چـاندین"[٢]. یەکسـەر لـە بـەردەم نزیکـەی پـەنجا پەرلـەمانتاردا وەڵامی دایەوە کە:

"گەورەترین مەسەلەی دوای مەسەلەی "ئیمان" بریتی‌یە لـە "نوێـژ". خـۆ هەرکەسێك نوێژ نەکات خائینە و، دیارە حوکمی خائینیش وەرناگیرێت و پشتگوێ دەخرێت"..

لـە بـەردەم ئـەم وەڵامـەدا ئـەو سـەرکردەیە ناچـار بـوو کـە تووڕەیـی خـۆی بخواتـەوە و هەندێ دڵنەوایی پێشکەش بکات..

---

(١) بریتی‌یە لەو دادگا عورفی‌یە سەربازی‌یەی کە بە سەرۆکایەتیی خورشید پاشای بەناوبانگ بە توندوتیژی و دوای ڕووداوەکانی (٣١)ی مارت دامـەزرا و، گەلـێ بڕیـاری ئیعدامی لەسـەر خـەڵکی دەرکرد و، مامۆسـتا نوورسیش یەکێك بوو لەوانەی کە وەك تاوانبار برابوونە بەردەم ئەو دادگایە. (وەرگێڕ)

(٢) کاتێ مامۆستا نوورسـی گەیشـتە "ئەنقـەرە" هەسـتی کـرد هـەندێ لـە ئـەندامانی ئەنجومـەنی پەرلـەمان نوێـژ ناکەن! بۆیە وتارێکی ڕەوانی ئاراستە کردن کە بەم دەستەواژەیە سەرەتاکەی دارشتبوو: (أیها المبعوثون إنکـم لمبعوثون لیوم عظیـم). لـە ئاکـامی ئـەم وتارەشـدا شەسـت کـەس لـەو ئەندام پەرلەمانانەی کە وازیـان لـە نوێـژ هێنابوو دەستیان کردەوە بە نوێژ و پەرستشەکانیان و، ئەنجومەنی پەرلەمانیش هۆڵی نوێژ کردنی ناو پەرلـەمانی گەورەتر کرد. (وەرگێڕ)

پاشان پیاوانی ئاسایشی دەوڵەت لە شەش پارێزگادا هیچ ڕووداوێکیان لەسەر قوتابیانی نوور تۆمار نەکردووە کە ئاسایش تێك بدات، هەرچەندەش ژمارەیان سەدان هەزار دەبێت، جگە لە ڕووداوێکی بچووك کە پەیوەندیی بە داکۆکی کردنی شەرعیی قوتابی‌یەکی بچووکی نوورەوە هەیە و، هیچ کەسێك نەبیستووە کە قوتابی‌یەکی نوور لەسەر هیچ تاوانێك چووبێتە بەندیخانەوە. خۆ ئەگەر بە نارەواش بەند کرابێت بووە بە هۆی چاك کردنی ڕەوشتی بەندکراوانی تر. ئنجا هەرچەند سەدان هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا بڵاو بوونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێك زیانێکی لێ نەبینیون، بگرە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا جگە لە سوود هیچ شتێکی تریان لێ نەدیوە. سێ دادگای سێ حکوومەتیش بڕیاری بێ تاوانی‌یان دەرکرد و، سەدان هەزار قوتابیش بە گوفتار و کردار پشتگیری و شایەتی لەسەر نرخ و بەهای پەیامەکانی نوور ڕادەگەیەنن.

پاشان ئایا کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز و هەژار و بەساڵاچوو کە خۆی لەسەر لێواری گۆڕدا دەبینێت و، بە هەموو هێز و قەناعەتێکی وازی لە شتانی فانی هێناوە و، بایەخ بە هیچ پلە و پایەیەکی دنیایی نادات، بەڵکو سەرقاڵی شتانێکە قسوور و ناتەواوی‌یەکانی پێشووی پاك بکەنەوە و سوود بە ژیانی ئەودنیای بگەیەنن و، لەبەر شەفەقەتی زۆر و حەزی لە پاراستنی بێ‌تاوان و پیران لە هەر زیانێك بێتە ڕێیان تەنانەت دوعای لەو ستەمکارانەش نەکردووە کە بە نارەوا ئازاری دەدەن.. ئایا دروستە کەسێکی ئاوا تاوانبار بکرێت و لە بارەیەوە بوترێت: ئەم پیرە گۆشەگیرە هەوڵی تێکدانی ئاسایش و ئارامی دەدات و، ئامانجیشی پیلانگێڕانی دنیایی‌یە و پەیوەندی و نامەکانیشی هەر لەبەر ئەو مەبەستەن، کەواتە کەسێکی تاوانبارە؟!

بێ گومان ئەو کەسانەی گوفتاری وای دەرحەق دەڵێن و لە سایەی بارودۆخی دژواردا بڕیار لە دژی دەردەکەن، خۆیان بە یەکجارەکی تاوانبارن و، سبەینێ لە دادگای هەرەمەزنی ڕۆژی حەشردا نرخ و بەهای ئەو تاوانەیان دەبێ بدەن.

کەسێکی وەك ئەم پیاوەی کە هەشت کەتیبەی سوپای بە ئاراستە کردنی تەنها یەك وتار هێور کردەوە و ناچاری کردن ملکەچی یاسا و ڕێسای سەربازی ببنەوە و ، پێش چل ساڵیش توانیی بە نووسینی تەنها یەك وتار هەزاران کەس بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و بیانکات بە لایەنگر و پشتگیری خۆی و، لە بەردەم سێ سەرکردەی زۆرداری بەزەبروزەنگدا - کە پێشتر باسکران - سەری نەوی نەکرد و لێیان نەترسا و مەرایی بۆ

نەنواندن و، لەبەردەم دادگاکانیشدا وتی: با چاك بزانن کە ئەگەر بە ئەندازەی مووی جەستەم سەرم ببێت و هەموو ڕۆژێك سەرێك لە جەستەم بکرێتەوە ئەوا ئەم سەرەی کە بۆ ڕاستی‌یەکانی قورئان تەرخانم کردووە هەرگیز لەبەردەم ئیلحاد و کوفری ڕەهادا نەویی ناکەم و هەرگیزاو هەرگیز خیانەت لە نیشتمان و نەتەوە و ئیسلام ناکەم..

کەسێکی ئاوا کە لە "ئەمیرداغ" لەگەڵ چەند کەسێکی کەمی هاوڕێی قیامەتی و سێ کەسی تر نەبێ لەوانەی کاروباری خزمەتی بۆ بەڕێوە دەبەن، پەیوەندیی لەگەڵ کەسی تردا نی‌یە، ئایا دروستە دوای ڕوون بوونەوەی هەموو ئەوانەی باس کران بەکەسێکی ئاوا بوترێت: ئەم سەعیدە لە "ئەمیرداغ" بە نهێنی بۆ تێکدانی ئاسایش هەوڵ دەدات، ئەوەتا بیری هەندێ کەسی ئەم گەلەی لەوێ ژەهراوی کردووە و، بیست کەسی ئەوێش مەدحیان کردووە و نامەی تایبەتی‌یان بۆ ناردووە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە نهێنی کار لە دژی سیستەمی شۆڕشگێڕانەی حکوومەت دەکات؟ ئنجا هەر لەسەر بناغەی ئەم تۆمەتەش سیاسەتی دوژمنایەتی‌یان لەگەڵدا بەکار هێناوە و ماوەی دوو ساڵ بڕیاری بەندکردنی سەخت و دژواری لەسەر دەرکرا و خراپە زیندانی تاکە کەسی و دابڕانی تەواوەتی‌یەوە و، لە دادگاشدا بواری قسە و بەرگری لەخۆ کردنیان پێ نەدا. بۆیە لەبەر هەموو ئەمانە، سەرجەمی ئەو کەسانەی کە ئازاریان دام و بەم ڕادەیە لە دادگەری لایان دا، بە ویژدانی ئێوە دەسپێرم.

جا ئایا کەسێکی وا کە لە شایستەیی خۆی زیاتر خەڵکی ڕوویان تێکردووە و، هەزاران کەسی بە یەك وتار هێنایەوە ژێر گوێڕایەڵی و، بە نووسینی تەنها یەك وتار وای لە هەزاران کەس کرد کە بڕۆنە ناو کۆمەڵەی "ئیتتیحادی محەممەدی" و، پەنجا هەزار کەس - بەوپەڕی ڕێزەوە - لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا گوێیان لە وتارەکەی ڕاگرت.. ئایا هەرگیز ژیری ئەوەی پێ قبووڵە کەسێکی ئاوا بۆ ماوەی سێ ساڵ لە "ئەمیرداغ" کاری نهێنی بکات کەچی بتوانێت قەناعەت تەنها بە چەند کەسێکی کەم بهێنێت و، ئنجا دەست لە کاروباری ئاخیرەتی خۆی هەڵبگرێت و نوقمی پیلانی سیاسی ببێت و، گۆڕە نزیکەکەی خۆی لە بری ڕووناکی لە تاریکی پڕ بکات؟

ئایا شتی وا هەرگیز دەگونجێ؟ خۆ تەنانەت شەیتان خۆیشی ناتوانێت ئەم قەناعەتە بە هیچ کەسێك ببەخشێت!

**چوارەم:**

شەپقە لەسەر نەکردنی منیان وەك هۆکارێکی گرنگ بۆ تاوانبار کردنم پێش چاو خست و، بواریشیان نەدام هیچ قسەیەك بکەم، کە نیازم بوو پێیان بڵێم:

سێ مانگ لە پۆلیسخانەی "قەستەمۆنی" بە گیراوی مامەوە و، هیچ کەسێکیش پێی نەوتم: "دەبێ شەپقە لەسەر بکەیت". لە سێ دادگاشدا کە دادگایی‌یان کردووم شەپقەم لەسەر نەکردووە و لە دەمی دانیشتنەکانی دادگاکاندا سەرم دەر نەخستووە و، کەس لەم ڕووەوە دەستی نەهێناوەتە ڕێم.. ڕاستە، هەندێ لەو ستەمکارانەی کە هیچ بەشێکیان لە ئایین نەبوو ئەم بابەتەیان کرد بە بیانووی دەستیان و بە شێوەیەکی نارەسمی ماوەی بیست و سێ ساڵ شەڕیان پێ فرۆشتم و گوشاریان خستە سەرم وئازاریان دام.

ئنجا منالان و ژنان و زۆربەی خەڵکانی لادێ نشین و کارمەندانی دەوڵەت لە فەرمانگە ڕەسمی‌یەکاندا و ئەوانەش کڵاو لەسەر دەکەن، ناچار نین شەپقە لەسەر بکەن، چونکە هیچ سوود و بەرژەوەندی‌یەکی ماددی لەوەدا نی‌یە..

کەواتە کەسێکی گۆشەگیری وەك من، ماوەی بیست ساڵ بەهۆی لەسەر نەکردنی شەپقەوە دووچاری گەلێ تۆمەتی ناڕەوا بووە. لە کاتێکدا کە هەموو موجتەهیدان و شەیخولئیسلامەکان ڕێیان بە لەسەر کردنی شەپقە نەداوە، کەچی وا ئێستا سەر لەنوێ بە ناحەقی ئازارم دەدەنەوە. خۆ بە ناوی سەربەستی و ئازادی‌یەوە کەس حەقی بەسەر ئەوانەوە نی‌یە کە بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕەمەزان ئارەق دەخۆنەوە و نوێژ ناکەن، کەواتە ئەو کەسانەی کە بەم سەرسەختی و بەم چەشنە توندوتیژی‌یە چەندین جار لەبەر جلوبەرگەکانم تاوانبارم دەکەن، بێ گومان دوایی لێپرسینەوەیان لێ دەکرێت کاتێ زیندانی تاکەکەسی و هەتاهەتایی گۆڕ دەبینن و، ئەو کاتەش کە ئامادەی بەردەم دادگای هەرەمەزن دەبن.

**پێنجەم:**

ئەو پەیامانەی نوور کە لە لایەن سەد هەزار کەسی ئەهلی ئیمانەوە "وەرگیراوی"یان بەدەست هێناوە و ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق چەندین سوودی زۆر و بێ زیانیان بە نەتەوە و نیشتمان گەیاندووە، ئێستا بێ نرخترین بڕوبیانوو دەکرێت بەهۆی دەست بەسەردا گرتنی. بۆنموونە: دەستیان بەسەر کۆمەڵە پەیامی (زولفەقار – موعجیزاتی ئەحمەدی)دا گرت کە ئیمانی سەد هەزار کەسیان ڕزگار کردووە، تەنها لەبەر ئەوەی تەفسیرێکی ڕاست و دروست بۆ دوو ئایەتی پیرۆز تەنها لە دوو لاپەڕەیدا کراوە لە نێوان کۆی لاپەڕەکانیدا کە دەگەنە چوارسەد لاپەڕە. لە کاتێکدا کە ئەم کۆمەڵە پەیامە وەختی بەسەردا تێپەڕیوە و لەم ماوەیەشدا چەندین یاسای لێبوردن دەرچوون.

جا ئایا دەست بەسەرداگرتنی ئەو کۆمەڵە پەیامە بەنرخە، تەنها لەبەر تەنها دوو لایەڕەی، کارێکی ڕاست و دروستە؟ وا ئێستاش چەند پەیامێکی تری بەنرخ لەبەر یەك دوو وشەی نێوان هەزاران وشە کە واتای هەڵەیان لێ دەدەنەوە، دەستیان بەسەردا دەگیرێت. هەر کەسێك ئەم سێ‌هەم لائیحەیەی داواکاری گشتی و ئەو بڕیارەی بیستبێت کە بڵاومان کردەوە، دڵنیا دەبێت لەم قسانەی کە دەیکەین.

بەڵام ئێمە سەبارەت بە هەر موسیبەتێك بێتە ڕێمان، دەڵێین:

﴿إنَّا للهِ وَإنَّا إلَيْهِ راجِعُونَ﴾ و ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيل﴾.

**شەشەم:**

ئەو کەسانەی کە وەرگێڕی هەژاری پەیامەکانی نوور[1] لەسەر ئەوە تاوانبار دەکەن کە هەندێ قوتابیی نوور زیادەڕەوی‌یان لە مەدح و سەنایدا کردووە و گومانی باشی زیاد لە پێویستیان بەرامبەری دەربڕیوە لەو نامانەدا کە بۆ هاندان و پیرۆزبایی و سوپاسگوزاری بۆیان نووسیوە، دوای ئەوەی سوودێکی یەکجار گەورەیان لە بەڵگە ئیمانی‌یە بەهێزەکان وەرگرت و هەتا پلەی "علم اليقين" زانستەکانی ئیمانیان بەدەست هێنا.. ئەوانەی لەسەر ئەمە تاوانبارمان دەکەن، پێیان دەڵێین:

من کەسێکی لاواز و دەستەوسان و نەفی‌کراو و نیمچە خوێندەوارم. لەو کاتانەشدا کە بە پروپاگەندەکانیان خەڵکیان لە دژم دەوروژاند و دەیانترساندن لێم، هەر دەرمانێکی قورئان و ڕاستی‌یە بەرزەکانی ئیمانم بۆ دەردەکانی خۆم بەدەست دەهێنا یەکسەر ئەو ڕاستی‌یە بەنرخانەم دەنووسی، چونکە لەو باوەڕەدا بووم کە چارەسەرێکی شیفابەخشن بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوە و نیشتمان. جا لەبەر ئەوەی خەتم یەکجار ناخۆشە، هەمیشە پێویستم بە چەند کەسێکی یارمەتیدەر بووە. چاودێریی خوای گەورەش چەندین یارمەتیدەری تایبەت و ڕاست و دامەزراوی پێ بەخشیم.

شتێکی ئاسایی‌یە کە بە تەواوەتی دەست بە ڕووی خۆش باوەڕی و گومان باشی و مەدح و سەنای بێ‌گەردیانەوە نەنێم و لەسەر ئەوە سەرزەنشتیان نەکەم، تاکو هەست و نەستیان زامدار نەبێت. چونکە هەڵسوکەوتی لەو جۆرە پێچەوانە و دژی ئەو ڕووناکی‌یانەیە کە لە گەنجینەی قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون، تەنانەت سووکایەتیشە بەو ڕووناکی‌یانە. جا لەبەر ئەوەی کە ئەو یارمەتیدەرە خاوەن قەڵەمە ئەڵماسی و دڵە

(١) دانەر مەبەستی خۆیەتی. (وەرگێڕ)

ئازایانەم لـێ دوور نەکەونەوە، هەمیشە هەر مەدح و سەنایەکیان کردووم من ئاراستەی پەیامەکانی نـوورم کـردوون، کە لـە ڕاستیدا ئـەو پەیامانە خاوەن مـافن لـەم ستایشـەدا، چـونکـە دەرخەر و پیشـاندەری موعجـیزەی مەعنەویی قورئـانی پیرۆزن. هەروەهـا ئـەو مەدح و سەنا و ستایشانەی ئەوانم بۆ کەسێتیی مەعنەویی قوتابیانی نوور گێڕاوەتەوە. خـۆ کاتێ کە پێم دەوتن: "ئێوە سەد هێندەی بەشەکەی خۆم زیاترم دەدەنێ" هەست و سـۆزی ئەوانم بەم قسەیە تا ڕادەیەك ئازار دەدا..

جا ئایا هیچ ماددەیەکی یاسایی هەیە کەسێك تۆمـەتبار و سەرزەنشـت بکـات لـەسـەر ئەوەی کەسانی تر مـەدح و ستایشیان کردبێـت، هەرچـەندەش خـۆی ئـەو ستایشـەی پێ ناخۆش بێت؟ ئایا ماددەی یاسایی لەم چەشنە هەیە هەتا بکرێت بە پاسـاوی کارمـەندێکی ڕەسمی کە بە ناوی یاساوە تاوانبارم بکات؟

دەبێ ئەوەش بزانین کە لە لاپەڕە (٥٤)ی بڕیاری لائیحەی تاوانبارکردن کە لە دژمان بڵاو کراوەتەوە، ئەم قسەیەی من هێنراوە کە وتوومە:

(ئەو کەسە مەزنەی کە لە ئاخر زەماندا دێـت لـە وەچـەی ئـالی بـەیت دەبێـت. ئێمـەی قوتابیانی نووریش تەنها لە ڕووی مەعنەوییـەوە دەکرێ لـە ئـالی بـەیت دابـنرێین. پاشـان ڕێبازی پەیامەکانی نوور هەرگیز جێی "خۆویستی" یاخود بەگەورە گرتنـی کەسێك یـان حـەزکردن لـە پلەوپایـەی دنیـایی یـان چـاوگێڕان بـۆ مەنسـەب و ناوبـانگی تێـدا نیـیـە. تەنانەت من خۆم بە ناچار دەزانم کە ئەگەر پلەوپایەی قیامەتیشم بدرێتێ وازیان لـێ بهێنم تاکو ئەو ئیخلاسە نەشێوێنم کە لە ڕێبازی نووردا هەیە).

هـەروەك لـە لاپەڕە (٢٢) و لاپـەڕە (٢٣)ی بڕیـاری لائیحەکـەدا ئـەم دەسـتەواژانە هاتووە:

"مرۆڤ لە بەردەم خوای گەورەدا تەقسیرەکانی خـۆی بزانێـت و پـەی بـە هـەژاری و دەستەوسـانیی خـۆی لـە بـەردەم خـوای گـەورەدا ببـات و بـە زەلیلـی و شکسـتەیی و نەوازشـەوە پـەنای بـۆ ببـات. جـا مـن - بـەم کەسایەتیـیە - خـۆم لـە هـەموو کەسێك بـە دەستەوسان تر و بەدبەخت تر و هەژارتر و تەقسیربارتر دەبینم لە بەردەم خوای گـەورەدا. خۆ ئەگەر سەرانسەری دنیا کۆ بینەوە و لەسەر مـەدح و ستایشـم یـەکبگرن، هێشـتا هـەر نـاتوانن قەناعـەتم پـێ بکـەن کـە مـن مرۆڤێکـی بـاش و سـاڵح بم... لەمـە زیـاتر لـە خراپکارییەکان و لایەنە چەوتەکانی کەسایەتیی سێ‌هەمم نادرکێنم، تاکو بە تەواوی لە

خـۆم دوورتـان نەخەمـەوە! کەواتـە تەنـها چاکـە و بەخششـی خـوای گەورەیـە کـە کەسایەتیی یە یـەکجار نزمەکـەم - کـە وەك سـەربازێك وایـە - لـە خزمـەتی نهێنیـیەکانی قورئـاندا گوێڕایـەڵ و ملکـەچ دەکـات، کـە لـە حوکمـی بـەرزترینی پلەوپایـەکانی موشیرێتیدایە.

کەواتـە "نـەفس" لـە هـەموان نزمـترە و، کارمەندییەکـەش لـە هـەموو شتێك بـەرز و بڵندترە.

دەسا سەدان هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە".

لەگەڵ ئەوەشدا کە لائیحەکە ئەو دەستەواژانەی سەرەوەی لە قسەکانمان هێناوە و لـە دەقەکەیدا دایناون، کەچی ئەوانەی دەیانەوێ تەنها لەبەر ئەوەی چەند کەسێك مـەدحیان کردووم و بە وێنەی ڕابەرێکی گەورە و مەهدییەك هیدایەتم داون - بەو واتایـەی کـە لـە پەیامەکانی نووردا هاتووە - بە تاوانبـارم دابنێـن، بێ گومـان ئـەو کەسـانە خۆیـان شـایانی سزادانن لەسەر تاوانە گەورەکانیان.

**حەوتەم:**

دادگای "دەنیزلی" و دادگای تاوانە گەورەکان لە "ئەنقـەرە" و دادگاکـانی تـەمییز بـە یـەکدەنگی بڕیـاری بێ تـاوانیی ئێمـە و هـەموو پەیامـەکانی نووریـان دەرکـرد، ئـەوەبوو هەموو ئەو پەیامانە و نامەکانیشیان داینەوە.

خـۆ هەرچـەندە ئـەوان وتیـان: "هێشـتا ئەگـەر گرێمـانی بوونـی هەڵـەش هـەبێت لـە بڕیارەکەی دادگای "دەنیزلی"دا کە بۆ بێتاوانیی ئێوە دەری کـرد، بـەڵام مـادەم دادگـای تەمییز بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەرکردوون، ئەوا ئەو بڕیـارە قەتعییـەتی وەرگرتـووە و نابـێ جارێکی تر ببرێنەوە بۆ دادگا"..

هەروەها لەگەڵ ئەوەدا کە سـێ سـاڵم بە گۆشـەگیری لـە "ئەمیرداغ"دا بـردە سـەر و پەیوەندیم تەنـها لەگـەڵ چـەند کەسێکی کـەمدا هـەبوو لەوانەیکـە بـە نـۆرە کاروبـاری خزمـەتم بـۆ ڕادەپـەڕێنن (ئەوانـەش وەك یارمـەتیدەری بـەرگدروو کاریـان دەکـرد). ئنجـا قسەشم لەگەڵ کەسدا نەدەکرد، مەگـەر چـەند کەسێکی دینـدار و لـە چـەند حاڵـەتێکی ناچاریدا و بۆ ماوەی تەنها چەند خولەکێك و، جگە لە ناردنی تەنها یەك نامـە لـە مـاوەی حەفتەیەکدا لە پێناوی هاندانی قوتابیانی نووردا لەسـەر خوێندنـەوەی پەیامـەکانی نـوور. (تەنانـەت لـە مـاوەی سێ سـاڵی دوورودرێـژدا سـێ نامـە زیـاترم بـۆ بـرا موفتییەکـەم

نەناردووە).. بەڵکو وازم لە نووسین و کتێب دانانیش هێناوە کە سێ ساڵە پێوەی سەرقاڵم، جگە لە دانانی دوو سەرنجی ورد لە بیست لاپەڕەدا سەبارەت بە (حیکمەتی دووپات بوونەوە لە قورئان)دا و (هەندێ مەسەلە سەبارەت بە مەلائیکەت)ەوە و، لەو دوانە زیاتر شتی ترم نەنووسیوە، بەڵام ڕەزامەندیم لەسەر ئەوە نواند کە ئەو پەیامانەی دادگاکان بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەرکردن لە شێوەی بەرگی گەورەدا کۆبکرێنەوە..

دوای ئەوەش کە دادگا ئەو پێنج سەد نوسخەیەی پەیامی (الآية الكبرى)ی داینەوە کە بە پیتە کۆنەکان چاپ کرابوون، ڕەزامەندیم بۆ برایانم نواند کە بەهۆی ئامێری فۆتۆکۆپییەوە لەبەری بگرنەوە، چونکە دەمزانی یاسا بە شێوەیەکی ڕەسمی ڕێ لەوە ناگرێت، تاکو جیهانی ئیسلامی سوودی لێ وەربگرێت و، هەر تەنها سەرقاڵی هەڵەگیریی ئەو پەیامانە بووم و، خۆم لە قەرەی سیاسەت نەداوە. تەنانەت مانەوەم لە غەریبیی ئازاربەخشدا لە گەڕانەوە پێ باشتر بووە. ئەوەبوو بە وێنەی هەموو نەفی کراوەکانی تر نەڕۆشتمەوە بۆ شارەکەی خۆم، هەرچەندەش ڕوخسەتی ڕەسمی دەرچوو بوو کە بگەڕێمەوە. بەڵام نەڕۆشتمەوە تاکو بە دنیا و سیاسەتەوە سەرقاڵ نەبم..

کەواتە ئاراستە کردنی ئەم سێهەم تۆمەتە کە کۆمەڵێك شتی درۆ و ناحەقی تێدایە و لێکدانەوەی هەڵەی لەخۆ گرتووە و، هەوڵدانی تاوانبارکردنی ئەم پیاوە، دوو واتای سەرسامکەریان لەخۆ گرتووە کە ئێستا نایانڵێم. ئەم ماوەیەی دوایی کە دەگاتە بیست مانگ ئەم بۆچوونە دەچەسپێنێت.

بەڵام من هەر هێندە دەڵێم: ئەوان گۆڕ و دۆزەخیان سەروزیادە و، کێشەکەی خۆم بە دادگای هەرەمەزنی ڕۆژی قیامەت دەسپێرم.

**هەشتەم:**

پەیامی "تیشکی پێنجەم" دوو ساڵ لە دادگای "دەنیزلی" و دادگای "ئەنقەرە"دا مایەوە، دوای ئەوە دایانەوە بە خۆمان و، منیش دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی ئەو پەیامە بوارم دا لەگەڵ بەرگی یەکەم لەو دادگایەدا - کە لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دایە - بڵاو بکرێتەوە. ڕاستە من یەکەم جار وەك پەیامێکی تایبەت هەڵم گرتبوو کە پێش چاوی خەڵکیم نەدەخست، بەڵام مادەم دادگا ئاشکرای کرد و پەردەی لەسەر لادا و ئنجا دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکەش دایانەوە بە خۆمان، ئەوا وتم: کەواتە هیچ زیانێك لە بڵاوکردنەوەیدا نییە، بۆیە ڕوخسەتم دا بڵاوی بکەنەوە.

ئەسلی ئەو پەیامەش نزیکەی چل ساڵ پێش ئێستا لەبارەی هەندێ فەرموودەی موتەشابیهەوە نووسراوە کە لە مێژە لەناو خەڵکیدا بڵاو بوونەتەوە. خۆ هەرچەندەش هەندێ لە زانایان بەشێکی ئەو فەرموودانەیان بە "زەعیف" لەقەڵەم داوە، بەڵام من لەبەر رزگار کردنی ئیمانداران لە شوبهە و گومانەکان نووسیومە، چونکە واتای ڕواڵەتیی ئەو فەرموودانە دەبوو بەهۆی ئاراستە کردنی ڕەخنەی زۆر لێیان. کەچی هەندێ لەو تەئویلە نائاساییانە لە پێش چاودا دەرکەوتن و بەرجەستە بوون. بۆیە ناچار بووین بیشارینەوە و وەك پەیامێکی پەنهان هەڵی بگرین، تاکو واتای هەڵەی لێ وەرنەگیرێ. ئنجا دوای ئەوەی چەندین دادگا بە وردی لەو پەیامەیان کۆڵییەوە و ئاشکرایان کرد، دایانەوە بە خۆمان. کەچی جارێکی تر دادگا هەمان پەیامی کردووەتەوە بەهۆکاری تاوانبارکردنمان!

بۆیە ڕادەی دووریی ئەم کارە لە دادگەری و حەق و ئینسافەوە بە ویژدانی ئەو کەسانە دەسپێرین کە دەیانەوێ لەسەر قەناعەتێکی ناو ناخی دڵمان تاوانبارمان بکەن. هەروەك ئەم سکاڵایەمان پێشکەش بە دادگای هەرە مەزنی خوایی دەکەین و، دەڵێین:

﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيل﴾.

**نۆهەم:**

ئەمەش خاڵێکی گەلێ گرنگە، بەڵام باسی ناکەین، تاکو ئەو کەسانە تووڕە نەکەین کە بڕیاریان لەسەر دەرکردین، لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نووریان خوێندەوە.

**دەهەم:**

ئەمەش خاڵێکی تری بەهێز و گرنگە، بەڵام ئێستا باسی ئەمیش ناکەین، تاکو باسکردنی نەبێت بە مایەی زویری و بێزاری.

بەندکراو لە زیندانی تاکەکەسیدا:

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## سکاڵانامەیەك

## کە پێشکەشی ئەنجومەنی وەزیران کرا

**ئەمە بەشێکە لەو سکاڵانامەیەی کە پازدە ساڵ پێش ئێستا و لە دادگای "ئەسکی شەهر"دا پێشکەشی ئەنجومەنی وەزیران کرا:**

ئەی ئەهلی حەل و عەقد!

من گرفتاری ستەمێکی ئەوتۆ کراوم کە دەگمەنە لە هەموو دنیادا هاوشێوەی هەبێت. جا لەبەر ئەوەی بێ دەنگ بوون لە "ستەم" بە سووکایەتی و ڕێز نەگرتن دادەنرێت بەرامبەر بە "حەق" ئەوا ناچار بووم کە ڕاستییەکی گەلێ گرنگ بدرکێنم. بۆیە دەڵێم:

یان لە سێدارەم بدەن و ئەو تاوانەشم ڕوون بکەنەوە کە شایانی بڕیاری سەد و یەك ساڵ زیندانی بێت لە چوارچێوەی یاسادا.. یان بە بەڵگە بیچەسپێنن کە من کابرایەکی شێتم و ژیریم لە دەست داوە.. یاخود سەربەستیی تەواوەتی بە خۆمان و پەیامەکانمان و هاوڕێیانمان بدەن و، لێپرسینەوە لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە بوون بەهۆی ئازاردانمان.

بەڵێ، دەبێ هەموو حکوومەتێك سەبارەت بە هەر شتێك یەك یاسا و یەك بنچینەی بۆ ئەو یاسایە هەبێت و، سزاکانیش لەسەر بناغەی ئەو یاسایە دەردەکرێن. جا ئەگەر یاساکانی حکوومەتی کۆماری شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبێت کە داخوازی سزادانی من و هاوڕێیانم بێت، ئەوا کارێکی پێویستە کە دڵمان ڕابگرن و دڵنەوایی پێویست و ڕێز و بەخششی شایانمان پێشکەش بکەن، هاوکات لەگەڵ بەخشینی ئازادی و سەربەستیی تەواوەتیدا پێمان. چونکە ئەگەر خزمەتە قورئانییەکانم بە دوژمنایەتی دابنرێت بەرامبەر حکوومەت، ئەوا دەبێ بڕیاری سەد و یەك ساڵ بەند کردن یان بڕیاری لە سێدارەدانم بۆ دەربکەن و، سزای سەختیش بۆ هەموو ئەو کەسانە دەربکرێت کە بە شێوەیەکی گەرموگوڕ لەم خزمەتەدا پەیوەندییان پێوە کردووم، نەك ئەوەی بچن بڕیاری یەك ساڵ بەندکردن لەسەر من و شەش مانگیش لەسەر هاوڕێکانم دەربکەن.

جا ئەگەر خزمەتەکانمان لە دژی حکوومەت نەبن، ئەوا دەبێ حکـوومەت لـە بریـی سـزا و زیندان و ئازار و تۆمەتبارکردن، بە ڕێزلێنان و خەڵاتەوە پێشـوازیمان لـێ بکـات. چونکە سەد و بیست پەیام زمانێکی ڕەوان و پاراون کە ئەم خزمەتـە پێش چـاو دەخـەن و توانییـان تەحـەددای فەیلەسـووفەکانی ئـەورووپا بکـەن و بناغـە فیکریـیـەکانی ئـەوان لــە بناغەوە هەڵبتەکێنن و ئاسەواری نەهێڵن.

بێ گومان ئەم خزمەتە کارا و کاریگەرە، یان ئاکامێکی ترسـناکی لـێ دەبێتـەوە، یـان بەروبوومێکی زانستیی یەکجار بەرز و سوودبەخش پێشکەش دەکـات. کەواتـە نابـێ بڕیاری تەنها یەك ساڵ بەندکردنم بۆ دەربکرێت، وەك ئەوەی ئێمە خەریکی یـاریی منـاڵان بین و عەوامی خەڵکی لەخشتە بەرین و خـەریکی شـاردنەوەی پیلانـی دوژمنـان بـین لـە دژمان. چونکە کەسانی وەك من یان دەبێ بەوپەڕی فەخر و شانازی و سەری بـەرزەوە بـە داری سێدارەکانیاندا سەربکەون، یـان دەبـێ لـە پلەوپایـەی شـایانی خۆیـاندا ئـازاد و سەربەست بن.

بەڵێ، ئەگەر دزێکی کارامە و لـێزان هـەبێت و بتوانێـت بـایی هـەزار لـیرە "ئـەڵماس" بدزێت. کەچی هەر ئەو دزە بەتوانایە بچێت چەند پارچە شووشـەیەکی بێبایـەخی چـەند قورشی بدزێت و، حوکمی دزیی ئەڵماسە بەنرخەکانیشی لەسەر دەربکرێت.. ئایـا هـیچ دزێکی ئاسایی خـاوەن هەسـت و ژیـری شتی وا دەکـات؟ چونکە بـێ گومـان ئـەو دزە کەسێکی لێزان و زیرەکە و هـەرگیز خـۆی دووچـاری کـاری لـەو جـۆرە ناکـات کــە ئەوپەڕی نەفامی و گەلحۆیی پێوە دیارە!

بەڕێزان!

گریمان بەپێی وەهم و گومانی ئێوە من وەکو ئەو دزە وابم.. ئایا بۆچی ناوچەیـەکی پڕ لە کوێرەوەریی سەر بە شاری "ئیسپارتە" هـەڵدەبژێرم کـە نـۆ سـاڵ تیـایدا بەگۆشـەگیری مامەوە؟ خۆ لە بریی ئەوەی بیروبۆچوونی چـەند کەسێکی دڵسۆزی کـەمی ئـەوێ (کـە چەند حوکمێکی سـووکەڵەیان لەسـەر دەرکـرا) بـەرەو دژایـەتیی حکوومـەت ببزوێنم و خۆم و پەیامەکانی نووریـش - کـە ئامـانجی ژیـانمن - گرفتـاری مەترسـی بکـەم، بـۆ مـن وا باشـتر بـوو کـە وەك جـارانم لـە شـوێنێکی گـەورەی وەك "ئەنقـەرە" یـان "ئەسـتەمبووڵ"دا بوومایە و، هەزاران کەسم بەرەو ئەو ئامانجـەی مەبەستمە ئاراستە بکردایـە. ئـەو کاتـەش دەمتوانی بەو شان و شکۆ و عیززەتەی کە شایانی ڕێبازی خۆمە بەشداری لـە کاروبـاری دنیادا بکەم، لە بریی ئەوەی خۆم بخەمە بەر ئەم چەشنە سزا سووك و بێ نرخانە.

جا بۆ ئەوەی ڕادەی هەڵەی ئەو كەسانە ڕوون بكەمەوە كە دەیانەوێ بەرەو پلەیەكی نزمی بێ نرخ و بێ سوود پاڵم پێوە بنێن، ئەوا بە ناچاری هەندێ خۆویستی و ڕیاكاریی پێشووی خۆمیان یاد دەخەمەوە، نەك بە مەبەستی فەخر و شانازی و، دەڵێم:

ئەو كەسانەی كە بۆیان ڕەخساوە ئەو بەرگرییەم ببینن كە بە ناونیشانی (شایەتیی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت) چاپكراوە، شایەتی دەدەن كە: توانیویەتی بە ئاراستەكردنی تەنها یەك وتار لە ڕووداوەكانی (٣١)ی مارتدا هەشت كەتیبەی سەربازی بگێڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵی و.. هەروەك ڕۆژنامەكانی ئەو كاتە نووسییان: لە دەمی جەنگی سەربەخۆییدا توانیی بە یەك دانە وتار بە ناوی (شەش هەنگاوەكان) ڕای زانایانی ئەستەمبووڵ بگۆڕێت لە دژی ئینگلیز، كە ئەوەش كاریگەرییەكی گەورە و ئیجابیی هەبوو لە بزووتنەوەی میللیدا و.. هەزاران كەس لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا گوێیان لە وتارەكەی ڕاگرت و.. لە ئەنجومەنی مەبعووسان(ئەنجومەنی پەرلەمان)یشدا لە ئەنقەرە بە چەپڵەڕێزانی گەرمەوە پێشوازیی لێ كرا و، سەدو شەست و سێ ئەندام پەرلەمان ڕەزامەندییان لەسەر تایبەتكردنی سەد و پەنجا هەزار لیرە نواند بۆ بنیاتنانی زانكۆكەی و.. كاتێكیش ئەندامانی پەرلەمانی بۆ نوێژ كردن بانگهێشت كرد، لە دیوانی سەرۆكایەتیدا ڕووبەڕووی توورەیی سەرۆك كۆمار بووەوە و بە بێ هیچ ترس و بیمێك بەرپەرچی قسەكانی دایەوە و.. ئەو دەمەش كە لە (دار الحكمة الإسلامية)دا ئەندام بوو حكوومەتی ئیتتیحاد و تەرەقی بە یەكدەنگی ئەویان لە هەموو كەسێك بەلاوە گونجاوتربوو كە بتوانێت "حیكمەتی ئیسلامی" بە شێوەیەكی كاریگەر بە فەیلەسووفانی ئەورووپا ڕابگەیەنێت.. سەبارەت بە كتێبەكەشی (إشارات الإعجاز) كە لە بەرەكانی جەنگدا دایناوە و ئێستا دەستی بەسەردا گیراوە، هێندە مایەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندیی "ئەنوەر پاشا"ی سەركردەی گشتیی هێزە چەكدارەكان بوو كە بەوپەڕی ڕێزەوە ـ كە ئەوەشی لەگەڵ كەسدا نەكردووە ـ ڕۆشت بۆ پێشوازی لێكردنی و، تەنانەت بڕیاری دا كاغەزی پێویست بۆ چاپكردنی كتێبەكە ببەخشێت، تاكو پاداشتێكی لە شەرەف و شانازی و پاداشتی ئەو دیارییەدا هەبێت..

جا پیاوی ئاوا هەرگیز ناتوانێت لەو مامەڵەیە بێدەنگ بێت كە بەم چەشنە لەگەڵی دەكرێت، وەك بڵێی چەند تاوانێكی بێ نرخی وەك دزینی هێسترێك یان ڕفاندنی كچێك یاخود بڕینی گیرفانێكی ئەنجام دابێت. چونكە ئەگەر لەو ڕەفتارەتان بێدەنگ ببێت ئەوا وەك پەڵەیەكی نەنگی وایە بە خۆیەوە و بە عیززەتی خاوێنی زانستی و

خزمەتگوزاریەکانی و هەزاران هاورێی بەنرخیەوە. چونکە کاتێ ئێوە بە زیندانکردنی ساڵێك فەرمانی لەسەر دەردەکەن وەك ئەوە وایە کە مامەڵەی دزی مەڕ یان بەرخێکتان لەگەڵدا کردبێت. ئەوەتا دوای ئەوەی کە بێ هیچ هۆیەك ماوەی دە ساڵی پڕ لە گوشار و ئازاری دەست بەسەری و چاودێریی بەسەر برد و دوای ئەم هەموو ئازاردانە درێژخایەنە، دەچن بۆ ماوەی یەك ساڵ زیندانی دەکەن و یەك ساڵی تریش دەیخەنە ژێر چاودێری و دەست بەسەرییەوە. جا لەبریی ئەوەی بیخەنە ژێر زەبر و زەنگ و خۆسەپاندنی پۆلیسێکی ئاسایی یان پۆلیسێکی نهێنیی ئاساییەوە ـ لە کاتێکدا کە ئەو کەسێکە تەنانەت خۆسەپاندنی سوڵتانیشی پێ قبووڵ نەکرا ـ بۆ ئەو باشتر وایە کە لە سێدارە بدرێت.

خۆ ئەگەر کەسێکی وەك ئەم مرۆڤە بیەوێت و حەز بکات دەست لە کاروباری دنیا وەربدات و، کارمەندی و ئەرکی خاوێن و پیرۆزی بواری ئەوەی پێ بدەن، ئەوا دەیتوانی پێشەوایەتیی ڕووداوێك بکات کە بە دەیان جار لە ڕووداوی (مەنمەن) و (شۆڕشەکەی شێخ سەعید) گەورەتر بوایە. واتە: دەیتوانی دەنگێکی گەورەی چەشنی زرمەی تۆپ بە گوێی ئێوەدا بدات، نەك دەنگێکی وەك ویزەی باڵی مێش!

بەڵێ، من ئەوە دەخەمە پێش چاوی حکوومەتی کۆماری کە هەرچی بەڵا و گیرو گرفتێك دووچاری دەبم هەر هەمووی ئەنجامی پیلان و پڕوپاگەندەی ڕێکخراوێکی بەلشەفیی نهێنییە، ئەوەتا کەش و هەوایەکیان بۆ پڕوپاگەندەی گشتی و هەمەلایەنەی ئەوتۆ ساز کردووە کە تا ئێستا شتی وا نەبینراوە و، ترس و تۆقاندنێکی زۆریشیان بڵاو کردووەتەوە. بەڵگەشمان ئەوەیە کە وا ماوەی شەش مانگە هیچ کام لە هاوڕێکانم کە ژمارەیان دەگاتە سەد هەزار کەس نەیتوانیوە یەك نامەم بۆ بنێرێت، تەنانەت سڵاوێکیشم پێ بگەیەنێت. جا ئەو پیلانگێڕانەی کە لە هەوڵی خەڵەتاندنی حکوومەت و لەخشتەبردنیدان، بە ڕاپۆرتە نهێنییەکانیان توانیویانە هەر لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتەوە هەتا دەگاتە پارێزگاکانی خۆرئاوای وڵات پشکنین و لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە ساز بکەن.

ئەو نەخشەیەی کە پیلانگێڕان دایانڕشتبوو بە جۆرێکی ئەوتۆ ڕێکخرابوو کە بڵێی ڕووداوێکی یەکجار گەورە لە ئارادایە و، من و هەزاران کەسی تری وەك من لەسەر ئەو ڕووداوە سزای سەخت دەدرێین. کەچی بە سزایەکی هێندە بێ نرخ کۆتایی پێ هات کە دەگونجێ لەسەر هەر کەسێکی ئاسایی دەربکرێت لەسەر دزینی شتێکی بێ نرخ و بەها.

ئەوەبوو سزای ساڵێك بەندکردنیان بۆ پازدە کەسی بێ تاوانی نێوان سەد و پازدە کەس دەرکرد!

ئایا هیچ کەسێکی ژیر و هۆشمەند هەیە کە شمشێرێکی تیژی بە دەستەوە بێت و بە سووکی لە کلکی شێرێکی گەورەی بژەنێت و بەو جۆرە لە دژی خۆی بیوروژێنێت؟ چونکە ئەگەر مەبەستی خۆپاراستن یان لەگەڵ جەنگانی ئەو شێرە بێت ئەوا شمشێرە تیژەکەی لە شوێنێکی تری جەستەی ئەو شێرەدا بەکار دەهێنا!

دیارە دەرکردنی سزایەکی سووکەڵەی ئاوا لە دژم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێتان وایە من وەکو ئەو کەسە وام!

جا ئەگەر کەسێك بم بە وێنەی ئەو ڕەفتارە دوور لە هەست و ژیرییە هەڵسوکەوت بکەم، ئیتر بۆچی سەرانسەری ئەم وڵاتەتان لە ترس و دڵەڕاوکێ پڕکردووە؟ یان چ پێویستییەك بەم هەموو پڕوپاگەندانە هەیە کە بۆ هەژاندنی ڕای گشتی لە دژی من بڵاوی دەکەنەوە؟ دەبوو بە وێنەی شێتێکی ئاسایی مامەڵەتان لەگەڵدا بکردمایە و بتاننادرمایە بۆ نەخۆشخانەی شێتان!

خۆ ئەگەر پێتان وایە من کەسێکی گرنگی مەترسیدارم و لە ئاستی گرتنەبەری ئەو تەگبیر و خۆئامادەکارییە گرنگانەدام کە لە دژی من دەیگرنەبەر، ئەوا هەرگیز مەنتیق و ژیری ڕێ بەوە نادەن کە بڕۆم لە کلکی ئەو شێرە یان ئەو دڕندەیە بژەنم و لە دژی خۆم بیوروژێنم، بەڵکو دەبێ بەپێی توانا خۆمی لێ بپارێزم. هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینن ماوەی دە ساڵە بە حەز و ویستی خۆم ژیانی گۆشەگیریم هەڵبژارد و، هێندە گوشار و ئازارم قبووڵ کرد کە هیچ مرۆڤێك لە توانایدا نییە و، لە هیچ کاروبارێکی حکوومەتدا خۆم هەڵنەقورتاندووە و تەنانەت هەر حەزیشم لە کاری لەو جۆرە نەکردووە، چونکە ئەرکی خاوێنی سەرشانم ڕێی کاری وام پێ نادات.

ئەی ئەهلی حەل و عەقد!

ئایا دەگونجێ کەسێك کە بیست و پێنج ساڵ پێش ئێستا ـ بە شایەتیی ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە ـ توانیی بە نووسینی تەنها یەك وتار بیری سی هەزار کەس و، سەرنجی گرنگی پێدانی سوپای بزووتنەوە[1] بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و، بە شەش وشە وەڵامی

(١) سوپای بزووتنەوە ئەو سوپایە بوو کە ئیتیحادییەکان لە مەڵبەندی هێزی خۆیان: شاری "سولانیك"ەوە بە سەرکردەیی "مەحموود شەوکەت پاشا" و بۆ سەرکوت کردنی یاخی بوونەکەی ڕووداوی (٣١)ی مارت و گێڕانەوەی دەسەڵاتی ئیتیحادییەکان هێنایان بۆ ئەستەمبووڵ. (وەرگێڕ)

پرسیارەکانی سەرگەورەی قەشەکانی ئینگلتەرای دایەوە کە دەیویست بە شەش سەد وشە وەڵام بدرێنەوە و، لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا[1] وەك هەر سیاسەتمەدارێکی شارەزا و لێزان وتاری ئاراستەی جەماوەر دەکرد.. ئایا دەگونجێ لە سەد و بیست پەیامی کەسێکی ئاوادا لە پازدە وشە زیاتری تێدا نەبێت کە پەیوەندیان بە سیاسەت و کاروباری سەر بە دنیاوە هەبێت؟ ئایا هیچ ژیریەك قەناعەت بەوە دەکات کە پیاوی ئاوا رێی سیاسەتی گرتووەتەبەر و چەند ئامانجێکی دنیایی هەیە؟ چونکە ئەگەر بایەخی بە سیاسەت بدایە و خۆی لە کاروباری حکوومەتدا هەڵبقورتاندایە ئەوا لە سەد شوێنی تەنها یەك کتێبیدا چ بە راشکاوی و چ بە هێما ئەو بایەخدانەی دەردەکەوت. خۆ ئەگەر ئامانجی ئەو ئاراستەکردنی رەخنەی سیاسی بوایە ئایا نەیدەتوانی جگە لە باسی پزشتەیی و بابەتی میرات - کە لەو بابەت و دەستوورانەن هەر لە مێژەوە هەن - شتی تری بۆ ئاراستەکردنی رەخنەکانی بدۆزیایەتەوە؟

هەر کەسێك هەڵگری بیرێکی سیاسیی دیاری کراو بێت دەتوانێت سەدان هەزار بابەتی رەخنە لێگرتن بدۆزێتەوە لەم رژێمە کۆماریەدا کە ئاڵوگۆڕێکی گەورەی بەرپا کرد، نەك تەنها یەك بابەت و دوو بابەت! چونکە ئایا دەگونجێ ئەو گۆڕانکاریەی حکوومەت ئەنجامی دا بترنجێنرێتە دوو مەسەلە و بابەتی بچووکەوە؟ خۆ هەرچەندە من بە بێ ئەوەی نیازی ئاراستەکردنی هیچ رەخنەیەکم بووبێت، ئەوان دوو سێ وشەیان لە یەك دوو کتێبی پێشووی مندا دەرهێناوە و ئیددیعای ئەوەیان کردووە کە گوایا من هێرش دەکەمە سەر سیستەمی حکوومەت و کوودەتاکەی.

ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: ئایا لێدوانی من لە بابەتێکی زانستیی ئەوتۆ کە شایانی هیچ سزایەکی تەنانەت یەکجار بچووکیش نیە ئەوە دەهێنێت کە سەرانسەری وڵات سەرقاڵ بکرێت و ترس و بیم لە هەموو لایەکدا بڵاو بکرێتەوە؟

دەرکردنی سزایەکی سووکەڵە و بێ نرخ لەسەر من و چەند کەسێکی کەمی هاوڕێیانم و.. بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی توندوتیژ و چڕوپڕ لە دژمان لە هەموو لایەکی وڵاتدا و.. نانەوەی کەش و هەوای ترس و تۆقاندن لەناو خەڵکیدا بە نیازی دوور خستنەوەیان لێمان و بێزاندمان لە بەرچاویاندا و.. هێنانی هێزێکی گەورە لە لایەن

(٢) سەردەمی سەربەستی بە یەکەم ماوەی حوکمی ئیتیحادیەکان دەوترێت لە دوای لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید. ئەو قۆناغەش بەم ناوە ناسراوە، دەنا لە راستیدا ئیتیحادیەکان لەو ماوەیەدا سیستەمێکی حیزبیی دیکتاتۆریان دامەزراند. (وەرگێر)

"شوکری قایا"وە بۆ شاری "ئیسپارتە" بۆ ئەنجامدانی کارێك کە تەنانەت یەك دانە سەرباز دەتوانێت ئەنجامی بدات، کە دەستگیرکردن و بەند کردنی منە و.. سەردانی "عیصمەت ئینۆنۆ"ی سەرۆك وەزیران بۆ پارێزگاکانی خۆرهەڵات بە هەمان بۆنەوە و.. ڕی نەدان بە قسەکردنی من بۆ ماوەی دوو مانگ و.. بوار نەدان بە هیچ کەسێك کە هەواڵم بپرسێت و سڵاوێکم لێ بکات، لە کاتێکدا کە من لەم غەریبییەمدا کەسێکی تەنها و بێ هاودەمم..

هەموو ئەمانە ئاماژە بۆ باروذۆخێکی هێندە نامۆ و نابەجێ دەکەن کە هیچ داناییەکی تێدا نییە و شایانی شان و شکۆی هیچ حکوومەتێك نییە لە دنیادا، چ جای حکوومەتی کۆماری کە دەبوو چاودێریی یاسای بکردایە و ڕێزی لێ بگرتایە، لە کاتێکدا کە وشەی "حکوومەت" ئەوە دەگەیەنێت کارەکان بە حیکمەت و دانایی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت!

من دەمەوێ لە چوارچێوەی یاسادا پارێزگاری لە مافەکانم بکرێت. هەرکەسێکیش پێچەوانەی یاسا ڕەفتار دەنوێنێت و هەر بە ناوی یاساوە یاسا پێشێل دەکات من بە تاوانبار ناوزەدی دەکەم. بێ گومان یاساکانی حکوومەتی کۆماری دەست بە ڕووی کردارەکانی ئەو تاوانبارانەوە دەنێت و، هیوادارم مافە زەوتکراوەکانم پێ بدرێتەوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

**تێبینی:**

مەکتووبی شازدەهەمی کتێبی "مەکتووبات" و پاشکۆکەی بە بەرگری دادەنرێت لە مامۆستا نوورسی و لە پەیامەکانی نوور. هەر لەبەر ئەوەشە کە مامۆستا نوورسی لێرەدا و لە نێوان ئەم تیشکی چواردەهەمەدا دایناوەتەوە. هەر خوێنەرێکی بەڕێز حەز بە خوێندنەوەی دەکات با بفەرموێ لە شوێنی ناوبراو لە کتێبی "مەکتووبات"دا سەیری بکات. (وەرگێر)

* * *

# چەند نامەیەك لە بەندیخانەوە

باسمه سبحانه
السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

سێ ڕووناکیی دڵدەرەوەم دی، وا لە سێ خاڵدا ڕوونیان دەکەمەوە بۆ ئەوانەی کە دووچاری بەندیخانە بوون و ئەوانەی چاودێرییان دەکەن و ئەوانەش کە لە ئیش و کار و گوزەرانیاندا یارمەتییان دەدەن:

**خاڵی یەکەم:**

دەکرێ و دەگونجێ هەموو ڕۆژێکی ئەو تەمەنەی لە بەندیخانەدا بەسەر دەبرێت، پاداشتی پەرستنی دە دانە ڕۆژ دەستی مرۆڤ بخات و، ئەو سەعاتانەش کە لە ئەنجامدا لەناو دەچن، دەگونجێ بکرێن بە چەندین سەعاتی نەمر و هەتاهەتایی. بگرە دەگونجێ بردنەسەری چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا، بکرێت بەهۆی ڕزگاربوون لە ملیۆنەها ساڵی بەندیخانەی هەمیشەیی.

مەرجی ئەم قازانجە مەزنەی ئیمانداران، بەجێهێنانی فەرزەکان و پەشیمان بوونەوەیە لە بەردەم خوای گەورەدا لەو تاوان و گوناهانەی گەیاندوویانەتە بەندیخانە و، شوکرانە بژێری و ئارامگرتنە تەنها لەبەر خوای گەورە. سەرەڕای ئەوەی کە بەندیخانە خۆیشی دەستی مرۆڤ لە گەلێ گوناه دەگێڕێتەوە.

**خاڵی دووەم:**

نەمانی ئازار لەزەتە و، نەمانی لەزەتیش ئازارە.

بەڵێ، هەرکەسێك بیر لە ڕۆژانی خۆش گوزەرانیی ژیانی بکاتەوە، ئەوا لە گیانی خۆیدا هەست بە خەم و خەفەت دەکات بۆ نەمانیان، بە چەشنێ کە وشەی ئاخ و داخی حەسرەت و پەژارە لە زمانی دەردەچێت. بەڵام ئەگەر بیر لە ڕۆژگارانی بەڵا و موسیبەتی بکاتەوە، ئەوا لە دڵ و گیانی خۆیدا هەست بە خۆشی و شادیی نەمانیان دەکات و،

زمانیشی بە وتنی: "الحمد لله" و دەربڕینی شوکرانەبژێریی خواوەند، ئەو خۆشی‌یە دەردەبڕێت، چونکە بەڵا و گیروگرفتەکانی ئەو ڕۆژانە ڕۆشتن و پاداشتیان پاشەکەوت کرد. ئیتر ئەو مرۆڤە دڵی بەمە دەکرێتەوە و بۆ خۆی دەحەوێتەوە.

واتە: ئازارێکی کاتیی یەك سەعات، تام و لەزەتێکی مەعنەوی لە گیاندا بەجێ دەهێڵێت.. بە پێچەوانەشەوە لەزەتێکی کاتیی تەنها یەك سەعات ئازارێکی مەعنەوی لە گیاندا بەجێ‌دەهێڵێت!

جا مادەم "ڕاستی" بەم جۆرەیە و، مادەم سەعاتەکانی بەڵا و موسیبەتیش، کە لەگەڵ ئازارەکانیاندا ڕۆشتن و بەسەرچوون، وەکو ئەوەوان کە هەر نەبوو بێتن.. مادەم ڕۆژگارانی بەڵا و موسیبەتی ئایندەش هێشتا نەهاتوون، کەواتە ئەوانیش وەك "نەبوو" وان. خۆ دیارە شتی "نەبوو"یش ئازاری نی‌یە..

مادەم وایە.. ئەوا دەربڕینی بێ‌ئارامی و ترس و بیم لە ئازارەکانی ڕابوردوو و ئەوانەی ئایندەش کە هێشتا نەهاتوون و هەموویان لە حوکمی "نەبوو"دان، بە گێلی و نەفامی دادەنرێت.

هەروەها سکاڵا کردن لە دەست خوای گەورە و، موحاسەبە نەکردنی دەروونی بەدخوازی پڕقسوور و، کات بەسەربردن بە حەسرەت و هەنسکدان و خەم هەڵڕشتن، هەموو ئەمانە، ئەوپەڕی نەفامین. ئایا ئەو کەسەی کە ئەمە حاڵیەتی لەوە نەفامتر نی‌یە کە لە ترسی برسێتی و تینوێتیی ڕۆژانی ئایندەی، هەر لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارە، خەریکی خواردن و خواردنەوە بێت؟

بەڵێ، ئەگەر مرۆڤ هێزی ئارامگرتنی خۆی بە ڕاست و چەپدا - واتە بە ڕابوردوو و ئایندەدا - بڵاو نەکاتەوە و، ئاراستەی تەنها ئەو ڕۆژەی بکات کە تیایدایە، ئەوا تەنها ئەو هێزەی سەروزیادە بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەی هەموو تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانی.

تەنانەت من دەڵێم و - سکاڵاش ناکەم - ئەو سەختڵەت کردنە ماددی و مەعنەوی‌یانەی کە لەم قوتابخانە یوسفی‌یە سێ‌هەمەدا[1] و لەماوەی چەند ڕۆژێکدا هاتنە ڕێم، بە درێژایی ژیانم شتی وام نەدیوە، بە تایبەت مەحرووم کردنم لە خزمەتگوزاریی نوور، لەکاتێکدا کە چەندین نەخۆشی سەری تێ کردووم..

(١) مەبەست بەندیخانەی شاری (ئافیوون)ە کە ساڵی ١٩٤٨ز مامۆستا نوورسی و قوتابیانی نووری تێدا بەند کران. (وەرگێڕ)

جا لەو کاتەدا کـە دڵ و گیـانم بەدەست ئـەم هـەموو تـەنگی و نائومێدی‌یـەوە پێکـەوە دەگوشران، چاودێریی خوای گەورە ئەو ڕاستی‌یەی پێشووی بە هاناوە ناردم. ئیتر دڵم بە تەواوی کرایەوە و ئەو دڵتەنگی و سەختڵەتی‌یانەم نەمان و بە ئازاری بەندیخانە و نەخۆشـی ڕازی بووم. چونکە هەر کەسێك وەك من لە لێواری گۆڕەکەیدا بێت، گەلێ قازانجیەتی یەك سەعاتی تەمەنی – کە دەگونجێ بە بێ ئاگایی لێی بڕوات – بە دە سەعات پەرستن بـۆ بژمێررێت.

ئیتر شوکرانەیەکی زۆرم لەسەر ئەمە پێشکەشی خوای گەورە کرد.

**خاڵی سێهەم:**

یارمەتیدانی پڕ سۆز و بەشەفەقەتی بەندکراوان و، بەدەست‌گەیاندنی ڕزق و ڕۆزی‌یان کە پێویستیان پێیەتی و، چارەسەر کردنی زامە مەعنەوی‌یەکانیان بە مەڵهەمی دڵنـەوایی و دڵدانەوە.. هەر یـەك لەمانـە هەرچـەندە کـارێکی ئاسـانە، بـەڵام پاداشتی گەلـێ مـەزن و زۆری تێدایە، چونکە بەدەست‌گەیاندنی ئەو ڕزق و ڕۆزی‌یەی کە لە دەرەوە بۆیـان دێـت لە حوکمی "سەدەقە"دایە و لە تۆماری کردەوە چاکەکانی ئەو کەسەدا دەنووسـرێت کـە ئەو ڕۆزی‌یەی بە دەستی ئەو بەندکراوە گەیاندووە، چ ئەوانەی لـە دەرەوە بۆیـان هێنـاوە، چ پاسـەوانەکان و چ ئـەو چاودێرانـەش کـە لـەم کـارەدا یارمـەتی‌یان دەدەن. بـە تایبـەت ئەگـەر بەندکراوەکـە پیر و بەتەمەن یان نەخۆش یان ئاوارە و دوور لـە شـاری خـۆی یـان هەژار و نەدارا بێت، ئەوا پاداشتی ئەو "سەدەقە مەعنەوی‌یە" گەلـێ زیاتر دەبێت.

مەرجی ئەم قازانجە: ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکانە، بۆ ئەوەی ئەم خزمەتگوزاری‌یە تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، لەگەڵ مەرجێکی تردا کە بریتی‌یە لەوەی ئەو خزمەتگوزاری‌یە هاوڕێی شـەفەقەت و بـەزەیی و سـۆز و میـهرەبانی و خۆشەویستی بێـت و هیـچ منـەتێکی ئاوێتە نەبێت.

* * *

باسمه سبحانه

بەندکراوان گەلـێ پێویستیان بەو دڵنەوایی‌یە ڕاستەقینە و دڵدانـەوە پـاك و بێگـەردەیـە کە لە "پەیامەکانی نوور"دا هەن. بە تایبەت ئەو لاوانەی کە بە دەستی هـەوا و ئـارەزووی خۆیان زلـلـەی تـەمێ کـردن و سەرزەنشتیان چەشتووە و، هـەرەتی جوانیـی تەمـەنیان لـە

بەندیخانەکاندا بەسەر بردووە، ئەوانە چەندە پێویستیان بە "نان"ە هێندەش پێویستیان بە "نوور"ە.

دەماری لاو هەردەم بۆ هەوا و ئارەزووی هەستەکانی لێدەدات و بەدەم ئەو هەستانەوە زیاتر دەڕوات و پتر گوێڕایەڵیان دەبێت تاکو عەقڵ و ژیری! ئاشکرایشە هەوا و ئارەزوو لە دەمی قوڵپدان و هەڵچوونیدا سەنگی درەمێك لەزەتی ئێستای بەلاوە باشترە لەچاو سەنگی یەك "تەن" تام و لەزەتی داهاتوو. دەبینیت بەهۆی هاندەری هەوا و ئارەزووی تام و لەزەتی یەك خولەکی "تۆڵە سەندنەوە" لاوێك دەچێت مرۆڤێکی بێ تاوان دەکوژێت و، لە ئەنجامی ئەم کارەشیدا هەشت هەزار کاتژمێری تەمەنی بە ئەشکەنجەی بەندیخانەوە دەتلێتەوە.. هەروەها "لاو" جڵەوی خۆی بۆ تام و لەزەتی سەعاتێکی ڕابواردن لە "مەسەلەی شەرەف"دا شل دەکات، پاشان لە ئەنجامی ئەمەدا ئازاری هەزاران ڕۆژی بەندیخانە و ترسان لە دوژمنەکەی دەچێژێت.

بەم جۆرە، بەختەوەریی تەمەنی ئەم لاوە لە نێوان دڵەتەپێ و نیگەرانی و ترس و لەرز و ئازاردا بە زایە دەچێت.

بەم جۆرە، لاوانی هەژار دەکەونە ناو چەندین گیروگرفتی سەختی زۆری وەك ئەمانەی باس کران. بە ڕادەیەك کە خۆشترین و شیرینترین ڕۆژگارانی ژیانیان لێ دەبێت بە سەختترین و تاڵترین و، دەکەونە بارێکی هێندە ناهەموارەوە کە مرۆڤ بەزەیی پێیاندا بێتەوە، بە تایبەت دوای ئەوەی کە چەندین گێژەڵووکەی لار و چەوت لە باکوورەوە هەڵیان کرد و چەندەها ئاشووبی کاولکاریان لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەم چەرخەی ئێستامان هێنا، چونکە شەرەف و نامووسی ئافرەتان و کچانی جوان بۆ هەوا و ئارەزووی دواڕۆژ نەبینی لاوان موباح دەکەن و، بۆ تێکەڵیی بێئابڕوانە هانیان دەدەن. سەرەڕای ئەوەش، سەروەت و سامانی دەوڵەمەندان بۆ چەند هەژارێکی هەرزە و نەفام بە حەڵاڵ دادەنێن.

جەستەی هەموو مرۆڤایەتی لە بەردەم ئەم هەموو تاوانە ناڕەوایانەی لە دژی دەکرێن، تەزووی پێدا دێت!

لاوانی موسڵمانی ئەم چەرخە پڕ لە تەنگانە و دەردیسەرییە، دەبێ چاکی لێبڕان بکەن بە لادا و قۆڵی مەردانەی لێ هەڵبماڵن، تاکو ئەم هەڵوێستە ڕزگار بکەن و، شمشێرە ئەڵماسییەکانی "پەیامەکانی نوور" و بەڵگە گومانبڕەکانی (کە لە پەیامی: بەری درەختی ئیمان و، ڕابەری لاوان و، هاوچەشنیاندان) بە دەستەوە بگرن و بەرگری

لە خۆیان بکەن و بەرەنگاری ئەو هێرشە ڕامالەرە بینەوە کە لە دوو قۆڵەوە دەکرێتە سەریان. دەنا پاشەڕۆژی لاوانی جیهان و بەختەوەریی ژیانیان تیادەچێت و، خۆش گوزەرانیی دوارۆژیشیان نامێنێت و، هەموو ئەمانەیان لێ دەبێت بە ئەشکەنجە و ئازار، چونکە لە ئەنجامی زیادەڕەوی و بەدکرداری‌یاندا لە خەستەخانەکاندا دەکەون و، بەهۆی هەڵەشەیی و سەرەڕۆیی‌یشەوە لە بەندیخانەکان توند دەکرێن و، ڕۆژگارانی پیریشیان بە گریانی بەکوڵ و هەنسك و پەژارەی پڕ لە حەسرەت و خەم لێ دەگوزەرێت!

بەڵام ئەگەر لاو لە ڕێی پەروەردەی قورئان و بەهۆی ڕاستی‌یەکانی پەیامەکانی نوورەوە خۆی پاراست، ئەوا دەبێ بە: لاوێکی ڕابەری ڕاستەقینە و، مرۆڤێکی کامڵ و، موسڵمانێکی بە ڕاستی بەختەوەر و، پادشای هەموو بوونەوەران.

بەڵێ، ئەگەر لاو تەنها یەك سەعاتی بیست و چوار سەعاتەکەی ڕۆژگارانی بەندیخانەی لە بەجێهێنانی فەرزەکاندا بەسەر ببات و لەو تاوان و گوناهانەی گەیاندوویانەتە بەندیخانە پەشیمان بێتەوە و، وەك بەندیخانە لەو خراپکاری‌یانەی دوور خستووەتەوە، بۆ خۆیشی دوور بکەوێتەوە لێیان، ئەوا چەندین سوودی زۆری دەست دەکەوێت بۆ ژیان و دوارۆژی خۆی و بۆ وڵات و نەتەوە و کەسوکار و خۆشەویستانیشی، سەرەڕای ئەوەش کە لاوی‌یەکی هەمیشەیی لە بەهەشتدا دەست دەکەوێت لە بریی لاویی کاتیی ئەم دنیای کە پازدە ساڵ ناخایەنێت.

هەموو کتێبە ئاسمانی‌یەکان، لە پێش هەموویانەوە قورئانی پیرۆز، بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە، مژدە و هەواڵی ئەم ڕاستی‌یەمان دەدەنێ.

بەڵێ، ئەگەر لاو بە گرتنەبەری ڕێی ڕاست و ئەنجامدانی پەرستنەکان، شوکرانەبژێریی نیعمەتی "لاوی" بکات کە سەردەمێکی خۆش و جوانە، ئەوا ئەو نیعمەتی لاوی‌یەی کە پێی بەخشراوە لە زیادبووندا دەبێت و کەم ناکات و دەمێنێت و تام و جوانی‌یەکەشی پتر زیاد دەکات. دەنا لاوی‌یەکەی لێ دەبێت بە بەڵا و گیروگرفتێکی بەسوێ و ئازار و، لەناو خەم و پەژارە و تەنگانەی ژیاندا ون دەبێت تا بە تەواوی دەڕوات و نامێنێت و، بەم پێیە سەردەمی لاوی‌یەکەی دەبێت بە ئەرکێکی قورس بەسەر شانی خۆی و کەسوکار و وڵات و نەتەوەکەیەوە بە گشتی.

ئنجا هەموو سەعاتێکی بەندیی ئەو بەندکراوەی بە ناڕەوا و ستەم بڕیاری بەندکردنی لەسەر دەرچووە، وەك پەرستنی ماوەی ڕۆژێکی تەواو وایە، بە مەرجێ فەرزەکانی ئەستۆی بەجێ‌بهێنێت و، بەندیخانە - بۆ ئەو - وەك مەڵبەندێکی گۆشەگیریی لێ دێت،

بە چەشنی زاهید و خواپەرستەكانی پێشین كە دەڕۆشتنە ناو ئەشكەوتەكانەوە و بۆ خواپەرستی لێ‌دەبڕان. واتە دەكرێ ئەو بەندكراوە وەكو ئەو زاهیدانە وابێت.

هەروەها ئەگەر ئەو بەندكراوە كەسێكی هەژار و نەخۆش و پیر بێت و، دڵیشی پەیوەستی ڕاستی‌یەكانی ئیمان بێت و، بۆ لای خوای گەورەی گەڕابێتەوە و، فەرزەكانی جێ‌بەجێ بكات، ئەوا هەموو سەعاتێكی بەندیخانەی لە حوكمی بیست سەعات پەرستشدا دەبێت و، بەندیخانە بۆ ئەو دەبێت بە قوتابخانەیەكی ئامۆژگاری و پەروەردەیی و مەڵبەندی خۆشویستنی یەكتری. چونكە ڕۆژگارانی ژیانی لەوێ لەگەڵ هاوەڵانیدا بە حەوانەوە دەباتە سەر. ئەمە سەرەڕای حەوانەوەی خۆی و سەرباری ئەوەش كە بە چاوی میهرەبانی‌یەوە خەڵكی بۆی دەڕوانن. تەنانەت لەوانەیە مانەوەی بەندیخانەی گەلێ پێ باشتر بێت لەو سەربەستی‌یەی دەرەوە كە لە هەموو لایەكەوە تاوان و گوناهی بەسەردا دەبارێت و، دڵی بەو وانەی ئامۆژگاری و پەروەردەكاری‌یانەی ناو بەندیخانە دەكرێتەوە..

خۆ كاتێك كە بەندیخانەش بەجێ‌دەهێڵێت وەكو پیاوكوژ و تۆڵەسێنەر ناڕواتە دەرەوە، بەڵكو ئەو كاتە پیاوێكی خواناسی باشی تۆبەكاری لێ دەردەچێت و، دەبێت بە ئەندامێكی سوودبەخشی ناو وڵات و هاووڵاتی‌یان، بە ڕادەیەك كە هەندێك لەو كەسانەی لە بەندیخانەكەی دەنیزلی لەگەڵ ئێمەدا بەند كرابوون، دوای ئەوەی لە ماوەیەكی گەلێ كورت و كەم خایەندا چەندین دەرس و ئامۆژگاری‌یان لە بارەی ئیمان و ڕەوشت بەرزی‌یەوە لە "پەیامەكانی نوور" وەرگرت، وتیان:

(ئەگەر بەندكراوان لە ماوەی پێنج حەفتەدا دەرس و ئامۆژگاری لە پەیامەكانی نوور وەربگرن، گەلێ باشترە بۆ ڕاستكردنەوەی هەڵسوكەوتیان، تاكو ئەوەی پازدە ساڵ بخرێنە بەندیخانەوە)!

جا مادەم مردن لەناوناچێت و كاتەكەشی پەردەی غەیبی بەسەردا دراوەتەوە و هەموو دەمێك دەگونجێ ڕووبەڕووی بینەوە و.. دەرگای گۆڕیش داناخرێت و، كاروانەكانی مرۆڤایەتی یەك لە دوای یەك لە پشت ئاسۆی گۆڕستانەوە ئاوا دەبن و.. مردن خۆیشی بۆ ئیمانداران وەك نامەی تەسریح و ڕزگار كردن وایە لە ئیعدامی هەمیشەیی – وەك بە ڕاستیی قورئان ئەمە ڕوون كراوەتەوە – هەروەها بۆ گومڕا نەفامەكانیش ئیعدامێكی

هەتاهەتاییـیە، وەك خۆیـان وای دەبینن، چونکە مردن جودایی‌یـەکی هەمیشەیی‌یە لـە هەموو کەسوکار و خۆشەویستانیان تەنانەت لە هەموو بوونەوەرانیش بە گشتی..

مادەم ئەمـە وایـە.. ئەوا بێ هیـچ گومـانێك بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە: شوکرانەی پەروەردگاری بکـات و لـە بەندیخانەکەیدا ئارامگر و چاوەڕوانی پاداشتی خوای گەورە بێت و، دەرفەت لە کاتەکانی ئەوێی ببینێت و بە جوانترین و باشترین شێوە بەکاریان بـهێنێت و، بەپێی ڕێنمـایی پەیامەکانی نـوور بـۆ خزمـەتی ئیمـان و قورئـان تێ‌بکۆشێت.

ئەی مرۆڤی تووشبووی لەزەت و چێژی دنیا!

لـە مـاوەی حەفتا و پێـنج سـاڵی تەمەنمدا و، بـە هـەزاران تاقیکردنـەوەی ژیـانم و ئـەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتوون، دڵنیا بووم لەوەی کە:

تام و چێژی ڕاسـتەقینە، کە ئازاری ئاوێتە نەبێت و، خۆشی‌یەك خـەم و پـەژارە لێڵـی نەکات و بەختەوەریی ڕاستەقینە و بێگەرد و تەواو تەنها بـە "ئیمـان" دەسـت دەکـەوێت و لەناو بازنەی "ڕاستی‌یەکانی ئیمان"دایە. دەنا بێ ئەم ئیمانە، تەنـها یـەك دانـە لـەزەتی دنیـا چەندەها ئازاری زۆر و زەبەندی تێدایە، چونکـە کاتێ کـە دنیـا لـەزەتێکی بـە ئەندازەی دەنکە ترێیەکت پێشـکەش دەکـات، دە دانـە زللـەی تونـدی بەسۆیشـت لـێ دەدات و، بەمەش تام و لەزەتی ژیانت لـێ دەسێنێتەوە.

ئەی ئەو بێچارانەی کە دووچاری بەڵا و گرفتاری موسیبەتی بەندیخانە بوون!

مادەم دنیاکەتان لە گریان و خەمباریدایە و، ژیانیشتان بە ئازار و بەڵا و موسیبەت لێڵ بووە، ئەوا تا دەتوانن تێ‌بکۆشن دواڕۆژیشتان بـە گریـان و پـەژارەوە لـێ نەگوزەرێت و ژیانی هەمیشەییتان بەختەوەر و شیرین بێت.

کەواتە برایـانم! ئەم هەلـە لەدەسـت مـەدەن، چونکـە هـەروەك دەکرێـت ئێشـکگرتنی ماوەی یەك سەعات بەرامبەر سوپای دوژمن لـە بـارودۆخێکی دژواردا، بـە خواپەرسـتیی مـاوەی یـەك سـاڵ بژمـێررێت، ئـەوا هـەموو سـەعاتە سـەختەکانی ژیـانی بەندیخانـەتان، لەودنیادا بە چەندەها سەعاتی خواپەرستی بۆ دادەنرێت، گـەر فـەرزەکانتان بەجێ‌بـهێنن. دیارە ئەو کاتەش دەردی‌سەری و بارە ناخۆشەکانتان بۆ دەبێت بە میهرەبانی و لێبوردن.

* * *

سەعیدی نوورسی

برایانی ئازیز و بەوەفام!

سەرەخۆشیتان ئاراستە ناکەم، بەڵکو پیرۆزباییتان لێ دەکەم. چونکە:

مادەم قەدەری خوای گەورە لەبەر خواستی حیکمەتێکی خۆی ئێمەی بەرەو ئەم قوتابخانە یوسفی‌یە سێ‌هەمە دایەبەر و، بەشێکی ڕۆزی‌یەکانمان لێرە دەرخوارد دەدات و، ڕۆزی‌یەکانمان ئێمەی بۆ ئێرە بانگ کردووە..

مادەم ئەزموونە بێ‌گومانەکانمان - تا ئێستا - تێی گەیاندووین کە چاودێریی خوای گەورە نەرمونیانە لەگەڵماندا و، بەهرەمەندی نهێنیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿**وعسى أن تكرهوا شيئاً وهو خيرٌ لكم**﴾ی (البقرة:٢١٦) کردووین..

مادەم برا تازەکانمان لەم قوتابخانە یوسفی‌یەدا لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستیان بەو دڵدانەوەیە هەیە کە پەیامەکانی نوور دەیبەخشن.

مادەم ئەو کەسانەی کە لە فەرمانگەکانی "داد"دا کار دەکەن زیاتر لە کارمەندەکانی تر پێویستیان بەو دەستوورە بەرزانە هەیە کە پەیامەکانی نوور لە خۆیان گرتوون..

مادەم بەشەکانی پەیامەکانی نوور لە دەرەوەی بەندیخانە و بە ڕادەیەکی یەکجار زۆر و لە بریی ئێوە ئەرکەکانی سەرشانیان ئەنجام دەدەن و فتووحاتیان ڕاناوەستێت..

مادەم هەموو سەعاتێکی فانیی ژیانی ناو ئەم بەندیخانەیە وەك چەندین سەعاتی پەرستشی باقی و هەمیشەیی وایە..

ئەوا بەپێی ئەم خاڵانە، پێویستە خۆمان بە کاڵای ئارامی و دامەزراوی برازێنینەوە و، بە دڵخۆشی‌یەوە سوپاسی بەدیهێنەرمان بکەین بەرامبەر بەم ڕووداوە..

وا هەموو نامە بچووکە دڵدەرەوەکانتان بۆ دەنێرمەوە کە لە بەندیخانەی "دەنیزلی"دا نووسیمانن.

لە خوا داواکارین کە ئەو برگانەی پڕن لە ڕاستی‌یەکان، دڵنەوایی بە ئێوەش بدات..

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

**یەکەم:** سوپاسی نەبڕاوە و بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە کە چەند پێشڕەوێکی مەعنەوی لە موفتی و واعیز و پێشنوێژ و زانایان کە - کە خاوەنی ڕاستەقینەی

پەیامەکانی نـوورن – لـە مـەیداندا دەرکـەوتن، چونکـە تـا ئێـستا هـەر قوتابیـان و لاوان و مامۆستایانی قوتابخانەکان قوتابیی بەغیرەتی قوتابخانەی نوور بوون..

بۆیە هەزار پیرۆزبایی و ئافـەرینتان لـێ بێـت ئـەی ئەدهـەم و ئیـبراهیم و عـەلی و عوسمان! بە ڕاستی ڕووی ئەهلی قوتابخانە شەرعی‌یەکانتان سپی کـرد و، دوودڵی‌یەکـەی ئەوانتان گۆڕی بە ئازایەتی و هەنگاونان بەرەو پێش.

**دووهەم**: نابێ ئەوانەی کە لە ئەنجامی چـالاکی و تووڕەبوونـی بێگـەردیان بـۆ خـوای گـەورە ئـەو ڕووداوەیـان هێنایـە گـۆڕێ، خەفـەت بخـۆن و پەشـیمان ببنـەوە، چونکـە بەندیخانەی "دەنیزلی" لە ڕووی ئاکام و ئەنجامەکانەوە پیت و بەرەکەتی بەوانە بەخشی کە لە کارەکانیاندا حەزەریان نەکرد، لەبەر ئـەوەی مـاندوو بوونـی کـەمیان هاتـەڕێ، بـەڵام سوودێکی مەعنەویی یەکجار گەورەیان دەست کەوت. لە خوای گەورە داواکارین کـە ئەم قوتابخانەی یووسفی‌یە سێ‌هەمە کەمتر نەبێت لەوەی پێش خۆی.

**سێ‌هەم**: دەبێ لەسەر ئـەم بارودۆخـە دژوارەی بەندیخانـەمان سوپاسـی خـوای گـەورە بکەین، لەبەر ئەوەی بەپێی سەختی و گیروگرفتەکان پاداشتەکانمان زیاد دەبن..

هەروەك دەبێ لە هـەمان کـاتدا بـۆ ئـەنجامدانی ئـەرکی سەرشـانمان هـەوڵ بدەیـن، کـە خزمـەت کردنـی ئیمانـە بەوپـەڕی ئیخلاسـەوە. سـەرکەوتنیش لـە کارەکانمـاندا و بەدەستهێنانی ئاکامی باش بە دەستی خوای گەورەیە و ئێمە خۆمـانی تێـدا هـەڵناقورتێنین، بەڵکو بەرامبـەر بـەم شـوێنانەی گۆشـەگیریمان هـەردەم ئـارام دەگریـن و سوپاسـی خـوای گەورە دەکەین و دەڵێین: (خيرُ الأمورِ أحمَزُها).

دەبێ ئەوەش بزانین کە ئـەم ڕووداوە نیشـانەی قبـووڵ بوونـی کارەکانمانـە و، بەڵگـە و نیشانەشە لەسەر ئەوەی کە لەم جیهادە خاوێنەماندا تاقیکردنەوەمان کۆتایی پێ هێناوە.

* * *

بۆ بەڕێز بەڕێوەبەری بەندیخانە و دەستەی کارگێڕی!

داواکاری‌یەکی سادەم هەیە کە بە ڕواڵەت هیچ گرنگی‌یەکی نی‌یـە، بـەڵام سـەبارەت بە من زۆر گرنگە:

ئـەم ژیانـەم کـە لـە زینـدانی تـەنیایی و دامـاڵینی تـەواوەتیم لـە خـەڵکی بەسـەرچووە و تەمەنیشم کە خۆی لە حەفتا و پێنج ساڵ داوە، هێندە جەسـتەی منیـان لاواز کـردووە کـە

توانای کوتان و دەرزی لێدانی لە دژی نەخۆشی‌یەکان نەماوە. پێش ماوەیەکی یەکجار زۆر دەرزیی کوتانیان لێ دام، کەچی برینەکەی بیست ساڵی خایاند، بە ڕادەیەك کە ئەو برینە سەبارەت بە من وەك ژەهرێکی هەمیشە و بەردەوامی لێ هات و، دوو دکتۆرە هاوڕێکەی "ئەمیرداغ"یش ئاگاداری ئەمەن. ئنجا چوار ساڵ لەمەوبەر هاودەم لەگەڵ بەندکراوانی بەندیخانەی "دەنیزلی"دا دەرزیی کوتانیان لێ دام و لە ئەنجامی ئەو کوتانەدا بیست ڕۆژ لە جێگادا کەوتم، لە کاتێکدا کە هیچ زیانێکی بە کەسیان نەگەیاند و، پارێزگاری و چاودێریی خوای گەورەم سەروزیاد بوو، چونکە ناچاری ئەوە نەبووم کە بڕۆم بۆ نەخۆشخانە..

بەو واتایەی کە جەستەم بە هیچ جۆرێك توانای کوتان و دەرزی لێدانی نەماوە. جگە لەوەی کە بەهانەی زۆر بەهێزیشم بە دەستەوەیە، چونکە تەمەنم گەیشتووەتە حەفتا و پێنج ساڵ و جەستەشم ئەوەندە لاواز بووە کە لەوانەیە توانای لوقاحی منالێکی تەمەن دە ساڵیشی نەمابێت. وێڕای ئەوەش کە من ژیانم بە تەنیایی و دابڕانی تەواوەتی لە خەڵکی لێ دەگوزەرێت و تێکەڵیی کەس ناکەم.

دوو مانگ پێش ئێستاش پارێزگار دوو پزیشکی نارد بۆ "ئەمیرداغ" و پشکنینێکی تەواویان لەسەر کردم، لە ئەنجامدا هیچ نەخۆشی‌یەکی پەرەسێنیان تێدا نەبینیم و، جگە لە لاوازیی زۆر و کۆڵنجی پشتم شتی تریان لە مندا شك نەبرد.

جا ئەم حاڵەتەم هەرگیز توانای کوتانم نادات. بۆیە تکایەکی گەرمتان لێ دەکەم کە ڕەوانەی نەخۆشخانەم مەکەن و مەخەنە ژێر زەبر و زۆر و خۆسەپاندنی پزیشکەکان و ئەوانەی کە نایانناسم، چونکە ناتوانم لە بارودۆخی لەو جۆرەدا بژێمەوە و لە هەموو ژیانیشمدا شتی وام لە تواناداا نەبووە، بە تایبەت لەم بیست ساڵەی دواییدا کە بە دابڕانی تەواوەتی لە خەڵکی ژیاوم.

خۆ هەرچەندە لەم ماوەیەدا حەوانەوەی خۆم لەوەدا دەبینم کە بڕۆمە ناو گۆڕەکەمەوە، بەڵام ئێستا مانەوەم لە بەندیخانەدا لە گۆڕ پێ باشترە، لەبەر ئەو مامەڵە مرۆییانەی لەم بەندیخانەیەدا هەستم پێ کردووە و، بۆ ئەوەش کە هەست و نەستی دەستەی کارگێڕیی بەندیخانە زامدار نەکەم، سەرباری بڵاوکردنەوەی دڵدانەوە و دڵنەواییش لە دڵی بەندکراواندا.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

**یەکەم:**

ئێوە - ئەی برایانی بەڕێزم!- هەرگیز بەو سووکایەتی و ئازاردانە خەم مەخۆن کە بە تایبەتی ئاراستەی کەسی منی دەکەن. چونکە نـاتوانن هیـچ ناتەواوی‌یـەك لـە پەیامـەکانی نووردا بدۆزنەوە، بۆیە زیاتر خۆیان بە کەسی ئاسایی و تەقسیرباری منەوە سەرقاڵ دەکەن. من بۆ خۆم لەم بارە ڕازیم. تەنانەت ئەگەر لە پێناوی سەلامەتیی پەیامەکانی نوور و دەرکەوتنی نرخ و بەهایاندا هەزاران سووکایەتی و ئازار و بەڵا و گیرو گرفتی کەسیم تووش ببێت، بەوپەڕی شانازی‌یەوە شوکری خوای گەورەی لەسەر دەکەم. ئەمەش بەپێی خواستی ئەو وانەیەی کە لە پەیامەکانی نوورەوە فێری بووم.

**دووهەم:**

ئەم دەستدرێژی‌یە بێ پەردە و فراوان و هێرشە سەختە ستەمکارانەیە، ئێستا لە ڕێژەی "بیست"ەوە بۆ ئاستی "یەك" دابەزیوە و سووك و تەنك بووەتەوە. چونکە لە بریی هەزاران کەسی قوتابیانی تایبەتمەندی پەیامەکانی نوور تەنها چەند کەسێکی کەمیان کۆ کردووەتەوە و، لەبریی سەدان هەزار کەسی پەیوەندیدار و بایەخدەر بە پەیامەکانی نوور چەند برایەکی نوێ‌یان جەم کردووە. واتە بە چاودێریی خوای گەورە موسیبەتەکە دابەزیوەتە سووکەڵەترین حاڵەتەکانی.

**سێ‌هەم:**

برایانم! ئێوە بە هیچ جۆرێك نیگەران مەبن. چونکە ئەو پارێزگارەی پێشوو کە پلان و فڕوفێڵی لە دژی ئێمە ساز دەکرد، بە فەزڵی چاودێریی خوای گەورە ڕۆشت و نەما.

لەوانەشە وەزیری ناوخۆ لەبەر دوو هۆ هێرشەکانی سەر ئێمەی تەنك کردبێتەوە: چونکە خەڵکی شارەکەی خۆمە و، باوك و باپیرانیشی بە ڕاستی ديندار بوون.

**چوارەم:**

چەندین ئەزموون و ڕووداوی زۆر، بە ڕادەیەك کە قەناعەت بە مرۆڤ دەبەخشن، ئەوەیان چەسپاند کە لە دەمی گریان و خەمباریی پەیامەکانی نووردا زەویش دەلەرێتەوە و ئاسمانیش فرمێسك هەڵدەڕێژێت! ئەمەمان چەندین جار بە چاوی خۆمان بینیوە و، لە بەردەم دادگاشدا چەسپاندوومانە.

لەو باوەڕەدام کە هاوکات بوونی شادمانیی سەرەتای بەهاری ئەمساڵ لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نووردا بە نهێنی و خەندەی سەرلێویان بەهۆی نووسینەوەیان بە ڕۆنیۆ.. هەروەها هاودەم بوونی توندوتیژیی زستان و تووڕەیی و گریانی بە نیگەرانییەوە لەگەڵ کاتی دەست بەسەردا گرتنی پەیامەکان و پشکنینی زۆر لە هەموو شوێنێکدا و وەستانی چالاکییەکانی ئەو پەیامانە، نیشانەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە پەیامەکانی نوور موعجیزەیەکی یەکجار مەزن و درەخشانی ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزن لەم چەرخەدا دەرکەوتوون، بە ڕادەیەك کە زەوی و ئاسمانیش پەیوەندییان پێیانەوە هەیە.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەمڕۆ کتوپڕ ئەوەم بە دڵدا هات کە لە بریی سەرەخۆشی، پیرۆزبایی پێشکەشی هەموو ئەو بەڕێزانە بکەم کە بە بۆنەی کێشەی پەیامەکانی نوورەوە قەدەری خوای گەورە و ڕۆژییەکەی بەندیخانەیان هێناونی بۆ ئەم قوتابخانە(یووسفییە). چونکە هەموو یەکێکی زۆرینەی ئەوان، لە بریی هەزاران برای بێ تاوانمان هاتووەتە ئەم قوتابخانەیەی کە تا ڕادەیەك لە دەردیسەری و شوبهە و گومانی کەڵەکەبووی ماوەی بیست یان سی تەنانەت سەد ساڵ ڕزگاریان دەکات.

هەروەها بەردەوامیی کار وچالاکیتان لە پێناوی ئیماندا لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە ئەوە دەگەیەنێت کە هەر یەکەتان لە ماوەیەکی کەمدا کارێکی گەورە ئەنجام دەدات، وەك ئەوەی کە هەندێ کەس لە ماوەی دە ساڵدا هێندە کار ڕادەپەڕێنێت کە مەگەر بە سەد ساڵ ئەنجام بدرێت.

هەروەها ئەو کەسانەی کە دێنە ناو ئەم موجاهەدە سەختەوە و.. ئامادەی تاقیکردنەوەی ناو ئەم قوتابخانە یووسفییە نوێیە دەبن و.. هەر لە ڕاستیشدا بەشی خۆیان لە بەروبوومە بەنرخە هەمەکییەکانی وەردەگرن و.. بە ئاسانی بە دیداری ئەو برا دڵسۆزانەیان شاد دەبنەوە کە گەلێ تاسەمەندی چاوپێکەوتنیان و ڕا گۆڕینەوەی باس و توێژینەوەی وانەیەکی بەچێژن لەگەڵ یەکتریدا.. هاودەم لەگەڵ نەمان و لەدەستچوونی کاتەکانی حەوانەوە لەم دنیایەدا.. هەموو ئەو کەسانەی کە بەم چەشنە ماندووبوونە

کەمانە تا ئەم ڕادەیە دەستکەوتی گەورە بە دەست دەهێنن، بە ڕاستی شایانی پیرۆزبایی لێکردنن.

برایانم!

ئەم هێرشە فراوانەی کرایە سەرمان تەنها بۆ ئەوە بوو کە بەربەست دابنێن لە بەردەم فتوحاتی پەیامەکانی نوور و ڕۆشتنیان بۆ ناو دڵی خوێنەرانیان. بەڵام هەر خۆیان هەستیان بەوە کرد کە هەتا دەست بهێننە ڕێی پەیامەکانی نوور ئەو پەیامانە درەخشانتر دەبن و پتر گرنگی بەدەست دەهێنن و بازنەی وانەکانیشیان فراوانتر دەبێت. کەواتە هەرگیز پەیامەکانی نوور شکست ناهێنن. بەڵکو لە ژێر سایەی "سـِـرّاً تَنَوَّرَتْ"دا ڕووناکییەکانیان بڵاو دەکەنەوە. بۆیە ئەم جارە پلانەکەیان گۆڕیوە و، بە ڕواڵەت دەست ناهێننە ڕێی نوورەکان. جا مادەم ئێمە لە ژێر سایەی چاودێریی خوای گەورەداین، ئەوا دەبێ هاوکات لەگەڵ سەبر و ئارامی تەواوەتیدا شوکرانەی زۆر پێشکەشی پەروەردگارمان بکەین.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

کاتی ئەوە هاتووە کە دوو حاڵەتی نامۆی خۆمتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

**یەکەمیان:**

ئەوەم بە دڵدا هێنرا کە: بەرژەوەندی و چاودێرییەکی خوایی لەوەدا هەیە کە لەم بەندیخانەی دابڕانە تەواوەتییەمدا لە خەڵکی، بە ئازادی چاوم بەو برایانەم ناکەوێت کە لە ڕۆحی خۆم زیاتر خۆشم دەوێن. چونکە زۆر لە برایانی قیامەتیم لەوانەی کە پەنجا لیرەی خەرج دەکرد بۆ ئەوەی بێت بۆ ئەمیرداغ بە مەبەستی چاو پێکەوتنێك کە پەنجا خولەك هەندێ جار دە خولەکی دەخایاند، تەنانەت جاری وا هەبوو کە ئەو چاوپێکەوتنەی بۆ نەدەڕەخسا و بە نائومێدی دەگەڕایەوە، زۆر لەوانە بە بیانوویەکی سادە و ئاسایی خۆیان دەهاویشتە ئەم قوتابخانە یوسفییەوە..

خۆ ئەگەر کەم وەختی و باری ڕۆحیم - کە لە گۆشەگیرییەوە سەرچاوەی گرتووە - بواری ئەوەیان پێ بدامایە، ئەوا خزمەتگوزاریی نوور بواری ئەوەی نەدەدا بە تەواوەتی دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو هاوڕێ بەوەفایانەدا ساز بکەم.

**دووهەمیان:**

موجاهیدان لە چەند شوێنێکی بەرەی جەنگدا زانایەکی مەزن و بەڕێزیان بینیبوو کە بەشداری لە جیهاددا دەکات.. دوایی کە ئەم بینینەیان بۆ خۆی باس کردبوو، وتبووی: هەندێ ئەولیا لە شێوەی مندا دەرکەوتوون و لە شوێنی من و لەبریی من چەند کارێکیان ئەنجام داوە تاکو پاداشتم بۆ پاشەکەوت بکەن و لەو لاشەوە ئیماندارا ن سوود لە وانەکانم وەربگرن.

بە هەمان شێوەی ئەمە، منیان لە مزگەوتەکانی شاری "دەنیزلی"دا بینیبوو لەو کاتەدا کە من لە بەندیخانەکەی ئەوێ بووم. تەنانەت ئەمەیان گەیاندبووە لایەنە بەرپرسەکان و بەڕێوەبەری بەندیخانە و پاسەوانەکان. هەندێکیشیان بە نیگەرانییەوە وتبووی: کێ دەرگای بەندیخانەی بۆ دەکاتەوە؟ ئێستا وا هەمان شت لێرەشدا ڕوو دەداتەوە.

بەڵام لە بریی ئەوەی ڕووداوێکی جوزئی بدەنە پاڵ من، پەیامی "مۆری تەسدیقی غەیبی" چەندین کاری دەراسا(خارق) بۆ پەیامەکانی نوور دەچەسپێنێت و ڕوونی دەکاتەوە و، سەد جار بەڵکو هەزار جار لەو ڕووداوە زیاتر متمانە و باوەڕی ئیمانداران بە پەیامەکانی نوور بەدەست دەهێنێت، جگە لەوەش کە قارەمانەکانی نوور لە ڕێی حاڵەتە دەراسا و نووسینە ڕەنگینەکانیانەوە وەرگێراویی پەیامەکانی نوور دەسەلمێنن و پشت ڕاستی دەکەنەوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

خەمی منتان نەبێت، چونکە لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئێوەدا لە یەك تەلاردام خۆم بە بەختەوەر دەزانم و ڕازی و دڵخۆشم.

ئەرکی سەرشانی ئێستامان ناردنی نوسخەیەکی "بەرگری"یەکەیە بۆ "ئیسپارتە" و، ئەگەر لە تواناشدا بوو نووسینەوەی بیست نوسخەیە لە هەمان بەرگری بە ئامێری چاپی دەستیی پیتە کۆنەکان و تازەکان، تاکو پیشانی داواکاری گشتی بدرێت لەوێ و نوسخەیەکیشی لێ بدرێت بە پارێزەرەکەمان و نوسخەیەك بۆ بەڕێوەبەر تاکو بیدات بە

وەکیلی دەعواکەمان و، وەك ئەوەی لە "دەنیزلی"دا ئەنجاممان دا بە هەمان شێوە بە پیتە تازە و کۆنەکان ڕەوانەی لای بەرپرسانی "ئەنقەرە" بکرێت.

ئەگەر لە تواناشدا بوو با پێنج نوسخە بۆ فەرمانگە بەرپرسەکان ئامادە بکرێت، چونکە پەیامە دەست بەسەردا گیراوەکان کە بە پیتی کۆن نووسراون ڕەوانەی ئەو فەرمانگانە کراون، بە تایبەت دیوانی دەستەی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی و دواییش ڕەوانەی ئێرە کراونەتەوە.

پاشان (کاك ئەحمەد)ی وەکیلمان ئاگادار بکەنەوە کە لە دەمی چاپکردنی ئەو بەرگرییەدا بە ئامێری چاپی دەستی بە وردی ئاگاداری ڕاستیی دەستەواژە و ڕستەکان بێت، چونکە ئیفادەکەی من لە هی ئیفادەی کەسی تر ناچێت و گەر هەڵە لە پیتێك تەنانەت هەندێ جار لە نوختەیەکیشدا بکات مەسەلەکە دەگۆڕێت و واتاکەش تێك دەدات. هەروەها – ئەگەر هێشتیان – هەردوو ئامێری چاپە دەستییەکانی پیتی کۆن و نوێ بهێننەوە.

ئەی برایانم! بە هیچ جۆرێك بێزار و نیگەران و نائومێد مەبن، چونکە چاودێریی خوای گەورە بە زوویی فریامان دەکەوێت، بە پێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی:

﴿إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾ (الشرح:٦).

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

پەیامەکانی نوور لە بریی من ڕووبەڕووتانە و لە بەرامبەرتانەوەیە، ئەوەتا زۆر بە باشی ڕێنمایی و فێرکردنی برا تازە و تاسەمەندەکانی وانەی نوور دەکەن. ئەزموون و تاقیکردنەوەکان چەسپاندوویانە کە سەرقاڵ بوون بە پەیامەکانی نوورەوە، ئیتر چ خوێندنەوەیان بێت چ ئەوە بێت بدرێن بە کەسی تر بیانخوێنێتەوە چ نووسینەوەیان بێت، شادمانی بە دڵ و حەوانەوە بە گیان و بەرەکەت بە ڕۆزی و تەندروستی بە جەستە، دەبەخشێت.

خوای گەورە ئێستا یەکێك لە قارەمانانی نووری وەك نیعمەتێك پێ بەخشیون کە "خەسرەو"ە و، پشت بەخوا قوتابخانەی یوسفیش شوێنێکی پیرۆزی لەمەڕ لێکۆڵینەی سەر بە قوتابخانەی "زەهراء" دەبێت. من تا ئێستا "خەسرەو"م دەشاردەوە و دەرم

نەدەخست بۆ ئەهلی دنیا، بەڵام ئەو کۆمەڵە پەیامانەی کە بڵاو بوونەوە هێندە بە ئاشکرایی دەریان خست کە بە جوانی لە بەرچاوی ئەهلی دنیادا دیارە و، هیچ شتێك بۆ شاردنەوە لە ئارادا نەماوە. شتێکم لە خزمەتەکانی ئەو بۆ هەندێ لە برایانی تایبەتمەند باس کرد. خۆ ئەگەر پێویست بکات من و ئەو خودی ئەو "ڕاستی"یە ڕوون دەکەینەوە و هیچ شتێك ناشارینەوە.

بەڵام ئێستا دوو کەسی سەرسەختی ترسناك لە بەرامبەرمانەوەیە و لە نێوان ئەوانەدان کە گوێ لە وانەکانی حەقیقەت ڕادەگرن و، دەرکەوتووە کە لە بەرژەوەندی‌یەکانی ئیلحاد و شیووعیەت کار دەکەن. یەکێکیان لە "ئەمیرداغ" ناسراوە و، ئەوی تریان لێرە ناسراوە. هەردووکیشیان بەوپەڕی فێڵ و پیلانسازی هەوڵی بڵاوکردنەوەی گومان و دوودڵی‌یەکانن لە دژمان، تاکو ترس و بیم بخەنە دڵی کارمەندەکانەوە.

لەبەر ئەوە، دەبێ حەزەری زۆر بکرێت و نیگەرانی دەرنەبڕین و، بە پشت بەستنمان بە خوای گەورە چاوەڕێی چاودێریی ئەو بین تاکو بێت بە فریامانەوە.

* * *

ئەی برایانی ئایینی و هاوەڵانی بەندیخانەم!

وام بە دڵدا هات کە ڕاستی‌یەکی گرنگی واتان بۆ ڕوون بکەمەوە - پشت بە خوای گەورە - لە ئازاری دنیا و قیامەت ڕزگارتان بکات. ئەو ڕاستی‌یەش ئەمەی خوارەوەیە کە بە نموونەیەك ڕوونی دەکەمەوە:

گریمان یەکێك برای یان خزمی یەکێکی تری کوشت.. دیارە ئەم کوشتنەی کە لەبەر لەزەتی لەخۆبایی‌بوونی تۆڵەسەندنەوەیە و تەنها یەك دەقیقە دەخایەنێت، ئەشکەنجەی ملیۆنەها دەقیقەی دڵتەنگی و ئازاری بەندیخانەی لێ پەیدا دەبێت و، لە هەمان کاتدا کەسوکاری کوژراوەکەیش هەمیشە لە نیگەرانی و دڵەتەپێدان و هەر کاتێك بکوژەکەیان بیر دەکەوێتەوە و کەسوکاری دەبینن، بۆ دەرفەت دەگەڕێن تاکو تۆڵەی خۆیان بسێننەوە.. بەم جۆرە لەزەتی تەمەن و خۆشگوزەرانیی ژیانیان بەدەم ئازاری بەسۆی ترس و بیم و دڵە تەپێ و ڕق و قینەوە لەدەست دەردەچێت و، هەردوو لایان لە ئازارێکی سەختدا دەتلێنەوە.

ئەم دەردە هیچ چارەسەری و دەرمانێکیشی نی‌یە جگە لە سولح و ڕێککەوتن کە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەدات و حەق و ڕاستی داواکاری دەبن و، بەرژەوەندیی هەردوو لایشی تێدایە و، مرۆڤایەتی داخوازیەتی و، ئایینی ئیسلامیش هەردوو لای بۆ هان دەدات.

بەڵێ، بەرژەوەندی و ڕاستی لە ڕێککەوتندایە و کارێکی گەلێ باشە، چونکە "ئەجەل" هەر یەکێکە و گۆڕانی بۆ نی‌یە. هەرچۆن بێت دەبوو ئەو کوژراوە هەر ژیانی بەجێ بهێشتایە و نەمایە، مادەم ئەجەلی هاتبوو و، بکوژەکەیش بوو بە هۆکاری ئەنجامدانی ئەو قەزایەی خوای گەورە. جا ئەگەر هەردوو لا ڕێك نەکەون، ئەوا ماوەیەکی گەلێ زۆر و درێژخایەن لە ترس و بیم و ئازاری تۆڵەسەندنەوەدا دەتلێنەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئایینی ئیسلام فەرمانی داوە لە سێ ڕۆژ زیاتر موسڵمان لە برای موسڵمانی دەنگ دانەبڕێت.

جا ئەگەر ڕووداوی ئەو کوشتنە ئەنجامی دوژمنایەتی‌یەکی کۆن و ڕقەبەرایەتی‌یەکی ڕەگداکوتاو نەبێت و مونافیقێك هۆکاری هەڵگرساندنی ئاگری ئەو فیتنە و ئاژاوەیە بووبێت، ئەوا دەبێ یەکسەر ڕێك بکەون، دەنا ئەو موسیبەتە بچووکە گەورە دەبێت و درێژە دەکێشێت، گەر هەردوو لایش ڕێك بکەون و بکوژەکەیش لە تاوانەکەی خۆی پەشیمان ببێتەوە و تۆبە بکات و بە بەردەوامی دوعای خێر بۆ کوژراوەکە بکات، ئەوا هەردوو لا دەستکەوتی زۆریان دەستگیر دەبێت، چونکە خۆشەویستی و ئولفەت دەکەوێتە نێوانیانەوە و ئەم لە دوژمنەکەی خۆش دەبێت و لە بریی یەك برا کە کۆچی کرد چەندین برای باش و خواناسی دەست دەکەوێت و هەردوو لا پێکەوە مل بۆ قەزا و قەدەری خوای گەورە کەچ دەکەن، بە تایبەت ئەگەر لەوانە بن کە گوێ بۆ دەرس و ڕێنمایی‌یەکانی "نوور" ڕادەگرن، ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر داوایان لێ دەکرێت دوورەپەرێزی لە هەر شتێك بکەن کە نێوانی دوو کەس تێك بدات، چونکە ئەو برایەتی‌یەی کە لە چوارچێوەی نووردایە و دەیانبەستێت بە یەکەوە و، پاشان بەرژەوەندیی گشتی و، ئنجا ئەو دڵسافی و دەروونساغی‌یەش کە ئیمان داوای دەکات لێیان..

هەموو ئەمانە، داخوازی پشتگوێ خستنی ناکۆکی و دامەزراندنی ئاشتی و ئاسایش دەبن.

ئەمەی باسمان کرد، لە ڕاستیدا، لە بەندیخانەی دەنیزلی لە نێوان دوو بەندکراودا - کە دوژمنایەتیی یەکتریان دەکرد - ڕووی دا، دوای ئەوە، بە فەزڵی خوای گەورە و پاش وەرگرتنی چەند دەرسێك لە پەیامەکانی نوور، بوون بە برای خۆشەویستی یەکتر، تەنانەت بوون بە یەکێ لە هۆکارەکانی تەبرییەبوونمان، بە ڕادەیەك کە مولحید و نەفامەکانیش لە بەردەم ئەم خۆشەویستی‌یە برایانەی ئەو دوانەدا هیچیان بۆ نەمایەوە و ناچار بوون بڵێن: "ما شاء الله.. بارك الله.."! بەم جۆرە دڵی هەموو بەندکراوان گەشایەوە. چونکە لێرەدا بە چاو دەبینین کە چۆن ستەم لە بەندکراوان دەکرێت و بە تاوانی یەك کەس توندوتیژی لەگەڵ سەد کەسیاندا دەنوێنرێت، بە ڕادەیەك کە لە کاتی حەوانەوەشدا نایەڵن ئەو سەد کەسە لەبەر تەنها ئەو تاوانبارە بڕۆنە ناو حەوشەی بەندیخانەکەشەوە. بەڵام مرۆڤی ئیمانداری بەغیرەت جوامێری‌یەکەی هەرگیز ڕێی ئەوەی پێ نادات کە ئازاری هیچ ئیماندارێك بدات، چ جای ئەوەی لە پێناوی سوودی هەندەکی و کەمی خۆیدا ببێت بەهۆی ئازاردانی، کەواتە دەبێ هەر کە بە هەڵەی خۆی زانی و هەستی بەوە کرد کە بووە بەهۆی ئازاری ئیماندارێك، یەکسەر بە پەلە تۆبە بکات و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە.

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

من پیرۆزبایی لە پەیامەکانی نوور و لە ئێوە و لەخۆیشم دەکەم بەبۆنەی ئەو مژدانەی کە "خەسرەو" و "حیفظی" و ئەوبەڕێزەش کە خەڵکی "بارتن"ە هەواڵیان لەبارەوە داوە.

بەڵێ، ئەو کەسانەی ئەمساڵ ڕۆشتن بۆ حەج هەروەك چەند زانایەکی گەورە و بەڕێزیان لە مەککەی پیرۆزدا بینی کە هەوڵی وەرگێڕانی کۆمەڵە گەورەکانی پەیامەکانی نووریان دەدا بۆ زمانەکانی عەرەبی و هیندی، بینی‌یان مەدینەی مونەووەرەش ئەو پەیامانەی قبووڵ کردووە و لێیان ڕازی بووە، بە چەشنێ کە لە ڕەوزەی خاوێن و لای حوجرەی شەریفی گڵکۆی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ﷺ دایاننناوە. بەو واتایەی کە ئەو پەیامانە قبووڵ بوونی لای پێغەمبەریان ﷺ بەدەست هێناوە و، ڕۆشتووەنە ناوەندی بازنەی لێ ڕازی بوونی پێغەمبەری سەروەرمان حەزرەتی محەممەدەوە ﷺ.

کەواتە پەیامەکانی نوور - وەك حاجی‌یان بۆیان گێڕاینەوە - زیارەتی ئەو شوێنە پیرۆزانەیان لە بری ئێمە کردووە، وەك ئەوەی کە لە نیازماندا بوو خۆمان بڕۆین بۆ زیارەتیان.

سوودێکی تری یەکجار زۆری ئەو کۆمەڵە پەیامە ڕاستکراوانەی کە قارەمانانی نوور بڵاویان دەکەنەوە ئەوەیە کە منیان لە ئەرکی ڕاستکردنەوە و هەڵەگیری و نیگەرانی بۆ پەیامەکان ڕزگار کرد و، بەوەی کە سەرچاوەی ڕاستکراوەیان هێنایە گۆڕێ وەك ئەوەیان لێ هات کە بووبن بە سەد کەسی ڕاست کەرەوە و هەڵەگیر. کەواتە شوکر و سوپاسی نەبڕاوە و بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە.

لە خوای گەورە داواکارم کە بەرامبەر هەر پیتێکی ئەو کۆمەڵە پەیامانە هەزار کردەوەی چاك لە تۆماری کردەوە باشەکانیاندا بنووسێت. ئامین.. ئامین.. ئامین.

* * *

## خەونێکی خۆش کە مژدەی پێیە و تەئویلەکەشی هاتە دی

ئەو "عەلی"یەی کە لە کاروبارمدا یارمەتیم دەدات، هات و پێی وتم: لە خەوندا بینیم تۆ و خەسرەو دەستی پیرۆزی پێغەمبەرتان ﷺ ماچ دەکرد. یەکسەر دوای ئەوە نامەیەکم بە دەست گەیشت کە ئەوەی تێدا هاتووە: (کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا" کە بەدەستخەتی خەسرەو نووسراوەتەوە، حاجی‌یان لە ڕەوزەی خاوێنی پێغەمبەردا ﷺ بینیویانە)! واتە ئەو کۆمەڵە پەیامە دەستی مەعنەویی پێغەمبەری سەرووەری ﷺ ماچ کردووە و ڕەزامەندیی ئەوی بەدەست هێناوە.

* * *

باسمه سبحانه

ئەی برایانی ئازیز و بەوەفام و ئەی هاوڕێیانی بەندیخانەم!

**یەکەم:** نیگەرانی ئەوە مەبن کە یەکتر نابینین، چونکە ئێمە لە ڕاستیدا و بە جۆرێکی مەعنەوی هەموو کات ڕووبەڕووی یەکین و ڕوومان لە یەکترە و، هەر پەیامێکتان دەست بکەوێت بیخوێننەوە یان گوێی لێ بگرن ئەوا نەك بە سیفەتی کەسی ئاسایی خۆم، بەڵکو بە سیفەتی ئەوەی کە خزمەتگوزارێکی قورئانی مەزن و پیرۆزم و لە ڕێی ئەو

پەیامەوە، دەمبینن و گفتوگۆم لەگەڵدا دەکەن. ئەوەش بزانن کە منیش لە ڕێی دوعا و پاڕانەوەکانمەوە و بەهۆی نووسینەکان و پەیوەندییەکانتانەوە هەردەم بە ئەندێشە دەتانبینم و ڕووم لێتانە. جا مادەم هەموومان پێکەوەین و لە یەك بازنەدا کار دەکەین ئەوا وەك ئەوە وایە کە یەکتر ببینین.

**دووهەم:** ئەو قوتابیانەی پەیامەکانی نوور کە تازەکی هاتوونەتە ناو ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە نوێیەوە، پێیان دەڵێین:

بە چەندین بەڵگەی بەهێز و چەندین ئاماژەی قورئانی پیرۆز کە خەبیرەکانی لە شوێنی خۆیاندا ڕاگرت و ناچاری تەسلیم بوونی کردن، ئەوە چەسپاوە کە:

(قوتابی‌یە ڕاستەکانی پەیامەکانی نوور ژیانیان بە عاقیبەت خێری کۆتایی پێ دێت و بە ئیمانەوە دەڕۆنە ناو گۆڕەکانیان و.. بەهۆی ڕێژنەی نوورەکانی بەشداری کردن لە کاروبارە نووری‌یەکاندا هەر قوتابی‌یەك - هەر کەسەو بەپێی پلەی خۆی - هاوبەشی دەستکەوتە مەعنەوی‌یەکان و دوعاکانی هاوڕێیانی دەبێت، وەك ئەوەی کە بە هەزار زمان داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات و پەرستشەکانی ئەنجام بدات).

جا ئەم دوو سوود و دوو ئەنجامە گرنگەی کە لەم ڕۆژگار و سەردەمە سەیرەدا پەیامەکان بە قوتابیانی دەبەخش، هەموو گیروگرفت و ئاستەنگێك لەسەر ڕێ لادەبەن.

بەم جۆرە دەبینین کە پەیامەکانی نوور بە نرخێکی هەرزان ئەم دوو قازانجە گەورەیە دەستی قوتابیانی خۆیان دەخەن.

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەو بەرگری‌یانەی کە لە دادگای "ئافیوون"دا پێشکەش کران چەندین ڕاستیی ئەوتۆیان لەخۆ گرتووە کە پەیوەندیی‌یان بە ئێمە و پەیامەکانی نوور و ئەم وڵاتە و جیهانی ئیسلامی‌یەوە هەیە. بۆیە دەبێ بە پیتە نوێکان نزیکەی دە نوسخەیان لێ بگیرێتەوە، تاکو ڕەوانەی فەرمانگە باڵاکانی "ئەنقەرە" بکرێت. ئەرکی سەرشانی ئێستامان گەیاندنی ئەو ڕاستی‌یانەیە بە پایەکانی حکومەت و فەرمانگەکانی داد و نەتەوە بە گشتی. هەرگیز بایەخ بە ئەنجامی دادگایی‌یەکانیش نادەم چ بڕیاری بێ تاوانیمان بۆ دەربکەن چ سزامان

بدەن. لەوانەیە ئەم ئەرکەی سەرشانمان یەکێك بێت لەو دانستانەی قەدەری خوای گەورە کە ئێمەی بەرەو ئەم قوتابخانەیە دایەبەر.. هەتا دەتوانن لە نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی ئەو بەرگرییەدا پەلە بکەن، چونکە تەنانەت گەر ئازادیش بکرێین هەر ناچارین ئەو بەرگرییە بگەیەنین بەو فەرمانگە بالایانەی دەولەت. هیچ کەسێك بە دواخستنی نووسینەوەیان لەخشتەتان نەبات. لەوە زیاتر دواخستن هەلناگرێت. با ئەم بەرگرییە دوا بەرگری بێت لە زنجیرەی ئەو بەرگرییانەی تر کە لە ماوەی پازدە سالدا بۆ تەنها یەك کێشە و لە بەرامبەر ستەمێکی سەخت و ئازارێکی بەسۆ و بڕوبیانووی هەلبەستراوی بێ نرخی ئەوتۆوە پێشکەش کران کە هەرگیز هاوشێوەیان نییە.

مادەم ئێمە بە پێی یاسا و لە دادگاکانی پێشوودا مافی ئەوەمان بەدەست هێناوە کە بەرگرییەکانمان بە ئامێری ڕۆنیۆ بنووسینەوە، ئەوا کەس ناتوانێت ڕێی بەکارهێنانی ئەم مافە یاساییەمان لێ بگرێت. خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی ڕەسمی چارەسەرێك بۆ ئەمە نەدۆزرایەوە، با پارێزەرەکەمان نزیکەی پێنج نوسخەی لە دەرەوە لێ کۆپی بکات، بەلام با بە ئەمانەتەوە پارێزگاریی ڕاستی و دروستیی بکات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

ئەی برا ئازیزە نوێیەکانم و ئەی بەندکراوانی پێشوو!

ئێستا گەیشتوومەتە قەناعەتێکی یەکجار تەواو بەوەی کە چاودێریی خوای گەورە ئێمەی لەبەر ئێوە گەیاندووەتە ئێرە. واتە هاتنمان بۆ ئێرە لەبەر بلاوکردنەوەی ئەو دلدانەوە و دلنەواییەیە کە "پەیامەکانی نوور" بۆ ئێوەیان هێناوە و، بۆ کەمکردنەوەی تەنگ پێهەلچنینەکانی بەندیخانەیە لەسەرتان بەهۆی "ڕاستییەکانی ئیمان" و، لەبەر پاراستنتانە لە گەلێ بەلا و موسیبەت و تەنگانەی ژیان و.. بۆ دەربازکردنی ژیانی پڕ خەم و پەژارەتانە لە بێمەبەستی و بێسوودی و، بۆ ڕزگارکردنی ئەودنیاشتانە تاکو وەك ئەم دنیاتان لە گریان و خەم و پەژارەدا نەبێت.

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە کە باسمان کرد، ئەوا دەبێ ئێوەش وەك قوتابیانی نوور و وەك ئەوانەی کە لە بەندیخانەی دەنیزلی لەگەلماندا بوون، ببن بە برای خۆشەویستی یەکتری..

ئەوەتا بە چاوی خۆتان دەبینن ئەو پاسەوانانەی کە سوورن لەسەر خزمەتکردنتان، بە دەست پشکنینەوە گەلێ ماندوو دەبن، تەنانەت خواردنەکانیشتان دەپشکنن نەوەك ئامێرێکی تیژی تێدا بێت! ئەمەش لەبەر ئەوەی کارێك ڕوونەدات کە دەستدرێژی بکەنە سەر یەکتری، وەك بڵێی ئێوە دڕندە و خوێنمژ بن و، هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی پەلاماری ئەوی تر بدات تاکو بیکوژێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەرفەتی پشوودان و حەوانەوەشتان نادرێتێ، نەوەك شەڕ و ئاژاوەتان لە نێواندا دروست ببێت!

دەسا ئێوە و ئەو برایانەش کە تازەکی هاتوونەتە بەندیخانەوە و وەك ئێوە دارای ئازایەتی و جوامێرییەکی سروشتین، هەمووتان بەوپەڕی ئازایەتیی مەعنەوییەوە لە بەردەم دەستەی سەرپەرشتیارانی بەندیخانەدا بڵێن:

(نەك تەنها شتی تیژ، بەڵکو ئەگەر چەکە تازەکانیشمان بدەنێ، ئێمە هەر دەستدرێژی ناکەینە سەر ئەو برا و هاوەڵانەمان کە لەگەڵماندا دووچاری بەندی بوون، تەنانەت گەر دوژمنایەتیی کۆن و دێرینیشمان لە نێواندا ببێت ئێمە هیچ جۆرە کارێکی وا ناکەین، چونکە لە هەموویان خۆش بووین و تا دەتوانین هەوڵ دەدەین هەست و نەستی یەکتر زامدار نەکەین و دڵیان نەشکێنین. ئەمە بڕیارێکە بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و فەرمانی برایەتیی ئیسلام و داخوازیی بەرژەوەندیی هەموومان دەرمان کردووە).

بەم جۆرە، "بەندیخانە" دەکەن بە "قوتابخانە"یەکی بەپیت و بەرەکەت.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

ئەو کەسانەی کە لە یەك سیاسەت، یان لە یەك پیشەدا، یان لە یەك کارمەندی، یاخود لە یەك خزمەتگوزاریدان کە پەیوەندیی بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە هەبێت یان جۆرە بازرگانییەکی تایبەتییان لە نێواندا بێت، هەموو یەکێکی ئەو دەستە و کۆمەڵانەی ئەهلی دنیا، جاربەجار کۆبوونەوەی گشتییان دەبێت کە تیایدا لە کاروباری تایبەتیی خۆیان دەکۆڵنەوە. هاتنی قوتابیانی نووریش، کە لە خزمەتی خاوێنی ئیمانی تەحقیقیدا کار دەکەن، بۆ ناو ئەم قوتابخانە یووسفییە بە فەرمانی پەروەردگار و لەسەر خواست و هاندەری چاودێریی ئەو، بێ گومان گەلێ سوودی مەعنەویی گەورەی تێدایە و، بە پشتیوانیی خوای گەورە لە نیعمەتی ئەو سوود و ئاکامانە بەرخوردار دەبن. هەروەها

هەموو یەکێکی قوتابیانی ئەرکانی نوور وەك پیتی ئەلف دەبن (چونکە ئەگەر ئەو پیتە بە تەنیا خۆی بێت نرخەکەی هەر یەك دانە ئەلف دەبێت، بەڵام ئەگەر لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا، واتە لەگەڵ سێ دانە ئەلفی تردا شان بە شانی یەکتر یەکبگرن، ئەوا نرخەکەی دەبێتە هەزار و سەد و یازدە). جا پاداشت و بەها و خزمەتی ئەو برایەش کە لەم کۆبوونەوەیەدا هاوبەشە هەزار دەبێت، بە پشتیوانیی خوای گەورە.

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆ پەنجەرەی ژوورەکەی منیان داخست و بزمار ڕێژیان کرد ئەوەیە کە لە بەندکراوان دام بـبڕن و ڕێ بگرن لەوەی کە لە نێوان خۆماندا سڵاو لە یەکتری بکەین. بەڵام ئەوان بیانوویەکی تری ڕواڵەتییان پێش چاو خست. ئێوە هەرگیز نیگەران مەبن. بەڵکو وازهێنانی ئەوان لە گوشار خستنە سەر پەیامەکانی نوور و قوتابیانی و، خۆ سەرقاڵ کردنیان بە کەسی منی بێ بایەخ و، سووکایەتی پێ کردنم و، ئازار دانی دڵ و جەستەم بە جۆرێکی ڕاستەقینە و، خۆنەدانیان لە قەرەی پەیامەکانی نوور، من دەخاتە ڕازی بوونەوە لەم دۆخە. تەنانەت بە ئارامگرتنەوە شوکری خوای گەورە دەکەم و، بە هیچ جۆرێك نیگەران و پەشێو نابم. دەسا ئێوەش بە هەمان جۆر خەم مەخۆن. قەناعەتم وایە کە سەرنج ڕاکێشانی کارمەندانی بەندیخانە لە لایەن دوژمنە پەنهانەکانمانەوە بۆ لای کەسی من چاودێریی خوای گەورەی لە پشتە و خێری بۆ سەلامەتی و بەرژەوەندیی پەیامەکان و قوتابیانی نوور تێدایە.

کەواتە دەبێ هەندێ لە برایانمان تووڕەیی دەرنەبڕن و گوفتاری وەهایان لە زار دەرنەچێت کە بەر هەستی ئەوان بکەوێت و، لە هەموو وەستان و جموجووڵێکیاندا و بێ ئەوەی پەشێوی و نیگەرانی دەربڕن حەزەری خۆیان بکەن و، دەرگای باس لەسەر ئەم کێشەیە لە لای کەس نەکەنەوە، چونکە هەندێ جاسووس هەن کە قسەی برایانی ساویلکەی ئێمە لەوانەی کە هێشتا فێری حەزەر نەبوون دەستکاری دەکەن و واتای پێچەوانەی لێ دەدەنەوە و شتانی بچووك بە گەورە پیشان دەدەن و دەیگەیەنن بە کەسانی بەرپرس. ئەم دۆخەی ئێستامان سەرتاپا جیددییە و هیچ گاڵتەیەکی تێدا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز مەشڵەژێن و بزانن کە ئێمە لە ژێر سەرپەرشتیی چاودێریی خوای گەورەداین و، بڕیارمان داوە بە ئارامێکی ڕەنگین تەنانەت بە شوکرانە بژێریی یەکجار گەورەوە ڕووبەڕووی هەموو تەنگانە و گیروگرفتەکان ببینەوە. کەواتە ئێمە شوکری خوای گەورەمان خراوەتە ئەستۆ، چونکە کێشی درەمێك ماندوو بوون و سەختیی ئەم بارودۆخە بە ئەندازەی یەك باتمان پاداشت و میهرەبانیمان بۆ بەجێ دەهێڵێت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

هەموو کاروبارێکی بەرگری کردنم بە قوتابیانی ئەرکانی نوور سپاردووە لەوانەی کە هاتوون یان دێن بۆ ئێرە. ئەمەش لەبەر دوو هۆ و لەسەر بناغەی ئاگادارکردنەوەیەکی مەعنەوی کە لە دڵەوە ناچار بووم بۆ ئەمە، بە تایبەت ئەم کارە بە هەریەك لە: (خ، ر، ط، ف، ص)[1] دەسپێرم.

**هۆکاری یەکەم:** لە فەرمانگەی لێکۆڵینەوەکانەوە و لە ڕێی چەند نیشانەیەکی زۆرەوە بە دڵنیایی بۆم دەرکەوتووە کە دەیانەوێ بە هەموو هێزێکیانەوە لە دژی من کێشە دروست بکەن و خۆیان لەوە ببوێرن کە من بە هزر و بیر بە سەریاندا سەرکەوتووم. بۆ ئەمەش ئاگادارکردنەوەی ڕەسمییان هەیە. وەك بڵێی هەر ئەوەندەی بکەومە قسە و گوفتار ئەوا توانستێکی زانستی و لێهاتنێکی سیاسیی ئەوتۆ دەنوێنم کە دادگاکان بە بەڵگە بێستمەوە و سیاسییەکانیش دەمکوت بکەم! هەر لەبەر ئەوەشە کە بە چەند بیانوویەکی لاواز و نابەجێ ڕێی قسە کردنم لێ دەگرن. تەنانەت کاتێ لە دەمی لێکۆڵینەوەکەدا و لە وەڵامی پرسیارێکدا وتم: "نایەتەوە یادم"، دادوەرەکە سەری سووڕما و وتی: چۆن کەسێکی وەك تۆ کە خاوەنی زیرەکی و زانستێکی سەرووی ئاستی ئاسایی بێت شتی لەبیر دەچێتەوە؟

---

(١) مەبەست ئەم قوتابیانەی نوورە: (خەسرەو، ڕەئفەت، طاهیری، فەیزی، صەبری). (وەرگێڕ)

بەڵێ، ئەوان لەو باوەڕەدان کە پایەبەرزیی پەیامەکانی نوور و لێکۆڵینەوە وردە زانستییەکانیان زادەی بیر و هزری منن و، لێرەوە سەرسامی و سەرسوڕمان دەیانگرێت و، ئیتر نایانەوێت قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکەم. وەك بڵێی هەر کەسێك بمبینێت و قسەم لەگەڵدا بکات یەکسەر ببێت بە قوتابییەکی بەغیرەتی پەیامەکانی نوور! بۆیە ڕێی چاوپێکەوتن و قسەکردنم لەگەڵ هەموو کەسێك لێ دەگرن. تەنانەت سەرۆکی کاروباری ئایینی وتبووی: "هەر کەسێك بیبینێت یەکسەر بەلایدا کێش دەبێت، بە ڕاستی هێزێکی زۆری کێش کردنی هەیە".

بەو واتایەی بەرژەوەندیمان داخوازی ئەوەیە کە ئێستا کاروبارەکان بە ئێوە بسپێرم. بەرگرییە کۆن و نوێکانم کە لای خۆتان هەیە لە بریی من هاوبەشی ڕاوێژ و پرس و ڕای نێوانتان دەکات و سەروزیادی ئەم کارەیە.

**هۆکاری دووهەم:** بە پشتیوانیی خوای گەورە بۆ کاتێکی تر دواخرا.

کورتە ئاماژەکەش بۆ ئەو بێدارکردنەوە مەعنەوییە، ئەمەی خوارەوەیە:

ئەو شتەی کە وای لێکردم ماوەی بیست و پێنج ساڵ واز لە سیاسەت و جگەرە کێشان و شتانی فانیی هاوشێوەیان بهێنم و ڕێی لێ گرتم بەو شتانەوە سەرقاڵ بم، ئەرك و واجبێکی قیامەتییانەی یەکجار مەزنە، هاودەم لەگەڵ حاڵەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆدا کە کاریگەرییەکی کارای لەسەرم هەیە. هەر ئەم دوو هۆکارەن کە بە تەواوی ڕێم لێ دەگرن خۆم بەم کێشەیە و لقە وردەکانیەوە سەرقاڵ بکەم. جا ئێوەش هەندێ جار بە ڕاوێژ کردن لەگەڵ هەردوو پارێزەرەکەتاندا ئەرکی سەرشانی من ڕادەپەڕێنن.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

هەر ئێستا و لە کاتی نوێژدا ئەمەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

لەبەر ئەو گومان باشییە زیاد لە پێویستەی کە برا ئازیزەکان بەرامبەر بە تۆ هەیانە، هەردەم چاوەڕێی وانە و ڕێنمایی و یارمەتی و پشتگیریی مەعنەوین لێت. جا هەروەك لە کاروبارەکانی دنیادا برا تایبەتمەندەکانت کرد بە وەکیلی خۆت و ئەو کارانەت بە شوورای نێوان برایانی ئەرکان سپارد، کە لەمەشدا کارێکی باشت کردووە، گەر بە هەمان جۆر کاروبارە قیامەتی و قورئانی و ئیمانی و زانستییەکانیشت هەر بە کەسێتیی

مەعنەویی برا تایبەتمەندە بێگەردەکان بسپێریت، ئەوا هاوەدەم لەگەڵ ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی خۆیاندا، ئەوەی تۆش بە تەواوترین و باشترین شێوە ئەنجام دەدەن. هەروەك ئێستا و بەردەوام بە کردەوە ئەنجامیان داوە و دەیدەن.

بۆ نموونە: ئەو کەسەی لە بینینی تۆدا بایی یەك درەم سوود لە یەك وانە و ڕێنمایی وەردەگرێت، بایی سەد درەم لە هەر بەشێکی پەیامێکی نوور وانە و ڕێنمایی بەدەست دەهێنێت، سەرباری ئەوەش کە لە بریی تۆ ئەو وانەیەی هەر لەگەڵدا دەمێنێتەوە و سوودی لێ وەردەگرێت. ئنجا ئەوەش هەیە کە قوتابیانی تایبەتمەندی پەیامەکانی نوور هەموو کاتێك ئەم ئەرکەی سەرشانی تۆیان ڕاپەڕاندووە. لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کەسی مەعنەویی ئەوان - کە خاوەنی پلەیەکی بەرز و دوعای گیرایە - پشتیوان و مامۆستا و یارمەتیدەریان بێت.

بێدار کردنەوەکە بەم جۆرە هاتە دڵمەوە و، دڵنەوایی بە گیانم بەخشی و مزگێنی و حەوانەوەی بۆ هێنا.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

هەردوو ڕووداوی تەقینەوەی ماوەی ئەم دوو ڕۆژە کە بە بێ هیچ هۆکارێکی ڕواڵەتی ڕوویان دا، لە ڕێکەوت ناچن و واتایەکی قووڵ دەردەبڕن..

**یەکەمیان:** تەقینەوەی کتوپڕیی زۆپا ئاسنە قایمەکەی ژوورەکەی خۆمە کە هاودەم لەگەڵ دەنگێکی گەورەدا پارچە پۆلاکەی ژێر خۆیشی لەت کرد و، حەمدیی بەرگدروو ترسی لێ نیشت و، تووشی سەرسامیی کردین. لە کاتێکدا کە ئەو زۆپایە لە چلەی زستاندا توانای بەرگەگرتنی گەرمیی خەڵووزی بەردیشی هەیە.

**دووهەم:** شکانی سەرسوورهێنی ئەو پەرداخەیە کە لەسەر شوێنی ئاو خواردنەوەکە لە هۆڵەکەی "فەیزی"دا دانراوە بە بێ هیچ هۆکارێکی ڕواڵەتی لە ڕۆژی دوای تەقینەوەی زۆپاکە.

وا بە دڵدا دێت کە ئەو بۆمبایانەی دانرابوون بەسەر ئێمەدا بتەقێنەوە، نوسخەکانی ئەو بەرگرییەی ڕەوانەی هەر شەش دیوانی بەرپرسانی "ئەنقەرە" کران تەقاندنیانەوە و،

ئەو زۆپای ڕق و قینەش کە گڕی گرتووە تاکو بە ئاگرەکەی بمانسووتێنێت ورد و خاش بوو، بێ ئەوەی هیچ زیانێکمان پێ بگات.

لەوانەیە ئەو زۆپا بەپیت و بەخزمەتەی کە هاوڕازێکی سوودبەخش بوو بۆ من و گوێی لە ئاخ و لالآنەوەکانم دەگرت، ئێستا پێم ڕابگەیەنێت کە: ئیتر پێوستت بە من نەماوە و لەم بەندیخانەیە کۆچ دەکەیت.

* * *

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

ئەمڕۆ بەهۆی بێدارکردنەوەیەکی مەعنەوی کە ڕووی لە دلّم کرد خەم و نیگەرانی بۆ ئێوە دایگرتم. چونکە خەمم بۆ حالّی ئەو برایانەم خوارد کە لە ئەنجامی نیگەرانییان بۆ ژیان و گوزەران حەزیان لەوەیە هەر ئێستا لە بەندیخانە بڕۆنە دەرەوە. هەر لەو خولەکەدا کە بیرم لەمە کردەوە، ئەندێشەیەکی بەپیت هاودەم لەگەلّ ڕاستی و مژدەیەکدا هاتە دلّمەوە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

دوای پێنج ڕۆژی تر ئەو سێ مانگە پیرۆزە دێنە پێشەوە کە گەلێ خێر و پاداشتی گەورە لەگەلّ خۆیاندا دەهێنن و، پاداشتی خواپەرستییەکان لەو مانگانەدا وەك ئەوە وایە کە چەند قات زیاد بکات، ئەوەتا ئەگەر پاداشتی کردەوە چاکەکان لە کاتەکانی تردا یەك بۆ دە بێت، لە مانگی ڕەجەبدا یەك بۆ سەد زیاترە و، لە مانگی شەعباندا لە یەك بۆ سێ سەد تێپەڕ دەبێت و، لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزانیشدا بەرەو یەك بۆ هەزار بەرز دەبێتەوە. خۆ لە شەوانی هەینیی ئەم مانگەدا یەك بۆ هەزاران و شەوی قەدریش یەك بۆ سی هەزار دەبێت. بەلّێ، ئەم سێ مانگە بازاڕێکی بەپیت و بەرزی بازرگانیی دواڕۆژە، بە ڕادەیەك کە ئەم هەموو سوود و قازانجە زۆرە قیامەتییانە دەستی مرۆڤ دەخەن و، پیشانگایەکی مەزن و نایابی ئەهلی حەقیقەت و خواپەرستییە و، لە ماوەی سێ مانگدا تەمەنێکی هەشتا سالّی بۆ ئیمانداران لەخۆ دەگرن.

کەواتە بەسەربردنی ئەم سێ مانگە لە قوتابخانەی یووسفیدا، کە لەخۆیدا یەك بۆ دە قازانج دەستی مرۆڤ دەخات، بێ گومان قازانجێکی گەورە و دەستکەوتێکی مەزنە. گیرو گرفتەکانیش هەرچەندە بن، هەر بۆ ئێمە سەرتاپا میهرەبانییە.

جا هەروەك ئەمە لە ڕووی خواپەرستی‌یەوە ئاوایە، لە ڕووی خزمەتکردنی نوور و کارکردنیش بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور وەهایە. چونکە پاداشتی خزمەتەکان، گەر لە ڕووی چەندایەتیشەوە نەبێت لە ڕووی چۆنێتی‌یەتی‌یەوە یەك بۆ پێنج بەرز دەبنەوە، چونکە ئەوانەی دێنە ناو ئەم میوانخانە(بەندیخانە)یە و دەڕۆنە دەرەوە دەبن بەهۆی بڵاوبوونەوەی وانەکانی نوور و، لەوانەیە ئیخلاسی یەك دانە کەس لەوان هێندەی بیست کەس سوودی لەم ڕووەوە بێت، چونکە ئەگەر هەر گیروگرفت و گوشارێك لەم بەندکردنەدا هەبێت ئەوا هیچ گرنگی‌یەکی نی‌یە لە بەرامبەر بڵاوبوونەوەی نهێنیی ئیخلاس - کە لە پەیامەکانی نووردایە - لە نێوان ڕیزی بەندکراواندا، کە لە هەموو کەسێك زیاتر پێوستیان بەو دڵنەوایی و دڵدانەوەیە هەیە کە پەیامەکانی نوور پەخشی دەکەن، بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە پاڵەوانێتیی سیاسی لە دەمارەکانیاندا هاتوچۆ دەکات.

سەبارەت بە خەم و خەفەتی گوزەرانیش، ئەوا ئاشکرایە کە ئەم مانگانە بازاڕی دواڕۆژن و، هەندێکتان لەبریی چەند قوتابی‌یەکی زۆر هاتووەتە ناو ئەم بەندیخانەیەوە، تەنانەت هەندێك لە بریی هەزار کەس هاتووە، ئەوا بێ گومان یارمەتی و پشتگیرتان دەبێت بۆ کاروبارەکانی دەرەوەی بەندیخانەتان.

ئەو بیرەم بەم جۆرە هاتە دڵەوە و، زۆریش پێی دڵخۆش بووم و، زانیم کە مانەوەمان لێرە هەتا جەژن نیعمەتێکی مەزنی خوای گەورەیە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

### بۆ سەرۆکایەتیی وەزیران و.. وەزارەتی داد و.. وەزارەتی ناوخۆ[1]

هەموو پیاوانی دەوڵەت لە نزیکەوە دەمناسن، بە تایبەتی ئەوانەیان کە لە سەردەمی ڕووداوە مەزن و گرنگەکانی وڵاتدا ژیاون؛ هەر لە ڕاگەیاندنی "سەربەستی" و "دەستوور" و، دەمی جەنگی جیهانی یەکەم و، داگیر کردنی ئەستەمبووڵ و وڵات لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە و، ڕووداوەکانی دواتریش.. تا کاتی دامەزراندنی حکوومەتی

(١) ئەم سکاڵانامەیە پارێزەرەکانی مامۆستا بە ئیزنی خۆی نووسیویانە و ڕەوانەی ئەو فەرمانگە بەرزە ناوبراوانە کراوە. (صونگور)

نیشتمانی و دەمی ڕاگەیاندنی ڕژێمی "کۆماری". ئەو کەسانەی بە جوانی ئاگاداری ئەو ڕووداوانەن و ئێستاش لە دەولەتدا دارای پلە و پایەن، بە باشی دەمناسن. لەگەڵ ئەوەشدا هیوادارم ڕێم بدەن زۆر بە خێرایی چەند دیمەنێکی ژیانی خۆمتان بخەمە پێش چاو:

من لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس" لە دایك بووم. بە درێژایی ژیانی قوتابێتی و خوێندنم لەگەڵ ئەو زانایانەی تووشم هاتوون کەوتوومەتە وتووێژ(مناقشة)ی گەرمی زانستییانەوە و، لە سایەی چاودێریی پەروەردگاریشمەوە هەمیشە بە سەریاندا سەردەکەوتم، تاکو ڕۆیشتم بۆ ئەستەمبوڵ.

لەو دەوروبەرە تێکەڵ بە "دەردی ناوبانگ"ەی ئەوێشدا هەر وازم لە گفتوگۆ زانستییەکانم نەهێنا، تا لە ئەنجامدا کەسانی حەسوود و نەیار لە لای کاربەدەستان بۆیان تێچاندم و، بە فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمید - خوا لێی خۆش بێت - بەرەو نەخۆشخانەی شێتان درامەبەر! پاشان خزمەتگوزارییەکانم لە دەمی ڕاگەیاندنی "دەستوور" و ڕووداوی "٣١ی مارت"دا سەرنجی حکوومەتی "ئیتتیحاد و تەرەقی"ی ڕاکێشا و، منیش ئەم دەرفەتەم بە هەل زانی و پرۆژەی دامەزراندنی زانکۆیەکم لە شاری "وان"دا پێشکەش کردن کە وەك "زانکۆی ئەزهەر" وابێت و ناوی "زانکۆی زەهراء" بێت، بە دەستی خۆیشم بناغەی زانکۆکەم دانا.

بەڵام جەنگی جیهانیی یەکەم بەرپابوو، ناچار لە قوتابیانی خۆم و خۆبەخشەران تیپەکانی "یاریدەدان"م پێکهێنا و خۆم سەرکردەییم دەکردن و، لە بەرەی قەفقازدا بۆ بەرگری کردن لە شاری "بەدلیس" بەشداریی چەندین جەنگی سەخت و خەتەرناکمان کرد لە دژی دەستدرێژییەکانی "ڕووس"ی داگیرکەر. لە پاشدا بە(دیل)ی کەوتمە بەردەستیان ، بەڵام چاودێریی پەروەردگار هات بە هانامەوە و لەو دیلییە ڕزگاری کردم و، گەڕامەوە بۆ ئەستەمبوڵ و، لەوێ کرام بە ئەندام لە (دار الحكمة الاسلامية)دا.

ئنجا لەو بارودۆخە سەختەشدا بە هەرچی هێز و توانا و وزەم هەبوو - کە خوای گەورە پێی بەخشیبووم - بۆ جیهاد کردن لە دژی داگیرکەران لە ئەستەمبوڵ ڕاپەڕیم، هەتا جەنگی سەربەخۆیی کۆتایی پێ هات و حکوومەتی نیشتمانی لە ئەنقەرە دامەزرا. ئەو حکوومەتە سەر لە نوێ بۆ مەبەستی ڕێزلێنان لە خزمەتگوزارییەکانم چاوێکی بە پرۆژەی زانکۆکەی "وان"دا گێڕایەوە.

سەرانسەری ژیانم ، لە سەرەتاوە تا ئێرە، یەك پارچـە خزمـەتکردنی وڵات بـووە بـەپێی بیر و بۆچوونی ئەوسام کە بریتی بوو لە: "خزمەت کردنی ئایین لە ڕێی سیاسەتەوە".

بـەڵام پاش ئـەو ماوەیـە ، بە یـەکجارەکی ڕووم لـە دنیـا وەرچـەرخاند و، "ســەعیدی کۆن"م – وەکو خۆم ناو لـێ ناوە – گۆڕ کرد و، بووم بە سەعیدێکی تـری "نـوێ" کـە بـە تەواوەتی بۆ ئاخیرەت دەژی. ئیتر بۆ خۆم لە ژیـانی کۆمەڵایـەتی کشامەوە و دەستم لـەو شـتانە داتەکاند کـە تایبەتن بە کاروبـاری کـۆمـەڵەوە. ئـەوەبوو بـە تـەواوی لـە خـەڵکی دابڕام و، لـە گـردی "یووشـەع"ی ئەستەمبووڵ و، پاشـان لـە ئەشـکەوتی نـاو چیاکـانی "وان" و "بەدلیس"دا دەستم دایە گۆشەگیری و خۆم بـە موجاهـەدەی ڕۆحـی و ویژدانیـی بەردەوامەوە سەرقاڵ کرد و، بە تاقی تەنیا لە جیهانی ڕۆحیی خۆمدا مامەوە و، دروشمـی: "أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة"م بەرزکـردەوە و، گشـت کات و بیر و هـەسـتێکـم بۆ سـەرنجدان و تێڕامـان لـە واتاکـانی قورئـانی پـیرۆز خسـتەکار و، بـۆ خـۆم لـە قۆنـاغی "سەعیدی نوێ"دا دەژیام..

هـاودەم لەگـەڵ ئەوەشـدا قـەدەری خـوای گـەورە بـە "نـەفی کـردن" لـەم شـارەوە بـۆ ئەوشـار دەیگواستمەوە. ئـا لـەم کاتـەدا چـەندەها وتـەی مـەزن کـە لـە ڕێژنـەی قورئـانی پیرۆزەوە هەڵقوڵابوون، لە ناخی دڵمەوە سەریان هەڵدا و، منیش بۆ ئەو کەسانەی کـە لـە نزیکمدا بوون دەموتن و ئەوانیش بۆیان دەنووسیمەوە و، بوون بەو نامیلکانەی کە نـاوی "پەیامەکانی نوور"م لـێ نان. ئەم ناوەش لە قووڵایی دڵمەوە هەڵقوڵاوە، چونکە بە ڕاستی ئـەو پەیامانـە لـە نـووری قورئـانی پـیرۆزەوە درەوشـاونەتەوە. لـە قەناعـەت ودڵنیاییـیەکی تەواویشدام کە ئەم پەیامانە زادەی "بیر"ی من نین، بەڵکو ئیلـهامێکی خوایـین لـە نـووری قورئانی پیرۆزەوە بەسەر دڵمدا ڕژاون..

لەبەر ئـەوە، پیرۆزبـایم ئاراستەی هـەموو ئـەو کەسـانە کـرد کـە پەیامـەکانیان بـۆ دەنووسیمەوە، چونکە من دڵنیام کە جگە لەم ڕێیە هیچ ڕێیەکی تـر لـە ئـارادا نییـە بـۆ پاراستنی ئیمانی موسڵمانان و، پێم وایە کە هەرگیز نابێ ئەو ڕێژنانەی قورئـانی پـیرۆز لـە هیـچ کەسـێك قەدەغـە بکرێـن و بشـارڕێنەوە. پاشـان دەسـتانی خـاوێن و دڵسـۆز بـۆ نووسینەوەیان و بڵاوکردنەوەیان کەوتنـە کـار. ئیـتر منیـش دڵنیـا بـووم کـە ئـەم لـێبڕانەی ئەوان ڕامکردن(تسخیر)ێکی پەروەردگار و هاندانێکی خوایییە تاکو ئیمانی کەسانی تر

بپارێزرێن و، هیچ کەسێك نەتوانێت ڕێ لەم ڕامکردن و هاندانە خواییە بگرێت. لەمەشەوە هەستم کرد بە فەرمانی ئایینەکەم گەلێ پێویستە هانی گشت ئەو کەسانە بدرێت کە لەم ڕێیەدا کار دەکەن.

مەبەستی ڕاستەوخۆی ئەم پەیامانە کە لە سەد و سی دانە تێپەڕ دەبن، باسکردن و لێدوانی کاروباری سیاسەت نییە و لەو بارانەوە نادوێن و، تەنها تایبەتن بە کاروباری سەر بە دواڕۆژ و ئیمان. کەچی لەگەڵ ئەم ڕاستییە ڕوون و ئاشکرایانەشدا، بوون بە مایەی پەژارە و سەرقاڵ بوونی ئەو هەل پەرستانەی کە دەیانەوێ لە ئاوی لێڵدا ڕاو بکەن و، کاربەدەستانیان لە دژمان هاندا هەتا توندی بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر" و "قەستەمۆنی" و "دەنیزلی"یان کردم.

پاشان شارەزا و پسپۆرەکانی دادگا جۆراوجۆرەکان چەندەها لێکۆڵینەوەی زانستییانەی وردیان لە پەیامەکانی نووردا ئەنجام دا، بە سایەی خوای گەورەشەوە هەموو جارێ "ڕاستی" بەوپەڕی ڕوونی دەردەکەوت و، "دادگەری"ش پلە و پایە و ڕێ و شوێنی خۆی دەدرایێ و، هەر دادگایەك لێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوەی زانستییانەی لەو پەیامانەدا کردبێت، ویژدانی لە کێشەکەماندا بە خەرج داوە و بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەرکردووین. بەڵام ئەوانەی کە بە دوای هەلدا دەگەڕێن و لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەکەن هەرگیز بێزار نەبوون، بەڵکو ئەم جارەش بوون بەهۆی بەندکردنم و هێنایانم بۆ "ئافیوون" و، لە دەمی گرتن و لێپرسینەوەدا ئەم تۆمەتانەیان دایە پاڵم:

١ ـ تۆ کۆمەڵەیەکی سیاسیت پێکهێناوە.

٢ ـ تۆ چەند بیروبۆچوونێك بڵاو دەکەیتەوە کە دژایەتیی ڕژێم دەکات.

٣ ـ تۆ چەند ئامانجێکی سیاسیت هەیە.

ئەو هۆکارانەش کە دەکرێن بە هۆ و بەڵگەی ئەم تۆمەتانە دە پازدە ڕستەیە لە چەند پەیامێکمدا.

ئەی وەزیری بەڕێز!

ناپلیۆن وتوویەتی:

"ڕستەیەکم بۆ بهێنن کە نەگونجێ تەئویل بکرێت، من بڕیاری ئیعدامتان لەسەری بۆ دەردەکەم"!

ئایا چ ڕستەیەك هەیە لە زاری مرۆڤ دەربچێت و نەتوانرێت بکرێت بەهۆی تەئویل و تاوانبارکردن؟ بە تایبەت بۆ کەسێکی وەك من کە لە تەمەنی حەفتا و پێنج سالیدایە و وازی لە کاروباری دنیا هێناوە و بە تەواوی دەستی لێ داتەکاندووە و سەرانسەری ژیانی خۆی تەنها بۆ قیامەت تەرخان کردووە. بێ گومان دەبێ نووسینی کەسێکی وا ئازاد و سەربەست بێت، چونکە هەموو قسەیەکی ئەو لەگەڵ نیازپاکیدا هاودەمە و جگە لە گومانی باش هیچ لێکدانەوەیەکی تری بۆ دەست نادات و، دوو دڵی و لەڕوودامانیش لەخۆ ناگرێت. کەواتە گەڕان بە دوای گوناه و تاواندا لە ڕێی وردەکاری و پەردە هەڵدانەوەی ژێر دێڕەکان ستەمێکی ئاشکرا و بێ شەرمانە زیاتر هیچی تر نییە.

لەسەر بناغەی ئەمە، پەیامەکانی نوور کە سەد و سی پەیامن، هەرگیز ڕاستەوخۆ و بە مەبەست هیچ شتێکیان تێدا نییە کە پەیوەندیی بە کاروباری دنیاوە هەبێت. بەڵکو هەر هەموویان پەیوەندییان بە قیامەت و ئیمانەوە هەیە. ئەمەش سەیر و نامۆ نییە، چونکە لە ڕێژنەی نووری قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون و هیچ ئامانج و مەبەستێکی دنیایی و سیاسییان لەخۆ نەگرتووە. ئەوەتا هەر دادگایەك لەم پەیامانەی کۆڵیبێتەوە بە هەمان قەناعەت بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکانی دەرکردووە. لەبەر ئەوە، سەرقاڵ کردنی دادگاکان بە شتێك کە پێویست نییە و ناچار نییە پێوەی سەرقاڵ بێت و، دابڕینی ئیماندارانی بێ تاوان لە کار و کەسابەتیان، لە ڕاستیدا مایەی خەم و خەفەتە سەبارەت بە وڵات و هاووڵاتییان.

بەڵێ، "سەعیدی کۆن" کە هەموو ژیانی خۆی لە پێناوی بەختەوەرکردنی ئەم نەتەوەیە و بڵاوکردنەوەی ئاسایش و بەختەوەری لە سەرانسەری وڵاتدا بەخت کردووە و، بە تەواوەتی لە هەموو شتێکی سەر بە دنیا کشاوەتەوە و دەستی لێ داتەکاندووە، ئایا دەگونجێ دوای ئەوەی بوو بە "سەعیدی نوێ" و گەیشتە تەمەنی حەفتا و پێنج سالی، جارێکی تر خۆی بە سیاسەتەوە خەریك بکات؟ دیارە نەخێر. لەو باوەڕەدام کە ئێوەش قەناعەتی تەواوتان بەمە هەیە.

من تەنیا یەك ئامانجم هەیە:

لەم کاتەدا کە لە گۆڕەکەم نزیك دەبمەوە و.. لەم نیشتمانەدا کە وڵاتێکی ئیسلامی‌یە، وا دەنگی بایەقوشی بەلشەفیك دێتە گوێمان کە هەڕەشە لە بناغەکانی ئیمان دەکات لە جیهانی ئیسلامیدا و، دوای ئەوەی کە "ئیمان" لە ڕۆڵەکانی گەل بە تایبەت لە توێژی لاوان دادەماڵێت، بە لای خۆیدا کێشیان دەکات.

من بە هەموو بوون و توانایەکی خۆم لە دژی ئەوانە دەڕۆمە جیهادەوە و، موسڵمانان، بە تایبەت لاوان بۆ لای "ئیمان" بانگ دەکەم و، لە جیهادی بەردەوامدام لەگەڵ ئەو دەستە مولحیدە و، بە پشتیوانیی خوای گەورە کە لە بەردەم حزووری خۆیشیدا ئامادە دەبم ئاڵای ئەم جیهادە بەرز دەکەمەوە. هەموو کارێکی من تەنها لەمەدا خۆی دەبینێتەوە. زۆر لەوە دەترسم کە ئەوانەی ڕێ لەم ئامانجەم دەگرن خۆیشیان بەلشەفیك بن.

ئامانجی خاوێنی من بریتی‌یە لە یەکڕیزی و پشتگیری و هاوپەیوەندی لەگەڵ هەرکەسێکدا کە جیهادی ئەو دوژمنانەی ئیمان بکات. دەسا دەستم بەربدەن و سەربەستیم بدەنێ با بە یەکڕیزی و هاوشانی لەگەڵ هێزە موجاهیدەکاندا کار بکەم لە پێناوی ڕاگەیاندنی تەوحید و توندوتۆڵ کردنی "ئیمان" لەم وڵاتەدا و ئەنجامدانی چاکسازی لەناو توێژی لاواندا کە بە شیووعیەت ژەهراوی کراون.

بەندکراو:

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برا ڕاست و ئازیزەکانم!

کاریگەرترین چارەسەری لەم دنیایەدا، بە تایبەت لەم سەردەمەدا و بە تایبەتیش بۆ ئەوانەی تووشی گیروگرفت هاتوون و بۆ قوتابیانی نووریش کە دووچاری بێزاری‌یەکی سەخت و نائومێدی‌یەکی ڕەش و تاریك بوون، ئەوەیە کە: دڵنەوایی یەکتر بکەن و، هەریەکەیان خۆشی بخاتە دڵی ئەوی تر و، یارمەتیی هێز و وورەی مەعنەویی یەکتر بدەن و، زامی تەنگانە و خەم و پەژارە و بێزاریی یەکتر تیمار بکەن و، بە چەشنی برای فیداکاری ڕاستەقینە دڵی پڕ لە خەم و خەفەتی یەکتر بدەنەوە. چونکە ئەو برایەتی‌یە ڕاستەقینە و

قیامەتی‌یانەی نێوانتان بەوە ڕازی نابێت کە ڕقتان لە یەکتر بێت و هەرکەسە لایەنی خۆی بگرێت. من بە تەواوی پشتم بە ئێوە بەستووە و، ئاگاداری ئەو عەزمەی منیشن کە بڕیارم داوە نەك هەر تەنها حەوانەوە و حەیسی‌یەت و شەرەفی خۆم، بەڵکو ئامادەم بەویەڕی دڵشادی‌یەوە گیانیشم لە پێناوی ئێوەدا بەخت بکەم، تەنانەت ئەمەشم بە کردەوە لێ دەبینن، بە چەشنێ کە سوێندتان بۆ دەخۆم وا هەشت ڕۆژە لە دڵەوە ئازار دەچێژم چونکە ڕووداوێکی بێ بایەخ بوو بەهۆی ئەوەی دوان لە "ئەرکانی نوور" نازی ڕواڵەتی بەسەر یەکتردا بکەن و، لەبریی دڵنەوایی یەکتری یەکێکیان خەفەتی بە دڵی ئەوی تردا کرد. لە ئەنجامی ئەمەشەوە "گیان" و "دڵ" و "عەقڵ"م پێکەوە دەستیان بە گریان کرد و هاواریان لێ هەڵسا و وتیان:

"ئەی هاوار! ئەی هاوار! ئەی خوای لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانتر! بمانپارێزە و لە شەیتانەکانی جینني و ئینس پەنامان بدە و، دڵی برایانم بە وەفای تەواوەتی و خۆشەویستیی بێگەرد و برایەتیی ڕاستەقینە و شەفقەتی تەواو، پڕ بکە".

دەسا ئەی ئەو برایانەم کە لە توندوتۆڵی و دامەزراویدا وەکو ئاسن وان!

لە ئەرکی سەرشانمدا یارمەتیم بدەن. چونکە کێشەکەمان گەلێ هەستیار و وردە. من هەموو ئەرکێکی خۆمم بە دەستی کەسێتیی مەعنەویی ئێوە سپاردووە، چونکە گەلێ متمانەم پێتانە و لێتان دڵنیام. کەواتە ئێوەش هەتا دەتوانن یارمەتیم بدەن. چونکە هەرچەند ڕووداوەکە بچووك و بێ بایەخە، بەڵام دەبێ بزانن کە یەك دانە "موو" گەر بکەوێتە چاومان ئازارمان دەدات و، گەر بیشکەوێتە ناو کاتژمێرەکانمان ئەوا دەیانوەستێنێت!

ئەم ڕووداوە جوزئی‌یە لە ڕاستیدا بە گەورە دادەنرێت، ئەوەبوو هەر سێ تەقینەوە ماددی‌یەکە و هەر سێ بینینە مەعنەوی‌یەکانیش هەواڵیان لەبارەوە ڕاگەیاند.

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

تەقینەوەی زۆپاکەی من و شکانی پەرداخەکانی فەیزی و خەسرەو هەواڵی موسیبەتێك ڕادەگەیەنن کە دێتە ڕێمان.

بەڵێ، دەبێ بە هەموو توانایەك پارێزگاری لە پشتگیریی ڕاستەقینەی یەکتر و هاوپەیوەندیی ڕاست و دۆستانەی نێوانتان بکەن، کە بەهێزترین پاڵپشت و پشتیوانیی ئێمەیە. هاودەم لەگەڵ چاوپۆشی لە هەڵەی یەکتر و بێزاری دەرنەبڕین لە "خەسرەو" کە پاڵەوانی نووره و نوێنەری کەسی مەعنەوییەتی و لە جێی مندایە.

چەند ڕۆژێك پێش ئێستا لە خۆمدا هەستم بە دڵتەنگی دەکرد و بە نیگەرانییەوە دەموت:

"دوژمنانمان هۆکارێکیان دۆزییەوە کە بەهۆیەوە بتوانن بەسەرماندا سەربکەون"!

دەسا وریا بن!! وریا بن!! وریا بن!!

خێرا ئەو کەلێنە لابەن کە کەوتووەتە پەیوەندیی توندوتۆڵی پۆڵایینی نێوانتانەوە. سوێند بە خوا ئەم ڕووداوە ـ بە تایبەت لەم کاتەدا ـ زیاتر لە بەندکردنمان زیان بە خزمەتی قورئان و ئیمان دەگەیەنێت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمە سبحانە

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

شەوی "میعراج" وەکو شەوێکی "قەدر"ی تر وایە؛ چونکە بەدەستهێنانی پاداشت بە ئەنجامدانی کاری بەردەوام و بەپێی توانا لەم شەوەدا یەك بۆ هەزار بەرز دەبێتەوە. هەروەها بەو نهێنییەی کە لە بەشداری کردنی مەعنەویی کاروبارە ئیمانییەکاندا هەیە و، بە وێنەی هەندێ لەو مەلائیکەتانەی کە بە چل هەزار زمان تەسبیحات دەکەن ئێوەش بە چل هەزار زمان چەندین پەرستش و دوعا و نزای بێگەرد لەم شەوە پیرۆزەدا ئەنجام دەدەن، بە تایبەت لەم شوێنی گۆشەگیری و ئیعتیکافەی کە پاداشتی زۆری تێدایە و، بە پەرستشەکانتان لەم شەوەدا شوکری پەروەردگاری خۆتان دەکەن. هەموو ئەم دەستکەوتانە لە بەرامبەر ئەوەی کە یەك لە دەی زیانەکانی ئەو زریانەی داهاتوومان بەرنەکەوێت کە لەوانەبوو بهاتایەتە ڕێمان.

ئێمە پیرۆزبایی ئەوەتان لێ دەکەین کە حەزەر و وریایی تەواوەتیتان ئەنجام دا و، لە هەمان کاتدا مژدەی ئەوەشتان دەدەینێ کە زۆر بە ڕوونی و ئاشکرا چاودێریی پەروەردگار سەبارەت بە ئێمەوە دەرکەوت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم:**

بە هەموو گیان و جەستەی خۆم پیرۆزبایی شەوی میعراجتان لێ دەکەم.

**دووهەم:**

بیست سالی ڕەبەقە دەعوای ئێمە بریتی‌یە لەوەی کە هەتا بتوانرێت قوتابیانی نوور کاریان بەسەر سیستەمی دەوڵەتەوە نی‌یە و، بە خراپی دەست بۆ ئاسایشی وڵات نابەن. کەچی کێشەی ئەم بەندکردنەی ئێستامان دەگونجێ نیشانە و بەڵگەیەکی بەهێز بێت بۆ زامدارکردنی ئەم دەعوایەمان، چونکە ئەو کەسانەی هێرش دەکەنە سەرمان لەو گومانەدان کە ئێمە یەکەم شت ڕێسا و ئاسایشی وڵات تێکدەدەین..

بەڵام بەهۆی ڕێز و حورمەتی بێگەردی و وەفاداریی ئێوەی ئازیزەوە چاودێریی خوای گەورە بە جوانی دەرکەوت، ئەوەبوو توندوتیژیی گیروگرفتەکە لە سەد پلەوە دابەزی بۆ یەك و، بە فەزڵی خوای گەورە ئەو شتەی کە هێندەی گومەزێك لەسەر ئێمە گەورە کرابوو بە ئەندازەی دەنکە دانەوێڵەیەکی لێ هات و بچووك بووەوە. دەنا ئەو کەسانەی کە شتی بچووك بە گەورەیی پێش چاو دەخەن و دەنکە دانەوێڵەیەك بە ئەندازەی گومەزێك پیشان دەدەن ئەم هەلەیان دەقۆزتەوە بۆ بڵاوکردنەوەی درۆ و دەلەسە لە دژمان و، لەوانەشە وا لە خەڵکی بکەن باوەڕ بە درۆکانیان بهێنن.

**سێهەم:**

ئێوە بیر لە من مەکەنەوە و هەرگیز بۆ من نیگەران مەبن. چونکە بوونم لەگەڵ ئێوە لەناو یەك تەلار و بینادا هەموو سەختی و دەردیسەری و گوشارێکم لەسەر لادەبات. بە ڕاستی کۆبوونەوەمان لێرە گرنگی‌یەکی مەزن و گەلێ سوودی زۆر و زەبەندەی، لە

چەند ڕوویەکەوە، بۆ خزمەتی ئیمان تێدایە. تەنانەت ناردنی ئەو ڕاستی‌یە گرنگانەی کە لە (پاشماوەی ئیعتیراز)ەکەدان لەم جارەدا بۆ هەر شەش فەرمانگە بالاکەی "ئەنقەرە" و سەرنج ڕاکێشانی ئەوان بە لای خۆیاندا و ڕایی کردنی فەرمانەکانی خۆی لەواندا ـ تا ڕادەیەك ـ هەموو سەختی و ماندووبوونێکی ئێمەی سڕی‌یەوە و لایبرد.

**چوارەم:**

سەرقاڵ بوون ـ بە پێی توانا ـ بە پەیامەکانی نوورەوە دڵتەنگی و بێزاری لەناو دەبات و، دەگونجێ بە پێنج جۆری پەرستش دابنرێت.

**پێنجەم:**

بە فەزڵی وانەکانی پەیامەکانی نوور پلەی موسیبەتەکەی پێشوو لە سەدەوە هاتە خوارەوە بۆ یەك، دەنا لە ڕووی بارودۆخی وردی کات و شوێنەکەوە تەنیا یەك دانە دانەوێڵە دەکرا بە چەند گومەزێکی زۆر. واتە وەك فڕێدانی پزیسکی ئاگری لێ دەهات بۆ ناو بارووت. تەنانەت هەندێك لە کارمەندە ڕەسمی‌یەکان وتیان: "ئەو کەسانەی گوێ بیستی وانەکانی نوور بوون، خۆیان لەو کارەدا هەڵنەقورتاند". خۆ ئەگەر هەموویان گوێ‌یان لەو وانانەی نوور بگرتایە ئەوا هیچ شتێك هەرگیز ڕووی نەدەدا.

دەسا برایانم!

تا دەتوانن بوار بە دروست بوونی دووبەرەکی و پەرتەوازەیی مەدەن، تاکو دەردیسەریی تر لەسەر دڵتەنگی و بێزاری‌یەکانی ناو بەندیخانە مەڵۆ نەکەن. دەبا بەندکراوانیش بە وێنەی قوتابیانی نوور برای خۆشەویستی یەکتر بن و، دەنگ لە یەکتری دانەبڕن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا بەوەفا و دڵسۆزەکانم!

تا ڕادەی واجب بوون و بە گوێرەی توانا و بەوپەڕی هێزمانەوە پێویستە دەستوورەکانی بریسکەی "ئیخلاس" و نهێنیی ئیخلاسی ڕاستەقینە لە نێوان خۆماندا بەرامبەر یەکتری بەکاربهێنین. چونکە هەواڵێکی یەقینیم پێ گەیشتووە کە ماوەی سێ

مانگە سێ دانە کەسیان داناوە بۆ ئەوەی ساردوسڕی بخەنە ناو برایانمانەوە لێرە. بۆ ئەم مەبەستەش دەرفەت لەوە وەردەگرن کە بەهێزان سارد بکەنەوە و وەهم و گومان و ترسیش بخەنە دڵی ئەوانەی کە نەرم و نیان و کەم سەبر و ئارامن و، لە ئەنجامدا وایان لێ بکەن واز لە خزمەتگوزاریی نوور بهێنن!

کەواتە: وریابن!! وریابن!!

نەکەن ئەو خۆشەویستی‌یە قووڵ و ڕاستەی نێوان دڵانتان لەرزەی پێ بکەوێ. چونکە تەنها لەرەیەکی کەمی بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە برایەتی و خۆشەویستیی نێوانماندا زیانێکی یەکجار مەزنی هەیە. ئێمە - گەر پێویست بکات - بەوپەڕی ئاسانی گیانی خۆمان لە پێناوی برایەتیی نێوانماندا بەخت دەکەین. خزمەتی ئیمان و قورئان داخوازی ئەمەیە. کەواتە با لە ئەنجامی بێزاری و دەمارگرژیی ئەم تەنگانە سەختەوە یان هەر هۆیەکی تر، هیچ کامتان لەوی تر زویر نەبێت، بەڵکو هەریەك لە ئێوە هەوڵ بدات خۆشەویستی‌یەکەی و دڵسۆزی و ئیخلاسی بەرامبەر براکەی زیاد بکات. دەنا زیانێکی گەلێ مەزن دەکەین، چونکە ئەو کاتە دەنکە گەنمێکی بچووك بە ئەندازەی گومەزێکی مەزنی لێ دێ و چار ناکرێت.

لێرەدا بە کورتی لەم باسە دوایین. درێژە پێدانەکەی بە فیراسەتی خۆتان دەسپێرم.

* * *

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

لەسەر بناغەی بێدارکردنەوەیەکی مەعنەوی بۆم دەرکەوتووە کە ئێوە یەك دوو ئەرکی نوورانیتان لە ئەستۆدایە، ئەویش بریتی‌یە لەوەی بە هەموو هێز و توانایەکی خۆتان و لە ڕێی وانەی پەیامەکانی نوورەوە کارێك بکەن کە دووبەرەکی و لایەنگرتنی هیچ لایەنێك لە نێوان بەندکراوانی هەژار و گیرۆدەی ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە سێ‌هەمەدا ڕوونەدات، چونکە چەند کەسێکی تێکدەری ترسناك لە پشتی پەردەوە بۆ هەل دەگەڕێن تاکو دووبەرەکی و ئاماجە کەسی‌یەکان و ڕق و سەرسەختیی بەندکراوان بقۆزنەوە.

جا مادەم زۆربەی هاوڕێیانی بەندیخانەمان گیانی قارەمانی و فیداکاری‌یان تێدایە و هەر یەکەیان ئامادەیە لە کاتی پێویستدا گیانی خۆی لە پێناوی وڵات و نەتەوە و خۆشەویستانیدا بەخت بکات، ئەوا بێ گومان پێویستە ئەو مەردە بەغیرەتانە لە پێناوی

ئاسوودەیی نەتەوە و حەوانەوەی بەندکراوان و ڕزگاربوون لە دەستی ئاژاوەچیانی ژێر پەردەدا (کە بە پەنهانی و لە بەرژەوەندیی ئاژاوە و تۆقاندندا کارەکانیان ئەنجام دەدەن و بیر و هزری خەڵکی بە شیووعیەت دەپێچن) ئامانجە کەسی‌یەکان و دوژمنایەتی‌یەکانی نێوان خۆیان واز لێ بهێنن و، دەست لەو دوژمنایەتی‌یە هەڵبگرن کە بە دڵنیایی‌یەوە دەزانین هیچ سوودێکی تێدا نی‌یە، تەنانەت زیانێکی زۆری لێ دەبێتەوە، بە تایبەت لەم کاتە سەیر و سەمەرەیەدا..

دەنا هەر شتێکی پێچەوانەی ئەمە ـ لەم کاتە سەیرەدا ـ وەك ئەوە وایە پزیسکی ئاگر فڕێ بداتە ناو باررووتەوە و، زیان بە سەد کەسی بەندکراوی لاواز و بە قوتابیانی بێ تاوانی نوور و بەم پارێزگای ئافیوونە دەگەیەنێت، تەنانەت لەوانەشە ببێت بە داردەستی ڕێکخراوێکی بیانی کە هاتووەتە ناو وڵاتەوە.

جا مادەم ئێمە لە ڕووی قەدەری خوای گەورەوە لەبەر ئەو کەسانە هاتووینەتە ناو ئەم بەندیخانەیەوە، بەڵکو هەندێکیشمان لە پێناوی بەردەوامکردنی حەوانەوە و بەختەوەریی مەعنەویی ئەو بەندکراوانەدا نایەوێت بەندیخانە بەجێ بهێڵێت و، هەمووومان ئامادەشین لەبەر حەوانەوەی برایانی ترمان حەوانەوە و شادمانیی خۆمان بەخت بکەین. ئەوا بێ گومان ئەو برا نوێیانەشمان وەك بەندکراوەکانی بەندیخانەی "دەنیزلی"یان لێ دێت و، لە یەکتر بێزار نابن و دەنگ لە یەکدی دانابڕن. بەڵکو دەبێ ـ کە ئەمەش گەلێ پێویستە ـ لە نێوان خۆیاندا ئاشت ببنەوە و، لەبەر هەست و نەستی برایانمان و بۆ ڕاگرتنی ڕێزی مانگی شەعبان و ڕەمەزانی پیرۆز ببن بە برای خۆشەویستی یەکتری.

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە و منیش لە لایەنی خۆمەوە ئەوان لە بازنەی قوتابیانی نووردا دادەنێم، تەنانەت ڕۆشتوونەتە ناوەندی دوعاکانمانەوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

**یەکەم:** بەپێی نهێنیی: "الخیر فیما اختاره الله" دواخستنی کاتی دادگایی کردنمان و ئامادەبوونی ئەو برایانەمان لە ڕۆژی دادگایی کردندا کە لێرە ئازاد کران، خێرێکی زۆری تێدایە.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی کێشەی "پەیامەکانی نوور" گرنگیی بۆ سەرانسەری جیهانی ئیسلامی، بە تایبەت ئەم وڵاتە هەیە، ئەوا پێویست بەم کۆڕ و کۆبوونەوە جەنجاڵ و سەرنج ڕاکێشانە دەبێت کە ڕوانینی گشتیی خەڵکی بۆلای ڕاستی‌یەکانی "پەیامەکانی نوور" ڕادەکێشێت.

بەم جۆرە "پەیامەکانی نوور" وانە ڕەنگینەکانی خۆی بەوپەڕی ڕاشکاوی بە دۆست و دوژمنانی دەڵێتەوە، بە ڕادەیەك کە بێ هیچ دوودڵی‌یەك پەنهانترینی نهێنی‌یەکانی بۆ سەرسەخت ترین دوژمنی خۆی ئاشکرا کردووە، لەم چەشنە کۆبوونەوانەدا کە لەسەرەوەی حساب و لێکدانەوەی ئێمەوەیە و، بەدەر لە حەزەر کردن و پێچەوانەی شاردنەوەی پەیامەکانە لە لایەن ئێمەوە و، دژی سووکایەتی پێ کردنی ئەو پەیامانەیە لە لایەن دوژمنانمانەوە، سەرەڕای ئەوەش کە لە دەرەوەی ویست و توانای ئێمەشدایە.

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئەوا دەبێ ئەو گوشارە کەم و جوزئی‌یانەی کە لێرە گیرۆدەی بووین وەك چارەسەر و دەرمانێکی تاڵی دابنێین کە بە شوکر وئارامگرتنەوە ڕووبەڕووی ببینەوە و، بڵێین: هەموو حاڵێك دەگوزەرێت.

**دووهەم**: ئەمەی خوارەوەم بۆ بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە نووسی:

کاتێ لە ڕووسیا دیل بووم، یەکەم جار شۆڕشی بەلشەفی لە بەندیخانەکانەوە سەری هەڵدا، هەروەك شۆڕشی فەرەنساش هەر لە بەندیخانەکانەوە دەستی پێکرد و ئەو بەندکراوانە هەڵگری ئاڵای شۆڕشەکە بوون کە لە مێژوودا بەناوی "ئاژاوەچی‌یەکان" ناوبراون. ئێمەی قوتابیانی نووریش هەموو جارێك لە بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" و لێرەش لە بەندیخانەی "ئافیوون" بە هەموو توانایەکمانەوە هەوڵمان داوە چاکسازی لەناو بەندکراواندا ئەنجام بدەین. ئەوەبوو تەقالا و هەوڵەکانمان لە هەردوو بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" بەروبوومی باشی بەرهەم هێنا. لێرەش بە پشتیوانیی خوای گەورە بەروبوومی زیاتری دەبێت. تەنانەت لەم کات و شوێنە ورد و بارودۆخە ناسکەدا ئەو زریانە[1] تێپەڕی و توندوتیژی‌یەکەی بەهۆی وانەی پەیامەکانی

---

(١) مەبەست ئەو ڕووداوی یاخی بوونەیە کە لەناو بەندکراوانی بەندیخانەی "ئافیوون"دا ڕووی دا و، قوتابیانی نوور بە هیچ جۆرێك بەشداری‌یان تێدا نەکرد. (دانەر)

نوور لە سەد پلەوە دابەزی بۆ یەك. چونکە ئەگەر ئەو وانانەی پەیامەکانی نوور نەبوونایە تەوژمە دەرەکی‌یە تێکدەرەکان ئەو دووبەرەکی و چەشنە ڕووداوانەیان بۆ ئامانجەکانی خۆیان دەقۆزتەوە و، پزیسکیان فڕێ دەدایە ناو بارووتەوە و ئاگریان هەڵدەگیرساند.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

ئەی برایانی ئازیز و دۆست و دامەزراوم لە خزمەتی قورئاندا!

ئەی ئەوانەی کە لە کاتی تەنگانەدا لێمان هەڵنایەن!

لە ئەنجامی تەنگانەیەکی ماددی و مەعنەویدا و بەهۆی بیرکردنەوەم لە ئێوە، گەلێ خەمم خوارد. بەڵام کتوپڕ ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە: ئەگەر دە هێندەی ئەم دەردیسەری و گیروگرفتانەشتان بە جۆرێکی تر بهاتایەتە ڕێ و خۆتان لە بەردەمیدا ڕابگرتایە هێشتا هەر بە کەم دادەنرا لە بەرامبەر چاو پێکەوتن و بینینی برایەکمان لە نزیکەوە.

بەڵێ، وەك ئەوەی کە ئەهلی حەقیقەت ساڵی یەك دوو جار کۆ دەبوونەوە، زۆر پێویستە هەموو چەند ساڵ جارێك قوتابیانی نووریش بە یەکەوە کۆببنەوە و، درێژە بە گفتوگۆ و تو وێژەکانیان بدەن، بەپێی مەشرەبی پەیامەکانی نوور کە ئاوێتەی تەقوا و وەرزشی ڕۆحی‌یە و، لەسەر ڕێبازی تایبەتیی پەیامەکان کە بریتی‌یە لە وتنەوەی وانەکانی بە هەموو کەسێك، بە تایبەت بەوانەی موحتاجی ئەو وانە و ڕێنماییانەن، تەنانەت بە نەیارەکانیشی و، بۆ ئەوەش کەسێتیی مەعنەویی ئەو پەیامانە لەو بازنەیەدا بخرێتە گوفتار. خۆ ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە باشترین و گونجاوترین جێ‌یە بۆ هێنانەدیی ئەم ئامانجانە، بە ڕادەیەك کە هەموو گیروگرفتێکی لە ڕێدا - با هەزار دانەش بێت - ئاسایی و ئاسان دەبێتەوە.

دوورەپەرێزیی برا لاوازەکانمان و خۆ کشانەوەیان لە مەیدانی کار کردن بۆ پەیامەکانی نوور لەتاو بێزاری‌یان لە بەندیخانەکانی پێشوودا زیانێکی گەورە بوو لێیان کەوت، لە کاتێکدا کە هیچ زیانێك بە پەیامەکان و قوتابیانی نوور نەگەیشت، بەڵکو لە بریی ئەوان کەسانی زۆر لەوان دامەزراوتر و دڵسۆزتر هاتنە بازنەی قوتابیانی نوورەوە.

جا لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەکانی دنیا چەند ڕێبوارێکن کە بە خێرایی دێن و دەڕۆن و پاداشت و بەروبوومەکانیان دەدەنە دەستمان، ئەوا دەبێ لە چاودێریی خوای گەورە دڵنیا بین و، لەناوەندی خۆڕاگری و ئارامدا شوکر و سوپاس پێشکەشی پەروەردگارمان بکەین.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

یەکەم: کاتێ دوو پارچەکەی دوایی لە ڕێی کەسێکی بەڕێزەوە کە خۆتان هەڵی بژێرن دەدەنە دەستی سەرۆکی دادگا تاکو بە جۆرێکی نارەسمی ببینێت و ئاگاداریی لەبارەوە پەیدا بکات، با دوای چاپکردنی بێت بە پیتی نوێ یان پیتە کۆنەکان و، یادخستنەوەیەکی تریشی لەگەڵدا پێشکەش بکەن کە تیایدا بنووسن:

"سەعید" سوپاسی زۆری خۆیتان پێشکەش دەکات و، دەڵێت:

پاسەوانەکان پەنجەرەکانیان کردەوە، بەڵام داواکاری گشتی بوار بە هیچ کام لە برایانم نادات بێت بۆ لام. هەروەها تکایەکی گەرمتان لێ دەکات موصحەفە پیرۆزەکەی بدەنەوە کە لە دادگادا دەستی بە سەردا گیراوە و بە خەتێکی دەستیی نایاب و ئیعجاز نوێن نووسراوەتەوە، تاکو لەم مانگە پیرۆزانەدا تیایدا بخوێنێت. ئەوەش هەیە کە سێ جوزء لەو موصحەفە بۆ سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی ڕەوانە کراوە، تاکو هەوڵی چاپکردن و لەبەرگرتنەوەی بدەن.

جگە لەمانەش تکاتان لێ دەکات کە یەکێك لەو کۆمەڵە پەیامانەی بدەنەوە کە درا بە دادگا تاکو لەم زیندانە تاکە کەسی و دابڕانە تەواوەتی‌یەدا لە خەڵکی و لەم تەنگانە توندوتیژەدا بیکات بە مایەی دڵدانەوەی خۆی و بێزاریی دڵی بە خوێندنەوەی ئەو کۆمەڵەیە دەربکات و هاوڕێی بێت لەم گۆشەگیری‌یەیدا.

ئەوەش بزانن کە ئەو کۆمەڵە پەیامانە بە سێ چوار دادگادا تێپەڕیون، بێ ئەوەی ڕەخنە و ئیعتیرازی لێ بگرن. وێڕای ئەوەی کە زۆر لە زانایانی مەککەی پیرۆز و

مەدینــەی منــەووەرە و شــام و حەلـــەب و گـــەورە زانایـــانی ئەزهـــەری میســـر ڕێــز و سەرسوورمانی خۆیان لە ئاستیاندا نواندووە و، هیچ ڕەخنە و ئیعتیرازێکیان بەرامبەر بەو پەیامانە نەبووە، بە شایەتیی ئەوانەی کە لە حەج هاتوونەتەوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و بەوەفام!

"فەیزی" دوو نوسخەی لە (الحزب النوري) لەلایە. جا ئەگەر پێویستتان پێیان نی‌یە بیان نێرن بۆم، یان با "محەممەد فەیزی" نوسخەیەکی تر بنووسێتەوە. جگە لەوەش پێویستمان بە (پەیامی ڕەمەزان) و (ئایەتولکوبرا)ی چاپکراوە.

بە خێرایی ئەو دڵگرانی‌یەی نێوانتان سارێژ بکەن..

وریابن.. وریابن لەم شتانە.. هەر لادانێك با زۆر کەمیش بێت زیانێکی یەکجار گەورە بە بازنەی نوور دەگەیەنێت. کەواتە هیچ کاردانەوەیەکتان نەبێت بەرامبەر بەو هەست و نەستانەی کە ئەنجامی ئەم تەنگانەیەن. ئەوەبوو تەقینەوەی زۆرپاکەم ئاماژەی بۆ ئەم ڕووداوە کرد.

* * *

برایانی دۆست و ئازیزم: "خەسرەو" و "محەممەد فەیزی" و "صەبری"!

بە هەموو متمانە و قەناعەتێکم ئومێدم وابوو کە ئەمانەتی پارێزگاری کردن لە سەلامەتیی پەیامەکانی نوور بە ئێوە بسپێرم و، پاشان بە دڵی شادەوە بڕۆمە ناو گۆڕەکەم. هەروەك لەو بڕوایەدا بووم کە هیچ شتێك ناتوانێت ئێوە لە یەکتر بکات. وا ئێستاش بێدارکردنەوەیەکی ڕەسمی هەیە کە بە پلانێکی ترسناك داڕێژراوە بۆ ئەوەی دڵگرانی لە یەکتر بخەنە نێوان قوتابیانی ئەرکانی نوورەوە.

جا مادەم ئێوە - گەر پێویست بکات - لەبەر کەسانی تر و بەپێی خواستی وەفای بێگەردی نێوانتان و پەیوەندیی توندوتۆڵتان بە پەیامەکانی نوورەوە ئامادەن ژیانی خۆتان بەخت بکەن، ئەوا بێ گومان تەنانەت پێویستیشە کە هەست و نەستە جوزئی و ڕێبوارانەکەی خۆتان، کە هیچ نرخێکیشی نی‌یە، لە پێناوی کەسانی تردا بەخت بکەن.

دەنا هەر کارێکی پێچەوانەی ئەمە - بێ هیچ گومانێك - زیانێکی گەورەمان لەم کاتەدا پێ دەگەیەنێت، هەروەك گریمانی جیابوونەوەش لە بازنەی پەیامەکانی نوور دێتە کایەوە. کە ئەمە دەڵێم لەرز بە جەستەمدا دێت لەتاو ئەم ئاکامە.

وا سێ ڕۆژە دڵتەنگی‌یەکی وام تووش بووە کە زۆر بە توندی ڕایچەڵەکاندووم و لە ژیانمدا شتی وام بە خۆمەوە نەدیوە و، ئێستاش بە دڵنیایی‌یەوە زانیم کە نازکردنێکی تەنانەت زۆرکەمی بە قەدەر تاڵە موویەك بەسەر یەکتریدا وەك تەقینەوەی بۆمبایەك وایە لە ژیانی نوورانیی ئێمەدا.

تەنانەت ئەوەشتان پێ ڕادەگەیەنم کە هەوڵ و تەقالایەکی سەرومڕ دراوە بۆ ئەوەی ئێمە وا پیشان بدرێین کە پەیوەندیمان بە زریانەکەی پێشووەوە بوو بێت. وا ئێستاش هەوڵی ئەوە دەدەن دڵگرانی لە یەکتر - با کەمیش بێت - بخەنە نێوانتانەوە.

من لە لایەنی خۆمەوە بڕیارم داوە کە بۆ قسوور و کەمتەرخەمیی کەستان نەڕوانم، هەرچەندە لە پێناوی پاراستنی هەست و نەستی ئێوەدا دە هێندەی خۆتان زیاتر سەختی و گیروگرفتەکان هەڵدەگرم. دەسا بەناوی مامۆستاکەمان کە بریتی‌یە لە کەسێتیی مەعنەویی پەیامەکانی نوور داواتان لێ دەکەم کە دەستبەرداری خۆویستی بن، چ مرۆڤ تیایدا لەسەر حەق بێت یان نا.

خۆ ئەگەر چەند پەنجەیەکی پەنهان لەو شوێنە سەیرەدا ببێت کاری خۆی بکات لەبەر ئەوەی بەیەکەوەن، دەبا یەکێکتان بڕوات بۆ ژوورەکەی "طاهیری".

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

ئەی هاوڕێیانی خوێندنم لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا!

ئەم شەوەی کە دێت شەوی نیوەی شەعبانە و، وەك ناوکێکی بەپیت و بەرزی ساڵێکی تەواو وایە و، جۆرە بەرنامەیەکی چارەنووسەکانی ئادەمیزادە. بۆیە ئەم شەوە بەرزی و خاوێنی‌یەك لە "شەوی قەدر"ەوە بەدەست دەهێنێت و، هەر کردەوەیەکی چاك و خوێندنی هەر پیتێکی قورئان لە شەوی نیوەی شەعباندا تا بیست هەزار خێر و پاداشت بەرز دەبێتەوە.

ئەگەر لە کاتەکانی تردا پاداشتی هەر کردەوەیەکی چاك یەك بە دە بێت، لەم سێ مانگەدا یەك بە سەد و یەك بە هەزار بەرز دەبێتەوە و، لەم شەوانەشدا پاداشتی کردەوەی چاك یەك بۆ دە هەزار و بیست هەزار و سی هەزار دەڕوات. کەواتە پەرستش لەم شەوانەدا هاوتای خواپەرستیی پەنجا ساڵ دەبێت. لەبەر ئەوە، خۆ خەریك کردن بە خوێندنی قورئان و تۆبە و داوای لێبوردن و سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەم شەوەدا قازانج و دەستکەوتێکی یەکجار گەورەیە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

سلمكم الله في الدارين

پڕ بە دڵ و گیانی خۆمان پیرۆزبایی شەوی نیوەی شەعبانتان لێ دەکەین، کە شەوێکە ئیمانداران دەتوانن تەمەنێکی مەعنەویی هێندەی پەنجا ساڵ خواپەرستیی تێدا بە دەست بهێنن. چونکە هەموو قوتابییەکی خاوەن ئیخلاسی پەیامەکانی نوور لەم شەوەدا وەکو ئەوە وایە کە بە چل هەزار زمان خواپەرستی و داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات، بە وێنەی هەندێ لەو مەلائیکەتانەی کە بە چل هەزار زمان تەسبیحاتی خوای گەورە دەکەن. بە دڵنیاییەکی تەواوەتی و بەهۆی نهێنیی بەشداری کردنی قوتابیانی نوور لە کاروبارە مەعنەوییەکاندا و لە ڕێژنەی هاوپشتگیریی مەعنەویی نێوانیانەوە ئەم ئومێدەمان بە میهرەبانیی خوای گەورە هەیە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

یەکەم: هەندێ کەس لە داواکاران ڕەخنەیان لە مەسەلەیەکی (تیشکی پێنجەم) گرت کە پەیوەندیی بە دەجالەوە هەیە و، لەمەشدا لە ژێر کاریگەریی ئیدیعای هەندێ زانای بیدعەتخواز و شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکاندان لەوانەی کە ئینکاریی هاتنی دەجاڵ

تەنانەت چەند دەجالێك دەکەن لەناو نەتەوەی ئیسلامدا. لەوانەیە ئەم فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر ﷺ باشترین بەلگە بێت کە ئەو بۆچوونە هەلاّنە پووچەڵ بکاتەوە:

(لن تزالَ الخلافةُ في ولدِ عمي - صِنْوِ أبي - العباس حتى يسلّمَها إلى الدجال)[1].

ئەم فەرموودە پیرۆزە وێڕای ئەوەی کە موعجیزەیەکی ڕەنگینی پێغەمبەری سەروەرمانە ﷺ، بەلگەیەکی ڕاشکاویشە لەسەر ئەوەی کە خەلافەتی عەبباسی پەیدا دەبێت و، ئنجا ماوەیەکی دوور و درێژی نزیکی پێنج سەد ساڵ دەخایەنێت و، پاشان لەسەر دەستی یەکێك لە سێ دەجالەکانی وەك جەنگیز و هۆلاکۆ دەڕووخێنرێت و، حکومەتێکی دەجالاّنە لە جیهانی ئیسلامیدا بەرپا دەبێت. واتە: بەلگەیەکی ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی کە جیهانی ئیسلامی دووچاری ئاشووبی سێ دانە دەجاڵ دەبێت، بەپێی هەواڵی فەرموودە پیرۆزە جیاجیاکان کە لەم بارەیەوە هاتوون.

ئەو هەواڵە غەیبی‌یەی کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە دوو موعجیزەی بێ گومانی پێغەمبەری خۆشەویستی ﷺ تێدایە:

یەکەم: خەلافەتی عەبباسی پەیدا دەبێت و پێنج سەد ساڵ بەردەوام دەبێت

دووهەم: ئەم خەلافەتە لەسەر دەستی دەجالێکی ستەمکاری خوێنڕێژی وەك جەنگیز و هۆلاکۆدا لەناو دەچێت.

بە ڕاستی گەلێ سەیرە! ئایا دەگونجێ ئەو خاوەن شەریعەتەی کە لە فەرموودەکانیدا هەواڵی چەندین شتی جوزئیی داوە کە پەیوەندی‌یان بە شەعائیر و قورئانەوە هەیە، هەرگیز هەواڵی لەبارەی ڕووداوە سەیر و سەمەرەکانی ئەم ڕۆژگارەی ئێمەوە ڕانەگەیاندبێت؟ یان ئایا دەگونجێ ئاماژە بۆ قوتابیانی پەیامەکانی نوور نەکرێت کە خۆیان تەرخان کردووە بۆ خزمەتێکی پاك و بێگەردی قورئانی پیرۆز و بە شێوەیەکی فراوان و ڕەنگین، بە تایبەتی لە زەمەنێکی سەیری وەك ئەم ڕۆژگار و سەردەمەی خۆماندا و لە بارودۆخێکی دژواری چەشنی ئەم بارودۆخەی ئێمەدا.. کە خزمەتێکە دۆست و دوژمن دانی پێدا دەنێن؟

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) تەخریجەکەی لە لاپەڕە (٦٢٨)دا ڕابورد. (وەرگێڕ)

باسمه سبحانه

بۆ برای ئازیزی پێشەنگی نوور و خزمەتگوزاری قورئان: (ڕەئفەت بەگ)!

ئەمەی خوارەوە سەرنجێکە لە سەرنجەکانی ئایەتی پیرۆزی:

﴿وَضُرِبَتْ عليهم الذِّلَّةُ والْمسْكَنَةُ﴾ (البقرة: ٦١).

کاتێ جوولەکەکان پێیان لـە خۆشەویستیی ژیـان و هەڵپەکردندا بۆ دنیا ڕاکێشا و زیادەڕەوی‌یان تێدا نواند، شایستەیی ئەوەیان بەدەست هێنا کە لە هەموو شـوێن و هـەموو چەرخێکدا زللـەی هـەژاری و زەلیلـی بچێـژن. بـەڵام ئێسـتا سـەبارەت بـە کێشـەی فەلەستینەوە هەندێ جیاوازیی هەیە، چونکە ئەو خۆشەویستیی ژیـان و هەڵپەکردنە بۆ دنیـا، کە بە درێژایی مێژووی چەرخەکانی پێشوو لـە سروشتی جوولەکەدا ڕیشـکی داکوتاوە، ئێستا لـە بریی ئەوە هەستێکی نەتـەوەیی و ئایینی‌یـان تێـدا پەیدا بووە، ئەوەتا خەریکن هەست بکەن بەوەی کە فەلەستین گۆڕستانی نـەوەی ئیسرائیلە و، پێغەمبـەرانی پێشـوو - درووديـان لەسـەر بێـت - لـە نەتەوەکەی ئەوان بـوون. جا لەبەر ئەم هەسـتە نەتـەوەیی و ئایینی‌یەیە کە ئـەم جـارە زللـەی تـەمێ کردنیـان لـێ نـەدرا. دەنـا چـۆن کەمایەتی‌یەکی خەڵك لە نێوان ئەو هەموو عەرەبە زۆرەدا دەتوانێـت بژی کە لـە هـەموو لایەکەوە دەورەیان لـێ داون، بێ ئـەوەی زللەیـەکی خێرایـان لـێ بدرێـت و هـەژاری و زەلیلی بچێژن!

* * *

**پرسیار:**

ئایا هیچ ئایەتێکی پیرۆز هەیە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە زەوی شێوەی گۆی هەیـە؟ ئایا لە چ سوورەتێکی قورئانی پیرۆزدایە؟ چونکە گومـانێکم هەیـە سـەبارەت بـەوەی کـە تەخت بێت یان شێوەی گۆی هـەبێت؟ ئنجا مـادەم زەویـی حکوومەتـەکان بە دەریاکـان دەورەیان دراوە، ئایا چی پارێزگاریی کەنارەکانی ئەو دەریا فراوانانە دەکات؟

مەلا عەلی - لە ئەمیرداغ

**وەڵام:**

پەیامـەکانی نـوور ئـەم مەسـەلەیە و هاوشێوەکانی ئەمـەیان شـی کردووەتـەوە. دەبـێ بیشزانین کە زانایانی ئیسلام ئەوەیان پێ قبووڵە زەوی لە شێوەی گۆدا بێت و، پێیان وایە

كە ئەوە دژی ئایین نی‌یە. هاتنی وشەی (ســـطح)یش (واتە تەختی) لە ئایەتەكەدا ئەوە ناگەیەنێت كە شێوەی گۆی نەبێت.

ئەوەش هەیە كە "ڕوو كردنە قیبلە" مەرجە لە نوێژدا بەلای موجتەهیدەكانەوە. خۆ "مەرج"یش دەبێ لە هەموو ئەركانەكانی نوێژدا بێتەدی، هەر لەبەر ئەوەشە كە دەبێ لە ڕكووع و سوژدەشدا مرۆڤ هەر ڕووی لە قیبلە بێت. ئەمەش تەنها بەوە دێتە دی كە زەوی لە شێوەیەكی خڕدا بێت! قیبلەش بەپێی شەرع: ستوونێكی نوورانی‌یە لەسەر كەعبەوە بەرز دەبێتەوە تاكو عەرش و، لە ژێر كەعبەشەوە دەچێتە خوارەوە تا چەقی زەوی. جا ڕوو كردنە قیبلە لە هەموو ڕوكنەكانی نوێژدا تەنها بەوە دەبێت كە زەوی خڕ بێت و قیبلەش ستوونێكی نوورانی بێت، وەك باسمان كرد.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

پڕ بە دڵ و گیانی خۆمان پیرۆزبایی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزتان لێ دەكەین و لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە كە شەوی "قەدر"تان لە هەزار مانگ زیاتر بۆ بكات بە خێر و چاكە.. ئامین. هەروەها لێتان قبووڵ بكات و بۆتان بخاتە بریی هەشتا ساڵی تەمەن كە بە خواپەرستی بەسەرچووبێت.. ئامین.

دووهەم: پێم وایە مانەوەمان لێرە هەتا جەژن خێر و سوودێكی زۆری تێدا بێت، چونكە ئەگەر ئازاد بكرێین لە خێرەكانی ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە بێ بەش دەبین، سەرەڕای ئەوەی كە ئەو كاتە بە چەندین شتی دنیایی‌یەوە سەرقاڵ دەبین لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا كە مانگێكی سەرتاپا قیامەتی‌یە، كە ئەوەش زیان بە ژیانی مەعنەویمان دەگەیەنێت.

کەواتە: (الخير فيما اختاره الله). بە پشتیوانیی خوای گەورە گەلێ دڵخۆشیی زۆر و پاداشتی زیاترمان دەست دەکەوێت.

هەروەها - برایانم! - ئێوە لە دادگادا زانیتان کە ئەوان ناتوانن تەنانەت بە یاساکانی خۆیشیان شتێك بدۆزنەوە و بیکەن بە بیانوو لە دژمان. بۆیە دەست لە داوێنی چەند شتێکی جوزئی گیر دەکەن کە بە ئەندازەی باڵە مێشێك بەلای یاسادا ناچێت. ئەوەتا دەچن لەناو چەند نامەیەکی جوزئیدا بە دوای چەند شتێکی جوزئی و یەکجار تایبەتیدا دەگەڕێن، چونکە لەناو مەسەلە گەورەکانی پەیامەکانی نووردا شتێکیان دەست ناکەوێت کە بیکەن بەهۆی ئەوەی دەست بهێننە ڕێمان!

پاشان ئێمە لەم کارەدا بەرژەوەندییەکی ترمان هەیە، کە ئەوەیە خۆیان بە کەسی بێ بایەخی منەوە سەرقاڵ دەکەن و، لە شان و شکۆم دادەگرن، لە بریی ئەوەی بە قوتابییە زۆرەکانی نوور و ئەو پەیامانەی نوورەوە سەرقاڵ ببن کە بە فراوانی بڵاوبوونەتەوە. کەواتە قەدەری خوای گەورە ڕێی ئەوەیان پێ نادات کە دەست بهێننە ڕێی قوتابیان و پەیامەکانی نوور. بەڵکو تەنها بە کەسی منەوە سەرقاڵیان دەکات. منیش لە لایەنی خۆمەوە بۆ ئێوە و سەرجەمی دۆست و هاوڕێیانم ئەمەی خوارەوە ڕوون دەکەمەوە:

من بەوپەڕی سوپاس و شادمانییەوە و بە هەموو گیان و جەستە و تەنانەت بە دەروونی بەدخوازیشمەوە و، لە پێناوی پاراستنی سەلامەتیی پەیامەکانی نوور و سەلامەتیی ئێوەدا، بەو هەموو گیروگرفتانە ڕازیم کە دەهێنرێنە ڕێم. چونکە هەروەك بەهەشت هەرزان نییە، دۆزەخیش زیاد لە پێویست نییە.

مادەم دنیا و گرفتەکانیشی ڕێبوارێکن بە خێرایی دەڕۆن و نامێنن، ئەوا ئەو ستەمانەی کە دوژمنە پەنهانەکانمان دەیهێننە ڕێمان، ئێمە حەقی خۆمانیان لە دادگای هەرە گەورەی ئەودنیا و بەشێکیشی لەم دنیادا بە چەندین قات، بەڵکو بە سەد هێندەی ئەوە، لێ دەکەینەوە.

کەواتە ئێمە لە بریی ئەوەی ڕق و قینیان لێ هەڵبگرین، خەمیان بۆ دەخۆین.

جا مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا دەبێ پشت بە خوای گەورە ببەستین و، بێ ئەوەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ کارمان تێ بکات ملکەچی کارەکانی قەدەر و چاودێریی خوای گەورە ببین کە دەمانپارێزێت. هاودەم لەگەڵ حەزەر کردن و ئارامگرتن و

سوپاسگوزاریی خـوای گـەورەدا و، توندوتـۆڵ کردنـی پـەیوەندیی خۆشەویسـتی و هـاودەمیی پیرۆز لەگـەڵ برایانمـان لـەم ڕۆژە بەپیت و بەرەکەتانەی ئـەم مانگـە پـیرۆزەی ڕەمەزاندا و، بەسەربردنی ئەو کاتانە لە کەش و هەوایەکی برایەتیی بێگەرد و دڵدانـەوەی جوانی یەکتری و پەیوەندیی تۆکمە و توندوتۆڵ و، خۆ خـەریك کـردن بـە خوێندنـی ویردەکانەوە لەم مانگەدا کە پاداشـتەکان یـەك بۆ هـەزار بەرز دەبنەوە و، هەوڵی گوێ نەدان بەم تـەنگ پێ هـەڵچنین و گوشـارە جوزئـی و کاتییانـە و، تەنانـەت خـۆ سـەرقاڵ کردن بە وانە زانستییەکانمانەوە. خۆ ئەمەش بەش و بەختێکی گەورەیە خوا بەوکەسانەی دەبەخشێت کە خۆی ویستی لەسەری بێت.

ئنجـا دەبێ ئـەوەش بزانـین کـە وانـە تـەواو کاریگـەرەکانی نـوور لـەم تاقیکردنـەوە سەختەدا و، ناچارکردنی تەنانەت نەیارەکانیشیان بۆ خوێندنەوەیان، لـە ڕاستیدا چـەند فتووحاتێکی نوورن کە بایەخ و گرنگیی خۆیان هەیە.

(پەراوێز): ئینکاری کردنی هەندێ لە برایانمان کە یەکێك بێت لە قوتابیانی نوور، بێ ئەوەی هیچ پێویسـتێك بـەوە هـەبێت، بە تایبـەت (...) و، شـاردنەوەی خزمەتـە نووریـیە مەزنـەکانی پێشـووی بێ پێویسـت بـوون بە شتی وا، هەرچـەند کـارێکی خراپـە، بـەڵام خزمەتەکانی پێشوویان وامان لێ دەکات کە چاویان لێ بپۆشین و لێیان بێزار نەبین.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِن شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم:** ئەم شەوانەی کە دێن، هەشتا و ئەوەندە ساڵ تەمەنی پڕ لە خواپەرستی دەستی مرۆڤ دەخەن و، گریمانی بوونی "شەوی قەدر"یش لەم شەوانەدا هەیە، بەپێی ئـەوەی کـە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (تحرَّوْا ليلةَ القَدْرِ في العَشْرِ الأواخِرِ من رمضـان)[1].

(١) بڕوانە: صحيح البخاري: كتاب فضل ليلة القدر: ٣، مسلم: كتاب الصيام، باب فضل ليلة القدر برقـم ١١٦٥ - ١١٦٧. (وەرگێڕ)

کەواتــە دەبــێ هــەوڵ بدەیــن ئــەم هەلــە بەنرخــە لەکیســی خۆمــان نــەدەین، چونکــە بەختەوەری‌یەکی یەکجار گەورەیە، بە تایبەت لـەم شوێنانەدا کە پاداشتیان بۆ مرۆڤ تێدایە.

**دووهەم**: بەپێی ناوەرۆکی: (مَنْ آمَنَ بالْقَدَر أَمِنَ مِنَ الْكَـدَر) و، دەستووری دانست بەخشی: (خُذْ مِنْ كُلِّ شيءٍ أَحْسَنَه) و، ئایەتی پیرۆزی: ﴿**الَّذيــــنَ يســـتَمِعُون الْقَــوْلَ فيَتبِعُونَ أحْسَنَهُ أُولئِكَ الَّذينَ هَداهُم اللهُ وأُولئِكَ هُمْ أُولُوا الأَلْبابُ**﴾ (الزمر: ١٨). بەپێی ئەم ئایەتە مەزن و دەستوورانەی پێشوو، دەبێ:

سەیری ڕووە جوان و مژدە بەخشەکەی هەموو شتێك بکەین، تاکو دڵمان بە شتی بێ سوودی بارودۆخەکاتی و ڕێبوارەکانەوە سەرقاڵ نەکەین کە هیچ پێویستێکمان پێیان نی‌یە، تەنانەت زیانیشمان پێ دەگەیەنن و دڵتەنگی و بێزاریمان بۆ فەراهەم دەهێنن.

لە "وتەی هەشتەم"دا باسی دوو پیاو کـراوە کـە یـەکێکیان دەڕواتـە نـاو باخچەیـەك و ئەوی تریـان لـەو باخچەیە دەڕواتە دەرەوە. بەختەوەرەکەیان ئەو کەسەیە کە سـەیری گوڵـەکان و شـتانی جوانـی هاوشێوەیان دەکـات لـە باخچەکـەدا و، بـۆ خـۆی بــە دڵــی شـادەوە دەحەوێتـەوە. بەڵام ئـەوی تریــان کــە بەدبەختەکەیــە، لەبــەر ئــەوەی نـاتوانێت دەوروبەری خـۆی پـاك بکاتـەوە ئـەوا ڕوانینـی خـۆی تەنـها ئاراستەی شتە بێ کـەڵك و چەپەڵەکان دەکات و، دووچاری هێڵنجدان و دڵتێکچوون و بێزاری دەبێت و، لـە بریـی ئەوەی لە باخچەکەدا دڵی بکرێتەوە و بحەوێتەوە، کەچی بەو جۆرە بەجێی دەهێڵێت.

جـا لاپـەڕەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتیی ئێستای ئادەمیزادیش، بـە تایبـەت "قوتابخانــەی یووسفی" وەکو باخچە وایە؛ شتی ناشیرین و جوان و شـتی دڵخۆشـکەر و خەفەتبەخشـی پێکەوە لە تەنیشتی یەکەوە تێدایە. مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە بێ ئـەوەی بایـەخ بـە شـتانی بێ کەڵك و ناشیرین بدات خـۆی بـە شتە جوانەکانـەوە سـەرقاڵ دەکـات و، شـوکرانە و سوپاس بۆ پەروەردگاری دەردەبڕێت و، لـەبریی سـکاڵا و نیگـەرانی دڵخـۆش و شـادمان دەبێت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و ڕاست و دامەزراوم!

لە هەموو دڵ و گیانمەوە پیرۆزباییتان لێ دەکەم؛ چونکە بە خێرایی زامەکانی ئێمەتان سارێژ کرد. منیش لە لایەنی خۆمەوە تەواو دڵخۆش بووم و ئەمشەو لە خۆشیدا شیفام بۆ هات.

ئاشکرایە کە "قوتابخانەی زەهراء" بەهۆی نهێنیی ئیخلاسی ڕاستەقینە و فیداکاریی گەرموگوڕ و دەستبەرداربوون لە خۆپەرستی و نواندنی خۆنەویستیی تەواوەتی لە بازنەی نووردا هەردەم فراوان دەبێت و، ئەم ڕەوشتە جوانانە لەناوەندەکاندا بڵاو دەکاتەوە. کەواتە نابێ شتانی جوزئی و کاتی و، نازی نێوانتان کە لە هەست و نەستەکانەوە پەیدا دەبن، ئەو وانە بەهێز و پەیوەندی‌یە برایانە و توندوتۆڵەی لە نێوان ئێوەدایە تێك بدات. بریسکەی "ئیخلاس" باشترین ئامۆژگارە لەم بوارەدا.

لەم کاتەی ئێستادا پلانێکی ترسناك دارێژراوە بۆ لێداغان و پەرتەوازە کردنی پەیامەکانی نوور و لەق کردنی پەیوەندیی نێوان قوتابیانی، ئەوەش لە ڕێی نانەوەی دڵگرانی و بێزاری لە نێوانیاندا و دروستکردنی جیاوازی لە ڕووی جۆراوجۆریی هزر و مەشرەبەکانەوە...

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برای ئازیزم کاك ڕەئفەت!

بۆ خاتری قورئانی پیرۆز و پەیوەندیی قورئانیی نێوانتان و شەرەف و شانازیی خزمەتە مەزنەکانی ماوەی بیست ساڵتان لە ڕێبازی نووردا.. دەنگ دابڕین و ڕق هەڵگرتن لە نێوانتاندا لابەن. چونکە هەرچەندە بە ڕواڵەت شتێکی جوزئی‌یە، بەڵام کارێکی گەلێ سامناکە و، سەبارەت بە بارودۆخی وردی ئێستامان گەلێ ئازاربەخشە. ئەوەتا دەبێت بە یارمەتی‌یەکی گەورە بۆ مونافیقانی پشتی پەردە کە بۆ لەناوبردنمان تێدەکۆشن.

کەواتە برایانم! لە یەکتر بێزار مەبن، کە وەك ئەوە وایە پزیسکی ئاگر بخرێتە ناو بارووتەوە. هەوڵ بدەن کەسانی تریش وازی لێ بهێنن. چونکە هەر کارێکی پێچەوانەی ئەمە گریمانی گەورەی تێدایە لەبەر مافێکی کەسی و جوزئی کە کێشی درەمێکیش

ناهێنێت هێندەی چەندین باتمان زیان بە خۆمان و خزمەتە قورئانی و ئیمانی‌یەکانمان بگەیەنێت.

وا من بۆ دڵنیابوونتان سوێندتان بە خوای گەورە بۆ دەخۆم کە ئەگەر کەسێك لە ئێوە توندترین و ناشیرینترین سووکایەتیم پێ بکات و بە تەواوەتی ڕێز و حورمەتم بشکێنێت، بەڵام لە هەمان کاتدا واز لە خزمەتی قورئانی و ئیمانیی نوور نەهێنێت، من لێی خۆش دەبم و، واز لە مافی خۆم دەهێنم بۆی و لەگەڵیدا ڕێك دەکەوم و، تێدەکۆشم کە لێی زویر نەبم.

جا مادەم دەزانن دوژمنانمان دڵگرانی‌یەکی تەنانەت جوزئی و کەمیش لە نێوان برایاندا دەقۆزنەوە، ئەوا خێرا ڕێك بکەون و، دەست لە نازکردن بەسەر یەکتردا هەڵبگرن، کە کارێکی نابەجێ‌یە و زیانی زۆری تێدایە. دەنا زیانێکی گەورە بە خزمەتە ئیمانی‌یەکەمان دەگات.

مادەم چاودێریی خوای گەورە لە بریی ئەوانەی تیاچوون و لێمان جیابوونەوە گەلێ کەسی تری پێ بەخشیین، ئەوا بە پشتیوانیی خوای گەورە فریامان دەکەوێت و یارمەتیمان دەدات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

نیگەران مەبن! ئێمە لە ژێر لوتف و چاودێریی خوای گەورەداین. هەمیشە گرفتە ڕواڵەتی‌یەکان چەندین سۆز و میهرەبانیی زۆریان لە دووتوێدایە. خەبیرەکانیان بە زۆرەملێ ناچار کرد لە شان و شکۆی هەندێ پەیام دابگرن، بێ گومان دڵی خەبیرەکانیش بوون بە "قوتابیی نوور"!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاورێ و ئازیز و دامەزراوم!

ئەی ئەوانەی کە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی کاریان تێ ناکات و، بە گەڕانەوەیان بۆ لای دنیای فانی واز لە قیامەت ناهێنن!

خەمی ئەوە مەخۆن کە لەبەر حەزکردنیان بە فراوان کردنی کێشەکەمان، بۆ ماوەیەکی تر لێرە دەمێنینەوە.. بەڵکو ڕازی بن و شوکری خوای گەورە بکەن. من خۆم ڕازی و شوکرانەبژێرم، چونکە تەمەن وەستانی بۆ نی‌یە و هەنگاو بەرەو نەمان دەنێت و، لە ڕێی بەروبوومە قیامەتی‌یەکانیەوە لەم چەشنە خەڵوەتگایانەدا مانەوە بەدەست دەهێنێت، جگە لەوەی کە بازنەی وانەی پەیامەکانی نووریش فراوان دەبێت. بۆ نموونە زانایانی دەستەی خەبیرەکان ناچار بوون بە وردی پەیامی "سراج النور" بخوێننەوە. بیشزانن کە گریمانی ئەوە هەیە لە یەك دوو ڕووەوە ناتەواوی ڕوو بکاتە خزمەتی ئیمانیمانەوە گەر لەم کاتەدا ئازاد بکرێین.

من سەرباری ئەوەی کە زۆر لە ئێوە زیاتر لەدەست تەنگ و چەڵەمە و گوشارەکانی بەندیخانە بێزارم، کەچی حەز ناکەم بڕۆمە دەرەوە. ئێوەش هەوڵ بدەن کە - بەپێی توانا - بەئارام بن و دان بەخۆتاندا بگرن و لەسەر شێوەی ژیانی ئێرە خۆتان ڕابهێنن، هاودەم لەگەڵ نووسینەوەی پەیامەکانی نوور و لێکۆڵینەوەیان، تاکو دڵنەوایی و دڵخۆشیی تێدا بەدەست بهێنن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاورێ و ئازیزم!

**یەکەم:** ئەگەر سەفەر کردن بە ئازادی ڕێی پێ بدرایە، لەوانەیە هەندێ کەس لە ئێمە ئەمساڵ بڕۆشتایە بۆ ئەنجامدانی فەرزی حەج. لە خوای گەورە داواکارین کە ئەو نیەتەمان لێ قبووڵ بفەرموێت وەك ئەوەی کە هەر لە ڕاستیدا ڕۆشتبین بۆ حەج و، پاداشتێکی مەزنی وەك پاداشتی حەجیش بە خزمەتە ئیمانی‌یە نووری‌یەکەمان ببەخشێت لەم کاتەدا کە ئێمە بەم بارودۆخە سەخت و پڕ لە دەردیسەری‌یەوە دەتلێینەوە.

**دووهەم:** "پەیامەکانی نوور" تەفسیرێکی بەنرخ و ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن. ئەم وتەیەشمان چەندین جار دووپات کردووەتەوە. وا ئێستا ئەوەم بە دڵدا هات کە ڕاستییەك ڕوون بکەمەوە، چونکە واتا ڕاستەقینەکەی ئەو قسەیە ڕوون نییە.

تەفسیر دوو جۆرە:

*یەکەم:* تەفسیرە ئاساییەکان کە واتای دەستەواژە و ڕستە و وشەکانی قورئانی پیرۆز لێك دەدەنەوە و دەیانچەسپێنن.

*بەشی دووهەمی تەفسیر:* ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزە بە پاڵپشتی بەڵگەی ڕوون و توندوتۆڵ. جا ئەم بەشەی تەفسیر گرنگییەکی یەکجار گەورەی هەیە.

بەڵام جۆرە تەفسیرە زانراوەکەی تر هەندێ جار بە پوختی ئەم جۆرە تەفسیرەی دووهەم لەخۆ دەگرێت. کەچی (پەیامەکانی نوور) ڕاستەوخۆ ئەم بەشەی کردووە بە بناغەی خۆی. کەواتە ئەم پەیامانە تەفسیرێکی مەعنەویی ئەوتۆی قورئانی پیرۆزن کە سەرسەخت ترین فەیلەسووف دەمکوت و بێ دەنگ دەکەن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

ئایا ئێمە و پەیامەکانی نوور لە هەموو کەسێك زیانبەخشترین لەناو کۆمەڵگادا بە ڕادەیەك کە هەموو ڕۆژنامەنووسێك بە ئارەزووی خۆی شت بنووسێت و، هەموو دەستە و توێژێکیش بێ ئەوەی دەست بهێنرێتە ڕێیان کۆڕ و کۆبوونەوە ساز بکەن؟ لە کاتێکدا کە ئەگەر پەروەردەی ئایینی لە ئارادا نەمێنێت ئەوا موسڵمانان جگە لە ئیستیبدادی ڕەها و بەرتیلی بێ سنوور هیچ هۆکارێکی تریان بۆ بەڕێوەبردنی وڵات لە بەردەمدا نامێنێتەوە. چونکە هەروەك ئەگەر موسڵمانێك وازی لە ئایینەکەی هێنابێت نابێت بە جوولەکەی ڕاستەقینە یان مەسیحیی ڕاستەقینە، بەڵکو دەبێت بە مولحید و بە تەواوی ڕێ ون دەکات و سەرگەردان دەبێت، بە هەمان جۆر هەرگیز ناشبێت بە

شیووعی، بەڵکو دەبێت بە گێرەشێوێنێکی تۆقێنەر. دیارە ئەو کاتەش بە ئیستیبدادێکی ڕەها نەبێت کاروباری بەڕێوەنابرێت.

بەڵام ئێمەی قوتابیانی نوور هەوڵ دەدەین یارمەتیی بەڕێوەبردن و سەقامگیر کردنی ئاسایش و ڕێسا و بەدەستهێنانی بەختەوەری بۆ نیشتمان و نەتەوە بدەین. ئەوانەش کە لە ڕوومان ڕادەوەستن تۆقێنەر و مولحید و دوژمنی نەتەوە و نیشتمانن. کەواتە باشتر وایە تەنانەت بۆ حکوومەت ئەوە پێویست ترە کە لە بریی ئەوەی دەست بهێنێنە ڕێمان و دەستدرێژیمان بکاتە سەر، هەوڵی پاراستنمان بدات و دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکات.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

یەکەم: ئازاد کردنی هەریەك لە ڕەئفەت و ئەدهەم و بنەماڵەی چالیشقان و هاوچەشنیان لە قوتابیانی بڵاوکەرەوەی پەیامەکانی نوور بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور قەدەغە نییە و دادگاش دەست ناهێنێتە ڕێیان..

پاشان نیشانەی ئەوەیە کە دانیان بەوەدا ناوە هیچ حیزبایەتی و کۆمەڵە پێکهێنانێك لە ئارادا نییە..

ئنجا درێژکردنەوەی ماوەی کێشەکەمان و سەرنج ڕاکێشان بۆلای پەیامەکانی نوور لە بازنەیەکی فراواندا، لە ڕاستیدا وەك بانگهێشتنێکی گشتی وایە بۆ خوێندنەوەیان و، ڕاگەیاندنێکی ڕەسمییە بۆیان بە چەشنێك کە حەزی گوێ بیستی تاسەمەند دەبزوێنێت بۆ خوێندنەوەیان و، هۆکارێکیشە بۆ ئەوەی کە ئێمە و ئیماندارانیش سەد هێندەی گرفت و دەردیسەرییەکانمان سوودی مەزن و گەورەمان دەست بکەوێت و، ئاماژەیەکیشە بۆ کاریگەریی ئەم چەشنە وانە ئیمانییە خاوێنانە لە فراوانترینی بازنەکانی گۆی زەویدا و، بە پشتیوانیی خوای گەورە بە وێنەی بۆمبای ئەتۆم وایە بەرامبەر هێرشێکی گشتی و هەمەلایەنە و سەخت و دڕندانەی ئەوتۆ کە سوپاکانی گومڕایی سامناك لەم سەردەمەدا دەیکەنە سەر ئیمانداران.

**سەعیدی نوورسی**

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام: ڕەئفەت، محەممەد فەیزی، صەبری!

ئاگادارکردنەوەیەکی قەلبیم پێ گەیشتووە. بۆیە لە پێناوی پەیامەکانی نووردا و لەبەر حورمەت و بەرەکەتی ئەم جەژنە پیرۆزە و لە پێناوی برایەتیی پێشووی نێوانمان، تکایەکی پاك و بێگەردتان لێ دەکەم کە ئێوە ـ هەر سێ براکە ـ بۆ سارێژکردنی زامە قووڵە نوێکەمان تێبکۆشن. چونکە دوژمنەکانمان دوو پیلان لە دژمان پیادە دەکەن:

*یەکەمیان*: داگرتن لە شان و شکۆی من و سووکایەتی پێکردنم.

*دووهەمیان*: نانەوەی ساردوسڕی و دڵگرانی لە نێوانماندا، لە ڕێی بڵاوکردنەوەی گیانی ڕەخنە و بێزاری لە نێوان ئێوەدا، بە تایبەت لەگەڵ "خەسرەو"دا..

وا من ئەوەتان پێ ڕادەگەیەنم کە: ئەگەر "خەسرەو" هەزارو یەك هەڵەشی هەبێت، من هەر دەترسم قسەی لەبارەوە بکرێت. چونکە هەر قسەکردنێك لەسەر خەسرەو لەم کاتەدا خیانەتێکی گەورەیە، لەبەر ئەوەی قسە وتن دەگەیەنێت بە پەیامەکانی نوور و ڕاستەوخۆ بە منیش. هەروەك ئەو کارە لە بەرژەوەندیی ئەو کەسانە دەبێت کە دەمانچەوسێننەوە. بۆیە خیانەتێکی هێندە مەزنە کە زۆرپاکەمی تەقاندەوە. من لەو باوەڕەدام کە ئەو ئازاردانەی لەم دواییەدا ئەوانە دەیهێننە ڕێم ئەنجامی پچڕانی پەیوەندیی نێوانتانە، کە کارێکی نابەجێیە و زیانێکی گەورەی تێدایە. چەند پەنجەیەکی ترسناك لەم بەندیخانەیەدا، بە تایبەت لە ژووری ژمارە شەشدا خۆیان هەڵدەقورتێنن. دەسا برایانم! لەم جەژنەدا مەخەنە خەفەت و گریانەوە.. بە خێرایی لە دڵەوە ئاشت ببنەوە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

من دەمویست ئەمڕۆ دوو سێ کەس لە برایانمان ئازاد بکەن. بەڵام چاودێریی خوای گەورە ئازاد کردنی ئەوانی دواخست، لەبەر چەند سوودێك کە دەستیان دەکەوێت.

تەنانەت مانەوەمان بەم حاڵەوە هەتا نزیکی بیست ڕۆژێکی تر گەلێ پێوستە، چونکە مانەوەمان پێکەوە لەم جەژنەدا بۆ خۆمان و بۆ پەیامەکانی نوور و بۆ خزمەتەکەمان و بۆ حەوانەوەی ماددی و مەعنەویمان پێویستە، بۆ ئەوەی بەشی خۆمان وەربگرین لە دوعای حاجیان و.. تاکو ئەو پەیامانەی نوور کە ڕەوانەی "ئەنقەرە" کراون لە دەست بەسەرداگرتن ڕزگاریان ببێت و.. ژمارەی ئەو کەسانەش زیاد بکات کە لەبەر ئەوەی ئێمە ستەم لێکراوین بەزەییان پێماندا دێتەوە، ئیتر دەڕۆنە ناو ڕێبازی خزمەتی نوورەوە و.. بەڵگەیەکیش بێت لەسەر ئەوەی کە ئێمە ڕازی نابین لەو هەڵبە مەزنانەی ئێستا دەکرێن و پەنا نابەینە بەر کەسانی خیانەتکار بەرامبەر نەتەوە و نیشتمان.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

لەم ماوەیەدا کە پڕە لە وەهم و گومان و دوو دڵی و پەشێوی و نیگەرانی، باشترین شوێن بۆ ئێمە "بەندیخانە"یە. بە پشتیوانیی خوای گەورە "پەیامەکانی نوور" ڕزگاری بۆ ئێمە و ئەوانیش بەدەست دەهێنێت. چونکە مادەم ئەم پەیامانە هەتا ئەم ڕادە فراوانە و لەم بارودۆخە دژوارەی دەوروبەردا و بە شێوەیەکی بێ وێنە و لە بەردەم چەندین نەیاری یەکجار زۆردا خەڵکی بۆ خوێندنەوەی خۆیان کێش دەکەن و، قوتابیانیشی بەرەو چەندین جۆری کاری خزمەت بە ئیسلام لەناو بەندیخانەدا هان دەدەن و، بە فەزڵی چاودێریی خوای گەورە بوار نادات ئەو قوتابیانە زەلیلی بنوێنن.. ئەوا ئێمە ـ لە بەرامبەر هەموو ئەمانەوە ـ لە بریی سکاڵا، شوکرانەبژێریمان دەکەوێتە ئەستۆ و دەبێت لەمەش دڵنیا بین..

خۆڕاگریم لە بەرامبەر هەموو گرفت و تەنگانە سەختەکاندا لەم قەناعەت و دڵنیاییەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە خۆم لە کاری ویستی خوای گەورەدا هەڵناقورتێنم.

**سەعیدی نوورسی**

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و بەوەفام!

یەکێکی ئەو دوو نوسخەیە هی خۆمە و، ئەوی تریان هی بەڕێوەبەری بەندیخانەیە. هەڵەکانی نوسخەکەی تر لەسەر نوسخەکەی من ڕاست بکەنەوە کە خۆم نووسیومەتەوە.

ئەم جارەی کە "ئایەتولکەبرا"م دەخوێندەوە هەستم کرد نرخ و بەهایەکی بەرزی هەیە، بە تایبەت مەقامی دووهەم و گفتوگۆ مەعنەوی‌یەکەی کۆتایی. بۆیە سوودی تەواوم لێ وەرگرت.

جا بۆ ئەوەی سوودتان دەست بکەوێت با یەکێکتان بیخوێنێتەوە و ئەوی تر گوێی لێ بگرێت. با لەکاتی هەڵە گیریدا دوو کەس لە برایانمان بخوێننەوە و بێ ئیش دانەنیشن.

دووهەم: نابێ "وتەی دەهەم" کە تایبەتە بە خۆم و ئەو نامانەی کە لێرەن و غەیری ئەمانەش تیابچن، هەروەك ناشبێ پشتگوێ بخرێن و نەخوێنرێنەوە. سەرپەرشتی و چاودێریی ئەمانەم بە "جەیلان" سپاردووە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و هاوڕێ و دامەزراوم!

**یەکەم**: دواخستنی کێشەکەمان خێری تێدایە. چونکە خێر لەوەدایە کە خوا پەسەندی بکات و هەڵی بژێرێت. من لە دڵەوە حەزم بەم دواخستنە دەکرد و، ئازادی بەخشینیش بە پەیامەکانی نوور وای دەخواست. بە پشتیوانیی خوای گەورە بەم دواخستنە ئێوە لە دڵدانەوەی یەکتری و، بەهێزکردنی ورە و گفتوگۆی زانستی و، سازدانی پێکەوە دانیشتنی بەپێز و، نووسینەوە و خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور و، لابردنی نوختەی زەحمەت و کردنی بە "ڕەحمەت" و، گۆڕینی ئەم سەعاتە فانی‌یانەی تەمەن بە چەندین سەعاتی باقی و هەمیشەییدا، سەرکەوتوو دەبن.

**دووهەم:** پیرۆزبایی لە یەکتر کردنمان بە بۆنەی جەژنەوە لەم مەنزڵە کاتی‌یەی دادگادا بوو. بۆیە لە لایەنی خۆمەوە شیرینیی جەژنتان بۆ دەنێرم، کە ئاوی "زەمزەم"ە و پێشڕەوی شاری "قۆنیا" کە زوبەیری برامانە، هێناویەتی.. هەروەها "هەنگوین"ی گوندی "نوورس"ە کە لای من واتایەکی گەورەی هەیە. ئاو بکەنە ناو دەفری هەنگوینەکە و بە باشی ڕایبووەشێنن، ئنجا ئاوی زەمزەمەکەی بەسەردا بکەن و، بیخۆنەوە نۆشی گیانتان بێت!

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

لە سەرچاوەیەکی یەکجار گرنگەوە ئەم پرسیارەی خوارەوەیان لێ کردم، کە ناوەرۆکێکی گرنگی لەخۆ گرتووە.. لێیان پرسیم:

سەرباری ئەوەی کە ئێوە "کۆمەڵە" نین، بە شایەتیی سێ دادگا کە لەم ڕووەوە بڕیاری بێ تاوانیی ئێوەی دەرکردووە، ئنجا دوای ئەوەی کە شەش پارێزگا ئەرکی چاودێری و سیخوڕی‌یان بە سەرتانەوە بۆ ماوەی بیست ساڵ پێ سپێررابوو، لە ئاکامدا بۆیان دەرکەوت کە ئێوە هیچ پەیوەندی‌یەکتان بەو تۆمەتەوە نی‌یە و هەر لە بناغەدا هەڵبەستراوە..

وێڕای هەموو ئەمانە، کەچی ئەو پەیوەندی‌یەی قوتابیانی نوور بە یەکەوە دەبەستێت هێندە توندوتۆڵە کە لە هیچ دەستە و کۆمەڵەیەکدا هاوشێوەی نی‌یە..

خۆزگا تیشکی ڕوونکردنەوەتان دەخستە سەر ئەم بابەتە و ئەم کێشەیەتان شی دەکردەوە؟

منیش وەڵامم دانەوە و وتم:

بەڵێ، قوتابیانی نوور نە "کۆمەڵە"ن و نە هیچ شتێکی تر لەو شێوەیەدا و، هەرگیز ناشبن. بە تایبەت کە ئەوان لەوە بەرزتر بیر دەکەنەوە پەیوەندی بەو جۆرە کۆمەڵانەوە بکەن، لەبەر ئامانجە کەسی و کۆمەڵایەتی‌یەکان پێکدێن و مەبەستیشیان بەدەستهێنانی چەند بەرژەوەندی‌یەکی سیاسی یاخود دنیایی‌یە، ئیتر چ ئیجابی بێت و چ سەلبی..

بەڵام ڕۆڵـە و نەوەکانی پاڵـەوانانی پێشـووی ئەم نیشتمانە، کە ئەو گیانفیدایانــەی ئیسـلام بـوون بەوپـەڕی خۆشـحاڵی و ڕازی بوونـەوە ملیۆنـەها گیانیـان لـە پێنـاوی بەدەستهێنانی پلـەی شـەهیدیدا بـەخت کـرد، بێگومـان ئەمانـە بەشـێکیان لـەو گیـانی خۆبەختکاری‌یەی باپیرانیـان بە میرات بـۆ ماوەتـەوە، بـەو ڕادەیـەی کـە ئـەو پەیوەندی‌یە توندوتۆڵ و نائاسایی‌یەیان دەربڕی هانی ئەم برا کۆڵـەوارەیان بـدات لـە بەردەم دادگـای "دەنیزلی"دا بڵێت:

"ئەو ڕاستی‌یەی کە ملیۆنەها قارەمـان سەری خۆیـان لـەپێناودا دانـا، ئێمـەش سـەری خۆمانی لەپێناودا بەخت دەکەین"..

ئەم ڕستەیەشی بەناوی هەموویانەوە وت و، دادگای بێ دەنگ کرد و خستنیە دۆخی سەرسامی و ڕێزگرتن و حەپەسانەوە!

بەو واتایەی کە چەندین گیانفیدای ڕاستەقینە و خاوێن و دڵسۆز بۆ خوای گـەورە لـە نێوان قوتابیانی نووردا هەیە کە تەنـها ڕەزامـەندیی خـوای گـەورە و بەدەستهێنانی ژیـانی دوارۆژیان مەبەستە. بۆیـە ماسۆنی‌یەکان و شیووعی‌یەکان و گومڕایـان و خراپکـاران و "تاشناق"[1] و ڕێکخراوە ترسناکەکانی تری هاوشێوەیان هیـچ ڕێگایـەکیان نەدۆزی‌یـەوە کە بەهۆیەوە بەسەر ئەو قوتابیانەی نووردا سەربکەون. ئیتر لـە ناچاریدا و لـە ڕێـی چەند یاسـایەکی پلاسـتیکی‌یەوە و بـە نیـازی شـکاندنی شـان و شـکۆی ئـەو قوتابیانـە، حکوومەت و فەرمانگەکانی دادیان لەخشتە برد.

بەڵام ئەوانـە سـەریان لـە بـەرد داوە و هـەموو هەوڵێکیشیان پووچـەڵ دەبێتـەوە و، بـە پشتیوانیی خـوای گـەورە هیـچ زیـانێك بـە قوتابیـانی نـوور ناگەیـەنن. بـەڵکو کارەکـەیان دەبێت بەهۆی زیادبوونی ژمارەی پاڵەوانە گیانفیداکانی نوور و ئیمان.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(١) ڕێکخراوێکی خۆبەختکار بووە، بە ئامانجی دروستکردنی دەوڵـەتێکی ئەرمەنی لەسـەر خـاکی دەوڵـەتی عوسمـانی – بەشـە کـورد نشینەکەی – دامـەزراوە. یـەکێك لـە بـەناوبانگترین کەسـانی ئـەو ڕێکخراوە: "ئەنترانیك"ە. (وەرگێڕ)

باسمه سبحانه

برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

وا گفتوگۆیەکتان بۆ دەگێڕمەوە کە وەك ئەوەی دوێنێ وایە و چل ساڵ پێش ئێستا ڕووی داوە:

پەیوەندیی قوتابیانی "سەعیدی کۆن" بە مامۆستاکەیانەوە هێندە توندوتۆڵ بوو کە گەیشتبووە پلەی خۆ بەخت کردن و قوربانیدان. بۆیە "سەعیدی کۆن" دەیتوانی ڕووبەڕووی ئەو چالاکی‌یە زۆرانە ببێتەوە کە چەکدارەکانی ئەرمەن و گیانفیدایانی تاشناق دەیانکردە سەر دەوروبەری (وان) و (بەدلیس). تەنانەت هەندێ جار تا ڕادەیەکیش لە سنووری خۆیاندا ڕایان دەگرتن. خۆکاتێ کە تفەنگی (ماوزەر)ی بۆ قوتابیانی پەیدا کرد، قوتابخانەکەی شێوەی سەربازگەی لەخۆ گرت، چونکە کتێب و تفەنگەکان لەو قوتابخانەیەدا شان بە شانی یەکتر بوون. هەر لەو دەمەدا سەرکردەیەکی سەربازی بە پلەی (فەریق) هات و ئەو دیمەنەی بینی، وتی: "ئەمە قوتابخانە نی‌یە.. سەربازگەیە"! ئنجا لە ترسی دووبارە بوونەوەی ڕووداوەکەی (بەدلیس) فەرمانی دا کە: "تفەنگەکان کۆ بکەنەوە". بەم جۆرە، پازدە تفەنگیان لە ئێمە گرت.

دوای نزیکەی دوو مانگ، یەکەم جەنگی جیهانی هەڵگیرسا و، منیش تفەنگەکانی خۆمم لێ سەندنەوە.. بە هەر حاڵ.

جا بە بۆنەی ئەو چەشنە بارودۆخ و هەلومەرجەوە، لێیان پرسیم:

چەکدارەکانی ئەرمەن کە خۆبەختکاری ترسناکیان تێدایە، لێتان دەترسن، تەنانەت لەو کاتەشدا کە لە خەڵکی دوور کەوتنەوە و لەسەر چیای "ئەرەك"ی "وان" دەستان دایە گۆشەگیری، ئەو چەکدارانە هەر خۆیان لە ئێوە دەپاراست و لێتان دوور کەوتنەوە. ئایا ئێوە چ هێزێکتان هەیە کە ئەوانی وا لێ کردووە؟

منیش وەڵامم دەدانەوە کە:

گیانفیدایانی ئەرمەن لە پێناوی بەدەستهێنانی ژیانێکی فانیی دنیایی و هێنانەدیی بەرژەوەندی‌یەکی کاتیی نەتەوەیەکی بچووك و پارێزگاری لێ کردنیدا ئەم چەشنە قارەمانێتی‌یە ناوازەیە دەنوێنن..

بەڵام ئێمە کە ڕووبەڕووی ئەوانە دەبینەوە ئەوا قوتابیانمان لەپێناوی بەدەستهێنانی ژیانێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی و هێنانەدیی چەندین بەرژەوەندیدا بۆنەتەوەی بەرز و مەزنی ئیسلام تێدەکۆشن و، دڵنیان کە ئەجەل یەکێکە و گۆڕانی بەسەردا نایەت.

جا بێ گومان ئەم قوتابیانە هەرگیز لەو گیانفیدا ئەرمەنانە دواناکەون، تەنانەت گەر پێویست بکات ئامادەن کە بە بێ هیچ دوودڵی‌یەك و بەوپەڕی شانازی‌یەوە ژیان و ئەجەلی خۆیان و تەمەنێکی چەند ساڵەی ڕواڵەتیی دنیا بەخت بکەن لە پێناوی بەدەستهێنانی ملوێنەها ساڵی ژیانێکی نەمر و، لەبەر پارێزگاری کردنی سەلامەتیی ملیارەها موسڵمانی خواناس.

* * *

برا ئازیز و بەشەفەقەت و وەفادارەکانم!

وا دوو ڕۆژە هەڵامەت گەلێ کاری کردووەتە سەر دەمارەکانم و سەرم. لەم چەشنە حاڵەتانەشدا وا هەست دەکەم کە پێویستم بە هاودەمی و دڵنەوایی برادەران هەیە. بەڵام لەم حاڵەی ئێستامدا بێزاریی تەنیایی و دابڕکردنم لە هەموو شتێك، بە چەشنێکی سەیر، بە جارێ دڵی تەنگ کردووم کە سکاڵایەکم بەم شێوەیە بە دڵدا هات:

ئەم ئازاردانە لە پێناوی چی؟ چ سوودێکی تێدایە بۆ ئەو خزمەتەی کە لە پێناوی ئیمان و قورئاندا ئەنجامی دەدەین؟

کتوپڕ ئەم سەرلەبەیانی‌یە ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

گەلێ پێویست بوو ئێوە بڕۆنە ناو ئەم تاقیکردنەوە سەختەوە و چەندین جار لە سەنگی مەحەك بدرێن، تاکو زێڕ بناسرێت و لە مس جیا بکرێتەوە.. پێویست بوو لە هەموو لایەن و ڕوویەکەوە بە چەندین تاقیکردنەوەی ستەمکارانەدا تێپەڕ ببن، بۆ ئەوەی بزانن کە تا چ ڕادەیەك دەروونی بەدخوازتان بەش و فڕوفێڵی خۆی ماوە.. پاشان پێویست بوو لە سێ پاڵێوگەدا پاڵفتە بکرێن..

هەموو ئەمانە چەند کارێکی پێویست بوون لە پێناوی خزمەتگوزاری‌یەکەتاندا، کە خزمەتێکی بێگەرد و خاوێنە و تەنها لەبەر حەق و ڕاستی ئەنجامی دەدەن.

لەبەر ئەوە، قەدەری خوای گەورە و چاودێریی پەروەردگار بواریان دا ئەو پاڵفتەکاری‌یە بهێنرێتە ڕێتان. چونکە ڕاگەیاندنی ئەم خزمەتە بەرزە لەم کۆڕی تاقیکردنەوەیەدا و بەرامبەر بە چەندین نەیاری سەرسەخت و ستەمکاری وا کە لاوازترین بیانوو دەدۆزنەوە، کارێکی کرد خەڵکی تێبگەن کە ئەم خزمەتگوزاری‌یەی قورئان ڕاستەوخۆ لە سەرچاوەی حەق و ڕاستی‌یەوە هەڵقوڵاوە و، هیچ فڕوفێڵ و خۆویستی و لەخۆبایی بوون و هیچ بەرژەوەندی‌یەکی کەسی و سوودێکی دنیایی، تەنانەت قیامەتیش، تێکەڵی نی‌یە. چونکە ئەگەر ئەم تاقیکردنەوەیە نەبوایە، عەوامی ئیمانداران متمانەیان بەم خزمەتە نەدەکرد و، زمانی حاڵیان دەیوت:

"لەوانەیە بەم قسانەیان بمانخەڵەتێنن".

تایبەتمەندانیشیان دەیانوت:

"ئەمانە بۆیە وا دەکەن تاکو چەند پلەوپایەیەکی دیاری کراو و ڕازی بوونی خەڵکی‌یان دەست بکەوێت، وەك ئەوەی کە هەندێ لە خاوەن پلەوپایە مەعنەوی‌یەکان دەیکەن".

دیارە ئەو کاتەش ئەوان متمانەیان بە خزمەتگوزاری‌یەکەمان نەدەما.

بەڵام دوای تاقیکردنەوە، سەرسەخت ترین و بەدگومان ترین کەسیش ناچار بوو مل بۆ ئەو ڕاستی‌یە کەچ بکات.

کەواتە ئەگەر یەك تەنگانە و دەردیسەریتان تووش بووبێت، ئەوا – پشت بە خوا – هەزار قازانجتان لەو تاقیکردنەوەیەدا دەست کەوتووە.

* * *

باسمه سبحانه

برا ئازیز و ڕاستەکانم!

ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەو ڕووداوە لە ڕۆژنامەکاندا کە لە دەمی دیلیم لە ڕووسیا ڕووی دا[1] ڕووتێکردنی خەڵکیی سەبارەت بە من زیاتر کردووە، هەرچەندەش

(١) مەبەست هەڵهەسانەوەی مامۆستا نوورسی‌یە لە بەر سەرکردە ڕووسەکە. (وەرگێڕ)

زۆر بە توندی ڕێیان لەو ڕووتێکردنەی خەڵکی لە من گرتووە و هەوڵیان داوە خەڵکیم لێ دوور بخەنەوە. تەنانەت سەرۆکی پاسەوانەکان وتی: دوێنێ سێ کەسی ڕەسمی لە حەوشەی بەندیخانەکەدا، کە لەوانەن پشتگیریی سووکایەتی پێکردنی ئێمە دەکەن، بە تایبەتی بە من، وتیان: هەر ئەوەندەی "سەعید" لە پەنجەرەکەوە دەردەکەوێت خەڵکی لە دەوری پەنجەرەکە کۆدەبنەوە و سەیری دەکەن. کەواتە نابێ لە بەردەم پەنجەرەکەدا ڕابووەستێ، دەنا دەیگوێزینەوە بۆ ژوورێکی تر!

برایانم! خەم مەخۆن و گوێ بەم ڕووداوانە مەدەن! چونکە من لە لایەنی خۆمەوە بڕیارم داوە هەموو گوشار و ئازارێکی ئەوان، هەرچەندە و چۆن بێت، قبووڵ بکەم و گوێی پێ نەدەم. پشت بە خوا هەموو ئەم دەردیسەری و تەنگانە و ناخۆشییانە دەگۆڕێن بە شادی و خۆشی، بە بەرەکەتی دوعا و نزاکانی ئێوە.

ئەسڵی ئەو ڕووداوە ڕاستە، ڕووی داوە.. بەڵام من تا ئێستا بۆیە بە درێژی ڕوونم نەکردووەتەوە و باسم نەکردووە چونکە هیچ شایەتێکم نەبوو کە لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەدا پشتم بگرێت، بەڵام من نەمدەزانی کە مەفرەزەیەکی سەرباز هاتوون من بەن بۆ ئەوەی لە سێدارەم بدەن، دوایی بەوەم زانی. هەروەها لە وتەی ئەو سەرکردە ڕووسەش تێنەگەیشتم کە قسەیەکی وت بۆ ڕازی کردنی من. وا دیارە ئەو نەقیبە موسڵمانەی کە ئامادەی ڕووداوەکە بووە و دوایی ئەم هەواڵەی بە ڕۆژنامەکە گەیاندووە ئاگاداری ئەو گوفتارە بووە، کەواتە تێگەیشتووە ئەو سەرکردە ڕووسە چەند جارێك وتویەتی: (داوای لێبوردن دەکەم).

برایانم! من هەر کات بە پەیامەکانی نوورەوە سەرقاڵ دەبم تەنگوچەڵەمە و نارەحەتییەکان کەم دەبنەوە و سووك دەبن، بەو واتایەی کار و پیشە و فرمانی ئێمە سەرقاڵ بوونە بە پەیامەکانی نوورەوە و، بایەخ نەدانە بە کاروبارە سەرپێیی و کاتییەکان، هاودەم لەگەڵ ئارامگرتن و شوکرانەبژێریی خوای گەورەدا.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## ڕەوشت و خوویەكی بەدیعوززەمان
## كە ژێرییەكان سەرسام دەكات

**(ئەم وتارە لە گۆڤاری "أهل السـنة"دا لە ئەستەمبوڵ و لە بەرواری (١٥)ی تشرینی یەكەمی ١٩٤٨ز بە پێنووسی خاوەنە پارێزەرەكەی بڵاوكراوەتەوە):**

كاتێك كە لە بەدلیس لە جەنگی یەكەمی جیهانیدا بریندار بووم و دیل كرام، لە هەمان ڕۆژدا بەدیعوززەمانیش بە دیل گیرا و، ناردیان بۆ گەورەترین سەربازگەی دیلەكان لە سیبیریا. منیش ڕەوانەی دوورگەی "نانكۆن"ی سەر بە "باكۆ" كرام.

ڕۆژێك كە "نیقۆلا نیقۆلا فیج" بە مەبەستی پشكنین سەردانی سەربازگەی ناوبراو دەكات، هەموو دیلەكان – بە مەبەستی ڕێز لێنان – لەبەری هەڵدەسنەوە. كاتێكیش بە بەردەم بەدیعوززەماندا تێدەپەڕێت ئەو لە شوێنی خۆی ناجووڵێت و بایەخی پێ نادات! ئەمەش سەرنجی سەركردە گشتییەكە ڕادەكێشێت! بۆیە بە بیانوویەك دەگەڕێتە دواوە و جارێكی تر بە بەردەم بەدیعوززەماندا دەڕواتەوە، ئەویش بە هەمان شێوەی جاری پێشوو بایەخی پێ ناداتەوە! لە جاری سێهەمدا كە بە هەمان شێوە بایەخی پێ نادات، لە بەردەم بەدیعوززەماندا ڕادەوەستێ و بە هۆی وەرگێڕێكەوە ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوانیاندا ڕوو دەدات:

دەڵێت:

ئایا نەیناسیم؟

لە وەڵامدا دەڵێت:

بەڵێ ناسیومە.. ئەوە "نیقۆلا نیقۆلا فیج"ە، كە خاڵی قەیسەر و سەركردەی گشتیی بەرەی قەفقاسە!

ئەویش دەپرسێت:

كەواتە بۆچی بە نیازی سووكایەتی پێ كردن لەبەرم هەڵنەسا؟

وەڵامی دایەوە:

نەخێر.. من سووکایەتیم پێ نەکردووە. بەڵکو کارێکم ئەنجام داوە کە بیروباوەڕەکەم فەرمانی پێ داوم.

وتی:

بیروباوەڕەکەت چ فەرمانێکت پێ دەدات؟

وەڵامی دایەوە:

من زانایەکی موسڵمانم و لەناو دڵمدا ئیمانم هەڵگرتووە. جا ئەو کەسەی ئیمانی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتبێت باشترە لە کەسێك کە ئیمانی لە دڵیدا هەڵنەگرتبێت. خۆ ئەگەر وەك ڕێز لێنانێك لەبەری هەڵبسامایەتەوە ئەو کاتە ڕێزی کەمم بەرامبەر بە بیروباوەڕەکەم دەنواند. جا بۆ ئەوەی شتی وا ڕوو نەدات، لەبەری هەڵنەسام.

ئەویش وتی:

کەواتە بەوەی سیفەتی بێ ئیمانیی داوەتە پاڵ من، ئەوا سووکایەتیی بە من و بە سوپاکەم و نەتەوەکەم و بە قەیسەر کردووە. کەواتە هەر ئێستا دەبێ دادگایەکی سەربازی بۆ لێپرسینەوە لەم کەسە پێك بهێنرێت.

لەسەر ئەم بڕیارە و بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە، دادگایەکی سەربازی پێکهێنرا..

ئەفسەرە دیلە تورك و ئەڵمان و نەمسایی‌یەکان بە جەخت لێ کردنەوە داوایان لە بەدیعوززەمان کرد کە داوای لێبووردن لەو سەرکردە ڕووسە بکات و پێی بڵێت کە لێی خۆش ببێت!

بەڵام بەدیعوززەمان بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی دانەوە:

(من پڕ بە دڵ حەز لە سەفەر دەکەم بۆ ئەودنیا و ئامادە بوون لە بەردەم پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ. ئەوەندە هەیە من پێویستم بە پاسپۆرتی سەفەرە بۆ ئەودنیا. هەروەها ناتوانم کارێك بکەم کە پێچەوانەی ئیمانەکەم بێت).

لە ئاستی ئەم گوفتارەدا هەموو ئەفسەرەکانی هاوڕێی بێ دەنگی دایگرتن و، چاوەڕێی ئەنجامی دادگایی‌یەکەیان دەکرد..

دادگاکەش کارەکانی بەدەر کردنی بڕیاری لە سێدارە دانی بەدیعوززەمان کۆتایی پێ هێنا، بەپێی ماددەی یاسایی سووکایەتی کردن بە قەیسەر و سوپای ڕووس!

پاشان مەفرەزەیەك بە سەرۆکایەتیی ئەفسەرێکی ڕووس دێـن بـۆ بردنـی بـەدیعوززەمان بەرەو گۆڕەپانی لە سێدارەدان. بەدیعوززەمانیش بە ڕوویەکی گەش و خەندانەوە داوا لـە ئەفسەرە ڕووسەکە دەکات کە:

(تەنها پازدە خولەکم بدەنێ بۆ ئەوەی دوا ئـەرك و واجبـی سەرشـانی خـۆم جێبەجێ بکەم).

ئیتر هەڵدەستێ و دەستنوێژ دەگرێت و دەیەوێ پێش لە سێدارەدانی نوێژ بکات.

لەو کاتەدا "نیقۆلا نیقۆلا فیج" ئامادە دەبێت و پێی دەڵێت:

داوای لێبوردنت لـێ دەکەم! پێشتر پێم وابوو کە ئەو کارەی بەرامبەر من نواندت بـە نیازی سووکایەتی پێکردنی من بێت، بۆیە ئەو ڕەوشە یاساییانەم بەرامبـەرتان ئـەنجام دا. بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە ئەم هەڵوێستەتان لە ئیمانەکانتانەوە سەرچاوە دەگرێت و کارێك جێبەجێ دەکەن کە بیروباوەڕەکەتان فەرمانتان پێ دەدات. لەبەر ئەوە، فەرمانی دادگـام سەبارەت بە ئێوە هەڵوەشاندەوە و، ئێوە لەبەر تـەقوا و ئاییندارێتـان شـایانی هـەموو ڕێـز و سەرسووڕمانێکن. داوای لێبـوردن دەکـەم کە بێزارم کـردن و، چـەند جـارێکی تریـش دووپاتی دەکەمەوە کە: داوای لێبوردن دەکەم.

* * *

ئـەم عیززەتـە ئایینی و خووڕەوشتە بەرزەی کـە پێشـەنگێکی جـوان و نەخشـینە بـۆ موسـڵمانان، یـەکێك لـە هـاوڕێ ئەفسـەرەکانی لـە سـەربازگەی دیلـەکان کـە لـە پلـەی نەقیبدا بووە و بە چاوی خۆی شایەتی ڕووداوەکە بووە، گێڕاویەتەوە.

منیش کە هەر ئەمەم بیست، چاوەکانم - بە بێ هیچ دەسەڵاتێکی خۆم - پڕ بـوون لـە فرمێسك[1].

عەبدوڕڕەحیم زابسوو

* * *

(١) هـەر چـەند مامۆستامان خۆی فەرمانی پێ نەداوین کـە ئەم برگەیـەی لـە ڕۆژنامـەدا نووسـراوە بـڵاوی بکەینەوە، بـەڵام خرایـە ئـەم شوێنە، لەبەر ئەوەی گەلـێ پەندی بەنرخی تێدایە و هەست و نەسـتی خوێنـەر دەورووژێنێت و مایەی بایەخ پێدانە. (خەسرەو)

برایانم! لەبەر ئەوەی حەزی خواردنم نەماوە و دڵم نایبات و، لەبەر زیان پێ گەیشتنیشم لە وەرگرتنی دیاری، وا بەشە خواردنەکەی خۆمم نارد بۆ لای ئێوە، کە سێ پارچە ڕۆن و سەبەتەیەك ترێ و کیسێك سێوە لەگەڵ دوو قوتوو شەکر و چادا. نیازیشم وا بوو کە هەندێکی بە دیاری بۆ ئێوە بنێرم، بەڵام دوایی زانیم ئێوەش لەو خواردنەتان لە لایە. بۆیە وەریشم گرت تاکو قوتابخانەی زەهراء لێم زویر نەبێت و نەڵێت: لە دیارییەکەی منی نەخوارد!

جا ئەو کەرەسانە بە نرخێکی هەرزان بفرۆشن بەوانەی کە موحتاج و شیاویانن، چونکە بە پارەکەی هێلکە و شیر و نان دەکڕم، تاکو ببێت بە دیارییەکی ڕاستەقینە و، شیفای تێدا بێت بۆ من و کڕیاران و قوتابخانەی زەهراء و لقەکانی. با "خەسرەو" سەرپەرشتیکاری فرۆشتنەکە بێت و، "جەیلان" و "حیفظی"ش بیفرۆشن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم**: بە بۆنەی ئەوەی کە لە ڕۆژنامەدا سەبارەت بە ڕووداوی دیلیم بڵاو کرایەوە، ئێستا ئەمەی خوارەوەم بەدڵدا هێنرا:

سەرکردەیەکی سەرسەختی ڕووس بەرامبەر بەو عیززەتی ئیمانەی لە ڕوویدا نواندم، وازی لە تووڕەیی و توندوتیژیی خۆی هێنا و، داوای لێبوردنی لێ کردم..

کەچی ئەو کارمەندە ڕەسمییانەی بە چاوی خۆیان توندوتۆڵیی ئیمان لە توێی وانە بەهێزە بێگەردەکانی پەیامەکانی نووردا دەبینن، کە سەد هێندەی ئەو توندوتۆڵییە زیاترە "کەس"ی من لە دیلیدا نواندی.. دەڵێم: ئەو کارمەندە ڕەسمییانە ئەگەر دڵیان نەرم نەبێت و لە سەرسەختی و عینادیاندا هەر سوور بن، ئەوا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچ شتێکی تر پاکیان ناکاتەوە! چونکە ئەم تەمەنە کورت و سنووردارە جێگەی تۆڵە لێ سەندنەوەی ئەو تاوانە مەزنەی تێدا نابێتەوە. ئەوەتا "ڕۆن" ئەگەر تێك بچێت ناتوانرێت بخورێت، بە پێچەوانەی "شیر" و "ماست"ەوە.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە پەیامەکانی نوور زۆر کەسی لەوانە ڕزگار کردبێت، پێش ئەوەی بە تەواوەتی تێك بچن و لە ڕێ بترازێن.

**سەعیدی نوورسی**

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم:** ئەوەم بە دڵدا هات کە مامەڵەیەك ڕوون بکەمەوە مایەی سەرسامی‌یە و گەلێ پەندی تێدایە و، لە هەردوو جاری دیلیم (لە ڕووسیا و لێرەدا) ڕووی داوە:

لە گەڵ نەوەد ئەفسەر لە کۆسترمای ڕووسیا لە هۆڵێکی گەورەدا دیل بووین و، جار بە جارێك من دەرسم پێ دەوتن. ڕۆژێکیان سەرکردە ڕووسەکە هات و هەڵوێستەکەی بینی، وتی: ئەم کابرا کوردەی کە سەرکردەی خۆبەخشەران بووە و زۆر کەسی لە سەربازەکانمان سەربڕیوە، ئێستا هاتووە لێرەدا وانەی سیاسی دەڵێتەوە؟! هەرگیز شتی وا نابێ ڕوو بدات. ئیتر بە توندی ڕێی ئەو کارەی لێ دەگرم..

بەڵام هەر هەمان سەرکردەی ڕووس دوای دوو ڕۆژ هاتەوە و وتی: وا دیارە وانەکانتان سیاسی نین، بەڵکو وانەی ئایینی و ڕەوشتین. کەواتە فەرموو لەسەر وتنەوەی وانەکانت بەردەوام بە. بەم جۆرە بواری دەرس وتنەوەی داین!

کەچی لە دیل بوونی دووهەمدا:

فەرمانگەی داد نەیهێشت یەکێك لە برا تایبەتەکانم، کە ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق گوێی لە دەرسەکانم گرتووە و لە من باشتر دەتوانێت دەرس بڵێتەوە، سەردانم بکات و بێت بۆ لام. هەروەك ڕێی نەدا کەسێك بێت لە کاروباری تایبەتی و پێویستیی خۆمدا یارمەتیم بدات، نەوەکو وانەم لێ وەربگرێت!

لە کاتێکدا ئەمە دەکەن کە پەیامەکانی نوور هیچ پێویستی‌یەکیان بۆ دەرس وەرگرتن لە غەیری خۆیان نەهێشتووەتەوە. جگە لەوەی کە ئێمە پەیامەکانی نوور نەبێت هیچ وانەیەکی ترمان نی‌یە کە بە خەڵکیی بڵێینەوە و، هیچ نهێنی‌یەکی شاراوەشمان نی‌یە.

بە هەر حاڵ، شتێك هاتە پێش کە ڕێی باسکردنی ئەم مەسەلە دوور و درێژەی لێ گرتین.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمە سبحانە

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

دوو سێ جارە بارودۆخێکی ڕۆحی دێتە ڕێم کە زۆر لەو بارە ڕۆحی‌یە دەچێت سێ ساڵ پێش ئێستا هانی دام لە گردی یوشەعی ئەستەمبووڵ بە گۆشەگیری بژیم و لە ژیانی کۆمەڵایەتیی پڕ لە زرق و برقی "دار الحكمة الإسلامية" خۆم بکێشمەوە و، تەنانەت بوار بە مانەوەی خوا لێخۆشبوو "عەبدوڕڕەحمان"یش نەدەم کە بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاروباری پێویست لەگەڵمدا بمێنێتەوە، لە کاتێکدا کە یەکەم قوتابیی پەیامەکانی نوور و پاڵەوانی پێشڕەویەتی.

ئەو حاڵەتە ئاڵوگۆڕێکی ڕۆحی بوو کە ماهییەتی سەعیدی نوێی دەرخست.

ئێستاش ئاماژە و نیشانەکانی شتێکی وەك ئەو حاڵەتە سەری هەڵداوە و، پێم وایە ئاماژە بێت بۆ سەر هەڵدانی "سەعیدی سێ‌هەم" کە بە تەواوی دەست لە دنیا هەڵدەگرێت.

بەو واتایەی کە پەیامەکانی نوور و قوتابی‌یە بە غیرەتەکانی لە بری من ئەرکەکانی سەرشانم ئەنجام دەدەن، کەواتە هیچ پێویستی‌یەك بە مانەوەی من نەماوە. دیارە هەریەك لە بەشە گشتی‌یەکانی پەیامەکانی نوور و هەرکام لە قوتابی‌یە دامەزراوەکانی ئەم پەیامانە، زۆر لە من باشتر و تەواوتر، وانەکان دەڵێنەوە و ڕێنمایی‌یەکان ئەنجام دەدەن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمە سبحانە

**یەکەم:** پێم وایە، لەسەر بناغەی چەند نیشانەیەك، پەیامی (ڕابەری لاوان) لە نێوان کۆمەڵەکانی تری پەیامەکانی نووردا گرنگی‌یەکی زۆرتری پێ دەدرێت. لەو باوەڕەدام کە باسی (سەرنجێکی یەکتاناسی لە وشەی (هُوَ)دا) کە لەو پەیامەدایە، بە تەواوی پشتی دوژمنە زەندیقەکانی شکاندووە و بتی "سروشت"یشی لەتوپەت کردووە کە ئەوان پاڵی پێوە دەدەن. ئیتر هیچ شتێك نەما حەقیقەتی ئەو بتە بشارێتەوە کە جاران - تا ڕادەیەك - گڵی چرووپر دەیشاردەوە. بەڵام دوای بڵاوبوونەوەی ئەو سەرنجە تەوحیدی‌یە ناوبراوە

ناتوانرێت تەنانەت لەناو هەوای ڕوون و نیانیشـدا بشـارڕێتەوە. واتـە: نـاتوانێـت لـە هیـچ شـوێنێکدا خـۆی بشـارێتەوە، هـەتا بتوانـن دام و دەزگـای (داد) بـە کوفـری عینـادی و سـەرپێچیی مورتەددانـە لەخشـتە بەرن. بە پشتیوانیی خـوای گـەورە پەیامـەکانی نـوور سەرنجی دام و دەزگای داد بەلای بەرژەوەندیی خۆیاندا ڕادەکێشن و، ئـەم هێرشـەی ئـەم جارەشیان شکست پێ دەهێنن و بێ ئاکامی دەکەن.

**دووهەم:** ئەوەی کە لەم ماوەیەدا بلاوکرایەوە، چ لە گۆڤاری (أهل الســـنة) و چ لـە ڕۆژنامە ناوخۆیی‌یەکەی ئێرەدا، هەروەها ئەو دیدارە ڕۆژنامەوانی‌یەش کـە "زوبـەیر" زۆر بە گەرموگوڕی ئەنجامی دا، وەك ئاگاداری و ڕاگەیاندنێکی باش وابوو بۆ خەریك بوون بە پەیامەکانی نوورەوە. ئێوە - لـە بریـی مـن - ئەو بابەتانـە بخوێننـەوە کـە پـەیوەندی‌یان بـە ئێمەوە هەیە و من پێم خۆشە، پاشان ئاگادارم بکەنەوە لێیان.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

براياني ئازيز و هاوڕێم: محەممەد و، مستەفا و، ئیبراهیم و، جەیلان!

**یەکـەم:** دوێنـێ هـەر چوارتـانم لـە دانیشـتنێکی بێگـەردی برایانـەدا بینـی. گەلـێ پێخۆشـحاڵ بـووم و سوپاسـی خـوای گـەورەم لەسـەر ئـەوە پێشـکەش کـرد و، بـە دڵخۆشی‌یەکی هێندە زۆرەوە بۆم دەڕوانین وەك ئـەوەی منیش هاوبەشـی دانیشـتنەکەتان بم. بەڵام کتوپڕ کەسانێکم بینی کە لە هەردوولاتانەوە ماوەی نیو سـەعاتێك بـە دزی‌یـەوە گوێیان لە قسەکانتان ڕادەگرت! یەکسەر کەوتمە نیگەرانی‌یەوە و لە دڵی خۆمـەوە وتم: لەوانەیـە جاسووسێك لـە نێوانیـاندا هـەبێت و واتـای گوفتارەکانیـان بگۆڕێـت و شـتی هێندەی دەنکە گەنمێك بە قـەدەر گومـەزێك گـەورە بکـات، چونکە زۆر بـە گرنگی‌یـەوە گوێیان ڕاگرتبوو، برایانی قسەکەریش لەبەر بایەخ نەدانیان بە حـەزەر و لـەتاو خۆشـیی هاودەمی و دانیشتنەکەیان ئاوڕیان لەوانە نەدەدایەوە. بۆیە نامەم سەبارەت بەوە بۆ ناردن.

سوپاس بۆ خوا دوایی زانیـم کـە قسـەکان زیـانی تێـدا نـەبووە. لەگـەڵ ئەوەشـدا، لـەم قۆناغە دژوارەدا حەزەر کردن کارێکی پێویستە.

**دووهەم:** لە پەیامی (پاشبەندەکان)ەوە - کە لە سەرووی سنووری خۆمەوە بە سەد قات گومان باشیی لەرادەبەدەری بەرامبەر بە من تێدایە - زانیم کە هاوشێوەی خوا لێخۆشبوو "حەسەن فەیزی" پەیدا دەبێتەوە، کە پێشەنگی قوتابیانی نووری "دەنیزلی" بوو. بە پشتیوانیی خوای گەورە لە "ئافیوون"یشدا گەلێ کەسی وەك "حەسەن فەیزی" دێنە مەیدانەوە و، "ئافیوون" هیچی لە "دەنیزلی" کەمتر نابێت. ئەو کاتەش گیروگرفتەکانمان دەبن بە دڵخۆشی و میهرەبانی.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانم!

من گوێم بە ڕۆژنامەکان نەدەدا، بەڵام بڵاوکردنەوەی چەند وتارێك لە گۆڤاری (أهل السنة) و (سبیل الرشاد)دا حەسوودکاران و دوژمنە زەندیقەکانی بێ هیچ گومانێك سەرسام کردووە و، بە دووری نازانم ئەوانە هەوڵی بێدەنگ کردنی ئەو هاوڕێیانەمان بدەن.

* * *

باسمه سبحانه

**دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینە**

**کە هەموو گیروگرفتێکم لادەبات مایەی بێزاریم بێت**

یەکەم: گۆڕانی سەختی و گیروگرفتەکان بۆ سۆز و میهرەبانی و دڵخۆشی.

دووهەم: بەدەستهێنانی ئەو شادمانییەی کە لە ڕەزامەندی و تەسلیم بوونەوە بۆ قەدەری خوای گەورە، سەرچاوە دەگرێت.

سێهەم: ئەو دڵخۆشییەی کە هی سەرپەرشتیی چاودێریی تایبەتیی خوای گەورەیە بۆ قوتابیانی نوور.

چوارەم: چێژ و لەزەتی نەمانی ئەو گیروگرفتەی کە شتێکی کاتی و ڕێبوارە.

پێنجەم: بەدەستهێنانی پاداشتە مەزنەکان.

شەشەم: خۆ هەڵنەقورتاندن لە ویستی خوای گەورەدا.

حەوتەم: ڕوودانی سووکەڵە و تەنکترین زام و کەمترین گیروگرفت لە دەمی توندترین و دڕندەترین هێرشدا بۆ سەرمان.

هەشتەم: بچووك بوونەوەی گیروگرفتەکان بە چەندین پلەی زۆر سەبارەت بە گیرۆدەبووانی ترەوە.

نۆهەم: دڵخۆشیی کاریگەریی ئەو ڕاگەیاندنە بەرزانەی هەواڵی تەواوبوونی ئەم تاقیکردنەوە سەختە دەگەیەنن کە لە خزمەتی نوور و ئیماندا هاتە ڕێمان.

ئەم نۆ دانە دڵخۆشییە مەعنەوی‌یانە، چارەسەرێکی مەعنەوی و مەڵهەمێکی هێندە ناسك و نیانن بۆ هێورکردنەوەی ئازارە توندەکانمان کە لە باسکردن نایەت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

**یەکەم:** ئەوە چاودێرییەکی خوایی بوو کە نەمتوانی بوختان و درۆ و دەلەسەکانی داواکاری گشتی ببیستم، دەنا بە گوفتارێکی ڕەق و تەق وەڵامم دەدایەوە.

ئەوەش کە لە دادگادا پێم وت: "حەواڵەی دادگات دەکەم" مەبەستم پێی دادگای هەرە مەزن بووە لەسەر ئەو ستەمەی کە لێت کردین و، دادگایەکی دنیاییش لەسەر هەڵسوکەوتی نایاساییت.

مەبەستیشم لە: "من پارێزەرم نی‌یە" ئەوەیە کە هەمووومان تەنها یەك پارێزەرمان هەیە بۆ کێشە گشتی‌یەکەمان کە تایبەتە بە هەموومانەوە. بەڵام هێرش کردنە سەر خودی من، ئەوا وەڵامدانەوەیم خستووەتە ئەستۆی خۆم.

ئەمە بە ئەحمەد حیکمەت ڕابگەیەنن.

**دووهەم:** بەرگری‌یەکانی پێشوومان سەروزیادە بۆ پووچەڵ کردنەوەی درۆ و دەلەسەکانی داواکاری گشتی.

**سێهەم:** هەریەك لە مستەفا عوسمان و جەیلان نامەیان بۆ نووسیوم کە: ئەوەی لە دادگادا وتراوە کاریگەریی خراپی لە ناوەندی بازنەی نووردا نابێت و، هەرگیز ڕوونیی دڵەکان لێڵ ناکات. بینیم قارەمانی پێشەنگی نوور: "طاهیری"یش هەر بەو جۆرە لە مەسەلەکە گەیشتووە.

**چوارەم:** پێم وایە کوفر و گومڕایی لەبەر ئەوە بە شێوەیەکی ڕێکخراو هێرش دەکەنە سەرمان چونکە پاڵیان بە چەند دامەزراوە و ڕێکخراوێکەوە داوە، بەڵام قەدەری خوای گەورە بە ستەمی دژواری ئەوان ئازارمان دەدات کە پشتی بە ڕێکخراوەکان بەستووە. بەو واتایەی یەکگرتنی ئیمانداران لەم کاتەی ئێستادا کارێکی گەلێ پێویستە. ئێمەش لەبەر ئەوەی ئەو ڕاستییەمان نەزانی زللەیەکی تەمێ کردنمان لە لایەن قەدەری خوای گەورەوە ئاراستە کرا.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم:** باشترین شوێن بۆ ئێمە بەندیخانەیە، لە سەردەمی حوکمڕانیی وەزارەتێکی خۆسەپێندا کە ڕێ لە حەج دەگرێت و سووکایەتی بە ئاوی زەمزەم و قەدەغەی دەکات و.. بوار دەدات توندوتیژترین ستەم بەرامبەرمان بکرێت و.. گوێ نادات بە دەست بەسەرداگرتنی کۆمەڵە پەیامی (ذوالفقار) و (سراج النور) و.. پلەی ئەو کارمەندانەش بەرز دەکاتەوە کە بە ئەنقەست و بە بێ هیچ پاڵپشتێکی یاسایی ئازارمان دەدەن و، گوێ لە دەنگ و گریانی ئێمەی ستەم لێکراو ناگرن کە بە زمانی حاڵ لە خانە و لانەکانمانەوە بەرز دەبنەوە..

بەڵێ، باشترین جێ بۆ ئێمە لە سەردەمی حوکمی ئەم وەزارەتەدا بەندیخانەیە، مەگەر بگوێزرێینەوە بۆ بەندیخانەیەکی تر. دیارە ئەو کاتە بە تەواوی ڕزگارمان دەبێت و بێوەی دەردەچین.

**دووهەم:** هەروەك ئەوان دوورترین کەسیان لە ئێمەوە ناچار کرد کە تایبەتیترین و پەنهانترینی پەیامەکان بخوێننەوە، وا دیارە بە هەمان شێوە و بە جەخت لەسەر کردنەوە هانی ئێمەش دەدەن کە "کۆمەڵە"یەك پێکبهێنین! چونکە برایەتیی ئیسلامی، کە لەناو کۆمەڵی ئەهلی ئیماندا پەرەی سەندووە، لای قوتابیانی نووریش بە شێوەیەکی بێگەرد و پاك و بەو خۆبەختکردنە ڕاست و فیداکارییە تەواوەتییە پەرەی سەندووە کە لە باپیرانی پێشوویان و لەو ملیۆنەها پاڵەوانەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە کە بەوپەڕی شەوق و حەزەوە گیانی خۆیان لە پێناوی حەقیقەتدا بەخت کردووە..

جا ئەو قوتابیانەی نوور بە پەیوەستێکی هێندە توندوتۆڵ پەیوەندی‌یان بەو ڕاستی‌یەوە کردووە کە تا ئێستا پێویست بەوە ناکات ڕێکخراوەکان پێکبهێنرێن، چ سیاسی بن چ ڕەسمی، چ ئاشکرا بن و چ پەنهان.

کەواتە لەم سەردەمەدا بە ڕادەیەکی ئەوتۆ پێویستی بەم "برایەتی‌یە ئیسلامی"یە هەیە کە قەدەری خوای گەورە ئەوانەمان بەسەردا زاڵ دەکات. دەبینی ئەوان ستەممان لێ دەکەن کە گوایا ئێمە کۆمەڵەیەکی وەهمیمان پێکهێناوە.. بەڵام قەدەری خوای گەورە پێمان دەڵێت: بۆچی بە ئیخلاسێکی تەواوەتی و پشتگیری‌یەکی توندوتۆڵ حیزبوڵڵای ڕاستەقینە(برایەتیی ئیسلامی)تان پێك نەهێناوە؟! کەواتە قەدەری خوای گەورە بە دەستی ئەوانە زللەیەکی ئاراستە کردین. خۆ ئاشکرایە کە قەدەری خوای گەورەش دادگەرە.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم**: پێم وایە ئێوە پێویستتان بە دڵدانەوە نی‌یە، چونکە ئەوەتان سەروزیادە کە لە نێوان خۆتاندا ورەی یەکتری بەرز دەکەنەوە. سەبارەت بە خۆیشم ئەو تابلۆیەم سەروزیادە کە لە بەرامبەری خۆمەوە هەڵم واسیوە.

بە دڵنیایی‌یەوە زانراوە کە ئەم هێرشەی دوایی تەنها ستەم و کارێکی نایاسایی و ترساندنێك بووە کە لە چەند وەهم و لاوازی‌یەکی دڵی ئەواندا چەکەرەی کردووە. چونکە حاڵی خەڵك و هەڵوێستی پیاوانی ئاسایش وەك ڕەخنە گرتنێك وابوو لەو هێرشە نابەجێ‌یە.

**دووهەم**: ئایا بەرگری‌یەکانم سەبارەت بەو تۆمەتانەی ئاراستەمان کراوە سەروزیادە؟ ئایا پارێزەرەکان و زوبەیر لەو پێناوەدا هەوڵ دەدەن؟ ئایا هیچ نیگەرانی‌یەکیان هەیە؟ دەبێ هەرگیز نیگەران نەبن.

گەر بەپێی ئەو ماددانە بێت کە ئێمەیان پێ تۆمەتبار کردووە، دەبێ هەموو ئەو کەسانە بە هەمان ماددە تاوانبار بکرێن کە برایەتیی ئیمانی‌یان لە دڵی خۆیاندا هەڵگرتووە! تەنانەت ئەوانەش کە لە مزگەوتەکاندا لە پشت سەری ئیمامەکانەوە نوێژ دەکەن و

هەموو قوتابیانی سەرجەمی مامۆستایان بە تاوانبار دابنرێن! بەو واتایای کە ئەوان لە بەرامبەر گەلێ نەیاری بەهێزەوە خۆیان بینییەوە. بۆیە ئەو هێرشەیان کردە سەرمان و "ئیمکانات"یان لە جێی "وقووعات"دا دانا. واتە: ئەو شتانەی کە ئیمکانە ببن و ڕوو بدەن وایان لێکداوەتەوە کە ڕوویان دابێت!

**سێهەم**: خۆم قەناعەتم وایە کە دەبێت هەتا بەهار لە بەندیخانەدا بمێنینەوە، چونکە دەزانین کاروبار لە زستاندا دەوەستێت. پشت بە خوا چاودێریی خوای گەورە فریامان دەکەوێت.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

برایانی ئازیز و هاوڕێم!

**یەکەم**: دەبێ تا دەتوانرێت حەزەر و خۆپارێزی بکرێت. هەروەك ڕاوێژ کردن بە یەکتری و "خۆڕاگری" کارێکی گەلێ گرنگ و پێویستن.

**دووهەم**: کارەکانی ئێرەم بە زوبەیر و جەیلان سپاردووە، چونکە بە شێوەیەکی مەعنەوی ئاگادار کراومەتەوە کە زوبەیر لە جێی خوا لێخۆشبوو عەبدورڕەحمانی برازامە و، جەیلانیش لە جیاتی برازاکەی ترم فوئادی خوا لێخۆشبووە.

* * *

هێرش و دەستدرێژییەکەی ئەم جارە لە بازنەیەکی یەکجار فراواندا کرایە سەرمان..

ئەوەبوو هەریەك لە سەرۆکی حکوومەت و وەزیرەکان، بەپێی پلانێکی دارێژراو کە لەسەر بناغەی چەند وەهمێکی ترسناك دارێژرابوو، هێرشیان کردە سەرمان.

بە گوێرەی ئەوەی من بیستوومە و بە چەند نیشانەیەکدا وا دیارە کە ئەو هەواڵە درۆینەیەی مونافیقانی پشتی پەردە سازیان داوە و بەو پیلان و فێڵانەش کە لە دژی ئێمە هەڵیان بەستووە وایان پیشان داوە کە پەیوەندییەکی بەهێز و توندوتۆڵمان لەگەڵ کۆمەڵەی نهێنیی تەریقەتی نەقشبەندی و ئەو ڕێکخراوەشدا هەبێت کە بۆ زیندووکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامی هەوڵ دەدات. تەنانەت ئێمەیان وا پیشان داوە

کە لـە پێشـەنگی ئـەوان و بـەڵکو پێشڕەویشـیان بـین! بـە ڕادەیـەك کـە لـەم ڕووەوە حکوومـەتیان تووشـی نیگەرانییـەکی یـەکجار گـەورە کـردووە. بـۆ ئەمـەش کۆمەڵـە گەورەکانی پەیامەکانی نووریان پیشان دان کە لە ئەستەمبووڵ بەرگیان تێ گیراوە و بۆ جیهانی ئیسلامی نێرراون و، لەوێ ڕەزامـەندی و قبووڵیـان بەدەسـت هێنـاوە و، ئەمـەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر چالاکیی قوتابیانی نوور. ئیتر بەم جۆرە ترس و دڵەڕاوکێیان لە دڵی حکوومەتدا بڵاوکردەوە و، دەماری غیرەت و حەسوودییان لە لای هـەندێ زانـای ڕەسمی وورووژاند و، وەهەم و گومانیشیان لـە لای کارمـەندەکان بـە ڕادەیـەك هـەژاند کـە ئەوانیان خسـتە هەڵوێسـتی دژایـەتیی ئێمـە و پێیـان وابێـت بەڵگـەی زۆر و نیشـانەی جۆراوجۆریان بە دەستەوەیە کە ئێمەی پێ تاوانبار بکەن و، لەو باوەڕەدان سەعیدی نوێ ئەم بارودۆخەی پێ قبووڵ ناکرێت و ڕێسا و سیستەمی ئاسایش تێکدەدات!

بەڵام سوپاسـێکی بێ کۆتـایی بۆ خـوای گـەورە کـە قورسایی ئەم گیروگرفتـەی لـە هـەزارەوە هێنایـە خـوارەوە بـۆ یـەك! ئـەوەبوو نـەیانتوانی بیچەسـپێنن کـە هیـچ پەیوەندییەکمان بە ڕێکخراوەکان و ئەو کۆمەڵانەوە هەبێت. چونکە هەر لە بناغەدا ئـەم جۆرە پەیوەندییە وجودی نییە، ئیتر چۆن دەتوانن پەیدای بکەن؟ بۆیە داواکاری گشتی ناچار بوو درۆ و دەلەسە هەڵببەستێت و بوختانمان بە دەمەوە بکـات و، چـەند شتێکی بێ نرخ بخاتە ئەستۆمان کە هیچ بەرپرسییەکیان تێدا نییە.

مادەم "ڕاستی" ئەمەیە، ئەوا ئێمە و پەیامەکانی نوور بە ڕێژەی لە سـەدا نـەوەد و نـۆ لـە گیروگرفتەکان ڕزگارمان بووە. لەبەر ئەوە، دەبێ چاوەڕوانیی چاودێریی خـوای گـەورە بکـەین و، بە شـوکر و سـەبر و لالانـەوە لـە دەرگانـەی خـوادا کـارێ بکـەین کـە ئـەو چاودێرییەی خوای گەورە بەرامبەر بە ئێمە بدرەوشێتەوە.

کەواتە دەبێ لـە جیـاتی سکاڵا، نـەك هـەر تەنـها یـەك جـار بـەڵکو هـەزار و یـەك جـار شوکر و سوپاس پێشکەشی خوای گەورە بکەین و، دەستی یارمەتی بۆ ئەوانەی دەڕۆن و دێنـە نـاو ئـەم قوتابخانـە یوسفییەوە ڕابکێشین و لـە ڕێگـای وانـەی پەیامـەکانی نـوورەوە دڵنەواییان پێ ببەخشین.

**سەعیدی نوورسی**

باسمه سبحانه

برا و هاوڕێی ئازیزم!

لە ڕێی ئاگادارکردنەوەیەکی توندوتیژەوە زانیم کە تۆ و ئەحمەد فەیزی بە ڕەوشێکی پێچەوانەی ڕێبازی نوور هەنگاوتان ناوە، کە ئەو ڕێبازەش بریتییە لە ڕووبەڕوو نەبوونەوە و زۆرانبازی نەکردن لەگەڵ ئەهلی دنیا (دەستەڵاتداران)دا و تێکەڵ نەبوون لەگەڵیاندا و خۆهەڵنەقورتاندن لە کاروباری سیاسەت و، تەنها و تەنها بەرگری لەخۆ کردن، گەر زۆرمان بۆ هات و ناچار کراین.

جا ئەو بڕگانەی کە ئێوە لە دادگادا لە بارەی زۆر شتەوە دەرتان بڕی و خوێندتانەوە، ڕووبەڕوو بوونەوە و زۆرانبازییان دەگەیاند لە شێوازێکی سیاسیدا و، زیانێکی هێندە زۆری بە پەیامەکانی نوور گەیاند کە بوو بەهۆی سزادانی هەموومان و، گوشار خستنە سەر من.

من لە تۆ و ئەحمەد فەیزی دڵگران نیم، بەڵام دەبوو لە پێشدا ئەو بەرگرییەتان پیشانی من بدایە.

ئەو بارودۆخی بەرگری کردنەتان وەك قەزایەکی ماددی لە لایەن خوای گەورەوە پێ بەخشرا. دەبێ ئێوەش وەك من هەوڵی چاکسازی و نۆژەن کردنەوەی ئەو بەرگرییە بدەن. گەلێ پێویستە کە فەیزی هەتا دەتوانێت واز لە بەرگریی سیاسییانە بهێنێت و بە وێنەی "طـاهری" بە تەواوەتی ڕوو لە پەیامەکانی نوور بکات و، لەگەڵ قوتابییە تازەکانی نووردا خەریك بێت.

* * *

# بەرگرییەکانی قوتابیانی نوور

**(ئەمانەی خوارەوە چەند بەرگرییەکن کـە قوتابیـانی پەیامـەکانی نوور ساڵی ١٩٤٨ز لـە دادگای ئافیوون و لـە کەش و هەوایەکی پـڕ لـە دەرکردنی بڕیـاری لەسـێدارەدان بـۆ چاوترسـاندنی بـەندکراوان، پێشکەشی دادگایان کردووە. خۆ هەرچەندە لەپێشدا دادگایی کران، بەڵام پاشتر پرۆسەی دادگاییەکە بـە گێڕانـەوەی پەیامـەکانی نـوور کۆتایی پێ هات).**

ئەو کەسانەی کە بە مەبەستی تاوانبار کردنی قوتابیانی نوور لە بەردەم دادگادا هـەوڵ دەدەن نـاوی پـەیوەندیی دنیـایی و سیاسـی لـەو پەیوەندییـە پـاك و بێگەردانـە بنێـن کـە قوتابیانی نوور بە پەیامـەکان و دانەرەکەیانـەوە گـرێ دەدەن و، جگـە لـە پاداشـتی ڕۆژی دوایی هیچ ئامانجێکی تریان تێدا نییـە.. ئەوانـە بـە تـەواوەتی لـە ڕاسـتی و دادگەرییـەوە دوورن. سەرەڕای ئەوەش کە سێ دادگای جیاجیا لەو تۆمەتانە تەبرییەی کردوون.

ئێمەش دەڵێین:

تۆمەتبارکردنی قوتابیانی نوور (بـە تـاوانی پـەیوەندی کـردن بـە کۆمەڵـە و ڕێکخـراوە سیاسییەکانەوە) تەنها بە دوو شت دەبێت:

**یەکەم:**

بە نکوولی کردن دەبێت لەو پەیوەندییە بنەڕەتییانەی کە ژیانی کۆمەڵایـەتیی مـرۆڤ بە یەکەوە دەبەستێت. بـە تایبـەت هـی نەتـەوەی ئیسـلام، کـە بریتییـە لـە خۆشەویسـتیی

ڕاست و بێگەردی نێوان خزمان و، پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوان تیرە و هۆزەکان و، برایەتیی یاریدەدەری مەعنەویی یەکتر لە ناوەندی موسڵمانانداو، ئەو پەیوەندییە بەهێزەش کە هاوکاتە لەگەڵ قوربانی و خۆ بەختکردندا لەنێوان ڕۆڵە هاوڕەگەز و هاونەتەوەکاندا و، پەیوەندیی نەپچڕاو و پابەند بوونی تەواوەتی بە ڕاستییەکانی قورئان و بڵاوکەرەوەکانی ئەو ڕاستییانەوە کە ژیانی هەمیشەیی ئەوان دەرباز دەکات.. ئەمانە و پەیوەندییەکانی تری هاوچەشنیان کە ڕۆڵەکانی کۆمەڵگا بە یەکەوە دەبەستێت و ژیانێکی کۆمەڵایەتیی ساغ و خاوێن دەهێنێتە دی.

**دووهەم:**

بە پەسەند کردن و وەرگرتنی ئەو مەترسییە سوورە دەبێت کە لە باکوورەوە هاتووەو، تۆوی ئاشووب و تۆقاندن دەچێنێت و، پەیوەندییەکانی وەچە و نەتەوە و باوکایەتی و کوڕایەتی دەبڕێت و، پەیوەستەی خزمایەتی و نەتەوایەتی دەپچڕێنێت و، ڕێ بۆ تێکدانی تەواوی شارستانێتیی ئادەمیزاد و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خۆش دەکات.

تەنها بەم دوانە دەتوانرێت تۆمەتی پەیوەندی کردنی قوتابیانی نوور بە کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانەوە سەربگرێت. هەر لەبەر ئەمەشە کە قوتابیانی نوور، بێ دوودڵی، پەیوەندیی نەپچڕاویان بە ڕاستییەکانی قورئان و برایەتیی قیامەتیی نێوان خۆیان ئاشکرا دەکەن و، ڕاستیی حاڵی خۆیان لە بەردەم دادگای دادگەری ئێوەدا ڕوون دەکەنەوە، بێ ئەوەی دابەزنە ئاستێك کە بە فێڵ و درۆ و مەرایی، بەرگری لە خۆیان بکەن.

بەندکراو

**سەعیدی نوورسی**

* * *

**بەرگریی خەسرەو:**

بۆ "دادگای تاوانە گەورەکان" لە شاری "ئافیوون":

"داواکاری گشتی" دوو تۆمەتی ئاراستە کردووم. یەکێکیان تۆمەتێکی گشتی‌یە و، ئەوی تریان تۆمەتێکی تایبەتە.

تۆمەتە گشتی‌یەکە ئەوەیە کە: من لە پێناوی پەیامەکانی نووردا تێکۆشاوم و، بەشدارم لەو تاوانە وەهمی‌یەی دراوەتە پاڵ مامۆستاکەم.

تۆمەتە تایبەتەکەش سەبارەت بە چەند شتێکی کەسی‌یە و تایبەتە بە ژیانی خۆمەوە، کە گۆشەگیریی پێوە دیارە و لە ڕاستیدا هیچ گوناهـ و تاوانێکی تێدا نی‌یە، چونکە چەند بابەتێکی جوزئی و بێ بایەخە.

لە بەرپەرچدانەوەی ئەو تاوانەی کە داواکاری گشتی ئاراستەی کردووم سەبارەت بە بەشدار بوونم لەو تاوانە وەهمی‌یەی دراوەتە پاڵ مامۆستاکەم و، پێشکەش کردنی خزمەتەکانم لە پێناوی پەیامەکانی نووردا، دەڵێم: من بە هەموو هێز و توانایەکی دڵ و گیانمەوە بەشدارم لە ڕێبازی مامۆستاکەمدا و یارمەتیی دەدەم لەو تاوانە وەهمی‌یەی کە دراوەتە پاڵی، سەبارەت بەو پەیامانەی نوور کە چەندین خزمەتی خاوێن پێشکەشی جیهانی ئیسلامی دەکەن، بە تایبەت بەم نیشتمان و نەتەوەیە. خۆ هەتا کۆتایی تەمەنیشم سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە لەم خزمەتە ئیمانی‌یەدا پشتی گرتووم.

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

باشترین بەڵگە بۆ ئەو سەرکەوتنەی بە چاوی خۆمان بینیمان لە دەمی خزمەتکردنی پەیامەکانی نووردا ئەوەیە کە لەوەوپێش دەستخەتم لە نووسینەوەی پیتەکانی قورئاندا زۆر ناخۆش بوو، کەچی زۆر لەتوانای خۆم زیاتر خەتم لە نووسینەوەی ئەو پیتانەدا خۆش بووە، بە ڕادەیەکی وا کە توانیم سێ نوسخەی ناوازە و جوان لە قورئانی پیرۆز بنووسمەوە، کە دانەیەکیان لە بەردەستی ئێوەدایە.

*بەڵگەی دووهەم:*

خوای گەورە لە نووسینەوەی نزیکەی شەش سەد پەیامی نووردا یارمەتیی دام کە لە ماوەی بیست ساڵدا گەلێ سوودی گەورەیان بۆ ئەم نیشتمان و نەتەوەیە و بۆ ئایین و ڕەوشتی جوان هێناوەتە دی.

تەنانەت هاوڕێکانم دەزانن لە ماوەیەکی کورتدا کە تەنها مانگێکی خایاند چوارده پەیامم نووسی‌یەوە!

بەرگری کردنیشم لەو خاڵانەی کە داواکاری گشتی بە تاوانی منی داناون سەبارەت بە خزمەتکردنی مامۆستاکەم لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکە پیرۆزەکەیدا، بە کارێکی زیاد لە پێویست دەزانم، چونکە بە هەموو هێزێکمەوە تەسدیقی هەموو ئەو شتانە دەکەم کە مامۆستام لە بەرگری‌یەکەی و پاشماوەی ئەو بەرگری‌یەشدا نووسیویەتی. تەنانەت بەرگری‌یەکەی ئەو بە هی خۆم دادەنێم و، لە سەر ئەو بناغەیە پێشکەشی دادگای دەکەم.

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

مامۆستاکەمان کە ئێستا لە دادگاکەی ئێوەدایە، هیچ ئامانجێکی دنیایی و سیاسیی بە دانراوە پیرۆز و پەیامە نوورانی‌یەکانی نی‌یە، کە لەبارەی ئیمان و ڕاستی‌یەکانی قورئانەوە دەدوێن. جا من و هاوڕێکانم هەروەك پشتی مامۆستاکەمان دەگرین و پیرۆزبایی پێشکەش دەکەین لەسەر ئەو خزمەتە خاوێنەی پێشکەشی ئەم نەتەوە و نیشتمانەی کردووە، دەشڵێین تەنانەت نیشتمان پەروەرەکانی حکوومەتی "ئیتتیحاد و تەرەقی" پشتی ئەم بۆچوونەیان گرتووە، چونکە بڕی نۆزدە هەزار لیرەی زێڕیان تەرخان کرد بۆ ئەوەی مامۆستا بتوانێت قوتابخانەکەی لە شاری (وان) پێ بنیات بنێت کە ناوی (قوتابخانەی زەهراء) ی لێ ناوە. جگە لەوەش هەموو نیشتمان پەروەران سەریان لە نیشتمان پەروەریی مامۆستامان و غیرەتی نەتەوایەتی و خزمەتە زانستی‌یەکانی سووڕماوە و پشتیان گرتووە. چونکە سەد و شەست پەرلەمانتار لە کۆی دوو سەد، ئیمزای ڕازی بوونیان لە سەر تەرخان کردنی سەد و پەنجا هەزار لیرە کرد بۆ بنیاتنانی ئەو زانکۆیەی کە مامۆستامان نیازی بوو دروستی بکات.

حەز دەکەم ئەوەش بخەمە پێش چاوی بەڕێزتانەوە و ڕایبگەیەنم کە لەڕادەبەدەر شادمانم و شانازی بەو خزمەتەوە دەکەم کە پێشکەشی پەیامەکانی نوورم کردووە لەوەدا کە بە درێژایی بیست ساڵ ئەو پەیامانەم نووسیوەتەوە، کە خزمەتێکە داواکاری گشتی بە گوناهـ و تاوانێکی من لە قەڵەمی داوە.

بۆیە ئەم شانازی‌یەش دەکەم چونکە مامۆستاکەم — خوا پیت و بەرەکەتی خۆی بەخشێت بە خۆی و کارەکانی — بە درێژایی تەمەنی کاری بۆ ئەنجامدانی خزمەتێکی خاوێن کردووە و، ویستوویەتی بەردی بناغەی بەختەوەری بۆ ئەم نیشتمان و نەتەوەیە

دابنێت. هەر تەنها ئەمەشە هۆکاری ئەوەی زۆربەی حەسوود و دوژمنە سەرسەختەکانی و ئەوانەش کە تێدەکۆشان لە دادگاکاندا تاوانباری بکەن نەیانتوانی ڕووبەڕووی وتارە توندوتیژ و کاریگەرەکانی ببنەوە، جگە لە تەسلیم بوون بەوەی کە دەیلێت، هیچ شتێکی تریان بۆ نەماوەتەوە.

بەندکراو
**خەسرەو ئاڵتن باشاق**

* * *

**بەرگریی "طاهیری"**

بۆ "دادگای تاوانە گەورەکان" لە شاری "ئافیوون":

لە لایەن داواکاری گشتیی دادگای ئافیوونەوە پێم ڕاگەیەنرا کە ئەو تۆمەتەی ئاراستەی من و مامۆستاکەم (بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی) و هاوڕێیانی ترمان کراوە، بریتییە لە: (بەکارهێنانی هەست و نەستی ئایینی بە مەبەستی هاندانی گەل بۆ تێکدانی ئاسایشی دەوڵەت). هەر ئەمەش کراوە بە هۆی هێنانم بۆ دادگا.

پێشتر، چ لە دادگای سوڵحی ئیسپارتە و چ لە فەرماندەی لێکۆڵینەوەی ئافیوون‌دا، وەڵامی ڕاست و دروستی هەموو ئەو پرسیارانەم دایەوە کە ئاراستەم کران. دادگای "دەنیزلی"ش دوای ئەوەی بڕیاری تەبرئەیە بوونی بۆ دەرکردین و هیچ سزایەکی نەداین، سەرجەمی ئەو کتێبانەشی داینەوە کە دەستیان بە سەردا گیرابوو. چونکە من و برایانی ترم لە قوتابیانی بەدیعوززەمانی مامۆستام پەیامەکانی نوورمان دەخوێندەوە و دەماننووسیەوە و بۆ یەکترمان دەناردن.

هەرچەندە من شەش ساڵ پێش ئێستا و بە بێ ڕوخسەتی مامۆستام پێنج سەد نوسخەم لە پەیامی "تیشکی حەوتەم"ی بەدیعوززەمان بە پیتە کۆنەکان لە ئەستەمبووڵ چاپ کرد، لەگەڵ ئەوەشدا دادگای دەنیزلی لە بەرواری ١٩٤٥/٧/٢٠ بڕیاری دا هەموو کتێبەکانمان بە سندووقەکانیشیانەوە پێ بدرێتەوە. دوای ئەوە ئەو پەیامانەمان تەنها بە نرخی چاپەکەی فرۆشتەوە بە قوتابیانی نوور، کە زۆر تاسەمەندی ئەو پەیامانە بوون.

بەم جۆرە و بە پشت بەستن بەو بڕیاری تەمیزەی کە لەم دادگا بە ڕێزەوە دەرکرا و، شێوەی قەتعییەتی بەدەست هێنا، پێش دوو ساڵ کاغەز و ئامێری چاپی "ڕۆنیۆ"م لە ئەستەمبووڵەوە بۆ ئیسپارتە هێنا.

برای بەڕێزیشمان خەسرەو ئالتن باشاق دوو کۆمەڵە پەیامی لەو سێ کۆمەڵەیەی بەردەستی ئێوە نووسییەوە و، منیش سێ‌هەمیانم نووسییەوە.

یەکەم جار کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار" و "موعجیزاتی قورئانی" و "موعجیزاتی ئەحمەدی"مان چاپ کرد و، هەندێکمان لێ فرۆشت و، بەو بڕە پارەیەش کاغەزی پێویستمان بۆ کۆمەڵە پەیامی "عەسای موسا" کڕی و، چاپمان کرد. ئنجا بە پارەی فرۆشتنی، کاغەزمان بۆ کۆمەڵە پەیامی "سراج النور" کڕی و چاپمان کرد. هەموو ئەمانەش ماوەی ساڵێکی خایاند.

کاتێك کە خەریکی گواستنەوەی سێ کۆمەڵە پەیام بووم بۆ "ئەگریدر" لە ڕێدا دەستگیر کرام و درام بە لایەنەکانی داد لە "ئەگریدر". پاشان هێندەی نەخایاند لە لایەن فەرمانگەی دادی شاری ئیسپارتەوە ماڵی خەسرەو ئالتن باشاق پشکنرا و، ئامێری ڕۆنیۆکە و چەند کۆمەڵێکی پەیامەکانی نوور دەستیان بە سەردا گیرا و، پێش ساڵێك دراین بە دادگا، لە ئەنجامدا من و خەسرەو و هاوڕێیەکی ترمان بڕیاری بەند کردنی ماوەی یەك مانگمان بۆ دەرکرا لەسەر چاپکردنی چەند کتێبێکی ئایینی نایاساغ لەبەر ئەوەی بە بێ ڕوخسەتی ڕەسمی چاپمان کردبوو. ئێمەش داوای تەمیزی ئەم بڕیارەمان کرد. بەڵام پێش ئەوەی ئەنجامی ئەو تەمیزە دەربچێت، منیان هێنا بۆ بەندیخانەی ئافیوون.

ئێستاش بەم جۆرە، لەم دادگا بەڕێزەی ئێوەدا دەیانەوێت لەسەر خزمەتکردنی ئایینەکەم و برایانی ئایینیم سزا بدرێم، لەبەر ئەو مەسەلە و بابەتانەی لە پەیامی "تیشکی پێنجەم"دان و دادگا دایەوە بە ئێمە و، بریتییە لە لێکدانەوەی هەندێك فەرموودەی پیرۆز..

هەروەها داواکاری گشتیی دادگای ئافیوون من و دانەری پەیامەکە و خەسرەو ئالتن باشاق و چل و شەش قوتابیی نووری بە (تێکدانی ئاسایشی وڵات و، نووسینەوە و خوێندنەوەی ئەم پەیامانە) تۆمەتبار کردووە و، داوای سزادانمان دەکات.

منیش وەك هاوولاتی‌یەکی ڕاستەقینەی ئەم نیشتمانە، لە بەردەم ئێوەدا و بێ ئەوەی لە ڕاستی لابدەم، دەڵێم:

ماوەی چەند ساڵێکە من قوتابیی مامۆستاکەم: (سەعیدی نوورسی)م کە ڕێزێکی زۆری لێ دەگرم. چونکە پەروەردەی ئێمەی بە پەیامەکانی دارشت و، ڕەوشت و خووە ئایینی‌یەکانی ئێمەی پوخت و خاوێن کرد و، ڕەوشت بەرزیی پێ بەخشیین. خۆ هەرچەندە ئێمە بە سیفەتی نوێکار(مجدد) بۆی دەڕوانین، بەڵام ئەو بەرپەرچی ئەمە دەداتەوە و پێی ناڕازی‌یە.

بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە شایەتی دەدەم کە:

نە لە لای مامۆستا و، نە لە پەیامەکانیدا و، نە لە لایەن قوتابی‌یەکانیەوە هیچ هەوڵێك نەدراوە بۆ تێکدانی ئاسایشی وڵات. بە تایبەت کە یەکێك لەو تۆمەتانەی ئاراستەمان کرا تایبەت بوو بە نرخی کتێبەکان. خۆ کاتێك دادگای ئیسپارتە ڕاستیی ئەم بابەتەی لە نزیکەوە بۆ دەرکەوت، هیچ سزایەکی بۆ دەرنەکردین، چونکە لە ژیان و گوزەرانی خۆماندا پێویستمان بە پارەی فرۆشتنی ئەم کتێبانە نی‌یە و، لە سەری ناژیین. پێمان خۆشە بە دادگای بەڕێزی ئێوەی ڕابگەیەنین کە ئەو پارەیە تەنها لە بەرامبەر نرخی ئامێری ڕۆنیۆ و مەرەکەب و کاغەزەکانەوەیە. ئەم هەوڵ و کۆششەی ئێمە و خزمەتەکانمان کە لە نیازی خاوێنەوە و لە پێناوی خوای گەورەدا سەرچاوەیان گرتووە، هیچ گوناه و تاوانێك پێکناهێنێت. بۆیە داوا لە دادگای بەڕێز و ویژدانی زیندووتان دەکەین کە پەیامەکانی نوورمان بدەنەوە.

بەندکراو:

**طاهیری**

## بەرگریی زوبەیر

ئەی دەستەی دادگای "تاوانە گەورەکانی ئافیوون"!

من بە تۆمەتی پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنی و تێکدانی ئاسایشی دەوڵەت تاوانبار کراوم. بەڵام لەبەر ئەوەی لە دوایی‌دا و لە ڕێی ئەم بەرگرییەی پێشکەشتانی دەکەم بە تەواوی و دڵنیایی باوەڕ دەکەن کە تاوانی وام ئەنجام نەداوە، ئەوا هەر لە ئێستاوە ئەو تۆمەتە بەدرۆ دەخەمەوە.

بەڵێ، من یەکێکم لە قوتابیانی نوور، بەوپەڕی متمانە و خۆشحاڵی‌یەوە ئەمە دەڵێم و ڕایدەگەیەنم. چونکە نکوولی کردن لەم ڕاستی‌یە تەواو دژ و پێچەوانەی وانەکانی ڕەوشت جوانی‌یە کە پەیامەکانی نوور فێریان کردووم. بۆیە ئامادە نیم ئەو تاوانە ئەنجام بدەم!

هەر کەسێك بە بەردەوامی پەیامەکانی نوور بخوێنێتەوە ناگونجێ ئەو خوێندنەوەیە لە خەڵکی بشارێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە شانازیی پێوە دەکات و بێ هیچ مەترسی و دوودڵی‌یەك دەری دەخات. چونکە پەیامەکانی نوور هیچ ڕستەیەك، تەنانەت هیچ وشەیەکیان تێدا نی‌یە کە مایەی ترس و دوودڵی بێت.

پێشتر لە نامیلکەیەکی چل پەنجا لاپەڕەییدا هەوڵی ڕوونکردنەوەی نرخ و بەهای پەیامەکانی نوورم دا، ناڵێم ستایشم کردن. چونکە ناتوانم مافی بەشێکی کەمی پەیامەکانی نوور بدەم چ جای هەموویان.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم پەیامانە تەفسیری ڕاستەقینەی ئەو قورئانە پیرۆزەن کە ژیری و خۆری گەردوونە و، زیاتر لە هەزار و سێ‌سەد ساڵە ڕێی ئادەمیزادی ڕووناك کردووەتەوە و بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنمایی کردوون.

وەك پێشتر وتم: ئەگەر لەو پەیامانەی هەوڵی ڕوونکردنەوەی نرخ و بەهایانم داوە شوێنێك بدۆزنەوە لەبارەی کۆمەڵەی نهێنی‌یەوە، دەتوانن بڕیاری سزام بۆ دەربکەن، چونکە ئەو کاتە دەبم بە کەسێکی بڕوادەر بە چەند کتێبێکی زیانبەخش.

ئەم پەیامانەی نوور، کە بە شێوەیەکی ڕەنگین و ناوازە و بێ هاوتا دانراون، پشتگیری و ڕەزامەندیی کەسایەتی‌یە زانستی‌یەکانیان بەدەست هێناوە و، توانای

چاکسازیی کۆمەڵگایەکی خراپ و ڕێنمایی مرۆڤی سەدەی بیستەمیان هەیە و، دەتوانن لە گومڕایی و ماددییەت و بێ بڕوایی و سروشت پەرستی و ژیانی هەرزەیی و تاریکیی بیروبۆچوونەکانی دەرەنجامی ماددییەت ڕزگاریان بکەن و، لە ڕێژنە و ڕووناکیی قورئانی پیرۆزەوە دەرگاکانی بەختەوەریی هەمیشەیی و بێوەیی بۆ گرۆی ئادەمیزاد دەخەنە سەرپشت..

جا ئەگەر لە سەرجەمی ئەم پەیامانەی نووردا هیچ بابەتێك نەبێت پشتی ئەو تۆمەتانە بگرێت کە ئاراستەمان کراوە، ئەوا دەرچوونی هەر سزایەك لەسەر من بە کارێکی دژ و پێچەوانەی بناغەکانی دادگەری دادەنرێت. قەناعەتی من وایە کە ئەمەش هەمان بۆچوونە دادگاکەتان لەم بارەیەوە دەیبێت و قبووڵی دەکات.

لە کاتی لێپرسینەوەدا پێیان وتم:

دەڵێن تۆ یەکێکیت لە قوتابیانی پەیامەکانی نوور؟

دەڵێم:

من هیچ شایستەیی‌یەك لە خۆمدا شك نابەم کە قوتابیی مامۆستایەکی بلیمەتی وەك بەدیعوززەمان سەعید نوورسی بم. خۆ ئەگەر ئەو بە قوتابیی خۆی وەرم بگرێت، ئەوا بەوپەڕی شانازی‌یەوە دەڵێم: بەڵێ، من یەکێکم لە قوتابیانی پەیامەکانی نوور!

زۆر جار دانەری پەیامەکانی نوور، کە مامۆستای بێ وێنەم بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی‌یە، لە لایەن دوژمنە پەنهانەکانیەوە درۆی بۆ ڕێك خراوە و بەرەو دادگاکان براوە، بەڵام لە لایەن سەرجەمی ئەو دادگایانەوە بێ تاوانیی ڕاگەیەنراوە. هەروەك دەستەیەکی پێکهاتووش لە کۆمەڵێك مامۆستا و زانایانی ئیسلام لێکۆڵینەوەیان لە دێڕ بە دێڕی سەرجەمی پەیامەکانی نووردا ئەنجام داوە و، لە ڕاپۆرتەکانیاندا دانیان بەوەدا ناوە کە ئەم پەیامانە لە سەرچاوەی زانستێکی گەورەوە دانراون و تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن.

جا ئەگەر ئەمە حەقیقەتی پەیامەکانی نوور بێت، بۆچی دەبێ دانەرەکەیان جارێکی تر بۆ دادگا ببرێت؟

من قەناعەتی تەواوەتیی خۆمتان لەسەر ئەم مەسەلەیە بۆ باس دەکەم:

ئەو کەسانەی کە پەیامەکانی نوور دەخوێننەوە، بە تایبەت لاوانی وریا و چاوکراوە، ئیمانێکی توندوتۆڵ و دامەزراو لە خوێندنەوەی پەیامەکانەوە بەدەست دەهێنن و

هەریەکەیان دەبێت بە مرۆڤێکی هێندە ئایندار کە لە پێشکەش کردنی هیچ قوربانی‌یەکدا سستی نانوێنێت و دەبێت بە کەسێکی وا نیشتمانەکەی خۆش بوێت.

وەك ئاشکرایە هەرکات ئیمانێکی توندوتۆڵی دامەزراو لە هەر شوێنێکدا ببێت بوار بۆ هەرزەیی و ڕەوشت نزمی نامێنێتەوە، کە ئەنجامێکی سروشتیی هەندێ ئایدۆلۆجیای زیانبەخشە.

خۆ هەتا ژمارەی ئەو کەسانە زیاد بکات کە بەم ئیمانە بەهێزە پڕچەك دەبن، ئەوا بوار لە بەردەم بڵاوبوونەوەی ماسۆنییەت و شیووعییەتدا تەسك دەبێتەوە.

پەیامەکانی نوور بەهۆی پشت بەستنیانەوە بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەڵگەی توندوتۆڵ و بەهێزیان لەسەر مەودای پووچەڵیی فەلسەفەی ماددی هێناوەتەوە کە شیووعی‌یەکان پشتیان پێ بەستووە و، بە چەندین بەڵگەی عەقڵی و مەنتیقی ڕادەی دووریی فەلسەفەی ماددی‌یان لە حەق و ڕاستی‌یەوە دەرخستووە و، زەینی ئەو کەسانەش ڕووناك دەکەنەوە کە گیرۆدەی تاریکیی ئەم بیر و هزرە بێ کەڵکە بوون. هەروەها ئەم پەیامانە بە چەندین بەڵگەی بەهێز و توندوتۆڵی ئەوتۆ کە هەرگیز ئینکاری ناکرێن و ڕەخنەیان لێ ناگیرێت، بوونی خوای گەورە تەنانەت بۆ ئەو ماددی‌یانەش دەچەسپێنن کە باوەڕ تەنها بەو شتانە دەکەن بە چاو دەیانبینن.

خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور بە بۆنەی شێوازی سەرنج ڕاکێش و ڕەسەن و ئەدەبی بڵندیانەوە جێی خۆی لەناو قوتابیانی ئامادەیی و زانکۆدا کردووەتەوە.

لەبەر ئەوەی شیووعی و ماسۆنی‌یەکان هەستیان کردووە کە پەیامەکانی نوور بەربەستێکی بەهێزن لە بەردەم بڵاوکردنەوەی بیرە ژەهراوی‌یەکانیاندا، ئەوا پەنا بۆ هەڵبەستنی درۆ و دەلەسەی جۆراوجۆر و پیلانی یەك لە دوای یەك دەبەن تاکو پەیامەکانی نوور لەسەر ڕێیان لابەرن و ڕێ لە خوێندنەوەیان بگرن، چونکە پەیامەکان پاڵپشتێکی بەهێز و سەرچاوەیەکی بەپیتی ئیمانن، بەهۆی ئەوەی تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن.

خۆ هەرچەندە هیچ نیشانەیەك دەرنەکەوتووە لەسەر ئەو درۆیانەی کە داویانەتە پاڵ پەیامەکانی نوور، کەچی هەر لەسەر هێرش کردن بەردەوامن. لەمەوە دەردەکەوێت کە نیازیان ترساندنمان و دوورخستنەوەمانە لە پەیامەکانی نوور، تاکو لە لایەکی ترەوە کتێبە

ژەهراوی‌یەکانیان پێشکەش بە ئێمە بکەن و، بەم جۆرە بتوانن ئیمان لە نەتەوەکەمان و لاوانمان بسڕنەوە، بۆ ئەوەی دارمانی ڕەوشتیی کۆمەڵگاکەمان بێتە دی و ڕووخانی خۆیی حکوومەت دەستەبەر بکەن و، نیشتمان و نەتەوەکەمان بە دەوڵەتێکی بیانی بسپێرن، کە ئەمەش ئاواتیانە.

من لەبەردەم دادگای ئێوەدا حەز دەکەم بەوپەڕی ڕاشکاوی و بێ هیچ دوودڵی‌یەك ڕایبگەیەنم کە:

با ئەوانە بە باشی بزانن و تەنانەت لە ترساندا لەرزیان لێ بێت کە ئێمە هەرگیز چ لە خۆیان و چ لە گەمە و یاریی ئەوان ناترسین، چونکە لە پەیامەکانی نوورەوە حەق و ڕاستیمان دیوە و فێری بووین و باوەڕمان پێی هێناوە.

لاوانی تورکیا وریا و بێدارن و، نەتەوەی موسڵمانی تورکیش هەرگیز ناگونجێ ملکەچی فەرمانی دەوڵەتێکی تر بێت.

گەنجی موسڵمانی فیداکار پشت بە هێزی ئیمانی یەقینیی خۆی دەبەستێت و هەرگیز بوار نادات نیشتمانەکەی خۆی بفرۆشێت. نەتەوەی قارەمان و دینداری تورك و لاوانی ئیمانداری تورکیا هەرگیز نابێ بترسن.

لەبەر ئەوەیە کە ئێمە پەیامەکانی نوور دەخوێنینەوە و لەسەر خوێندنەوەشیان هەر بەردەوام دەبین، چونکە ئەو خوێندنەوەیە بۆ بەرزترین ئاست و پلەکانی ڕەوشتە مرۆیی‌یەکانی بەرزمان دەکاتەوە و ئێمەی چینی لاوان فێری ئەو ئایینە دەکات کە هۆکاری پێشکەوتنمانە لە هەموو بوارەکاندا و، خۆشەویستیی نیشتمان و نەتەوەمان لە دڵدا دەڕوێنێت و لەسەر ئەو بەها ئایینی‌یانە پەروەردەمان دەکات کە لە پێناوی نیشتمان و نەتەوەدا هەموو شتێکمان بەخت بکەین.

وەك زووتر باسم کرد، من بەش بە حاڵی خۆم سوودێکی یەکجار گەورەم لە پەیامەکانی نوور بەدەست هێناوە، هەرچەندە بەشێکی کەمم لێ خوێندووەتەوە. خۆ ئەگەر سەروەت و سامانم ببوایە هەموویم لە بڵاوکردنەوەی سەرجەمی ئەو کۆمەڵە پەیامانەدا خەرج دەکرد کە سوودی یەکجار زۆر بۆ نیشتمان و نەتەوە و سەرجەمی مرۆڤایەتی دەهێننە دی، چونکە ئامادەم کە هەرچیم هەیە لە پێناوی ئایینەکەم و بەختەوەریی هەمیشەیی نیشتمان و نەتەوەکەمدا بەختی بکەم.

من پێشتر بۆشاییەکی گەورەم لە دەروون و گیانی خۆمدا هەست پێ دەکرد و بە شوێن کتێبێکدا دەگەڕام کە بیخوێنمەوە..

لەم کاتەدا پەیامەکانی نوورم دەست کەوت کە هەر ئەوەندەی خوێندمنەوە، زانیم تازە ناتوانم لێیان جیا ببمەوە و دەستبەرداریان بم، لەبەر ئەوەی هەستم کرد کە ئەم پەیامانە پێویستییەکانی دڵ و دەروونم دەستەبەر دەکەن، چونکە ئەو بەڵگە عەقلی و ئیمانییانەم لەم پەیامانەدا دەست کەوت کە مرۆڤ لە دوودڵی و گومانە زانستی و ئیمانییەکان ڕزگار دەکەن..

ئیتر لەم ڕێیەوە لەو نیگەرانی و دڵتەنگییە ڕزگارم بوو کە شوبهە و گومانەکان لە ناخی مندا دەیان وروژاند و، لەم ڕاستییانەوە تێگەیشتم کە پەیامەکانی نوور بۆ مرۆڤی ئەم چەرخە نووسراون.

بۆ ئەوەی مرۆڤ چەند تایبەتکارییەکی بەرزی وەك ئەدەبی جوان و پەروەردەی بڵند و پێشکەوتوو بەدەست بهێنێت، دەبێ لە پێشدا ئیمانێکی بەهێزی بێت. جا لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور بە چەندین بەڵگەی تابلیی بەهێز و نموونەی ڕوون، ڕاستییەکانی ئیمان دەخەنە ڕوو ئەوا هەتا ئەو پەیامانەم زیاتر بخوێندایەتەوە هەستم دەکرد ئیمانەکەم پتر بەهێز و دامەزراو دەبێت، هەر ئەمەش بوو کە نەیهێشت بۆ ناو گومڕایی بەر ببمەوە و واز لە ئایینەکەم بهێنم، کە هەرچی لایەنی حەق و ڕاستی هەیە لەخۆیدا کۆی کردووەتەوە، ئەو حەق و ڕاستییەی کە بە بناغەی پێشکەوتووترین شارستانێتی دادەنرێت. هەر خوێندنەوەی پەیامەکان بوو کە ڕزگاری کردم لەوەی ببم بە پاروویەکی ئامادەی ئەوتۆ دڕندەی سوور قووتی بدات!

پەیامەکانی نوور خوێنەرانی خۆی لە گەلێ گیروگرفتی ماددی و مەعنەوی دەپارێزێت و زۆر زیاتر لەو زانستەی کە دەرچووی زانکۆ هەیەتی زانست بە خوێنەرانی دەبەخشێت و، خۆشەویستیی ئیسلام و نیشتمان و نەتەوەیان لەناودا بڵاو دەکاتەوە و، فێری گوێڕایەڵیی خوای گەورە و کاری پوخت و چالاکی و میهرەبانییان دەکات. هەر کەسێك پەیامەکانی نوور بخوێنێتەوە هەرگیز دەستیان لێ هەڵناگرێت و بۆ هیچ نرخ و بەهایەك وازیان لێ ناهێنێت و، ئەم هەست و سۆزە بێگەردەی ڕێزنان لە پەیامەکانی نوور لە دڵی هیچ کەسێکدا ناتوانرێت لاببرێت.

لە لایەن داواکاری گشتییەوە پەیامەکانی نوور بە "چەند دانراوێکی زیانبەخش" وەسف دەکرێن.

بەڵام من بە توندی نارەزایی لەم بوختانە دەردەبڕم کە هەر کەسێك تۆزقاڵێك ویژدانی بێت بوختانی وا لە زاری دەرناچێت.

داواکاری گشتی باس لەوە دەکات کە من هانی خەڵکیم بۆ خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور داوە. بەڵێ ئەمەیان ڕاستە، بەڵام دڵی هەموو ڕۆشنبیران خوێنی لێ هات تەنانەت فرمێسکیشیان هەڵڕشت و دانەچیرەیان گرت سەبارەت بەو تۆمەتەی تر کە سەرتاپا درۆ و دەمهەڵبەستە و لە ڕاستییەوە دوورە.

سەدەی بیستەم سەدەیەکە ئەو بیر و بۆچوونانەی تێدا زاڵە کە بەڵگەیان لەسەر هەبێت و، کەس باوەڕ بە هیچ شتێك ناکات و ئاوڕی لێ ناداتەوە کە بەڵگە پشتی نەگرتبێت. بۆیە داوا دەکەین لە داواکاری گشتی کە بە بەڵگە بیسەلمێنێت پەیامەکانی نوور زیانبەخشن!

یەکێك لەو ئامانجانەی کە دوژمنە پەنهانەکان هەیانە لە بڵاوکردنەوەی درۆ و دەمهەڵبەستەکانیان لە دژی پەیامەکان: شکاندنی پشتگیری و پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوانمانە، کە لە هەستی ڕێز و خۆشەویستی و سۆزی برایەتییەکەوە سەرچاوەی گرتووە کە خوێنەرانی پەیامەکانی نوور پێکەوە گرێ دەدات، ئەوانەی کە تەنها لە پێناوی خزمەتی قورئاندا - نەك شتی تر - پەیوەندییان بە ئاینی ئیسلامەوە بەستووە.

جا ئەگەر ئامانجی ئەو دوژمنانە نەهێشتن و شکاندنی ئەو پەیوەندییەی نێوانمان بێت، ئەوا لەناو وەهمدا دەژین و دووچاری هەڵە بوون و ڕەنجیشیان بە زایە دەچێت. من لە لایەنی خۆمەوە و لەو ڕوانگەیەوە کە لە نێوان خوێنەرانی پەیامەکانی نووردا لە هەموویان نەخوێندەوارترم و توانای تێگەیشتنم لە هەموویان کەمترە و لەناو دوا ڕیزەکانی ئەواندام، لە وەڵامی ئەو دوژمنە پەنهانانەدا دەڵێم:

ئەگەر یەکێکمان لە خۆرهەڵات و ئەوی‌ترمان لە خۆرئاوا.. یان یەکێکمان لە باکوور و ئەوی‌ترمان لە باشوور.. یاخود یەکێکمان لەودنیا و ئەوی ترمان لەم دنیا بێت، ئەوا ئێمە هەر پێکەوەین و، تەنانەت ئەگەر سەرجەمی هێزەکانی گەردوون کۆ ببنەوە هەر ناتوانن لە سەعید نوورسیی مامۆستامان و لە پەیامەکانی نوور دوورمان بخەنەوە، یان

جیاوازی لە نێوانماندا بنێنەوە و لە یەکتر دامان ببڕن. چونکە لەبەر ئەوەی خزمەتی قورئان دەکەین و هەر لەسەر ئەو خزمەتەش دەمێنینەوە و باوەڕمان بە ڕاستیی ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوا هیچ هێزێك ناتوانێت ئەم خۆشەویستی‌یە لە دڵمان ڕیشەکەن بکات و پەیوەندیی مەعنەویی نێوانمان لاببات، ئەمەش بەهۆی ئەوەی سەرجەمی موسڵمانان سبەینێ لە خانەی بەختەوەریی هەمیشەییدا کۆ دەبنەوە.

ئەگەر ڕێم پێ بدەن وا بە ناوی ئاسایش و سەلامەتیی نیشتمان و نەتەوەکەمانەوە ئەم ڕاستی‌یە گرنگەی خوارەوەتان بۆ باس دەکەم:

یەکێك لە نەخشە نهێنی‌یەکانی شیووعی‌یەکان: هاندانی گەلە لە دژی حکوومەت، هاوکات لەگەڵ ئەو ڕاپۆرتە ساختە و درۆیانەی کە پێشکەشی بەرپرسانی حکوومەت دەکرێن بۆ بەندکردنی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی و پیشاندانی نووسینەکانی لە شێوەی چەند کتێبێکی زیانبەخشدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی پەرەپێدانی پڕوپاگەندە و درۆی وا دەدرێت کە هیچ کەسێکی ئەم گەلە باوەڕی پێ ناکات.

جا لەبەر ئەوەی چەند ساڵێکە ئەم نەتەوەیە قەناعەتی تەواوەتی بەوە هەیە کە بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی بلیمەتێکی نایاب و دەگمەنی نێوان بلیمەتەکانی ئیسلامە لەم چەرخەدا و خاوەنی کەسایەتی‌یەکی بەرز و ناوازەیە لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوا ئەستەمە کە هیچ پڕوپاگەندەیەك بتوانێت ئەم قەناعەتە ڕاستە لە دڵی خەڵکیدا نەهێڵێت و تێکی بدات.

من لە لایەنی خۆمەوە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەم کە بە سۆز و میهرەبانیی خۆی هەلی سوود وەرگرتنی لە نووسینەکانی مامۆستایەکی گەورە بۆ ڕەخساندم و، لە ناخی دڵ و هەناومەوە خۆم بە قەرزاری ئەم مامۆستایە دەزانم، چونکە گەلێ وانەی بەنرخم سەبارەت بە ئیمان و ئیسلام لە کتێبەکانی وەرگرت.

بەوپەڕی خۆشحاڵی و شانازی‌یەوە ئامادەم چەندین ساڵ لە بەندیخانەدا بمێنمەوە لە پێناوی ئەم مامۆستا بەڕێزەدا کە چەندەها ساڵی سەخت و درێژخایەنی لە نووسینەوە و دانانی ئەو کتێبانەدا بەسەر بردووە بۆ ئەوەی لاوەکانمان ڕزگار بکات و نەبن بە پاروویەك شیووعییەت قووتیان بدات و زیندانی تاکەکەسی هەتاهەتایی چارەنووسیان بێت.

وا بیست ساڵە پەیامەكانی نوور، كـە تەفسیری قورئـانی پیرۆزن، وانـەكانی ئیمـان و ئیسلام و ڕەوشت بەرزی بە ملیۆنەها كەس دەڵێنەوە و لە ئیلحاد دەیانپارێزن. خۆ ئەگـەر لە پێناوی ئەم پەیامانەدا بڕیاری ئیعدامیشم بۆ دەربكرێت ئەوا بە پەلە و هەڵـەداوان بـەرەو سێدارەكەم هەنگاو دەنێم و هاوار دەكەم: (ألله .. ألله .. یا رسول الله).

ئەو پەیامانەی نوور كە لاوانمان دەپـارێزن لـەوەی بكەونـە باوەشـی شـیووعییەت و لـە ئایین دەربچن و دووچـاری ئـەو بـەڵا و گرفتانـە بـبن كـە دوا ئـەنجام دەیانگەیەننـە خیانـەتی نیشتمان، كـە تاوانێكـە جگـە لـە ئیعدام هیـچ سزایەكی تـری نیـیـە.. ئەو پەیامانـەی كـە لاوەكانمان لەمانە دەپارێزن، من ئامادەم لە پێناویاندا ئیعدام بكرێـم و بـەر گوللـە بدرێـم و بێ هیچ تـرس و دوودڵـیـیەك سنگم بـۆ ئـەو گوللانـە دەربپـەڕێنم. خـۆ ئەگـەر لـە پێنـاوی بەدیعوززەمانی مامۆستامدا بـە خەنجەر پارچـە پارچـەم بكـەن لـــە خـوا دەپارێمـەوە كـە خوێنەكەم بە دەوروبەرمدا بپرژێت و بنووسێت: پەیامەكانی نوور.. پەیامەكانی نوور!

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

خوێندنـەوەی پەیامـەكانی نـوور و بەدەستهێنانی زانسـت لـە ڕێیانـــەوە لــە ڕاسـتیدا شتێكی نوێ و ڕەسەنە و هەرگیز هاوشێوەی نیـیە. چونكە ئامانجی هەر خوێندنێكـی تـر و بەردەوامبوون تیایدا بەرژەوەندیی ماددی یان بەدەستهێنانی پلە و پایەیەكی تایبەتییە. واتە بـەردەوامبوون لـەو خوێندنانـەدا زۆربـەی جار لەبـەر هیـچ حـەزێك نییـە، بـەڵكو بـۆ بەدەستهێنانی سوودی ماددی و ناوبانگە. بەڵام پەیامەكانی نـوور وەك زانكۆیـەكی ئـازاد وایە و ئـەو كەسـانەش لـە ڕێـی خوێندنـەوەی پەیامـەكانی نـوورەوە لـەو زانكۆیـەدا دەوام دەكەن هیچ ئامانجێكی دنیایان نییە، بەڵكو مەبەستیان تەنها خزمەتی ئیمان و قورئانە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئـەم پەیامانـەی نـوور كـە دانراوێكـی جیددیـی زانسـتی و ئیمـانین، بەوپەڕی حەز و شەوق و چێژ و خۆشحاڵییەوە دەخوێنرێنەوە، كـە ئەمـەش لـە ڕادەیـەكی وەهادایە كـە ئەوانـەی بـە ڕاستی و دروستی دەیانخوێننەوە، لـە خۆیـاندا هەسـت دەكـەن بەوەی حەزیان لە خوێندنەوەی چەندین جارە و یـەك لـە دوای یـەكی ئـەو پەیامانەیـە. ئـەو كەسـانەش كـە پەیامـەكانی نووریـان بـە نووسـینی دەسـتی نووسـییەوە و خوێندنیانـەوە، كـاتێك بـران بـۆ دادگـاكـان و ژیانیـان كەوتـە مەترسـییەوە، بـە ئاشـكرا دانیـان نـا بـە خوێندنەوەی پەیامەكانی نوور و نیازی بەردەوامبوونیان لەسەر خوێندنەوەی. خۆ ئەگەر

بە دڵنیاییشـەوە بیانزانیایـە کـە بڕیـاری لـە سێدارەدان لـە دژیـان دەردەچێـت، هـەر لـەم هەڵوێستە نـەگۆڕەیان پەشیمان نەدەبوونەوە. ئەمـەش تایبەتکاری‌یـەکی نێـوان سـیفەتە نائاسایی و ناوازەکانی پەیامەکانی نوورە کە لەوانەیە هانتان بدات ئەم پرسیارە بکەن:

(ئایا ئەوانە تا ئەم رادەیە گیانی خۆیان بەلاوە سووك و کەم نرخە)؟

کەواتە ڕاستی‌یەکی بەرز لە پەیامەکانی نوور و بـەدیعوززەماندا هەیـە و، دەبێـت هیـچ شتێکی زیانبەخش لەو کتێبانەدا نەبێت؟ چونکە نکوڵی‌یـان لـە خوێندنـەوەی ئـەو پەیامانـە نەکرد.

قوتابیانی خوێندگاکان بۆیە وانەکانیان دەخوێنن چونکـە هێزێك ڕێـسا و خوێندنیـان بەسـەردا دەسـەپێنێت، بـەڵام بـەدیعوززەمان بـە زۆرەملـێ کەسـی ناچـار نـەکردووە پەیامـەکانی نـوور بخوێنێتـەوە، کـەچی سـەدان هـەزار خوێنـەری پەیامـەکانی هـەن کـە زۆربەیان نەیاندیوە و لـەگەڵ ئەوەشـدا بـە پەیوەندی‌یـەکی توندوتۆڵـی نـەپچڕاو پەیوەسـتی بوون و بە ڕەزامەندیی خۆیان پێخۆشحاڵن کە قوتابیی پەیامەکانی نوور بـن و وانـەکانی خۆیانی لـێ وەربگرن.

ئەم ڕێـسا ڕەنگین و ناوازە و نائاسایی‌یەی وانـە وتنەوە، نـە لـە مێـژووی کـۆن و نـە لـە مێژووی هاوچەرخ و نە لە هیچ زانکۆیەکدا تا ئێستا نەبینراوە.

بـەڕێز داواکـاری گشـتی پێـی وتم: (ئـەو ڕێـزەی کـە بەرامبـەر بـەدیعوززەمان دەری دەبڕیت لە ئاستی تەفسیرنووسەکانی تردا نایبینێنیت).

بەڵێ ڕاستە، چونکـە ڕێـز و ئیحتیـرام هاوڕێژەیـە لەگـەڵ پلـەی کـەماڵ و تـەواویدا و، منـەت و سوپاسـگوزاریش هـاوڕێژەن لەگـەڵ ئـەندازەی سـوودی بەدەسـتهاتوو. خـۆ گـەورەیی ئـەو سـوودەی کـە لـە نووسینەکانی بـەدیعوززەماندا بەدەسـت دەهێـنرێت لـە دانراوەکانی تردا نایبینین.

ماسۆنی و شیووعی‌یەکان تێدەکۆشن کە ئێمە، بە تایبەت لاوەکانمـان، بـەدیعوززەمان نەناسین کـە یەکێکـە لـە گـەورەترین نووسـەر و بیریـارە موسـڵمانەکانی سـەدەی بیسـتەم. بـەڵام لاوی تورکـی موسـڵمان و نەتـەوەی ئیسـلام و گەنجــە وریـا و هۆشـیارەکانی ئـەم مامۆستا پێشڕەوەیان ناسیوە و سوودیان لـێ وەرگرتووە و وایان لە خەڵکیش کردووە کە سوودی لـێ وەربگرن.

هەر ئەمەیـە هـۆی ئـەوەی کـە پـەیوەندیی توندوتـۆڵ بەرامبـەر بـەدیعوززەمان و متمانـە بوون پێی هەرگیز ناپچڕێت و لەرزەی پێ ناکەوێت.

جا لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور بە کارامەییەکی لەڕادەبەدەر و بە زمـانی تورکیـی خۆمـان ئایەتـەکانی قورئـانی پیرۆز تەفسیر دەکـەن، بێ ئـەوەی ئـەو ئایەتانـە تایبـەتکاریی خۆیان لەدەسـت بدەن، کـە گـەورەترین مـوعجیزەیانە، ئەوا هـەموو چینەکانی گـەل، بـە ژن و پیـاو، کارمـەند و پیشـەوەران، زانایـان و فەیلەسـووفەکان دەتوانـن بیانخوێننـەوە و سوودیان لـێ وەربگرن. ئنجا لە ئاکامی ئەو سـوودانەی کـە هەرکەسـەیان بـەپێی توانـای خۆی لەو پەیامانەوە بەدەستیان دەهێنێت.. پەیوەندییان بە پەیامەکانەوە پتر زیاد دەبێـت. ئەوەتا هـەموو چینەکانی گـەل دەیانخوێننـەوە: قوتابیـانی دوانـاوەندی، قوتابیـانی زانکـۆ، مامۆستایانی زانکۆ، فەیلەسووفەکان. وێڕای ئەوەی کە ئەم هەموو چینە ڕۆشـنبیرە سـوود لـەم پەیامانـە وەردەگـرن، هەرهەموو شیان بـە یـەك دەنـگ قسـەیان لەسـەر ڕەنگینـی و ناوازەیی ڕوونیی دانان و شێوازی پەیامەکانی نوور یـەکی گرتـووە و، زیـاتر تاسـەمەندی خوێندنەوەی سەرجەمی گشتی ئەم پەیامانەن.

هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە تـازەکی بـەدیعوززەمان و پەیامـەکانی نووریـان ناسـیوە لـە کەسانی وریا و خاوەن تێگەیشتنی ساغ و بێ عەیب، داخـی ئـەوەیان لەدڵدایـە کـە پێشـتر بەم پەیامانە ئاشنا نەبوون. جا بۆ ئەوەی قـەرەبووی ئـەو مـاوە لەدەسـت چـووەی تەمـەنیان بکەنـەوە کـە درەنـگ پەیامـەکانی نووریـان ناسیوە، دەچـن هـەموو هـەلێکی ڕەخسـاو، تەنانەت با پێنج خولەکیش بێت، دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی پەیامـەکانی نـووری بـە بـەردەوامی تێدا بخوێننـەوە! ئـەم حـەزە لەڕادەبـەدەر و پەیوەندییـە توندوتۆڵـە بەرامبـەر نووسینەکانی هیچ زانایەکی کۆمەڵناسی یان دەروونناسی یان هیچ فەیلەسووفێك نەبینراوە و، تەنیا ئـەو کەسـانەی خوێندنیـان تـەواو کـردووە سـوود لـە کتێبـەکانی ئەوانـە وەردەگـرن. ئـەوەتا هەرکات قوتابییەکی ناوەندی یان ئافرەتێك کە تەنـها فێری خوێندنـەوە بووبێـت کتێبـی فەیلەسـووفێك بخوێنێتەوە سـوودی لـێ وەرناگـرێت، کەچی هەموو توێژەکانی کۆمـەڵ – هەرکەسەو بە پێی توانای خۆی – سوود لە پەیامەکانی نوور وەردەگرێت!

لەبەر ئەوە، سەرتاسەری نەتەوەیەك بە تاسەمەندییەوە چاوەڕوانی بڕیـاری بێتـاوانیی بەدیعوززەمان و قوتابیانی نوور دەکات لە دادگاکەی ئێوە.

خۆ ئەگەر سەعیدی نوورسی وانەی ئارامی و خۆڕاگریی بۆ كاتی مەینەتی و تەنگانە بە قوتابیانی خۆی نەوتایەتەوە، وەك ئەوەی كە قوتابیانی لە دەمی جەنگدا كۆ كردەوە لەو كاتەدا كە فەرماندەی خۆبەخشەران بوو، ئەوا هەر ئێستا هەزاران قوتابیی نوور خێوەتیان لەسەر تەپۆلكەكانی شاری "ئافیوون" هەڵدەدا و، چاوەڕوانی دەرچوونی بڕیاری "بێ تاوانیی" بەدیعوززەمان و پەیامەكانیان دەكرد لە دادگای تاوانە گەورەكانی شاری ئافیوون!

تا ئێستا كەس نەیتوانیوە ئەوە بچەسپێنێت كە چالاكیی سەعیدی نوورسی و قوتابیانی نوور لە ڕووی یاساییەوە دەكەوێتە چوارچێوەی چالاكییەكانی كۆمەڵەیەكی نهێنی. ئایا بۆچی ناتوانرێت ئەوە بسەلمێنرێت؟ گەر كەسێك یاوی یاسا بێت و لە پسپۆڕیی خۆیدا یەك لە دوای یەك پلەكانی ببڕێت و بەرز بووبێتەوە هەتا گەیشتبێتە پلەی "داواكاری گشتی" ئایا دەستەوسان دەبێت لەوەدا كە لە ڕووی یاساوە ئەوە بچەسپێنێت؟ نەخێر هەرگیز لەوەدا دەستەوسان نابێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕاستیدا پێكهاتنی كۆمەڵەیەكی نهێنی لەگۆڕێدا نییە ئەوا لە توانای هیچ كەسێكدا نییە بوونی كۆمەڵەیەكی لەو جۆرە بچەسپێنێت!

لە سەرەتاوە داواكاری گشتی وتی: (قوتابیانی نوور كۆمەڵەیەك نین). ئەم ڕا و بڕیارەشی ڕاست و دروست و لە چوارچێوەیەكی یاساییدا بوو. كەچی پاش كەمێك - كەسیش نازانێت بۆچی - وتی: (ئەوان كۆمەڵەیەكن)! دیارە ئەم هەڵوێستە ناسازی دەردەخات لە نێوان ئەو دوو گوفتارەیدا. بێ گومان ئەمەش وەك ڕایەكی خۆی دەری بڕیوە، نەك بڕیارێك. ئێمە دڵنیاین لەوەی كە دەستەی دادگا لەم ڕاستییە تێدەگات و بڕیار دەدات كە: (هیچ كۆمەڵەیەك لە گۆڕێدا نییە كە پەیوەندییان بە یەكەوە گرێ بدات).

ئەی دادوەرە بەڕێزەكان!

ئەگەر دڵی مرۆڤ وا ڕابهاتایە كە لە ساتی خەفەت و پەژارەدا لەت لەت ببێت، ئەوا دەبوو ئەو دڵە لەكاتی بیستنی هەواڵی كەوتنە خوارەوەی لاوێك بۆ ناو كەندەڵانی ئیلحاد بە ژمارەی گەردیلەكانی پارچە پارچە ببوایە.

کەواتە دەرکردنی بڕیاری (بێ گوناهی) سەبارەت پەیامەکان و دانەرەکەیان لە لایەن دادگاوە فاکتەرێکی کارا دەبێت بۆ ڕزگـار کردنی لاوانی ئیسلام و جیهانی ئیسلامی لەو دێوەزمە سامناکە. هەر ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بە پەیوەندییەکی نەپچڕاو من بە بەدیعوززەمان و نووسینەکانیەوە پەیوەست دەکات.

ئەو بڕیاری بێ گوناهییەی کە دەری دەکەن بۆ پەیامەکانی نوور و بـواردان بـە بڵاوبوونەوەیان، لاوانی تورك و موسڵمان لە گرفتی ئیلحاد دەپارێزێت. چونکە ئەو پەیامانەی نوور کە گەنجینەی ڕاستییە بەرزەکانن ڕۆژێك دێت کە بێ هیـچ گومانێك لـە سەرانسەری دنیادا دەناسرێن و ناوبانگ دەردەکەن. جا لەسەر ئەم بناغەیە، پێم وایە ئێوە بەم بڕیارەتان مایەی ڕێزلێنانی سەرجەمی گرۆی ئادەمیزاد دەبن و، نەوەکانی ئێستا و داهاتوو سوپاسی دەرکردنی ئەو بڕیاری بێ تاوانییەی ئـەوانتان ئاراستە دەکـەن و، هەرکاتێك پەیامەکان بخوێننەوە و سوود لە ڕێژنەی گەورەی ئەو پەیامانە وەربگرن بە ڕێزەوە باستان دەکەن.

خۆ کە من بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەم وشانەتان پێ دەڵێم، وا گومـان نەبـەن دووڕوویی و مەراییتان لە بەردەمدا دەکەم.. نەخێر هەرگیز گومانی وا مەبەن.. چونکە من لە دادگایەکدا کە دادگایی بەدیعوززەمان بکات سڵ لە کەس ناکەمەوە و لە هیچ کەسێکیش ناترسم!

بەڵام تکام وایە بوارم بدەن ڕوونکردنەوەیەکی کورت بخەمە ڕوو:

ئەگەر داواکاری گشتی لەسەر ئاراستەکردنی ئەو تۆمەتە ناڕەوایانە سەبارەت بە پەیامەکانی نوور و دانەر و خوێنەرانیان بەردەوام بێت، لە کاتێکدا کە ئەو پەیامانـە چارەسەرێکی کاریگەرن لە دژی شیووعییەت و ماسۆنییەت لەم نیشتمانە پیرۆزەدا.. هەروەها ئەگەر واز لە هەڵچوون و تۆمەتە هەڵە و هەست و سۆزە تایبەتییەکانی خۆی نەهێنێت، ئەوا دەبێت بە یارمەتیدەری ماسۆنییەت و شیووعییەت و هۆکـاری گەشەکردن و بڵاوبوونەوەیان.

* * *

## بەشێکی ئەو لائیحەیەی کە پێشکەشی دادگای تەمییزکرا:

پەیامەکانی نوور لە ڕێگای بەڵگەهێنانەوەیانەوە، ئیمانی شل و شێواوی هەموو ئەو کەسانە بە توندوتۆڵی دادەمەزرێننەوە کە شوبهە و گومانی ڕێکخراوە ئیلحادییەکان کاریان تێ دەکات.

یەکێك لە نهێنییەکانی پەیوەندیی توندوتۆڵی لاوان بە پەیامەکانی نوورەوە و دەستگرتنیان پێیانەوە، کە لە ڕادەیەکدایە بە وێنەی تەزووی کارەبا جێدەستی ئەو پەیامانە لەواندا دیار و نمایانە، ئەمەی خوارەوەیە:

بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی ماوەی چەندین ساڵە لە بەرامبەر هەموو جۆرەکانی چەوسانەوە و ئازاردانەوە، کە لە لایەن دوژمنە شاراوە و پەنهانەکانی (لە ماسۆنی و شیووعییەکان و خەڵەتاوانی سەر دەستی ئەوان)ەوە ئاراستەی کراوە هێندە خۆنەویستی و قوربانی و خۆبەختکاریی نواندووە کە هەرگیز وێنەی نییە، بە تایبەت لە دەمی پیری و نەخۆشیدا، کە قۆناغێکە مرۆڤ تیایدا پێویستی بە چاودێری و بایەخ پێدانە، کەچی ئەو هێندە خۆڕاگری و ئارامی نواندووە لە باسکردن نایەت..

هەروەها بەهۆی سەرنجدانی ورد و تێبینییە واقیعییەکانی خۆیشیەوە هەستی بەو پیلانە سەرسووڕهێن و پەنهان و فرت و فێڵە ترسناکانە کردووە کە لە دژی ئیمان ساز کرابوون و، زانیی بە چ شێوازێك لە ڕێی نووسراوە ئیمانییەکانیەوە ئەو پیلانانە پووچەڵ بکاتەوە.

بەڵام ئایا ئەوە جێی داخ و ئازار نییە کە ئەم پێشەوا ئیسلامیی و کەسایەتییە مەزن وناوازەیە ماوەی بیست و پێنج ساڵە ئازاری بەندی و زیندانی تاکەکەسی دەچێژێت و هەوڵی لەناوبردنی دەدرێت؟

خۆ ئەگەر دانەری پەیامەکانی نوور بەو ئازارانەوە بتلێتەوە، تەنانەت گەر لە ئەنجامی وەهم و گومانی سووکایەتی کردنی شیووعییەکان و پیلانەکانیانەوە سزاش بدرێت، ئەوا خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور، بەوپەڕی حەز و شەوق و پێخۆشحاڵییەوە، لە لایەن خوێنەرانیەوە لە زیادبووندایە.

یەکەم بەڵگە و گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو لاوانەیە کە پەیامی (عەسای مووسا)یان بە پیتە نوێیەکان خوێندەوە، ئێستا دەستیان داوەتە فێربوونی پیتەکانی قورئان، تاکو بتوانن پەیامەکانی تریش بخوێننەوە! بەم جۆرە، بەربەستێکی گەورەیان لە بەردەم خۆیاندا رووخاند، کە نەزانینی خوێندنەوەی خەتی قورئانی پیرۆزە و، تا ئێستا رێگرێك بووە لە بەردەم فێربوونی زۆر زانستدا و، پیلانێك بووە بۆ ناچارکردنیان لەسەر خوێندنەوەی زۆر لەو کتێبانەی کە بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لە ئایین و ئیمان دانراون.

خۆ هەرکاتێك لاوانی هەر نەتەوەیەك رووەو قورئان و ئەو زانستانە بڕۆن کە رووناکی‌یان لە قورئانەوە بەدەست هێناوە و، خۆیان بەو زانستانە تەیار و پڕچەك بکەن، ئەوا ئەو نەتەوەیە یەکەم هەنگاوی لەسەر رێگای پێشکەوتن ناوە.

ئەو لاوانەی کە گیانیان تینووی ئیمان و ئیسلامە، خەریکن لە رێژنەی پەیامەکانی نوور - کە تەفسیری قورئانی پیرۆزە - گیانیان تێراو دەکەن. ئیتر ئەو لاوانەی کە ئیمانێکی یەقینی و زانستی و دامەزراو بەدەست دەهێنن رووبەرووی شیووعییەت و ئیلحاد دەبنەوە و بوار بە فرۆشتنی نیشتمانەکەیان بە دوژمنانی ئیسلام نادەن. تەنانەت گەر شیووعی‌یەکان بیشتوانن مەرەکەب و کاغەز لەسەر زەویدا نەهێڵن، ئەوا لاوانی وەکو من و بگرە پیرانیش ئامادەن لە پێناوی پەیامەکانی نووردا - کە گەنجینەی راستی‌یەکانە - خۆیان بەخت بکەن و، گەر پێویست بکات پێستی جەستەیان دەکەن بە کاغەز و خوێنەکانیشیان بە مەرەکەب، بۆ نووسینەوەی ئەو پەیامانە!

بەڵێ.. بەڵێ.. هەزار جار بەڵێ!

داواکاری گشتی لە ناوەندی تۆمەتەکانیدا دەڵێت:

"بەدیعوززەمان لە رێی نووسینەکانیەوە بیری لاوەکانی زانکۆی ژەهراوی کردووە".

ئێمەش لە بەرپەرچدانەوەی ئەمەدا دەڵێین:

(ئەگەر پەیامەکانی نوور ژەهر بن، ئەوا ئێمە پێویستمان بە چەندین تەن لەم ژەهرە هەیە و، گەر بەرێزیان شوێنێك شك دەبات کە ئەو ژەهرەی بە زۆری تێدا بێت با بە زووترین کات بۆ ئێمەی بنێرێت)!

هەر جارەی کە ئێمەی قوتابیانی نوور گیرۆدەی ستەمی ستەمکاران دەبین، لە کاتێکدا کە لە پێناوی ئیمان و ئیسلامدا خزمەتگوزارییەکانمان پێشکەش دەکەین، ئەوا بەخشینی گیانمان لەناو بەندیخانەکان و لەسەر داری سێدارەکان پێ باشترە تا ئەوەی لەسەر جێ و لەناو پێخەفی حەوانەوەدا ئەو گیانە ببەخشین، چونکە مردنمان بە ستەم لێکراوی لە بەندیخانەدا بەهۆی ئەم خزمەتە قورئانییەمانەوە، بە فەزڵ و چاکەیەکی خوایی دادەنێین و، ئەو چەشنە مردنەمان پێ باشترە لە ژیانێك کە بە ڕواڵەت ئازادییە و لە حەقیقەت و ناوەڕۆکدا ئیستیبدادێکی ڕەهایە.

بەندکراو لە بەندیخانەی ئافیوون:

**زوبەیر گوندوز ئالب**

خەڵکی پارێزگای قۆنیە

* * *

**تێبینی:**

دوای ناردنی ئەم بەرگری و لائیحەی بەرگرییە بۆ دادگای تەمیز، سەرۆکایەتیی دادگای تەمیز بروسکەیەکی خێرای نارد کە تیایدا داوای کردبوو یەکسەری "زوبەیر" لە بەندیخانە ئازاد بکرێت!

* * *

## بەرگریی مستەفا صونگور[1]:

بۆ دادگای تاوانە گەورەکانی شاری ئافیوون!

مەقامی داواکاری گشتی داوای سزادانی منیشی کردووە، بە تۆمەتی پەیوەندی کردنم بە کۆمەڵەی نووریەکانەوە و، هاندانی گەل لە دژی حکوومەت.

یەکەم: هیچ کۆمەڵەیەك لە ئارادا نی‌یە بە ناوی (کۆمەڵەی نووری‌یەکان) و، منیش پەیوەندیم بە هیچ کۆمەڵەیەکی لەم جۆرەوە نی‌یە. بەڵکو پەیوەندیم تەنها بە کۆمەڵەی گەورە و خاوێنی ئیسلامەوە هەیە، کە کۆمەڵەیەکی خوایی و نوورانی‌یە و، مژدەی بەختەوەریی هەمیشەیی و سەلامەتیی هەتاهەتایی بە گرۆی ئادەمیزاد دەدات و، هەزار و سێ سەد ساڵە فەخری کائینات سەروەرمان حەزرەتی محەممەد پێغەمبەر ﷺ دایمەزراندووە و، لە هەموو چەرخ و سەردەمێکدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن شوێنکەوتە و پەیوەندیداری هەیە. سوپاس بۆ خوا بڕیاریشم داوە کە بە هەموو هێز و توانایەکمەوە گوێڕایەڵی فەرمانە پیرۆز و خاوێنەکانی بم.

سەبارەت بەوەش کە داواکاری گشتی قوتابی بوونی من بۆ (پەیامەکانی نوور) بە تاوان و گوناه لە قەڵەم دەدات، دەڵێم:

ئەو پەیامانە فێری ئەرکە ئایینی و نیشتمانی‌یەکانی سەرشانیان کردووم و، تێیان گەیاندووم کە "ئیسلام" خاوێنترین ئایینە و تاقانە ڕێگای بەدەستهێنانی بەختەوەری‌یە بۆ گرۆی ئادەمیزاد. هەروەك فێریان کردووم کە قورئانی پیرۆز ئەو فەرمانەی خوای گەورەیە کە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هاتووە کە ئامادە و بینەری هەموو شتێکە و، سەرانسەری بوونەوەرانیش هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە خۆر و ئەستێرەکان لە ژێر بەڕێوەبردن و توانستی ئەزەلیی ئەودایە و، فێری کردم کە قورئان موعجیزەیەکی خوایی ئەوتۆیە کە ڕوانینی ئەو دەورانەوری هەموو ڕووداوەکانی لە ئەزەلەوە تا ئەبەد داوە و، لە هەموو کتێبەکانی تر بەرز و بڵندترە و، لە چل ڕووەوە

---

(١) لە قەزای "ئەفلانی"ی سەر بە پارێزگای "زەنگولداغ" لە ساڵی ١٩٢٩زدا لەدایك بووە و، لە هەموو بارودۆخێکی ژیانی مامۆستا نوورسیدا هاودەمی بووە و، تا پلەی "فناء في رسائل النور" – وەك مامۆستا خۆی وتوویەتی – قوتابێتیی ئەوی کردووە. هەروەك مامۆستا نوورسی دوای خۆی ئەمانەتی سەرپەرشتیی قوتابیانی نووری بەم و بە چەند برایەکی تری بەڕێزی هاوڕێنەی ئەم سپاردووە. خوا تەمەنی درێژ و بەپیتی پێ ببەخشێت. (وەرگێڕ)

کتێبێکی خاوەن ئیعجازە و، گوفتارێکی ئەزەلیی وایە کە مژدەی بەختەوەریی هەمیشەیی بە سەرجەم گرۆی مرۆڤ دەدات و، تاسەمەندانی وا لێ دەکات کە هەست بە گەورەیی چاکە و منەتی خوای گەورە بکەن بەسەریانەوە. هەروەها ئەو پەیامانە تێیان گەیاندووم کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە رەوانە کراوە و، لە هەموو حاڵەت و بارەکانی ژیانیدا تەواوترین و راست ترین کەس بووە و، لە سەرجەم بوار و لایەنەکانی کەماڵ و تەواویدا لە هەموویان بەرز و بڵندتر بووە و، لە رێی نووری ئاینی ئیسلامەوە گەورەترین مزگێنی و خاوێنترین دڵدانەوەی پێشکەش بە سەرجەمی مرۆڤایەتی کردووە و، پێنج یەکی رەگەزی مرۆڤ لە ماوەی چوارده سەدەی رەبەقدا، لە رێی دەسەڵاتداریی مەعنەویی خۆیەوە، بەڕێوە بردووە و، لە پێش هەزار و سێ سەد و ئەوەندە ساڵەوە هەتا ئێستا هەرچی کردەوەی چاکی نەتەوەکەی هەیە لە دەفتەری کردەوە چاکەکانیدا تۆمار دەکرێت و، هۆی بەدیهێنانی گەردوون و، خۆشەویستی خوایە..

هەروەها پەیامەکانی نوور بە چەندین بەڵگەی درەخشانی هەڵقوڵاو لە قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازەوە، پێی سەلماندم کە دوارۆژ و بەهەشت و دۆزەخ حەق و راستن.

پەیامەکانی نوور بە سەرجەم وشە و رستەکانیەوە شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە لە رێژنەی قورئانی پیرۆز و نووری حەزرەتی محەممەدەوە ﷺ سەرچاوەیان گرتووە، لەو رووەوە کە پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە و تەفسیرێکی تایبەتیی ئەو قورئانەن و، لەو رووەوە کە چەند پەیامێکی عەرشی و ئاسمانین.

بەم جۆرە، ئەو پەیامانەی نوور - کە تۆمەتی ئەوەیان دراوەتە پاڵ خەڵکی لە دژی حکوومەت بورووژێنن - بە هەموو بەشەکانیەوە، وەك: (وتەکان، بریسکەکان، تیشکەکان، مەکتووبات) چەندین وانە لەبارەی راستییە خواییەکان و بناغە و دەستوورەکانی ئیسلام و نهێنییەکانی قورئانەوە پێشکەش دەکەن. ئایا ئیتر خوێندنەوەی ئەو پەیامانە بە تاوان دادەنرێت؟ لە کاتێکدا کە لوتکەی کتێبە دانراوەکانە لە رووی وانە وتنەوە و بەگوێدادانی رەوشتە جوانەکان و فێرکردنی راستییەکانی ئیمانەوە؟!

ئایا نووسینەوەی ئەم پەیامانەی کە بەختەوەریی هەمیشەییمان بە دیاری بۆ دەهێنن، یان گەیاندنی سوودە ئیمانییەکانی ئەم پەیامانە بە برادەرێکی ئیماندار، بە گوناه و تاوان دادەنرێت؟ یان دەکرێ بە هاندانی خەڵك لە دژی حکوومەت لەقەڵەم بدرێت؟ یان ئایا

سەردانی دانەری ئەو پەیامە پیرۆزانە کە گەیشتووەتە لوتکەی ئیمان و ڕەوشت و ئاکارە جوانەکان، یاخود پێکهێنانی برایەتی لە پێناو قورئانی پیرۆزدا لەگەڵ چەند قوتابییەکی نووردا لەوانەی کە بە ئیمانی توندوتۆڵ و باوەڕی دامەزراو پڕچەك بوون و پاراستنی شەرەفی ئیسلام و ڕاستییەکانی قورئانیان لەم چەرخەدا خستووەتە ئەستۆی خۆیان و جگە لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێکی تریان نییە. ئایا ئەم کارانە پێکهێنانی کۆمەڵەیە؟ ئایا چ ویژدانێکی خاوێن و دادگەر دەتوانێت سزا لەسەر ئەم کارانە دابنێت؟

ئەی دادوەرە بەڕێزەکان!

پەیامەکانی نوور - بە هەموو بەشەکانیانەوە - هەر لە (وتەکان) و (بریسکەکان)ەوە تا دەگاتە (تیشکەکان) کە گەورە زانایان دانیان پێدا ناوە و، پلەی ئیمانیی بەرز و شەوقێکی ئیسلامیی گەورە و باڵا بە خوێنەرانیان دەبەخشن، جگە لە تەفسیری قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان هیچ شتێکی تر نین و، هەریەك لە بەشەکانی ئەو پەیامانە نەخۆشییە مەعنەوییەکان چارەسەر دەکەن و تاریکاییە مەعنەوییەکان دەڕەوێننەوە.

مامۆستاکەمان - کە دانەری پەیامەکانی نوورە - سەرانسەری ژیانی خۆی لە ڕێی ئیمان و لە پێناوی قورئاندا بەسەر بردووە و، لەم ڕێیەدا هەموو جۆرێکی ئازار و گیروگرفتی هاتووەتە ڕێ و، بە بڵاوکردنەوەی ئەم ڕاستییانەی قورئانیش لەم چەرخەدا هەوڵی ڕزگارکردنی ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە پیرۆزەی داوە لە هێرشی درندانەی شیوعیەت و هەموو جۆرەکانی ئیلحاد. هەروەك لاپەڕەی سپی و خاوێنی ژیانی ئەو، کە هیچ لەکەیەکی پێوە نییە، شایەتە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئەرکە خاوێنەی خراوەتە ئەستۆ و شایانی هەڵگرتنیشیەتی و، هەرگیز وانەی دوور لە ئاکاری جوان و سەر بە ڕێبازی هونەری کاولکاریی فێری ئێمە نەکردووە، بەڵکو چەندین وانەی لەمەڕ ڕزگارکردنی ئیمانەوە فێر کردووین، کە گەورەترین ئامانجی نەوەی ئادەمیزادە لە سەر ڕووی زەویدا.

ئەم کارەی ئەو کە نزیکەی بیست و پێنج ساڵە ئەنجامی دەدات و هەوڵی داوە لە ڕێی "پەیامەکانی نوور"ەوە ئیمانی سەدان هەزار کەس ڕزگار بکات، بە تایبەت هەژار و داماوانی وەك من کە هیچ شتێکمان لە ئیسلام نەدەزانی و، چەندین وانەی لەبارەی ئیمانەوە پێ وتینەوە کە ئەوپەڕی بەختەوەری و ئامانجی ژیانە. ئەم کارانە - بێ گومان - بە فەزڵ و چاکەیەکی گەورەی خوایی دادەنرێت.

بۆیە ئێمە بە هەموو ئەو کەسانە دەڵێین کـە ڕاستی‌یەکان ئاوەژوو دەکەن و چاو لـەم خزمەتە خاوێنە دەنووقێنن و، بە زیانبەخش ناوزەدی دەکەن بۆ ژیـانی کۆمەڵایـەتی، پێیـان دەڵێین:

ئەگەر ئەو کـارەی ئەنجامی داوە لـە بـواری ڕزگـار کردنـی خـەڵکی لـە چـەندین گیروگرفتی ترسناکی چەشنی دارمانی ڕەوشتی و ئیلحاد و بێ‌ئیمانی و، ڕێنمایی خەڵکی بۆ لای ئیمـان و هـەنگاونان لەسـەر ئەو ڕێگایـەی کـە خـوای گـەورە نەخشـەی بـۆ کێشـاوە و، بانگەواز کـردن بـۆ گوێڕایـەڵیی فەرمانـەکانی ئـایین و بەختـەوەر کردنـی خەڵکی بە بەختەوەریی هەمیشەیی ئیسلام..

ئەگەر بسەلمێت کە ئەم کارانە گوناهـ و تاوان بن، ئەوا ئەو کاتـە دەتوانـن بلێـن: زیـان بە ژیانی کۆمەڵایـەتی دەگەیـەنێت. دەنـا ئـەو دەعوایـە گـەورەترین درۆ و دەمهەڵبەست و تاوانی ئەوتۆ دەبێت کە لێخۆشبوون هەڵناگرێت.

پەیامـەکانی نـوور ئامانجیـان دنیـا نی‌یـە، بـەڵکو ئامـانجی ئـەم پەیامانـە بەختـەوەریی هەمیشەیی و بەدەستهێنانی ڕەزامـەندیی خـوای بـاقی و ئـەزەلی و میـهرەبان و شـکۆمەندە، کە هەموو جوانی و قەشەنگی‌یەکی دنیا تەنها سێبەرێکی کـز و لاوازی جوانیـی ئـەون و، سەرجەم لایەنە ناسك و نیانەکانی بەهەشتیش تەنـها بریسـکەیەکی خۆشەویسـتیی خـوای گەورەن.

جا مادەم ئەم ئامانجە خوایی‌یە خاوێن و نیـازە بێگـەرد و بـەرزە لـە پەیامـەکانی نووردا هەیە، ئەوا من هەزار جار پەیامەکانی نـوور لـەوە خـاوێن و بـەرزتر ڕادەگـرم کـە دابەزنـە ئاستی شتانی نزم و حەرامەوە، کە ئاکـامی وەك: هـاندانی خـەڵکیی لـێ ببێتـەوە لـە دژی حکومەت. پـەنا بـە خـوا دەگریـن لـە شـەڕ و زیـانی ئەوانـەی کـە نایانـەوێت کاروبـاری ئایینمان فێر ببین و خزمەتی ئیمانەکەمان بکەین و، دەچن ئەو چەشنە درۆ و بوختانەمان بۆ هەڵدەبەستن بە نیازی ئەوەی لەناومان بەرن.

دادوەرە بەڕێزەکان!

هەرگیزاو هەرگیز ناتوانرێت ڕووناکیی پەیامەکانی نوور بکوژێنرێتـەوە! گـەورەترین بەڵگەش ئەوەیە کە سەرباری ئەو هەوڵانەی لە ماوەی بیست و پێنج ساڵدا بۆ لـەناوبردنی ئەم پەیامانە دران، کەچی بە پێچەوانەی ئەو ئامانجەوە، پەیامەکان درەخشـانتر بـوون و پـتر بـڵاو بوونـەوەیان بەدەسـت هێنـا، چونکـە خـاوەن و پشـت و پـەنای ئـەو پەیامانـە خـوای

گەورەی شکۆمەندە کە جڵەوی هەموو شتێکی لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد بە دەستەوەیە و، لەبەر ئەوەش کە ڕاستی‌یەکانی ئەم پەیامانە هەمان ڕاستی‌یەکانی قورئانی پیرۆزن کە خوای گەورە پاراستن و چاودێری‌یانی لە لایەن خۆیەوە دەستەبەر کردووە. کەواتە ڕووناکی‌یەکانی ئەم پەیامانە - پشت بە خوای گەورە - هەر دەمێننەوە و بە بەردەوامی ڕووناکی و تیشکەکانی خۆیان پەخش دەکەن.

دادوەرە بەڕێزەکان!

ئەگەر خوێندنەوە و نووسینەوەی پەیامەکانی نوور، کە بەوپەڕی شەوق و خۆشەویستی‌یەوە ئیمان و ئیسلاممان فێر دەکەن و، جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێکیان نی‌یە و، تەفسیرێکی نوورانیی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیانن لەم چەرخەدا، ئەگەر خوێندنەوەی ئەم پەیامانە بە تاوان دابنرێت..

ئەگەر بەخشینی ئەم پەیامانە، کە ڕاستی‌یەکانی‌ئیمانیان لەخۆ گرتووە، بە چەند برایەکی ئیماندار بە گوناه و تاوان لەقەڵەم بدرێت..

ئەگەر پەیوەندیی ئایینی و برایەتیی موسڵمانان کە ئیمانداران لە پێناوی ڕەزامەندیی خوا و لە ڕێی قورئان و ئیماندا پێکەوە کۆ دەکەنەوە، کە ئەوەش یەکێکە لە فەرمانە خاوێنە موقەددەسەکانی ئایین، ئەگەر ئەم پەیوەندی‌یە بە لای ئێوەوە بە دامەزراندنی (کۆمەڵەیەك) دابنێرت، ئەوا خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە پەیوەندی بەو (کۆمەڵە)یەوە بکەم. تەنانەت بەختەوەری‌یەکی وەهایە کە زۆر لە خەڵات و مەدالیاکان بە گەورەتری دەزانم.

من سوپاسێکی بێ کۆتایی پێشکەش بە خوای گەورە دەکەم کە منەتی لە هەژارێکی داماوی وەك من ناوە و بە لوتف و چاکەکاریی خۆی منی کردووە بە یەکێك لە قوتابیانی پەیامەکانی نوور!

لە کۆتاییدا هەر هێندە دەڵێم:

**﴿حسبُنا اللهُ ونِعْمَ الوكيل﴾.**

**﴿حسبي اللهُ لا إله إلا هو عليه توكلتُ وهو ربُّ العرشِ العظيم﴾.**

مامۆستا:

**مستەفا صونگور**

## لائیحەی بەرگریی مستەفا صونگور لە دادگای تەمیزدا:

١ – دادگای تاوانە گەورەکان، خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور و نووسینەوەیان و بەخشینیان لە لایەن منەوە بە برایەکی موحتاج بەو پەیامانە، تاکو سوودی لێ وەربگرێت، ئەم کارەیان لەسەر من بە تاوان لەقەڵەم داوە. گوایا – بە وتەی داواکاری گشتی – بەم کارەم گەلم لە دژی حکوومەت هان داوە! لە کاتێکدا کە من لە بەرگرییەکەمدا لە وەڵامی ئەم تۆمەتەدا وتم:

ئەو پەیامانەی نوور کە پێتان وایە خەڵکی لە دژی حکوومەت هەڵدەنێن، لە ڕاستیدا جگە لە تەفسیرێکی ڕاستەقینەی قورئان هیچی تر نییە و، بە سەرجەم بەشەکانیەوە چەندین وانە لەمەڕ ڕاستییەکانی ئیمان دەڵێنەوە و، بەختەوەرییەکی یەکجار مەزن بە خوێنەر و نووسەرانیان دەبەخشن. ئنجا هەرگیز شتانی دنیایی و فانی و نزمی چەشنی هاندانی خەڵك لە دژی حکوومەت – کە کاری کەسانی نزم و گێرە شێوێنە – هەرگیز لە ناوەندی ئامانجەکانی ئەم پەیامانەدا نییە، بەڵکو ئامانجیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورەیە، کە بڵندترین پلەکانی بەختەوەری و کامەرانییە.

من شانازی دەکەم بەوەی کە خزمەتگوزارێکی دەستەوسان و قوتابییەکم لە قوتابیانی پەیامەکانی نوور، کە لە دەمی خوێندنەوە و نووسینەوەیان شیرینترین نیعمەت و گەورەترین چاکەیان پێ بەخشیم کە خزمەت و فەزیلەتی ئیمانە.

خۆ هەرچەندە لە بەرگرییەکەمدا وتم: قوتابێتی کردنم بۆ پەیامەکانی نوور گەورەترین چاکەی خوای گەورەیە بەسەرمەوە و بەردەوام شوکر و سوپاسی خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەوەی کە ئەم نیعمەتە مەزنەی بە هەژارێکی وەکو من بەخشی. کەچی وێڕای ئەمە، فەرمانی سزادانیان بۆ دەرکردووم، چونکە پەیوەندی کردنی منیان بە ئیمان و ئیسلامەوە بە تاوان داناوە! بێ ئەوەی لەم بڕیارەدا پشت بە بەڵگە و یاسایەك ببەستن و، بەم کارەشیان – بە ڕاشکاوی – ڕەفتاری دژی حەق و ڕاستییان لەگەڵدا نواندووم.

٢ – من بەش بەحاڵی خۆم شایەتیی ئەوە دەدەم کە کاتێ لە پەیمانگای "گوڵ کۆی" لە "قەستەمۆنی"دا دەمخوێند، هەندێ لە مامۆستاکانی ئەوێ چەند وانەیەکی ئیلحادییان پێ

دەوتینەوە و، دەیان وت: (محەمەد - خوا پەنامان بدات - خۆی قورئانی نووسیوە و، ئیسلامیش لە حوکمی هەلوەشاوەدایە و مەدەنییەت بەرەو پێش دەڕوات. کەواتە شوێنکەوتنی قورئان هەلەیەکی گەورەیە و، تەنانەت کۆنەپەرستیشە).

بگرە یەکێك لەو مامۆستایانە ڕۆژێکیان پێی وتین:

(موسلمانەکان بەردەوام ژیانیان بە خەم و ئازارەوە بەسەر دەبەن، چونکە نوێژ دەکەن و یادی دوارۆژ دەکەنەوە و، کەش و هەوایەکی خەمۆکی بەسەر مزگەوتەکانی ئیسلامدا زالە، بە پێچەوانەی گاورەکان کە هەردەم ژیانیان لە خۆشیدایە و لە کەش و هەوای مۆسیقا و گەمە و گالتەدا بەسەری دەبەن)!

ئەوانە هەولیان دەدا کە سەرجەمی ئەو پەیوەندی‌یانە ببڕن کە دل و دەروونی ئێمە بە ئیمان و ئیسلامەوە گرێ دەدەن و، کوفر و ئیلحاد لە جێگەیاندا دابنێن.

جا لەو کاتەدا کە من ئەم چەشنە بیرە ژەهراوی‌یانە کاریان تێ کردبووم و نزیك بوو ئیمانەکەم لە دەست دەربکرێت و ژیانی ئیمانیم لەناو ببرێت لە ڕێی ئەو وانە ئیلحادی‌یە زیانبەخشانەوە کە لە ڕادەیەکدا بوون تەوژمەکەیان منیشیان ڕاپێچ کرد و لە دەوروبەری خۆمدا - پەنا بەخوا - بلاوم دەکردنەوە.. ئا لەم کاتەدا هەندێکم لە پەیامەکانی نوور خوێندەوە، کە ڕووناکی لە قورئانی پیرۆز وەردەگرن و، بە بەلگەی توندوتۆل و درەخشان ڕاستی‌یەکانی ئیمان و ئیسلام دەخەنە ڕوو، هەر بە بەلگە ئەوەش دەسەلمێنن کە ئایینی ئیسلام هەمیشە هۆکاری بەختەوەری و سەلامەتیی مرۆڤە و، خۆرێکی مەعنەویی وەهایە کە هەرگیزاو هەرگیز ناکوژێتەوە..

ئەم پەیامانە سەرجەمی بیرە ژەهراوی‌یەکانیان لە مێشکی مندا دەرکرد و، ئیمانیان لە دل و دەروونمدا بلاو کردەوە و، لە سایەی ئەم بەختەوەری‌یە بێ کۆتایی‌یەدا باسی حالی خۆم لای مامۆستا بەدیعوززەمان خستە ڕوو کە دانەری ئەم پەیامانەیە و، تاقانە کەسی دلسۆز و میهرەبان و بەوەفا و پێشڕەوی ڕاستەقینەیە. ئەوەشم بۆ باس کرد کە چۆن لە ژیانی بێ‌ئاگایی و گومڕایی ڕزگارم بوو و لەسەر لێواری دەریای نوور و ئیماندا لەنگەرم گرت و، چۆن پەیامەکانی نوور - کە ئیمانی ڕاستەقینەمان پێ دەبەخشن - خۆری هیدایەت و ڕێنماییین بۆ هەموو کەسێکی ئەم سەردەمە و، هۆکاری بەختەوەری‌یانن..

هەروەها ئەوەشم بۆ باس کرد کە بە نووسینی ئەم پەیامانە و بەوەی کە ئەم ئەرکە خاوێنەی خستووەتە ئەستۆ گەورەترین خزمەتی بەرامبەر ئیمان ئەنجام داوە و، کارەکەی نیعمەتێکی گەورەی خوایی‌یە بەسەر هەموو گرۆی مرۆڤەوە، بە تایبەت بۆ ئیمانداران.. هەروەها خەم و پەژارە و بێزاریی خۆیشم لەبەر دەمیدا ڕاگەیاند سەبارەت بەو کارانەی کە دەستە و تاقمەکانی شوێنکەوتەی دەجالی سوفیانی ئەنجامی دەدەن و، دەستدرێژیی چەپەڵانە دەکەنە سەر قورئان و ئیسلام و، چۆن ئەوانە - وەك کەمێك پێش ئێستا باسمان کرد - ئیلحاد لە پێش چاوی ئەم نەتەوە موسڵمان و پاڵەوانەدا دەڕازێننەوە و، هەوڵی ڕووخاندنی بناغە خوایی و ئیسلامی‌یە خاوێنەکان دەدەن کە ملیۆنەها خەڵك پەیوەندی‌یان پێوە هەیە و، بۆ ڕووخاندنی بەختەوەریی هەمیشەیی خەڵك تێدەکۆشن..

هەروەها لای ئەو مامۆستا بەرێزە داخ و خەفەتی زۆر و نەفرەتی لە ڕادەبەدەریشم بەرامبەر بەو شێتانە دەربڕی کە چەپڵە بۆ خراپکاران لێ دەدەن و دەستخۆشیی کاولکاری‌یە نزم و ستەمکارانەکەیان لێ دەکەن.

ئنجا لەگەڵ هاوڕێیانی خوێندنیشم - کە دووچاری دوودڵی بووبوون - کەوتمە گفتوگۆ و، پێم وتن: ( وەرن با خۆمان لە هەوا و ئارەزووەکانی ئەم دەروونە دەرباز بکەین و سەری نەوازش لە بەردەم ڕاستی‌یەکانی قورئاندا دابنەوێنین و بە پەلە خۆمان بگەیەنینە قوتابخانەی نوور کە خەڵکی سەردەم بەرەو ڕێی بەختەوەری ڕێنمایی دەکەن.. وەرن با واز لە درۆ و دەلەسەی ئەو هەرزە و درۆزنانە بهێنین کە چەندین مانگ و ساڵی درێژخایەنە گوێمان لێ ڕاگرت و چەپڵەمان بۆ لێ دا و، وەك حەقیقەتی ڕاستەقینە پێشکەشیان کردین .. وەرن با بەدیعوززەمان بکەین بە مامۆستامان و لە هەموو دڵ و دەروونمانەوە دەستمان بە داوێنی وانەکانیەوە بگرین، کە لە تاریکی بەرەو ڕووناکی دەربازمان دەکات).

بەم جۆرە گوفتارم ئاراستەی ئەو هاوڕێیانەم کرد.

جا ئایا ئەم گوفتارە هی ئەو خۆشحاڵی‌یەی نی‌یە کە لە ئیمانەکەی و خۆشەویستیی قورئان و ئیسلام و دەستگیر کردنی پێیانەوە سەرچاوەی گرتووە و، هی حەز کردنیەتی لەوەی کە هەموو کەسێکی میللەتەکەی ئیمانی تەحقیقی بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی بەختەوەریی هەمیشەیی دەست بکەوێت؟

ئایا پەیوەندی كردن بە خوای گەورە و، ڕوانین بۆ ئیسلام وەك مەزنترین ئایین و سەرچاوەی ڕەوشت بەرزی و مژدەی بەختەوەریی هەمیشەیی و، ڕاگەیاندنی ئەمە بە خەڵكی بە تاوان دادەنرێت؟!

لەم ڕۆژگارەدا لە هەموو لایەكەوە هێرشی ڕووخێنەر دەستی پێ كردووە بۆ سەر ئیسلام و قورئان و، بوختان و درۆ و دەلەسە ئاراستەی قورئان و محەممەد پێغەمبەر ﷺ دەكرێت و هەوڵی سووكایەتی كردن دەدرێت بەو زاتە بەرز و بڵندە. لە هەمان كاتدا بوار بە بڵاو كردنەوەی ئەو كتێبانە دەدرێت كە ژەهری ئیلحاد و خۆدامالین لە ئایین و ڕەوشت بەرزی بڵاو دەكەنەوە و، مەدح و سەنای چەند كەسانێكی نزم و بەدبەخت دەكرێت لە دوژمنانی ئیسلام و كەسانی سەرپێچی كەر لە فەرمانەكانی خوای گەورە و، كارە بیدعەت و ناڕەواكانیان بە ڕێز و تەقدیرەوە ناو دەبرێت و، بڵندیی قورئان و پایە بەرزیی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و مافی لە پێشتر بوونیان بەسەر هەموو شتێكدا، پشتگوێ دەخرێت.

دەبێت ئەوەش بزانین كە "پەیامەكانی نوور" بوونی خوای گەورە ڕوون دەكەنەوە و دەری دەخەن كە سەرانسەری بوونەوەران و گەردوون شایەتی لەسەر "یەكتایی" و پێویستیی بوونی ئەو بەدیهێنەرە دەدات و، لەسەر ئەوەش كە مرۆڤ بەهۆی خوای گەورە بە بیر و ژیری پڕچەكی كردووە باشترین ئاوێنەی تیا دەركەوتنی ناوە جوانەكانی خوای گەورەیە. بۆیە مرۆڤ بە پادشای هەموو بوونەوەران دادەنرێت.

خۆ ئەگەر مرۆڤ پەیوەندی بە خوای پەروەردگارەوە بكات و، خۆی لە گومڕایی و هەرزەیی و گوناهە گەورەكان بپارێزێت، ئەوا لە نێوان پلە هەرەبەرزەكاندا شایستەی پلەی "میوانی بەڕێز" دەبێت و، لە ناز و نیعمەتەكانی بە هەشتی هەمیشەییدا دەمێنێتەوە..

بەڵام ئەگەر بەرامبەر بە بەدیهێنەری خۆی كافر بێت و بڕواتە ناو گومڕایی و بێ ئاگاییەوە و هاوبەشی بۆ بڕیار بدات و سەرپێچی لە فەرمانەكانی بكات، ئەوا لە ئاژەڵ سەر لێ شێواوتر دەبێت و، شایانی نزمترین پلەی ئازاری هەمیشەیی دۆزەخ دەبێت.

هەروەها"پەیامەكانی نوور" دەیچەسپێنن كە قورئانی پیرۆز ئەو گوفتارە بەرزەی خوای گەورەیە كە بڕیار و فەرمانەكانی هەرگیز گۆڕانكارییان بەسەردا نایەت و،

ئـاینی ئیسـلامیش دەستمان دەگرێـت و دەمانبـات بـەرەو باشـترین شارسـتانێتی و، بەختەوەریی ڕاستەقینە و بەردەوامیش بە بێ شوێنکەوتنی فەرمانەکانی قورئان و پەیوەندی پێوە کردنی، هەرگیز بۆ گرۆی ئادەمیزاد نایەتەدی..

ئەمانـە ئـەو شتانەن کـە "پەیامـەکانی نـوور" بڵاویـان کردوونەتـەوە و بـە شـێوەیەکی گومـان بڕ بەڵگەیان لەسـەر هێناوەتەوە. پەیامەکانی نـوور لـە ڕوونکـردنەوەی ئەمانـەوە پلە و پایەی بەرزیان بەدەسـت هێنـاوە، چونکـە لـە موعجیزاتی قورئـان و نـووری خـوای گەورە بەهرەمەندی ڕووناکی بوون.

جا ئایا ئیمان هێنان بەمانە و بڵاو کردنەوەیان بە گوناهـ و تاوان دادەنرێت؟!

ئەوەی سەیر و سەمەرەیە و جێی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە ئەو ڕۆمان و ئەفسانانەی بـۆ گڕ تێبـەردانی ئارەزووە فـانی و نامەشـرووعەکان دەنووسـرێن و، بڵاوکردنـەوەی ئـەو کتێبانەی کە زیان بـە سـەلامەتیی نیشـتمان دەگەیـەنن و هێرش دەکەنە سـەر ئیسـلام و، مـەدح و سـەنای ئـەم چەشنە کتێبانـە.. هـەموو ئەمانـە، ڕێگایـان پـێ دراوە و بـە تـاوان دانانرێن! کەچی نووسینەوەی "پەیامەکانی نوور" لە لایـەن ئێمـەوە، کـە چـەند پـەیامێکن ئەو خۆرە درەخشانەی ئیسلاممان پێ دەناسێنن کە سەدان ملیۆن خـەڵك ڕێنماییـیان لـێ وەرگرتـووە و بەختـەوەریی ڕاستەوخۆیان تێدا بینیـوە و، بانگەشە بـۆ ئیسـلام دەکـەن و پێمان دەناسێنن و مژدەی ڕاستییەکانی ئیمانیان پێیە، هەروەها مەدح کردنی ئەم پەیامانە لە کاتێکدا کە خۆمان بە دەستەوسان و کۆڵەوار دەزانین لە بەرامبەر مـافی تـەواو دان بـە ستایشیان..

ئەم کارە، بە گوناهـ و تاوان دادەنرێت!

ئایا مرۆڤێك لەسـەر زەویدا هەیە کـە هێندەی کێشـی گـەردیلـەیەك ئیمـان لـە دڵیـدا بێت و ئەوەندەی گەردیلەیەکیش پەرۆشیی بۆ سەلامەتیی ئەم وڵات و نەتەوەیە تێـدا بێـت کاری وا بە تاوان دابنێت؟!

دادوەرە بەڕێزەکانی دادگای جەزا!

ئەم داوایەی کە خراوەتە بەردەستی مەقامی بەرزی ئێوە، لە ڕاستیدا دەعـوای ئیمـان و قورئانە.. دەعوای بەختەوەریی هەمیشەیی و ڕزگارییە بۆ ملیۆنەها کەس.

سەرجەمی پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - لە پێشەنگیانەوە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، هەروەها ئەولیا و ئەهلی حەقیقەت و گشت باپیرانی ئیماندارمان کە کۆچیان بۆ ئەودنیا کردووە، هەر هەموویان پەیوەندییەکی مەعنەویيان بەم دەعوا گەورەیەوە هەیە..

ئێوەش هەلی بەدەستهێنانی خۆشەویستی و دوعا و شەفاعەتی ئەو ملیۆنەها بەڕێزانەی ئەهلی حەقیقەتتان لە بەردەستدایە و ئەو ڕاستییە بەرز و بلندەش کە ناوی "پەیامەکانی نوور"ی لێ نراوە و لە بەردەمتاندایە و دەیبینن..

جا ئایا ئامانجی ئەم پەیامانە بەدەستهێنانی پلە و پایە دنیاییە نزمەکانە؟!

یان ئامانجیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورەیە کە خۆی لە خۆیدا بەختەوەریی مەزن و کامەرانی و شادمانیی یەکجار مەزنە کە هیچ شادمانییەکی تری پێ ناگاتەوە؟!

ئایا وشەکانی ئەم پەیامانە مرۆڤ بەرەو ڕەوشتە خراپ و نزمەکان هان دەدەن؟ یان پڕچەکی دەکەن بە ئیمان و دەیڕازێننەوە بە ڕەوشت و ئاکارە بەرز و بەنرخەکان؟

ئەوەتا ئێوە پەیامەکانی نوور لە بەردەستاندایە، کە لە ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆز سەرچاوەیان گرتووە کە نوورێکی خوای گەورەیە..

جا مادەم بەدەستهێنانی ئیمان و کۆچ کردن بەم ئیمانەوە بەرەو ئەودنیا گرنگترین ئامانجی ژیانی مرۆڤە و.. پەیامەکانی نووریش - بەهۆی بەرەکەت و ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە - ڕاستییەکانی ئیمان پێشکەش دەکەن و، سەدان هەزار کەس لە خوێنەران و نووسەرانی لەم ئامانجە نزیك دەکەنەوە، ئەوا هیچ ڕێگایەکی تر نییە لە بەردەم دادگەریی بەرز و خۆشەویستیتاندا بۆ "حەقیقەت"جگە لە وەرگرتن و تێگەیشتنی ڕووی ڕاستەقینەی "پەیامەکانی نوور" و، ڕێزنان لە نرخ و بەهای ڕاستەقینەیان و، زانینی ئەوەی کە قوتابیانی نوور تەنها بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورە تێدەکۆشن و، جگە لەمە هیچ ئامانجێکی تریان نییە.

دادوەرە بەڕێزەکانی دادگای جەزا!

مامۆستای بەڕێزمان"بەدیعوززەمان" کە گەیشتووەتە بلندترین پلەی فەزیلەت و ڕەوشتە بەرزەکان، بەو هەموو سۆز و شەفەقەت و میهرەبانییەی کە خوای گەورە پێی

بەخشیوە، لە هەوڵی ئەوەدایە کە مرۆڤ لـە شـەوەزەنگی "فیکـر"ی تـاریك و بەندیخانـەی هەتاهـەتایی رزگـار بکـات و، لـە پێنـاوی ئـەرکی سەرشـانی لەمـەڕ بڵاوکردنـەوەی ڕاستییەکانی قورئان هەموو جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیەکی هەڵگرتووە..

ئەم مامۆستایەمان بە ناحەق و بە پێچەوانەی "دادگەری" دەخرێتە بەندیخانەکانەوە، لـە کاتێکدا مرۆڤێکی نەخۆش و پیرێکی بەتەمەن و بێ خاوخێزانە. هـەموو ئامـانجێکی ئـەو تەنها ڕزگار کردنـی ئیمـانی خەڵکییـە لـە ڕێـی ئـەو زانستە مـەزن و زیرەکییـە نـاوازە و ئیمانە بەرز و خواپەرستییە گەورەیەی کە خوا پێی بەخشیوە.

دڵی مرۆڤ لە ئازاری ئەو سەختی و گیروگرفتانە وەختە لەت ببێت کـە ئـەم مامۆسـتا پیرۆز و خێرخوازەی مرۆڤایەتی لە بەندیخانەی (ئـافیوون) گیرۆدەیـان بـوو، لـەو سـەرما و سۆڵە سەخت وئازارە گەورە و تەنگوچەڵەمە زۆرانەی هێنرانە ڕێی ئەوی تەمـەن حـەفتا و پێنج ساڵ!

بۆیــە ئێمــە لــە دادگەرییــە بەرزەکــەتان کــە پەیوەســتە بــە ڕاســتییەکانەوە و لــە خۆشەویستیتان و پەیوەند بوونتان بە خۆشەویستی و مرۆڤایەتی، چاوەڕوانی دەرکـەوتنی شەفەقەت و میهرەبانیی دادگەریتانین.

**مستەفا صونگور**

* * *

### بەرگریی محەممەد فەیزی[١]:

بۆ دادگای تاوانە گەورەکان لە شاری (ئافیوون)!

داواکاری گشتی منی بە سکرتێری مامۆستام: "سەعیدی نوورسی" لەقەڵەم داوە، ئنجا ئەمە و پەیوەندیی توندوتۆڵم بەو مامۆستایە و بە پەیامەکانی نوورەوە و، خزمەتکردنی گەورەم لەم بوارەدا، بە تاوانێکی ئەوتۆی داناوە کە پێویستی بە لێپرسینەوەی یاسایی هەبێت..

منیش لە لایەنی خۆمەوە و بە هەموو هێزێکمەوە دەڵێم: بەم تۆمەتە ڕازیم و شانازیی پێوە دەکەم! چونکە من کەسێکم خوای گەورە بە سروشت حەز و تاسەمەندیی بۆ زانست تێدا دروست کردووم. بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە من حەزم لە زانستە، ئەوەیە کە لە ڕووداوی دەستگیر کردنمان و بەندکردنمان لە دەنیزلی ماڵەکەی منیان پشکنی و، پێنج سەد و هەشتا کتێبی زانستی و عەرەبییان تێدا دۆزییەوە و ناوی هەموشیان بە شێوەیەکی ڕەسمی نووسرا.

خۆ هەرچەندە من کەسێکی هەژار و دەست کورتم و لە سەرەتای تەمەنمدام و زمانی عەرەبی بە تەواوی نازانم، کەچی ئەوینی زانست و حەزی زۆرم لە فێربوون وای لێ کردم کە ئەم کتێبە جۆراوجۆرانە کۆبکەمەوە و دەستی خۆمیان بخەم، کە لە هەزار کەسدا مەگەر یەکێکیان کتێبی وایان ببێت.

جا ئەم سروشتە زانستییەم هەردەم هانی دەدام بە دوای مامۆستا و ڕابەرێکی ڕاستەقینەدا بگەڕێم. سوپاسی نەبڕاوەم بۆ خوای گەورە کە لە نزیکەوە بۆ لای ئەو کەسە ڕێنمایی کردم کە من پێم وابوو لێمەوە دوورە.

بەڵێ، ژیانی سەعید نوورسیی مامۆستام شایەتی دەدات کە تاکە ئامانجی لە ژیاندا حەز و تاسەی زانست و بەدەستهێنانی زانستە ئیسلامییەکانە. ئنجا لە ئاکامی بینینەکانی خۆم و خوێندنەوەی مێژووی ژیانی - کە کتێبێکی چاپکراوە - و ئەو زانیارییانەش لە

---

(١) سالی ١٩١٢ز لە قەستەمۆنی لە دایك بووە و، هەر لەوێش ماوەی شەش ساڵ لە خزمەت مامۆستا نوورسیدا بووە و، لەگەڵ ئەویشدا سالی ١٩٤٣ لە "دەنیزلی" و سالی ١٩٤٨ لە "ئافیوون" بەند کراوە. سالی ١٩٨٩ز کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

قوتابیانی پێشووی وەرم گرتووە، دڵنیا بووم لەوەی کەئەم حەزە سروشتی‌یەم لە زانست، بە شێوەیەکی دەراسا لـە لای مامۆستاکەشم هەیـە، بە ڕادەیەك کـە تـا ئێستاش - بـە پێچەوانەی هەموو ئەو زانایانەی کە لە قوتابخانە ئیسلامی‌یە کۆنـەکان دەرچوون - هـەر پارێزگاریی لە سیفەتی "قوتابی زانست" کـردووە و نـاوێکی تـری لـە خـۆی نـەناوە، هـەر ئەمەش بووە کە هێز و وره و توانای پێ بەخشیوە هەموو بەڵا و گیروگرفتێك هەڵبگرێت.

جـا لـەبـەر ئـەوەی سیاسـەتمەداران نـەیانتوانی لـەم بارودۆخـە سەرسـووڕهێنەرانەی مامۆستام تێ‌بگـەن، ئـەوا هـەوڵیان دا ئـەو بارودۆخانـەی ژیـانی بـە جـۆرە سیاسـەتێك پەیوەسـت بکـەن کـە ئـەو هیـچ پەیوەندی‌یـەکی پێـوەی نی‌یـە، تەنانـەت گرفتـاری بەندیخانەشیان کـرد. بـەڵام خـوای گـەورە ئـەم شـەیدا بوونـی زانستەی بـۆ ئـەو کـرد بـە کلیلێك بۆ ڕاستی‌یەکانی قورئان، ئەوەبوو لە ئەنجامی ئەمەدا "پەیامەکانی نوور" سـەریان هەڵدا کە سەرجەم زانایان و فەیلەسووفانی مات و سەرسام کردووە.

لـەم کاتـەدا بـوو کـە لـە شـاری "قەستەمۆنی" و لـە نزیـك و تەنیشـتی خۆمـەوە ئـەو مامۆستایەی خۆمم دۆزی‌یەوە کە بەو سروشتەم شەیدای زانستە هەموو تەمەنم بە شوێنیدا دەگەڕام.

ئەمەش بە چاکەیەکی خوای گەورەی دەزانم و، تا دواهەناسەی ژیانم شوکری خـوای گەورەی لەسەر دەکەم.

مامۆستام بۆ ئەوەی پارێزگاری لە عیززەت و پلە و پایەی زانست بکـات، نـە ئێستا و نە لەوەوپێش سەدەقە و دیاری و شتانی هاوشێوەیان وەرناگرێت و وەریشی نـەگرتووە و، نایەڵێ قوتابیانیشی وەری بگرن و، سەری بۆ هیچ کەسێك نەوی نەکردووە.

یەکێك لە ڕەفتارە نائاسایی‌یەکانی ئەوەیە کە لە جەنگ و بەرەی پێشـەوەی شـەڕدا بـە مـەبەسـتی پارێزگـاری کـردنـی عیـززەتی زانسـتی خـۆی ڕازی نـەبووە بڕواتـە نـاو سـەنگەرەوە و، لـە بـەردەم سـێ سـەرکردەی ترسێنەریشـدا[١] هەڵوێسـتی مامۆسـتایەکی نواندووە کە پارێزگاری لـە عیزەتی زانستی خۆی بکـات، بـێ ئـەوەی گـوێ بـە ڕق و تووڕەیی ئەوان بدات، تەنانەت بێدەنگیشی کردوون!

(١) مەبەست: خورشید پاشایە لە دادگای ئیتبحادی‌یەکاندا و، مستەفال کەمال و، نیقۆلا نیقۆلا فیچە. (وەرگێڕ)

جا لەبەر ئەوەی دەزانم کە ئەم مامۆستایەم پارێزگاریی شەرەفی ئەم نەتەوە و نیشتمانە و شەرەفی زانایانی تورکیای کردووە و لەو پێناوەدا هەموو شتێکی بەخت کردووە، ئەوا بە مامۆستای ڕاستەقینەی خۆمم قبووڵ کردووە. خۆ ئەگەر بە فەرزی مەحاڵیش بڵێین: سەد عەیب و ناتەواویی تێدایە، ئەوا دەبێ بە چاوی لێبوردەیی بۆی بڕوانین و ڕەخنەی لێ نەگرین.

نیشتمان پەروەرانی سەردەمی مەشرووتیەت و سەردەمی کۆماری ڕێزیان لەم مامۆستایە ناوە. نموونەی ڕێزنانیان بۆ خزمەتە مەزنە زانستییەکانی ئەم مامۆستایە ئەوەیە کە حکوومەتی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بڕی نۆزدە هەزار لیرەی زێڕیان بۆ بنیاتنانی قوتابخانەکەی مامۆستا (قوتابخانەی زەهراء) لە شاری (وان) تەرخان کرد، کە دەیویست هاوشێوەی "ئەزهەر" بێت. خۆ هەرچەندە بناغەکانی ئەو قوتابخانەیە دانران، بەڵام دەست پێکردنی یەکەم جەنگی جیهانی بوو بەهۆی دواخستنی بنیاتنانی..

بیست و چوار ساڵ پێش ئێستاش، دوای ڕەزامەندی و پشتگیریی سەد و شەست ئەندام پەرلەمان، حکوومەتی کۆماری سەد و پەنجا هەزار لیرەی تایبەت کرد بە بنیاتنانی زانکۆکەی مامۆستا (قوتابخانەی زەهراء).

هەوڵدانی تەنیا کەسەی ئەم مامۆستا بەڕێزە بۆ بنیاتنانی دامەزراندنی زانکۆیەکی هاوچەشنی زانکۆی ئەزهەر کە هەزاران زانا هاوکارییان لە دامەزراندنیدا کردووە و، نزیکبوونەوەی لە هێنانەدیی ئامانجەکەی، ئەوە لەسەر هەموو نیشتمان پەروەرێك و خۆشەویستانی نەتەوە و سەرجەمی زانایانی ئایین پێویست دەکات کە ڕێز لەم مامۆستایە بگرن و ستایشی بکەن.

جا لەبەر ئەوەی ئێمە ئەم مامۆستایەمان دەست کەوتووە، ئەوا ئامادەی هەموو سەختی و گیروگرفتێکین.

من لە لایەنی خۆمەوە خاوێنترین ڕێز و نەوازشم بۆ ئەم زانا هەڵکەوتووە لە دڵدا هەڵگرتووە، چونکە توانیی لە ڕێی ڕێژنە زانستییەکانی و بەرهەمە بەرز و بڵندەکانیەوە کە خۆیان لە سەد و سی کتێب دەدەن، یارمەتیم بدات و بتوانم لەسەر ڕێی زانست و ئیمان بڕۆم و بەردەوام بم، پشت بە خوا هەتاهەتایە ئەم ڕێز و تەقدیرەم بۆی دەمێنێت.

لە گەڵ ئەوەی چەند مانگێك پشكنین بەردەوام بوو تاكو ئەو تۆمەتە بچەسپێت كە داواكاری گشتی ئاراستەی كردووم سەبارەت بە "قۆزتنەوەی ئایین و هەست و نەستە ئایینی‌یەكان بە مەبەستی دامەزراندنی كۆمەڵەیەكی نهێنیی تێكدەری ئاسایشی دەوڵەت" كەچی ئەو هەموو لێكۆڵینەوانە هیچ ئاكامێكی لەو جۆرەیان بەدەستەوە نەدا، چونكە ئەو جۆرە كۆمەڵەیە وجوودی نی‌یە و ئێمەش پەیوەندیمان بە هیچ كۆمەڵەیەكەوە نی‌یە..

تەنیا پەیوەندیمان بە "پەیامەكانی نوور"ەوەیە كە لە بەرامبەر یاساكانی كۆماریدا رۆشتە ناو تاقیكردنەوەیەكی سەختەوە، بەڵام لە لایەن دادگا خاوەن صەلاحیەتەكانەوە بێ تاوانی و لە لایەن دەستە و لیژنە تایبەتەكانیشەوە رێز و تەقدیریان بەدەست هێنا..

ئەم پەیوەندی‌یەش بەم پەیامانەوە هەرگیز بە خیانەت دانانرێت بەرامبەر نیشتمان و نەتەوە، بەڵكو پەیوەندی‌یەكی زانستیی سوودبەخشە بۆ نیشتمان و نەتەوە.

ئیتر جگە لەمەو لە دەرەوەی ئەمەدا هیچ ئامانج و نیازێك لە ئارادا نی‌یە.

جا لەسەر ئەم بناغەیە و، لەبەر ئەوەی بابەتی بێ تاوانی و دڵسۆزیمان تەواو ئاشكرایە.. ئەوا داوا لە دادگای دادگەر و بەرزتان دەكەین كە بە وێنەی دادگای "دەنیزلی" بڕیاری بێ تاوانیمان دەربكەن و، بەمەش دادگەری ئاشكرا بێت و رێ و شوێنی خۆی بگرێت.

**محەممەد فەیزی پاموروقچی**

خەڵكی قەستەمۆنی و

بەندكراو لە بەندیخانەی "ئافیون"

* * *

**بەرگریی ئەحــمەد فەیزی[1].**

بۆ دادگای تاوانە گەورەکان لە شاری "ئافیوون"

ئەی دادوەرە بەرێزەکان!

ئایا ماف و ئەرکی سەرشانی ئیماندار نی‌یە بە خزمەت زانایەکی ئایینی بگات و ئەو کتێبانەی بخوێنێتەوە و بیانووسێتەوە کە پەیوەندی‌یان بە راستی‌یەکانی ئایینەوە هەیە و، لە پێناوی خزمەتی ئایین و قورئان و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ راکات بە فریای برایانی ئایینی‌یەوە؟ ئایا هیچ ماددەیەکی یاسایی رێی ئەم خزمەتە ئایینی‌یەمان لێ دەگرێت؟ ئایا رەخنە گرتن لە چەند لایەنێك لە تەوژمە کافر و نارەوشتی‌یەکان بە تاوان دادەنرێت؟

ئێمە چینێکی ئاییندارى بێ خلتە و غەشی ئەم گەلەین و، هیچ پەیوەندی‌یەکمان نە بە سیاسەت و نە بە کارگێڕیی دەوڵەتەوە نی‌یە.

رێزلێنان و گومان باشی بەرامبەر هەر کەسێك قەناعەتێکی خۆیی و کەسی‌یە. ئێمە لەو باوەڕەداین کە بە دیعوززەمان گەورەترین زانای ئایینی‌یە لەم زەمان و رۆژگارەی خۆماندا و، بە مەردی حەق و راستیی دەبینین و، بێ هیچ دووڕوویی و مەرایی کردنێك بۆ کەس راستی‌یەکانی ئایینی روون کردووەتەوە.

ئێمەش سیفەتی "موجاهید"مان لەو روانگەیەوە بۆ بەکارهێناوە کە خزمەتە ئایینی‌یەکانی خۆی ئەنجام داوە و لە دژی تەوژمە رووخێنەرەکانی ئیمان و رەوشت کە هەڕەشە لە نیشتمانەکەمان دەکەن بەرگریی کردووە و لەمەشدا پشتی بە راستی‌یە رەگ داکوتاوەکانی قورئانی پیرۆز بەستووە.

لە توانای هیچ کەسێکیشدا نی‌یە لەسەر ئەم قەناعەتە زاتی و ویژدانی‌یەمان تاوانبارمان بکات، بە تایبەت کە لە وڵاتێکداین بوار بە ئازادیی بیروڕا دەدات. بۆیە ئێمە خۆمان بە ناچار نازانین ئەو حسابە بە کەس بدەین.

سەبارەت بە باسی ئەو کەسانەش لە ئاخر زەمانْدا دێن، وەك لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، دەڵێم: ئێمە لە خۆمانەوە ئەم بابەتانەمان دروست نەکردووە، چونکە لە ئاییندا هەیە. پێغەمبەر ﷺ خۆی لە هەندێ فەرمایشتیدا فەرموویەتی:

---

(١) خەڵکی یەکێك لە قەزاکانی سەر بە پارێزگای "ئیسپارتە"یە و، لە شاری "ئافیوون" لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەند کراوە. بە بەرگری‌یە بەهێز و توندوتۆڵەکانی بەناوبانگە. ساڵی ١٩٧٢ز لە تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێر)

تەمەنی نەتەوەی محەممەدی لە هەزار و پێنج سەد ساڵ زیاتر نابێت. ئەم فەرموودانە، لە ژێر ناونیشانی "نیشانەکانی قیامەت"دا وەسفی گەلێ ڕووداوی مێژوویی گرنگ دەکەن لە ژیانی ئوممەتی محەممەد ﷺ و ژیانی دنیادا بە گشتی.

ئەو فەرموودانە نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مەترسی‌یەکانی ئەو ڕووداوانە ئاگادار دەکەنەوە و دەفەرموون ئەو کەسانەی بە نەزانی و بێ ئاگایی دەکەونە ناو ئەو خراپکاری‌یانەوە دووچاری بەدبەختی و تیاچوونی هەتاهەتایی دەبن. گەلێ بەڵگەی ئایینی بێ سنوور سەبارەت بەم باس و بابەتانە هەیە.

ئێمەش باوەڕمان بە خوا و پێغەمبەر ﷺ و قورئان هێناوە.

ئایا بە پشت بەستنمان بەم ئیمان و باوەڕە و بە ڕاستیی پێغەمبەر ﷺ هەوڵی ڕزگار کردنی خۆمان نەدەین لە تیاچوونی هەتاهەتایی؟ ئایا چاوی خۆمان لە ئاستی ئەو ڕووداوانە بنووقێنین کە لە دەوروبەرماندا ڕوو دەدەن؟ ئایا بە پشت بەستنمان بە ڕاستی‌یە ئایینی‌یەکان ئەمە ڕوون نەکەینەوە و نەپرسین: (ئایا ئەو زەمانە ترسناکە کاتی هاتووە؟ ئایا ئێمە ئەو بەرە و نەوەیەین کە ڕووبەڕووی ئەم کارەساتە لەناوبەر و ترسناکانە دەبینەوە)؟ ئایا خۆمان لەو بەڵگە درەخشانانە گێل بکەین کە لە بەردەمماندان و، ئەو ڕاستی‌یە دامەزراوە زانستی‌یانە پشتگوێ بخەین کە بوونی خوای گەورەمان بۆ دەچەسپێنن و، واز لە ئایینەکەمان بهێنین و بە دوای ئەو تەوژمەدا بڕۆین کە ئیلحاد بە گەورەترین پایەکانی شارستانێتی ئەورووپا دادەنێت؟

ئەگەر وا بکەین کێ لە تیاچوونی هەمیشەیی ڕزگارمان دەکات؟ ئایا دەبێ خۆمان لەمە گێل بکەین و بیری لێ نەکەینەوە؟ ئایا دەگونجێ کەسێك باوەڕی بەوە هەبێت کە هیچ شتێك نی‌یە لە سەرووی قورئان و ڕاستی‌یەکانی قورئانەوە بێت، لە ترسی چەند سزایەکی فانی، خۆی بهاوێتە ناو باوەشی تیاچوونی هەتاهەتایی‌یەوە؟ ئایا دەگونجێ ئەو کەسە بایەخ بە هەندێ نرخ و بەهای فانی بدات؟ ئایا واز لە ئەرکی سەرشانی دەهێنێت لە بواری خزمەتی خوا و پێغەمبەر ﷺ و ئایینەکەیدا؟

ئەمانەن کە لە ڕاستیدا هۆکاری ڕاستەقینەی پەیوەست بوونمانە بە "بەدیعوززەمان"ەوە.

جا ئایا هیچ سەرچاوەیەکی ئایینی تر شك دەبەن کە تینوێتی "گیان"مان بۆ پێداویستی‌یە ئەزەلی‌یەکان بشکێنێت؟

بەڕێز داواکاری گشتی ئامۆژگاریمان دەکات کە ئەو کتێبە عەرەبی و زانستی‌یانە بخوێنینەوە کتێبخانەکانیان پڕ کردووە و بۆ گیانی ئەم چەرخەمان دەست نادەن. لەوانەیە داواکاری گشتی بەڕێز و ئەو کەسانەش وەك ئەو بیر دەکەنەوە ئەو گەنجینە زانستی‌یەیان پێ باش نەبێت کە لە کۆمەڵی پەیامەکانی نوور و ئەو ڕاستی‌یانەدا خۆیان دەنوێنن لەم پەیامانەدان، تەنانەت لەوانەیە ڕەخنەشی ئاراستە بکەن. ئەوەش پەیوەندیی بە خۆیەوە هەیە و لەو بۆچوونەیدا ئازادە. بەڵام ناتوانێت خۆی لەو خۆشەویستی‌یەدا هەڵبقورتێنێت کە لە دڵماندایە بەرامبەر بەم کتێب یان ئەو کتێب.

ئێمە پڕ بە دڵ "پەیامەکانی نوور"مان خۆش دەوێت و، بە کتێبێکی ڕاستەقینەی ئایینی دەبینین کە دووڕوویی تێدا نی‌یە و، تەفسیری قورئانی پیرۆزە.

پێوەرەکانی تەرجیحدان و فەزڵدانی کتێبێك بەسەر هی تردا مەسەلەیەکی ویژدانی‌یە و لە دڵدایە، کەس ناتوانێت خۆی تێدا هەڵبقورتێنێت و، ئینکاری کردنی داواکاری گشتی و وەرنەگرتنی ئەم ڕاستی‌یە لای ئەو هەرگیز ئەم باوەڕەمان لاواز ناکات و لەرزەی پێ ناخات.

ئێمە لەبەر کەرامەتە گەردوونی‌یەکانی پەیامەکانی نوور نی‌یە کە ئەم پەیامانەمان قبووڵ کردووە، بەڵکو لەبەر دەرکەوتنی ئەو کەرامەتە زانستی‌یە تەواوەی وانەکانی نوورە کە تەحەددای ناوەندە زانستی‌یەکان دەکات.

خۆ هەرچەندە ماوەی زانست خوێندنی دانەرەکەیان لە سێ مانگ تێپەڕی نەکردووە، کەچی زانستی لێ دەبارێت و ئەو زانستەشی بڵاو دەکاتەوە و، لە کارە زانستی‌یە دەراساکانیدا و لە ئاڵۆزترین مەسەلەی زانستیدا مەنتیقێکی هێندە بەرز و بڵند بەکاردەهێنێت کە گەورەترین بیریاران مات و سەرسام دەکات و، شێوازێکی سەرنج ڕاکێشی ڕەنگین و شەوق بزوێن و گەرموگوڕ و پڕ لە عیشق و سۆزی هەڵچوو لە نووسینەکانیدا بەکاردەهێنێت و، بە زمانێك کە دوای نیوەی تەمەنی فێری بووە. تەنانەت نووسینەکانی وەك دەریای‌یەکی ئیمان و گەنجینەیەکی تەوحید و زەریایەکی دانست دەردەکەون..

جا ئایا دەتوانن بەدیعوززەمانێکی تری دووهەممان پیشان بدەن؟ ئێوە پێتان زۆرە کە ئەم پەیکەری فەزیلەتە بە مامۆستای خۆمان دابنێین، لە کاتێدا کە ئاوڕی بە لای هیچ کام لە ڕواڵەتە فانی‌یەکان نەدایەوە و.. بواری بە خۆی نەدا دابەزێتە ئاستی هیچ سوود و بەرژەوەندی‌یەك، با زۆر گەورەش بووبێت، یان بۆ هیچ کام لەو شتانەی مرۆڤ لە کەدار

دەکەن با زۆر بەهێزیش بووبن و.. چاوەڕێی هیچ شتێکی لـە کـەس نەکردووە و بـۆ هیـچ شتێك لـە کـەس نەپاڕاوەتەوە و هـەر شـتێکی بـۆ پێشـنیاز و پێشـکەش کـراوە، وەری نەگرتووە و.. باشترین نموونەی پاکی و خاوێنیی پێـش چـاو خستووە و.. ئارامی لەسەر هەموو سەختی و گیروگرفت و تەنگانەیـەك گرتووە و.. خۆی بۆ دەرخستنی ڕاستی و نوورەکانی قورئـان و زانسـتەکانی پێغەمبـەر ﷺ یـەکلایی کردووەتـەوە.. لـە بـەردەم ئازارەکانی ولات و نەتەوەشدا دڵـە میهرەبانەکەی هـەردەم بە ئـازار و شـەفەقەتەوە لـە گریاندایە؟

وێڕای ئـەم هـەموو غـەدر و سووکایەتی‌یەی هێنرایە ڕێـی، کـەچی هـەر وازی لـەو ئەرکەی سەرشانی نەهێنا کە بریتی‌یە لـە بەختـەوەرکردنی دەوروبـەری خۆی. ئـەوەتا سەرباری پیری و بێ نەوایی خۆی، بە هـەموو هێز و توانایەکی و لـە ڕێی خـوادا گەلـێ هەوڵی سەرومڕی داوە بۆ ڕزگار کردنی خەڵکی لە داوی نەزانی و شەپۆلی ئیلحـاد. خۆ لەم کاتەدا کە هەموو پێوەرە ڕەوشتی‌یەکان تیاچوون، دەبینین ئەو - وێڕای ئەو کەرامەتـە زانستی‌یەی لە سەرەوە باس کرا - نموونەی خۆبەختکاری و خۆنەویستی و ڕاستڕەوی و خاوێنی و، پێشەنگی چاولێکراوی کەماڵ و، میحرابی فەزیلەتە.

جا ئایا ئەمە بە زیادەڕەوی دەبینن لە ئێمەدا؟

کەواتە ئەمەیە تێڕوانینی ئێمە بۆ (بەدیعوززەمان) و نووسراوەکانی.

ئایا پەیوەندیمان پێیەوە کە لە ئیمانەکەمانەوە سەرچاوەی گرتووە.. یان ئایا بەشداری کردنمان لەگەڵ قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان لەوەدا کە کوفر و لەڕێ ترازانی ئەخلاقی بە ناشیرین بزانین، کارێك دەکات کە ئێمە بە چڵك و خاشاکی سیاسەتی فـانی چەپـەڵ و لەکـەدار بکـات؟ ئایـا دەکـرێ سـیفەتی (خراپکـاری) بدرێتـە پـاڵ کردەوەیـەکی (چاکسازی) کە چەند دەروونێکی بێ تـاوانی هـەندێ لـە ڕۆڵـەکانی ئەم ولاتـە ئەنجامی دەدەن کە بیست و پێنج ساڵە بواری فێربوونی ڕاستی‌یەکانی ئایینیان بۆ نەڕەخساوە؟ ئایـا ڕزگـار کردنیـان لـە تیـاچوونی هەتاهـەتایی و پـێ ڕاگـەیاندنی فەرمایشـتەکانی خـوا و پێغەمبەر ﷺ و قورئان بە خراپەکاری دادەنرێت لە دژیان؟

ئەی دادوەرە بەڕێزەکان!

هـەرگیز ئێمـە بابای سیاسـەت نین، چونکە پێمـان وایـە سیاسـەت سـەبارەت بـەو کەسـانەی وەك ئێمـە لـە دەرەوەی ڕێبـازی سیاسـەتدان گەلـێ گیروگرفت و مەترسـی و

بەرپرسیاریی تێدایە و، ئێمەش هیچ بایەخ و گرنگییەك بە ڕواڵەتە فانییەکان نادەین، چونکە تەنها لە ڕووە خێرەکەی دنیاوە بۆ دنیا دەڕوانین کە مرۆڤ دەگەیەنێتە ڕەزامەندیی خوای گەورە. بۆیە زۆر بە توندی بەرپەرچی ئەو تۆمەتە دەدەمەوە کە گوایا ئێمە بە دوای سیاسەتدا ڕادەکەین و نەیاری دەوڵەتین. خۆ ئەگەر ئامانجمان ئەوە بوایە، ئەوا بێ گومان لە ماوەی ئەم بیست و پێنج ساڵەدا بچووکترین دیاردە و نیشانەی ئەوەمان لێ دەردەکەوت.

ڕاستە ئێمە سیفەتی "نەیاری"مان تێدایە، بەڵام لە دژی ئیلحاد و دارمانی ئەخلاقی. ئەم نەیارییەشمان سەرهەڵداوێکی سروشتی و پێویستی بەشداربوونمانە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا کە زۆر بە توندی لەو بابەتانەدا سەرزەنشت و ڕوونکردنەوەکانی خۆی دەرخستووە.

جا ئەگەر ئەو هۆکارە پێویستانەی ڕوونمان کردنەوە، کە لە دڵسۆزی و نیازی خاوێنەوە سەرچاوەیان گرتووە، سەروزیادی ئەوە نەبوون قەناعەتتان پێ بەخشن، ئەوا چ سزایەکتان لە دژمان پێ خۆشە دەری بکەن. بەڵام ئەوەتان لەیاد نەچێت حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - کە شەش سەد ملیۆن نەصرانی خۆیان بۆ لای ئەو نیسبەت دەدەن، لە لایەن پیاوانی حوکمی ئەو سەردەمەوە بە وێنەی دزێکی ئاسایی فەرمانی ئیعدامی بۆ دەرکرا، لە کاتێکدا دڵی بۆ بەختەوەریی ئادەمیزاد و گەیاندنی ڕاسپاردەکەی سەرشانی لێی دەدا.

ئەم گوفتارە سەربەست و ئازادانەیە هانتان دەدات سزایەکمان لەسەر دەربکەن. بەڵام ئێمە بە هەموو شانازییەکەوە پێشوازی لەو بڕیار و سزایە دەکەین.

هەموو ئەو کارەی دەیکەین بەرزکردنەوەی دەستی لاڵانەوەمانە بۆ لای خوای گەورەی ئەنجامدەری پێویستییەکان و، دەڵێین:

﴿حسبُنا اللهُ ونعمَ الوَكيلُ﴾.

**ئەحمەد فەیزی قول**

خەڵکی ناوچەی ئۆرتاقلار و

بەندکراو لە بەندیخانەی "ئافیون"

**بەرگریی جەیلان:**

بۆ دادگای "تاوانە گەورەکان" لە شاری ئافیوون!

داواکاری گشتی کە ئەم باسەی گەورە کردووە و دەنکە دانەوێڵەیەکی هێندەی گومەزێك نیشان داوە، بەشێکی گەورەی ئەو تۆمەتە گومانکراوانەی بە تایبەتی بە هی من داناوە کە ئاراستەی پەیامەکانی نوور کراون و، بە وێنەی پیاوێکی سیاسیی ترسناك و کەسێکی پیلانساز منی پیشانداوە، لەبەر ئەوەی کە خزمەتی مامۆستاکەم و پەیامەکانی نوورم کردووە، کە خزمەتێکە لە ڕاستیدا من شانازیی پێوە دەکەم.

لە بەرپەرچی ئەو تۆمەتەدا دەڵێم:

من پەیوەندیی‌یەکی توندوتۆڵم بە مامۆستاکەم "بەدیعوززەمان"ەوە هەیە، کە سوودێکی هێندە گەورەم لە کتێبە ئایینی و ئیمانی و ڕەوشتی‌یەکانی وەرگرتووە کە ئامادەم لە پێناویدا خۆم و ژیانم بە ئاسانی بەخت بکەم. بەڵام ئەم پەیوەندی‌یە هەرگیز وەك ئەو گومانەی داواکاری گشتی نی‌یە کە زیانی بۆ نیشتمان و نەتەوە تێدا بێت و، لە پێناوی هاندانی گەل نەبووە لە دژی دەوڵەت.

بەڵکو پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵی ئەوتۆیە کە هەرگیز لێك ناترازێت و، لە پێناوی ڕزگار کردنی خۆمانە لە ئیعدامی هەتاهەتایی گۆڕ - کە هیچ کەسێك ناتوانێت لێی دەرباز بێت - و، لە پێناوی ڕزگار کردنی هاوشێوەکانی ئێمەن لە برایانی ئایینیمان لەم ڕۆژگارە پڕ لە مەترسی‌یەدا و، بۆ پاکژ کردنی ڕەوشت و ئاکارەکانیانە بە شێوەیەك کە ببن بە ئەندامی سوودبەخش بۆ ئەم نیشتمان و نەتەوەیە.

من یەکێکم لە کەسە نزیکەکانی، چونکە لە چەند کاتێکی پچڕ پچڕی ماوەی چوار ساڵدا خزمەتم کردووە و، شانازیش بەم خزمەتەوە دەکەم. بە درێژایی ئەو ماوەیە جگە لە فەزیلەتی پاك و بێگەرد هیچ شتێکی ترم لێ نەدیوە و، تەنانەت یەك دانە وشەم لێ نەبیستووە لە بارەی ئەوەی کە "مەهدی" یان "موجەددید" بێت.

سەدان هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور و سەدان هەزار کەس لە قوتابیانی نوور کە ئیمانی خۆیان بە خوێندنەوەی ئەو پەیامانە ڕزگار کردووە، شایەتی لەسەر کەماڵی

خۆنەویستیی ئەو دەدەن. ئەم مامۆستا پیرۆزەم خۆی بە یەكێك لە قوتابیانی نوور دەبینێت و هەر لەسەر ئەم بناغەیەش خۆی دەناسێنێت..

ئێوەش زۆر بە ئاسانی و لە ڕێی خوێندنەوەی ئەو پەیامانەی كە لە بەردەستاندایە دەتوانن ئەم ڕاستی‌یە ببینن، بە تایبەت "پەیامی ئیخلاس" كە لە ناوەندی كۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا"دایە. ئەوەتا لەو كۆمەڵە پەیامەدا دەڵێت: "ڕاستی‌یە هەمیشەیی‌یەكان وەك خۆر و ئەڵماس وان؛ لەسەر شانی كەسەكان بنیاد نانرێن و كەسانی فانی ناتوانن ببن بە خاوەنیان". ئەمەش زۆر جار لە پەیام و نامەكانیدا دووپات دەكاتەوە. ژیریی ساغی هیچ كەسێك ناتوانێت بڕیاری ئەوە بدات كە ئەو شانازی بە خۆیەوە دەكات یان خۆی بە "مەهدی" و "موجەددید" دادەنێت.

خۆ ئەگەر بە وردی و ویژدانەوە پەیام و نامەكانی نوور بخوێننەوە، بە دڵنیایی‌یەوە بۆتان دەردەكەوێت و دەزانن گەورە زانای ئەم زەمەن و سەردەمەیە كە بە دەگمەن ڕۆژگار هاووێنەی ئەو لە زانست و ئاییندا بە مرۆڤایەتی دەبەخشێت و، چەند چەرخێك دەبێت ڕزگاركەرێكی تری ئیمانیی هاوشێوەی ئەو پەیدا نەبووە. كەواتە كەسێكی خاوەن بەخشش و بەپێت و بەرەكەتە بۆ ئەم نیشتمان و نەتەوەیە زۆر زیاتر لەو سوودانەی كە سوپایەكی تەواو پێی دەگەیەنن، بە تایبەتی لە چەرخێكدا كە پزیسكی سووری بەلشەفیك گوێزراوەتەوە بۆ لای ئێمەش و دەیەوێت وڵاتەكەمان قووت بدات.

من زۆر بەداخەوەم كە هەر لە منالیمەوە قوتابێتیی خۆی و نووسراوە بەنرخەكانیم بۆ نەڕەخساوە!

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

گەلێ سوودی مەزن و لەژمارەبەدەرم لە خوێندنەوەی پەیامەكانی نوورەوە لە خۆمدا بینیوە. لەبەر ئەوە و بە ڕوخسەتی ڕەسمی پەیامی "ڕابەری لاوان"م لە شاری "ئەسكی شەهر" بە چاپ گەیاند، تاكو كەسانی وەك من لە ڕۆڵەكانی ئەم نیشتمانە سوودی لێ وەربگرن. واتە خزمەتێكی نیشتمانیی بەرزم ئەنجام داوە.

پێم خۆشە ئەم پرسیارەتان ئاراستە بكەم:

منی هەژاری دەرگانەی میهرەبانی خوا ئەو پەیامانەی نوورم بە چاپ گەیاندووە كە تەفسیرێكی ڕاستەقینەی زامدار نەكراوی قورئانی پیرۆزن. واتە خزمەتێكی ئیمانیم

جێبەجێ کردووە.. ئایا حەق و داد پێیان ڕەوایە ئەم مامەڵە زبرەم لەگەڵ بکرێت، لە کاتێکدا کە دەبوو بەرامبەر بەو کارەم ڕێز و تەقدیرم بۆ دابنرایە؟

من لە دادگای دادپەروەرتان داوا دەکەم بڕیاری سەربەستیی پەیامەکانی نوور دەربکات، کە خۆراکی گیان و هۆکاری ڕزگار بوون و کلیلی بەختەوەریی هەمیشەیی مانە.

خۆ ئەگەر بەشێکی ئەو شتانەی لە سەرەوەدا باسم کردن لە پێش چاوی ئێوەدا بە گوناه و تاوان دابنرێت، ئەوا پێم خۆشە بۆتان ڕوون بکەمەوە کە بە سنگێکی فراوانەوە پێشوازی لە هەر سزایەك دەکەم، چەندەش توندوتیژ بێت، کە لەبارەی منەوە بڕیاری لەسەر بدەن.

**جەیلان چاڵقشان**

خەڵکی ئەمیرداغ و

بەندکراو لە بەندیخانەی ئافیوون

* * *

**بەرگریی مستەفا عوسمان**[1]:

بۆ دادگای "تاوانە گەورەکان" لە شاری ئافیوون!

لە بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتەی ئاراستەم کراوە سەبارەت بە هاوبەشی کردنم لە چالاکی‌یە گومان کراوەکانی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی لەمەڕ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی و قۆزتنەوەی هەست و سۆزی ئایینی بۆ تێکدانی ئاسایشی وڵات و هەڵسانەوەی لە دژی ڕژێمی حوکمڕان.. دەڵێم:

١ - بەڵێ، منیش وەکو قوتابیانی نوور پەیامەکانی نوورم پەیدا کرد و خوێندمنەوە، تاکو ڕەوشتە قورئانی‌یەکان فێر ببم کە دروشمی ئەو پەروەردە شارستانی و ئایینی‌یەن شایستەی شەرەفی مێژوویی نەتەوە تورکە موسڵمانەکەمانن و، ئایین و ئیمانی خۆم لە کاریگەریی ئایدۆلۆژی‌یە بیانی‌یەکان بپارێزم و، ببم بە ئەندامێکی سوودبەخش بۆ نیشتمان و نەتەوەکەم..

ئێستا خراپکاری و ڕەوشتە نزمەکان جێی ئەو ڕەوشت و کارە بەرزانەیان گرتووەتەوە کە باپیرانمان پێی ناسرابوون، ئەوانەی ڕەفتارە پرشنگدارەکانیان لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو تۆمار کردووە. ئەو خراپکاری‌یانە هێندە پەرەیان سەندووە و ژیانی کۆمەڵایەتی‌یان تێکداوە کە تەنانەت ئەو کەسانەش بەدڕەفتار و خاوەنی ڕەوشتی ناشیرینن بێز لەم بەربوونەوە و دارمانە ڕەوشتی‌یە پەرەسێنە دەکەنەوە کە ڕای گشتیی تووشی نیگەرانی کردووە و، باس و خواستی هەموو کۆڕ و دانیشتنێکی ماڵان و، بابەتی گۆڤار و ڕۆژنامەکانە کە زمانێکن ڕای گشتی دەردەبڕن..

ئەم بارودۆخە ئازاربەخشانە هەر لە بڵاوبوونەوەی خێرادان و شێوەی بەڵا و گێروگرفتێکی گشتی‌یان لەخۆ گرتووە.

ئا لەم قۆناغەدا "پەیامەکانی نوور" توانی‌یان من و هەموو خوێنەرێکی موسڵمانی تریان لە دارمانی ڕەوشتی ڕزگار بکەن. ئینجا هەر کەسێکیش بە گەرموگوڕی داوای ئەو پەیامانەی لێ کردبم - دوای ئەوەی کە زانیویەتی من خوێندوومنەتەوە - پەیامەکانم پێ داون، بەو نیازەی کە لە ڕووی پاکژکردنی ڕەوشت و ئاکارەکانەوە سوود و بەهرەی

(١) لە شاری قەستەمۆنی بە مامۆستا نوورسی ئاشنا بووە و، قوتابێتیی کردووە و، لە گەڵیشیدا بەند کراوە. ساڵی ١٩٩١ز لە تەمەنی هەشتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

لێ وەربگرن. بەم کارەشم یارمەتیی ڕزگار کردنی زۆر کەسم دا لەوانەی کە خەریك بوو دووچاری دارمانی ڕەوشتی ببن و چەند ئەندامێکی زیانبەخشیان لێ دەربچێت بۆ نەتەوە و نیشتمان.

پەیامەکانی نوور بە ڕێنمایییەکانی خۆیان توانییان هەموو ئەوانە ڕزگار بکەن و چەند ئەندامێکی سوودبەخشیان لێ پێك بهێنێت بۆ مرۆڤایەتی و، لە بەردەم پەتای سووری شیووعیەتدا خۆڕاگر و پڕچەکیان بکەن کە لە وڵاتی ئێمەشدا خەریکە بڵاو دەبێتەوە و هەموو جیهان لە ئاستیدا لەرزی لێ هاتووە.

کەواتە بەدیعوززەمان بە موجاهیدێکی مەعنەوی دادەنرێت کە شایانی هەموو ڕێز و تەقدیرێکە. چەکی کارا و نوورانیی لەم جیهادەدا ئەو پەیامانەی نوورە کە لە ماوەی بیست ساڵدا توانییان بیست هەزار کەس - لەوانەیە زیاتریش - بگۆڕن بە کەسانی سوودمەند بۆ نیشتمان و نەتەوە.

کەواتە ئیتر چۆن ئەم کارەم، کە خەڵکیم بۆ خوێندنەوەی ئەو پەیامانە هان داوە، بە تاوان دادەنرێت؟ یان دانانی ئەو پەیامانە سەبارەت بە دانەرەکەیان بە تۆمەت لەقەڵەم دەدرێت؟

ئەم پرسیارە ئاراستەی ویژدانی ئێوە دەکەم.

٢- سەبارەت بەوەش کە داواکاری گشتی لەبارەی ئەو حەدیسەوە وتوویەتی: "مەوزووعە"، دەڵێم: ئەوە بڕیارێکی نازانستییە، چونکە ئەو حەدیسە صەحیحە و لە کتێبەکانی فەرمووودەدا هەیە و، زانایانی حەدیث قبووڵیان کردووە. ئەوە بوو لە سەردەمی مەشرووتیەتدا - پێش سەردەمی ئازادی - ژاپۆنییەکان و کەنیسەی ئەنگلیکیی ئینگلیز چەند پرسیارێکیان ئاراستەی زانایانی ئەو ڕۆژگارە کرد. زانایانی ئەستەمبووڵیش ئەو پرسیارانەیان برد بۆ "بەدیعوززەمان". کە ئەویش تەئویلی ئەو فەرموودەیەی لەناو ئەو پەیامەدا نووسی کە ئێستا ناوەکەی بووە بە "تیشکی پێنجەم". جا قبووڵ کردنی ئەو وەڵامانە لە لایەن ئەو زانا گەورانەوە و ڕەخنە نەگرتنیان لێی، بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی فەرموودەکە.

ئنجا نەك تەنها ئەم بەشەی پەیامەکانی نوور، بەڵکو ئەو ڕاستییانەی کە لەو پەیامانەدان و سەرجەمی وانەکانیان، هێندە بەهێز و توندوتۆڵن کە هیچ زانایەکی موسڵمانی ڕاستەقینە ناتوانێت ڕەخنەیان لێ بگرێت. هەر لەبەر ئەوەیە دەبینین زانایانی

ڕاستەقینەی ئەم وڵاتە لە سەردەمی مەشرووتیەتەوە تا ئێستا، لە پێشەنگیانەوە سەرۆکایەتیی کاروبارە ئایینییەکان، ناچار بوون ڕێز و تەقدیر بەرامبەر بەم پەیامانە دەربڕن. لەبەر ئەوە، هەرگیز ناتوانرێت ڕاستی و بەڵگە بەهێزەکانی ئەم پەیامانە لە لایەن کەسێك یان چەند کەسێکەوە بسڕرێنەوە کە هیچ بەشێکیان لە زانستی ڕاستەقینەدا نییە و، لە زانستدا تەنها ناوەکەی دەزانن. تەنانەت کاری وا دەبێت بە مایەی گاڵتە و پێکەنین!

پەیامەکانی نوور بەوپەڕی ڕێزەوە لە هەموو شوێنێکی نیشتمان و لە لایەن سەرجەم توێژەکانی گەلەوە و بە مەبەستی ڕزگار کردنی ژیانی هەمیشەیی ئیمانەکەیان، دەخوێنرێتەوە. جا لەبەر ئەوەی هەزاران کەس لەو هاووڵاتییانە سوودیان وەرگرتووە و ڕێزیان بۆ ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان داناوە، ئەوا هەموویان سۆزی پێزانین و هەستی قووڵی ئەمەکداری و سوپاسیان لە دڵدایە بۆ دانەری ئەو پەیامانە..

جا ئایا نووسینی نامە لە لایەن ئەوانەوە لە ڕوانگەی وەفاداری و پێزانینەوە بۆ دانەری پەیامەکان و، تێگەیشتن لەو حەدیسەی کە کراوە بە مایەی تۆمەتبار کردنمان بەپێی ئەو ڕاستییانەی کە بەرپەرچ نادرێنەوە و، سەیر کردنی واتای ئەو فەرموودەیە وەك ئەوەی لەم وڵاتەدا هاتبێتەدی، لەسەر بناغەی چەند کار و ئاسەوارێك و، دەربڕینی هیوا و ئاواتیان کە نیشتمانەکەمان نەکەوێتە باوەشی ئاژاوە و ئامێزی ئەم مەترسییە سوورەوە.. ئایا ئەمانە بە خیانەت دادەنرێت لە دژی ڕژێمی فەرمانڕەوا؟ ئایا ڕەخنەن لە دژی شۆڕش؟

خۆ هەرچەند ئەم زانا بەڕێزە بەهۆی ئەم بوختانانەوە بۆ چەندین دادگا ڕۆشتووە و، ئەو دادگایانەش بڕیاری بێ تاوانییان بۆ دەرکردووە، کەچی هێشتا هەر هەمان تۆمەتەکانی پێشووی ئاراستە دەکرێت و دەخرێتە زیندانی تاکە کەسی و دەبرێت بۆ دادگاکان. لە کاتێکدا کە ئەو کەسێکی گۆشەگیر و تەنیایە و بەساڵدا چووە.

سەبارەت بە ئێمەش، هەوڵ و کۆششە زانستییەکانمان کراوە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە گوایا ئاسایشی دەوڵەت تێکدەدەین!

جا ئێمە پرسیار لە دادگاکەتان دەکەین:

ئایا چ ویژدانێکی دادگەر دەتوانێت ئەم چەشنە بڕیارە دەربکات؟ ئەمە بۆ ویژدانتان بەجێ دەهێڵین!

٣ – با بێینە سەر هۆی تۆمەتەکەی تر کە: (ئێمە وێنەی بەدیعوززەمان – وەك ئەوەی شتێکی موقەددەس بێت – هەڵدەگرین و، نامەکانی کۆ دەکەینەوە و، نامەی بۆ دەنێرین).

لە بەرپەرچدانەوەی ئەمەدا دەڵێین:

من وەکو هەموو کەسێکی تر مافی خۆمە نامە و کارتی پیرۆزبایی بۆ بنێرم و، هاوڕێیەتی خۆشەویستانی بکەم و، وێنەکەشی هەڵبگرم. تەنانەت نەك تەنها وێنەیەکی ئاسایی ئەو، بەڵکو ئەگەر وێنەکەی چوارچێوەی گەوهەر و ئاڵتوونیشی تێگیرابێت هێشتا شتێکی زۆر کەمە لە بەرامبەر ئەو چاکەیەی کە ئەم زانا مەزنە بە منی بەخشیوە؛ چونکە ژیانی مەعنەوی و هەتاهەتایی منی لە ئیعدامی هەمیشەیی ڕزگار کرد، تەنانەت لەزەتی بەختەوەریی ژیانی ماددیشی پێ چەشتم و، لە ڕێی نووسینەکانیەوە بوو بەهۆی ڕزگار کردنی ئیمانی هەزاران کەسی تری وەك من.

جا ئەمە مافێکی خۆمە و، پێم وایە هیچ تاوانێك پێك ناهێنێت.

لە کۆتاییدا دەڵێم:

پیاوانی ئاسایشی دوو پارێزگا و چەند قەزایەك شایەتی دەدەن کە ئەو قوتابیانەی نوور بە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور خۆیان و کەسانی تریان لە ڕەوشتە هەرزەییەکان ڕزگار کردووە و، بە درێژایی چەندین ساڵ خزمەتێکی هێندە گەورەیان پێشکەش بەم نیشتمان و نەتەوەیە کردووە کە هەزاران پیاوی ئاسایش ناتوانن ئەنجامی بدەن.

جا ئەوانە لە بریی ئەوەی ڕێز و ستایشیان بۆ دابنرێت، کەچی بە هەڵە لێیان تێگەیشتن و، بە وێنەی کەسانی بەکرێ گیراوی بیانییەکان مامەڵەیان لەگەڵدا کرا. ئەوەبوو گیراین و براین بۆ دادگاکان و، کار و کاسبی و بەرژەوەندییەکانمان پەکی کەوت و، خۆمان و منداڵ و خێزانمان دووچاری بارێکی پەرێشان کراین.

ئایا چ دیموکراسیەتێك بەم بارە ناهەموارە بۆ خێزانەکانمان و گریان و شیوەن بۆ منداڵەکانمان ڕازی دەبێت و بە ڕەوای دەزانێت؟

ویژدانی چ دادوەرێك بەمە ڕازییە؟ ئەم پرسیارە لە دادگا و ویژدانی ئێوە دەکەم!

لەبەر ئەوە، من بە ناوی دادگای بەڕێزتان و بە ناوی نەتەوەی سەربەرزی تورك و بە ناوی ئەنجومەنە دادگەرەکەیەوە کە ئێوە لە ژێر سایەیدا کار دەکەن، داوا دەکەم:

بڕیاری ئازادیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور دەربکەن کە هەرگیز ناتوانرێت ئینکاریی سوودە زۆرەکانیان بکرێت.. هاودەم لەگەڵ دەرکردنی بڕیاری بێ تاوانیمان.

**مستەفا عوسمان**

خەڵکی "سفرانبوولو" و

بەندکراو لە بەندیخانەی شاری ئافیوون

**بەرگریی حیفظی بایرام:**

بۆ دادگای "تاوانە گەورەکان" لە شاری ئافیوون!

ئەو تۆمەتەی ئاراستەی من کراوە ئەوەیە کە:

نووسینەکانی زانای ئیسلامی "بەدیعوززەمان" دەخوێنمەوە کە بەوە تۆمەتبار کراوە هەستی ئایینی دەقۆزێتەوە بۆ تێکدانی ئاسایشی وڵات.

ئەو نووسراوانە لە ڕاستیدا زۆر بەنرخن و، سوودی گەورەیان بۆ وڵات و نەتەوە تێدایە و، گەلێ وانەی سوودبەخش لەبارەی ڕاستییەکانی قورئان و ئیمانەوە دەڵێنەوە..

هەروەها کە بۆم دەرکەوت سوودێکی زۆرم لە ڕووی ئایینی و ڕەوشتییەوە لەم پەیامانە دەست کەوتووە و، لەسەر داواکاریی هەندێ لە هاوڕێکانم، چەند دانەیەکم لەم پەیامانە پێ دان، بەپێی ئەو دەستوورەمان کە بریتییە لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی خێر و پاداشت لە ڕێی بڵاوکردنەوەی پەروەردەی ئایینی و ڕەوشتییەوە..

هەروەها ناردنی هەندێ نامەی زانستی، یان نامەی دۆستانە لە لایەن هەندێ لە ناسراوەکانمەوە بۆ ئادرەسەکەی من..

ئەمانە، ئەو بروبیانووانەن کە پشتیان پێ بەستراوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ناوبراودا هاوبەشی تاوان بم.

وا بەرپەرچی هێنانی ئەم مەسەلانە دەدەمەوە کە کراون بەهۆی تۆمەتبار کردنمان:

١ - من لەو باوەڕەدا نیم کە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور لە لایەن منەوە بە نیازی فێربوون و پارێزگاریی ئایین و ئیمانەکەم و، بەخشینی هەندێ لەم پەیامانە بە چەند هاوڕێ و دۆستێك بە نیازی فێربوون، هیچ گوناهـ و تاوانێك پێکبهێنێت. چونکە ئەم پەیامانە بە چەند دادگایەکدا تێپەڕیون و لە لایەن هەموویانەوە بێ تاوانییان ڕاگەیەنراوە و دراونەتەوە بە دانەرەکەیان و، ڕێز و تەقدیری زانایانی وڵاتی خۆمان و وڵاتە ئیسلامییەکانیان بەدەست هێناوە و، هیچ هزر و بیرێکی خراپیان تێدا نییە، وەك ئەوەی داواکاری گشتی گومان دەبات..

هەریەك لەم پەیامانە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی، تەفسیرێکی گرنگی قورئانی پیرۆزن و، خەڵکی بۆ ڕەوشت بەرزی و فێربوونی ڕەفتار و ئاکاری جوان بانگ دەکەن و، چەند

وانەیەکی ئیسلامی و پەروەردەی ئایینی بە شێوەیەکی کاریگەر دەڵێنەوە و، بەمەش دەبن بە هۆکارێکی پاراستنی نەتەوەکان لەوەی کە بەرەو نزمایییەکان هەرەس بهێنن.

کەواتە نەك چەند کتێبێکی سوودبەخشن بۆ ئەم نەتەوە و وڵاتە، بەڵکو لە ڕووی مەعنەوییەوە سوودیان بۆ هەموو گرۆی مرۆڤایەتی تێدایە. چونکە تا ئێستا هیچ کەسێك لە هیچ شوێنێکدا ڕووداوێکی تۆمار نەکردووە کە زیانی بۆ نەتەوە یان کارگێڕیی دەوڵەت بووبێت و یەك کەس لە قوتابیانی نوور بەشدارییان تێدا کردبێت. پیاوانی پۆلیس و ئاسایش هیچ ڕووداوێکی لەم چەشنەیان لەسەر تۆمار نەکردوون.

پاشان هیچ کۆمەڵەیەکی نهێنی لە ئارادا نییە تا خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور بە نهێنی بێت. چونکە قوتابیانی نوور پەیوەندییان بە هیچ کۆمەڵەیەکەوە نییە، زانستی بێت یان سیاسی، ئاشکرا بێت یان پەنهان. تەنانەت پێش چەند ساڵێك بەدیعوززەمان و چەندین کەس لە قوتابیانی بە هەمان تۆمەت بران بۆ دادگای تاوانە گەورەکان لە "دەنیزلی" و، دادگاش توێژینەوەی ورد و لێکۆڵینەوەی قووڵی ئەنجام دا، پاشان ناچار بوو بڕیاری بێ تاوانیی هەموویان و بێ تاوانیی پەیامەکانی نووریش دەربکات.

نازانم خوێندنەوەی نووسراوەکانی دانەرێك کە بڕیاری بێ تاوانیی خۆی و کتێبەکانی دراوە، بۆچی دەکرێت بە بەڵگە لەسەر تاوانێکی گەورەی وەك: تێکدانی ئاسایشی دەوڵەت و هەوڵدان لە دژی ڕژێمی فەرمانڕەوا؟

چۆن ئەمە دەکرێت بە هۆکاری تاوانبار کردن؟

پلەی دادگەری لەم شتەدا چەندەیە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بە ویژدانی ئێوە دەسپێرم.

٢ - پاشان لەو کاتەدا کە من لە قەزای "بایەزید" لە بەندیخانەدا بووم لە لایەن کەسێکەوە کە نایناسم نامەیەکم بۆ نێراوە و، ئەو نامەیە کراوە بەهۆی تاوانبار کردنم! لە کاتێکدا کە من ئەو نامەیەم نەدیوە و نازانم ناوەرۆکەکەشی چییە. خۆ ئەگەر یەکێکە لە پەیامەکانی نوور من قبووڵمە. بپرسن بزانن چییە؟ با وەڵامی ئەو تۆمەتە بدەمەوە.

لە وتەکەی داواکاری گشتیدا شتێك لە بارەی "مەهدییەت"ەوە وتراوە. جگە لەو من ئەوەم لە هیچ کەسێکی تر نەبیستووە. مامۆستاکەشم لەم چەشنە لاف و گەزافانە

بەرییە و، نە لە قسەکانیدا و نە لە پەیامەکانیدا شتی وای تێدا نەهاتووە. تەنانەت لە هەموو بۆنەیەکدا وا ڕاهاتووە قوتابیانی ئاگادار دەکاتەوە کە هەردەم دوور بکەونەوە لەوەی بە گەورەی بگرن، یان ڕێزی زیادی بۆ دابنێن، یاخود پلەیەکی بەرزی پێ ببەخشن.

ئێمە خۆمان دڵنیاین لەوەی کە مەزنترین زاناکانی چەرخی خۆیەتی و، بەرییە لە حەز و ئارەزووی ناوبانگ و پلە و پایە. کەواتە زانایەکی ڕەسەنە.

بەندکراو

**حیفظی بایرام**

* * *

**بەرگریی مستەفا ئاجەت[(١)]:**

بۆ "دادگای تاوانە گەورەکان" لە شاری ئافیوون!

وەڵامی ئەو تۆمەتە وەهمی‌یە دەدەمەوە کە داواکاری گشتی "بەدیعوززەمان"ی مامۆستامی پێ تاوانبار کردووە:

خزمەتەکانم بۆ مامۆستا و بۆ پەیامەکانی نوور تەنها یەك دڵۆپە لە بەرامبەر ئەو دەریای لوتف و چاکەیەی کە لەگەڵمدا کراوە. هەرگیز پەشیمان نیم لەو پەیوەندی‌یەم.

جا هەروەك چەند پارچە شووشەیەك لە پێناوی بەدەستهێنانی گەنجینەی یەکجار بەنرخی ئەڵماسدا بەخت دەکرێت، منیش ئامادەم ژیانی خۆم لە ڕێی پەیامەکانی نووردا بەخت بکەم کە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی هەمیشەییمن.

بە دڵنیایی دەرکەوتووە کە گەلێ سوودی قیامەتی و دنیایی لە پەیامەکانی نوورەوە بەدەست دێن. لەبەر ئەوە، پێم وایە وازهێنان لەو سوودە گەورانە و ساردوسڕی بەرامبەر پەیامەکان و مامۆستای بەڕێزم، لەبەر ئەوەی زیانێکی وەك بەندکردنێکی بێ نرخ و تەنگ و چەڵەمەیەکی کاتی نەیەتە ڕێی ئەم ژیانە دنیایی‌یە کورت و شێواوە، پێم وایە ئەم کارە سووکایەتی‌یەکی گەورەیە بەرامبەر مامۆستاکەم کە عەللامەی ڕۆژگارە و، بەرامبەر تاقانە ئامانجە مەزنەکەی کە خزمەتکردنی ئیمان و قورئانە..

بۆیە من نامەوێ هەرگیز بێ فەرمانیی بکەم، یان لە ئیزن و ڕوخسەتی ئەو لابدەم.

ئەی دەستەی دادوەرانی بەڕێز!

بۆچی بە لاتانەوە گەورەیە کە من، وێڕای هەژاریم، قوتابیی زانایەکی مەزن بم کە دژی ئەو بەلشەفیکە جیهاد دەکات کە هەوڵ دەدات ژەهرەکانی لە نیشتمانە ئازیزەکەماندا بلاو بکاتەوە. ئەمە بێ گومان دەیچەسپێنێت کە ئەو سەروەت و سامانەی "نوور" هەیەتی زۆر زیاترە لە سەروەتی سەرانسەری جیهان بە گشتی.

---

(١) مستەفا ئاجەت: سالی ١٩٢٤ز لە "ئەمیرداغ"ی سەر بە پارێزگای "ئافیوون" لە دایك بووە. لەسەر چالاکی‌یەکانی لە خزمەتی نووردا سالی ١٩٤٨و١٩٦١ بەند کراوە. ماوەیەکی درێژخایەن خۆشنووس بووە لە دیوانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی. سالی ١٩٩٢ز لە تەمەنی شەست و هەشت سالیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

دەسا دەستی مامۆستاکەم و پەیامەکانی نوور بەربدەن، تـاکو ملیۆنـان لاوی نەتـەوەی تورك ڕزگار بکات و ببن بە ڕۆڵەی سوودبەخش بۆ وڵات!

بەڵێ، ئێمەی لاوانی نەتەوەی تـورك زۆر زیـاتر پێویسـتمان بـە پەیامـەکانی نـوورە لـەو پێویستی‌یەی کە مرۆڤێك وەختە بخنکێت بۆ هەوای سازگار هەیەتی و.. لە پێویسـتیی ئـەو کەسەی لـە تاریکاییدایـە بـۆ ڕوونـاکی و.. لـە تینوێتـی و برسـێتیی کەسێکی وێڵـی نـاو دەشت و بیابانەکان بـۆ ئـاوی سـازگار و خواردنێکـی سـوودبەخش.. تەنانـەت زیـاتر لـە پێویستیی کەسێك کە نوقمی ژێر ئاو بووە، بۆ ڕزگاری!

لەناودانی ژیانی "بەدیعوززەمان" کە گومان باشـیی لـە ڕادەبـەدەری ئێمـەی بەدەسـت هێنـاوە و، ئێمـە ڕوومـان تێکـردووە و، پـەیوەندیی توندوتۆڵمـان لەگـەڵدا بەسـتووە.. هـەروەها لـەناودانی کەسـانێکی لاواز کـە بـە نیـازێکی بێگـەرد بـوون بـە قوتـابیی ئـەو، هەرگیز ئەم کارە لەگەڵ شەرەفی دادگەریدا ناگونجێت.

بەندکراو:

**مستەفا ئاجەت**

خەڵکی ئەمیرداغ

* * *

## بەرگریی خەلیل چالیشقان[1]:

بۆ دادگای تاوانە گەورەکان لە شاری "ئافیوون"!

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

لەو لائیحەی تۆمەتبار کردنەی کە داواکاری گشتی پێشکەشی کردووە، خزمەت کردنی منی بۆ مامۆستاکەم بە تاوانێکی گەورە لە قەڵەم داوە.

ئەم مامۆستایەم کە وەك میوانێك ساڵی ١٩٤٤ هات بۆ شارەکەمان و چوار ساڵە لەوێ نیشتەجێیە، چل ساڵی ڕەبەقە وازی لە هەموو چێژ و خۆشی و حەوانەوەیەکی ژیان هێناوە و، خۆی بۆ خزمەتی ئیمان و ئیسلام تەرخان کردووە، بە تایبەتی بۆ ڕزگار کردنی بەختەوەریی هەمیشەیی موسڵمانانی نیشتمانەکەمان و، دانانی بەربەستێك لە بەردەم ئەو بیروڕایانەی کە زیانیان بۆ ئایینی ئەم نەتەوە تورکە موسڵمانە هەیە، وەك بیروڕای ئەو بەلشەفیکەی کە زیانی لەڕادەبەدەری ماددی و مەعنەویی تێدایە و بیر و بۆچوونەکانی تر کە زیان بە نیشتمان و نەتەوە دەگەیەن..

ئەم هەوڵەی مامۆستاشمان لە ڕێی وانە ئیمانی و ئەخلاقییەکانی پەیامەکانی نوورەوەیە کە سەرجەمی زانایان دانیان بە فەزڵیدا ناوە.

ئایا خزمەتکردنی جارجارەی من - کە شانازیی پێوە دەکەم - بۆ مامۆستاکەم لە ماوەی سێ ساڵدا، بە تاوان دادەنرێت؟

جگە لەمە، دەچن وازهێنانم لە پیشەی "بەرگدروویی" لە پێناوی ئەم خزمەتەدا، بە تاوان دادەنێن. خۆ ئەگەر ژیانی خۆم لە پێناوی مامۆستاکەم و پەیامەکانی نووردا - کە ئێمەیان بۆ ڕاستی و حەقیقەت ڕێنمایی کرد و، تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن - بەخت بکەم، ئایا بەو کارە تاوانبار و خیانەتکار دادەنرێم بەرامبەر نیشتمانەکەم؟ ئەم پرسیارە لە ئێوە دەکەم!

ئەی سەرۆکی بەڕێزی دادگا! من هەندێ پەیامی نوورم خوێندووەتەوە و هەندێکی تریشیانم نووسیوەتەوە و، سوپاس بۆ خوا خەریکە سوودێکی زۆر لەم پەیامانە وەردەگرم.

---

(١) بنەماڵەی "چالیشقان" خزمەتی زۆریان پێشکەش بە پەیامەکانی نوور کردووە و، لە دەمی دەست بەسەریی مامۆستادا لە ئەمیرداغ ئەو خزمەتەیان بە ئەنجام گەیاندووە. یەکێك لەوانە خەلیل چالیشقان و یەکێکی تریان "عوسمان"ی باوکیەتی کە لە پێشەنگی خزمەتگوزارانی پەیامەکانی نووردا بوون. ساڵی ١٩٦٥ز لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. خوای گەورە لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

چونکە هەر لە سەرەتاوە دڵم تاسەمەندی زانستە و پەیوەندی‌یەکی گەورەی بە زانستەوە هەیە. خۆ هەرچەندە زۆر لە نزیکەوە پەیوەندیم بەم پەیامانەوە هەیە، کەچی ئەوەم تێدا نەبینیوە کە گەل لە دژی حکومەت هان بدات، یان بانگەشە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی بکات بە مەبەستی تێکدانی ئاسایش و، هیچ شتێکم سەبارەت بە "مەهدی‌یەت" و لافی "تەجدید" یان هاندان لە دژی ئاسایش لە مامۆستاکەم نەبیستووە.

تەنیا ئامانج و تاکە خزمەتی پەیامەکانی نوور و مامۆستاکەمان و قوتابیانی نووریش، ئەنجامدانی خزمەتێکی خاوێنە بۆ ئیسلام، بە تایبەتی بۆ نەتەوەی تورکی موسڵمان، لە رووی ئیمان و ئەخلاقەوە.

لەبەر ئەوە، گەلێ پێویستە کە لەسەر ئەنجامدانی ئەم خزمەتە، ڕەفتاری ناڕەوا بەرامبەر پەیامەکانی نوور و قوتابیانی نەکرێت.

ئەمە ئامانج و مەبەستی ئێمەیە، نەك شتی تر. ئەنجامدانی ئەم ئەرکەشمان لە پێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورەدایە. ئاشکرا و سروشتی‌یە کە ناکرێت ئەم ئەرکە خاوێنە لە پێناوی دنیا و شمەك و سوودەکانیدا بێت، تەنانەت هەر دانابەزێتە ئەو ئاستە.

قوتابی‌یە خاوێنەکانی نوور جێی ئامانجە دنیایی‌یەکان لە دڵیاندا نابێتەوە، چونکە دڵیان بە ئیمان و شتانی سەر بە دواڕۆژ پڕ بووە.

لەبەر ئەوە، ئێمە هەرگیز پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنیمان بە دڵدا نەهاتووە، کە داواکاری گشتی ئێمەی پێ تۆمەتبار دەکات و، هەرگیز ئەم چەشنە تۆمەتە قبووڵ ناکەین.

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

لەو باوەڕەداین کە ئێوە قەناعەتتان بە حەقیقەتی ئامانجەکانی ئێمەی قوتابیانی نوور کردووە و، دڵنیا بوون لەوەی کە هیچ پەیوەندی‌یەکمان بەو تۆمەتانەوە نی‌یە کە داواکاری گشتی هێناونی. بۆیە داوا لە دادگای بەڕێز و ویژدانی ئێوە دەکەین کە کتێبەکانمان بدەنەوە و بواری سەربەست بوونیان بدەن و، بڕیاری بێ‌تاوانیمان بۆ دەربکەن.

**خەلیل چالیشقان**

خەڵکی ئەمیرداغ و

بەندکراو لە بەندیخانەی ئافیوون

## بەرگریی مستەفا گوڵ[(١)]:

بۆ دادگای تاوانە گەورەکان لە شاری "ئافیوون"!

من ئەندام نیم لە هیچ کۆمەڵەیەکی نهێنیدا، هەروەك "بەدیعوززەمان"ی مامۆستاشم کۆمەڵەیەکی لەو جۆرەی پێك نەهێناوە. چونکە بەردەوام چەند وانەیەکمان پێ دەڵێت لە بارەی ڕاستییەکانی قورئانەوە و، بە توندی ڕێمان لێ دەگرێت کە پەیوەندی بە سیاسەتەوە بکەین. من تەنها قوتابییەکی مامۆستای گەورە "سەعید نوورسی"م و، لەناخی دڵ و ڕۆحی خۆمەوە پەیوەندیم بە خۆی و پەیامەکانی نوورەوە هەیە و، ئامادەی هەر سزایەکم لە ڕێی پەیامەکانی نوور و لە پێناوی مامۆستاکەمدا لەسەرم دەربکرێت. چونکە ئەو مامۆستایەم بە پەیامەکانی نوور ئیمان و ژیانی ئەودنیای منی ڕزگار کرد. تەنیا ئامانجی ئەو ڕزگار کردنی موسڵمانان و هەموو هاووڵاتییانە لە ئیلحاد، بۆ ئەوەی بەختەوەریی هەمیشەیی بەدەست بهێنن.

لە هەموو دادگاکاندا بە ئاشکرا دەرکەوتووە کە ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان بە هیچ ئامانجێکی سیاسییەوە نییە، کەچی وێڕای ئەوەی کە ڕاستی ئەمەیە، هێشتا هەر بە ناحەق و بێ هیچ تاوانێك بەرەو دادگاکان دەبرێین. ئێمە پێمان وایە کە دەیانەوێت یەکێتی و یەکڕیزیمان بشکێنن، لە کاتێکدا هاوکاری و یەکڕیزیمان بە مەبەستی هیچ ئامانجێکی دنیایی یان سیاسی نییە. هەر تەنها ئەوەندەیە کە ڕێزێکی گەورە لە مامۆستاکەمان دەگرین، چونکە هەر کەسێك پەیامەکان دەخوێنێتەوە ئیمانێکی بەهێز و ئیسلامێکی توندوتۆڵ و ڕەوشت و کەماڵێکی بەرز بەدەست دەهێنێت.

ئێمە ناتوانین خۆشەویستییەکی زۆرمان بۆ مامۆستاکەمان نەبێت. من بە هەموو هەست و نەستێکم و لە ناخی دڵمەوە پەیوەستم بەم چەشنە مامۆستایە و بەم جۆرە قوتابیانەی نوورەوە. خۆ ئەگەر لە سێدارەش بدرێم هەر ئەم پەیوەندییەم ناپچڕێت.

من و هەموو برایانم بێ تاوانین و، بە هەموو هێزێکمانەوە داواکاری سەربەست کردنی پەیامەکانی نوورین. من داواکاری دەرکردنی بڕیاری بێ تاوانیی مامۆستا گەورەکەمان و برا بێ گوناهەکانم لە قوتابیانی نوور و بێ تاوانیی خۆیشم دەکەم.

(**مستەفا گوڵ**) خەڵکی ئیسپارتە

---

(١) ساڵی ١٨٩٩ز لە گوندی "ساو"ی سەر بە پارێزگای "ئیسپارتە" لەدایك بووە و، یەکێکە لە نووسەرەوە پێشینەکانی پەیامەکانی نوور. لە ساڵی ١٩٤٢ز لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا ئاشنایی پەیدا کردووە. ساڵی ١٩٨٥ز کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

**بەرگریی ئیبراهیم فاقازلی[1]:**

بۆ دادگای تاوانە گەورەکان لە شاری ئافیوون!

ئەی دادوەرە بەڕێزەکان!

یەکەم شت: ئەو تۆمەتەی کە ئاراسـەتی ئێمـە کـراوە ناڕەوایـە و پـەیوەندیی بـە دنیـاوە هەیە، چونکە تۆمەتێکی سیاسی‌یە.

بێ گومان ئێوە – ئەی دادوەرە بەڕێزەکان – هەر لە یەکەم ڕوانینتانەوە بۆ ئێمـە بۆتـان دەرکەوتووە کە لەو کەسانە نین لە مەیدانی سیاسەتدا کار دەکەن، تەنانەت گـەر سـەدان کەسی خاوەن سەلاحیەتیش بیانەوێت جەخـت لەسەر ئـەو تۆمەتـە بێتـام و نامۆیـە بکـەن، ئێوە هەر باوەڕ ناکەن.

خۆ ئەگەر ژیریم سەدان هێندەی ئێستام گەورەتر بیێـت ئـەوا ئـەو کاریگـەری‌یـەی کـە پەیامەکانی نوور و دانەرە بەڕێزەکەیان لە مندا بەجێیان گەیاندووە سەروزیادی ئەوەیە کە واز لە چێژی کاتی وفانیی سیاسەت بهێنم و، بە هەموو قـەوارە و بـوون و هێزێکم بـەرەو ڕێی ئاخیرەت و ڕزگار بوون لە دۆزەخ ڕابکەم.

پەیوەندی‌یەکانمان لەگـەڵ دانـەری بـەڕێزی پەیامەکانی نـوور و ڕێز گرتنمـان لێـی و خوێندنـەوەمان لـە پەیامـەکانی نـووردا و نووسـینەوەیان و، پـەیوەندیمان لەگـەڵ قوتابیـانی نووردا.. هەموو ئەمانە چەند پەیوەندی‌یەکی قیامەتی و سەر بەودنیان. دادگای گـەورەی تاوانـەکان لـە شـاری دەنیزلی و دادگـای بـاڵای تـەمیز دانیـان بەمـەدا نـاوە و تەسـدیقیان کردووە.

ئەو بیر و بـۆ چوونانـەش کـە لـە پەیامـەکانی نـوورەوە بـە دەستمان هێنـاون داخـوازی ئەوەن کە هەرگیز دەستبەرداری ئەم پەیوەندی‌یە نوورانی‌یە نـەبین و نەیگۆڕینـەوە بـە هیـچ ئامانجێکی ماددی و دنیایی. ئەم ئیمانەشمان لەگەڵدا دەمێنێت هەتا دوا چرکەی تەمەنمان.

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

---

(١) سالی ١٩١٠ز لە ناحیەی "ئەینەبولو" لەدایك بووە. سالی ١٩٤١ز لـە "قەستەمۆنی" سـەردانی مامۆستا نوورسیی کردووە. لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە خزمەتی ئیمانیی بە ئەنجام گەیاندووە. ٢٠٠٣/١١/٣ز کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

مادەم لەسەر ئەم تۆمەتە سەرسوورهێنەرە لێرەدا کۆکراوینەتەوە، ئەوا ویژدانم و خۆشەویستیی وڵاتەکەم پێویستی دەکەن لەسەرم کە ئەم ڕاستییە گرنگانە ڕوون بکەمەوە:

بە چاوی خۆم لە ناوەندەکانمان و لەو ژینگەیەی کە تیایدا دەژیم مەودای ئەو چاکسازییە گەورانەم بینی کە پەیامەکانی نوور ئەنجامیان داون و، کەسانی تریش بینیویانە. ئەوەبوو لە ماوەی دە ساڵدا کەسانێکی زۆر - کە خۆم یەکێکم لەوانە - فێری ئەوە بوون ڕێگا بەرەوماڵەوەیان بگرنەبەر و بایەخ بە خێزانەکانیان بدەن و، وازیان لە شتانی نەنگ و ناشیرین هێنا و، تامی بەختەوەریی خێزانییان چەشت. ئێستا باوکان و دایکانی ئەو کەسانە دەستی نزا و پاڕانەوە بەرز دەکەنەوە و دوعا بۆ ئەو کەسە دەکەن کە هۆکاری ئەم ئاڵوگۆڕە بووە.

دەتوانن شتی زۆر لەم بارەیەوە لە خەڵکانی پارێزگاکەمان و دەوروبەری ببیستن.

کاتێك پەیامەکانی نوور ڕۆشتنە ناو بەندیخانەی "دەنیزلی" کاریگەریی یەکجار ئیجابییان لەسەر بەندکراوەکان بەجێهێشت، کە تا ئێستاش ئەو کاریگەرییە ئیجابییە جێی باس و گفتوگۆی خەڵکییە!

کاتێکیش ڕۆشتمە ناو بەندیخانەی "ئافیوون" لەگەڵ هەر بەندکراوێك دەدوام دوعای خێری بۆ قوتابیانی نوور دەکرد و، جیاوازیی گەورەی نێوان حاڵەتی پێشوویان و حاڵەتی ئێستایان بۆ باس دەکردم..

ئەم ڕاستییانە لە بەرچاودان و هەستیان پێ دەکرێت.

لە ڕاستیدا من زۆرم بەلاوە سەیر و نامۆیە کە بگونجێ پێم بوترێ لە بواری سیاسەتدا کار دەکەم، تەنها لەبەر ئەوەی کە چەند نامەیەکی خۆشەویستیم بۆ دانەری بەڕێزی پەیامەکانی نوور ناردووە، ئەو پەیامانەی کە لە ڕووی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و قیامەتییەوە سوودێکی زۆریان بۆ من و هاوڕەگەزەکانم بووە، چونکە تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن.. یان لەبەر ئەوەی چەند نامەیەکی خۆشەویستیی موسڵمانانە و نامەی دڵدانەوەم بۆ چەند هاووڵاتییەکم ناردووە.

جا من لە ناوەندی ئەم سەرسوورمانەمدا دەڵێم:

هەرگیز ناکرێ ئەم کارە مایەی تۆمەت و تاوان بێت.

ئەو گریمانەی لێرەدا بۆ ئەم دیاردەیە مەزەندە دەکرێت ئەوەیە کە دوژمنانی قورئان، کە هی پەیامەکانی نووریشن، لەوانەی کە لە پشت پەردەوە خۆیان حەشار داوە. وەهم و گومان و مەترسیی‌یان لە دەروونی کارمەندانی داد و ئاسایشدا سەبارەت بە ئێمە بڵاوکردووەتەوە، تاکو بخرێینە بەندیخانەکانەوە.

بەڵام دادوەرە بەڕێزەکان، بێ هیچ گومانێك، لەم ڕاستی‌یانە ئاگادارن و، دەستیان لەسەر ویژدانیان دادەنێن، بۆ ئەوەی ئەو بڕیارە دادگەرانەیە دەربکەن کە پاداشتی زۆری لای خوای گەورە هەیە و.. نەتەوەی تورکی موسڵمانیش، کە لە هەموو شوێنێکی ئەم نیشتمانەدا بە بایەخ پێدانەوە چاوەڕێی ئەو بڕیارانە دەکات، منەتزان و سوپاسگوزاریان دەبێت.

**ئیبراهیم فاقازلی**

بەندکراو لە بەندیخانەی ئافیوون

* * *

